# موقەدیمەی ئیبن خلدون



عبدالرحمن ابن خلدون





بەرگی دووەم

وەرگێڕانی: سەعید بەشیر

**لەبڵاوکراوەکانی خانەی چاپ و پەخشی ڕێنما**

**زنجیرە(٥٣٠)**

## ناسنامەی کتێب

- ناوی کتێب: موقدیمەی ئیبن خەلدون
- نوسینی: عبدالرحمن بن خلدون
- وەرگێڕی کوردی: سەعید بەشیر
- تـــایپ: هـــەوار جـــزا غفور
- بەرگ: فواد کەوڵۆسی
- شوێنی چاپ: چاپەمەنی گەنج
- ساڵی چاپ: ٢٠١٦
- نۆبەتی چاپ: چاپی یەکەم
- تیراژ: ١٠٠٠ دانە

**لەبەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردن(١٢٤٠)ی ساڵی ٢٠١٥ی پێدراوە.**

ناونیشان:

سلێمانی ـــ بازاڕی سلێمانی ـــ بەرامبەر بازاڕی خەفاف.

ژمارەی مۆبایل: (٠٧٧٠١٥٧٤٢٩٣)، (٠٧٥٠١١٩١٨٤٧)

## پێڕست

**بسم الله الرحمن الرحيم**

# بابی چوارەم لەکتێبی یەکەم

## لەبارەی گوندو شارەبچوك و گەورەکان و هەموو کۆمەڵگە شارنشینەکان و ئەو چۆنیەتی وحاڵەتانەی کەلەواندا ڕوودەدات، ئەم بابە چەند پێشەکی و پاشکۆیەکی لەخۆ گرتووە

## بەشی یەکەم

### لەبارەی ئەوەی کەدەوڵەتەکان بەرلە دروستبوونی شارە گەورەو بچوکەکانەوە دادەمەزرێن دامەزرانی شارە بچوك و گەورەکان لە پاش بەدیهاتنی پاشایەتیە

ڕاڤەکەشی ئەمەیە کەدروستکردنی شارەکان و دامەزراندنی خانووەکان بێگومان لەحەزو خولیاکانی شارنشینیە کەجوانخوازی و نازو نیعمەت و هێمنی و ئارامی دەبێتە هۆی دامەزراندنیان. هەروەك پێشتر ئاماژەمان پێکرد ئەم بارودۆخەش لەپاش قۆناغی دەشتەکیەتی و حەزو پێداویستیەکانیەوەیە. وەهەروەها ئەوەی کە شارو پایتەختەکان خاوەنی هەیکەل[1] و خانوو باڵەخانەی گەورەو بەشکۆن و بۆ هەمووان بنیاتیان دەنێن و،

---

[1] هیاکل جەمعی هیکل بەچەندین مانا هاتووە: وەك بینای بەرز و کڵێسای مەسیحیەکان کەلێرەدا مەبەست مانای یەکەمە (منتهی الارب، اقرب الموارد).

تایبەت نین بەکەسە تایبەتەکانەوە، هەربۆیە دروستکردنی وەها باڵەخانەگەلێکی گەورە بەناچاری دەبێت بەهەرەوەزی گروپەگەورەکان و کۆمەڵە زۆرەکان ئەنجام بدرێت و، لەشتە پێویستیەکانی خەڵکی نازمێردرێت و کەپێویستی هەمووان بێت تاوەکو ئەوانەلەڕووی شەوق و پێویستیەوە دابمەزرێنن، بەڵکو دەبێت ئەم جۆرە کۆمەڵەزۆرانە بەزۆرو بەقامچی پاشایان و زۆر بەشیان بەهاندان لەڕێگەی کرێ و مووچەوە ئەم کارانەیان پێبکەن. دیارە کەئەم هەموو هەقدەستە زۆرانە کەسی ئاسایی ناتوانێت بیدات بەڵکو لەتوانای پاشاو دەوڵەتاندایەو بێجگەلەوانیش کەسی تر ناتوانێت ئەوکارە بکات. هەربۆیە بۆ دروستکردنی باڵەخانەو بنیاتنانی شارەگەورەکان هیچ ڕێگەیەك بێجگە لەهێزی پاشایی دەوڵەت بۆئەم کارە بوونی نیە. ئەوکات کاتێك شارەکە دروستکرا و بناغەکەی لەگەڵ دیدی دامەزرێنەرەکەیدا پایەدارو گونجاو بێت ڕەچاوی پێویستیە هەوایی و زەمینیەکانی بکرێت، ئەوکات مانەوە یان تەمەنی ئەو شارە وابەستەیەبەتەمەنی فەرمانڕەوایی دەوڵەتی دامەزرێنەری ئەو شارەوە و ئەگەر تەمەن و ڕۆژگاری ئەو دەوڵەتە کورت بێت ئەوا چۆنیەتی فراوانبوون و پێشکەوتنی ئەوشارەش لەپاش کۆتایی هاتنی فەرمانڕەوایی دەوڵەتی ناوبراو دەوەستێت و، کۆمەڵگەو ئاوەدانیەکەیشی ڕوولەکەمبوونەوە دەکات و بەرەو وێرانی دەچێت، وە ئەگەر فەرمانڕەوایی ئەو دەوڵەتەش ماوەکەی دوورودرێژبێت ئەوا گوندو شارو شارۆچکەکانی خانوو کۆشکی فراوان و زۆرو جۆراو جۆری تێدا دروستدەکرێت، بازنەی دوکان و بازاڕو شوراکان تێیدا فراوان دەبێت وتاوەکو وای لێدێت کەڕووبەرێکی فراوان داگیر دەکات و بازنەکەی دەگاتە ئاستێکی بێسنور، هەروەك بارودۆخی بەغداد و شارە هاوشێوەکانی بەم شێوەیە فراوانبوون. خەتیب[٢] لەمێژووەکەی خۆیدا نوسیویەتی کەلەسەردەمی

---

[٢] ئەبوبەکر ئەحمەد بن علی بن سابیت بن ئەحمەد بن مەهدی بەغدادی، فەقیهو موحەدیس و مێژوونوس کەنزیکەی سەد دانراوی هەیە ومێژووەکەی بەناوی مێژووی خەتیبی بەناوبانگە، کەلەساڵی ٣٩١ یان٣٩٢ لەدایك بووە و لەساڵی ٤٦٣ ك مردووە (لغتنامەی دهخدا).

مەئموندا شاری بەغداد شەشسەدو پێنج هەزار حەمامی هەبووە، کەچل ناوچەو شاری بچوک و گەورە و پەیوەست بەیەك و نزیك لەیەکەوە بوون و بەهۆی فراوانبوونی کۆمەڵگەوە (ئاوەدانی زۆرو پەیوەست بەیەکەوە).

بەیەك شار نەزانراوە کەشورایەك دەورەی دابێت. بارودۆخی قەیرەوان و قورتوبە و مەهدیە لەسەردەمی زێرینی ئیسلامدا، وەمیسریش (قاهیرەی کۆن) و قاهیرەی تازە لەپاش ئەو قۆناغە هەروەك ئاگادارین لەم سەردەمەدا وەك بەغدادی ئەو سەردەمەیە. بەڵام لەپاش نەمانی خاندانی دەوڵەتی کەشاریان بنیات ناوە ئەگەربێت و لەنزیك کێو شیوو بیابانەکانی ئەوشارەدا دەشتەکیەتی بوونی هەبێت کەبەردەوام یارمەتی کۆمەڵگەکەی دەدات ئەوکات ئەمەدەبێتە هۆی پاراستنی بوونی ئەو لەپاش ڕووخانی دەوڵەتی ناوبراو شاری ناوبراویش بەردەوام دەمێنێتەوە، هەروەك چۆن ئەم بارودۆخە لەفاس و بجایە لەووڵاتی مەغریب و عێراقی عەجەم لەشارەکانی خۆرهەڵاتدا دەبینرێت کەخاوەن دێهاتی کوێستانین. چونکە کاتێك دەشتەکیەکان لەڕووی ئاسایش و خۆشگوزەرانی و داراییەوە (بەهۆی کەسابەت و بازرگانی) بگەنە ئامانجی خوازراوی خۆیان، ئەوکات شەوق و ئارامش و شارنشینی کەلەتەبعەکانی مرۆڤ دەژمێردرێت لەواندا هەڵدەستێتەوە و دەچنە شارە بچوك و گەورەکانەوە و تێیاندا دەژین، بەڵام ئەگەر شارێکی نوێ خاوەن وەها هەلومەرجێك نەبێت کەبەشێوەیەکی بەردەوام لەدەشتەکیەکان ڕووی تێنەکەن و کۆمەڵگەکەی ڕوولە فراوانی نەکات و دانیشتوانی زۆرنەبن، ئەوکات لەناوچوونی خاندانی ئەودەوڵەتە (دامەزرێنەران) وەك لەناوچوونی بناغەی ئەودەوڵەتەن و هێندە نابات کەهۆکارەکانی مانەوەی لەناودەچن و وردە وردە ئاوەدانی کۆمەڵگەی کەم دەبێتەوە دانیشتوانەکەی پەراگەندە دەبن و دەڕووخێت. هەروەك چۆن شارەکانی میسر (قاهیرەی کۆن) و بەغدا وکوفە لەخۆرهەڵات و قەیرەوان و قەلعە و مەهدیە و قەلعەی ئیبن حەماد لە خۆرئاوا دووچاری ئەم چارەنوسە بوونەوە. کەواتە دەبێت ئاگاداری ئەم ڕاستیانەبین و دەرکیان بکەین.

هەرچەندە لەپاش لەناوچوونی دامەزرێنەرانی شارێك پاشاو خاندانێكی تر دەبنە فەرمانڕەوا و دەیكەنە پایتەختی دەوڵەتەكەی خۆیان و پێویست ناكات، شارێكی تر بۆ ئەومەبەستە بنیات بنێن‌و لەهەوڵی بەردەوامدا دەبن بۆ پێشكەوتن و ئاوەدانیەكەی و زۆركردنی سەروەت و سامانەكەی و دەبینین بیناو باڵەخانەكان و گوندو شارۆچكەكانی دەوروبەری زۆر دەبن و، شێوازێكی نوێ لەئاوەدانی كۆمەڵگەو ژیان و مانەوە دێتە ئاراوە، هەروەك چۆن ئەم هەلومەرجە لەشارەكانی فاس و قاهیرەدا بەدی هاتوون. لەم حەقیقەتانە پەند وەربگرە و نهێنیەكانی خودا لەئافرێنراوەكانیدا بدۆزەرەوە.

# بەشی دووەم

## لەبارەی ئەوەی کەهەرکات هۆزگەلێك توانیان دەوڵەت دا بمەزرێنن ئەمەدەبێتەهۆی ئەوەی کە ڕوویکەنە شارە گەورەکان

چونکە هەرکاتێك هۆزو گروپە دەشتەکیەکان بگەنە پاشایەتی دووشت وایان لێدەکات کەدەست بەسەر شارە گەورەکاندا بگرن: یەکێکیان ئەو هۆکارەیەکە پاشایەتی دەوڵەتداری والەمرۆڤ دەکات کەخوازیاری ئاسایش و ئارامی و نیشتەجێ بوون و وەلانانی باری قورسی بیابان گەڕی و، دەشتە کیەتی و تەواو کردنی ئەو کەم و کورتیانەی کەلەژیانی دەشتەکیەتدا بوونیان هەبووە. دووەم لەبەرچاو گرتنی ئەو مەترسیانەی کەلەوانەیە بەهۆی داگیرکەرانەوە ڕوولەدەوڵەت بکات، چونکە ئەوشارەگەورەیەی کەلەنزیك ناوچەکانی هەردەوڵەتێکدابێت ئەگەر بێت و ئەو دەوڵەتە داگیری نەکات ئەوا بەزۆری دەبێتە پەناگەی داگیر کەرو ئاژاوەچیەکان و، ئەوانەی کەئاوازی ئاژاوەچیەتی و داگیر کاریان هەیەو ئەیانەوێت دەسەلآت بگرنەوە دەست و ئەو شوێنە بۆزاڵبوون بەسەر دەوڵەتدا وەك قەلآیەکی پارێزراو سەیر دەکەن، چونکە داگیرکردنی شارێکی گەورە وەك جەنگکردنە لەگەڵ سوپایەکدا و زۆر قورس و ئاستەمە، چونکە جەنگاوەران و بەرگریکاران لەشار لەشوێنەبەرزەکانی قەلآی شارەکە و شوێنە مەحکەمەکاندا دەجەنگنو بەرگری دەکەن و پێویستیان بەسوپاو لەشکری گەورەنیە، چونکە پێویست بوونی لەشکر لەجەنگە ڕووبەڕووەکاندایە و لەکاتی هێرش بۆسەر دووژمن گروپەکانی سوپا جێگۆرکێیان پێدەکرێت، ئەمەلە کاتێکدا ئەو بورج و پەناگەو قەلآیانە وەك باشترین

پشتیوانن بۆ جەنگاوەرانی ئەو شارە و هەلومەرج و بارودۆخی ئەو شارە پێویستی بەجەنگاوەرو لەشکری زۆر نیە و دەبێتە کەمەرشکێنی هێزی هێرشبەر و هێزی ئەودەوڵەتەی کەئەیەوێت ئەو شارە داگیر بکات سەرکوتی دەکات. هەربۆیە دەبینین هەرکات دەوڵەتێك دروست ببێت بەبێ وەستان ناوچەکانی دەوروبەری داگیر دەکات بەپێی توانای خۆی بۆ ئەوەی رێگری لەدروستبوونی پەناگەبکات بۆ ئاژاوەچی و، هەلگەڕاوەکان و خۆیانی لێدەپارێزێت. وەهەرکات لەنێو ئەوهۆزانەی کەوابەستەن بەو دەوڵەتەوە شارێکی گەورە بوونی نەبێت دەوڵەتی ناوبراو بەناچاریەوە لەبەر دووهۆکار دەست دەکات بەبنیاتنانی وەها شارێك: یەکەمیان کاملکردنی کۆمەلگەکەی خۆیی و داگرتنی باری قورسی دەشتەکیەتی لەسەر شانی خەلکەکەی. دووەمیش وەك بەربەستێکی گەورەیە لەبەردەم ئەوانەی کەتیازی هەلگەڕانەوە و ئاژاوەچیەتیان هەیە لەهۆزو نەتەوەکانی پەیوەست بەخۆیەوە.

کەواتە دەرکەوت کەدامەزراندنی دەوڵەت و پاشایەتی و خوێندنەوە و تێگەشتن لەهۆزەکان هاتنە ناو شارەکانە وداگیر کردنیانە، خوداش زاڵە بەسەر کارەکانیدا.[٢]

[٢] (وَاللهُ غالِبٌ عَلى أمرِهِ) س یوسف ئا ٢١.

# بەشی سێیەم

## لەبارەی ئەوەی کە شارە گەورە و بینابەرزو بەشکۆکان پاشاگەورەکان بنیاتیان دەنێن

لەبەشەکانی پێشودا لەبارەی یادگاری دەوڵەتەکان وەك بیناو باڵەخانەکان و نمونەی ئەمانەمان باسکرد، کەئەم جۆرە ئاسەوارانە بەپێی گەورەیی و بچوکی دەوڵەتەکان بنیات نراون. لەوڕووەوەی کە دروستکردن و بنیاتنانی شارەکان بەهۆی هاوکاری و هەرەوەزی گروپە گەورەکانی کرێکارانەوەیە، هەربۆیە هەرکات دەوڵەتێك گەورەبێت و فەرمانڕەوایی بەسەر ناوچە فراوان و دوردەستەکانەوە بکات کرێکاران لەناوچەکانی ترەوە دەهێنێتو بەهاوکاری ئەمان هێزێکی کاری گەورە دروستدەکات. هەرچەندە بۆ ئەم جۆرە بینایانە زیاتر سود لەمەکینە و ئامێری هەڵگرتن و بارکردن وەك سڵنگی ئەوسەردەمە وەردەگیرێت بۆ بەرزکردنەوەی بارە قورس و سەنگینەکان و ئەو کێش و وەزنانەی کەمرۆ توانای هەڵگرتنیانی نیە، زۆرێك لەخەڵکی کاتێك یادگارەکانی پێشینان و بیناو باڵاخانە بەرزەکانیان دەبینن، وەك ئیوانی کیسرا و هەرەمەکانی میسر و تاقە هەڵواسراوەکانی شەرشال لەمەغریب وادەزانن کەئەم بینایانەیان بەهێزو دەسەڵاتی خۆیان ئیتر بەشێوەی پەراگەندەیان بەشێوەیەکی بەکۆمەڵ دروستیان کردووە و، پێیانوایە ئەم جۆرە کەسانە جەستەو ئەندامێکیان هەبووە کەلەڕووی درێژی و پانیەوە گونجاوبووە لەگەڵ ئەم بینایانەدا بۆ ئەوەی گونجانێك لەنێوان بیناکان و بنیاتنەرەکانیاندا دروستبکەن و لەگرنگی ئامێرەپیشەسازیەئەندازیاریەکانی هەڵگرتنو، بەرزکردنەوە کەم بکەنەوە

کەلەدروستکردنی ئەم بیناو باڵەخانەنەدا بەکارهاتوون و بێئاگابوون، زۆرێك لەو خەڵکانەشی کەلەناوچە غەیرە عەرەبیەکاندا گەڕاون و هاتووچۆیان کردووە چۆنیەتی دروستکردن و بەرزکردنەوەی ئەو کەرەستەقورسانەیان بەهۆی ئەو ئامێرانەوە بینیوە کەلەدروستکردنی بیناوباڵەخانەکاندا بەکار هێنراون و شاهێدی ئەم قسەیەی ئێمەن. زۆربەی خەڵکیش زۆرێك لەیادگارو ئاسەوارەکانی ڕابوردوان، کەتاوەکو ئێستەش ماونەتەوە دەیدەنە پاڵ قەومی عاد و پێیان دەڵێن عادی، چونکە وادەزانن کەبیناو باڵەخانەکانی قەومی عاد بەهۆی گەررەیی جەستەیان و بەهێزیانەوە کەچەندین بەرابەری تواناو هێزی خەڵکی ئەم سەردەمەبووە دروستکراون.

ئەمە لەکاتێکدا ڕاستەقینە بەم جۆرە نیە چونکە ئێمە شوێنەوارگەلێکی زۆرلەنەتەوەکان دەبینین کە ئاگاداری جەستەیانین و دەزانین جەستەیەکی گەورەشیان نەبووە و لەکارە ئەندازیاریەکانی قەومی عادیش گەورەترو بەرزتر بوون وەك کۆشکی کیسرا و خانووەکانی عەبیدیەکانی شیعە لەئەفریقا[٤]، وەصەنهاجیان کەیادگاریان لەصەومەعەی قەڵای ئیبن حەماد ئاشکرایە و هەروەها بیناکانی ئەغلەبیەکان لەمزگەوتی جامیعەی قەیرەوان و بینای مووەحیدان[٥] لەڕیبات الفتح[٦] بینای سوڵتان ئەبو سەعید کەلەچل ساڵ لەمەوبەرەوە لەمەنصورە لەبەرامبەر تلمسانەوە دروستکراوە.

وەهەروەها جسرگەلێك کەخەڵکی تاژ بەهۆیانەوە ئاو دەگەیەننە شارەکەیان کەتاوەکو ئێستەش ماوە وەهەواڵی بیناو باڵەخانەکان و، پەرستگاکانی تر کەبەپێی هەواڵی بنیاتنەرەکانیان ئیتر لەسەردەمە دورەکاندا بێت یان نزیك ئاگادار بووینەتەوە بەشێوەیەکی تەواو زانیومانە کەبنیاتنەرانی بینا ناوبراوەکان لەڕووی ئەندازەو قەبارەوە

---

[٤] مەبەست بەهێزیەکانی شاری مەهدیەو ئەوحەوزانەیە کەبیکری جوگرافی زانی کۆن باسی کردوون کەتاوەکو ئێستەش لەبەرامبەر قەیرەوانەوەیە(حاشیەی دسلان).

[٥] منارەیەکە کەتاوەکو ئێستەش ماوە و کەوتووەتە دووری هەشت فەرسەخی شاری مسیلەوە.

[٦] شارێکە لەکەناری چەپی بورگریدایەڕووبەڕووی سلە کەکۆنترین پایەگەلێکە کەهێشتا ماوە (دسلان٢٤٢ج٢).

لەقۆناغی زیادەڕەویدا نەبوون، بەڵکو ئەم بیروباوەڕە دروستکراوی ئەفسانە سازانێکە کەزۆر حەزیان لەباسکردنی مێژووی قەومی عادو سەموودو زلهێزەکانە کەلەم سەردەمەشدا ئێمە خانووە تاشراوەکانیان لەبەرد دەبینین. لەحەدیسی صەحیحیشدا سەلمێنراوە کەئەوانە شوێنی ژیانیان بووە کاروانەکانی حیجاز لەزۆربەی ساڵەکاندا لەبەرامبەریانەوە تێدەپەڕن و، تێبینی ئەوە دەکەن کەلەڕووی ڕووبەر و بەرزایی و زەویەوە لەخانووە ئاساییەکان زۆرجیاوازن و، بەڵکو ئەفسانەسازان لەم بارەیەوە زیادە ڕەوی دەکەن تەنانەت دەڵێن کەعەوجی کوڕی عناق لەنەوەی عەمالیقە ماسی تازەیان لەدەریادا دەگرت و لەبەرامبەر خۆرەوە هەڵیان دەخست و، بەو هۆیەی کەپێیان وابووە کەهەرچەندە لەخۆر نزیك ببنەوە گەرمتر دەبێت و نازانن ئەوگەرمایەی کەلەلای ئێمە لەخۆرەوە وەردەگیرێت بریتیە لەنورێك. کەبەهۆی پێچەوانە بوونەوەی تیشکەکانیەوەیەتی لەبەرامبەر سەرڕووی زەوی و هەوا گەرم دەبێت.

بەڵام خۆر لەزاتی خۆیدا نەساردەو نەگەرمە و بەڵکو بریتیە لەئەستێرەیەکی ڕووناك کەمیزاج و پێکهاتەیەکی نیە، ئێمەش لەم بارەیەوە لەبەشی بابی دووەمدا باسمانکرد و گوتمان: شوێنەوارەکانی دەوڵەت بەنیسبەت هێزەکەیەوە لەڕیشەو ئەصڵی ئەودایە، خوداش ئەوەی کەبیەوێت دەیئافرێنێت[٧] وەفەرماندەکات بەوەی کەبیەوێت.

---

[٧] (یَخلُقُ مایَشاء) س ال عمران ئا ٢٤.

# بەشی چوارەم

## لەبارەی ئەوەی کەشوێنەوارو بینا بەرزو زۆرگەورەکان لەسەردەمی یەك دەوڵەتدا بەتەنهایی بنیات نانرێت

چونکە هەروەك باسمانکرد دروستکردنی ئەم جۆرە بیناگەورانە بەئەندازەیەك گەورەیە کەبەهێزە مرۆییەکان هەرچەندە بەئامێرو هۆکارەکانی بەرزکردنەوەی قورسایی و هێزەتاکەکان، یان زیادە ئەنجام بدرێت لەسەردەمی سوڵتانێکدا ناگاتە کۆتایی هەروەك گوتمان پێویستی بەهێزەکانی تر بەهەمان ئەندازە لەسەردەمەیەك لەدوای یەکەکاندا هەیە تاوەکو بگەنە کۆتایی، ئەمەیە کەپاشای یەکەمین یەکەم پایەگوزاریەکەی دەست پێدەکات و پاشای دووەم و سێیەم بەردەوام دروستکردنی بیناکەی درێژە پێدەدەن و هەریەکەلەوان بیناکەی بەهۆی کرێکارگەلێکی زۆرو، هەرەوەزی گروپگەلێکی زۆرگەورە کامڵی دەکەن تاوەکو مەبەستی بنەڕەتی دێتەدی و بیناکردنەکەی کۆتایی دێت. بەپێی گێڕانەوەی مێژوونوسان لەبارەی بینای سەدی مەئرەبەوە[٨] باسی بکەین، کەچۆن سەبأی کوڕی یەشجب دایمەزراند و حەفتا ڕووباری بەرەو ئەو ڕۆکرد بەڵام مەرگ بواری ئەوەی نەدا کەبیگەیەنێتە کۆتایی هەربۆیە پاشاکانی حەمیر لەپاش ئەو تەواویان کرد. هاوشێوەی ئەمەش لەبارەی بینای قرتاجنەوە (کارتاژ) وکاریزەکەی کەلەسەر تاقە

---

[٨] واتە وولات و شارەکانی تزد.

عادیەکان[٩] دروستکراوە دەگێڕنەوە. زۆربەی بیناگەورەکان بەئیحتیمالی بەهێز بەم شێوەیەن بەڵگەش لەسەر ئەوە ئەو خانووە گەورانەیە کەلەسەردەمی خۆماندا دەبینرێن‌و دەبینین کەیەك پاشا دەستدەکات بەدروستکردنیان و، ئەگەر پاشاکانی دوای ئەو کارەکەی تەواو نەکەن بەناتەواوی دەمێنێتەوە و کامڵ نابێت. وەهەم بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە دەبینین زۆرێك لەشوێنەوارەکان و بیناگەورەکانی پێشینان بەئەندازەیەك پایەدارن کەیەك دەوڵەت توانای وێرانکردنیانی نیە، هەرچەندە ڕووخاندن لەدروستکردن ئاسانترە، چونکە وێرانکردن و گەڕانەوە بۆ سەرەتا یان بینا نەکردن بەپێچەوانەی ئەو ئەصڵەوەیە. کەواتە هەرکات بینیمان کەهێزەمرۆییەکان توانای وێرانکردنی بیناگەلێکیان نەبێت، ئەوا بەدڵنیاییەوە لەدروستکردنیاندا هێزێکی مرۆیی لەڕادەبەدەر بەکار هاتووە و شوێنەواری تەنها دەوڵەتێك نیە.

ئەمەش وەك ئەو ڕووداوە وایە کە لەپاش داگیر کردنی کۆشکەکانی کیسرا، کاتێك ڕەشید ویستی بیانڕوخێنێت و نامەیەکی نارد بۆ یەحیای کوڕی خالد کەلەزینداندابوو بۆ ئەو مەبەستەو ئەویش لەوەڵامدا گوتی ئەی ئەمیر المومنین کارێکی لەو جۆرە مەکە و، وەك ئاسەوارێك بیهێڵەوە بۆ ئەوەی وەك گەورەیی پێشینانتان بمێنێتەوە کەبەچ شێوەیەك بەسەر خاوەنی ئەم جۆرە بیناو باڵەخانانەدا زاڵبوون و داگیریان کردووە، بەڵام ڕەشید بەخۆشویستنی ئێرانیەکان تۆمەتباری کردو پێشنیارەکەی قبوڵ نەکرد و سوپایەکی بێشوماری ئامادەکرد و، سوێندی خوارد کەهەردەبێت وێرانیان بکەم و تەورگەلێکی زۆریان لەئاگردا سوردەکردەوە بۆ ئەو مەبەستە بەکار هێناو سرکەیان دەڕشت بەبیناکاندا و دەستیانکردە ڕووخاندنیان، بەڵام لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا نەیتوانی وێرانیان بکاتو، دیسانەوە کەسێکی ناردەلای یەحیا بۆئەوەی ڕاوێژی لەگەڵدا بکات، بەڵام ئەمجارەیان یەحیاگوتی ئەی ئەمیرالمومنین لەکارەکەت پەشیمان مەبەرەوە بۆئەوەی خەڵکی نەڵێن ئەمیرالمومنین و پاشاکانی عەرەب نەیانتوانی یەکێك لەبینا

---

[٩] مەبەست قەومی عادە و کینایەیە لەکۆنەیی و قەدیمی بوونیان.

ئاسەواریەکانی ئێرانیەکان بڕوخێنن، بەڵام ڕەشید پەی بەوە بردبوو کەناتوانێت وێرانیان بکات هەربۆیە دەستی لەوکارە هەڵگرت. ئەم بەسەرهاتەش بۆ مەئمون ڕوویدا کەویستی ئەهرامەکانی میسر بڕووخێنێت و کرێکارگەلێکی زۆری کۆکردەوە بۆ ئەوکارە بەڵام سودی نەبوو نەیتوانی، کاتێك دەستیانکردە کونکردنیان و سەرئەنجام لەپشتی دیوارەکانەوە بۆشایی بوو دواتر دیسانەوە دەبویەوە بەدیوار، هەربۆیە تائەو شوێنە توانیان ئەوکارە بکەن و نەیانتوانی بیانڕووخێنن، هەروەك دەڵێن ئەو بەشە تاوەکو ئێستەش دیارە. هەندێکیش پێیان وایە کەلەنێوان دیوارەکاندا گەنجینەگەلێك دۆزراونەتەوە خوداش داناترە. هەروەها جسرە هەڵواسراوەکانی کارتاژ کەتاوەکو ئەم سەردەمەش خەڵکی شاری تونس پێویستیان بەبەردەکانیانە بۆ دروستکردنی خانووەکانیان و پیشەگەران بەردەکانیان بۆ کاروپیشەکانیان بەکارهێناوە، هەربۆیە چەندەها ڕۆژ سەرقاڵی ڕووخاندنیانن بەڵام بچوکترین دیواریان تاوەکو ئێستە نەڕوخێنراوە مەگەر لەپاش ئەزیەت و ئازارێکی زۆر. وەبۆ وێرانکردنیان کۆمەڵەگەلێکی بەناوبانگ کۆدەبنەوە، هەروەك چۆن من لەسەردەمی منداڵیمدا زۆرێك لەوانم بینیوە. خوداش بەتوانایە بەسەر هەموو شتەکاندا[١٠].

---

[١٠] (وَاللهُ عَلى كُلِّ شَيءٍ قَدِير) س ال عمران ئا ٢٩. (وَاللهُ خَلَقَكُمْ وَما تَعمَلُون) س الصافات ئا ٩٣.

# بەشی پێنجەم

## لەبارەی ئەو شتانەی کەڕەچاوکردنیان لەدروستکردنی شارەکاندا پێویستە ئەو دەرئە نجامە خرا پانەی کەڕوودەدەن ئەگەربێت و ئەو شتانە لەبەرچاو نەگیرێن

دەبێت ئەوەبزانین کەشارەکان جێگەی مانەوە و بنکەگەلێکن کەنەتەوەکان لەپاش گەشتنیان بەکەماڵ و تەواوی جێگردەبن و، بەهێمنی ئارامیەوە دەژین و واز لەکۆچکردن دەهێنن و بۆشوێنی نیشتەجێ بوونیان خانو باڵەخانەکان دروستدەکەن. وەلەبەر ئەوەی کەئەم شارانە وەك شوێنی مانەوە و پەناکە دادەنرێن دەبێت تێیاندا ڕێگە لەزەرەرو زیانەکان بگیرێت، وەك پاسەوانی بۆ ڕێگری کردن لەدزەکان و هێرشبەران، و بەدەستهێنانی چاکە ودورخستنەوەی خراپە و چاککردن و ئاسانکردنی ئاوو ئاوەڕۆ و نمونەی ئەمانە. هەروەك چۆن بۆ پاسەوانی لەشارەکان شورەو حەصار دروستدەکرێت و هەمیشە هەوڵی ئەوە دەدەن کەلەبەرزترین شوێندا شارەکان دروستبکەن، وەك کێوو تەپۆڵکەکان کەسەرکەوتن بۆیان زۆرئاستەم بێت، وەیان لەشوێنێکدا بێت کەلەهەموولایەکەوە دەریا یان ڕووبارێك دەورەی دابێت کەتەنها لەڕێگەی پرد و جسرە بچوکەکانەوە نەبێت کەس نەتوانێت پێیان بگات و پێیاندا تێپەڕبکات و گەشتن بەو شارانە بۆدووژمن زۆرئاستەم بێت و، پاراستنی و پایەداریەکەی لەڕێگەی ناوچەیەکی سروشتیەوە دەبێت. لەوخاڵانەی کەبۆ پارێزگاری ئەو لەئافەتەئاسمانیەکان ڕەچاو دەکرێت خۆشی هەوایە بۆ سەلامەتی و دوریە لەنەخۆشیەکان، چونکە ئەگەر هەواوەستاو ناپاك بێت یان شارەکەلەنزیك ئاوە خراپ و حەوزەبچوکە ناتەندروستەکان یان لەوەرگە

ناپاك و پیسەکانەوەبێت بەم هۆیەوە بۆگەنی ڕوودەکاتە ئەو شارە و لەئەنجامدا بوونەوەرە زیندووەکان یان گیانەوەرەزیانبەخشەکانی زۆردەبن و بەخێرایی خەڵکەکەی دووچاری نەخۆشی دەبنەوە، هەروەك چۆن ئەم بارودۆخە لەهەندێك ناوچەدا دەبینین، وەئەوشارانەی کەڕەچاوی پاکی هەواکەیان ناکرێت سەرئەنجام دانیشتوانەکانیان دووچاری چەندین نەخۆشی جۆراو جۆر دەبنەوە، وەشارێك کەبەم سیفەتەوە لەناوچەی مەغریبدا بەناوبانگە، بریتیە لەشاری قابیس لەناوچەکانی جەرید لەئەفریقا کەدەتوانین بڵێین دانیشتوانەکەی یان ئەوانەی کەدێنەناویەوە بەهیچ شێوەیەك لەچنگی تای بۆگەنی ڕزگاریان نابێت. هەروەك دەڵێن ئەم بارودۆخە دواتر لەو شارەدا ڕوویداوە و لەسەرەتاوە بەو شێوەیە نەبووە.

بیکری لەهۆکاری دەرکەوتنی نەخۆشی ناوبراو گوتوویەتی: لەشاری قابیسدا چاڵێك هەیە کە لەناویدا دەفرێکی مسین هەبووە و بەقەلع سەرەکەیان گرتووەو هەرکە لایان بردووە دوکەڵێك بەهەوادا بلاّو بووەتەوە دواتر تەواو بووە ئەم ڕووداوەش سەرەتای نەخۆشیە تادارەکانە لەوشارەدا. مەبەستی بیکری لەم چیرۆکە ئەوەیەکەلەو دەفرەدا کۆمەڵێك کرداری تەلیسمدار بۆ ڕێگری لەو نەخۆشیە گوازراوانە لەو شارەدا ئامادەکرابوو، لەئەنجامی نەمانی ئەو هەڵمەدا ئەو تەلیسمەش لەناوچووە دیسانەوە شارەکە دووچاری پەتاو بەلاّکە بووەتەوە. ئەمەلەکاتێکدا ئەم ئەفسانەیە لەبیرو فیکرە پەست و نەفامانەکانی خەڵکیە. بیکریش خاوەنی ئەوئەندازە زانست و زانیاری و ئەندیشەو بینابیەنەبووە کەوەها ئەفسانەیەك ڕەت بکاتەوە و خورافی بوونەکەی ئاشکرابێت بۆی، هەربۆیە هەربەوجۆرەی کەئەفسانەکەی بیستووە گێڕاویەتیەوە. ئەمەلەکاتێکدا ئەوەی کەئەم جۆرە هەوا بۆگەنانەی کەبۆ بۆگەنپێکردنی تەنەکان و نەخۆشیە تاهێنەرەکان ئامادە دەکات بریتیە لەوەستانیان، کەئەگەربێت با هەڵبکات و ئەو هەوایانە بەڕاست و چەپ ودا بلاّویکاتەوە ئەوا چۆنیەتی ئەو بۆگەنکردنەی کەحەیوانات دووچاری نەخۆشی دەکات کەم دەکاتەوە. وەهەرکاتێك شارێك دانیشتوانەکەی زۆربن و هاتووچۆی تێدا

زۆربێت بمانەوێت و نەمانەوێت هەواکەی شەپۆلدەدات و ئەوهەوایانەی کەهەوا وەستاوەکان دەجولێنن دروستدەبن، کەواتە دانیشتوانی زۆری هەرشارێك دەبێتەهۆی جولاندنی هەواکەی. بەپێچەوانەشەوە ئەگەر شارێك دانیشتوانەکەی کەم بێت ئەوا هۆکارێك بۆ جولەی هەوا نابینرێت و لەئەنجامدا هەواکە دەوەستێت و بۆگەنیەکەی زۆر دەبێت و زیانێکی گەورە بەدانیشتوانەکەی دەگات.

شاری قابیسی ناوبراو لەوکاتەی کەئەفریقا پڕبووە لەدانیشتوان و بەهۆی جولەو هاتووچۆی دانیشتوانەکەیەوە لەم لاوە بۆ ئەولاو هۆکارەکانی جولەی هەوا فەراهەم بوبو کەمتر هەواکە زیانی بەخەڵکی دەگەیاند بەلام هەرکە دانیشتوانەکەی کەم بوونەوە هەوای بۆگەنی شار بەهۆی لەناوچوونی ئاوەکانیەوە لەئەنجامدا بۆگەنی و نەخۆشی بلاو بووەتەوە هۆکاری نەخۆشی لەشاری قابیسدا تەنها ئەمەبووە ئێمەش پێچەوانەی ئەم بارودۆخەمان بەئەزموون بینیوە. ئەوشارانەی کەلەکاتی بنیاتنانیاندا ڕەچاوی پاکی و باشی هەوایان تێدا نەکراوە دانیشتوانەکانیان کەم بوون نەخۆشیەکی زۆریان تێدا هەبووە. وەهەرکە دانیشتوانەکەیان زیادی کردووە کەش و هەوایان گۆڕاوە و هەوای زیانبەخشیان گۆڕاوە بۆهەوایەکی پاك و بەسود، نمونەی ئەوشارانەش شاری پایتەختی ئێستەی فاسە کەپێی دەڵێن شاری نوێ (البلد الجدید) کەلەجیهاندا هاوشێوەی ئەو زۆرن و لەم خاڵە بەباشی تێبگە و حەقیقەتی قسەکەمانت بۆ دەردەکەوێت. ئێستە دەبینین هێندەی نەبردووە کە هەوای خراپبوو بۆگەنکردووی شاری قابیس نەماوە چونکە لەوکاتەی کەسوڵتانی تونس گەمارۆی داو دارخورماکانی بڕییەوە و، دەوری چۆڵ بوو هەواکەی ئازاد بوو شەپۆلیدا و هەواکەوت و هەوا بۆگەنکردووەکەی لەناوچوو، خوداش هەڵسوڕێنەری کارەکانە. بەلام بۆ دابینکردنی مەنافع ومرافق[11] دەبێت ئەم چەند خاڵە لەبەرچاو بگرین: لەوانەش ئاو کەدەبێت شار لەکەنار ڕووبارێك یان لەبەرامبەر کانی و کارێزەکانەوە دروستبکرێت چونکە نزیك بوونی ئاو لەشارەوە پێداویستیەکانی

---

[11] شوێنی هەڵگرتنی ئاوو بەفر.

دانیشتوانەکەی دابیندەکات لەبەرئەوەی ئاو یەکێکە لەپێداویستیەکانی ژیانی خەڵکی بەگشتی کەسودێکی زۆری لێوەردەگرن.

یەکێکی تر لەو شتانەی کەدەبێت لەشارەکاندا ڕەچاو بکرێت پاکی وباشی لەوەڕگاکانی حەیواناتیماڵیە چونکە دانیشتوانی هەرشوێنێك ناچارن کەحەیوانەماڵیەکان بەخێو بکەن بۆ زاوزێ و سود وەرگرتن لەبەرهەمەکانیان، وەك سواری و باربردن و چەندان شتی تر سودیان لێوەردەگرن هەربۆیە دەبینین پێویستیان بەلەوەڕگەکان هەیە پێویستە لەنزیك ئەو شارەوە لەوەڕگەی باش و بەپیت هەبێت و، ئەمەش وادەکات کەبۆخەڵکەکەش سودێکی زیاتری هەبێت لەوەی کە لەشوێنەدوورەکانەوە ئالیك و خۆراکیان بۆ دابین بکەن. یەکێکی تریش لەو شتانەی کەدەبێت ڕەچاو بکرێت کێڵگەو کشتوکاڵەکانە چونکە کێڵگەو ڕەزەکان هۆکارن بۆ دابینکردنی قوتی ڕۆژانەی خەڵکی هەرکات کێڵگەکان لەشارەوە نزیك بن ڕۆزی و قوتی ڕۆژانەی خەڵکی نزیکترو ئاسانتر دەگاتە دەستیان. خالێکی ترکەپێویستە بۆ شوێنی دروستکردنی شار بریتیە لەدارو درەختی فراوان بۆ سوتاندن و بەکارهێنانی لەژیانی ڕۆژانەی خەڵکی ئەو شارەدا، چونکە داری سوتاندن لەپێویستیەکانی گشتیە کەبۆ سوتاندن و کولاَندنی خۆراکەکان پێویستە هەروەها بۆ دروستکردنی خانو، بەتایبەت سەقفی خانوو باڵەخانەکان پێویستیەکی هەنوکەییە و بۆ زۆرێك لەشتی تر بەکار دێت.

هەندێك جاریش بیر لەوە دەکرێتەوە کەشار دەبێت نزیکی دەریابێت بۆ ئەوەی پێداویستیەکانی دانیشتوانەکەی لەوەوە دابینبکرێت و، پەیوەندیەکانیان ئاسانتر ببێت بەلاَم ئەم شتەلەڕووی گرنگیەوە وەك خاڵی یەکەم نیە. هەمووئەم شتانەش بەپێی پێویستی ناوچەکان جیاوازن. هەندێك جاریش دامەزرێنەرانی شار لەدیاری کردنی شوێنی باشی شاردا هەڵەدەکەن و تەنها شتانێك ڕەچاو دەکەن کەبۆ داروودەستەی خۆیان گرنگ بێت و گوێ نادەنە پێداویستیەکانی خەڵکانی تر. هەروەك چۆن غەزاکەران لەسەرەتای ئیسلامەوە ئەو شارانەی کەلەعێراق و حیجاز و ئەفریقادا بنیاتیان نان لەدروستکردنیاندا

تەنها ئەو خالآنەیان ڕەچاو کرد کەبەلای خۆیانەوە گرنگتر بوون، وەك لەوەڕگەی حوشتر و درەختی تایبەت بەئالیکی ئەوان و ئاوی سوێر، بەهیچ شێوەیەك بارودۆخی ئاوی شارو کێڵگەو پێداویستیەکانی سوتاندنی ڕۆژانە لەدارو درەخت و، لەوەڕگەی حەیوانەکانی تری بێجگە لەحوشترو پێداویستیە گشتیەکانیان ڕەچاو نەکرد وەك شارەکانی قەیرەوان و کوفە و بەصرەو سجلماسەو نمونەی ئەمانە، هەربۆیە شارە ناوبراوەکان نزیکترن لەوێرانیەوە چونکە شتە سروشتیەکان لەدروستکردنیاندا ڕەچاو نەکراوە.

## بەشێك

لەو خالآنەی کەلەشارەکانی کەنار دەریاکاندا ڕەچاو دەکرێت ئەوەیە کەدەبێت لەناوچەکوێستانی و یان لەنێو نەتەوەیەکی پڕلە دانیشتواندا دروستبکرێن، بۆئەوەی کەکاتێك دووژمن بەشەودا دەدات بەسەریاندا وەك پەناگەیەك وابێت بۆیان، چونکە ئەگەر شارێك لەکەنار دەریادا بنیات نەنرێت و کومەڵگەیەکی خاوەن عەصەبیەتی بەهێزی تێدا نەبێت وەیان لەکوێستانێکی سەختو بەرزدا دروست نەکرێت، ئەو کات لەبەردەم مەترسی پەلاماری کتوپڕی دوژمن و داگیرکەراندا دەبێت و داگیر کردنی لەلایەن دووژمنەوە و بەهۆی هێزی دەریاییەوە ئاسانتر دەبێت و، هەندێك لەناوچەکەناریەکانی دەکەوێتە دەستی دووژمنەوە، چونکە دووژمن لەبوونی فریادڕەسێك بێخەمە (بۆئەوەی لەکاتی هێرشی دوژمندا لەهەرلایەکەوە یارمەتی شارەکەبدەن)، ئەوشارنشینانەشی کەفێری هێمنی خزمەتکردنی خۆیان بوون هەستی بەرگری جەنگ لەدەست دەدەن ناتوانن شەڕ بکەن. وەك ئەسکەندەریە لەخۆرهەڵات و تەرابلس لەخۆرئاوا و شارەکانی بوونە و ڤیسلا. بەلآم کاتێك کەهۆزو عەصەبیەتەکان لەنزیکیەوە بن لەکاتی پێویستدا بەهانایەوە بێن وەهەروەها بەهۆی دروستکردنیەوە لەسەر تەپۆڵکەو شوێنە بەرزەکان تێپەڕینی دووژمن بەڕێگاکانیدا بۆ دوژمن زۆر ئاستەمە، ئەو کات ئەم بارودۆخە وەك

پاسەوان وایە لەبەرامبەر دوژمنانەوە و بیٚ ئومێد دەبن لەداگیر کردنی و توشی ئازارێکی زۆر دەبن ئەگەر بیانەوێت هێرشی بۆ بکەن. هەروەك چۆن سیبتە و بجایە و شاری قل لەگەڵ بچوکیەکەیاندا ئەم سیفەتەیان هەیە و داگیرکردنیان زۆر دژوارە. لێرەوە دەتوانین لەوە تێبگەین کەبۆچی ئەسکەندەریەیان لەسەردەمی عەباسیەکاندا بەسنور ناوزەد کراوە لەگەڵ ئەوەی کەدەوڵەتی ئیسلامی گەشتووەتە پشتەوەی ئەویش وەك برقە و ئەفریقا، چونکە ترسی ئەوە هەبوو کەئەم ناوچانە بەئاسانی لەلایەن دوژمنانەوە داگیر بکرێن لەرێگەی دەریاوە، هەربۆیە خوداش داناترە لەسەردەمی دەسەلاتی ئیسلامیدا شارەکانی تەرابلس و ئەسکەندەریە چەندیە جار کەوتونەتەبەر هێرشەوە.

# بەشی شەشەم

## لەبارەی مزگەوت و بەیتە[12] گەورەکانی جیهانەوە

دەبێت ئەوە بزانین کەخودای گەورە هەندێك شوێنی لەم سەرزەویەدا بەرێزو گەورە باسکردووە و خستونیە بەر چاودێری و عینایەتی زاتی خۆیەوە، کردونی بەشوێنی پەرستشی خودا کەخێرو پاداشتی پەرستش تێیاندا چەندین بەرابەری شوێنەکانی ترە و ئەمەش لەرێگەی نێردراوان و پێغەمبەرانەوە بەئێمەی گوتووە بۆئەوەی بەندەکانی خۆی بخاتە بەرڕەحمەتی خۆیەوەو رێگەکانی بەختەوەریان بۆ ئاسان بکات. هەروەك دەزانین و لەصەحیحەینیشدا هاتووە باشترین شوێنەکانی سەرزەوی سێ مزگەوتەکەی مەککە و مەدینە و بیت المقدسەو، بیت الحرام کەلەمەککەدایە هەمان ئەو ماڵەی ئیبراهیمە (ع) کەخودا فەرمانی دروستکردنی بەناوبراو کرد بۆ ئەوەی بەخەڵکی بڵێت حەج بکەن هەربۆیە ئەوو ئیسماعیلی کوڕی بنیاتیان نا هەروەك لەقورئانی پیرۆزیشدا هاتووە[13]. ئیبراهیمیش فەرمانی خودای بەجێ گەیاند و ئیسماعیل لەگەڵ هاجەر و کەسانێك لە (جرهم)[14] کەلەگەڵیاندا هاتبوون، لەوێدا نیشتەجێ بوون و تائەوکاتەی هاجەرو ئیسماعیل

---

[12] مەبەست بیت الحرام یان بیت العتیق (ماڵی خودا) و بیت المقدسە.

[13] (واذیرفع ابراهیم القواعد من البیت واسماعیل). س البقره ئا ١٢١.

[14] هۆزێکەلەیەمەن کەلەناوچەی مککە و موعزەمە دابەزیون و حەزرەتی ئیسماعیل علیە السلام لەناو ئەو هۆزەدا هاوسەرگیری کرد.

گیانیان سپارد و لەحیجرەکەیدا[15] بەخاك سپێردران. بیت المقدسیش (بیتی داوود و سولەیمان بوو کەخودا فەرمانی بەهەردوکیان کرد کەمزگەوتەکە بنیات بنێن و هەیکەلەکان دابنێن) وەزۆرێك لەپێغەمبەران کەلەنەوەکانی ئیسحاق (ع) من لەوێدا بەخاك سپێردراون. وەمەدینە شوێنی کۆچی پێغەمبەری (ص) ئێمە کەخودا فەرمانی پێکرد کەکۆچی بۆ بکات و بانگەوازی ئیسلام پەرەپێبدات هەربۆیە پێغەمبەر مسجدالحرامی لەو شارەدا بنیاتنا و ئارامگای شەریفیشی لەوێدایە.

ئەمانەن هەرسێ مزگەوتە شەریفەکەن کەوەك نوری چاوی موسوڵمانانن و بەدڵ و گیان خۆشیان دەوێن و، مایەی پاسەوانی پاراستن و گەورەیی ئاینەکەیانن. لەبارەی فەزڵ و گەورەیی خێری نوێژکردن لەناو یان لەپەنایانەوە ڕیوایەتگەلێکی زۆرو بەناوبانگ هەن، ئێستەش ئێمە بەکورتی باسی مێژووی دروستکردنی ئەو مزگەوتانە دەکەین و باسی ئەو گۆڕانکاریانەش دەکەین کەبەدرێژایی مێژوو بەسەریاندا هاتووە و، تاوەکو تەواوی وکامڵبوونیان لەجیهاندا بەدیهاتووە. سەرەتا لەبارەی دروستکردنی مەککەوە هەروەك دەگێڕنەوە کەئادەم (ع) لەبەرامبەر بیت المعمورەوە[16] دروستیکرد لەپاشان تۆفان وێرانی کرد، بەڵام لەمبارەیەوە هەواڵێکی ڕاست کەبتوانرێت پشتی پێببەسترێت نیە، بەڵکو لەوانەیە بەگریمان لەمانای ئەم ئایەتەوە وەریانگرتبێت (کاتێك کە ئیبراهیم و ئیسماعیل پایەکانی کەعبەیان بەرزدەکردەوە[17]. لەپاشان خودا ئیبراهیمی کردە پێغەمبەر و مەسەلە پەیوەندیدارەکانی ژیانی خۆی و هاوسەرەکەی سارە و غیرەتی ئەو لەبەرامبەر هاجەرەوە و هەروەك ناسراوە ڕوویدا، خوداش وەحی بۆکردو فەرمووی کەهاجەری خێزانی و ئیسماعیلی کوڕی لەدەشتی چۆڵ و بێ گژو گیاو بیاباندا بەجێبهێڵێت و ئەویش ئەوکارەی کردو لەشوێنی بیتدا بەجێیهێشتن و، ئەو سۆزو میهرەبانیەی کەخودا لەگەڵ

---

[15] چواردەوری کەعبە حەتیم لەلای باکورەوە. (منتهی الارب).

[16] خانویەکە لەئاسمان کەلەڕێکی کەعبەدایە.(منتهی الارب)

[17] (وَإذ يَرفَعُ إبراهيمُ القَواعِدَ مِنَ البَيتِ وَإسماعِيل) س البقره ئا (١٢١)

ئەواندا کردی و سەرچاوەی ئاوی زەمزەمی بۆ هەڵقوڵاندن و لەپاشان جرهم هاتنە لایان و خانووەکەیان دروستکرد و تێیدا دەژیان و لەگەڵ ئەماندا لەدەوری زەمزەم جرهەمیش نیشتەجێ بوون، هەروەك چۆن لەشوێنی خۆیدا ناسراوە. ئەوکات ئیسماعیل لەشوێنی کەعبەدا خانوویەکی دروستکرد و تێیدا دەژیا و لەدەوریدا دیوارێك لە دومی[18] دروستکردو کردیە پەچەی حەیوانەکانی ئیبراهیمیش (ع) بۆ سەردانی کردنی لەشامەوە چوویە ئەو ناوچەیە لەکۆتا دیداریشدا لەخوداوە فەرمانی پێکرا کەماڵی کەعبە بنیات بنێت، ئیبراهیمیش دروستی کردو یارمەتی لەئیسماعیل وەرگرت و ئیسماعیل لەوێدا دەژیاو، لەبەرئەوەی کەهاجەری دایکی مرد هەرلەوێدا بەخاکی سپارد و بەردەوام بوو لەخزمەتکردن لەوێدا تاوەکو ئەو ڕۆژەی کە گیانی سپارد و، لەتەنیشت دایکیەوە بەخاك سپێردرا. لەپاش ئەویش نەوەکانی لەگەڵ خاڵەکانیدا لەخاندانی جرهم سەرقاڵی خزمەتکردنی کەعبەی ماڵی خودابوون.

لەپاشانیش عەمالیقە ئەو کارەیان گرتە ئەستۆو بارودۆخەکە بەمشێوەیە بەردەوام بوو خەڵکی لەهەموو نەتەوەکان و، لەهەمووناوچەکانی دونیاوە سەردانیان دەکرد و ئیتر لەخاندانی ئیسماعیل یان خەڵکانی تر کەنزیك بوون لەمانەوە، هەروەك دەڵێن تەبابیعە بۆ حەج کردن دەچوونە کەعبەو ڕێزێکی زۆریان بۆ دادەنا وەیەکێك لەتەبعەکان ناوی (قیارئەسعەدی ئەبو کەربە) کەعبەی بەپارچە پەڕۆی ڕەنگاو ڕەنگ و نەخشێنراوی یەمانی داپۆشی و، فەرمانیدا پاکو خاوێنی کەعبە ڕابگرن و کلیلێکی بۆ دانا، دەگێڕنەوە کەئێرانیەکان حەجیانکردووە لەکەعبە نزیك دەبوونەوە و وەئەوەدوو ئاسکە ئاڵتوونیەی کەعبدالموتەلیب لەکاتی پاککردنەوەی زەمزەمدا دۆزیبونیەوە، لەو دیاریانەبووە کەئەوان لەسەردەمەکانی پێشتردا هێنابوویان بۆ کەعبە. لەپاش نەوەکانی ئیسماعیل بەهەمان شێوە خاندانی جرهم بەناوی خاڵوانی نەوەکانی ئیسماعیلەوە فەرمانڕەوایی مەککەیان

---

[18] درەختێکی بۆندارە بەناوی جهودان بەهیندی پێی دەڵێن کوکل وەبەدرەختی تەنیشت هەردرەختێکی گەورەش دەڵێن (منتهی الارب).

کردووە و کاروباری کەعبەیان لەدەستدا بووە تائەوکاتەی کەهۆزی خوزاعە ئەوانیان وەدەرنا و لەوێدا نیشتەجێ بوون تائەوکاتەی کەخوداویستی. لەپاشان نەوەکانی ئیسماعیل زۆر بوون و بلاّو بوونەوە و بوون بەچەند بەشێکەوە دابەشبوون بەسەر هۆزی کینانەدا. دواتریش کینانە چەندهۆزێکیان لێبوویەوە، وەك قورەیش و هۆزەکانی تر، شێوازی فەرمانڕەوایی خوزاعە ناپەسەند بوبو هەربۆیە قورەیش بەسەریاندا زاڵبوون و لەکەعبە کردنیانە دەرەوە و خۆیان کاروبارەکانی تایبەت بەکەعبەیان گرتە دەست کەسەرکردەکەیان لەو سەردەمەدا قوصەی کوڕی کیلاب بوو. ئەو سەرلەنوێ کەعبەی نۆژەن کردەوە و سەقفەکەی بەداری درەختی کەنار و لقی دارخورما داپۆشی. ئەعشی دەڵێت: (سوێندم خوارد بەو جل و مێزەرەی کەڕاهیبی دیرەکان و، ئەو خانووەی کەقوصەیی و مەزازی کوڕی جرهم بنیاتیان ناوە).

ئەوکات کەقورەیش کاروباری کەعبەیان لەئەستۆدا بوو بەهۆی لافاو یان وەك دەڵێن سوتانەوە خانووی ناوبراو ڕوخا، هەربۆیە سەرلەنوێ دەستیانکردەوە بەنۆژەنکردنەوەیو بڕێك پارەیان لەناوهۆزەکەیاندا بۆ ئەو مەبەستە کۆکردەوە، لەوکاتەدا لەکەناری جەدە کەشتیەکی تێکشکاوهەبوو دارو تەختەکەیان بۆ سەقفی کەعبە کڕی و، دیوارەکانی کەمێك لەبالاّی مرۆڤێك بەرزتر بوو لەو نۆژەنکردنەوەیەدا دیوارەکانیان نزیکەی هەژدە زیراع بەرز کردەوەو وەدەرگاکەیشی لەپێشەوە لەگەڵ زەویەکەدا یەکسان بوو، لەم کاتەدا بۆ ئەوەی کە لافاو نەیەتە ناویەوە بەئەندازەی بالاّی مرۆڤێك بەرزیانکردەوە وەئەو شتانەی کەبۆ دروستکردنی فەراهەمیان کردبوو بۆ تەواو کردنی بەس نەبوون، هەربۆیە پایەکانیان کورتکردەوە و کردیانە ئەندازەی شەش زیراع و یەك بست و لەچواردەوریدا دیوارێکی کورتیان دروستکرد کەلەپشتیەوە تەواف دەکرێت، ئەم بەشەش بریتیە لە حیجر. بینای کەعبە بەم شێوەیە بەردەوامبوو تائەو کاتەی ئیبن الزبیر[١٩] لەمەککەدا

---

[١٩] ئەبوبەکرعبداللەی کوڕی زوبەیری کوڕی عەوامی قورەیشی باوکی ئەو زوبەیر، یەکێکە لەو دە کەسەی کەمژدەی بەهەشتیان پێدراوە و دایکی ئەسمای کچی ئەبو بەکرە، عبداللە لەپاش مەرگی موعاویە بەیعەتی

خەڵکی بانگکرد بۆلای خەلافەتی خۆی و ئەوێی کردە پەناگەی خۆیی و لەساڵی شەست و چواری کۆچیدا سوپاکەی یەزیدی کوڕی موعاویە بەسەرکردایەتی حەصینی کوڕی نومەیری سکونی بەرەو مەککە بەڕێکەوت و، کەعبە سوتا و دەڵێن بەهۆی ئەو نەوتەوەبووە کە بەرەو ئیبن زوبەیر وەشاندویانە و لەئەنجامی ئەم ئاگرەشدا دیوارەکانی ڕووخان و ئیبن الزوبیریش دیوارەکانی بەتەواوەتی ڕووخاندو، دواتر لەجاران باشتر نۆژەنیکردنەوە و لەوەبەدواوە هەرچەندە صەحابەلەنوژەنکردنەوەیدا کێشەیان هەبوو لەگەڵیدا، بەڵام ئیبن الزبیر بەفەرموودەی پێغەمبەر کەڕووی لەعائیشە کردبوو بەڵگەی هێنایەوە کەفەرموویەتی: ئەگەر تایفەی تۆ تازەموسوڵمان نەبوونایە و سەردەمە کەیان لەکوفرەوە نزیك نەبوایە بێگومان بارودۆخی بینای کەعبە بەو شێوەیە نۆژەنم دەکردەوە کەلەسەردەمی ئیبراهیمدا بووە و، دوو دەرگای خۆر هەڵات و خۆرئاوام بۆ دروستدەکرد. هەربۆیە ئیبن الزبیر دیوارە کۆنەکانی ڕووخاند و ئەو پایانەی کەئیبراهیم (ع) بنیاتی نابوون دەری خستو گەورە و سەرکردەکانی نەتەوەکەی کۆکردەوە، بۆ ئەوەی ئەو بناغەیە بەچاوی خۆیان ببینن ئیبن عەباس ئامۆژگاری کرد کە قیبلە لەخەڵکی بپارێزێت و، ئەویش بۆ ئەم مەبەستە لەنێو دیوارەکانی کۆمەڵێك داردەستی جێگیر کرد و لەسەریانەوە پەردەگەلێکی بۆ پاراستنی قیبلە دابەدەوریداو بۆ بەدەستهێنانی گەچ و قسڵ کۆمەڵێکی ناردە صەنعا لەیەمەن بۆ ئەوەی لەو ناوچەیەوە ئەو کەرەستانە بهێنن.

---

بەیەزید نەدا و چووە مەککە و بانگەشەی خەلافەتی دەکرد و، فەرمانڕەوایانی یەزیدیان لەحیجاز دەرکرد یەزید موسلیمی کوڕی عەقەبەی بەسوپایەکی زۆرەوە لەدژی ئەو کۆکردەوە موسلیم لەپاش ڕووداوی الحرە مرد و، وەحەصینی کوڕی نومەیر لەجێگەی ئەو بوویە سەرکردەی سوپا و، مەککەی پەیرۆزی گەمارۆ داو ئەم گەمارۆیەش تاوەکو مەرگی یەزید واتە ڕەبیعی یەکەمی ساڵی ٦٤ ك، درێژەی کێشا و لەپاش مەرگی یەزید مەملەکەتە ئیسلامیەکان بێجگە لەمیسرو شام خەلافەتی ئیبن الزبیریان قبولکرد و عبدالملیکی کوڕی مەروان سوپایەکی بەرەو عێراق نارد و، حەجاجی کوڕی یوسفی بەرەو حیجاز نارد لەساڵی ٧٢ دا مەککەی لەگەمارۆ دەرهێنا و بەو مەنجەنیقانەی کەبەئەبو قەبیس دایمەزراندبوون کەعبەی ڕووخاند و، ئەم گەمارۆیە درێژەی کێشاو تاوەکو لەجەمادی الاخری ساڵی ٧٣ ك دا عبدالله کوژرا. (لغتنامەی دهخدا).

وەلەو کانەبەردەی کەپێشتر بەردیان لێدەر دەهێنا گەڕان و هەرچیەك بەردیان پێویست بوو بەدەستیانهێنا، ئەوکات بیناکەیان لەسەر هەمان ئەو بناغەیەی کەلەسەردەمی حەزرەتی ئیبراهیمدا هەبووە دروستکردەوە و دیوارەکانیان بەئەندازەی بیست زیراع بەرز کردەوە و، هەروەك چۆن خۆی لەفەرموودەکەیدا ریوایەتی کردبوو دوو دەرگای پەیوەست بەزەوی دروستکرد.

وەناو خانووەکە و ڕووپۆشی دیوارەکانی بەبەردی مەڕ مەڕ نەخشاند و فەرمانیدا کلیلگەلێکی زێڕین بۆ دەرگاکانی دروستبکەن و، دەرگاکانیشیان بەزێڕ ڕازاندەوە. لەپاشان لەسەردەمی عبدالملیك، دا حەجاج بۆ جەنگکردن لەگەڵیدا ڕۆشتوو مەککەی گەمارۆ دا و بەمەنجەنیق هێندەی بەرد گرتە کەعبە دیوارەکانی ڕووخاند و، لەپاشان چاوی بڕیە ئیبن الزبیر و تێکی شکاند و لەگەڵ عبدالملیك دا لەبارەی ئەوەکە ئیبن الزبیر کەعبەی نۆژەنکردوەتەوە و، هەندێکی بۆ زیاد کردووە گفتو گۆیانکرد. عبدالملیك فەرمانیدا بیڕوخێنن و دیسانەوە لەسەر هەمان شێوەی پێشووی سەردەمی قورەیش بنیاتی بنێنەوە. کەتاوەکو ئێستەش هەمان ئەو بینایە کەئەو دروستی کردووە، وەدەڵێن کاتێك عبدالملیك پەی بەڕاستیەتی ئەو ریوایەتەبرد کە ئیبن الزبیر لەعائیشەوە گێڕاویەتیەوە لەکارەکەی پەشیمان بووەتەوە و گوتوویەتی: خۆزگە ئەوەی کەئەبو خوبەیب (عبدالله بن زوبەیر) لەئەستۆی گرتووە لەمەسەلەی کەعبەدا منیش لەئەستۆم دەگرت و لەسەر هەمان شێوەی ئەو نۆژەنم دەکردەوە. هەربۆیە حەجاج شەش زیراع و یەك بست شوێنی حیجری ڕووخاند و لەسەر بناغەکەی قورەیش دروستی کردەوە لەدەرگای خۆرئاوا و هەم لەژێرەوەی دەرگای خۆرهەڵاتەوە، کەئێستە دەبینرێت بەستیو بەشەکانی تری بیناکەی وەك خۆی دروستکردەوە و هیچ گۆڕانکاریەکی تێدا نەکرد و ئەو بینایەی کەئێستە هەیە هەمان ئەو بینای ئیبن الزبیرە لەنێوان دیوارەکەی ئیبن الزبیر و دیوارەکەی حەجاجدا پەیوەندیەکی ئاشکرا هەیە و، بەچاو دەبینرێت دیارە کەهەردوو بیناکەیان پەیوەست کردووە بەیەکەوە و بەئەندازەی یەك پەنجە لەیەکتری جیاوازن و

وەك بۆشاییەكە كەپڕ كرابێتەوە. لێرەدا كێشەیەكی گەورە ڕوودەدات چونكە ئەوەی كەگوترا (لەچۆنیەتی بینای ئیبن الزبیر و حەجاجەوە) دژە لەگەڵ گوفتاری فەقیهەكان لەمەسەلەی تەوافدا، چونكە بەپێی تێڕوانینی ئەوان ئەوانەی كەتەواف دەكەن دەبێت خۆیان لەچەمینەوە لەسەر شادەروانی خوارەوەی ڕووی پایەی دیوارەكاندا كەدەوردەداتەوە دوور بكەونەوە تاوەكو تەوافەكەیان نەكەوێتەناو كەعبەوە، چونكە بەشێك لەدیوار كەهەمان شوێنی شادەروانە لەسەر پایەی ئەصڵی بنیاتنەنراوە. وەهەروەها فەقیهەكان لەبارەی ماچكردنی حجرالاسوەد گوتوویانە كەتەوافكەر ناچارە بۆ ماچكردنی بەردەكە بگەڕێتەوە، تاوەكو بەڕاستی وەستاوە بۆ ئەوەی نەوەك بەشێك لەتەوافەكەی لەناوكەعبەدا ئەنجامبدرێت.

لەم كاتەدا ئەگەر هەموو ئەودیوارانەی كەئیبن الزبیر دروستی كردوون لەسەر بناغەكەی ئیبراهیم بێت، ئەی چۆن ئەو شێوازەی كەفەقیهەكان گوتویانە ڕوودەدات. بۆ ڕزگاربوون لەوگرفتە دەبێت یەكێك لەم دوو تێڕوانینە لەبەر چاو بگرین: یەكەم ئەوەی كە بڵێین حەجاج هەموو بیناكەی ڕووخاندووە و، سەرلەنوێ دروستی كردووەتەوە ئەم بۆچوونەش گروپێك گێڕاویانەتەوە، بەڵام بینین پێچەوانەی ئەمە دەسەلمێنێت، چونكە پەیوەندی نێوان هەردوو بیناكەو جیاوازی نێوان هەردوو دیوارەكە لەبەشی سەرەوەیاندا بەچاو دەبینرێت لەڕووی پیشەی وەستاییەوە بەتەواوی ئەم بۆچوونە ڕەتدەكاتەوە. وەیان ئەوەی كەبڵێین ئیبن زوبەیر لەهەموولاكانەوە وەك ئیبراهیم بیناكەی دروستنەكردووەتەوە تەنها ئەم كارەی لەلای حجرەوە ئەنجامداوە، هەربۆیە بینای ئەمڕۆ لەگەڵ ئەوەی كە هەمان ئەو بینایەی ئیبن الزبیرە بەڵام لەسەر پایەكانی ئیبراهیم دروستنەكراوەتەوە و ئەمەش شتێكی دوورە.

ڕێگەی ڕزگاربوونیش لەم دوو بۆچوونە نیە و خودای تەعالاش داناترە. لەپاشان دەبێت بزانین كەحەوشەی كەعبە یان مزگەوتی پێشوو كەشێكی لەبار بووە بۆ تەوافكاران لەسەردەمی پێغەمبەر (ص) و ئەبوبەكردا دیوارێكی نەبووە و دواتر لەبەر زۆری و

قەرەباڵغی خەڵك حەزرەتی عومەرخودای لیّ ڕازی بێت چەند خانوویەکی لەدەوربەری کەعبەدا کڕی و ڕووبەری مزگەوتەکەی زۆرکرد و، دیوارێکی بەدەوردا دروستکرد کەبەئەندازەی بالآی مرۆڤێك کەمێك کورتتر دەبوو عوسمان و لەدوای ئەویش ئیبن الزبیر و دواتریش وەلیدی کوڕی عبدالملیکیش هەریەکەو ئەم شێوازەیان گرتەبەر و چەندخانوویەکی تریان کڕی و خستیانە سەر حەوشەی مزگەوت و، وەلید پایەگەلێکی لەبەردی مەڕمەڕ بۆ دروستکرد.

لەپاشانیش مەنصورو مەهدی کوڕی ڕووبەرەکەیان زیاتر کرد و لەوەبەدواوە زیاد نەبووتائێستەش هەرلەسەر ئەو شێوەیە کەئەوکات هەیبووە. خوداش بەئەندازەیەك ڕێزی لەو ماڵە گرتووە و گرنگی پێداوە کەلەبیرو فیکردا ناگونجێت و هێندەبەسە کەبڵێین خودا کردوویەتیە جێگەی دابەزینی وەحی و مەلائیکە و شوێنی پەرستش و جێبەجیّ کردنی شیعارەکانی حەجی تێدا واجب کردووە. وەبۆ حەرەمی کەعبە لەهەموو بوارەکاندا ئەو مافی بەگەورەزانین و ڕێزو شایستەییە تایبەتەی بۆ داناوە قەدەغەیەکەسێك کەبچێتە ناوحەرەمەوە جلی دوراوی نابێت لەبەردا بێت تەنها پارچەیەکی گەورە کەسەرانسەری جەستە دادەپۆشێت، (ازار) دەتوانێت بچێتە ژوورەوە و حەرەمی مەکە وەك شوێنێکی هێمن و ئارام و بێوەی دانراوە و، پارێزراوە لەهەموو دەستدرێژیەك و نابێت هیچ گیاندارێکی ڕاوبکرێت و بکوژرێت و، درەختی نابێت ببڕدرێتەوە بۆ سوتاندن. سنوری حەرەم ئەم تایبەتمەندیانەی هەیە: سیّ میلە لەمەدینەوە تاوەکو تەنعیم، وەلەڕێگەی عێراقەوە حەوت میلە و تاوەکو لاری پچڕاوی کێوەکە وەلەڕێگەی جعرانەوە[٢٠] تاوەکو شوعەب و لەڕێگەی جەدەوە دەمیلە و تاوەکو یەکتر بڕی عەشایر، ئەمەبوو چۆنیەتی هەواڵەکانی تایبەت بەمەککە کەبەئوم القری و کەعبەش ناوزەد کراوە، لەووشەی کەعب کەبەهۆی بەرزیەکەیە وە و پێشی دەڵێن بکە ئوصموعی دەڵێت: چونکە خەڵکی لەگەڵ یەکتریدا نەرم و نیانن، موجاهیدیش دەڵێت: بای بکەیان گۆڕیوە بەمیم هەروەك چۆن

[٢٠] لەڕێگەی تائیفەوە حەوت میلە و تاوەکو ناوجەرگەی نمرە.

بەلازب دەڵێن لازم چونکە مەخرەجی میم و با زۆر نزیکە لەیەکترەوە، وەنەخعی دەڵێت: بکە بەبا مەبەست لێی ماڵی کەعبە یە و مەککە بەمیم مەبەست لێی شاری مەککەیە و زهری[21] دەڵێت: بکە بەبا بەهەموو مزگەوتەکە و بەمیمیش بەحەرەم گوتراوە. نەتەوەکانی پێشوو لەسەردەمی جاهیلیەتدا ڕێزێکی زۆریان لەکەعبە گرتووە پاشایانێکی وەك کیسرا (خسرەو) و چەندانی تر ماڵ و سامان و دیاری گەلێکی بەنرخیان بۆ ناردووە، چیرۆکی شمشێرو دوو ئاسکەئاڵتوونیەکەی کەعبدالمتەلیب دۆزینیەوە لەکاتی هەڵکەندنی چاڵی زەمزەمدا بەناوبانگە.

وەپێغەمبەریش کاتێك کەمەککەی فراوانکرد لەچاڵێکدا حەفتاهەزار ئۆقیەئاڵتوونی دۆزیەوە، ئەم برەش لەو دیاریانە بووە کە پاشاکان دەیاننارد بۆ کەعبەو بەهای زێڕی ناوبراو نزیکەی دوو ملیۆن دیناری ئاڵتوون بەکێشی دووسەد قینتار بووە. حەزرەتی علی یش بەپێغەمبەری گوت ئەی پێغەمبەری خودا خۆزگە ئەم پارەیەت بۆ جەنگ بەکار دەهێنا و سەرفت دەکرد، بەڵام پێغەمبەر دەستی لێنەدا، و ئەبوبەکریش بەهەمان شێوە دەستی لێنەدا. ئەزروقی دەڵێت: لەبوخاریدا فەرموودەیەك هەیە کەسەنەدەکەی دەگاتەوە بەئەبو وائیل[22]، دەڵێت: لەلای شەیبەی کوڕی عوسمان دانیشتبووم و ئەویش گوتی منیش لەلای عومەری کوڕی خەتاب دانیشتبووم گوتی نیەتی ئەوەم هێناوە کەلەکەعبەدا هیچ دینارو دیرهەمێکی زێڕو زیو نەهێڵم و، هەمووی لەنێوان موسوڵمانانداا دابەش بکەم. شەیبە گوتی: تۆ ناتوانیت ئەم کارە بکەیت، گوتی بۆچی ؟ لەبەر ئەوەی کەهەردوو هاوەڵت (پێغەمبەر و ئەبوبەکر) وەها کارێکیان نەکردووە. ئەوانە کەسانێك بوون کەئیقتیدایان پێدەکرێت. وەئەبوداوود و ئیبن ماجە حەدیسی نابراویان تەخریج

---

[21] ئەبو بەکری کوڕی محمدی کوڕی موسلیمی زوهری ناسراو بەئیبن شهاب موحەدیسێکی تابیعیە و لەهەر دە کەسەکەی هاوەڵانی پێغەمبەرەوە حەدیسی گێڕاوەتەوە و، لەساڵی ١٢٤ ك مردووە (لغتنامەی دهخدا).

[22] برای سەلەمەی ئەسەدی خوزەیمیە هەندێك بەصەحابە داویانەتە قەڵەم هەندێکی تریش دەڵێن تابیعیە و لەخەڵکی کوفەیە و، هاوەڵیەتی عومەرو عوسمان و علی و موعازی کوڕی عباس و ئیبن مەسعود و ئەبو هورەیرە و عائیشەی کردووە و لەساڵی ٨٢ یان ٨٩ ك دا مردووە (لغتنامەی دهخدا).

کردووە. ئەم سەروەت و سامانە وەك خۆی مایەوە تائەوکاتەی کەئاژاوەی ئەفتەص حەسەنی کوڕی حوسەین[٢٣]ی کوڕی علی کوڕی زین العابیدین بووە، لەبەر ئەوەی کەلەساڵی ١٩٩ ك مەککەی داگیر کردووە و بەرەو کەعبە چووە و هەموو گەنجینەکانی دەست بەسەردا گرتووە و گوتوویەتی ئەم سەروەت و سامانە بەکەڵکی کەعبە نایەت کەبەبێ سود کۆکراوەتەوەو، ئێمە شیاوترین بۆ داگیر کردن و دەستێوەردانی بۆ ئەوەی لەجەنگەکاندا سودی لێوەربگرین، دواتر هەموو خەزێنەکانی لەکەعبە دەرهێناو داگیری کردو لەو ڕۆژە بەدواوە کەعبە هیچ خەزێنەیەکی تێدا نەمایەوە.

بەڵام بیت المقدس ئورشەلیم یان مزگەوتی ئەقصا لەسەرەتاوە و لەسەردەمی صائیبەدا شوێنی پەرستگای زوهرە بووە، لەو دیاریانەی کە پێشکەشی ئەو پەرستگایە دەکرا ڕۆنی زەیتونیشیان بەدیاری لەوێدا دادەنا و دەیانڕشت بەسەر بەردێکدا کەلەو پەرستگایەدا بووە. لەپاشان پەرستگای نابراو کۆن بوو لەپاش ئەوەی کەبەنی ئیسرائیل ئەو ناچەیان داگیر کرد بەردی ناوبراویان کردە قیبلە و ئەوەش لەبەر ئەوەبوو کەموسا (ع) بەنی ئیسرائیلی لەمیسر هێنایە دەرەوە بۆ ئەوەی بەپێی ئەو وەعدەی کەخودا بە ئیسرائیلی باوکی ئەمان و باوکی ئەو ئیسحاقی دابوو بیت المقدس داگیر بکەن و، لەبەر ئەوەی کەلەسەرزەوی (تیە) دا نیشتەجێ بوون، خودا فەرمانی بەموساکرد کەگومەزیەك لەدار دروستبکات کەشێوە و چۆنیەتیەکەی لەڕێگەی وەحیەوە دیاری کرابوو بڕیار درابوو کەدەبێت لەو گومەزیەدا (تابوتی پەیمان) و سفرەیەك بەقاپی منارەیی و بەقندیل (قەنیلەچرا) وە کوشتارگەیەك بۆ قوربانیکردن دروستبکات و وەصفی هەموو ئەمانە بەکامڵترین شێوە لەتەوراتدا هاتووە. موساش گومەزیەکەی دروستکرد و تابوتی عەهدی خستەناویەوە و لەو تابوتەشدا لەبری ئەلواحی نازڵ بوو بەهەردە فەرمانەکەوە کەشکاندبووی ئەلواحگەلێکی تری دەستکردی داناو، کوشتارگەکەی لەنزیکیەوە

---

[٢٣] لەیەنی دا حسنی کوڕی حوسەینە، لەدسلانیشدا حوسەینی کوڕی حوسەینە و ڕاستیەکەی مەبەست حەسەنی کوڕی علی ئەصغەری کوڕی علی سەجادی کوڕی حوسەینی کوڕی علی کوڕی ئەبی تالیبە (لغتنامەی دهخدا).

ڕێکخست و خوداش فەرمانی بەموساکرد کەهارون کاروباری قوربانی بگرێتە ئەستۆ. گومەزی ناوبراوی لەنێو خێوەتەکانی خۆیاندا لەتیە داناو لەنوێژدا ڕوویان دەکردە ئەوو لەکوشتارگەکەی بەردەمیدا قوربانیان دەکرد.

وەلەبەر ئەوەی کەسەرزەوی شامیان داگیر کرد گومەزیەکەیان بردە کلکال لەسەرزەوی پیرۆزی نێوان بەشی بەنی یامین بەنی ئەفرایمداو، لەو شوێنەشدا چواردە ساڵ مانەوە و حەوت ساڵ لەماوەی جەنگ و حەوت ساڵیش لەپاش فەتح ولەکاتی دابەشبوونی وولآتداو لەبەر ئەوەی کەیەشوع (ع) وەفاتی کرد بردیانە شاری شیلو لەنزیك کلکال بەدەوریدا دیواریان کرد و ئەم بارودۆخەش بۆ ماوەی سێسەد ساڵ مایەوە، تائەوەبوو نەوەکانی فەلەستین لەدەستی ئەوانیان سەندەوە، هەروەك باسکرا و زاڵبوون بەسەریاندا و بەلآم دواتر گومەزیەکەیان بۆ گێڕانەوە و لەپاش مەرگی کاهینی گەورە (عالی) گومەزیەکەیان بردە نوف و، لەسەردەمی تالوتیشدا بردیانە کنعون (کەنعان) لەوولآتی بەنی یامین، وەکاتێك داوود (ع) گەیشتە دەسەلآت گومەزی و تابوتەکەی گواستەوە بۆ بیت المقدس و پارچەگەلێکی تایبەتی دابەسەریاندا و داپۆشین و خستنیە سەر صخرەکەوە، وەداوود (ع) بڕیاریدا لەبری گومەزیەکە مزگەوتێك لەسەر صەخرە دروستبکات، بەلآم ئەم کارەی بەکۆتا نەگەیاند و وەصیەتی کرد بۆ سولەیمانی کوڕی (ع)و، ئەویش لەماوەی چوار ساڵی دەسەلآتی خۆیدا کارە کەی تەواو کرد و لەم کاتەشدا نزیکەی پێنج سەد ساڵ لەمردنی حەزرەتی موسا (ع) تێپەڕیبوو کۆڵەکەکانی مزگەوتەکەی لەسەر ئەو بنیاتناو، لەسەریەوە کوشکێکی شوشەی دانا و دەرو دیوارەکانی بەڕوپۆشی زێڕین ڕازاندەوە و هەیکەل و تەصاویرو (کەرەستە) منارە و کلیلەکانی لەزێڕ دروستکرد و، لەدواوە بینایەکی لەشێوەی گومەزیدا دروستکرد بۆ ئەوەی تابوتی عەهدی تێدا دابنێن تابوتەکەیان لەصەهیون کەشوێنی نیشتەجێبوونی داوودی باوکی بوو هێنا و لەکاتی دروستکردنی مزگەوتەکەدا فەرمانی دابوو کەبیهێنن، هەربۆیە هەرکە دروستکردنی بیناکە تەواوبوو لەوێدا ئامادەبوو، تابووتی ناوبراویش

ئەسبات واتە سەرۆك هۆزەكان و كاهینانی كەنعان و هێنابوویان بۆ ئەوەی لەبینا شێوە گومەزیەكەدا دابینێن گومەزی و كەرەستەكان كوشتارگەی هەموویان لەمزگەوتەكەدا ئامادە كرد و، بۆ هەریەكەیان جێگەیەكی تایبەتیان دیاری كرد و تائەو كاتەی كەخوداویستی بەو شێوەیە بەردەوامبوو تائەوەبوو لەپاش هەشت سەد ساڵ لەدروستكردنی مزگەوتەكە سەردەمی بخت نەصر هاتە پێشەوە و، مزگەوتەكەی وێران كرد و تەورات و عاصاكەی موسای سوتاند و هەیكەل و وێنەكانی شكاند و فڕێیدانە دەرەوە.

لەپاشان كاتێك پاشایانی ئێران بەنی ئیسرائیلیان گێڕایەوە سەرزەوی پیرۆزی خۆیان عوزەیر كەیەكێك بوو لەپێغەمبەرانی بەنی ئیسرائیل بەیارمەتی بەهمەن پاشای ئێران مزگەوتەكەی دیسانەوە دروستكردەوە. ئەم پاشایەش ئەو كەسەیە كەبەنی ئیسرائیلی لەدیلی بەخت نەصر ڕزگار كرد و فەرمانڕەوایی بۆ گێڕانەوە (چونكە دایكی بەهمەن یەهودی بووە) و، پاشای ناوبراو لەدروستكردنەوە مزگەوتەكەدا سنورێكی بۆ دیاری كردن كەلەخواریەوە سولەیمانی كوڕی داوود(ع) بوو، ئەوانیش لەوسنورە تێپەڕیان نەكرد. بەڵام ئەو كۆشكانەی كەلەو سەرزەمینەدا هەبوون لەسەر شێوەی دوو گومەزی، یەكێكیان بەسەر ئەوی تریانەوە بوو هەروەك چۆن ستونی قاتی سەرەوەی لەسەر زەڕبی قاتی خوارەوە وەستابوو زۆرێك لەخەڵكی واگومان دەكەن كۆشكە نابراوەكان بریتین لەكۆمەڵێك گەوری سولەیمان (ع) ئەمە لەكاتێكدا بەو جۆرە نیە. بەڵكو مەبەست لەبنیاتنانیان پاككردنەوەی بیت المقدسە لەپیسیەكی وەهمی كەوا دەزانن بەو جۆرەیە، چونكە لەشەریعەتی ئەواندا پیسی هەرچەندە لەژێر زەویشەوە بێت و لەنێوان ئەو پیسیەو سەرزەویدا پڕیش بێت لەخاك، بەڵام لەنێوان پیسی شاراوە و ئاشكرای زەویدا هێڵێكی ڕاست دروستدەبێت ئەو كاتی بەشی ئاشكراو دیاری زەویش پیس دەبێت، ئەم وەهمە بەلای ئەمانەوە وەك شتێكی حەقیقی و سەلمێنراو وایە. هەربۆیە كۆشكە نابراوەكان بەم شێوەیە دروستیان كردوون كەستون و كۆڵەكەی كۆشكەكانی خوارەوە

لەزەربەکانیاندا کۆتاییان دێت هێڵەکەیان دەپچڕێنن لەئەنجامدا پیسیەکە بەهۆی هێڵە ڕاستەکەوە ناگاتە چینەکانی سەرەوە، خانووەکە لەم پیسیە وەهمی و خەیاڵیە پاك دەبێتەوە بۆ ئەوەی بەشێوەیەکی کامڵ و دڵنیاتر بیت المقدس بگاتە قۆناغی پاکیەتیو تەقدیس (پیرۆزی). ئەوکات وولآتی بەنی ئیسرائیل لەنێوان پشاکانی ئێران و یۆنانو ڕۆمدا دەست بەدەستی دەکرد و، لەم ماوەیەدا پاشایەتی خاندانی ئیسرائیل گەشتە ئەوپەڕی پلەی گەورەیی لەپاشان خاندانی حشمنای کەلەکاهینەکانی ئەو نەتەوەیە بوون گەشتنە دەسەلآت و فەرمانڕەوایی کەوتە دەستی هیرۆدۆس لەخزمانی ئەمان و زاواو مێردی خوشکیان و، لەپاش ئەویش گەیشت بەنەوەکانی و هیرۆدۆس بیت المقدسی لەسەر بناغەو سنوری سولەیمان (ع) بنیاتی نایەوە و لەجوانکاریەکەیدا ووردەکاریەکی زۆری کرد و لەماوەی شەش ساڵدا تەواوی کرد، لەبەر ئەوەی نۆبەی دەسەلآتی ڕۆم هاتو کەوتە دەستی تیتش و دەستی گەیشتە وولآتی بەنی ئیسرائیل بیت المقدس و مزگەوتەکەی وێرانکرد و، فەرمانیکرد کەلەجێگەکەیدا کشتوکاڵ بکەن.

لەپاش ماوەیەك ڕۆمیەکان هاتنە سەرئاینی مەسیح (ع) و باوەڕیان پێهێنا و دواتر بارودۆخی پاشاکانی ڕۆمی لەپەیڕەوی کردنی ئاینی مەسیحدا ئاوەژوو بوویەوە و، جارێك پابەند دەبوون پێیەوە و جارێکیش دژی دەوەستانەوە تائەوەبوو نۆبەی پاشایەتی قونستانتین هات و دایکی ئەو هیلانە (هیلن) باوەڕی بەئاینی مەسیح هێناو سەفەری کرد بۆ قودس (ئورشەلیم)، بۆ ئەوەی ئەو دارەی کەبەبیرو باوەڕی ئەوان حەزرەتی مەسیحی پێدا لەخاچ دراوە بیگێڕێتەوە، بەڵآم قەشەکان پێیان ڕاگەیاند کەئەو دارە کەوتووەتە ژێرزەوی و پیس بووە. بەڵآم هیلین فەرمانیدا کەداری ناوبراو بهێننە دەرەوە و لەجێگەکەیدا کڵێسای قومامەی[٢٤] بنیاتنا و هەروەك دەڵێن گوایە کڵێسای ناوبراو لەسەر گۆڕەکەی ئەو بنیاتنراوە ئەمەش بەبیرو باوەڕی ئەوان دواتر، فەرمانیکرد بەشەکەی تری بینای بیت المقدس کەماوەتەوە بڕوخێنن و خاشاك و پیساییەکانی بڕژێننە سەر بەردەکە

---

[٢٤] ئەم ناوە موسوڵمانان لێیان ناوە بەڵآم مەسیحیەکان خۆیان پێیی دەڵێن (پەرستگای ژیانی دووبارە).

بۆ ئەوەی شوێنەکەی لەژێر پیساییەناوبراوەکاندا بشاردرێتەوە بۆ ئەوەی بەبیرو باوەڕی ئەمان پەند و عیبرەت بێت بۆ ئەو کەسانەی کەبێڕێزیان بەرامبەر گۆڕی مەسیح کردووە. لەپاشان مەسیحیەکان لەبەرامبەر قومامەوە بیت لەحمیان بنیاتنا کەئەو خانووەیە حەزرەتی عیسای تێدا لەدایك بووە.

بیت المقدس لەسەر ئەم بارودۆخەبوو تائەوکاتەی کەسەردەمی ئیسلام هات و حەزرەتی عومەر بۆ فەتحی بیت المقدس چوویە ئەو شوێنەو، لەبارەی صەخرەکەوە پرسیاری کرد و، خەڵکیش شوێنەکەیان نیشاندا هەرچەندە خۆڵ و خاشاکێکی زۆری بەسەرەوە بوو. حەزرەتی عومەر لەژێر خاکەکە دەری هێنا و پاکیانکردەوە و لەسەری مزگەوتێکیان لەسەر شێوەی دەشتەکیەتی بنیاتنا و زۆرْ بەرێزەوە سەیری کرد، هەروەك ئەوەی کەخودا لە(ام الکتاب)[٢٥] دا واتە قورئان باسی فەزڵ و گەورەییەکەی کردووە.

لەپاشان وەلیدی کوڕی عبد الملیك لەسەر نەریتی مزگەوتەکانی ئیسلام ئەوەی کەخودا دەیویست لەبەرزو بڵند ڕاگرتنی مزگەوتی نابراودا ڕەچاوی کرد هەروەك چۆن هەمان شێوەی لەمسجد الحرام (مککە) و، مزگەوتەکەی پێغەمبەردا(ص) لەمەدینە و مزگەوتی دیمەشقداپەیڕەو کرد. عەرەبەکان بەمزگەوتی دیمەشق دەڵێن (بلاط الولید)، ئەو پاشاکەی ڕۆمی ڕاسپارد بۆ ئەوەی کرێکارو مەوادی پێویست بۆ نۆژەنکرد نەوەی مزگەوتە نابراوەکان ئامادە بکات و بەکاشی کاری بیانڕازێنیتەوە پاشای ڕۆمیش فەرمانەکەی وەلیدی جێبەجێ کرد و، بەپێی ئەوەی کەئەو داوای کردبوو مزگەتی ناوبراو تەواو کرا، ئەوکات لەبەر ئەوەی کە بارودۆخی خەلافەت لەسەدەی پێنجەمی کۆچیدا بەرەو لاوازی چوو بیت المقدس کەوتە ژێردەسەڵاتی عبیدیەکان (فاتمیەکان) کەسەربە دەسەڵاتی

---

[٢٥] لەزاراوەدا (أمُّ الکتاب) بەئەصڵی کتاب یان لەوح یان سورەتی فاتیحەیان هەمووقورئانیان گوتووەلەقورئانی پیرۆزیشدا لەس ال عمران تا ٥ دا، بەمانای ئەصڵی کتاب (قورئان) هەموو قورئان (هُنَّ أُمُّ الکتاب) وەلە س رعد دا تا ٣٩، بەهەمان شێوە مانای ئەصڵی کتاب دە گەیەنێت وەبەمانای لەوح المحفوز لە س زخرفدا تا ٢هاتووە. (کشف الاسرار).

خەلیفەکانی شیعە دەژمێردرا و، لاوازی ڕووی تێکردبوو فەرەنگیەکان هێرشیانکردبوویە سەر بیت المقدس و بەفەتحی بیت المقدس بوونەخاوەنی (پغوری شام)[٢٦] و لەسەر صەخرەی پیرۆز ئەو کڵێسایەیان بنیاتنا کەزۆر بەڕێز بوولەلایان و شانازیان بەدروستکردنەکەیەوە دەکرد، بەڵام هەرکە صەلاحەدینی کوڕی ئەیوبی کوردی لەوولاتی میسر و شامدا سەربەخۆیی بەدەستهێنا و شوێنەوارەکانی بیدعەتی عەبیدیەکانیان لەناوبرد و هێرشی کردە سەر ئەو فەرنگیانەی کەبیت المقدسیان داگیر کردبوو تائەوەبوو سەرکەوت بەسەریاندا و لەژێر دەسەڵاتی ئەوان ڕزگاری کرد، ئەم ڕووداوەش لەساڵی ٥٨٠ ك دا بووە.

صەلاحەدین ئەو کڵێسایەی کەمەسیحیەکان لەسەر صەخرەکە دروستیانکردبوو ڕووخاندی و صەخرەکەی دەرخست و، مزگەوتەکەی بەشێوازێك بنیاتنا کە تاوەکو ئێستەش لەسەر هەمان ئەو شێوەیە. نابێت ئەو کێشە بەناوبانگە ی کەلەوفەرموودەیەدا هەیە بۆ تۆ ڕووبدات: لەپێغەمبەریان پرسی لەبارەی یەکەمین ماڵێك (مزگەوت) کە دروستکراوە کامەیە ؟ فەرمووی مەککە گوتیان لەپاشان فەرمووی بیت المقدس دواتر پرسیان ئەی ماوەی نێوان ئەو دوانە چەندە ؟ فەرمووی چل ساڵ، چونکە ماوەی نێوان دروستکردنی بینای کەعبە و بیت المقدس بەو ئەندازەیە کەلەنێوان سولەیمان و ئیبراهیمدا هەیە لەو ڕووەوەی کەئیبراهیم بنیاتنەری بیت المقدسە و، ماوەی نێوان ئەوو ئیبراهیم هەزران ساڵ تێپەڕ دەکات.

---

[٢٦] ثغور لەبەکارهێنانی جوگرافیای مێژوودا بەهەردوو بەشەکەی شام دەگوترا، سغوری جرزی و سغوری شامی کەکێوی لکام کەوتووەتە نێوانیانەوە سغوری جرزی شارەکانی ملتیە و شمشات و حصن و قەڵای ڕۆم و حەدەسی حەمزا یان محمدیە، یان کیتوك مەرعەشی دەگرتەوە سغوری شامیش بریتی بوو لەشارەکانی تەرتوس و ئزنە ومصیصە و سغوری هارونی و سیس یان سیسیە، ووشەی سغور لەم بابەتەدا بەمانی قلاع یان بەهێزکردنە سنوریەکانە چونکە جیهاد کەرانی حورە لەو نووناوچەیەدا سوپای ئیسلامیان کۆ دەکردەوە و لەگەڵ ڕۆمیەکاندا دەجەنگان. (نخبە الدهر).

دەبێت ئەوە بزانین کەمەبەست لەدانانی حەدیس، بیناکردنی ماڵەکەنیە، بەڵکو مەبەست یەکەمین ماڵێکە کە بۆ پەرستش دیاری کراوە دووریش نیە کەبیت المقدس بۆ پەرستش بەر لەبینای سولەیمان لەوەها ماوەیەکدا بنیاتنرابێت هەروەك دەڵێن صابیئە پەیکەری زوهرەیان لەسەر صەخرەکە (بەردەکە) دروستکردووە و، لەوانەیە دانانی پەیکەری زوهرە بەو هۆیەوە بووە کە شوێنی ناوبراو بۆ پەرستش دیاری کراوە. هەروەك چۆن لەسەردەمی جاهیلیەتدا بت و پەیکەرەکانی خوداکانیان لەناو کەعبەدا دانابوو صابیئەش کەپەیکەری زوهرەیان دروستکرد لەسەردەمی ئیبراهیم (ع) دابووە. کەواتە دور نیە ماوەی چل ساڵ لەنێوان دروستکردنی مەککە و بیت المقدس ماوە هەبێت هەرچەندە هەروەك بەناوبانگە لەوێدا بینایەك نەبووە، ئەڵبەت یەکەمین کەسێك کە بیت المقدسی بنیاتناوە سولەیمان (ع) بووە، کەواتە دەبێت لەم خاڵە تێبگەین چونکە چارەسەری گرفتی ناوبراوی تێدایە. بەڵام مەدینەی منەوەرە کەبەیەسریبیش ناوزەد کراوە، بنیاتنەرەکەی یەسریبی کوڕی مهلائیل لەعەمالیقەبووە و بەناوی ئەوەوە ناونراوە، بەنی ئیسرائیلیش لەو شارانەی کەلەسەرزەوی حیجازدا داگیریانکردن یەکێکیان یەسریب (مەدینە) بووە. دواتریش خاندانی قیلە(ئەوس و خەزرەج) لەهۆزی غەسان بوونە دراوسێیان و بەسەر بەنی ئیسرائیلدا زاڵبوون و مەدینە و دەوروبەرەکەیان داگیر کردو، لەپاشان پێغەمبەر(ص) فەرمانی پێکرا بۆ ئەوەی کۆچ بکات بۆ ئەو شارە، چونکە خودا پێشتر گرنگی بەو شارە دابوو..

ئەوەبوو لەگەڵ حەزرەتی ئەبو بەکردا کۆچی کرد بۆ مەدینە و هاوەڵانیش لەپێش خۆیەوە کۆچیانکردبوو. پێغەمبەر لەو شارەدا نیشتەجێ بوو مزگەوت و ماڵی خۆی دروستکرد و کەخودا بۆ ئەو مەبەستە دیاری کردبوو، خاندانی قیلەش پشتگیریان لێکرد و بەئەنصارناونران و ناوبانگیان دەرکرد. ئاینی ئیسلام لەمەدینەدا گەیشتە کەماڵ و سەرکەوت بەسەر هەموو ئاینەکاندا و پێغەمبەر سەرکەوت بەسەر قەومەکەی خۆیدا و مەککەی فەتح کرد و خستیە ژێر دەسەڵاتی خۆیەوە وبەموسوڵمانانی ڕاگەیاند کە لەدوای

فەتحی مەکە دەگەڕێتەوە مەدینەو، ئەمەش بوویە جێگەی سەرنجی موسوڵمانان، ئەوەبوو پێغەمبەر پێی ڕاگەیاندن تاوەکو ئەو کاتەی دونیا بەجێدەهێڵێت لەمەدینە دەمێنێتەوە. وەکاتێك ئەو زاتە (ص)ماڵئاوایی لەژیانی دونیا کرد قەبری پیرۆزی هەرلەو شارەدا بوو لەبارەی فەزڵ و گەورەیی مەدینەوە حەدیس گەلێکی صەحیح هاتوون کەهیچ گومانێکیان تێدا نیە، بەڵام لەنێو زانایاندا لەبارەی فەزڵ و گەورەیی مەککە و مەدینەوە کەئایاکامیان بەرێزترە جیاوازی بۆ چوون هەیە، مالیك ڕەحمەتی خودای لێبێت نەصی صەریحی لەڕافیعی کوڕی خەدیج[27] بۆ ئەو سەلمێنراوە کە دەڵێت: پێغەمبەر (ص) گوتوویەتی: مەدینە لەمەککە باشترە هەربۆیە ئەویش ئەمەی گوتوە. ئەم حەدیسەش عبدالوهاب[28] لە(المعونه) دا لەگەڵ حەدیسگەلێکی تردا کەبەڕواڵەت ئەم مانایە دەگەیەنن گێڕاویەتیەوە، بەڵام ئەبو حەنیفە و شافیعی دژی بوون.

بەهەرحاڵ مزگەوتی مەدینە لەپلەی دووەمدایە لەڕێزو گەورەیدا و هەموو نەتەوەکان لەسەرانسەری جیهانەوە بەدڵ و گیان یەکەمجار دەچنە ئەوێ و فەریزەی حەجیش دەبێت لەوێدا ئەنجام بدرێت.

لەوەی کەباسکرا دەتوانین ئەوە تێبگەین کەچۆن گەورەیی و ڕێز، بەشێوەیەکی یەك لەدوای یەك لەو مزگەوتانەدا کۆبووەتەوە لەو ڕووەوەی کەگرنگی خودا لەڕۆژی یەکەمەوە بەمزگەوتە ناوبراوەکان دراوە و، دەتوانین ئەمە بەیەکێك لەنهێنیەکانی خودای بدەینە قەڵەم و لەجیهانی هەستیدا پەی پێ بەرین کەچۆن کاروباری دین و دونیای بەشێوەیەکی پایەدارو بەتێپەڕبوونی کات ڕێکخستوە. بەڵام بێجگە لەو سێ مزگەوتەی کەباسمانکردن زانیاریمان سەبارەت بەمزگەوتەکانی تری سەر ڕووی زەوی نیە جگە لەوەی کەدەڵێن مزگەوتی ئادەم (ع) لەسرندیب کەوتووەتە دوورگەکانی هیندەوە، بەڵام هەواڵی

---

[27] موحەدیسێکە لەمەدینە لەدایك بووە بەیەکێك لەئەنصارەکان دادەنرێت و لەساڵی ٧٤ ك دا مردووە.

[28] قازی عبدالوهابی کوڕی علی کەناسراو بووە بەئیبن تاووس لەساڵی ٤٢٢ ك دا مردووە، کەبەسید ئیبن تاووس بەناوبانگە.

باوەرپێکراو لەبارەیەوە بەدەست نەهاتووە کەبتوانین بوونی بسەلمێنین. گەلانی پێشوو بەپێی ئەو ئاینانەی کەهەیانبووە خاوەنی مزگەوت بوون کەزۆر بەرێزبوون لەلایان لەوانەش پەرستگای ئاگرەکانی ئێرانیەکان پەرستگاکانی خەڵکی یۆنان و ماڵە پیرۆزەکانی تازیەکان لەحیجازدا کەپێغەمبەر(ص)، فەرمانی کرد وێرانیان بکەن مەسعودیش هەندێك لەو ماڵانەی لەدانراوەکەی خۆیدا باسکردوون کەپێویست ناکات ئێمە هیچکامیان باسبکەین، چونکە خانووە نابراوەکان نەبەپێی شەرع و نەلەسەر شێوەیەکی ئاینی دروستنەکراون و هیچ کەسیش گرنگیەکی ئەوتۆبەمێژوویان نادات و ئەوەی کەلەمێژووەکاندا لەبارەیانەوە هاتووە بەسە و هەرکەسێکیش بیەوێت ئاشنای مێژوویان بێت باسەیری کتێبەتایبەتەکانی ئەو بوارە بکات، خوداش هەرکەس کەبیەوێت رێنمایی دەکات.[٢٩]

---

[٢٩] (یَهدِی مَن یَشاء)س المدثر نا ٣٤.

# بەشی حەوتەم

## لەبارەی ئەوەی کە شارە بچوك و گەورەکان لەئەفریقادا کەمن

چونکە سەرزەمینە ناوبراوەکان لەهەزاران ساڵ بەر لەئیسلامەوە موڵکی نەتەوەکانی بەربەر بووە. هەموو ئاوەدانی کۆمەڵگەی ناوچە باسکراوەکان لەقۆناغی دەشتەکیەتیدا بوون شارستانیەت لەو سنور و شوێنانەدا هێندە نەماوەتەوە تاوەکو چۆنیەتی ژیان و گوزەرانیان بگاتە قۆناغی کەماڵ، دەوڵەتانێك لەفەرنگ و عەرەبەکان لەو ناوچانەدا حوکمیان کردووە، حکومەتداریان هێندەی نەخایاندووە کەداب و نەریتەکانی شارستانیەتیان لەومەملەکەتانەدا ڕەگ و ڕیشە دابکوتێت. هەربۆیە داب و نەریتی دەشتەکیەتی لەناویاندا وەك خۆی ماوەتەوە و لەو داب و نەریتانەوە نزیکترن، هەربۆیە بیناو خانووەکانی ئەو ناوچەیە پێشکەوتنیان بەخۆیانەوە نەبینیوە و پیشەسازیش لەنێو بەبەرەکاندا زۆر کەم بووە و، ئەوەش بەهۆی قوڵی ڕەگی دەشتەکیەتی تێیاندا وشارستانیەت و پیشەسازی پێویستی بەکەسانێك هەیە کەبتوانن فێری ببن و ئەوانیش هیچ کەسێکیان لەو بوارەدا هەوڵی نەداوە، هەربۆیە هەوڵی دروستکردنی خانوو باڵەخانەی بەرزو جوانیان نەداوە و نەیانتوانیوە ئەو کارە بکەن. سەرەڕای ئەمەش بەربەرەکان خاوەنی عەصەبیەت و خاندان و هۆزگەلێکن و هیچ گروپێکیان نیە کەخاڵی بێت لەعەصەبیەت عێل عەشیرەت خۆی یەکێکە لە و دیاردانەی کەبەتایبەت لەناو دەشتەکیەکاندا بوونی هەیە، پێویستی شارنشینیش بریتیە لەهێمنی ئارامی و

دانیشتوانی شار لەم کارەشدا پشت بەسوپا وپاسەوانەکان دەبەستن بۆ ئەوەی لەمەترسیەکان بیانپارێزن، هەربۆیە دەبینین کەدەشتەکیەکان هەرگیز حەزناکەن لەشارەکاندا نیشتەجێ بن و تەنها شتێکیش واله مرۆڤ دەکات حەزلە ژیانی شار بکات خۆشگوزەرانی جوانخوازیەکانی ژیانە و ئەم گروپەش زۆر کەمن. هەربۆیە سەرانسەر یان زۆربەی ئاوەدانی ئەفریقا خێوەت نشینن و سەرقاڵی بەخێو کردنی مەڕو ماڵاتن و لەئەشکەوتەکانی کێوەکاندا دەژین. هەموو یان زۆربەی ئاوەدانی وولآتانی غەیرە عەرەب بریتی بووە لەشارو شارۆچکەو گوند لەمەملەکەتەکانی شام و میسر و عێراقی عەجەم و ئەندەلوس و نمونەی ئەمانە بووە، چونکە نەتەوە غەیرە عەرەبەکان بێجگە لەهەندێك شوێنی کەم نەبێت خاوەنی نەسەب نین کەزنجیرەی خاندانی خۆیان بپارێزن و لەو مەسەلەیەدا شانازی بەسەر یەکترەوە بکەن، بەڵکو ئەم تایبەتمەندیە زیاتر لەدەشتەکیەکاندا بوونی هەیە، چونکە پەیوەندی نەسەب ئەوان زیاتر لەیەکتری نزیك دەکاتەوە و ڕەگ و ڕیشەی خزمایەتی بەهێزتر دەکات و عەصەبیەتیشیان بەهێزتر دەبێت و خاوەنانی ئەم جۆرە عەصەبیەتانە خوازیاری دەشتەکیەتین و لەمانەوە و نیشتەجێبوون لەشارەکاندا خۆیان بەدوور دەگرن، چونکە شارنشینی دلاوەریان لەناو دەبات و وایان لێدەکات کەپشت بەخەڵکانی تر ببەستن. کەواتە دەبێت لەم ڕاستیە تێبگەین و هەی موومەسەلەکان قیاس بکەینە سەری.

# بەشی هەشتەم

## لەبارەی ئەوەی کەبیناو باڵەخانەکان لەنێو نەتەوەی ئیسلامدا بەنیسبەتی توانای ئەوان و بەنیسبەت ئەو دەوڵەتانەی کەلە پێش ئەوانەوە ژیاون زۆر کەمە

هۆکارەکەشی هاوشێوەی ئەو بابەتانەیە کە لەبارەی بەریەرەکانەوە باسمانکرد، چونکە عەرەبیش زیاتر لەنەتەوەکانی تر دەشتەکی بوون و دوربوون لەپیشەسازیەوە. وەهەروەها بەهۆی ئەوەی کەتازیەکان بەنیسبەت ئەو مەلەکەتانەی کەلەکاتی ئیسلامدا فەتحیان کردن تاوەکو بەرلە ئیسلام بێگانە و نائاشنا بوون بەپیشەسازی و هەرکە وڵاتە ناوبراوەکانیان لەپاش ئیسلامەوە داگیر کرد، هێندەی نەبرد کەداب و نەریتی شارستانیەتیان وەرگرت و هەرکە بیناو باڵەخانەکانی خەڵکانی تریان بینی و داگیریان کردن ئیتر خۆیان بەبێ نیاز زانی لەدروستکردنی بیناو باڵەخانە و ڕاستەو خۆ لە نێویاندا نیشتەجێ بوون. ئاینیش لەسەرەتاوە ڕێگر بوو لەزیادە ڕەوی کردن لەدروستکردنی بیناو باڵەخانەکاندا بەڕەوا نەدەزانی، هەروەك چۆن لەکوفەدا بەهۆی بەکار هێنانی بەردەوە یەکێك لەخانووەکان گڕی گرت و ئاگرێکی گەورە کەوتەوە و داوای مۆڵەتیان لەخەلیفە عومەر خواست کەلەدروستکردنی خانووە کانیاندا ڕێگەیان بدات بەرد بەکار بهێنن و ئەویش ڕێگەی دان. بەڵام نابێت هیچ کەسێك لەسێ ژوور زیاتر دروستبکات و لەبنیاتنانی خانووەکاندا چاولێکەری لەیەکتر مەکەن و ئیسراف و زیادەڕەوی مەکەن سوننەت بپارێزن بۆ ئەوەی دەوڵەتەکەتان پارێزراو بێت. بەوانەی گوت کەلەدەوریدا بوون کەباهیچ کەسێك

زیاتر لەئاستی پێویست خانووەکەی بەرز نەکاتەوە گوتیان ئەندازەکەی کامەیە؟ گوتی ئەوەی کەلەئیسراف نزیکتان نەخاتەوە و لەمیانەڕەوی نەتانباتە دەرەوە. خەڵکیش لەبەر ئەوەی لەڕۆژگارێکدا کەئاین فەرمانڕەوایی دەکرد دوور کەوتنەوە لەم جۆرە کارانە، بەلأم سروشتی پاشایەتی و دەوڵەتداری و خۆشگوزەرانی زاڵبوو بەسەریانداو عەرەبەکان لەکاروبارەکاندا یارمەتیان لەئێرانیەکان وەردەگرت و، پیشەسازی دروستکردنی خانوویان لەوانەوە وەرگرت و داب و نەریتی شارنشینی و خۆشگوزەرانی بەرەو دروستکردنی خانوو باڵەخانەی بەرزو بڵندی بردن، ئەوکات باڵەخانەی بەرزو کارگەی پیشەسازیان دامەزراند، بەلأم ئەم چۆنیەتیە کاتێك وەدی هات دەوڵەتی عەرەب نزیك بوبویەوە لەهەرەسهێنان و لەناوچوون و ماوەیەکی درێژی نەخایاند کەیتوانن بیناو باڵەخانەی گەورەو فراوان دروستبکەن و، شارە جۆراو جۆرەکان بنیات بنێن، بەلأم نەتەوەکانی تر بەم جۆرە نەبوون چونکە سەردەمی فەرمانڕەوایی ئێرانیەکان هەزاران ساڵی خایاند، هەروەها قیبتی نەبەتی و ڕۆمیەکان و تازیان لەسەردەمەکانی پێشووی عاد و سەمود و عەمالیقە و تەبیعەکاندا ماوەیەکی زۆر فەرمانڕەواییانکرد و، جۆرەها پیشەسازی لەنێویاندا داهێنران، هەربۆیە ژمارەی بیناو پەرستگاکانیان زۆرو زەوەند بوون و سەردەمانێکی زۆر لەدونیادا وەك شوێنەوار و یادگار مانەوە.

ئەگەر خوێنەر لەم بارەیەوە بەدیدێکی بیناوە تێبڕوانێت قسەکانی ئێمە بەگونجاو لەگەڵ واقیعدا دەبینێت، خوداش واریسی زەوی و ئەو کەسانەیە کەلەسەری دەژین.

# بەشی نۆیەم

## لەبارەی ئەوەی کە ئەو بینایانەی کەعەرەب دروستیانکردوون بێجگە لەهەندێك جێگەی کەمدا نەبێت بەخێرایی ڕووخاون

هۆکارەکەشی هەروەك باسمانکرد حاڵەتی دەشتەکیەتی و دوورییانە لەپیشەسازییەوە، هەربۆیە بیناکان لەبناغەوە بەمەحکەمی دروستناکەن. خوداش داناترە. بۆ خراپی بناغەی بیناکانیان هۆکارێکی تریش هەیە و ئەویش ئەوەیە کەئەوان لەبنیاتنانی شارەکاندا هەروەك باسمانکرد کەمتر شوێنی باش هەڵدەبژێرن و ڕەچاوی ئاوو هەوا و لەوەڕگەو سەوزاییەکان ناکەن، چونکە بەهۆی خاڵە ناوبراوەکانەوە باشی و خراپی شارەکان لەڕوانگەی ئاوەدانی سروشتیەوە دەگۆڕێت، ئەمەلەکاتێکدا عەرەب لەم جۆرە وردەکاریانەوە زۆر دوورن، بەڵکو ئەوان تەنها لەوەڕگەی حوشترەکانیان لەبەر چاو دەگرن بەهیچ شێوەیەك گرنگی بەپاکی و ناپاکی ئاوو هەوا نادەن و، بەدوای لەوەڕگەی باش و کشتوکاڵی باشدا ناگەڕێن، چونکە ئەوان بەردەوام لەحاڵی کۆچەریەتیدان و لەم لایەوە دەچن بۆ ئەولا و دانەوێڵەو پێویستیەکانیان لەشارەکانی ترەوە بەدەست دەهێنن. بەڵام لەبارەی هەڵکردنی هەواکانەوە، دەشت و شوێنی هەڵکردنی هەوای جۆراو جۆری هەیە و کۆچکردن لەجێگەیەکەوە بۆ جێگەیەکی تر زامنی شوێنە باشەکانی هەڵکردنی هەوایە، چونکە هەوا ناپاك و بۆگەنەکان بەهۆی مانەوە لەیەك شوێنداو مانەوە و زۆربوونی خۆڵ و خاشاك و زبڵ پیسیەکان دەردەکەون، سەیر کە کاتێك تازیەکان کوفەو بەصرەو قەیرەوانیان بنیاتنا بێجگە لەوەڕگەی حوشترەکانیان گوێیان بەهیچ شتێکی

ترنەداو، تەنها گرنگیان بەنزیکی و ڕێگەکانی کۆچکردن دا. هەربۆیە ناوچە ناوبراوەکان لەڕوانگەی بارودۆخی سروشتیەوە بەهیچ شێوەیەك بۆ شار گونجاو نەبوو هەروەك باسمانکرد مادەیەك لەپاراستنی کۆمەڵگەو ئاوەدانیدا پێویستە لەنێو ئەواندا بوونی نیە، تاوەکو لەپاش فەرمانڕەواییشیان یارمەتی دەربێت بۆ ئاوەدانی ئەو شارانە، هەروەك چۆن ئەو شوێنانەی کەبۆ دروستکردنی ئەو شارانە دیاریان کردبوون بۆ ژیان گونجاو نەبوون و نەکەوتبوونە نێو کۆمەڵگە و تایفە جۆراو جۆرەکانەوە، تاوەکو خەڵکی ئاوەدانیان بکەنەوە و دانیشتوانیان زۆر ببێت. هەربۆیە لەیەکەمین قۆناغدا کەفەرمانڕەواییان لەناوچوو عەصەبیەتەکەیان کەوەك حەصارێك وابوو بۆ ئەو شارانە لەناو چوو شارە ناوبراوە کانیش زۆر زوو وێران بوون، هەروەك بڵێی لەم جیهانەدا نەبوبن. خوداش کارەکان ڕادەپەڕێنێت و مەبەستەکانی وەدی دەهێنێت و هیچ کەسێك ناتوانێت حوکمی دوا بخات[٣٠].

---

[٣٠] (وَاللهُ يَحكُمُ لامُعَقِّبَ لِحُكمِهِ) س رعد ئا ٤١.

# بەشی دەیەم

## لەبارەی بنەماکانی وێرانبوونی شارەکانەوە

دەبێت ئەوە بزانین سەرەتا کاتێك شارەکان بنیات دەنێن هەندێك خانووی کەم لەو ناوچەیەدا هەیە و شتە بنەڕەتیەکانی دروستکردنی خانوو باڵەخانەکان وەك بەرد و قسلّو هۆکارەکانی تر کەبۆ بەرزکردنەوەو جوانکردنی دیوارەکان بەکاردێن، وەك بەردە تاشراوو ساف و مەڕمەڕەکان و کاشی و صەدەف و شوشە تێییاندا بوونیان نیە، هەربۆیە بیناکانی لەوەها بارودۆخێکدا وەك خانووی دەشتەکیەکان وان و کەرەستەکانیان خراپ و بیّ کەڵکە. بەڵام کاتێك کەئاوەدانی و کۆمەڵگەی شار فراوان ببێت دانیشتوانەکەی زۆر بن و هۆکارەکانیش بەهۆی ئیش و کارو پیشەکانەوە و زۆردەبن و دەگاتەقۆناغی کەمال، هەروەك لەم بارەیەوە باسمانکرد. هەربۆیە هەرکات ئاوەدانیەکەی وێران ببێت و دانیشتوانەکەی کەم ببنەوە، و بیناو باڵەخانەکانیشی بەرەو کەمی بچن بینای بەرزو جوانی تێدا نەمێنێت، دەبینین بەهۆی کەمی دانیشتوانەوە کارو پیشەکانیشی کەم دەبنەوە و، لەئەنجامدا هێنانی کەرەستەی وەك بەردی مەڕمەڕ و شتەکانی تریش بۆ ئەو شارە بەرەو کەمی دەچێت و وورده وورده خەڵکی ئەم شتانە لەدەست دەدەن و بۆ دروستکردنی خانووەکانیان لەکەرەستە کۆنە و سەرەتاییەکان سود وەردەگرن و لەکارگەیەکەوە بۆ کارگەیەکی تر دەیانگوازنەوە، چونکە زۆربەی کارگە و کۆشك و خانووەکان بەهۆی کەمی ئاوەدانیەوە خاڵین لەدانیشتوان و شار ئەو ڕەونەق و

دەرەوشاوەییەی جارانی لەدەست دەدات، و بەردەوام ئەم کەرەستانە لەبینایەکەوە بۆ بینایەکی تر دەگوازرێنەوە و، بەکار دێن و بەهۆی نەبوونی کەرەستەی گواستنەوەیانەوە لەم نێوەندەدا زۆربەیان لەناو دەچن و وون دەبن و کۆنیش دەبن و هێندە نابات و پاش ماوەیەك ژیان لەبواری خانوو باڵەخانەکاندا دەگەڕێتەوە دۆخەکەی پێشووی، واتە دەشتەکیەتی و لەبری بەرد خشتی قوڕ بەکار دەهێنن و بەتەواوی جوانی لەدەست دەدەن و خانووەکان وەك خانووی گوندەکانیان لێدێت و شوێنەواری دەشتەکیەتیان تێدا دەردەکەوێت، وهێندە کەم و کورتی ڕووی تێدەکات تاوەکو وێران دەبێت ، ئەگەر بۆی تەقدیر کرابێت. دەستوری خودای گەورەیە لەنێو بەندەکانیدا.

# بەشی یازدەهەم

## لەبارەی ئەو لە پێشتریەی کەشارە بچوك و گەورەکان لەخۆشگوزەرانی خەڵکەکانیان و رەواجی بازارەکان بەسەر یەکتریدا هەیانە پەیوەستە بەکەمی یان زۆری ئاوەدانی کۆمەڵگەی شارەکانەوە

هۆکارەکەشی ئەمەیە کە سەلمێنراوو زانراوە کەمرۆڤێك بەتەنهایی هەوڵی بەدەستهێنانی پێویستیەکانی خۆی نادات، بەڵکو تاکەکانی یەك کۆمەڵگە بەشێوەیەکی هەرەوەزی و بەیەکەوە هۆکارەکانی ژیان و گوزەرانیان فەراهەم دەکەن کەبەهۆی هاوکاری و یارمەتیدانی گروپێك لەخەڵکی لەنێوان یەکتریدا بەدی دێت و پێویستیەکانیان فەراهەم دەکات. هەروەك چۆن بۆ نمونە یەك کەس بەتەنهایی ناتوانێت گەنمی پێویستی خۆی فەراهەم بکات، بەلأم هەرکات بۆ بەدەستهێنانی شەش بۆ دەکەس هاوکاری یەکتری بکەن، واتە ئاسنگەر و پیشەگەر بۆدروستکردنی پێداویستیەکانی کیلأن و چاندن و دروێنەکردن و شتەکانی تر ئیتر ئەم کارانە لەنێو خۆیاندا دابەش بکەن یان بەشێوەیەکی دەستەجەمعی ئەنجامیان بدەن و، بەم کارەیان کەمێك خۆراك بەدەست بهێنن، ئەوکات ئەم مادە خۆراکیە بۆ کۆمەلأنێکی چەند بەرابەری ئەوانیش بەس دەبێت و بەشیان دەکات. کەواتە کارکردی مرۆیی لەپاش کۆمەڵگە و هاودەستی یەکتر لەپێویستیەکانی خۆشیان (واتە کرێکارەکان) زیاتر بەرهەم دەهێنن. وەهەرکات هەموو کارەکانی دانیشتوانی شارێك یان ناوچەیەك دابەشبکرێت بەسەر ئەندازەی پێویستیەکانیاندا،

ئەوکات ئەندازەیەکی کەم لەو کارانە لەبەرامبەر پێداویستیەکانیانەوە بەس دەبێت کارەکانیان یەکسەرە بەنیسبەت پێویستی و نیازەکانیان زیاتر دەبێت و، ئەو کات زیادەی ئەم بەرهەمانە سەرفی داب و نەریت و چۆنیەتی خۆشگوزەرانی جوانخوازی دەکرێت و پێداویستی شارەکانی تریش دابین دەکەن و، لەبەرامبەر شتوومەکی تر یان بەنرخێکی گونجاو دەیانکڕن، هەربۆیە دەگەنە قۆناغی هێزو دەسەڵات، ئێمەش لەبەشی پێنجەمدا لەبابی پیشە و ڕۆزیدا ئەوەمان سەلماند کە دەرامەت و دارایی بریتیە لە بەهای کارە مرۆییەکانە، هەربۆیە هەرکات کارە مرۆییەکان زۆر بن ئەوابەهاکەشیان لەنێو ئەواندا زۆر دەبێت و لەئەنجامدا بمانەوێت و نەمانەوێت دارایی و دەرامەتیان زیاد دەکاتو، دەبێتە هۆی خۆشگوزەرانی و بەوەش کۆتایی دێت کە ڕوودەکەنە جوانخوازی و خۆشگوزەرانی و جوانکاری لەهەموو بوارەکاندا، وەك خانوو پۆشاك و کەرەستەکانی ناوماڵ و دامەزراندنی خزمەتکارو ڕازاندنەوەی ئەو شتانەی کەسواری دەبن و ڕازاندنەوەی ماڵەکان و ناوبازاڕو زۆر بوونی پیشەسازیەکانی ڕەفاهیەتی ژیان و لەئەنجامدا ئاستی خەرجیەکان زۆر دەبێت و، ئەو پیشەوەرو هونەرمەندانەی کەئەم کارانەیان کردووەتە پیشەی خۆیان سەروەت و سامانێکی زۆر بەدەست دەهێنن و لەگەڵ بەرەو پێش چوون و پێشکەوتنی کۆمەڵگەدا پیشەو کارەکانیش پێش دەکەون و جوانخوازیش بەهەمان شێوە فراوان دەبێت و، پیشەو کارانێکی نوێ لەو بوارەدا دادەهێنرێن و بەهایان بەرز دەبێتەوە، هەربۆیە دارایی و بەروبووم لەشاردا بۆ جاری دووەم دەبێتە دوو بەرابەر و بازاڕی کار لەجاری یەکەم زیاتر ڕەواج پەیدا دەکەن و، لەجاری دووەم و سێیەمدا کاروبارەکان ڕەونەق وەردەگرن.. چونکە هەموو ئەو کارانە تایبەت دەبن بەکاروبارەکانی جوانکاری و خۆشگوزەرانیە وە، بەپێچەوانەی ئەوکارە بنەڕەتیانەی کەتەنها پەیوەندیان بەکاروباری ژیان و گوزەرانەوە هەیە.

کەواتە هەرکات شارێك بەهۆی یەکجۆری کۆمەڵگە و ئاوەدانیەوە پێش بکەوێت ئەم پێشکەوتنەش بەهۆی زۆری بەدەستهاتووەکانی هۆکارەکانی خۆشگوزەرانی داب و

نەریتەکانی جوانخوازیەوە بووە کەلەشارێکی تردا نیە، هەرچەندە ئاوەدانی ئەو لەشارەکانی تر زیاتر فراوانتر بێت بارودۆخی ژیانی خەڵکەکەیشی بەهەمان ئەندازە لەتواناو خۆشگوزەرانیدا لەبارو دۆخی ژیانی خەڵکی شارێك کەلەو نزمترە خۆشگوزەرانترو ڕەفاهی تر دەبێت، ئەم گونجانەش لەسەر یەك شێوە لەتەواوی بەشەکاندا دەر دەکەوێت، هەروەك چۆن ژیانی قازی و بازرگان و پیشەگەر و بازاڕی و ئەمیر و پۆلیس (پاسەوان) ی ئەم شارە لەگەڵ ژیانی هەموو بەشەکانی خەڵکی دواکەوتوودا جیاوازی هەیە، ئەم حەقیقەتەش دەتوانین لەمەغریبدا تێبینی بکەین و بارودۆخی فاس لەگەڵ شارەکانی تری ئەوناوچەیەدا، بەنمونە بهێنینەوە پێوانە بکەین لەگەڵ تلمسان و سیبتەدا، ئەوکات دەبینین لەنێوانیاندا ئیتر لەڕووی گشتیەو بێت یان لەڕووی تایبەتەوەبێت جیاوازیەکی زۆر هەیە. هەروەك چۆن ژیانی یەك قازی لەفاسدا ڕەفاهی ترە لەقازیەکی تلمسان و هەروەها هەریەشێك لەهەردوو شاری ناوبراودا بەیەکەوە پێوانەیان بکەین، دەبینین کەبارودۆخی ژیانی ئەوان لەفاسدا باشترە لەژیانی هەمان ئەو بەشە لەتلمسانداا، وەهەروەها بارودۆخی تلمسان لەگەڵ وهران و الجزایر دا لەگەڵ ئەو شارانەی کەلەوان ئاستیان نزمترە بەم شێوەیە تاوەکو دەگەینە گوندە کوێستانیەکان کەکارەکانیان تەنها لەفەراهەمکردنی پێویستیەکانی ژیانیاندا کورت بووەتەوە، یان لەفەراهەمکردنی ئەو شتە پێویستیانەشدا بێ توانان.

هۆکاری ئەو جیاوازیە بریتیەلە کارەکان لەشارە ناوبراوەکاندا هەروەك بڵێی هەموویان بریتین لەبازاڕ گەلێکی تایبەتی کارەکان و خەرج لەهەربازاڕێکدا بەئەندازە ونیسبەتی خۆیەتی، هەروەك چۆن دەرامەتی یەك قازی لەفاس و هەم لەتلمساندا بەرابەرە بەخەرجەکەی، بەڵام لەهەر شوێنێکدا دەرامەت و خەرج زیاتر بێت بارودۆخی ژیانی خەڵکەکەی گەورەتر و فراوانتر دەبێت، دەرامەت و خەرج لەفاسدا بەهۆی ڕەواجی بازاڕی کارەوە لەوێدا زیاترە لەشارەکانی تر چونکە جوانخوازی و سەروەت و سامان لەو شارەدا زیاتر و فراوانترە، هەربۆیە بارودۆخی ژیان و گوزەرانی خەڵکەکەشی فراوانتر و زیاترە.

ئەوکات بارودۆخی ژیانی خەڵکی وهران و قوستەنتینیەو الجزایر و بیسکرەش بەهەمان شێوەیە، تاوەکو هەروەك باسمانکرد دەگەینە شارانێك کەکاریان بۆ فەراهەم کردنی پێویستیەکانی ژیانیان بەس نیە ناتوانین بەم ناوچانەش بڵێین شار، چونکە لەڕیزی گوند و شارو شارۆچکەکاندا دێنە ئەژمار، هەربۆیە خەڵکی ئەم جۆرە شارە بچوکانە بارودۆخی ژیانیان لاوازە و تائەندازەیەك دووچاری هەژاری و کەم دەستی بوونەتەوە، چونکە کارەکانیان بەپێی پێداو یستیە کانی ژیانی ڕۆژانەیان نیەو ئەو ماڵ و سامانەی کەبۆ قازانج دەیخەنەکارەوە زۆر نابێت، هەربۆیە داراییەکەیان زیاد ناکات و بێجگە لەهەندێك شوێنی کەم نەبێت لەزۆربەی کاتەکاندا نەدار و بێنەوان.

ئەم حەقیقەتەش دەتوانین تەنانەت لەبارودۆخی ژیانی سواڵکەر و بێنەواکانیشیاندا لێکۆڵینەوە بکەین، چونکە دەرۆزەکەر و سواڵکەرانی فاس لەوانەی تلمسان خۆشگوزەرانترن، من لەفاسدا بینیومە کەسواڵکەرەکان لەڕۆژەکانی قوربانیدا بەهای گۆشتی قوربانیان دەویست و زۆرێك لەپێداویستیەکانی جوانکاری و کەرەستەکانی بەتواناکان وەك گۆشت و ڕۆن و کەرەستەکانی چێشتخانەو پۆشاك و کەرەستەکانی ژیانیان داوادەکرد، ئەگەر بێت و سوڵکەرێك لەتلمسان یان وهراندا داوای شتێکی لەو جۆرە بکات سەرزەنشتی دەکەن.

لەم سەردەمەشدا لەبارەی داب و نەریتەکانی تواناوەبوون و هۆکارەکانی نازو نیعمەتی خەڵکی قاهیرەی میسر شتانێکمان پێدەگەیشت کەزۆر سەرسوڕهێنەر بوون، بەجۆرێك نەدارانی مەغریب حەزیان دەکرد لەمیسر بژین، چونکە لەبارەی ڕەفاهیەتی بارودۆخی ژیانی خەڵکی ئەوێیان دەبیست کەلەزۆرێك ناوچەکانی تر ڕەفاهی ترو ئارام ترو باشتر بوو. هەمووانیش پێیان وایە هۆکارەکەی ئەوەیەکە[٣١] لەو سەرزەمینەدا سەروەت و سامانێکی زۆر و زەوەند هەیەو، گەنجینە گەلێکی فراوان لەدەستی خەڵکی ئەو

---

[٣١] خەڵکی ئەو سەرزەمینە بەبەراورد بەناوچەکانی تر خێرو چاکەی زۆریان دەکرد و، گەنجینە گەلێکی زۆریان لەبەر دەستدابووە.

وولاّتەدایەو خەڵکی ئەو وولاّتەش زیاتر لەخەڵکی شارەکانی تر خێر و چاکە دەکەن، ئەمە لەکاتێکدا ڕاستیەکەی بەم شێوەیە نیە بەڵکو هۆکاری فراوانی نیعمەت و سەروەتی ئەو سەرزەمینە هەروەك دەزانین ئەوەیە کە میسر و قاهیرە لەڕووی ئاوەدانیە بەبەراورد بەو شارانەی کەلەدەستڕەسی ئێمەدایە لەپێشترن، هەربۆیە هۆکارەکانی ئاسایش و ڕەفاهیەت لەو وولاّتەدا فراوان بووە.

بەلاّم بارو دۆخی دەرامەت و خەرج لەهەموو شارەکاندا یەکسانە و هەرکات دەرامەت زۆر ببێت خەرجیش بەهەمان ڕێژە زۆر دەبێت و بەپێچەوانەشەوە. وەکاتێکیش ئاستی دەرامەت و خەرج بەرز ببێتەوە و ژیانی خەڵکی خۆش ببێت و شاریش بەرەو گەشەکردنو فراوانی دەچێت. هەرچیەك لەبارەی ئەم جۆرە مەسەلانەوە دەیبیستی ئینکاری مەکە و لەگەڵ زۆربوونی ئاوەدانی و ئەوەی کەلەوەوە بەدی دێت هەڵبسەنگێنە هەروەك: بەروبووم و داراییەکان کەبەهۆیانەوە بەخشش و ئیسار بۆ خوازیارانی ئاسان دەبێت. ئەم جۆرە دەرئەنجامانەی ئاوەدانی لەباش بوونی ژیانی خەڵکی و فراوانی گەشەی شارەکاندا زۆر کاریگەری دەبێت. هاوشێوەی ئەم بارودۆخەش دەتوانین لەحەیواناتی کێویدا لەماڵەکانی شارێکدا ببینین کەچۆن لەڕووی دورکەوتنەوەوە لەیەك ماڵ یان نزیك بوونەوە لەخانوویەکی تر جیاوازیان هەیە، چونکە لەناو حەوشە و سنوری خانووی خەڵکانی هەبوو بەتوانا و خاوەن نازو نیعمەت کەسفرە کەلێکی ڕازاوە و ڕەنگاو ڕەنگیان هەیە، بەهۆی ڕژاندنی پاشماوەی زۆری چێشت و خۆراکەکانەوە جۆرەها گیانەوەری وەك مێرولەو مێروەکانی تر لەوێدا بوونیان هەیەو، لەژێر زەویەکانیشدا مشکێکی زۆرو زەوەند هەن و لەئاسمانەکانیاندا باڵندەی جۆراو جۆر پۆل پۆل دەفڕن و دەنیشنەوە و سود لەو پاشماوانە وەردەگرن و، خۆیان لەتینویەتی برسیەتی ڕزگار دەکەن، بەلاّم لەگەڕەك و ماڵەکانی هەژار نشینەکاندا دەبینین بارودۆخە پێچەوانەیە و هیچ جۆرە گیانەوەر و پەلەوەرێك لەو ناوەدا نابینرێت، هەروەك شاعیر دەڵێت: باڵندەکان لەشوێنێك دەنیشنەوە کە خۆراك و دانەوێڵەی تێدا بێت، ئەوان دێنە ماڵی بەخشندە و

داراکانەوە[٣٢] کەواتە لەنهێنیەکانی خودای گەورە وورد ببەرەوە و کۆمەڵانی خەڵك لەگەڵ دەستەی گیانەوەران و ووردەی سفرەکان لەگەڵ زیادەی ڕۆزی و سەروەتدا بەراوورد بکە کەچۆن بەخششەکانی بۆ کەسانێك کەنیەتی بەخشینیان هەبێت ئاسان دەبێت، چونکە زۆرێك لەخەڵکی بێنیازن لەوشتانەی کەدەیبەخشن بەخەڵکی و لەلایان زۆر و زەوەندن، وەدەبێت ئەوەش بزانین کەفراوانی و هەبوونی نازو نیعمەت لەکۆمەڵگەدا پەیوەستە بەفراوانی ئەوانەوە، خوداش بێنیازە لەجیهانیان[٣٣] .

[٣٢] دەقی شیعرەکەی سەعدی شیرازیەکەدەڵێت: مرغی جایی رود کەچینە بود نەبجایی رود کە چی نبود

[٣٣] (وَاللهُ غَنیٌّ عَن العالَمینْ) س ال عمران ئا ٩٢.

# بەشی دوازدەیەم

## لەبارەی ئەرزاق و کاڵای شارەکان

پێویستە ئەوە بزانین کەکاڵاو هەموو مادەکانی بازار بریتین لەپێداویستیەکانی خەڵکی، ئەم مادانەش دوو جۆرن: هەندێکیان زۆر پێویستن وەك مادە خۆراکیەکانی گەنم و جۆ و هاوشێوەکانیان وەك پاقلە و نۆك و دانەوێڵەکانی تر. وەهەروەها تامخۆشکەری چێشتەکان وەك پیاز و سیر و شتەکانی تر، وەهەندێکی تریشیان لەقۆناغی کەمالیاتدان وەك: خۆرشت و میوە و پۆشاك و کەرەستەی خانوو هۆکارەکانی سواربوون و گواستنەوە و بەشەکانی تری خانوو باڵەخانەکان. وەهەرکاتێك شار فراوان ببێت و دانیشتوانەکەی زۆر ببن نرخ و بەهای مادە خۆراکیەکانیش هەرزان دەبێت و نرخی شتە کەمالیاتەکانی وەك خۆرشت و میوە و شتەکانی تریش گران دەبێت. وەهەرکات دانیشتوانی شارێك کەم ببنەوە و ئاوەدانی کۆمەڵگاکە لاواز ببێت مەسەلەکە پێچەوانە دەبێتەوە. هۆکارەکەشی ئەوەیە کەلەبەر دانەوێڵە لەمادە خۆراکیە پێویستەکانە و بۆ بەرهەمهێنانی هەوڵێکی فراوان دەدرێت، چونکە هیچ کەسێك لەفەراهەمکردنی مادەی خۆراکیە مانگانە یان ساڵانەکانی خۆی و خێزانەکەی بێئاگا نابێت و، هەربۆیە هەموو یان زۆربەی خەڵکی لەو شارە یان لەناوچەکانی تری نزیك لەو شوێنە بۆ بەرهەمهێنان و بەدەستهێنانیان هەوڵ دەدەن و، ناچارن ئەم پێداویستیانەی خۆیان فەراهەم بکەن، لەبەرئەوەی کەهەمووخەڵکی بۆ بەدەستهێنانی مادە خۆراکیەکان بەنیسبەت

پێویستیەکانی خاندانەکانیان زۆرتر دەبێت و، پێویستی زۆرێك لەخەڵکی تری ئەو شارەش دابیندەکات و لەزۆربەی کاتەکاندا نرخ و بەهای ئەو مادە خۆراکیانەش دادەبەزێت مەگەر لەهەندێك ساڵدا بەهۆی ئافەت و کەم بارانیەوە بەرو بووم کەم بێت و لەترسی ئەم جۆرە حاڵەتانە هەندێك جار نرخی خۆراك بەرز ببێتەوە. ئەگەر لەبەر ئەم شتانە خۆراك نەشاردرێتەوە ئەوا زۆر بەئاسانی دەکەوێتە دەستی خەڵکیەوە هەندێك جار بەبێ بەرامبەریش. بەڵام پێداویستیەکانی تری ژیان وەك خۆرشت و میوەکان و شتەکانی تریش هێندە خەڵکی شار بەگشتی پێویستیان نیە و گرنگیەکی زۆری پێنادەن و، بەتایبەت هەوڵی بەدەستهێنانیان نادەن، بەڵکو زۆربەی خەڵکیش هێندە خۆیانیان پێوە سەرقاڵ ناکەن، سەرەڕای ئەمەش، کاتێك شارێك لەڕووی ئاوەدانیەوە فراوان ببێت داب و نەریتەکانی خۆشگوزەرانی لەڕادە بەدەر ڕوولەزیاد بوون بکات ئەو کات ئەم جۆرە پێداویستیە ناسەرەکی و هونەریانە ڕەواج پەیدا دەکەن و، خوازیارانێکی زۆریان دەبن هەموو چینەکانی خەڵکی لەژیانی ڕۆژانەیاندا بەکاریان دەهێنن و لەئەنجامدا ئەندازەی ئەم شتانە بەبەراورد بەڕێژەی بەکار هێنانیان زۆر کەم دەبێتەوە و کڕیارانی زۆر دەبن، ئەمە لەکاتێکدایە کەڕێژەی ئەو شتەکەمالیاتانە هەروەك جارانن و هیچ زیادیان نەکردووەو خوازیاران بۆ بەدەستهێنانیان قەرەباڵغی دروستدەکەن و سەرمایەداران و خاوەن تواناکان نرخەکانیان لەڕادە بەدرەر بەرز دەکەنەوە چونکە زیاتر لەخەڵکی هەژارو ئاسایی پێویستیان پێیان هەیە (داراو هەبووەکان) هەربۆیە وەك دەبینین ئەم جۆرە پێداویستیان گران دەبن.

بەڵام لەبارەی گرانی پیشەسازیی و هەقدەستی ئەوانەی کەئەوشتانە دروستدەکەن لەشارە قەرەباڵغەکاندا سێ هۆکاری هەیە:

١ – زۆری پێویست بوون پێیان بەهۆی فراوان بوونی ئاوەدانی کەدەگاتە قۆناغی جوانخوازی و توانا.

٢ – بەڕێز سەیر کردنی کارلەلایەن پیشەوەران و صەنعەتگەران و بەکەم نەزانینی خۆیان بەهۆی ئاسانی و خۆشی ژیان و گوزەرانی شارەوە.

٣ – زۆربوونی بەتواناکان و جوانخوازان و پێویستی زۆریان بەوەی کە خەڵکی بکەنە خزمەتکاری خۆیان و لەتوانای پیشەگەران لەپیشەسازیەکان سود وەربگرن، هەربۆیە دەبێتە کێبڕکێ لەسەر تایبەتکردنی پیشەوەران هەرپیشەوەرەو بەدەوڵەمەندێکەوە و ئەمەش وادەکات کەپیشەوەران هەقدەست و مووچەیەکی لەڕادەبەدەر وەربگرن، واتە زیاتر لەبەهای ڕاستەقینەی کارەکانیان و ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی کە پیشەوەران بەڕێزتر ببن و، کارەکانیان گران ببێت و لەئەنجامدا خەرجی خەڵکی لەڕادەبەدەر زۆر دەبێت. بەڵام لەشارە بچوکەکاندا مادەخۆراکیەکانی خەڵکی کەمن، چونکە لەلایەکەوە کاری بەرهەمهێنان لەم شوێنانەدا کەم دەبێتەوە و لەلایەکی تریشەوە بەهۆی بچوکی شارەوە ترسی ئەوەیان هەیە کەمادە خۆراکیەکان کەم ببنەوە، هەربۆیە ئەوەی کەبەدەستی دەهێنن لەلای خۆیان دەیهێڵنەوە و ئیحتیکاری دەکەن و لەئەنجامدا مادەناوبراوەکان لەنێویاندا کەم دەبێتەوە و نرخیشیان بەرز دەبێتەوە. بەڵام ئەو مەرافیقانەی[٣٤] کەهەیانە سودیان نابێت بەهۆی کەمی دانیشتوان و تەنگی مەعیشەتی خەڵکیەوە کڕیار نامێنێت و بازاڕیان ڕەواجی نامێنێت و هەرزان دەبێت.

وەهەندێك جاریش بەهای ئەو باج و خەراجەی کە بەناوی سوڵتانەوە لەبازاڕ و دەروازەکانی شاردا لەسەر ئەرزاقی گشتی دایدەنێن و، هەم ئەو سودانەی کە کۆکەرەوەکانی خەراج لەفرۆشیارانی وەردەگرن بۆ خۆیان دەبێتە هۆی زۆربوونی بەهای مەوادە خۆراکیەکان لەشارەکاندا گران دەبێت و لەگوند و ناوچەکاندا هەرزان، چونکە باج و خەراج کەفەرمانبەران لەخەڵکی وەردەگرن و ئەو تەکلیفانەی کەدەیدەن بەسەر خەڵکیدا لەنێوئەواندا (خەڵکی گوندەکان) کەمترە یان هەرنیە، بەڵام لەشارەکان و بەتایبەت لەقۆناغەکانی کۆتایی تەمەنی دەوڵەتاندا ئەم جۆرەماڵیاتانە بەڕۆژی ڕۆشناو

---

[٣٤] مرافق: بەهەرشتێك دەگوترێت کەسودی لێوەر بگیرێت.

بەشێوەیەکی ڕۆژانە زیاد دەبن. هەندێك جاریش بەهۆی ئەو ئەرك وماندوبوونەی کەلەبەرهەمهێنانی مادە خۆراکیەکاندا دەیکێشن نرخەکەیان بەرز دەکەنەوە و ئەم بەشەش لەبەهای شتەکان دەپارێزن (واتە نرخەکانیان)، هەروەك چۆن لەم ڕۆژگارەداو لەئەندەلوس ئەم شتە ڕوویداوە. چونکە لەبەرئەوەی کەمەسیحیەکان موسوڵمانەکانیان لەزەویە باش و بەپیتەکانی ئەندەلوس دەرکردبوو بەناچاریەوە پەنایان بردبووە کەنار دەریا و ناوچە ناسازگارەکان کەلەوێدا گیاو کشتوکاڵ بەباشی بەدەست نایەت زەویە بەپیت و شارە پاکەکان[٣٥] و، خۆش ئاوو هەواکان مەسیحیەکان داگیریان کردبوو هەربۆیە بەناچاریەوە بۆ کشتوکاڵ کردن کێڵگە و گای تایبەتیان بەکشتوکاڵ کردن بەکرێ بگرن و هەوڵێکی زۆر بدەن بۆ گۆڕینی ئەو زەویانە بەزەوی گەلێکی بەپیت و، بەرەکەت بەچەندین ڕێگەی تایبەت وەك وەشاندنی کوت پێیاندا و شتەکانی تریش، هەربۆیە ناچار دەبوایە خەرجێکی زۆریان لەم پێناوەدا بکردایە، ئەمەیە کەخەرجیەناوبراوەکان لەنرخی فرۆشتنی بەرهەمەکاندا حیسابدەکەن و لەو کاتەی کەمەسیحیەکان موسوڵمانەکانیان لەئەندەلوس ناچار کردبوو کەکۆچ بکەن بۆ ئەم ناوچەیە سەرزەوی نابراو لەگەڵ کەنارەکانیدا تایبەت کرا بەموسوڵمانانەوە و، نرخ بەرز دەبێتەوە و وولاتی ئەندەلوسیش ناوبانگ دەردەکات بەگرانی نرخی شتەکان.

کاتێکیش خەڵکی دەبیستن کەناوچەکەیان دووچاری گرانی نرخی خۆراکو پێداویستیەکان بووەتەوە واگومان دەبەن هۆکارەکەی کەمی مادە خۆراکیەکانو دانەوێڵەیە لەو ناچەیەدا. ئەمە لەکاتێکدا حەقیقەتی مەسەلەکە بەم شێوەیەنیە، خەڵکی ئەندەلوسیش وەك دەزانین بەبەراورد بەخەڵکی ئەو ناچەیە جووتیار ترن و شارەزاترن لەخەڵکانی تر لەو بوارەدا و، زۆر بەکەمی هەرلەسوڵتانەوە بیگرە تاوەکو ئاسایی ترین کەس نیە کەلەماڵەکەیدا ڕووبەرێکی کشتوکاڵی نەکردبێت، مەگەر گروپێکی کەم لەصەنعەتگەر و پیشەوەران یان ئەو غەریبانەی کەلەشارێکی ترەوە هاتبن وەك غازیانی

---

[٣٥] (وَالبَلَدُ الطَّيِّب) س اعراف ئا ٥٨.

موجاهید کەخاوەنی موڵکی چێندراو نین، هەربۆیە سوڵتان لەبری مووچەدان بەم جۆرە غازیانە شتومەك و خۆراکیان دەداتێ و واتە مادە خۆراکی و دانەوێڵەکانیان لەسەر کشتوکاڵەکان دیاری دەکات. هەربۆیە تەنها هۆکاری گرانی دانەوێڵە لەنێو ئەواندا هەرئەوەیە کەباسمانکرد، وەلەبەر ئەوەی بەپێچەوانەوە بەربەرەکان لەسەرزەویە بەپیتو ئاوەدانەکاندا دەژین هەموو نارەحەتیەکیان لێ دوور کەوتووەتەوە، سەرەڕای ئەوەی کە جووتیاری شتێکی گشتی و زۆرە، ئەمەش بووەتە هۆی هەرزانی مادە خۆراکیەکان لەووڵاتی ئەواندا. خوداش ئەندازەگیری شەوو ڕۆژە[36].

[36] (وَاللهُ يُقَدِّرُ اللَّيلَ وَالنَّهارَ). س المزمل ئا ٢٠.

# بەشی سیازدەیەم

## لەبارەی ئەوەی کە خەڵکی دەشتەکی ناتوانن لەشارە قەرەباڵغەکاندا نیشتەجێ بن

هۆکارەکەشی ئەوەیە کەهەروەك لەبەشەکانی پێشوودا باسمانکرد لەشارە قەرەباڵغەکاندا سەروەت و هۆکارەکانی نازو نیعمەت زۆر دەبێت و، خوو دەگرن بەم پێویستیانەوە و لەئەنجامدا هۆکارەکانی نازو نیعمەت دەگۆڕێت بۆ پێویستی و لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا هەموو کارەکان لەم جۆرە شارانەدا دەبنە خاوەن بەها و بەهۆی قەرەباڵغی، مەبەستەکانی دروستبوو لەنازو نیعمەت بەقازانجی ئەوانە دەبێت کەبەشوێن سوددا دەگەڕێن، چونکە لەلایەك هۆکارەکانی خۆشگوزەرانی و سەروەت و سامان زۆر دەبێت و، لەلایەکی تریشەوە لەبەر ئەوەی کەماڵیاتە سوڵتانیەکان کەدەخرێنە سەر کاڵاو شتوومەکەکان لەنرخی کاڵاکاندا تێبینی دەکەن و حیسابی بۆ دەکەن، بتەوێت و نەتەوێت هەم کەرەستەکانی کەمالیات و جوانخوازی و هەم مادە خۆراکیەکان و بەرهەمی کارەمرۆییەکان بێ ئەندازە گران دەبێت و، سەرئەنجام خەرجی خەڵکی زیاد لەئەندازە بەبەراورد لەگەڵ ئاوەدانیدا زۆر دەبێت و خەرجیەکانی هەرتاکێکیش بەهەمان ئەندازە زۆر دەبن و، ژمارەیەکی گەورە تۆمار دەکەن لەم هەلو مەرجەشدا تاك بۆ دەرامەتی پێویستیەکانی خۆی و خێزانەکەی پێویستی بەسەروەتێکی زۆر هەیە، کەسێکی دەشتەکی کەدەرامەتێکی کەمی هەیە و لەشارێکی بچووکدا دەژی و بازاڕی کاری بۆ

بەدەستهێنانی سەروەت و سامان گونجاو نیە، ناتوانێت پیشەیەك بۆ بەدەستهێنانی ماڵو سامان و دەرامەت بۆ خۆی فەراهەم بكات، هەربۆیە ژیانی ئەو لەشاری گەورەدا زۆر دژوارە چونكە لەم جۆرە شارانەدا كەرەستەكانی كەمالیات زۆر و زەوەندن و لەگەڵ ئەوەشدا بەدەستهێنانی پێویستیەكانی ژیان سەخت و دژوارن، ئەمە لەكاتێكدا هەمان دەشتەكی لەحاڵەتی بیابانگەڕیدا بەكەمترین كار پێویستیەكانی خۆی فەراهەم دەكات، چونكە ئەو لەمەسەلەی مەعاش و خەرجیەكانی تری ژیاندا كەمتر پابەندە بەداب و نەریتەكانی كەمالیاتەوە و ئەگەریش هەبێت زۆر كەمە، هەربۆیە پێویستی بەسەروەت و سامانێكی زۆر نابێت.

وەهەركەسێك لەدەشتەكیەكان ڕوویكاتە شار و لەوێدا بژی هێندە نابات بێتوانایی ئەو دەردەكەوێت و ڕسوادەبێت، مەگەر ئەوانەی كەسەروەت و سامانێكی فراوان بەیەكەوە دەنێن و لەقۆناغێكدا دەژین كەلە ئاستی پێویستیەكان زیاترە و دەگەنە ئاستی ژیانی شارنشینەكان وەك خواستنی هێمنی و ئارامی و خۆشگوزەرانی. لەم كاتەدا وەها كەسانێك دێنە شارو لەگەڵ شاریەكاندا هەنگاو هەڵدەگرن بۆ ئەوەی وەك ئەوان لەڕەفاهیەت و خۆشگوزەرانیدا بژین. بارودۆخی سەرەتای ئاوەدانی شارەكان لەسەر ئەم شێوەیە خوداش موحیتە بەهەموو شتەكان،[٣٧].

---

[٣٧] (وَاللّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ مُّحِيطٌ) س فصلت ئا ٥٤.

# بەشی چواردەیەم

## لەبارەی ئەوەی کە جیاوازی سەرزەمینەکانیش (ناوچەکان) لەڕووی ڕەفاهو خۆشگوزەرانی و هەژاریەوە وەك شارەکانە

دەبێت ئەوە بزانین هەرچەندە ئاوەدانی سەرزەمینەکان زۆر ببێت و نەتەوە جۆراو جۆرەکان لەناوچە جۆربەجۆرەکانیدا بژین و دانیشتوانیان زۆر ببێت، بەهەمان ئەندازە ژیان و گوزەرانی خەڵکەکەشی باش دەبێت و، سەروەت و سامان و ئاستی بنیاتنانی شار زیاد دەکات و دەوڵەت و وولاتگەلێکی زۆر لەو شوێنانەدا دروستدەبن و هۆکاری هەموو ئەمانەش زۆر بوونی کارەکانە کەلەبەشەکانی پێشوودا باسمانکرد و، لەداهاتووشدا باسی دەکەین، کەکارەکانی مرۆڤ هۆکاری زۆر بوونی سەروەت و سامانە، چونکە بەهۆی دەرئەنجامی کارە بەکۆمەڵ و هەرە وەزیەکانی مرۆڤەوە لەپاش فەراهەم کردنی پێویستیەکانی ناوچەیەك ئەندازەیەکی زۆری زیادە دەمێنێتەوە کەزیاترە لەپێویستیەکانی خەڵکانی ئەو ناوچەیە، هەربۆیە خەڵکی سەروەت و سامانێکی زۆر بەدەست دەهێنن و سودی بنەڕەتی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوان، هەروەك چۆن لەم بارەیەوە لەبەشی مەعاش و کەسابەت و پیشەدا گفتوگۆ دەکەین. هەربۆیە ڕەفاهی خەڵکی زۆر دەبێت و باری ژیان و گوزەرانیان بەرەو باشتر دەچێت و دەگەنە قۆناغی جوانخوازی و خۆشگوزەرانی و نازو نیعمەت بەتوانایی بەهۆی ڕەواجی بازاڕەکانەوە ئەندازەی ماڵیاتو خەراجەکانی دەوڵەتیش زۆر دەبێت و، سەروەت و سامانێکی زۆر بەدەست دەهێنێت و هێزو دەسەلاتی زۆر دەبێت و جۆرەها بەرگری و قایم کاری دروستدەکات و شارەکان

بنیات دەنێت و، شارستانەکان بەهێز دەکات و ئەم بارودۆخەش دەتوانین لەسەرزەمینەکانی خۆرهەڵاتدا وەك میسر و شام و عێراق و ئێران و هیند و چین و هەموو ناوچەکانی باکور و وولأتەکانی لەماورای دەریای ڕۆمدا تێبینی بکەین، لەبەر ئەوەی کەئاوەدانی وولأت و ناوچەکانی گەشەی کردووە دەبینین کەچۆن سەروەت و سامان لەنێو ئەواندا زۆر بووە و دەوڵەتەکانی ئەو ناوچەیە گەشتونەتە قۆناغی گەورەیی و تواناو شارو ئاوەدانی پایتەختەجۆراو جۆرەکان لەو سەرزەمینانەدا بنیات نراون و، شوێنە بازرگانی و بارو دۆخیان بەچ شێوەیەك گەشەی کردووە و، بارو دۆخی بازرگانان و نەتەوە مەسیحیەکان کەلەم سەردەمەدا دێنە وولأتانی مەغریبەوە لەڕوانگەی ڕەفاه و تواناوە بەئەندازەیەك سەر سوڕهێنەرە کەوەصف ناکرێت.

وەهەروەها ئەو هەواڵانەی کەلەبازرگانانی خۆرهەڵاتەوە دەگات بەئێمە (لەوە زیاترە کەبتوانین لەئەندێشەدا بیانگونجێنین، لەوەش گرنگتر بارو دۆخی بازرگانانی خۆر هەڵاتی دوورە وەك عێراق و ئێران و هیند و چین کەگەشتیاران، هەواڵگەلێکی سەرسوڕهێنەر لەبارەی سەروەت و ڕەفاهی ئەوانەوە دەگێڕنەوە هەرچەندە لەچەندین بواری زۆردا خەڵکی قبوڵیان نین و خەڵکی بەگشتی دەیانبیستن و، وادەزانن پارە پول و ئاڵتونیان لەخەڵکی مەغریب زیاترە، یان ئەوەی کە کانزای زێڕو زیو لەوشوێنانەدا لەمەغریب زیاترە، یان بەهۆی ئەوەی کە مادە بەنرخەکانی نەتەوەکانی پێشوو تەنها تایبەت بووە بەوانەوە، بەلأم ڕاستەقینە بەم جۆرە نیە. چونکە ئەو کانە ئاڵتوونەی کەئێمە لەو سەرزەمینانەدا دەیانناسین تەنها لەناوچەکانی سوداندایە کەنزیکە لەمەغریبەوە تاوەکو مەشریق (خۆرهەلأت) و هەموو ئەوکالأیانەی کەلەناوچەکانی خۆرهەلأتدا بوونیان هەیە، بۆ بازرگانی هەناردەی وولأتانی تریان دەکەن. ئەمەلەکاتێکدایە ئەگەر ئەوان تایبەتمەند بوونایە بەزێڕو زیوەوە ئەوا کالأکانی خۆیان بەمەبەستی بەدەستهێنانی سەروەت و سامان نەدەنارده وولأتانی ترەوە و، بەتەواوی لەڕاکێشانی سەرمایەی وولأتانی تر بێ نیاز دەبوون. ئەستێرەناسان لەبەر ئەوەی کەئەم بارودۆخەیان بینیوە و لەفراوانی

هۆکارەکانی ژیان و خۆشگوزەرانی توانای خەڵکی خۆرهەلآت سەرسام بوون، و باوەڕییان بەوە هێناوە کە بەهرەو بەشی ئەستێرە و سهامەکان[٣٨] لەمەوالیدی خەڵکی خۆرهەلآت زیاترە لەمەوالیدی خەڵکی خۆرئاوا.

ئەم بابەتەش هەروەك گوتمان لەڕووی گونجان لەنێوان حوکمە نجومی و بارودۆخە زەمینیەکاندا ڕاستە ئەوان لەم بارەیەوە هۆکاری نجومی دانراویان باسکردووە. بەلآم تەنها هۆکاری ناوبراو بەس نیە، بەڵکو دەبێت هۆکارە زەمینیەکەشی وەیاد بهێنرێتەوە کەهەمان ئەو شتەیە کەئێمە باسمانکرد و گوتمان فراوانی وافری و زۆری ئاوەدانی تایبەتە بەسەرزەمین و ناوچەکانی خۆرهەلآتەوە (مشرق)، زۆربوونی ئاوەدانی بەهۆی زۆرێك لەدەرئەنجامی کارەکان و سەرچاوەی سود و قازانجەکانەوە دەبێت هەربۆیە خۆرهەلآت لەنێو هەموو سەرزەمینەکاندا تایبەت بووە بەخۆشگوزەرانیە، نەوەك ئەوەی کەتەنها بەهۆی کاریگەری نجومی (ئەستێرە بورجەکانەوە بێت. کەواتە لەوەی کەسەرەتا ئاماژەمان پێدا ئەوە دەرکەوت کەتەنها هۆکاری نجومی تایبەت نیە پێیەوە (هەروەك باسمانکرد)، کەگونجان لەنێوان حوکمی نجوم و ئاوەدانی و سروشتی زەویدا شتێکە خۆلادان لێی ئەستەمە.

وەچۆنیەتی وەو خۆشگوزەرانی ڕەفاهەی کەلەدووتوێی ئاوەدانیدا بەدی دێت دەتوانین لەسەر زەوی ئەفریقاو بەرقەدا تێبینی بکەین، لەبەر ئەوەی دانیشتوانی ئەو ناوچەیە کەم بوونەوە لەئاوەدانیەکەشی کەم بوویەوە و لەئەنجام دەوڵەتانی ئەو ناوچەیە گرفتاری بێنەوایی و تەنگ دەستی بوونەوە. ئەندازەی خەراجیان کەم بوویەوە، ئەمە لەکاتێکدا دەوڵەتەکانی شیعە و صەنهاجە، هەروەك بیستووتە لەو ناوچەیەدا لەوپەڕی ڕەفاهیەتدا ژیاون دەرامەت و هەقدەستێکی زۆریان دەدا و بەجۆرێك زۆرجار کالآگەلێکی زۆر بۆ دابینکردنی پێویستیی و ئەرکەکانی سوڵتانی میسر لەقەیرەوانەوە دەبرانە ئەو وولآتە سەروەتی دەوڵەت بەئەندازەیەك بوو کەجەوهەری نوسەر کاتێك بۆ فەتحی میسر

---

[٣٨] (دەستەواژەیەکی ئەستێرە ناسیە).

سەفەری دەکرد، هەزار بار زێڕو زیوی لەگەڵ خۆیدا برد بۆ ئەوەی ئەرزاق و پێویستیەکانی سەربازەکانی پێ بکڕێت و ئامادە بکرێت. وەهەرچەندە سەرزەوی مەغریب[٣٩] لەکۆندا لەڕووی سەروەت و سامانەوە کەمتر بووە لەئەفریقا، بەلاّم لەهەمان کاتدا وولاّتێکی کەم سامان و دارایش نەبووە. هەروەك چۆن بارودۆخی ئەو سەرزەمینە لەسەردەمی دەوڵەتی مووەحیداندا لەوپەڕی ڕەفاهو خۆشگوزەرانیدا بووە خەراجێکی زۆر و زەوەندە دەگەڕایەوە بۆ دەوڵەت و، هۆکاری ئەوەی کەلەم ڕۆژگارەدا ئەو شتانە کەمیان کردووە ئەوەیە کەئاوەدانیەکەشی کەم بووەتەوە، چونکە بەشێکی زۆری ئاوەدانیەکەی بەربەری ئەو سەرزەمینە لەناو چووە و بەبەراورد بەبارودۆخی پێشوو کەمو کورتیەکی ئاشکراو دیار ڕووی تێکردووە و، نزیکە لەڕووی سەروەت و سامان و ئاوەدانیەوە دووچاری چارەنوسەکەی ئەفریقا ببێتەوە کەلەسەردەمەکانی پێشوودا ئاوەدانیەکەی لەدەریای ڕۆم تاوەکو وولاّتی سودان بەدرێژیەك بەئەندازەی نێوان سوسی ئەقصا[٤٠] و بەرقە بەستراوەتەوە بەیەکەوە.

ئەمەلەکاتێکدا ئەمڕۆکە هەمووی یان زۆربەی ئەو سەرزەمینە بووە بەدەشتایی و شوێنی نیشتەجێبوون نیەو، زۆرتری بیابانە و هەندێك لەزۆنگاوەکانی کەنار دەریا یان نزیك لەوەوە نەبێت هەمووی بیابان و وێرانە. خوداش واریسی زەوی ئەوکەسانەشە کەلەسەری دەژین و هەرخۆی باشترینی میراتگرەکانە[٤١].

---

[٣٩] مەبەستی دانەر لێرەدا لەمغرب الجزیرەی خۆرئاوا و مەراکیشە (دسلان).

[٤٠] ویلایەتێکە کەتاوەکو ئێستەش لەباشوری دەوڵەتی مەراکیشدا بوونی هەیە (دسلان).

[٤١] ئاماژەیە بەئایەتەکانی ٤١ س مریەم و ٨٩ ی س الانبیا .

# بەشی پازدەهەم

## لەبارەی بەدەستهێنان و زۆرکردنی ئەملاك و زەویە کشتووکاڵیەکان و چۆنیەتی سود وەرگرتن لێیان

دەبێت ئەوە بزانین کەخەڵکی شارە بچووك و گەورەکان بەیەکجارو یان لەیەك سەردەمدا ئەملاك و زەوی کشتوکاڵی فراوان بەدەست ناهێنن، چونکە هیچکات کەسێك هێندە سەروەت و سامانی نیە کەبتوانێت بەهۆیەوە موڵکگەلێك بەدەست بهێنێت کەبەهاکەیان لەدەرەوەی سنوری ئاساییەوە بێت، هەرچەندە بارودۆخی خەڵکی لەخۆشگوزەرانیدا بگاتە قۆناغێك کەئومێدیان پێی هەبێت، بەڵکو ئەم جۆرە ئەملاکانە یان بەقۆناغ بەقۆناغ و لەڕێگەی میراسەوە لەباو باپیرانیەوە بۆی بەجێ مابێت و، تاوای لێدێت کەم کەم هەموو سامانی ئەو خاندانە دەبێتە هی یەك کەس، و زیاتر بەم شێوەیە کەسێك دەبێتە خاوەنی ئەملاك سامانی زۆر.وەیان ئەوەی کەلەدەرئەنجامی قازانجەگەورەکانی بازاڕدا دەبنە خاوەنی وەها سەروەت و سامانێك، چونکە بەهای ئەملاکەکان لەکۆتایی سەردەمی دەوڵەتێك و دەست پێکردنی دەوڵەتی نوێدا کەم دەبێتەوە، چونکە لەم کاتەدا بەهۆی لەناوچوونی هێزی پاسەوانی و لەشکرەوە و دروست بوونی کەلێن لەڕیزەکانی پاسەوانانی سنوردا بازاڕی کڕیارانی ئەملاك ڕوولە کزی دەکات، چونکە بەهۆی پەرێشانی بارودۆخەوە، سود و قازانج لەئەملاکەکاندا کەم دەبێتەوە و بەهاو نرخیان هەرزان دەبێت و خەڵکی دەتوانن بەنرخێکی هیچ و زۆر هەرزان ببنە خاوەنی ئەملاك و زەوی زۆر و، دواتریش ئەم ئەملاکانە لەڕووی میراسەوە دەبنە هی

کەسێك و لەئەنجامدا گەورەبوونی دەوڵەتی نوێ و گەڕانەوەی هێمنی و ئارامی و باش بوونی بارودۆخ سەرلەنوێ شار گەنج دەبێتەوە و، خەڵکی حەز بەکڕینی ئەملاك و زەویەکشتوکاڵیەکان دەکەن، چونکە لەم کاتەدا سود و قازانجیان زۆر دەبێت ونرخیان بەرز دەبێتەوە و ئەو گرنگیەی کەلەدەستیان دابوو بۆیان دەگەڕێتەوە.

ئەمەشە مانای بازرگانانی بازاڕی ئەملاك. ئەوکات خاوەنی وەها ئەملاکێك لەبەتواناترینی کەسەکانی شار دێنە هەژمار و ئەم سەروەتەش وەها کەسێك لەڕێگەی هەوڵ و کۆششەوە بەدەستی ناهێنێت، چونکە ئەو توانای بەدەستهێنانی وەها ماڵێکی زۆری نیە. بەلام سودی ئەملاكو زەویەکشتو کاڵیە کان لەبەرامبەر پێویستیەکانی ژیانی خاوەنەکەیەوە بەس نیە، چونکە داهاتی ئەم جۆرە ئەملاکانە پێویستیەکانی جوانخوازی و خۆشگوزەرانیان دابین ناکات، بەڵکو زۆربەی ئەم ئەملاکانە بۆ شتە پێویست و زەروریەکان و مادەخۆراکیەکان دەبێت و بەواندا ڕادەگات هەروەك ئەوەی کەئێمە لەهەندێك لەبەتەمەنەکانەوە (ڕیش سپیەکان) ی شارەکانەوە بیستوومانە کەمەبەست لەکۆکردنەوەی ئەملاك و زەوی کشتوکاڵی ئەوەیە لەلەئایندەی مندالأنی بێتوانای خۆیان ترسیان هەیە و، ئەم ئەملاکەش لەو ڕووەوە کۆدەکەنەوە بۆ ئەوەی پشتو پەنای دابینکردنی ڕزق و ڕۆزیان بێت و تائەوکاتەی کەناتوانن کەسابەت بکەن و دواتر خۆیان دەست بکەن بەکارو کەسابەت بۆ دابینکردنی ژیانی ڕۆژانەی خۆیان.

هەرچەندە هەندێك لەمندالأن بەهۆی لاوازی جەستەییەوە یان ئەو ئافەتەی کەلەئەقڵ و مەعاشیان دەدات لەهەڵبژاردنی پیشەو هۆکاری مەعاش بێتوانادەبن، ئەوکات ئەم جۆرە ئەملاکانە لەوانەیە لەفەقیری و بێنەوایی ڕزگار بکات. ئەمەیە مەبەستی خۆشگوزەرانەکان لەکۆ کردنەوەی ماڵ و سامان. بەلام ئەگەر وابزانرێت کەدەتوانرێت بەهۆیانەوە توانا پەیدا بکەن و خەرجیەکانی خۆشگوزەرانی و، جوانخوازی دابین دەکەن، وەها ئەندێشەیەك ڕاست نیە. ئەوەڕاستە کەهەندێك جار زۆر بەکەمی لەڕێگەی بازرگانانی بازاڕەوە لەوانەیە کەسانێك بەم مەبەستە بگەن و سودێکی زۆر لەگرانی نرخی کالأو بازاڕ

ببەن، بەلاّم ئەگەر ئەم مەبەستە بێتەدی ئەو کات دیدگای والی و ئەمیرەکان و فەرمانڕەوایان چاویان بڕیبێتە ئەو بەزۆری یان بەزۆر لێی دەسەنن یان خاوەنەکەی ناچار دەکەن کەماڵ و سامانەکەی بفرۆشێت بەوان و، لەئەنجامدا زەرەو بەد بەختی گەورە ڕووی تێدەکات، خوداش زاڵە بەسەر کارەکانیدا[٤٢].

[٤٢] (وَاللهُ غالِبٌ عَلى أمرِهِ) س یوسف ئا ٢١.

# بەشی شانزەیەم

## لەبارەی پێویستیەکانی بەتواناکانی شارنشینان بە (خاوەنانی) پلەوپایە و بەرگریکارانی بەتواناوە

چونکە هەرکات سەروەت و سامانی کەسێکی شارنشین زۆر ببێت و لەکشتوکاڵ و عەقارەکی سود وەربگرێت و، بچێتە ریزی گەورەترین بەتواناکانی شارەوە و هەمووان سەیری سەروەت و سامانەکەی بکەن و هۆکارەکانی خۆشگوزەرانی لەژیانیدا زۆر بن ئەوکات ئەمیر و پاشاکان بەهۆی ئەم هەموو خۆشگوزەرانیەوە تەنگە تاو، و سەغڵەت دەبن و دێنە سەر ئەوەی کەسەروەت و سامانەکەی لەدەست دەربهێنن دەستدەکەنە کێشەو ئاژاوە لەگەڵیدا و بەهەرجۆرێك پێیان بکرێت کێشەی بۆ دەنێنەوە و، بەفرو فێڵ بەفەرمانی پاشایی تاوانباری دەکەن و بەڵگەیەکی ئاشکرا بۆ تۆمەتبارکردنی دادەتاشن، بۆ ئەوەی سەروەت و سامانەکەی لێ داگیر بکەن، چونکە حوکمەسوڵتانیەکان زیاتر لەستەمەوە نزیکن تاوەکو دادگەری، چونکە دادگەری رووت لەسەردەمی خەلافەتدا بوو کەپێغەمبەر(ص) دەفەرمێت: لەپاش من خەلافەت سی ساڵ دەبێت و دواتر خەلافەت بەپاشایەتیەکی ستەمگەرانە دەگەڕێتەوە. هەربۆیە لەوەها هەلومەرجێکدا ئەو بەتوانایانەی کە لەکۆمەڵگەدا بەسەروەت و سامانی زۆر بەناوبانگن ناچار دەبێت خاوەنی پاسەوانێك بن کەبەرگریان لێبکات و، پشتیان بەخاوەن پلەیەك لەدەسەلآت بەستبێت، یان خۆیان پلەو پایەیەکی دەوڵەتی بەدەست بهێنن یان خاوەنی عەصەبیەتێك بن کەسوڵتان پارێزگاری لێبکات و لەسایەی ئەودا خۆی لەدەستدرێژی کاران بپارێزێت و

لەئەمن و ئەماندا بێت. ئەگەر بێت پشتی بەم شتانە نەبەستبێت ئەوا دەکەوێتە بەر پلانو فێڵی دەسەڵاتداران و خاوەنانی تاج و تەختەوە.. خوداش حوکم دەکات هیچ کەسێکیش ناتوانێت ئەو حوکمەی دوابخات[٤٣]

[٤٣] (وَاللَّهُ يَحْكُمُ لا مُعَقِّبَ لِحُكْمِهِ) س الرعد ئا ٤١.

# بەشی حەڤدەیەم

## لەبارەی ئەوەی کە بنەماکانی شارنشینی و شارستانیەت لەسایەی بەدیهاتنی دەوڵەتەکاندایە و ئەم بنەمایانەش بەهۆی پەیوەست بوون و پایەداری دەوڵەتەکانەوە ڕیشە دادەکوتن

چونکە شارنشینی لەحاڵەتەئاسایی و زیادەکانی پێویستیەکانی کۆمەڵگە و ئاوەدانیە و زیاد بوونی بەپێی جیاوازی ڕەفاهو خۆشگوزەرانی نەتەوەکانەوەیە، ئەمەش لەڕووی زۆری و کەمی دانیشتوانەوە جیاوازە و دەگۆڕێت و ئەم جیاوازیەش بێئەندازە و سنوورە. ئەم حاڵەتەی شارستانیەتیش کاتێکە کە هەموو جۆرە جوانکاریەکان بەدی بێن، هەربۆیە ئەمە وەك پیشەسازی وایە کەلەهەرجۆرێکیدا پێویستی بەپیشەگەرانی شارەزا و لێزان هەیە، بەهەمان ئەو ئەندازەیەی کەپیشەگەرانی زۆر دەبێت، هونەرمەندو پیشەگەری جۆراو جۆرو نوێیی تێدا دەردەکەون و ئەو نەوەیە پێی ئاشنا دەبن و لەپاش تێپەڕبوونی سەردەمە یەك لەدوای یەکەکان و هەوڵدانی بەردەوام تێیاندا، ئەو گروپە هونەرمەندە هەریەکە و لەهونەرەکەی خۆیدا دەبنە وەستاو لەناسینەوەیدا شارەزایی پەیدا دەکەن و، بەدرێژایی سەدەکان و ساڵانێکی دوورو درێژ و بەدیهاتنی سەردەمەکان مەحکەمی و پایەداریان زۆر دەبێت و، زۆربەی پیشەسازیەکانیش بەهۆی فراوانبوونی ئاوەدانی و زۆر بوونی هۆکارەکانی خۆشگوزەرانی لەشارەکاندا بەدی دێت و، هەمووشیان لەلایەن دەوڵەتەوە بەدی دێن، چونکە دەوڵەت ماڵی خەڵکی کۆدەکاتەوە و لەڕێگەی کەسەتایبەت و پیاوانی دەوڵەتیدا سەرفیان دەکات و ژیانیان لەڕووی پلە و پایەوە زیاد

لەپێویست خۆش و فراوان دەبێت، هەربۆیە دەرامەتی ئەم ماڵ و سامانە لەنێو خەڵکیدا بەدەست دێت و کاربەدەستانی دەوڵەت وئەوانەی کەخۆیان بەوانەوە لکاندووە سەرفی دەکەن و سەروەت و سامانێکی زۆر بەدەست دەهێنن و دەچنە ڕیزی بەتواناو داراکانەوەو داب و نەریتی جوانخوازی و خۆشگوزەرانی وورده وورده زۆر دەبێت و هەمووهونەر و پیشەکان لەنێوانیاندا ڕەواج پەیدا دەکەن، ئەمەیە شارستانیەت، هەربۆیە دەبینین ئەو شارانەی کەکەوتوونەتە شوێنە دوورەکانەوە هەرچەندە لەڕووی ئاوەدانی دانیشتوانەوە پێشکەوتبێت، بەڵام بەردەوام داب و نەریتەکانی دەشتەکیەتی تێیاندا هەریاوی هەیە و لەهەمووشێوەکانی شارستانیەت بەدوور دەبن.

بەپێچەوانەوە ئەو شارانەی کەکەوتوونەتە ناوەڕاستی وولات و نزیکن لەپایتەختەوە خاوەنی هەموجۆرە هۆکارێکی شارستانیەتن. تەنها هۆکاری ئەم شتەش ئەوەیە کەشارەکانی بەشی دووەم نزیکن لەسوڵتانەوە و سەروەت و سامانی سوڵتانیان پێدەگات، وەك ئاو کەهەرشتێکی لێوە نزیك بێت سەرسەوزە و تاوەکو دووربکەوێتەوە ووشك و بێ ئاوو ئاوەدانی دەبێت. ئێمەش لەبەشەکانی پێشوودا باسمانکرد کەسوڵتان و دەوڵەت وەك بازارێکە بۆ جیهان کەهەمووکاڵاکان لەو جیهانە و لەنزیك ئەوەوە دەست دەکەون، هەرکاتێکیش لەبازاڕ دوور بکەوینەوە هیچ کاڵاو شتومەکێکمان دەست ناکەوێت. وەئەگەر بێت و ئەم دەوڵەتە سەردەمێکی زۆر بەردەوام بێت و زنجیرەی پاشایەتیەکەی پەیاپەی لەو وولاتەدا فەرمانڕەوایی بکەن شارستانیەت لەنێوانیاندا بەهێز دەبێت و زیاتر لەپێشتر ڕەگ و ڕیشە دادەکوتێت، دەتوانین ئەم حەقیقەتەش لەقەومی یەهوددا بەدی بکەین لەبەرئەوەی کەسەڵتەنەتیان لەشامدا بۆ ماوەی هەزار و چوارسەد ساڵ بەردەوام بوو شارستانیەتیان جێگیر بوو لەهەموو بوارەکانی شتە پێویستیەکانی وەك: خۆراك و کەمالیاتەکان و پۆشاك و هونەرەکانی جوانکاری و، هەموو کاروبارەکانی ماڵداریدا شارەزاییەکی باشیان پەیدا کردبوو کەتاوەکو ئەمڕۆکەش هەندێك لەگەلان سود لەو داب و نەریت و هونەرانەی ئەوان لەشامدا وەردەگرن.

وەهەروەها دەوڵەتی ڕۆمیش کەلەپاش ئەوانەوە شەش سەد ساڵ فەرمانڕەوایی کرد لەو پەڕی شارستانیەتدا دەژیان، ئەویش ڕەگ و ڕیشەیە زۆر بەهێزەوە داکوتابوو. وەهەروەها قیبتیەکان کەپاشایەتیەکەیان سێ هەزار ساڵ لەناو خەڵکیدا درێژەی کێشا داب و نەریتەکانی شارستانیەت لەووڵاتەکەیان میسر، ڕەگ و ڕیشەی داکوتا و لەپاش ئەوانیش نۆبەی فەرمانڕەوایی یۆنانی و ڕۆمیەکان هات، لەو ووڵاتەدا لەپاش ئەوانیش سەردەمی ئیسلام هات و هەموو داب و نەریتەکانی ئەوانی سڕیەوە و، کەتاوەکو ئێستەش داب و نەریتی ئیسلامی لەوێدا پەیڕەوە دەکرێت.

وەهەروەها لەیەمەنیشدا داب و نەریتی شارستانیەت ڕەگ و ڕیشەی داکوتا، چونکە دەوڵەتی عەرەب لەسەر دەمی عەمالیقە وتەبابیعەدا هەزاران ساڵی یەك لەدوای یەك حوکمیان کرد و لەپاشان پاشایەتی هۆزی موزەر بویە جێنشینی شارستانیەتی ئەوان. وەهەر وەها شارستانیەت لەعێراقدا بەهێز بوو، چونکە دەوڵەتەکانی نەبەتی و ئێرانیەکان لەسەرەتای سەردەمی کلدانی و کیانی و ساسانیەکانەوە (کسرەویە) و دواتریش عەرەبەوە، هەزاران ساڵی یەك لەدوای یەك فەرمانڕەواییان کرد کەواتە تاوەکو ئەم سەردەمە لەسەرزەویدا خەڵکانێك لەشامی و عێراقی و میسریەکان شارستانی تر نەبوون، هەروەها نەریتی شارستانیەت لەئەندەلوسدا هەزاران ساڵ ڕەگی داکوتابوو، چونکە دەوڵەتی گەورەی قوت (گت) کان بۆماوەیەکی دوور و درێژ لەو ووڵاتەدا فەرمانڕەوایی کرد و، دواتریش دەوڵەتی بەنی ئومەییە بوویە جێنشینی گتەکان و هەردوو دەوڵەتی ناوبراو لەدەوڵەتەکانی تر گەورەتر بوون هەربۆیە نەریتەکانی شارستانیەت یەك لەدوای یەك لەو ووڵاتەدا بەدیهاتووە و جێگیر بووە.

بەڵام لەئەفریقاو مەغریبی بەر لەئیسلامدا دەوڵەتێکی بەهێزو پاشایەکی بەتوانا بوونی نەبووە، تەنها ڕۆمیە فەرەنگیەکان تاوەکو ئەفریقا دەریاوانیان کردووە و کەنارەکانی ئەو سەرزەویانەیان داگیر کردووە و بەربەرەکانی کەنارەکان هێندە ملکەچیان نەبوون و فەرمانڕەوایی ڕۆمیەکان لەنێو ئەواندا هێندە بەهێز نەبووە، چونکە بەربەرەکان بەردەوام

لەحاڵی کۆچکردندا بوون لەجێگەیەکەوە بۆ جێگەیەکی تر. لەتەنیش خەڵکی مەغریبیشەوە هیچکات دەوڵەتێکی بەهێز بوونی نەبووە، بەڵکو ئەمان بۆ دەرخستنی فەرمانبەری بۆ دەوڵەتی گتەکان کەسانێکیان دەنارده پشتەوەی دەریا. وەکاتێکیش خودا ئیسلامی نارد بۆ خەڵکی دونیا عەرەب ئەفریقاو مەغریبیان داگیر کرد، دەوڵەتی عەرەب لەو سەرزەمینەدا هێندەی نەخایاند چونکە عەرەب لەو کاتەدا لەقۆناغی دەشتەکیەتیدا بوون و، ئەوانەشی کەلە ئەفریقاو مەغریبدا دەژیان شوێنەوارێکیان لەشارستانیەت نەدی بوو تاوەکو ئەوانەی دوایی چاولەپێشینانیان بکەن، چونکە بەر بەرەکان لەناو داب و نەریتی دەشتەکیەتیدا غەرق بوبون.

ئەوکات هێندەی نەبرد کەبەربەرەکانی مەغریبی ئەقصا (مراکش) لەسەردەمی هیشامی کوڕی عبدالملیکدا بەپێشەوایەتی مەیسەرەی موتغەری لەدژی فەرمانڕەوایی عەرەب ڕاپەڕین و دەوڵەتێکی سەربەخۆیان دامەزراند و، هەرچەندە لەگەڵ ئیدریسدا بەیعەتیان کرد، بەڵام دەوڵەتەکەی لەنێو بەر بەرەکاندا بەدەوڵەتێکی عەرەبی هەژمار نەدەکرا، چونکە بەربەرەکان ئەویان گەیاندە فەرمانڕەوایی و بێجگە لەهەندێك گروپی کەمی عەرەب نەبێت عەرەبیان تێدا نەبوو. تەنها ئەفریقا لەدەستی ئەغلەبیو ئەوعەرەبانەی کە وابەستەی ئەوان بوون مایەوە، وەئەوان بەهۆی ئەوەی کە گەشتبوونە قۆناغی خۆشگوزەرانی و نازو نیعمەت و دەوڵەتداری شاری قەیرەوان ئاوەدانیەکی زۆری هەبوو، کەمێکیش نیشانە و شوێنەواری شارستانیەتیان پێوە دیار بوونەم شارستانیەتەش خانەدانەکانی کەتامە، دواتریش صەنهاجە و بەدەستیان هێنا و هەموو ئەم سەدەمانی کەمن و نەگەشتووەتە چوار سەد ساڵ دەوڵەتەکەیان ڕابوردو نەریتی شارستانیەت گۆڕانکاری بەسەردا هات و، چونکە شارستانیەتی ناوبراو هێشتا بەهێز نەبوبو عەرەبە دەشتەکیەکانی وەك هیلالیەکان (بنی هلال) زاڵبوون بەسەر ئەفریقادا و، ئەو شارستانیەیان وێرانکرد و نیشانەگەلێکی نهێنی کەلەو شارستانیەتە ماونەتەوە

تاوەکو ئەم سەردەمەش دەبینرێن کەئەگەر بارودۆخی خاندانەکانی دواتر کەلەقەلعە[٤٤] و قەیرەوان[٤٥] یامەهدیە[٤٦] وورد ببێنەوە، دەبینین لەکاروباری خانوو داب و نەریتەکانیاندا نمونە گەلێك لەشارستانیەت بوونیان هەیە، کەئاوێتەی شارستانیەتەکانی تر بووە و شارنشینی ئەفریقا دەبینرێت، بەلآم لەمەغریب و شارەکانیدا بەم شێوەیە نیە، چونکە دەوڵەتی عەرەب بۆ ماوەیەکی دوور و درێژ لەسەردەمی ئەغلەبیەکان و شیعەکان (فاتیمیەکان) و صەنهاجە لەو سەرزەمینەدا ڕەگ و ڕشەیان داکوتاوە.

بەلآم لەمەغریبدا لەسەرەتای دەوڵەتی مووەحیدانەوە بنەما گەلێکی زۆر لەداب و نەریتی شارستانیەتی ئەندەلوس ڕەواجی پەیدا کرد و، لەئەنجامدا ئەو داب و نەریتانە جێگیر بوون. چونکە دەوڵەتەکەیان زاڵبوبو بەسەر ئەندەلوسیشدا و زۆرێك لەخەڵکی ئەو ناوچەیە بمانەوێت و نەمانەوێت گوازرانەوە بۆ مەغریب و سنورەکانی دەوڵەتی مووەحیدانیش دەزانین تاوەکو چ ئاستێك بوون، هەربۆیە مەغریب بەشێکی شیاوی لەشارستانیەت بەر کەوتبوو داب و نەریتەکانی لەو سەرزەمینەدا بەهێز بوبون بەشی هەرە زۆری ئەم شارستانیەتە بەهۆی خەڵکی ئەندەلوسەوە بلآو بوویەوە. لەپاشان لەکاتی کۆچی مەسیحیەکاندا خەڵکی خۆرهەلآتی ئەندەلوس گوازرانەوە ئەفریقا و، لەشارەکانی ئەو ناوچەیەدا شوێنەواری شارستانیەتیان لەپاش خۆیان بەجێهێشت کەزۆربەی لەتونس و لەگەڵ شارستانیەتی میسر و ئەو داب و نەریتانەی کەگەشتیارانی ئەو سەرزەویە دەیانگواستەوە تێکەڵ بوبو، بەم شێوەیە مەغریب و ئەفریقا شارستانیەتێکی جێگەی سەرنجیان هەبوو بەجۆرێك وێرانی لەو شوێنەدا باری کردو نەما، بەلآم بەربەرەکانی مەغریب گەڕانەوەسەر هەمان شێوەی دەشتەکیەتی و زبری ژیان. بەهەرحاڵ شارستانیەت لەئەفریقادا لەشارەکانی مەغریب زیاتر کاریگەری لەسەر بووە

---

[٤٤] پایتەختی ئەو شارانەی کە صەنهاجیەکان فەرمانڕەواییان تێدل دەکرد کەبۆ ماوەی یەك ڕۆژ لەڕێگەی مسیلەوە دوورە.

[٤٥] مەقەڕی فەرمانڕەوایی ئەغلەبیەکان.

[٤٦] پایتەختی دەوڵەتی مووەحیدان (فاتیمیان).

چونکە زنجیرەی دەوڵەتانی پێشوو لەو سەرزەمینەدا زیاتر لەمەغریب بووە و، داب و نەریتیان لەمیسریەکانەوە نزیکە، لەو ڕووەوەی کەهاتوو چۆ لەنێوان هەردو ناوچەدا زۆرە. کەواتە ئەم ڕازەی کەلەبەردیدەی خەڵکە نادیارە دەبێت بەباشی بیزانین. وەدەبێت ئەوەش بزانین کەهەموو ئەمانە کارانێکن کەگونجاون لەگەڵ یەکتریدا، بەلاّم بارودۆخی دەوڵەت لەڕوانگەی هێز و لاوازی و زۆری یەك نەتەوە یان یەك گەل و گەورەیی شار یان شارستان و فراوانی نیعمەت و سەروەت و شتەکانی تر هەموو ئەمانە لەگەڵ یەکتریدا گونجاون، چونکە دەوڵەت و پاشایەتی وەك شێوەی کۆمەڵ و کۆمەڵگەیە و خەڵك و شارەکانیش وەك مادەی ئەو شێوەیەن هەروەك چۆن ماڵ و خەراج دەگەڕێتەوە بۆ خەڵکی و بەزۆری سەروەت و سامانیان لەبازاڕ و شوێنە بازرگانیەکاندا بەدەستدێت و، هەرکاتیش سوڵتان مووچە و خەرجی بداتە ئەندامانی خۆی دیسانەوە هەمان ئەو سەروەت و سامانە دەگەڕێتەوە بۆ خەڵکی و، دیسانەوە لەڕێگەی باج و خەراجەوە دەگەڕێتەوە بۆ دەوڵەت.

کەواتە سەروەت و سامان لەدەستی خەڵکی دەر دەچێت بەهۆی باج و خەراجەوە و دیسانەوە لەڕێگەی خەرجی و مووچەوە دەگەڕێتەوە دەستی خەڵکی و سەروەتی خەڵکی بەنیسبەتی توانای دەوڵەت و سامانی خەڵکەوەیە و دەوڵەت بەهێز دەبێت و بناغە و بنەڕەتی هەموو ئەمانەش ئاوەدانی و کۆمەڵگە و زۆریەکەیەتی. کەواتە دەبێت ئەم خالانە لەبەر چاو بگرین و بەباشی بیر بکەینەوە ئەوکات لەهەموو دەوڵەتاندا دەیانبینین، خوداش حوکم دەکات و کەس ناتوانیت ڕەتی بکاتەوە[٤٧] .

---

[٤٧] (وَاللّهُ يَحكُمُ لا مُعَقِّبَ لِحُكمِهِ) س الرعد ئا ٣١.

# بەشی هەژدەیەم

## لەبارەی ئەوەی کەشارنشینی و شارستانیەت ئەوپەڕی ئاوەدانی و کۆتایی سەردەمەکەیەتی و هەرئەم شارستانیەش خراپە و لەناو چوونی ڕادەگەیەنێت

لەبابەتەکانی بەشەکانی پێشوودا ئەوەمان سەلماند کەدەوڵەتداری وەك ئامانجی هەر ئاوەدانی و کۆمەڵگەیەکە ئیتر لەقۆناغی دەشتەکیەتیدا یان لەقۆناغی شارنشینیدا بێت، وەهەرووڵات و بازاڕێك سەرئەنجامی سەردەم و تەمەنێکی هەستپێکراوە هەروەك چۆن هەریەکە لەبوونەوەران مەوالیدی سروشتی تەمەنی هەستپێکراویان هەیە. لەزانستە ئەقڵیو نەقڵیەکاندا ئەوە سەلمێنراوە کە قۆناغی چلساڵی بۆ مرۆڤ کۆتاییەکە کەتاوەکو ئەو تەمەنە هێزەکانی ئەو لەزۆر بوون و گەشەکردندان و، هەرکە دەگاتە ئەم تەمەنە تەبیعەتی میزاجی ئەو لەماوەیەکی دیاریکراودا لەگەشە دەوەستێت و دواتر بەرە و هەرەسهێنان دەچێت. کەواتە دەبێت ئەوە بزانین کەشارنشینیش لەئاوەدانیدا وەك کۆتاییەك وایە و لەوای ئەو قۆناغێکی زیاتر بوونی نیە، چونکە کاتێك خەڵکی هەرکۆمەڵگەیەك دەگەنە خۆشگوزەرانی، ئەو کات بەرەو شارنشینی دەڕۆن و داب و نەریتەکانی وەردەگرن. شارنشینی یان شارستانیەت وەك زانرا بریتیە لەگەڕان بەدوای هونەرەکانی جوانخوازی و خۆشگوزەرانیدا و باشتر کردنی چۆنایەتیەکانیان و حەزکردن بەو پیشەسازیانەی کە هەموو هونەرەکانیان بەرەو پێشەوە دەچن و، وەك پیشەسازیەکانی بواری چێشتخانە و پۆشاك و بیناو باڵەخانەکان و ئامێرو شتەکانی تری وەك چۆنیەتیەکانی ماڵداری ئامادە دەبێت و، بۆ جوانکردنی هەریەکە لەو پیشەسازیانەیە

کەلەقۆناغی دەشتەکیەتیدا پێویست بەهیچکامیان ناکات و، پێویستیەك بۆ جوانکردنیان نیە وەهەرکات جوانکاری لەم چۆنیەتیانەی کاروباری ماڵەوەدا بگاتە قۆناغی کۆتایی بەدوایدا گوێڕایەڵی لەهەواو حەزو ئارەزووەکان بەدی دێت، نەفسی مرۆڤیش بەم نەریتانە ڕەنگاو ڕنگ دەبێت کەحاڵی لەگەڵ هیچکامیاندا لەگەڵ دین و دونیایدا نایەتەوە و خۆی ڕاناگرێت و باش نابێت.

بەڵام باش نەبوونی کاروبارەئاینیەکان بەو هۆیەوەیە کەنەریتەناوبراوەکان بەجۆرێك تێیدا ڕیشە دادەکوتێت کەجیابوونەوە لێیان زۆر دژوار دەبێت. وەباش نەبوونی کاروباری دونیاشی لەبەر ئەوەیە کەنەریتە ناوبراوە کان پێداویستی خەرجیەکی زۆر بۆ ئەو دێنێتە پێشەوە و، ئەم نیازمەندیانەش بەئەندازەیەك زۆرن و فراوانن کە دەرامەتی ئەو لەبەرامبەر یانەوە بەس نیە، چونکە بەهۆی خۆشگوزەرانیەوە خەرجیەکانی خەڵکی شار زۆر دەبن و شارستانیەتیش بەنیسبەتی ئاوەدانیەکانەوە جیاوازە و، هەرچەندە ئاوەدانی کامڵتر بێت شارستانیەتیش بەهەمان ئەندازە کامڵدەبێت. ئێمەش لەبەشەکانی پێشوودا باسی ئەوەمانکرد کەشارە پڕ دانیشتوانەکان بەگرانی نرخەکان بەناوبانگن.

لەپاشان باجەکان دەخرێنە سەر نرخەکان چونکە کامڵبوونی شارستانیەت هەمیشە لەکۆتایی دەوڵەت و بەهێز بوونیدایە، وەئەم قۆناغەش هەمان کاتی دانانی باجەکانە بەهۆی دەوڵەتەوە ئەمەیە کەفرۆشیارەکان کاڵا و شتومەکەکانیان گران دەفرۆشن، چونکە هەموو فرۆشیارو بازرگانەکان باجەکان حیسابدەکەن و دەیخەنە سەر نرخی کاڵا و شتومەکەکان تەنانەت ئەو خەرجیانەشی کەلەپێناو هێنان و گواستنەوەی کاڵاندا خەرجیان کردووە بەهەمان شێوە دەیخەنەسەر نرخ و بەهای کاڵاکان و، لەئەنجامدا خەرجیەکانی شارنشینان زۆر دەبێت و لەقۆناغی مامناوەندیەوە دەچنە قۆناغی زیادەڕەوی و ئیسراف و، هیچ ڕێگەیەکیشیان بۆ دەربازبوون لەم دۆخە نیە چونکە داب و نەریتەکانی خۆشگوزەرانی چاوی بڕیوەتە ئەو بارودۆخە و خەڵکیش فەرمانبەرداری لەو بارو دۆخە دەکەن و، هەموو ئەو دارایەەی کەلەڕێگەی کارو پیشەکانەوە بەدەستیان

دەهێنن دەبێت لەڕێگەی جوانکاری و جوانخوازیەکاندا سەرفی بکەن و یەکەبەیەکەیان دووچاری هەژاری و بێنەایی دەبنەوە و، کڕیارانی کاڵاکان کەم دەبنەوە و لەئەنجامدا کەساد ڕوو دەکاتە بازاڕ و بارودۆخی شار بەرەو پشێوی دەچێت و هۆکاری هەموو ئەمانەش بریتیە لەزیادەڕەوی لە شارنشینی و جوانکاری و نازو نیعمەتەکاندایە. ئەمانەش کۆمەڵێك خراپەن کەلەبازاڕو ئاوەدانیەکاندا بەشێوەیەکی گشتی ڕوودەدەن، بەڵام ئەو فەسادەی کەلەناخی یەکە بەیەکەی خەڵکی شارەکەدایە و بەتایبەت دەچێتە ناویانەوە بریتیە لەماندو بوون و تەحەموول کردنی سەختیەکان، لەپێناو بەدەستهێنانی ئەو پێداویستیانەی کەبەهۆی نەریتەکانەوە دروستبوون و بووەتە چەندین بەشەوە و بۆ بەدەست هێنانیان مرۆڤ ڕوودەکاتە شتە ناباشەکانیش لەهەندێك کات و شوێندا.

هەربۆیە خراپە و شەڕ و فڕو فێڵ لەڕێگەی بەدەستهێنانی مەعاشدا ئیتر لەڕێگەی ڕاستەوە بێت یان لەڕێگەی ناباشەوە بێت ڕوولەزۆربوون دەکات و نەفسی مرۆڤ لەم بوارەدا دەچێتە ناوبیر کردنەوەوە و، لەم جۆرە کارانەدا ڕۆ دەچێت و پەنا دەباتە بەر جۆرەها فێڵ و تەڵەکە لەو بوارەدا و ئەم جۆرە کەسانە لەسەر درۆزنی و قومار بازی و غەشکردن و دزی سوێندی ناهەق سوخۆری لەمامەڵەکاندا زۆر دەبێت.

لەپاشان دەبینین بەهۆی زۆر بوونی هەواو ئارەزووە کان و ئەو لەزەتانەکەبەهۆی جوانخوازیەوە دروستدەبن و ئاگادار ترن بەڕێگەو شێوازەکانی تاوان و خراپەکارین و، تەنانەت لەنێو خزمەکانیشیاندا کەسایەتیان لەکەدار دەبێت و لەناو دەچێت، ئەمە لەکاتێکدا خوی دەشتەکیەتی مرۆڤ والێدەکات شەرم و شکۆی هەبێت لەگوفتاری خراپ لەلای خزمان و دۆستان دەیگێڕێتەوە و، ئەم کەسانەش ئاگاداری فێڵ و تەڵەکە بازیەکانن‌و لەخۆیانی دوور دەخەنەوە هەروەك چۆن ئەم سیفەتە دەبێتە سیفەتێکی جێگیر لەناخیاندا و خراپەکان لەخۆیان و خزم و نزیکانیان دوور دەخەنەوە. شاریش وەك دەریایەکی لێدێت کەکاروکردارەکان خەڵکە خراپەکان شەپۆل دەدات تێیدا. وەزۆرێك

لەپەروەردەکراوانی دەزگای دەوڵەت و نەوەکانیان کەپەروەردەیەکی ڕاست نەکراون لەم سیفەتانەدا لەگەڵ خوو خراپەکاندا هاویەش دەبن و، هاونشینی و تێکەڵی لەگەڵ ئەواندا کاریان تێدەکات. هەرچەندە لەخاندانە بنەڕەتی و ئەصیلەکانیش بن، چونکە خەڵکی هەموو بەشەرن و وەك یەك وان باشی یەکێکیان لەویتریان پەیوەستە بە پابەند بوونیان بەچاکە و دوور کەوتنەوەیانە لەخراپە. هەربۆیە ئەگەر لەناخی کەسێکدا نەریتی پەستی بەهەرشێوەیەك بێت جێگیر ببێت و چاکەی تێدا نەمێنێت و ئەوکات چاکی نەسەب و ئەصالەتی خاندانەکەی سودێکی نابێت بۆی هەربۆیە زۆرێك لەخانزادەکان و وابەستەکان بەدەوڵەت دەبینین کەلەزۆنگاوی نەفامیدا ڕۆ دەچێتو، بۆ بەدەستهێنانی ژیان و گوزەران کاروپیشەی ناپەسەند دەکەن، چونکە ڕەوشتیان خراپ بووە و خوویان گرتووە بە پەستی و خراپەوە، هەرکاتێکیش ئەم خووە خراپانە لە شارێکدا بڵاو بوویەوە ئەوا وێران دەبێت، ئەمەش مانای ئەو فەرموودەی خودایە کەدەفەرمێت: ئەگەر بمانەوێت کە گوندێك لەناوبەرین فەرمان بەخۆشگوزەرانەکانیان دەکەین کەزیادە ڕەوی بکەن و تاوان ئەنجام بدەن و حوکمیان بەسەردا دەسەپێنێت و لەناویان دەبات.[٤٨]

بەڵگەی ئەمەش ئەوەیە کەپیشەی ئەوان لەم کاتەدا لەگەڵ پێویستیەکانیاندا بەرابەرنین، چونکە داب و نەریتگەلێکی زۆر بەدی دێن و دڵی مرۆڤ پەسەندیان دەکات و بەدوایاندا دەگەڕێت. هەربۆیە بارو دۆخی ژیانیان بەهیچ شێوەیەك جێگیر نابێت و هەرکاتێکیش بارو دۆخی ژیانی خەڵکی خراپ ببێت ئەوا شارو وولآتیش بەرەو وێرانی دەچێت.

لێرەدایە مانای قسەی هەندێك لە کەسە تایبەتەکان کەدەڵێن هەرکات لەشاردا نارنجی زۆر بچێنرێت، بەڵگەیە لەسەر وێرانیەکەی، تەنانەت هەندێك لەخەڵکی نەخوێندەوار

---

[٤٨] (وَإذا أرَدْنا أنْ نُهلِكَ قَريَةً أمَرنا مُترَفيها فَفَسَقُوا فيها فَحَقَّ عَلَيهَا القَولُ فَدَمَّرناها تَدمِيراً) س اسرى ئا ١٦.

ناشتنی داری نارنج بەشتێکی خراپ و ناباش دەزانن و لەچاندنی دوور دەکەونەوە، بەڵام مەبەستی سەرەکی ئەوەنیە کە درەختی نارنج پیرۆز نیە و خاسیەتەکەی بەو شێوەیە، بەڵکو مانای ئەم قسەیە ئەوەیە کە سەرفکردنی ئاوی زۆر لەپێویستیەکانی شارنشینیە. سەرەڕای ئەمەش درەختی نارنج و لیمۆ و سروو نمونەی ئەمانە کەنەمیوەی خۆشیان هەیە و نەسودێکیان لێوە دەبینرێت لەئامانجەکانی شارنشینیە. چونکە تەنها مەبەست لەچاندنیان جوانی شێوەکەیانە. ئەم جۆرە درەختانەش ناچێنن مەگەر دوای گەیشتن بەقۆناغی جوانخوازی و جوانکاری، ئەمەش هەمان ئەو قۆناغەیە کەتێیدا ترسی لەناو چوونی شارو خەڵکەکەی هەیە.

هاوشێوەی ئەم مانایەشیان لەبارەی خزری زوهرەشەوە گوتووە، بەڵام ئەویش لەجۆری درەختە ناوبراوەکانە کەتەنها بۆ ڕازاندنەوەی بێستان و پارکەکان دەیچێنن چونکە شکۆفەی ڕەنگاو ڕەنگ و سور و سپی هەیە، چاندنی ئەم جۆرە درەخت و گوڵانە لەشێوازەکانی جوان پەرستیە. یەکێکی تر لەخراپەکانی شارنشینی بریتیە لەڕۆچوون بەناوهەواو ئارەزو بازیدا بەهۆی ئەوەی کە جوان پەرستی بڵاوە دەکات و، لەئەنجامدا جۆراو جۆری لەهەواو ئارەزووە کانی ووڕگدا وەك خواردن و خواردنەوە خۆش و بەتامەکان و جۆراو جۆری کردن لەئارەزووە کانی عەورەتدا لەڕێگەی ژنان و نێر بازیەوە بەدی دێت و، ئەم جۆرەکارانەش دەبنە هۆی فەسادی لەنەوعدا(جۆردا) و کاردەگاتە ئەوەی کە کەس منداڵی خۆی ناناسێت، چونکە ناشەرعین و لەزیناوە دروستبوون لەو ڕوەوەی کەئاوە هەڵواسراوەکان لەنێو ڕەحمەکاندا دەبێتە هۆی ئەوەی کەباوکەکان مۆری سروشتی سەبارەت بەنەوەکانیان لەدەست بدەن و ئەو ئەرکانەی کەدەبێت لەبەرامبەر منداڵەکانیانەوە هەیانبێت ئەنجامیان نادەن و لەئەنجامدا منداڵەکان لەناو دەچن و، ئەمەش دەبێتە هۆی پچڕان لەنەوع و جۆردا. یان ئەوەی کەفەسادی جۆر بەبێ هیچ هۆیەك ڕوو دەدات..

هەروەك نێر بازی دەبێتە هۆی نەمانی وەچە و نابێتە هۆی لەدایك بوونی هیچ جۆرێك، بەلآم زینا دەبێتە هۆی بەدی نەهاتنی ئەوەی كە لێەوە بەدی دێت، هەربۆیە لەمەزهەبی مالیك دا (ر، ح) مەسەلەی نێربازی ئاشكراترە لەمەزهەبەكانی تر و، ئەوەش نیشاندەدات كەئەو بەصبر تر بووە بەمەقاصیدە (مەبەستە) شەرعیەكان و ئەوانی بۆ لەبەر چاو گرتووە. كەواتە دەبێت لەم خاڵە تێبگەین و ئەوەش لەبەرچاو بگرین كە كەمەبەستی ئاوەدانی كۆمەڵگە بریتیە لەشارستانیەت و جوانپەرستیە و هەركاتێكیش كۆمەڵگە بگاتە ئامانج و مەبەستی خۆی و، دەگەڕێتەوە سەر فەساد و هەروەك تەمەنی سروشتی هەموو حەیوانات و گیانلەبەران دەچێتە قۆناغی پیریەوە، بەڵكو دەڵێین ئەو خوو خدانەی كەلەشارستانیەتەوە بەدی دێن هەمان ئەو فەسادەیە چونكە مرۆڤ كاتێك دەتوانرێت پێی بگوترێت مرۆڤ كەخۆڕاگر بێت لەسەر هێنانی شتە بەسودەكان و، دور خستنەوەی شتە خراپەكان (جلب المنافع ودفع المچار) و، بۆ هەوڵدان لەم ڕێگەیەدا توانای هەبێت، چونكە دەبینین یەك كەسی شارنشینی خۆی بەتەنها ناتوانێت پێویستیەكانی خۆی دابین بكات، یان بەو هۆیەوەیە كەبەهۆی خواستنی هێمنی و ئارامیەوە لەو كارە بێتوانایە یان بەهۆی بەرز فڕییەوە، كەبەهۆی نازپەروەردەییەوە نیعمەت و جوانپەرستی بۆ بەدیهاتووە و ئەم دووسیفەتەش هەردووكیان خراپن و زەمكراون.

وەهەروەها ناتوانێت زیانەكان لەخۆی دوور بخاتەوە چونكە دلاوەریەكەی بەهۆی جوان پەرستیەكەی و ئەدەبكردنەوە لەدەستداوە و بەهۆی ئەم پەروەردەیەشەوە پشت دەبەستێت بەهێزی پاسەوانی و لەشكر بۆ ئەوەی بەرگری لێبكەن. سەرەڕای ئەمەش ئەو بەزۆری لەڕوانگەی ئاینیەوە خراپ دەبێت و چونكە ڕاهاتن و فەرمانبەری لەوشتانە دەبێتە هۆی لەناوچوونی ئەوو مەلەكە ئەخلاقیەكان بێجگە لەهەندێك كەسدا نەبێت دەگۆڕێن هەروەك سەلماندمان، هەركات مرۆڤ لەڕووی هێز و ئاینەوە خراپ ببێت لەڕاستیدا ئەو مرۆڤ بوونی خۆی خراپ دەكات و دەسڕێتەوە، هەربۆیە ئەو كەسانەی

کەلەدەوروبەری سوڵتاندان بەتایبەت ئەوانەیان کە لەنەریتەکانی دەشتەکیەتەوە نزیکن سودمەند ترن لەوانەی کە بەپێی داب و نەریتی شارەکان ڕاهێنراون، ئەم بارو دۆخەش لەهەر دەوڵەتێکدا بوونی هەیە. کەواتە ئەوە دەرکەوت و ئاشکرا بوو کەشارستانیەت تەمەنی وەستان و گەشەنەکردنی جیهانە لەڕووی ئاوەدانی و کۆمەڵگەو دەوڵەتانەوە. تەنها خودایە خاوەن ڕق و هێز.[٤٩]

---

[٤٩] (وَاللهَ الواحِدُ القَهّار) س الزمر ئا ١٦ .

# بەشی نۆزدەیەم

## لەبارەی ئەو شارانەی کەدەبنە پایتەختی مەملەکەتەکان بەهۆی فەساد و لەناوچوونی دەوڵەتانەوە ویران دەبن

لەبارەی ئەو لێکۆڵینەوە و وورد بوونەوانەی کەلەبارەی ئاوەدانیەوە کردمان گەشتینە ئەو ئەنجامەی کەهەرکات خراپە و فەساد ڕوویکاتە دەوڵەتێك ئەوا ڕوودەکاتە ئەو شارەشی کەپایتەختەکەیەتی و، ئاوەدانی تێدا کەم دەبێتەوە و ئەم فەسادەش بەرەو ویرانی دەڕوات. ئەم بارودۆخەش بەبێ ئاراوتە بۆ هەموو دەوڵەتان ڕوودەدات، هۆکارەکەشی دەگەڕێتەوە بۆ چەند شتێك:

١ — هەردەوڵەتێك بەناچاری لەسەرەتای کارەوە لەسەر خوی دەشتەکیەتیە کەدەبێتە هۆی دەستدرێژی نەکردن بۆ سەرماڵ و، سامانی خەڵکی و دوور کەوتنەوە لەخۆ نواندن ئەم بارو دۆخەش دەبێتە هۆی ئەوەی کەخەراج و ماڵیات کەمادەی دەوڵەتە کەم ببێتەوە و، دەرامەتەکان کەم ببنەوە و جوانپەرستی و خەرجیەکانیش کەم بکرێنەوە، کەواتە هەرکاتێك ئەو شارەی کەپایتەختی ئەو وولاتە بووە بکەوێتە ژێر دەسەڵاتی دەوڵەتێکی نوێوە و چۆنیەتیەکانی جوانپەرستی تێیدا نەمێنن، بمانەوێت و نەمانەوێت جوانپەرستیش لەنێو خەڵکی ئەو شارەشدا کەم دەبێتەوە چونکەخەڵکی هەمیشە شوێنکەوتەی دەوڵەتن و، پەیڕەوی لەخوو نەریتەکانی دەکەن ئەم پەیڕەویەش یان بەدڵخوازی خەڵکەکە خۆیانە کەبەهۆی ئەوەی لەتەبعی مرۆڤەکاندا چاولێکەری لەپێشەواو گەورەکان ئافرێنراوە، وەیان بەزۆرو بەبێ مەیل و حەز خەڵکی ناچار دەکرێن ئەو کارەبکەن کە لە

جوانپەرسیەکانی خەڵکی کەم دەکاتەوە و کەم ئەو شتانەی کەبۆ جوانپەرستی بەکار دێن دەستدەکەون، ئەمەش دەبێتە هۆی کەمبوونەوە و کەم و کورتی لەشارستانیەتی دەوڵەتدا و زۆرێك لەنەریت و سەروەت و سامانەکان لەدەوڵەت دوور دەکەونەوە، مانای ئەوەی کەئێمە لەبارەی وێرانبوونی شارەوە باسی دەکەین هەرئەمەیە.

٢ – دەزانین کەبۆ وولات دەوڵەتداری دەستبەسەردا گرتن و زالبوون بەسەر کەسانی تردا لەڕووی زۆرداریەوە دێتەدی ئەمەش لەپاش هەڵگیرسانی جەنگ و هەراکان و زاڵبوونی لایەنێك بەسەر لایەنێکی تردا دەبێت و، ئەمەش لایەنێك لەپێشتری خۆی لەهەموو ڕوویەکەوە نیشانی لایەنێکی تر دەدات لەداب و نەریتەکانی ژیاندا. سەرکەوتنی دەوڵەتێك بەسەر دەوڵەتێکی تردا دەیکوتێتەوە و هەرچی داب و نەریتیشی هەیە بەلای دەوڵەتی نوێوە زشت و ناشیرین دێنە بەرچاو، هەربۆیە لەنەریتی ئەماندا ئەو شتانە نامێنن و لەناودەچن بەهۆی ڕەتکردنەو ئینکاری لێکردنیان لەلایەن دەوڵەتی نوێوە و بەپێی تێپەڕبوونی کات ئەو داب و نەریتانە لەناو دەچن و نامێنن کۆمەڵێك داب و نەریتی دیکە شوێنیان دەگرنەوە و، ئەم دەوڵەتەش گەشەدەکات ئەم نەریتانەش وەك شارستانیەتێکی نوێیان لێدێت، ئەوەی کە شارستانیەتێك لەناو دەچێت و شارستانیەتێکی تر شوێنی دەگرێتەوە مانای دروستبوونی کەلێن لەئاوەدانی شارێکدا هەرئەمەیە.

٣ – هەرگەلێك بەناچاریەوە نیشتمانێکی هەیە کەیەکەمین جێگەی دامەزراندن و پاشایەتی ئەو گەلەیە و، هەرکاتێك نیشتمان و وولاتێکی تر داگیر بکەن ئەم ناوچە نوێیەش دەبێتە پەیڕەویکار لەناوەندی ئەو دەوڵەتەی ئەوان و شارەکانی دەبنە شاری ئەوو بازنەی سنووری ئەو وولاتە فراواندەبێت و ناچار دەبێت پایتەخت بکەوێتە ناوەڕاستەوە و، وەك ناوەندی بازنەیەك وایە کەلەشوێنی پایتەختی یەکەمەوە دوور دەبێت و خەڵکی بۆ بینینی پایتەخت و سوڵتان حەز بەسەردانی دەکەن و ئاوەدانی ڕوو دەکاتە ئەو شارە و، پایتەختی پێشوو ئاوەدانیەکەی کەم دەبێتەوە و شارستانیەت

هەروەك لەپێشەوە باسمانكرد بریتیە لەزۆری ئاوەدانی و كۆمەڵگا، كەواتە لەئەنجامدا شارستانیەتەكەی كەم و كورتی تێدەكەوێت و مانای وێرانی درووستبوونی كەلێن تێیدا هەرئەمەیە.

ئەم بارودۆخەش بۆ سلجوقیەكان روویدا كاتێك پایتەختەكەیان لەبەغدادەوە گواستەوە بۆ ئەصفەهان و هەم بۆ عەرەبیش بەرلەوان ڕوویداوە كەلەمەدائینەوە بۆ كوفە و بەصرە گواستیانەوە وەبۆ بنی عەباس كەپایتەختەكەی خۆیان لەدیمەشقەوە گواستەوە بەغداد و بۆ مەرینیەكانی مەغریب كە لەمەرا كیشەوە كواستیانەوە فاس. بەكورتی هەردەوڵەتێك كەپایتەختەكەی بگۆڕێت ئەوا پایتەختی یەكەم وێران دەبێت.

٤ – دەوڵەتی تازە هەركات زاڵبێت بەسەر دەوڵەتی پێشوودا، ئەوا دەبێت بەناچاریەوە بیرێك لەهەوابازان و پەیرەوانی دەوڵەتی پێشوو بكاتەوە و بیانباتە ناوچەیەكی تر بۆ ئەوەی لەخراپەیان بەدوور بێت، چونكە زۆربەی دانیشتوانی پایتەخت لەپەیرەوانی هەوابازان و دەوڵەتی پێشوون ئیتر لەو لەشكریانە بن كەپێشترلەكاتی دامەزراندنی دەوڵەتی پێشوەوە هاتبنە ناو ئەو شارەوە یان پیاوماقوڵان و گەورەكانی شاربن، چونكە هەمیشە خاندان و پیاوە گەورەكان بەجۆرێك لەجۆرەكان پەیوەندیان بەدەوڵەتەوە هەبووە و لەنێویدا گەشەیان كردووە، هەربۆیە ئەو خەڵكانە خوازیارانی دەوڵەتی پێشوون و هەرچەندە لەڕووی هێزو تواناو عەصەبیەتەوە نەتوانن یارمەتی بدەن بەڵام لەڕووی بیرو باوەڕ و خۆشەویستیەوە لایەنگری دەوڵەتی پێشوون. لەلایەكی تریشەوە سروشت و نەریتی دەوڵەتی تازە دامەزراو ئەوەیە كە هەموو شوێنەوارەكانی دەوڵەتی پێشوو بسڕێتەوەو لەناوی بەرێت. هەربۆیە هەموویان لەشاری پایتەختەوە بەرە و شوێنی بنەڕەتی خۆیان لەو وولاتەدا كەهێزو دەسەلاتی هەیە دەگوازێتەوە، هەندێك وەك زیندانیو حەپس و هەندێكیشیان بەڕێزو ئیحتیرام و میهرەبانیەوە بەجۆرێك كەنەبێتە مایەی توڕەبوونیان دەیانگوازێتەوە و، بەم شێوەیە بەردەوام دەبێت تاوەكو لەشاردا بێجگە لە سەوداو مامەڵەكاران و جووتیاران و خەڵكی بەگشتی و لایەنگرانی دەوڵەتی نوێ

کەسانێکی تر نابینرێن و، هەرلەم خەڵکە نوێیە پاسەوان و لەشکرو سوپا پێك دێت و شارەکە بەهێز دەبێتەوە و هەرکاتێکیش چینەناودارەکان لەشارێك دەرچن دانیشتوانەکەی کەم دەبنەوە و مانای دروستبوونی خەلەل لەئاوەدانیدا هەرئەمەیە. ئەوکات بەناچاریەوە دەبێت لەدەوڵەتی نوێدا ئاوەدانیەکی تازە لەپایتەختدا بێتەئاراوە و شارستانیەتێکی ترکەبەئەندازە و گونجاو بێت لەگەڵ هەلومەرجی نوێدا جێگەی پێشوو بگرێتەوە.

ئەم بارودۆخەش وەك ئەوکەسەوایە کەخاوویەکی کۆنی هەبێت و نەخشەکەی بەپێی حەزو ئارەزووی ئەم نەبێت هەولبدات بیگۆڕێت و بەکرداریش ئەو کارە دەستپێبکات و بەو شێوەیەی کەئەیەوێت سەرلەنوێ بیناو باڵەخانەیەکی تر دروستبکاتەوە. هاوشێوەی ئەم بارودۆخەش لەزۆرێك لەو شارانەی کەپایتەختی وولات بوون ڕووی داوە و، ئێمەش بەچاوی خۆمان بینیومانە و زانیویشمانە[٥٠] یەکەمین هۆکاری سروشتی ئەم شتە بەگشتی ئەوەیە کەدەوڵەت و پاشایەتی لەبەرامبەر ئاوەدانیەوە وەك شێوەوایە بۆ مادە کەلەشێوەی خۆیدا وەك پاسەوان وایە بۆی بوونی مادە، وەلەزانستەکانی حیکمەتیشدا سەلمێنراوە کەجیابوونەوەی یەکێك لەو دوانە لەیەکتری نەگونجاوە کەواتە دەوڵەت بەبێ ئاوەدانی تەسەور ناکرێت دەوڵەت و پاشایەتیش بەبێ ئاوەدانی بەدی نایەت بەهۆی ئەوەی کەدەستدرێژی لەتەبعی مرۆڤدا هەیە و، ئەمەش وادەکات کەلەهەرئاوەدانی کۆمەڵگەیەکدا حاکیم و بەرپەرچدەرەوەیەك (رادع) دروست ببێت و سیاسەت و کاروبارەکانی پاسەوانی کۆمەڵگا دیاری بکرێت و، ئەم سیاسەتەش لەڕێگەی شەریعەت یان لەڕێگەی دەوڵەتداری و پاشایەتیەوە جێبەجێ دەکرێت و مانای دەوڵەتیش هەرئەمەیە. وەهەرکات ئەو دوانە لەیەکتری جیانەکرێنەوە ئەوا کەم و کورتی یەکێکیان کاریگەری لەویتریاندا دەبێت، هەروەك چۆن لەناوچوونی یەکێکیان کاریگەرە لەویتریاندا و کەموکورتی (خلل) گەورە ئەڵبەت سەرەتا بەهۆی کەموکورتی بچووکەوە دروستدەبێت

---

[٥٠] (وَاللهُ يُقَدِّرُ اللَّيلَ وَالنَّهار) س المزمل ئا ٢٠.

وەك دەوڵەتی ئێران و ڕۆم یان عەرەب بەشێوەیەکی گشتی یان دەوڵەتی بنی ئومەییە یان بنی عەباس و چەندانی تریش، بەڵام تاکەدەوڵەتێکی وەك دەوڵەتەکەی ئەنوشیروان یان هرقل یان عبدالملکی کوڕی مەروان یان ڕەشیدو دەسەڵاتدارنی دوای ئەو یەك لەدوای یەك دەبنە جێنشینی یەکتری و شوێن ئاوەدانی دەکەون و، دەبنە پاساوانی بوون و مانەوەی ئەو زۆر لەیەکتری دەچن هەربۆیە خەلەلێکی زۆری تێناکەوێت، چونکە دەوڵەتی ڕاستەقینە کاریگەرلەکۆمەڵگەدا لەو عەصەبیەت و هێز و لەشکرەیە و ئەویش لەگەڵ دەسەڵاتدارانی دەوڵەتدا بەردەوامی هەیە.

بەڵام هەرکات ئەو عەصەبیەتە لەناوبچێت و عەصەبیەتێکی تر جێگەی بگرێتەوە کەکاریگەر بێت لەکۆمەڵگەدا ئەوا ئەوەی پێشوو لەناودەبات و، هەمووخاندانی ئەو نەوەیە لەناودەچن و وێرانی بێسەروبەریەکی گەورە ڕوولەدەوڵەت دەکات هەروەك چۆن لەسەرەتای بەشەکەوە سەلماندمان. خوداش هەرچیەکی بوێت بەتوانایە بەسەریدا (ئەگەربیەوێت ئێوە لەناودەبات و مەخلوقی تازە دەهێنێتە جێگەتان و ئەوەش بەلای خوداوە ئەستەم نیە.[٥١]

---

[٥١] (إِنْ يَشَأْ يُذْهِبْكُم وَيَأْتِ بِخَلْقٍ جَدِيد وَماذالِكَ عَلى الله بِعَزِيز) س ابراهيم ئا ٢٢ ٢٣.

# بەشی بیستەم

## لەبارەی ئەوەی کەهەندێك لەشارەکان تایبەت دەبن بەهەندێك کارو پیشەی تایبەتەوە

چونکە دیارە کەبەهۆی هاوکاری کردنی یەکتریەوە کەلەسروشتی کۆمەڵگەدا بوونی هەیە کارەکانی خەڵکی شارێك پەیوەستن بەیەکترەوە و، یەکێکیان هۆکاری بەدیهاتنی ئەوی تریانە و هەرکارێکیش کەببێتە پێویستی خەڵکی ئەوا تایبەت دەبێت بەهەندێك کەسی شارەکەوە و دەیکەنە پیشەی خۆیان و لەوکارەدا شارەزاییەکی زۆر پەیدا دەکەن‌و تایبەت دەبن پێیەوە و دەیکەنە هۆکاری پەیدا کردنی ڕزق و ڕۆزی ژیانی ڕۆژانەیان، چونکە پیشەی ناوبراو دەبێتە یەکێك لەپێویستیەکانی خەڵکی ئەو شارە، چونکە کارێك لەشارێکدا خەڵکی زۆر پێویستیان پێی نەبێت هێندە گرنگی پێ نادەن و وازی لێدەهێنن و پیشەگەرەکەی سودی لێ نابینێت و، ناشتوانێت بیکاتە هۆکاری ژیان و گوزەرانی بەلاّم ئەو کارو پیشانەی کەپێویستی خەڵکیان پێوە بەسراوەتەوە و لەشاردا دەستدەکەون وەك بەرگدوری(خیاتی) ئاسنگەری و دارتاشی نمونەی ئەمانە. وەئەو پیشانەی کە زۆر پێویست نین و زیاتر بۆجوانکاری و خۆشگوزەرانی بەکار دێن و تەنها کەسانی خاوەن توانای دارایی دەتوانن بەکاریان بهێنن لەشارە قەرەباڵغەکاندا وەك شوشەگەری و زەڕەنگەری و عەتتاری لە چێشتخانەی بازاڕەکان و، دروستکردنی مرەباکان و هەلیسە سازی و نمونەی ئەم جۆرە پیشانە لەشارەکاندا جیاوازیان هەیە و، بەو ئەندازەیەی کەداب و نەریتەکانی شارستانیەت زۆر دەبێت و جوانخوازی دەیخوازێت

پیشەگەلێکی لەم جۆرە بەدی دێن و، لەشارێکدا ڕەواج پەیدا دەکەن و لەشارێکی تردا بوونیان نیە هەروەك چۆن دەتوانین گەرماوەکان بۆ ئەم مەبەستە بەنمونە بهێنینەوە کەتەنها لەشارە خاوەن شارستانی و پڕ دانیشتوانەکاندا هەن چونکە جوانخوازی و نازو نیعمەت خوازیاری بوونی ئەو گەرماوانەیە(حمام)، هەربۆیە دەبینین لەشارە بچووکەکاندا ئەو حەمامانە بوونیان نیە، هەرچەندە هەندێك لەپاشاو دەسەلآتدارەکان لەم جۆرە شارە بچوکانەشدا هەندێك حەمامیان دروستکردووە و ئەگەر بێت خەڵکی بەگشتی سەردانیان نەکەن و بەکاریان نەهێنن، ئەوا بەخێرایی وەلا دەخرێن و وێران دەبن و خاوەنەکانیان واز لەو پیشەیە دەهێنن چونکە هیچ سودو قازانجێکی لێ ناکەن بۆ دابینکردنی ژیان گوزەرانیان. خوداش ڕۆزی دەگرێتە وە و ڕۆزیش دەدات.[٥٢]

[٥٢] (وَاللهُ يَقْبِضُ وَيَبْصُطُ) س بقرة ئا ٢٤٥.

# بەشی بیست و یەکەم

## لەبارەی ئەوەی کەلەشارەکانیشدا عەصەبیەت بوونی هەیە و هەندێکیان زاڵدەبن بەسەر هەندێکی تریاندا

دیارە کەپەیوەندی خزمایەتی و وابەستەبوون بەیەکترەوە لەتەبعەکانی مرۆڤدا بوونی هەیە هەرچەندە لەیەك نەسەب و نەژادیش نەبن. بەڵام ئەم جۆرە وابەستە بوونە هەروەك چۆن باسمانکرد لەخزمایەتی نەسەبی لاوازترە و بەهۆی ئەوەوە هەندێك لەتایبەتمەندیەکانی عەصەبیەت کەلەڕێگەی خزمایەتی نەسەبیەوە بەدی دێن دەست دەکەون. زۆرێك لەخەڵکی یەك شار لەڕێگەی ژن و ژنخوازیەوە پەیوەندی خزمایەتی دروستدەکەن و هێندە وابەستەی یەکتری دەبن تاوەکو بەرەبەرە خەڵکی شار وەك کۆمەڵ و گروپی خزمایەتی گەورەیان لێدێت و، ئەو دۆستی و دوژمنیەی کەلەنێو هۆزو تیرەکاندا هەیە لەنێو ئەمانیشدا دروستدەبێت و، هەروەك چۆن لەشاردا گروپ و کۆمەڵگەلێکی جۆراو جۆر درەستدەبن و هەرکاتێکیش دەوڵەت پیری ڕووی تێبکات و هێزو دەسەڵاتی لەناوچە دووردەستەکاندا نەمێنێت، ئەوکات خەڵکی ئەو ناوچانە ناچار دەبن خۆیان کراوبارەکانیان بەڕێوەبەرن و بیر لەپارێزگاری کردنی شارەکەیان لەدەستدرێژی دووژمنان بکەنەوە و پرس و ڕاوێژ بەیەکتری بکەن و، خەڵکی بەڕێز لەکەسە پەستەکان جیابکەنەوە، چونکە لەناخی مرۆڤدا حەزکردن بەزاڵبوون هەیە هەربۆیە گەورەپیاوان و ناودارانی شار کاتێك بۆشایی دەسەلات دەبینن بیری سەربەخۆیی لەناخیاندا پەروەردە دەبێت و لەگەڵ یەکتریدا بەشەر دێن و هەرکەسەو گروپ و کۆمەڵێك

لەدەوری خۆیان کۆدەکەنەوەو، هاوسۆینی بۆ خۆیان دروستدەکەن و سەروەت و سامانیان لەڕێگە خەڵکانی پەست و بێسەروبەردا سەرفدەکەن بۆ ئەوەی پارێزگاریان لێبکەن و ئەوکات هەوەسبازانی هەریەکەیان لەدەوروبەری ئەو کۆدەبنەوە و سەرئەنجام یەکێکیان زاڵدەبێت بەسەر ئەوانی تردا و سەرەتاش ئەو کەسە بەمیهرەبانیەوە لەگەڵ شوێنکەوتووە کانیدا هەڵسووکەوت دەکات بۆ ئەوەی بۆخۆی ڕامیان بکات و لەپاشان کەم کەم دەستدەکاتە کوشتن یان دوور خستنەوەیان بۆ ئەوەی هەرهێز دەسەڵاتێك لەشاردا هەیە تێکی بشکێنێت و، هەرجۆرە سەرکەشی و سەرهەڵدانێك کپ بکاتەوە و لەسەرانسەری وڵاتەکەیدا بەشێوەیەکی سەربەخۆ و بەبێ ڕکابەر فەرمانڕەوایی بکات و، دەبینێت کەلەشارێکی بچووکدا پاشایەتیەکی بچووکی دروستکردووە و، نەوەکانی بەشێوەیەکی یەك لەدوای یەك دەسەلات دەگرنە دەست و بەم شێوەیە ئەوشتانەی کەلەوڵاتێکی گەورەدا ڕوودەدەن، وەك خۆشگوزەرانی و شادی لەم وڵاتە بچووکەشدا ڕوودەدەن تاوەکو ئەوکاتەی پیری و فەتوتی دەوڵەت دێتە پێشەوە.

سەرۆکی ئەم جۆرە وڵاتانە وەك سەرکردەو پاشاگەورەکان هەڵسووکە وت دەکەن کەخاوەن وڵاتی پان و بەرین و عەصەبیەتی بەهێز و هۆزو عەشیرەتی گەورە و سوپای تۆکمە و تەیارو وڵاتی جۆراو جۆرن و، لەهەموو شتێکدا چاو لەسەرۆکی ئەم وڵاتە گەورانە دەکەن و لەسەر تەخت دادەنیشن و لەکاتی گەڕانیاندا کەژاوەی گەورە و ڕازاوەیان هەیە و مۆری تایبەتیان بۆ نوسراوەکانیان هەیە و، دەزگای موحتەسیبی دادەمەزرێنن و خەڵکی ناچار دەکەن کەبەمەولاو (امیر المومنین) بانگیان بکەن بەجۆرێك هەرکەسێك ئەو بارودۆخە ببینێت بەیاری منداڵانی دەزانن، چونکە بەهیچ شێوەیەك شایستەی ئەو کارە نین و هۆکاری دروستبوونی ئەم حاڵەتەش هەمان ئەو دواکەوتنەی دەوڵەت و هەندێك پەیوەندی خزمایەتیە، کەعەصەبیەتێك دروستدەبێت و هەندێك جاریش هەندێکیان لەم جۆرە چاولێکەریانە دوور دەکەونەوە بۆ ئەوەی لەلایەن خەڵکیەوە گاڵتەیان پێ نەکرێت و، بەسادەییەوە دەژین.

لەسەردەمی ئێمەشدا ئەم جۆرە ڕووداوانە لەکۆتایی دەوڵەتی حەفصیەکانەوە لەئەفریقا ڕوویداوە وەلەشارەکانی جەریددا: تەرابلس و قابس و توزر و نفتە قفصە و بیکرە و زاب و ناوچەکانی تەنیشتی ئەوان لەکاتی لاواز بوونی دەسەڵاتی دەوڵەتدا لەدەیان ساڵ لەمەوبەرەوە هاوشێوەی ئەم ڕووداوانە ڕوویانداوە و، سەرکردەی ئەو شارانە سەربەخۆییان ڕاگەیاندووە و خەراج وماڵیاتیان لەخەڵکی کۆ کردووەتەوە و بەڕواڵەت وایان نیشان دەدا کەبەفەرمانی دەوڵەتی مەرکەزی ئەوکارە دەکەن و، وایان نیشاندەدا کەپابەندی بەیعەتن و ملکەچی دەوڵەتن، ئەمە لەکاتێکدا بەڕاستی بەو جۆرە نەبوو، تاوەکو ئەم سەردەمەش فەرمانڕەواییان بەمیرات گەشتووە بەمنداڵەکانیان. ئەو دەسەڵات و لەخۆبایی بوونەی کەبۆ منداڵانی فەرمانڕەوا گەورەکان دەست دەدات بۆ منداڵانی ئەمانیش دەستدەدات و، خۆیان لەڕیزی سوڵتانەکان دەزانن لەکاتێکدا هێندە نیە کەلەڕیزی خەڵکی ئاساییدا بوون، تائەوەبوو مەولامان ئەبو العباس ئەم بارودۆخەی نەهێشت و ئەو شارانەی کەخستبوویانە ژێر دەسەڵاتیانەوە لێی سەندنەوە هەروەك چۆن لەمێژووی ئەو دەوڵەتەدا باسی دەکەین.

هاوشێوەی ئەم چۆنیەتیەش لەکۆتایی دەوڵەتی صەنهاجیدا ڕوویداوە لەشارەکانی جەریددا خەڵکی خۆیان کاروبارەکانیان گرتە دەست و، ئەو ناوچەیان بەشێوەیەکی سەربەخۆ بەڕێوە دەبرد تائەوکاتەی پێشەواو پاشای نەژادی مووەحیدان عبدالمومن بن علی شارەناوبراوەکانی لەوان سەندەوە و هەموو ئەو سەرکەشانەی لەدەسەڵات دوور خستەوە بۆ مەغریب و لەوێدا شوێنەواری نەهێشتن، هەروەك چۆن لەمێژووی ئەودا باسی دەکەین. وەهەروەها لەکۆتایی دەوڵەتی عبدالمومن دا ئەم جۆرە ڕووداوانەش ڕوویانداوە وەك ڕووداوەکانی سیبتە. ئەم جۆرە کارانەی دەسەڵات گرتنەدەست و کودەتاکردن و سەربەخۆیی ڕاگەیاندنانە زیاتر لەنێو گەورەکان و خاندانە شەریفەکاندا ڕوودەدەن، کە بەربژێری سەرکردایەتی کردنی شارن. هەندێك جاریش کەسە پەستەکان ئەمکارانە دەکەن و دەسەڵات دەگرنە دەست و ئەمەش ئەو کاتەیە کەبەهۆی بەدەستهێنانی

عەصەبیەتەوە و پەیوەست بوونی بەو کەسە پەست و خراپانەوە هەلو مەرجی ئەوە دەڕەخسێت کە ئەم کەسە پلەنزمانەش جڵەوی دەسەڵات بگرنە دەست و ئەوکات زاڵدەبن بەسەر ئەوگەورە و مەشایخانەی کەخاوەن عەصەبیەت نین. خوداش زاڵە بەسەر کارەکانیدا.

# بەشی بیست و دووهەم

## لەبارەی زمانەکانی شار نشینانەوە

دەبێت ئەوە بزانین کەزمانی خەڵکی شارەکان بریتیە لەزمانی نەتەوە یان گەلێکە کەبەسەر شارەکاندا زاڵدەبن یان بنیاتیان دەنێن، هەربۆیە زمانی هەموو شارە ئیسلامیەکان لەخۆرهەڵات و خۆرئاوادا تاوەکو ئەم سەدەمەش عەرەبیە هەرچەندە شێوەی بنەڕەتی زمانی عەرەبی موزەڕی خراپ بووە و ئیعراب و یاساکانی گۆڕاون. هۆکارەکەشی ئەوەیەکە دەوڵەتی ئیسلامی زاڵبووە بەسەر گەلاندا و دین و نەتەوە بۆ جیهانی هەستی وولآت وەك شێوە وەهان و، هەموویان دەبنە مادەکانی و شێوەلەپێش مادەوەیە دین لەشەریعەت سود وەردەگرێت کەبەزمانی عەرەبیە، چونکە پێغەمبەر (ص) عەرەبیە، کەواتە پێویستە کەمانەکانی تری بێجگەلەعەرەبی لەهەموو مەملەکەتە ئیسلامیەکاندا بخرێنە لاوە. ئەم شتەش دەبێت قسەکەی خەلیفە عومەرخودای لیّ ڕازی بێت لەبەرچاو بگرین کەقسەکردنی بەزمانەکانی تری نەهی کردووە و گوتوویەتی قسەکردن بەزمانە عەجەمیەکان فێڵکردن و خەڵەتاندنە.

لەبەر ئەوەی کە ئاینی ئیسلام زمانە غەیرە عەرەبیەکانی خستووەتەلاوە و زمانی کاربەدەستانی دەوڵەت بەزمانی عەرەبی قسەدەکەن، هەربۆیە زمانەکانی تر قسەیان پێنەکراوە چونکە خەڵکی پەیڕەوی لەئاینی سوڵتان و سەرکردەکانیان دەکەن و بەکار هێنانی زمانی عەرەبی لەشیعارەکانی ئیسلامن و بەفەرما نبەری لەعەرەب دەژمێردراو،

نەتەوەکان زمانەکانی خۆیان وەلانا و بەزمانی عەرەبی قسەیان دەکرد بەجۆرێك ئەم زمانە رەگ و ریشەی داکوتا کەزمانە غەیرە عەرەبیەکان نامۆ بوونەوە لەناو خەڵکیدا. ئەوکات بەهۆی ئاوێتەبوونی زمانەکانی تر لەگەڵ زمانی عەرەبیدا. لەئەنجامی ئاوێتە بوونی زمانی عەرەبی لەگەڵ زمانەکانی تردا خراپە روویکردە زمانی عەرەبی و هەندێك لەیاساکانی ئاوەژوو بوونەوە و کۆتایی ووشەکانی گۆڕانکاریان بەسەردا هات و، هەرچەندە لەرووی دەلالەتەکان لەسەر چەمك و مەفهومەکان لەسەر ئەصڵی خۆی مابوویەوە و ئەم زمانە ئامێتەیە لەهەموو شارە ئیسلامیەکاندا بەزمانی شاری ناوی دەبەن و بەهەمان شێوە زۆربەی خەڵکی شارە ئیسلامیەکان لەم رۆژگارەدا لەپاشماوەی تازیانێکن، کەشارە ناوبراوەکانیان داگیر کردووە وبوونەتە قوربانی جوانخوازی و نازو نیعمەتی ئەوان چونکە لەرووی ژمارەوە زیاتر بوون لەدانیشتوانی غەیەرەبی ئەو شارانە.

هەربۆیە بوونە میراتگری سەرزەوی و دیارەکانیان و زمانەکا نیش بەویراسەت لەنەوەیەکەوە بۆ نەوەیەکی تر دەگوازرێتەوە. هەربۆیە زمانی دواییناں لەبەرامبەر زمانی باو باپیرانەوە ماوەتەوە هەرچەندە بەهۆی ئاوێتەبوونی لەگەڵ بێگانەکاندا کەم کەم یاساکانی خراپ بوون و دراونەتە پاڵ شارەکانو زۆر ئەصڵ نیە و زمانی عەرەبی لەنێو دەشتەکیەکاندا ریشەدارترە چونکە لەناو دەشتەکیەتیدا بووە و ئەصیل ترە. چونکە نەتەوە غەیرە عەرەبەکانی وەك دیلەمیەکان و سلجوقیەکان لەخۆرهەلات و زناتە و بەربەرلەمەغریبدا گەشتنە فەرمانڕەوایی و زاڵبوون بەسەر هەموو وولاتە ئیسلامیەکاندا و زمانی عەرەبی بەم هۆیەوە خراپ بوو نزیك بوو لەنێو بچێت و، ئەگەر موسوڵمانان پابەندی قورئان نەبوونایە و ئاینیان نەپاراستایە و ئەم شتە بوویە هۆی مانەوەی زمانی عەرەبی و پاراستنی. لەبەر ئەوەی کەتەتارو مەغۆلەکان پەیرەویان لەئیسلام نەدەکرد و لەخۆرهەلاتدا گەیشتنە فەرمانڕەوایی ئەم لەپێشیە لەناو چوو بەتەواوی زمانی عەرەبی تێکچوو لەمەملەکەتەئیسلامیەکانی وەك عێراق و خۆراسان و وولاتی فارس و سەرزەوی هیند و سیند و ماورا النهرو وولاتی باکور و مەملەکەتەکانی رۆمدا هیچ جۆرە

ناونیشانێکی لێ بەجێنەماوەتەوە و، شێوازەکانی زمانی عەرەبی لەشیعر و پەخشاندا هەڵوەشایەوەو، بێجگەلەهەندێك شوێن نەبێت کەخودا بۆ کەسانێکی ئاسانکردووە کەزمانی عەرەبی بەشێوەیەکی صەناعی بەهۆی یاسا و ڕێساکانی عەربیەوە وانەکانی زانستەکانی عەرەبیان فێری یەکتر دەکرد و گوتە عەرەبیەکانیان لەبەر دەکرد. هەرچەندە کەزمانی عەرەبی یان موزەڕی لەمیسر و شام و لەمەغریب و لەئەندەلوس و مەغریبدا بەهۆی مانەوەی ئاین و داواکردنیەوە ماوەتەوە، هەربۆیە تائەندازەیەك زمانی ناوبراو لەو وولاتەدا بەپارێزراوی ماوەتەوە بەلاَم لەمەملەکەتەکانی عێراق و ماوراء النهر هیچ جۆرە شوێنەوارێکی نەواوەتەوە، تەنانەت کتێبە زانستیەکان بەزمانی عەرەبی نانوسنەوە واتە بەزمانەکانی تر دەیانوسنەوە و لەناوەندەکانی خوێندندا بەعەرەبی نایانخوێنن. خوداش ئەندازەگیری کاری شەوو ڕۆژە[٥٣].

درودی خودا لەسەر سەروەر و سەردامان محمد و خاندانەکەی و هاوەلاَنی و سلاَوێکی بەردەوام و نەمر تاوەکو ڕۆژی قیامەت لەسەر ئەوبێت و، ستایشی خودایەك دەکەین کەپەروەردگاری جیهانیانە. بەشی چوارەم لەکتێبی یەکەم کۆتایی هات و لەپاش ئەو بەشی پێنجەم دێت کەلەبارەی مەعاش و بەشەکانی پیشە و کەسابەتەوەیە.

---

[٥٣] (وَاللهُ يُقَدِّرُ اللَّيلَ وَالنَّهار) س المزمل ئا ٢٠.

# بابی پێنجەم لەکتێبی یەکەم

## لەبارەی مەعاش ( ئابوری ) و ڕێگەکانی بەدەستهێنانی وەك پیشە و هونەرەکان و ئەو چۆنیەتیانەی کەلەم بارەیەوە ڕوودەدەن، ئەم بابە چەند مەسەلەیەکی لەخۆ گرتووە

## بەشی یەکەم

### لەبارەی حەقیقەتی ڕۆزی و بەروبوم و ڕاڤەیان و ئەوەی کە بەرو بووم بریتیە لەبەهای کارە مرۆییەکان

دەبێت ئەوە بزانین کەمرۆڤ بەسروشتی خۆی پێویستی بەهۆکار گەلێکە کە خۆراك و ڕۆزیەکەی لەهەموو حاڵەت و قۆناغەکانی ژیانیدا هەرلەسەرەتای منداڵیەوە تاوەکو قۆناغی لاویەتی و سەردەمی بەتەمەنی و پیری دابین بکات، خودا بێ نیازە و ئێوەن نیازمەندان[٥٤] خوداش ئەوەی لەم جیهانەدا هەیە بۆ مرۆڤی ئافراندووە و لەچەندین ئایەتی قورئاندا باسی کردووە و منەتی ناوە بەسەریدا و فەرمویەتی: هەموو ئەو شتانەی لەئاسمان و زەویدا بۆ ئێوەی دروستکردووە[٥٥] وەخۆرو مانگی ڕامکردووە بۆتان وهەروەها

---

[٥٤] (وَاللهُ الغَنِيُّ وَأنتُمُ الفُقَراء) س محمد ئا ٤٠.

[٥٥] (وَسَخَّرَلَكُمْ ماني السَّماوات وَما في الأرضِ جَمِيعاً) س جاثية ئـا ٢ و (وَالَّذي خَلَقَ لَكُم مَّـا في الأرضِ جَمِيعـاً) س البقرة ئا ٢٧.

دەریاشی بۆ ئێوە ڕامکردووە[٥٦] وەکەشتیەکانی بۆ ئێوە موسەخەر کردووە[٥٧]و، چوارپێکانی ڕامکردووە بۆتان[٥٨] ئەم جۆرە شاهێدو بەڵگانە لەقورئاندا زۆر و زەوەندن و دەستی هێز و توانای مرۆڤ لەوەی کەلەجیهاندا هەیە دەستکراوەیە، چونکە خودا ئەوی وەك جێنشینی خۆی داناوە[٥٩] وەهێزەکانی مرۆڤ پەراگەندەن کەواتە ئەوان لەم بارەیەوە شەریکی یەکرتن. وەئەوەی کەیەکێك لەوان لەدەرئەنجامی ئەم فراوانی و دەستکراوەییەوە بەدەستی دەهێنێت و ئەویتری لێ بێبەش دەکات مەگەر ئەوەی کە لەبریکی لێوەر بگرێت، کەواتە کاتێك کەمرۆڤ هێز پەیدا دەکات و لەقۆناغی بێتواناییی دەردەچێت هەوڵی هەڵبژاردنی کارو پیشەکان دەدات و ئەوەی کەخودا بەوی دەبەخشێت بەهۆی ئەو کارو پیشانەوە لەبەڕێوەبردن و، بەدەستهێنانی پێویستیەکانی ژیانیدا

---

٥٦ (وَالَّذي خَلَقَ لَكُم البَحرَ) س جاثية ئا ٤٥.

٥٧ (وَسَخَرَ لَكُمُ الفُلك) س جاسية ئا ٤٥.

٥٨ (اللهُ الَّذي جَعَلَ لَكُم الأنعام) س المومنون ئا ٧٩.

٥٩ (وَهُوَالَّذي جَعَلَكُم خَلائفَ الأرض) س انعام ئا ١٦٥. لێرەدا گرنگە ئامـاژە بـەخاڵێکی گرنگ بکـەین و ڕوونـی بکەینەوە، ئەویش مەسەلەی جێنشینی ئادەمە لەسەر زەویدا کەتاوەکو هەنووکەش ئـادەم بەجێنشـینی خـودا تەفسیر کراوە لەئایەتەکاندا، بەڵام هەربەدەقی هەمان ئایەت ئادەم جێنشـینی هاوشـێوەکانی خۆیـەتی چـونکە خەلیفە و جێنشین کاتێك دەبێت کە کەسێك دەمرێت‌و، کەسێکی دیکە شوێنی دەگرێتەوە کەواتە ئەگـەر بڵـێین ئادەم جێنشینی خودایە ئەوا پاك و بێگەردی بۆخـودای تاقانـە دەبێـت خـودا نـەمابێت، ئـەوکات جێنشـینێکی هەبێت ، بـەڵام حـەزرەتی ئـادەم جێنشـینی هاوشـێوەکانی خۆیـەتی بەبەڵگـەی ئـەوەی کەلـەو کاتـەی کـەخودا بڕیاریدا کەئادەم خەلق بکات بەفریشتەکانی گووت و، ئەوانیش بەبێ وەستان گووتیان ئەی خـالیقی گـەورە تـۆ کەسـێك دەئـافرێنی کـە فەسـاد لەسـەر زەویـدا بـڵاو دەکاتـەوەو، خوێندەرێـژێت چونکەفریشـتەکان پێشـتر هاوشـێوەکانی ئادەمیـان بینیبـوو کـەخودا دروسـتی کردبـوون و هـیچ ئـەقڵ و فامێکیـان نـەبووەو یـەکتریان کوشتوەتەوە، بۆیە ڕەخنەیان گرت، بەڵام خودا پێی فەرموون ئەمجارەیان وەك جارەکانی پێشوونیە و ئەمەیان هـەمووناوەکانی فێـر دەکـەم و، ئـەقڵ و ئـیرادەی پێدەبەخشـم ئـەوەبوو خـودا ناوەکـانی فێـری ئـادەم کـردوو لەپاشـان لەفریشـتەکانی پرسـی و ئـەوانیش وەك ئـادەم نـەیانتوانی وەڵام بدەنـەوە، خـوداش فـەرمووی بەفریشتەکان ئەی پێم نەگووتن من غەیب و نادیاری ئاسمانەکان و زەوی دەزانم و ئەوەشی کەئێوە نایزانن مـن دەیزانم.

سەرفیان بکات و بیانبەخشێت[٦٠] کەواتە داوای ڕزق و ڕۆزی هەر لەخودا بکەن[٦١] وەهەندێك جاریش هۆکارەکانی ڕۆزی بەبێ هەوڵ و ماندبوونیش بەدەست دێن، وەك ئەو بارانانەی کەبۆ کشتووکاڵ بەسودن.

بەڵام لەگەڵ هەموو ئەم هۆکارانەدا تەنها بەیارمەتی ئەو دەبێت بەناچاریش مرۆڤ دەبێت هەوڵبدات، هەروەك چۆن لەداهاتوودا ئاماژەی پێدەکەین. کەواتە دەستکەوتە ناوبراوەکان ئەگەر بەپێی پێویست بن ئەوا دەبنە وەسیلەی مەعاشی ئەو وە ئەگەریش لەپێویست زیاتر بوون ئەوکات دەبنە سەرچاوەی سەروەت و سامانی ئەو. لەپاشان دەبێت ئەوەش بزانین کەئەم بەهرەو دەستکەوتە ئەگەر سودەکەی بگەڕێتەوە بۆ مرۆڤ و لەبەرهەمەکەی سودمەندبێت و، لەڕێگەی بەرژەوەندی و پێویستیەکانی خۆیدا سەرفی بکات بەم بەرهەمە دەگوترێت ڕزق و ڕۆزی.

پێغەمبەر (ص) دەفەرمێت ئەوەی لەسەروەت و سامانی تۆ تایبەتەپێتەوە ئەندازەیەکە کەبیخۆیت بەڵام تەواوی نەکەیت، یان بپۆشی و کۆنەی بکەیت، یان خێربکەیت و سەرفی بکەیت، لەکاتێکدا هیچ سودێکی لەسەروەت و سامانەکەی نەبات و لەبەرژەوەندیەکانی خۆیدا بەکاری نەهێنێت و نەیخاتە کارەوە و سودی لێوەرنەگرێت، بەم جۆرە سەروەت و سامانە ناڵێن ڕزق و ڕۆزی.

کەواتە ئەوەی کەمرۆڤ بەهەوڵ و ماندوبوونی خۆی بەدەستی دەهێنێت پێی دەڵێن (کسب) ئەمەش وەك میرات وایە، چونکی بەکەسابەتی مردووی دەزانن نەوەك ڕزق چونکە بەهۆیەوە سودێکی نەبردووە و بەنیسبەت واریسەکانەوە لەو کاتەی لێی بەهرەمەند دەبن پێی دەڵێن ڕزق. ئەمەیە حەقیقەتی چەمك و مانای ڕزق لەلای ئەهلی سوننەت، بەڵام موعتەزیلە دەڵێن مەرجی ئەوەی بەم جۆرە سەروەت و سامانە دەڵێن ڕزق ئەوەیە کەموڵکداریەکەی ڕاست بێت و بەبیرو باوەڕی ئەوان هەرچیەك نەتوانرێت

---

[٦٠] (فَلْيُنْفِق مِمَّا آتاهُ الله) س الطلاق ئا ٧.

[٦١] (فَابتَغُوا عِندَالله الرِّزق) س عنکبوت ئا ١٧.

بەموڵك ناوبېرێت پێی ناگوترێت ڕزق هەموو موڵك و ماڵە حەرام و غەصبەکان لەم مانایە کردووەتە دەرەوە و، دەڵێن هیچکام لەم جۆرە موڵکانە بەڕزق ناژمێردرێن. دەبێ کەخوداش ڕۆزی کافر و زاڵم و غاصیب و باوەڕدار ڕۆزی دەدات و هەرکەسێکیش کەبیەوێت تایبەتی دەکات بەهیدایەتی خۆیەوە[٦٢] ئەمان، واتە موعتەزیلە لەم بارەیەوە بەڵگەگەلێکیان هەیە کەلێرەدا جێگەی باسکردنیان نیە. دواتر دەبێت ئەوە بزانین کەکەسب بریتیە لەهەوڵ و کۆشش ویستکردن بۆ کۆکردنەوە و بەدەستهێنانی مایە گوزارانە و بەناچاریەوە دەبێت بۆ ڕۆزی هەوڵ و کۆششێك هەبێت، هەرچەندە بەدەستهێنان و گەڕان بەدوایدا لەڕێگە ڕاستەکانەوە بێت. خودای گەورە دەفەرمێت: کەواتە ڕۆزی لەخودا داوابکەن.

هەوڵدانیش بۆی وابەستەیەبەئیلهام و ڕێبەری و هێزێکە کە خودا دەیدات بەمرۆڤ، هەموو هۆکارەکانی لەلایەن خوداوەیە بەناچاریەوە دەبێت هەرجۆرە بەرووبوم و سەروەتو هێزێکی مرۆیی سەرف ببێت چونکە ئەگەر خۆی بۆ خۆی وەك پیشەکان کارێك بێت دیارە کەکاری مرۆڤ لەبەدی هێنانیدا زۆر پێویستەوە، ئەگەر لەحەیوان یان گیا یان کانزاوە بەدەست بێت دیسانەوە دەبێت بەهێزی کاری مرۆیی بێتە دی، هەروەك دەیبینین، وەگەرنا بەهیچ شێوەیەك بەدەست نایەت و سودێکی نابێت. لەپاشان دەبێت ئەوە بزانین کەخودای گەورە دووبەردی کانزایی کەبریتین لەزڕ و سیم بۆ بەهای هەریەرهەم و سەروەتێك دروستی کردوون و بەزۆری مایەی زەخیرە و کەسبی خەڵکی دونیا دەبن و، ئەگەربێت و لەهەندێك کاتیشدا مادە گەلێکی تریش بێجگە لەزڕو سیم دروست بکەن دیسانەوە مەبەست لێی بەدەست هێنانی ئەو دوانەیە، چونکە هەرکانزایەك بێجگەلەم دوانە لەئاڵوگۆڕی بازرگانیدا دەوەستێت بەلاّم زڕو سیم لەم بەسەرهاتە بەدوورن. کەواتە زڕو سیم وەك بناغەو ئەصڵی هەموو کەسابەت و کارەکانە.

---

[٦٢] (یَختَصُ بِرَحْمَتِهِ مَنْ یَشاء)س بقره ئا ٩٩.

لەم پێشەکیەی کەباسکرا ئەوە دەرکەوت کە هەرچیەك کەمرۆڤ سودی لێ وەردەگرێت لەنێو هەموو سەروەت و سامانەکاندا بەدەستی دەهێنێت و کەسبی دەکات و ئەگەر لەجوملەی پیشەکان بێت، کە واتە مایەی ئەو سودەی کەلەوەوە وەرگیراوەبریتیە لەبەهای ئەو کارەی کەلەودا بەئەنجام گەشتووە و مەبەستی مرۆڤیش لەکەسابەت و بەدەستهێناندا هەمان ئەو بەهای کارەیە چونکە لێرەدا بێجگە لەکار شتێکی تر نیە و نابێتە مەبەستی زاتی بۆ کەسابەت و ماڵ کۆکردنەوە. هەندێك جار لەو پیشانەیەکە شتانێکی تریشیان تێدایە وەك دارتاشی و پارچە دووری کەبەهۆیانە قامیشی چێخ دروستدەکرێت، بەڵام لەو دووکارەدا زیاترە و کەواتە بەهاکەی واتە کار زیاترە. وەئەگەر سەروەت و وەسیلەی مەعاش پیشە نەبێت ئەو کات دەبێت لەنرخەکەیدا سود و قازانج لەبەرچاو بگیرێت وەبەهای ئەو کارەی کەبەهۆیەوە بەدەست هاتووە بکەینە ناویەوە چونکە ئەگەر کار نەبوایە سود و قازانجیش نابێت، هەندێك جاریش لەهەندێك مادەدا تێبینی کار ئاشکرایە ئەو کات بۆ ئەو کارە بەهرەیەك ئیتر بچووك بێت یان گەورە بڕیار دەدەن و هەندێك جاریش چەمکی کارەکە شاراوەیە و دیار نیە، هەروەك چۆن لەنرخی مادە خۆراکیەکاندا کەلەنێوان خەڵکیدا هەن بەهای کارەکە شاراوەیە چونکە ئیعتیباری کارو خەرجیەکانی تایبەت بەوانەوە لەنرخی دانەوێڵەدا تێبینی دەکرێت، هەروەك باسمانکرد.

بەڵام ئەم ئیعتیبارە لەو ناوچەو وولاتانەی کە کشتووکاڵ و خەرجیەکانی کەمەنادیار و شاراوە دەبێت و بێجگە گروپێکی کەم نەبێت لەجووتیاران هەستی پێ ناکەن. کەواتە ئەوە دەرکەوت کەهەموو یان زۆربەی سودو قازانجە بەدەستهاتووەکان بریتین لە بەهاو کارە مرۆییەکان و هەم مانای ڕزق و ڕۆزیش ئاشکرا بوو سەلمێنرا کەڕۆزی ئەو شتەیە کەبەهرە و سودێکی لێ دەبرێت. کەواتە مانای کەسب و ڕزق و ڕوانگەی ناونانی هەریەکەیان ڕوون بوویەوە. وەدەبێت ئەوەبزانین کەهەرکات بەهۆی کەم و کورتی لەئاوەدانی کۆمەڵگەدا کاروبارەکان نەمێنن یان کەم ببنەوە ئەوکات خودا نەمانی بەرهەم

و کەسابەت لەوکۆمەڵگەیەدا ڕادەگەیەنێت. مەگەر نابینیت لەشارە بچووك و کەم دانیشتوانەکاندا چۆن ڕۆزی بەدەستهاتوو کەم دەبێتەوە و یان بەیەکجاری لەلای خەڵکی هەرنامێنێت چونکە کارە مرۆییەکان لەو کۆمەڵگایانەدا کەم دەبنەوە. وەهەروەها ئەو شارستانانەشی کەکاری جۆراو جۆریان تێدایە خەڵکەکەیان بەتواناتر و ڕەفاهی ترن هەروەك باسمانکرد. لەبەر ئەمەیە کەخەڵکی بەگشتی دەڵێن کەهەرکات ئاوەدانی و دانیشتوانی شارەکان کەم ببێتەوە ئەوا ڕزق و ڕۆزی ئەو سەرزەمینەش نامێنێت و، تەنانەت کانی کارێزەکانیش ووشك دەبن لەئەنجامی بیر هەڵکەندن کەخۆی لەکارە مرۆییەکانە، هەروەك چۆن شیردانی حەیواناتیش ئەم حاڵەتەیان هەیە کەواتە ئەگەر چاڵهەڵکەندن و ئاودان بەردەوام نەبێت سەرچاوە و ڕووبارەکان بەتەواوی ووشك دەبن و دەچن بەناخی زەویداو، شیری حەیواناتیش ووشك دەبێت کاتێك دەیاندۆشن. سەیربکە ئەو وولاَتانەی کەلەکاتی ئاوەدانیدا خاوەن کانی و سەرچاوەئاویەکان بوون چۆن کاتێك کە وێران دەبن، هەمووئاوەکانیان دەچن بەناخی زەویدا و هەروەك بڵێی هەرگیز بوونیان نەبوویێت، خوداش ئەندازە گیری شەو ڕۆژە.

# بەشی دووەم

## لەبارەی ڕێگەکانی بەدەستهێنانی مەعاش و شێوازە جۆراو جۆرەکانی

دەبێت ئەوە بزانین کەمەعاش بریتیە لەگەڕان بەشوێن ڕۆزی و هەوڵدانە بۆ بەدەستهێنانی، ووشەی ناوبراو لەڕوانگەی زمانەوانیەوە لەسەر وەزنی (مفعل) واتە مەصدەری (عیش) و گونجانەکەی لەگەڵ مانا زاراوەییەکەیدا هۆکارە بۆ ئەوەی (عیش) یان ژیانی مرۆڤ بێجگە لەدوو توێی مانای ئەودا نەبێت بەدەست نایەت، هەربۆیە ووشەی مەعاشیان بەشێوەی زیادەڕۆیی و موبالەغە لەمانای گەڕان بەشوێن ڕۆزیدا بەکارهێناوە. کەواتە دەبێت ئەوە بزانین کە بەدەستهێنانی ڕۆزی یان بەم شێوەیە بەدەست دێت، کەلەدەستی خەڵکی دەسەنن و بەهێز و تواناوە و بەپێی ئەو یاسایەی کەباوە بەدەستی دەهێنن و بەم جۆرە کەسابەت و ڕۆزیەش دەگوترێت باج و خەراج، وەیان ئەوەی کە ڕۆزی لەڕێگەی ڕاو کردنی گیانەوەرانەوە بەدەست دێنن و حەیواناتی ناوبراو یان لەووشکانی یان لەناو دەریادا بەدەستیان دەهێنن و، بەم جۆرە کەسابەتەش دەڵێن ڕۆزی ئاشکرا. وەیان کەسبی ڕۆزی بەهۆی سود وەرگرتنە لەحیواناتەماڵیەکانەوە دەبێت بەوەی کە بەروبوومەکەیان کەپێویستی خەڵکیە دەفرۆشن، بۆنمونە لەچوارپێکان شیر و لەکرمی ئاوریشمیش ئاوریشم و حەریر و لەمێش هەنگیش هەنگوین بەدەست دەهێنن یان سود لەگیاکان وەردەگرن و، سەرقاڵی چاندنی درەخت و کشتووکاڵ دەبن و لەبەربووم و میوەکانیان بەهرەو سود وەردەگرن و بەهەموو ئەم شتانەش دەگوترێت جووتیاری.

وەیان ئەوەی کە بەدەستهێنانی ڕۆزی لەدوو توێی کارە مرۆییەکانداییە و ئەوەش بەچەند شێوە ئەنجام دەدرێت: یان لەمادە گەلێکی دیاری کراودا دەستێوەردان دەکەن و پێی دەڵێن پیشەسازیەکان وەك نوسەری و دارتاشی و ئاسنگەری و خەیاتی وپەروەردە کردنی ئەسپ و ئەم جۆرە شتانە، وەیان لەمادەگەلێکی دیاری نەکراودا کاردەکەن کەبریتین لەهەموو پیشەو هەڵسوکەوتەکانی مرۆڤ، یانم ئەوەی کەکەسب بەهۆی کاڵاو شتومەك و ئامادەکردنیانەوەیە بۆ دەستاو دەست کردن و، گوێزینەوەیان گێڕانیان لەووڵاتێکەوە بۆ ووڵاتێکی تر وەیان شاردنەوە و هەڵگرتنیان و چاوەڕێکردنی هەلی گونجاوی پڕقازانجی بازرگانی بۆ ئەوەی سود و قازانجێکی زۆر بکەن بەم جۆرە کەسبەش دەڵێن بازرگانی.

ئەمانەن ڕێگەو بەشە جۆراو جۆرەکانی مەعاش و مانای ئەو قسەیەی کەلێکۆڵەرەوانی ئەدەب و حیکمەت وەك حەریری و ئەوانی تر باسیان کردووە، چونکە ئەمان گوتوویانە مەعاش بریتیەلە: ئەمارەت و تیجارەت و فەلاحەت صەناعەت. بەلام فەرمانڕەوایی شێوازێکی سروشتی نیە بۆ بەدەستهێنانی مەعاش و لێرە پێویست ناکلات ئێمەش باسی بکەین چونکە بەشێك لەچۆنیەتیەکانی خەراجی سووڵتانی و خەراج وەرگرەکانمان لەبەشی دووەمدا باسکرد. بەلام کشتووکاڵ و پیشەسازی و بازرگانی لەڕێگە سروشتیەکانی مەعاش دەژمێردرێن. بەلام جووتیاری لەخودی خۆیدا لەهەموو جۆرەکانی مەعاش لەپێشترە چونکە شتێکی سروشتی و فیتری و ئاساییە و پێویستی بەبیر کردنەوە و زانستێکی ئەو تۆ نیە و سەرچاوەکەی دەگێڕنەوە سەر ئادەم باوکی مرۆڤایەتی و ئەو بەمامۆستاو ئەنجامدەری ئەو کارە دەزانن و، ئەم خاڵەش ئاماژەبەوەیە کەکشتووکاڵ و جووتیاری لەکۆنترینی ڕێگەکانی مەعاشە و شیاوترینی هۆکارە سروشتیەکانیەتی. بەلام پیشەسازیەکان بەبەراورد بەجووتیاری و کشتووکاڵ لەپلەی دووەمدا دێت و لەدوای جووتیاریەوەیە چونکە پیشە لەشتە پێکهاتەیی و زانستیەکانە کەتێیدا بیر و ئەندێشە بەکار دێت هەربۆیە پیشە بەزۆری بێجگە لەشارەکاندا کەلەژیانی

دەشتەکیەتی لەدواترە و، لەپلەی دووەمیدایە دەست ناکەوێت هەربۆیە ئەمەش دەگێڕنەوە سەر ئیدریس باوکی دووەمی مرۆڤایەتی چونکە ئەو بەهۆی وەحیەوە لەلایەن خوداوە فێری صەنعەت و پیشە بووە و بەیادگار بۆ مرۆڤایەتی بەجێی هێشتووە. بەڵام بازرگانی هەرچەندە لەڕووی کەسبەوە شتێکی سروشتیە، بەڵام زۆربەی ڕێگە و ڕێکارەکانی وەك سەوداو مامەڵە نیە کەبۆ بەدەستهێنانی نرخ لەنێوان کاڵاکانی کڕین و فرۆشتندا بەکاری دەهێنن تاوەکو لەم جیاوازی نرخە سودێك وەربگرن، هەربۆیە شەرع لەمەسەلەی بازرگانیدا دەمەقاڵێی بەئاسایی زانیوە چونکە دەچێتە ڕیزی سەوداو مامەڵەوە، بەم جیاوازیەوە کەبازرگانی بریتیە لەوەرگرتنی ماڵی غەیر بەشێوەیەکی خۆڕایی و بەبێ بەرامبەر نیە، هەربۆیە تایبەت بووە بەمەشروعیەتەوە، خوداش داناترە.

# بەشی سێیەم

## لەبارەی ئەوەی کەخزمەتگوزاری لەرێگەی مەعاشەوە سروشتی نیە

دەبێت ئەوە بزانین کە سوڵتان ناچارە بۆ بەڕێوەبردنی هەموو کاروبارەکانی وولات و پاشایەتی، کۆمەڵێك خزمەتکار هەڵبژێرێت وەك سوپا و شورتە و پاسەوان نوسەر و لەبارەی هەریەکە لەمەسەلە ناوبراوەکان پشت بەکەسانێك ببەستێت کەئاگاداری تواناکانیان بێت و ڕۆزیان لەخەزێنەی خۆی دابین بکات. هەموو ئەم کاروبارو ئیشانە دەچنە ژێر ئەمارەت و مەعاشەکەیەوە چونکە حوکم بەسەر هەموویانەوە جێبەجێ دەبێت و دەزگای گەورەی پاشایەتی وەك سەرچاوەیەك وایە کەئەوان وەك جۆگەلەکانی ئەون. بەڵام خزمەتگوزار یەکانی تر لەمان جیاوازن واتە پەیوەندیان بەدەوڵەت و پاشایەتیەوە نیە لەوەوە دەردەکەوێت کەزۆربەی بەتواناکان لەفەراهەمکردنی پێویستیەکانی خۆیان دوور دەکەونەوە، یان توانایان نیە لەپەیداکردنیدا چونکە لەلانکەی نازو نیعمەت و جوانپەرستیدا پەروەردە بوون، هەربۆیە ئەویتر هەڵدەبژێرن بۆ ئەوەی لەئەستۆی بگرێت و لەسامانی خۆیان مووچەیەکی پێ دەدەن ئەم شێوازەش بەپێی مەردایەتی سروشتی مرۆڤ خوویەکی ناپەسەندە، چونکە پشت بەستن بەهەرکەسێك نیشانەی بێ توانایی مرۆڤە و سەرەڕای ئەمەش خەرجیەکانی تاکەکەس زۆر دەکات و نیشانەی بێ توانایی و نامەردیە کەلەشێوەکانی مەردایەتیدا پێویستە خۆمانی لێ بەدوور بگرین. بەڵام ئەو شتەی کەهەیەئەوەیەکە داب و نەریت زاڵدەبێت بەسەر تەبعی مرۆڤدا و لەحەقیقەتدا مرۆڤ دەبێتە کوڕی نەریتەکانی خۆی نەوەك کوڕی خاندان و نەسەبەکەی.

لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا خزمەتکارێك کەشایستەی خزمەتکاری بێت و بتوانرێت پشت بە تواناکانی ببەستێت لەحوکمدا دانا دەبێت، چونکە وەها خزمەتکارێك کەکاروبارەکانی کەسێکی بەدەست بێت لەچوار حاڵەت بەدەر نیە: یان هەم بەتوانایە بەسەر کارەکانی خۆیدا و هەم شیاوی باوەڕ پێکردن و پشت پێبەستنە، وەیان تەنها لەیەکێك لەو دوو حاڵەتە ناوبراوەدا شایستەیی هەیە واتە یان لەکارەکەی خۆیدا بەتوانایە بەڵام ناتوانیت پشتی پێ ببەستیت و جێی متمانە نیە، یان جێی متمانەیە بەڵام بەڵام لەکارەکانیدا توانای نیە. بەڵام حاڵەتی یەکەم واتە کەسێك کەهەم توانای کارەکانی هەبێت و هەم باوەڕپێکراویش بێت ناتوانێت صیچ کەسێك دابمەزرێنێت، چونکە ئەو بەهۆی بوونی ئەو دوو سیفەتەتێیدا خۆی بەبێ نیاز دەزانێت لەخزمەتکردنی خەڵکانی پلە نزمداو هەقدەستی ئەم جۆرە کەسانە بەهیچ و پووچ دەداتە قەڵەم، چونکە ئەو توانای بەسەر کاڵاگەلێکی زۆرتر و گەورەتر لەمانەدا هەیە هەربۆیە بێجگە لەئەمیرە دەسەڵاتدارەکان و خاندانە خاوەن پلە و پایەکان کەسی تر بەشیاوی ئەوە نازانێت کەخزمەتکاریان بکات، چونکە هەمووان پێویشتیان بەپلە و پایە و دەسەڵات هەیە.

بەڵام گروپی دووەم واتە ئەوانەی کەنەتوانای کاریان هەیە و نەمتمانە پێکراویشن، وەها کەسێك هیچ ئاقڵێك نایکاتە خزمەتکار، چونکە ئەم کەسە لەهەردوولاکەوە زەرەو زیان و ستەم لەوانە دەکات کەخزمەتیان دەکات، لەلایەکەوە بەهۆی بێتواناییەوە لەکارەکانیدا کاروبارەکان خراپ دەکات و لەلایەکی تریشەوە بەهۆی، بەهۆی بێ متمانەییەوە لەسەروەت و سامانەکەیدا خیانەت دەکات و لەهەموو حاڵەتەکاندا بارە بەسەر خاوەن کارەکەیەوە هەربۆیە هیچ کەسێك هەوڵی دامەزراندنی هیچکام لەم دوو گروپە نادات. دووگرپ زیاتر نامێننەوە: متمانە پێکراو کەتوانای کارەکانی نیەو، بەتوانایەکیش کەمتمانە پێکراو نیە، خەڵکیش لەهەڵبژاردنی یەکێك لەم دوو گروپەدا دەبن بەدوو بەشەوە و هەریەکەیان لایەنێکی بەباش دەزانێت، بەڵام کەسی بەتوانا هەرچەندە متمانە پێکراویش نەبێت باشترە لەویتر چونکە دەتوانین لەوە بێخەم بین کەشتێك

بەفیرۆنادات و، لەم رێگەیەوە زیانێك ناگەیەنێت وەهەم لەوانەیە بەپێی توانا چاودێری بكرێت و نەهێڵرێت خیانەت بكات، بەڵام مرۆڤی بێ توانا هەرچەندە متمانە پێكراویش بێت ئەوا زیانەكەی زۆر ترە لەسودەكەی. كەواتە دەبێت ئەم خاڵانە بزانین و لەبەكارهێنانی كەسەكاندا وەك یاسایەك بەكاریان بهێنین خوداش بۆ هەرشتێك كەبیەوێت بەتوانایە.

# بەشی چوارەم

## لەبارەی ئەوەی کە گەڕان بەدوای سەروەت و سامان لەشوێنەوارە کۆن و گەنجینە شاراوەکانی سەردەمانی زوو لەبەشەکانی مەعاشی سروشتی نیە

دیارو ئاشکرایە کەزۆرێك لەخەڵکی لەشارەکاندا بەدوای دۆزینەوەی خەزێنە و گەنجینە شاراوەکانی ژێر زەویدان و وەك سەرچاوەی ژیان و گوزەرانیان بەکاریان دەهێنن و پێیان وایە کەهەموو سەروەت و سامانی نەتەوەکانی سەردەمە کۆنەکان لەژێر زەویدا وەك گەنجینە ماونەتەوە و، بەهۆی تەلیسمە جادوگەریەکانەوە سەرمۆر کراون و تەنها لەڕێگەی بوخورد و دووعای تایبەتەوە دەتوانرێت سەرەکەیان بکرێتەوە و ئەو تەلیسمانە بشکێنرێن. هەروەك چۆن خەڵکی شارەکانی ئەفریقا پێیان وایە کە ئەو فەرەنگیانەی کەبەر لەئیسلام لەو سەرزەمینەدا ژیاون بەهەمان شێوە ماڵ و داراییەکانیان لەژێر زەویدا شاردووەتەوە و لەکتێبەکاندا باسیانکردوون تاوەکو لەکاتی پێویستی خۆیاندا بیاندۆزنەوە و دەریان بهێنن. خەڵکی خۆرهەڵاتیش ئەم بیرو باوەڕەیان هەبووە لەبارەی نەتەوە قیبتی و ڕۆمی و ئێرانیەکانەوە و هەواڵ گەلێك دەگێڕنەوە کەزیاتر لەخورافات دەچێت، لەوانەش دەڵێن هەندێك لەوانەی کەگەڕاون بەشوێن گەنجینەکاندا کەتەلیسمەکانیان نەزانیوە و، لەمێژووەکەیان شارەزا نەبوون دوای ئەوەی کە ئەو شوێنەیان هەڵکەندووە بەهۆی ناشارەزاییانەوە لەتەلیسمەکانیان یان ئەو شوێنە خاڵی بووە یان پڕبووە لەکرم و مار، وەیان دەیاندۆزێتەوە بەڵام بەهۆی ئەو پاسەوانەی کە

شمشێریان هەڵکێشاوە، کەئەو گەنجینانە دەپارێزن ناتوانێت دەستی پێیان بگات، وەیان زەوی گەنجینەکان بۆ لای خۆی رادەکێشێت ئەگەر بێت و ئەم بیەوێت هەڵیان بگرێتەوە هەروەك بڵێی بەناخی زەویدا چەقیون، لەم جۆرە خورافاتانەش لەنێو قوتابیانی[٦٣] بەربەرکانی مەغریبدا زۆر باون چونکە توانای بەدەستهێنانی مەعاشیان نیە لەرێگە ئاساییەکانیەوە هەربۆیە خۆیان لەکەسە بەتواناکان نزیك دەکەنەوە و ئەو وەرەقانەی کەپەراوێزەکانیان رزیوو دڕاون و زۆر کۆن دەنوێنن دەبەنە لایان و لەسەر ئەم لاپەڕانە و یان هێڵگەلێکی سەیرو سەمەرەیان لەسەر دەکێشن و، پێیان وایە ئەمانە ڕەمز و نیشانەی کردنەوە و بەدەستهێنانی ئەو گەنجینانەن، و لەم رێگەیەوە رۆزی خۆیان (واتە قوتابیانی زاستە شەرعیەکان) لەلای ئەوان ( واتە کەسەدارا و بەتواناکان) رۆزی خۆیان پەیدا دەکەن و هانیان دەدەن کەبەشوێن گەنجینەکاندا بگەڕێن و، ئەو کەسە بەتوانایانە وا تێدەگەیەنن هۆکاری ئەوەی کەئەمان واتە (قوتابیانی زانستە شەرعیەکان) خۆیان بەتەنها ئەو کارە ناکەن ئەوەیە کەوەك ئەوان هێزو توانای ئەو کارەیان نیە و، لەبەر سزای دەسەلاتدارانیش دەترسن.

هەرچەندە هەندێکیشیان لەسیحرو جادوو تەردەستیشدا شارەزاییەکی باشیان هەیە و بۆ ئەوەی کەبەرامبەرکەیان باوەڕیان پێبکات سودی لێوەر دەگرن و بانگەشەکانی خۆیان بەراست دەدەنە قەڵەم، ئەمە لەکاتێکدا ئەوان لەکرداری سیحر و تەردەستی بەتەواوی بێئاگاو بێخەبەرن. لەئەنجامی ئەم جۆرە هەڵخەڵەتاندنانەدا کرێکار گەلێکی زۆر بۆ هەڵکەندنی چاڵەکان بەکرێ دەگرن و بۆ شاردنەوەی کارو بارەکانیان لەتاریکی شەو سود وەردەگرن و، بەشەودا ئەو کارانە دەکەن لەبەر ترسی ئەوەی مەبادا ناحەزانیان ئاگادار ببنەوە و یان فەرمانبەرانی دەوڵەت لەکارەکەیان ئاگادار ببنەوە، کاتێکیش شتێکیان دەست ناکەوێت هۆکارەکەی دیگێڕنەوە بۆ ناشارەزایی لەبارەی تەلیسمی تایبەت بەو گەنجینەیەوە کەپێی سەرمۆر کراوە و بەم جۆرە خۆیان دەخەڵەتێنن و سەرپۆش لەسەر

---

[٦٣] مەبەست لەقوتابیانی زانستەشەرعیەکانە.

تەماعە شکستخواردووەکانیاندا دەدەن. ئەوشتەی کەئەم جۆرە کەسانە والێدەکات کەئەم کارانە بکەن بریتیە لەوەی کە ناتوانن لەڕێگەکانی ترەوە مەعاشی خۆیان دابین بکەن وەك بازرگانی و پیشەسازی و کشتووکاڵ و ....هتد هەربۆیە لەبەدەستهێنانی مەعاشیاندا لادەدەن و لەڕێگەی لارو چەوت و ناسروشتیەکانەوە هەوڵی بەدەستهێنانی دەدەن و لەهەوڵی ئەوەدان ڕۆژێك لەڕۆژان بەبێ هیچ ماندبوونێك مەعاشی خۆیان دابین بکەن، هەربۆیە دەبینین بەم ڕێگە لارو لەوێرانەدا دەڕۆن کەلەماندوبوونی تر زۆر ترە و خۆیان ڕووبەڕووی مەترسی جۆراو جۆر دەکەنەوە. چونکە هەندێك جاریش زیادەڕەوی لەجوانپەرستی و خۆشگوزەرانیدا وادەکات مرۆڤ بیر لەم جۆرە کارانە بکاتەوە، چونکە لەم جۆرە هەلومەرجەدا ئەو داهاتانەی کەلەڕێگەی پیشەئاساییەکانەوە بەدەست دێت لەگەڵ خەرجی فراوانی ئەم جۆرە داب و نەریتانەدا بەرابەر نیە و، هەرکاتێك نەتوانێت لەڕێگەی سروشتیەوە بەئامانجی خۆی بگات هیچ ڕێگەیەکیان نیە، بێجگە لەوەی کە بیر لەبەدەستهێنانی سەروەت و سامانێکی زۆری بێ ڕەنج و ئازار بکەنەوە بۆ ئەوەی بتوانن ئەو خەرجیە زەبەلاحەی کەلەئەنجامی داب و نەریتی جوانپەرستی و خۆشگوزەرانی لەڕادە بەدەرەوە پێویستیانە دابینی بکەن.

هەربۆیە لەگەڕان بەدوای ئەم جۆرە کارانەدا بەپەرۆشەوە تێدەکۆشن و ئەو پەڕی هەوڵ و کۆشش دەکەن و دەبینین زۆربەی ئەو کەسانەی کەلەڕێگەیەدا هەوڵی زۆر دەدەن، ئەوانەن کەزیاتر لەجوانپەرستی و خۆشگوزەرانیە لەڕادە بەدەرەکاندا ڕۆچوون و دانیشتووی شارەکانیشن وەك میسر و هاوشێوەکانی. هەربۆیە دەبینین زۆرێك لەخەڵکی میسر بەئارەزوویەکی فراوانەوە لەگەڕاندان بەدوای گەنجینە و خەزێنەکاندا و لەبارەیانەوە پرسیار لەهەر گەشتیارێك دەکەن هەروەك چۆن حەزیان لەکیمیا هەیە. هەروەها دەبیستین کەخەڵکی میسر هەرکەسێکیان بگات بەقوتابیەکی خەڵکی مەغریب لەم بارەیەوە گفتوگۆیان لەگەڵدا دەکەن و، پرسیاریان لێدەکەن کەبەڵکو بەو هۆیەوە شوێنی خەزێنەیەك پێبزانن، ئەمەسەرەڕای ووشککردنی سەرچاوەکانی ئاوو گەڕان بەشوێن

گەنجینەدا لەشوێنەکەیدا و پێیان وایە بەزۆری ئەم گەنجینانە کەوتوونەتە ناو ڕێڕەوی ڕووباری نیلەوە و لەهەرشوێنێکی تر زیاتر خەزێنەی تێدایە و خاوەنی ئەم جۆرە قسە هەڵبەستراوانەش دەڵێن کەگوایە زۆرترین گەنجینە لەژێر ڕووباری نیلدایە و دەستیان پێدا ناگات و ناتوانرێت دەربهێنرین، خەڵکی میسریش لەبەر ئەوەی کەباو باپیرانیان سەرقاڵی سیحر و جادووگەری بوون کەم تازۆرێك باوەڕیان بەم قسانەدەکرد و چونکە لەبەشی برابی[٦٤] دا شوێنەواری زانستەکانی سیحر و جادووی میسریەکان هەرمابوویەوە و چیرۆکی ساحیرانی فیرعەون گەواهیدەری ئەم ڕاستیەیە کەئەوان تایبەت بوون بەم کارانەوە. خەڵکی مەغریبیش قەصیدەیەك دەگێڕنەوە و دەیدەنە پاڵ حەکیمەکانی خۆرهەلات و شاعیر تێیدا چۆنیەتی ووشککردنی ئاو باسدەکات بەپێی بیرو باوەڕی خۆیو لەو بارەیەوە لەڕێگەی هونەری جادووگەریەوە بەم شێوەیە باسی دەکات: ((ئەی عەداڵی ڕاستەقینەی ووشککردنی ئاو، قسەی ڕاست لەو کەسەوە وەربگرە کەئاگارە لێی، قسەی بوختان و دەستەواژەی خەڵەتاندن، کەخەڵکی لەکتێبەکانیاندا نوسیویانە بخەرەلاوە،

وەئەگەر لەو کەسانە کەباوەڕت بەقسەی هەڵیت و پەڵیت و درۆ نیە قسەی ڕاست و پەندی من ببیستە، کەواتە هەرکاتێك کەبتەوێت ئاوی چاڵێك ووشك بکەیت کەفام و ژیری هەمووان لەدۆزینەوەی ڕێگەی چارەیەك لەو بارەیەوە سەرگەردانە.

شێوەیەك وەك خۆت (واتە مرۆڤ) کەبەپێوە وەستاوە وێنا بکە کەسەری ئەو وێنەیە بەئەندازەی سەری بەچکە شێرێك بێت،

وەهەردوو دەستی گرتبێت بەپەتێك کەپێشتر پەتی دۆڵچەی ناو بیر بوو،

وەلەسەر سینەی ئەو پیتی ها ء هەروەك بینیت ژمارەی تەلاقە، بەلام لەدووبارە کردنەوەی دوور بکەوەرەوە،

---

[٦٤] جمعی (بربی) یە واتەپاشماوەی ئەو شوێن و پەرستگایانەی کەمیسریە کۆنەکان یادگاریان تێدا بەجێهێشتوون.

وەلەسەر پیتی گا هەنگاو هەڵدەگرن، و دەستیان لێنادەن و وەك زانایەكی ژیر و شارەزا دەچن بەرێوە،

وەبەچوار دەوری هێڵی تەلیسمەكەدا خەتێكی كێشاوە كە چوار گۆشەییەكەی باشترە لەبازنەیی بوونەكەی،

وەباڵندەیەك لەسەر ئەو شێوەیە سەر ببڕە و بەخوێنی باڵندەكە ڕەنگی بكە و لەپاش سەربڕینەكە ئەم مادانە بسوتێنە و بیانكەرە دووكەڵ: سندروس[٦٥] و كندر و صمغی ڕۆمی[٦٦] وەعودی هیندی بەپارچەیەكی ئاوریشم دایپۆشە و ئاوریشمی سور یان زەرد یان نیلگون كەڕەنگی سەوز و ڕەشی تێر نەبێت، بەبەنی خوری سپی دەبەستیت و بورجی شێر دەبێت لەتالیعێكدا بێت كە فەلەكناسەكان باسیانكردووە و سەرەتای مانگ بێت كەشەوەكانی مانگەشە وو ڕۆشن نین، وەبەدر دەبێت پەیوەست بێت بەتالیعی سەعد عەتاردەوە كاتژمێری ڕێكخستن و حیسابی تەلیسمەكە دەبێت لەڕۆژی شەممەدا بێت)).

مەبەست لەڕستەی (هەنگاونان بەسەر پیتی تائدا) ئەوەیە كە پیتە ناوبراوەكان لەنێوان هەردوو قاچەكانیدا بن هەروەك بڵێی بەسەریاندا دەڕوات. بەبڕوای من ئەم قەصیدەیە یەكێكە لەو شتانەی كەفێڵبازان و درۆزنان بۆ خەڵەتاندنی خەڵكی هۆنیو یانەتەوە، چونكە ئەمان لەم بارەیەوە ئەحواڵی سەیر و زاراوەگەلێكی سەرسوڕهێنەریان هەیە و، كاری درۆكردنەكەیان دەگاتە ئەو جێگەیەی كە لەناو خەڵكیدا وابڵاوی دەكەنەوە كە لەناو ماڵ و كۆشك و باڵەخانە بەناو بانگەكاندا ئەم جۆرە خەزێنە و گەنجینەی زێڕو زیوانە دەستدەكەون و لەوشوێنانەدا چاڵی قوڵ هەڵدەكەنن و، نەخشەی ساختەكەلەسەر دەفتەرە تایبەتەكانیان كێشاویانە دەیانخەنە ئەو چاڵانەوە و وای نیشان دەدەن كەئەمانە نەخشەی ئەو گەنجینە كۆنانەن و، كاتێكیش ئەم كەسانە دەفتەرە نابراوەكان

---

[٦٥] بۆیاخێكی زەرد ڕەنگە كەپێی دەڵێن كهربا و هەروەها بەڕۆنی كەمانیش دەگوترێت واتە ئەو ڕۆنەی كەكەمانی پێ چەور دەكەن.

[٦٦] عەترێكی بۆن خۆشە یان درەختێكی بۆن خۆشە كەلەڕۆمەوە هێنراوە (منتهى الارب).

دەبینن هاندەدرێن کە ئەو خانوانە بەکرێ بگرن و تێیاندا نیشتەجێ ببن بۆ ئەوەی بەبڕوای خۆیان لەهەلێکی گونجاودا ئەو خەزێنە گەورەیەی کەهیچ کەسێك لەشێوەی ئەوی نیە دەربهێنن و، دەوڵەمەند ببن و بەناوی کڕینی دەرمانەوە هەندێك بوخورد دەکڕن گوایە بۆ کردنەوەی گرێ کوێرەی تەلیسمەکان و هێنانە دی ئەو وەعدو بەڵێنانەی کە درۆزنەکان خۆیان پێیان داون، ئەمەلەکاتێکدا خەڵەتێنراون و نازانن لەنێو ئەو فێڵبازانەدا ئەم جۆرە قسانە دەکەن بۆ خەڵەتاندنی خەڵکی و کۆکردنەوەی پارە و سامان‌و لەکاتی قسەکردنیشدا لەگەڵ خەڵکی کۆمەڵێك دەستەواژەی سەیر و نامۆ بەکار دەهێنن، ئەمەش بۆ شاردنەوەی درۆ و فێڵە کانیا نە وەك چاڵ هەڵکەندن و بوخورد و سەربڕینی حەیوان و نمونەی ئەمانە بەکار دەهێنن.

بەڵام لەڕاستیدا ئەم جۆرە قسانە هیچ بنەمایەکی زانستی و مێژووییان نیە وەدەبێت ئەوە بزانین هەرچەندە خەزێنەگەلێکیش بەدەست دێن، بەڵام ئەم شتە زۆر دەگمەن ڕوودەدات ئەوەش بەڕێککەوت نەوەك بەپلان و بەرنامە و ئەم بابەتەش لەلەم سەردەمەداو نەلەسەردەمی زوودا بەهیچ شێوەیەك جێگەی پێویستی خەڵکی نەبووە و ماڵ و سامانی خۆیان لەژێر زەویەکاندا بشارنەوە و تەلیسمیان لەسەر دابنێن. وەئەو (رکازە)[٦٧] شی کەلەحەدیسدا هاتووە و فەقیهەکان بەفەرزیان داناوە بریتیە لەو ماڵە و سامانە شاردراوەیەی سەردەمی پێش ئیسلام (عصر الجاهلیە) کەبەشێوەیەکی ڕێککەوت دەدۆزرێتەوە، نەوەك بەشێوەیەکی پلان بۆ داڕێژراو و لەڕێگەی گەڕان و پشکنینەوە. سەرەڕای ئەمانەش کەسێك کەماڵ و سامانی خۆی لەژێر خاکدا دەشارێتەوە و بەسیحر تەلیسمی دەخاتە سەر و سەریان مۆر دەکات، بێگومان لەشاردنەوەیاندا زیادەڕۆیی دەکات. چۆن دەگونجێت ئەو کەماڵێك لەسەردەمی خۆیدا دەشارێتەوە وبۆ خۆی سودی لێوەرناگرێت و ئەیەوێت کەس پێی نەزانێت تەلیسم و ناوو نیشانی لەسەر دادەنێت بۆ

---

[٦٧] لەشەرعدا بریتیە لەسەروەت و سامانێکی زۆری ژێر زەوی، ئیتر هەڵگرەکەی خەڵکی بن یان خودا، لەرکازیش یەك لەسەر پێنج زەکاتی دەکەوێت.

ئەوەی کە نەوەکانی دواتر ئەو ماڵ و سامانە بەکار بهێنن؟ ئەم کارەش دژی شاردنەوە و قایم کاریە. وەهەروەها کردارەکانی ئاقڵەکان بەناچاری دەبێت بۆ مەبەست و ئامانجێك و بەمەبەستی سود وەرگرتن ئەنجام بدرێت وەکەسێکیش کەداراییەکەی دەشارێتەوە و دفنی دەکات بێگومان بۆ ئەوە و کەسوکارەکەی خۆی دەبێت ئەو کارەبکات و سامانەکەی دفن بکات و لەهەمووانی بشارێتەوە، بەلآم کەسێك بیەوێت بەشێوەیەکی گشتی سامان و داراییەکەی بشارێتەوە و نەئامادەبوان و نەداهاتوان بەشوێنەکەی نەزانن، ئەم جۆرە کارانە لەمرۆڤی ژیر و ئاقڵ ناوەشێنەوە. وەئەوەی کە گروپێك دەڵێن سەروەت و سامانە میلیەکان کەبەر لەئێمە ژیاون بۆکوێ چوون ؟ لەگەڵ ئەوەی کە ئەوە دەرکەوتووە کەپێشینان سەروەت و سامانێکی زۆر زەوەندیان هەبووە ئەی چی لێهاتووە ؟ لەوەلآمی ئەم پرسیارەدا دەبێت ئەوە بزانین سامانێکی وەك زر و سیم گەوهەر و کالآکان هەمان ئەو کانزا و شوێنی کەسابەتانەن وەك ئاسن و مس و ئرزیر و کانزا و ماڵ و داراییەکانی تر. هەموو ئەم جۆرە ماڵ و سامانەش ئاوەدانی کۆمەڵگە بەهۆی کردارە مرۆییەکانەوە بەدی دەهێنن و دەبێتە هۆی زۆری یان کەمیان. وەئەوەی کەلەدەستی خەڵکیدایە لەماڵ و داراییە ناوبراوەکان دەست بەدەست و لەکەسێکەوە بۆ کەسێکی تر گواستراوەتەوە و وەك میرات لەپێشینانەوە بۆداهاتووان ماوەتەوە ئەمە سەرەڕای ئەوەی کەوەك گۆڕینەوە و سەوداو مامەڵەکۆمەلآیەتیەکاندا لەشوێنێکەوە براون بۆ شوێنێکی تر یان لەدەولەتێکەوە براون بۆ دەولەتێکی تر هەروەك چۆن ئەگەر بەنمونە لەمەغریب و ئەفریقادا ئەم جۆرە سەروەتە کەم ببێتەوە ئەوا لەمەملەکەتەکانی ئەسلاڤ و فەرەنگیەکاندا کەم نابێتەوە وەئەگەر لەمیسرو شامدا کەم ببێتەوە ئەوا لەهیند و چیندا کەم نابێتەوە بەڵکو ئەم جۆرە سەروەت و سامانانە(زێڕ و سیم و بێجگە لەمانیش) وەك بناغەو هۆکاری کەسابەتن و ئاوەدانی کۆمەڵگە دەبێتە هۆی کەمی و زۆریان. سەرەڕای ئەمەش کۆنەیی ڕزیوی هەروەك چۆن توشی هەموو بوونەوەران دەبێت ئەوا بەهەمان شێوەش تووشی ئەم شتە گرانبەهایانەش دەبێت و لەناویان دەبات و دەبنە خۆراکی

زەوی بەتایبەت ئەوانەیان کەلەکانزاکان دروستکراون و مرواری و گەوهەر زوتر لەماڵ و سامانەکانی تر کۆن دەبن و دەرزێن و خەزێنەکە خراپ دەبێت و لەناو دەچێت. هەروەها زێڕ و سیم و مس و ئاسن و ئرزیر و قلعیش کۆنەیی و ڕزین ڕوویان تێدەکات و لەناویان دەبات هەروەك چۆن هاوشێوەکانیان لەکەمترین کاتدا ئەو حاڵەتەیان بەسەردا دێت.
بەڵام ئەوەی کەلەمیسردا بارودۆخی ئەوانە کەبەدوای ئەم شتانەدا واتە دفنکراو خەزێنەکاندا دەگەڕێن ڕوو دەدات بەو هۆیەوەیە کەلەماوەی دووهەزار ساڵ یان زیاتردا لەو وولاتەدا قیبتیەکان فەرمانرەواییان کردووە و، لەداب و نەریتەکانیشیان ئەمەبووە کە مردووە کانیان بەپێی مەزهەبی دەوڵەتی پێشووی ئەو وولاتە لەگەڵ ئەو ماڵ و داراییە گوازراوانەی کەهەیانبووە وەك زێڕ و سیم و گەوهەرو مرواری دەیانخستە ناو چاڵەوە.
لەپاش ئەوەی کە دەوڵەتی قیبتیەکان کۆتایی هات و ئێرانیەکان دەسەلاتیان لەو وولاتەدا گرتە دەست بۆ ئەم مەبەستە گۆڕەکانیان هەڵکەندەوە و، شتانێکیان ئاشکرا کرد کە وەسف ناکرێن وەك پەیکەرەی زێڕ و زێوی ئەهرامەکان و چەندین شتی گرانبەهای تر.
وەهەروەها لەپاش ئێرانیەکانیشەوە یۆنانیەکان دەستیان دایە ئەم کارە و لەو سەردەمەوە تاوەکو ئێستا گۆڕی میسریەکان جێگەی گومان و، تەماعی ئەوانە بووە کە گەڕاون بەشوێن گەنجینە شاراوەکانی ژێر زەویدا و، شتانێکی بەنرخیان تێدا دەدۆزنەوە کە یان لەگەڵ مردووەکاندا نێژراون یان لەو شتانەن کەلەکاتی ناشتنی مردووەکاندا ڕێزو گەورەییان بۆ مردووەکان نیشانداوە، وەك دەفرو تابوتی زێڕین و سیمین و کەتایبەت بەمردووەکان دروستیان دەکردن.

لەبەر ئەمەیە کە گۆڕی قیبتیەکان هەزاران ساڵە جێگەی گومانی دۆزەرەوانی گەنجینەکانە، هەربۆیە خەڵکی ئەو وولاتە بەمەبەستی دۆزینەوە و دەرهێنانی زێڕ و سیمی ئەو گەنجینانە کەجێگەی بایەخی دانیشتوا نی کۆن و نوێی جیهانە سەرقاڵ دەبنو کاتێکی زۆری خۆیانی بۆ تەرخاندەکەن، تەنانەت میسریەکان لەکۆتاییەکانی دەوڵەتدا دەیانخستە ناو بەشەکانی باجەوە و باجێکی تایبەتیان لەسەر ئەوانەی کەئەو شتانە

دەدۆزنەوە دادەنا ئەمەش وەك باجێكی تایبەتی ئەو كەم ئەقڵ و نەفامانەبوو كەسەرقاڵی ئەم كارانە دەبوون و پێویست بوو لەسەریان كەبیدەن بەدەوڵەت لەبەرامبەر ئەو شتانەی كەدەستیان دەكەوێت، بەلاّم ئەوان لەهەموو هەوڵ و كۆششەكانیان بێجگەلە نائومێدی شتێكی ئەوتۆیان بەنسیب نەدەبوو، پەنا بەخودا لەزەرەرو زیان. هەربۆیە كەسێك كەدووچاری ئەم وەسوەسە و خەیاڵپلاّوانە دەبێتەوە بەهۆی نەتوانی و تەمبەڵیەوەیە لەبەدەستهێنانی كارو كەسابەتی ڕۆژانەدا بەبێ ئەوەی كەهەوڵبدات، پەنا دەگرین بەخودا. هەروەك چۆن پێغەمبەر پەنای بەخودا گرتووە و خۆی لەڕێگە كانی شەیتان و وەسوەسەكانی لابدات و سەرگەرمی نەكات بەدرۆو شتی ئەفسانە و مەحاڵاّتەوە، و خوداش بەهەركەس كەبیەوێت ڕۆزی بێشوماری پێ دەبەخشێت[٦٨].

---

[٦٨] (وَاللهُ يَرزُقُ مَن يَشاء بِغَيرِ حِساب) س بقره ئا ٢٠٨.

# بەشی پێنجەم

## لەبارەی ئەوەی کە پلەو پایە بۆ سەروەت و سامان بەسودە

چونکە دەبینین کەخاوەنانی پلەو پایە لەهەموو جۆرەکانی مەعاشدا بەتواناتر و خۆشگوزەرانترن لەو کەسانەی کەپلەو پایەیان نیە. هۆکارەکەشی ئەو پێویستیەی خەڵکیە بە توانای خاوەنانی پلە و پایە کەهەیانە، هەربۆیە خۆیانیان لیّ نزیك دەکەنەوە و بەپێی ئەو کارانەی کەبۆیان دەکەن خزمەتی پلەدارەکان دەکەن و، کەواتە خەڵکی بەڕەنجەشانی خۆیان خزمەتی ئەم جۆرە کەسانە دەکەن و لەهەموو بوارەکانی ژیاندا ئیتر پێویستیەکان بن یان کەمالیات و جوانکاریەکان خزمەتیان دەکەن و یارمەتیان دەدەن، و لەئەنجامدا ئەم کەسانە لەبەرامبەر ئەو خزمەت و هاوکاریانەی کەبۆ خاوەن پلە و پایەکان کردوویانە بەهرەمەند دەبن، لەکاتێکدا دەبوایە لەبەرامبەر ئەوکارو خزمەتەدا مووچەیەکیان هەبوایە بەڵام خەڵکی بەخۆڕایی کاریان بۆ دەکەن، هەربۆیە خاوەن پلە و پایەکان لەبەهای کارکردنی زۆر سودێکی بێشوومار وەردەگرن کەجۆرێکیان بەبیّ بەرامبەر دەستیان دەکەوێت و جۆرێکی تریشیان دەبێت کریّ و مووچەیەك لەبەرامبەریە وە بدەن. کەواتە سود و نەتیجەی کارانێکی زۆریان بۆ دەگەڕێتەوە و بەهرەمەند دەبن و لەکەمترین ماوەدا سەروەت و سامانێکی زۆر کۆدەکەنەوە و ئەم سەروەتەشیان ڕۆژ لەدوای ڕۆژ زۆر دەبێت، هەربۆیە فەرمانڕەوایی بەیەکێك لەهۆکارەکانی بەدەستهێنانی مەعاش دەژمێردرێت، هەروەك باسمانکرد. بەڵام کەسێك کەهێز دەسەڵاتی نەبێت هەرچەندە بەتواناش بێت بەشێوەیەکی گشتی بەپێی توانا

تاکەکەسیەکەی ماڵ و دارایی بەدەستدەهێنێت و زۆربەی ئەم جۆرە کەسانەش بازرگانەکانن کەخاوەنانی پلە و پایە و هێزن و بەچەند پلەیەك لەهاوشێوەکانیان لەپێشترن. لەو شتانەشی کەپشتگیری ئەم مانایە ئەوەیە کە دەبینین زۆرێك لەفەقیهەکان و دینداران و لەخوا ترسان هەرکات بەچاکە نادەربکەن خەڵکی هاوکاریەکی زۆریان دەکەن و پێیان وایە ئەم کارەیان لەڕێگەی خودایە هەربۆیە خەڵکی بەو پەڕی دڵسۆزیەوە لەکاروبارە دونیاییەکاندا هاوکاری و یارمەتیان دەدەن و هەوڵێکی زۆر لەپێناو بەر ژەوەندی ژیانیاندا دەدەن، دەبینین بەخێرایی توانا پەیدا دەکەن و دەچنە ریزی دەوڵەمەندەکانەوە بەبێ ئەوەی لەڕێگەی هەوڵ و کۆشش و ماندبوونەوە هیچ شتێکیان بەدەست هێنانبێت و تەنها بەری ڕەنجی شانی ئەو خەڵکانە دەخۆن کەوەك هاوکاری یارمەتیان دەدەن. ئێمەش کۆمەڵێك خەڵکی زۆر لەم کەسانە لەنێو گروپی دەشتەکیەکاندا دەبینین خەڵکی لەبواری کشتووکاڵ و بازرگانیدا هەوڵێکی زۆریان بۆ دەدەن، لەکاتێکدا ئەوان لەماڵی خۆیاندا دانیشتوون و بەهۆی کاری خۆڕایی خەڵکانی ترەوە سەروەت و سامانەکەیان زۆر دەبێت و سودێکی زۆر لەسەروەت و سامانەکەیان وەردەگرن. وەئەو کەسانەی کە ئاگاداری ئەم ڕاز و نیازە نین لەچۆنیەتی کۆبوونەوەی ئەو هەمووە سەروەت و سامانەیان سەرسام دەبن، خوداش بۆ هەرکەسێك کەبیەوێت ڕۆزی بێشوماری پێدەبەخشێت.

# بەشی شەشەم

## لەبارەی ئەوەی کە خۆشبەختی و هۆکاری ڕۆزی بەزۆری بۆ ئەو کەسانە دێتە دی کەژێر و ووریان و ئەم خووەش هۆکاری بەختەوەری مرۆڤە

لەبەشەکانی پێشوودا ئەوەمان وەیاد هێنایەوە کە ئەو کەسابەت و بەدەستهاتووەی کە مرۆڤ سودی لێوەر دەگرێت هەمان بەهای ئەو کارانەی ئەمانەو ئەگەر وادابنێین کەسێك بەگشتی بێکار بێت، ئەم کەسە یەکسەر هۆکاری مەعاشی نیە و بەهای هەرکەسێك پەیوەستە بەجۆری کارەکەیەوە لەناوکاروبارەکانی خەڵکیدا و پێویستی خەڵکیە بەو کارە، کەواتە هەرچەندە کارەکەی بەنرخ بێت لای خەڵکی ئەوا سەروەت و سامانەکەشی بەئەندازەیە زۆر دەبێت و بەپێچەوانەشەوە. ئێمە لەبەشی پێشوودا ئەوەمان سەلمان کە پلەو پایە بۆ بەدەستهێنانی سەر وەت و سامان بەسوودە چونکە خاوەنانی پلەو پایە و هێز سەروەت و سامانێك بەدەست دەهێنن کەخەڵکی ئاسایی ناتوانن وەها سامانێکیان دەست بکەوێت و، لەبەرامبەر ئەو هاوکاریەی کەخەڵکی بۆ خاوەن پلەکان دەیکەن خەڵکەکەش لەپلەو پایەدارەکان خۆیان نزیك دەکەنەوەو هەوڵی ئەوە دەدەن سود لەهێزو دەسەڵاتەکەی وەربگرن و زۆرێك لەئامانجەباش و خراپەکانیان دەهێننە دی و ئەوکارانەی کەخاوەن پلەوپایەکان ئەنجامیان دەدەن، هۆکارێك دەبێت بۆ زۆر بوونی سەروەت و سامانی ئەمان و بەهای پیشەو کارەکانیان بەرز دەکاتەوە و بەرهەمێکی زۆرتریان دەبێت و لەکەمترین ماوەدا ماڵ و داراییەکی زۆر بەدەست دەهێنن. لەپاشان دەبێت ئەوە بزانین کەپلە و پایە لەناو خەڵکیدا بەپێی چین و توێژەکان دابەشکراوە و

چینێك لەپاش چینێکی ترەوە خاوەن پلە و پایەیە و باشترین چین و توێژیش پاشاکانن لەم بوارەدا و لەسەرو ئەمانەوە هیچ هێز و پلەیەك نیە و، چینەکانی خوارەوە ناتوانن زیانیان پێبگەیەنن و لەنێوان هەردوو چینەکەدا واتە پاشاکان و چینی خەڵکی ئاسایی چەندین چین و توێژی تری جۆراو جۆر هەن.

ئەمەش حیکمەتی خودایە لەنێو ئافرێنراوە کانیدا کەبەو شێوەیە ژیانیان فەراهەم دەبێت و بەرژەوەندیەکانیان دەپارێزرێت لەپێناو مانەوەی ژیانیاندا، چونکە بوونی جۆری مرۆڤ ناگاتە کەماڵ مەگەر بەهۆی هاوکاری کردنی یەکترەوە نەبێت بۆ ئەوەی لەم رێگەیەوە بەرژەوەندیەکانی ژیانی یەکتر دابین بکەن، چونکە ئەوە سەلمێنراوە کەبوونی تاکە کەسێك بەتەنها ناکرێك بگاتە قۆناغی کامڵبوون و ئەگەریش بەرێککەوت و گریمانیش وەها کەسێك ببینرێت ئەوا مانەوەی بەڕاست دەرناچێت. ئەم هاوکاریەش تەنها بەتۆپزی دێتە دی چونکە زۆرێك لەخەڵکی ئاگاداری بەرژەوەندیەکانی هاوڕەگەزەکانیان نین و خوداش ئازادی و ئیختیاری بەمرۆڤ بەخشیوە، هەربۆیە کارو کردەوەکانیان لەڕووی بیرو ئەندێشەوە دەکرێن نەوەك بەحوکمی تەبع و لەڕووی غەریزەوە، هەربۆیە هەندێك جار یارمەتی و هاوکاری یەکتری ناکەن، هەربۆیە پێویستە ناچار بە و کارە بکرێن و ئەمەش بەوەدەبێت کەکەسێك بێت و بەزۆر ئەوەی کە لەبەرژەوەندیاندایە پێیان بکات و تاوەکو حیکمەتی خودایی لەمانەوەی ئەم جۆرەدا ببێتە کردار، ئەمەش مانای ئەو فەرموودەی خودایە کەدەفەرمێت: هەندێك بەسەر هەندێکی تریاندا بەرز دەکەینەوە لەپلەو پایەدا بۆ ئەوەی هەندێکیان هەندێکی تریان بەکار بهێنن و ڕەحمەتی پەروەردگارت زیاترو باشترە لەوەی کەئەوان کۆی دەکەنەوە[٦٩].

کەواتەئەوە ئاشکرابوو کەپلەو پایە بریتیە لەهێزێك کەبۆ مرۆڤ دێتە دی کەلەبارەی هاوڕەگەزەکانی ژێر دەستی خۆیەوە وەك ڕێگە پێدان و، ڕێگری لێکردن جێبەجێی

---

[٦٩] (وَرَفَعنا بَعضَهُم فَوقَ بَعضٍ لِيَتَّخِذَ بَعضُهُمْ بَعْضاً سُخرِيًّا وَرَحمَةُ رَبِّكَ خَيرٌ مِمَّا يَجمَعُون) س الزخرف ئا .٣١

دەكات بەسەریاندا تاوەكو ئەوان لەڕووی دادگەریەوە بەهۆی ئەحكام و یاساو شەریعەت و سیاسەتەكانەوە هانیان بدات كەسود وەرگرو زیان دوور خەرەوە بن لەخۆیان و ناچاریان بكات بەجێبەجیێ كردنی ئامانج و مەبەستەكانی تریش، بەڵام گرنگی پەروەردگار بەهۆی یەكەمین ئەحكامەكانی شەریعەتەكانەوە بەشێوەیەكی زاتی و بەهۆكاری دووەم ئەحكامی سیاسەتەوە بەشێوەیەكی عەرەزی وەك هەموو بەدیهیەكانی تر كەلەحوكمی خودادا هاتوون، چونكە هەندێك جار چاكەی زۆر بەبیێ كەمێك لەخراپە نەبێت ناگاتە كەماڵ، بەهۆی ئەمەوە چاكە لەناو ناچێت بەڵكو ئەوەی كەخراپە سست و لاواز دەبێت. مانای ڕوودانی ستەمیش لەنێو خەڵكیدا هەرئەمەیە، كەواتە دەبێت ئەم خاڵە بزانین. سەرەڕای ئەمەش هەریەكە لەچینەكانی كۆمەڵگە ئیتر لەشار یان هەرێمێكدا بن لەوانەی كەلەخوار خۆیانەوەن بەهێزترن و، هەریەكە لەتاكەكانی چینی خوارەوە یارمەتی و هاكاری لەچینەكەی سەرەوە وەردەگرن و هۆكاری كەسابەت و مەعاشی چینی خاوەن دەسەڵات بەو ئەندازەیەی كەژێر دەستەكانیان كاریان بۆ دەكەن و، بەكاریان دەهێنن زۆر دەبێت لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا پلە و پایە لەهەموو ڕێگەكانی مەعاشی خەڵكیدا دەستوەردانی هەیە، بەپێی ئەو چینە و ئەو بارودۆخەی كەخاوەنانی ئەو چینە لەكۆمەڵگەدا هەیەتی بەرتەسك و فراوان دەبێت، واتە ئەگەر پلە و پایە فراوان ببێت ئەوا سودو دەرئەنجامەكانیشی فراوان دەبن و، ئەگەریش كەم بنەوە ئەوا سودەكەشی كەم دەبێتەوە.

وە كەسێك كە پلە و پایەی نیە هەرچەندە داراش بێت ئەوا تواناكەی تەنها بەئە ندازەی سەرمایەكەیەتی و بەئەندازەی هەوڵ و كۆشش كارە زیادەكانی دەبێت، وەك زۆربەی بازرگانەكان. هەندێك لەجووتیاران و پیشەگەرانیش ئەگەر پلە و پایەیان نەبێت ئەوا تەنها هەمان سودی كارو پیشەكانی خۆیانیان دەست دەكەوێت و هەندێك جاریش گیرۆدەی هەژاری بێنەوایی دەبنەوە و درنگ سەروەت و سامان بەدەست دەهێنن و زیاتر لەئەندازەی پێویستیەكان و خۆ تێر كردن بەدەست ناهێنن. كەواتە لەباسكردنی

پێشەکیەکانی پێشوو ڕوون بوونەوەی ئەم خاڵەی کە بەرهەمی دەسەلاّتیش دەتوانێ ببەخشینە کەسانی تر کەدەبێتە هۆی بەختەوەری، ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کە بەخششی دەرئەجامەکانی پلەو پایە و بەشدار کردنی خەڵکی تێیدا لەگەورەترین و گرنگترینی نیعمەتەکانە و بەخشندەکەشی لەگەورەترین دیاری بەخشەکانەو، ئەم بەخشینەشی لەڕێگەی زیرەکی و گورج و گۆڵیەوەیە لەبەدەستهێنانی داراییەکەیدا بووە هەربۆیە ئەوەی بەشوێن ئەم پلە و پایەوەیە هەروەك چۆن داوای هاوکاری لەخاوەنانی پلەوپایە دەکات، بەهەمان ئەندازەش هەوڵ و کۆشش و ژیری بۆ بخاتە کارەوە وەگەرنا بەدەستهێنانی دژوار دەبێت.

هەربۆیە گوتمان کە ژیری و وریایی لەهۆکارەکانی بەدەستهێنانی پلە و پایەیە و پلەو پایەش مایەی بەختەوەری و ڕۆزیە، هەروەك چۆن زۆربەی بەتواناکان بەختەوەرەکان بەم سیفەتەوە ناسراون هەربۆیە دەبینین زۆربەی ئەو کەسانەی کە خوی بەرزە فڕی و بەرز ڕوانیان هەیە ناگەنە هیچ پلە و پایەیەك و لەو ڕێگەیەشدا تەنها پشت بەهێزی خۆیان دەبەستن و لەگەڵ هەژاری و بێنەوایدا دەسەملان دەبن. وەدەبێت ئەوەش بزانین کە ئەم خووەی بەرز ڕوانین و بەرزە فڕیە لەو سیفەتە ناپەسەندانەیە کە بەهۆی ئەوەی کەمرۆڤ وادەزانێت گەشتووەتە کەماڵ دروستدەبێت و، ئەم جۆرە کەسانە وادەزانن کەخەڵکی پێویستی بەسەرمایەی هونەری و زانستی ئەوان هەیە، وەك ئەو زانایەی کە لەزانستەکەی خۆیدا قوڵبووەتەوە یان بەڕێوەبەرێك لەئامادەکردنی کاروبارەکانیدا شارەزایە، یان شاعیرێك کە شیعری بەپێز دەنوسێت، بەکورتی هەرکەسێك کەلەهونەری خۆیدا شارەزایی و لێهاتنی هەیە وادەزانێت کەخەڵکی دەرئەنجامی کارەکەی ئەویان پێویستە هەربۆیە بەم هۆیەوە، خۆی لەکەسانی تر بەلەپێشتر و باشتر دەزانێت و خوی بەرزەفڕی تێدا دروستدەبێت. وەهەروەها ئەوانەی کەخاوەنی خاندان و نەسەبن لەگروپێك دەژمێردرێن کەلەنێو پیاوچاکانی ئەواندا پاشا یان زانای هەڵکەوتوو یان توخمێکی تەواو لەیەك قۆناغدابوونی هەبووە لەئەنجامی بینین یان بیستنی بارودۆخی باپیران و پێشینانی

خۆیان لەشاردا لەخۆیان بایی دەبن و، وادەزانن کەئەوانیش بەهۆی ئەوەی کە میراتگر و نەوەی ئەو پیاوچاك و ئازایانەن شیاوی هەمان پلە و پایەن. ئەم جۆرە کەسانە لەحاڵی حازردا دەست بەشتێکی نەبوەوە دەگرن و پابەند دەبن پێیەوە چونکە کەماڵ بۆ ماوەیی نیە.

وەهەندێك کەسیش کەلەهەندێك حاڵەتدا بۆچوون و تێڕوانینی باش دەدەن وادەزانن ئەم سیفەتانە نیشانەی کەماڵن و وادەزانن خەڵکی پێویستیان پێیان هەیە. هەربۆیە دەبینین هەموو ئەو بەشانەی کەباسمان کردن بەرزە فڕو خۆبەزلزانن و بەهیچ شێوەیەك لەبەرامبەر خاوەن پلەکانەوە سەردانانەوێنن و چاولەوکەسانە ناکەن کەلەوان لەپێشترن و بێجگە لەخۆیان خەڵکی تر بەبچوك سەیر دەکەن، چونکە پێیان وایە کەلەخەڵکی لەپێشترن و هەموو ئەو کەسانە لەخاکی بوون پشت هەڵدەکەن ئەگەرچی لەبەرامبەر پاشایشەوەبێت، ئەم ڕێزگرتنەی پاشاو گەورەکان بەپەستی کەمی و بێ ئەقڵی دەزانن و پێیان وایە کەدەبێت خەڵکی هەڵسوکەوتیان بەپێی ئەوەی کەئەمان پێیانوایەلەگەڵیاندا بکەن و هەرکەسێکیش لەپلە و پایەی ئەوان بەباشی تێ نەگات و لەڕێزگرتنیاندا کەمێك کەمو کورتی بکات بەدووژمنی دەزانن و، هەرچەندە خەڵکی بەهۆی دریێغ کردن و بێئاگایی لەم بارەیەوە لەگێژاوی غەمدا ڕۆدەچن و نارەحەتیەکی زۆر دەبینن کەبۆچی خەڵکی ڕێزی شیاویان لێ ناگرن و بەواجب و ئەرکی سەرشانی خیانی نازانن هەربۆیە زۆر ڕقیان لەخەڵکی دەبێتەوە چونکە لەسروشتی مرۆڤدا خوی سیفەتخودایی بوونی هەیە کەمتر دەگونجێت کەسێك لەبەامبەر بەرزەفڕی کەسێکی ترەوە تەسلیم ببێت، مەگەر بەجۆرێك لەجۆرەکانی زەبر و هێز نەبێت.

هەموو ئەمانە لەپلە و پایەوە بەدی دێت هەربۆیە هەرکات کەسە خۆبەزلزان و بەزەفڕەکان پلەو پایەیان نەبێت، وەهەروەك چۆن ئاشکرامان کرد ئەم جۆرە کەسانەئەوەشیان نیە، ئەوکات خەڵکی بەهۆی ئەم خووەی تەکەبورەوە لێیان دوور دەکەونەوە و لەچاکەی خەڵکی بەهرەمەند نابن. لەئەنجامدا لەبەرویبو مەکانی پلەو

پایەچینێك كەلەوان لەپێشترن ئەمان بێبەش و مەحرووم دەكەن چونكە بەدوژمنیان دەزانن و لەئاشنایەتیان دوور دەكەونەوە و ناچن بەلایاندا.

ئەمەیە كەلەڕووی مەعاشەوە دەكەونە تەنگ دەستیەوە و لەهەژاری و بێنەوایيدا دەمێننەوە یان دەگەنە سەردەمێكی كەمێك باشتر، بۆ ئەم جۆرە كەسانەش بەهیچ شێوەیەك سەروەت و سامان كۆنابێتەوە هەربۆیە لەناو خەڵكیدا واباوە كەزاناكان لەبواری شەنس و سەروەتدا زۆر مەحرومن و ئەو بەهرەیەی كەلەزانست هەیان بێبەشی كردوون لەڕۆزی فراوان و بەهرەی ئەوان لەژیاندا هەمان ئەو زانستەیە و هیچی تر، واتە لەسەر ئەوە دروستكراون و بۆ ئەوەش ئامادەكراون، خوداش ئەندازەگیری شەوو ڕۆژە و خودایەكی تر بێجگە لەو نیە. هەندێك جاریش بەهۆی ئەم خوەوە لەپلەو پۆستە دەوڵەتیەكاندا كێشە ڕوودەدات هەروەك چۆن زۆرێك لەمبیٚ مایەكان دەگەنە پلە و پایەی باڵاَ و كەسانی بەرێزیش پلەیان دێتە خوارەوە، چونكە كاتێك دەوڵەتان دەگەنە كۆتا قۆناغی هێز و دەسەڵات خاندانی پاشا لەنێو هەموو خاندانەكاندا دەبێتە تاكە خاندانی دەسەڵاتدار و خاندانەكانی تر لەگەشتن بەوەها پلەیەك نائومێد دەبن و دەكەونە قۆناغ گەلێكی خوارتر لەقۆناغی پاشایەتی و بەژێر دەستەكان هەژمار دەكرێن هەروەك بڵێی بەندە و خزمەتكاری ئەون و هەركات بۆ ماوەیەكی دوور و درێژ دەوڵەت بەم بارودۆخە بەردەوام بێت و، پاشا دووچاری تەكەبور ببێت و لەم كاتەشدا ئەو كەسانەی كەلەبارەگاكەی ئەودا خزمەت دەكەن، لەڕووی خێرخوازیەوە خۆیان لەو نزیك دەكەنەوەو بەهۆی ئەو توانایەی كەهەیانە لەزۆرێك لەكاروبارە گرنگەكاندا خۆیان هەڵدەبژێرن، لەڕووی پلە و پایەوە لەلای سوڵتان لەیەك ئاستدان.

ئەمەیە كەدەبینین زۆرێك لەڕەعیەت لەڕووی نیشاندانی چالاكی و خێر خوازی هەموو جۆرە خزمەتگوزاریەكانەوە هەوڵی نزیك بوونەوە لەسوڵتان و دارو دەستەكەی دەدەن بۆ گەشتن بەئامانج و مەبەستیان تاوەكو پلەو پایەیان دەگاتە ئاستی پلە و پایەی كاربەدەستانی تری دەوڵەت و سوڵتان بەدارو دەستەی خۆیانی دەزانێت و بەهرەیەكی

گەورە لەبەختەوەری و نازو نیعمەت دەبەن و بەئەهلی دەوڵەت دەژمێردرێن. لەم کاتەدا پەروەردەکراوەکانی دەوڵەت کەلەخزم و نزیکان و نەوەکانی سوڵتانن ئەوانە بەکەسی نزیکی خۆیان دەزانن کەلەسەرەتای دامەزراندنی سەڵتەنەتەوە لەگەڵ سوڵتاندا بوون لەهەموو کێشە و مەترسیەکاندا شانازیان پێوە دەکەن و لەخۆیان بایی دەبن هەربۆیە ئامادە نین لەپێناو سوڵتاندا یانیان بەخت بکەن و شوێنەواری پێشینانیان بەگرنگ دەزانن و، لەدەزگای دەوڵەتدا بەسەربەخۆییەوە هەڵسوکەوت دەکەن و لەئەنجامدا سوڵتان ڕقی لێیان دەبێتەوە و دەریان دەکات و، ئەو پەروەردەکراوانەی کە تازە پێگەشتوون دایان دەنێت چونکە شانازی بەهیچ ڕابووردوویەکی خۆیانەوە ناکەن و بەسەربەخۆ کارناکەن و بەرزەفڕی ناکەن، بەڵکو داب و نەریتیان ژیری و وریاییە و لەپێناو ئامانج و مەبەستەکانی سوڵتاندا هەوڵ و کۆششی زۆر دەکەن.

ئەمەیە کەپلە و پایەی ئەوان فراوان دەبێت و دەگەنە پلە و پایەی بەرز و بەهۆی ئە و لێپرسراویەتیەی کەلەدەرباری سوڵتاندا هەیانە هەموو پیاوەگەورە و تایبەتەکان ڕوویان تێدەکەن. پەروەردە کراوانی کۆنی دەوڵەتیش کەپێشتر باسمانکردن شانازی بەپێشینانیانەوە دەکەن بەردەوام لەدەرباری سوڵتان و پلە و پایەوە دوورن و سوڵتان ڕقی لێیانە و خزمەتکارانی تازەی بەلاوە باشترە تاوەکو ئەوان و ئەم بارودۆخەش بەردەوام دەبێت تاوەکو ئەو کاتەی کە دەوڵەت لەناو دەچێت. بەدی هاتنی ئەم حاڵەتە لەدەوڵەتەکاندا سروشتیە و بەهۆی ئەوەوە بەزۆری چۆنیەتی هەڵبژاردنی خزمەتکارانی نوێ دێتە پێشەوە، خوداش هەرچیەك کەبیەوێت دەیکات[٧٠]

[٧٠] (فَعّالٌ لِما يُرِيد) س هود تا ١٠٩.

# بەشی حەوتەم

## لەبارەی ئەوەی کە بەرپرسانی کاروبارەئاینیەکان وەك ئەوانەی کە بەقازیەتی و فتوا دان و وانە ووتنەوە و پێشنوێژی کردن و خوتبەدان و بانگبێژی و نمونەی ئەمانەوە سەرقاڵن بەزۆری سەروەت و سامانێکی زۆر بەدەست ناهێنن

بەهۆی ئەوەی کەکەسب و بەدەستهاتوو سودو قازانج هەروەك پێشتر باسمانکرد بریتیە لەبەهای کارە مرۆییەکان، کارە ناوبراوەکان بەپێی پێویستی خەڵکی پێیان جیاوازن هەروەك چۆن ئەگەر لەڕیزی ئەو کارانەدا بن کەلەکۆمەڵگەدا پێویستن و زەرورەتی هەمووانن ئەوکات بەهاکەیان زیاتر و پێویستی خەڵکی پێیان توند تر دەبێت، بەڵام خاوەنی ئەم جۆرە کاڵا ئاینیانە لەو هونەرمەندانە نین کەخەڵکی بەگشتی پێویستی بەوان هەبێت، بەڵکو گروپێك لەکەسە تایبەتەکانی خەڵکی کەگرنگی بەئاینی خۆیان دەدەن پێویستیان پێیەتی وەئەگەر هەم کەسانێکیش پێویستیان بەشتە قەزاییەکان و فتوادان لەکێشەکاندا هەبێت بەشێوەیەکی ناچاری و گشتی نیە و بەزۆری پێویستیان پێیان نابێت، وەخاوەنانی دەوڵەت لەکاری ئەم گروپ و بەڕێوەبەرێتی ئەو کارانەی کەلەئەستۆیاندایە گرنگی دەدات، چونکە ئەو پێویستە لەسەری چاودێری بەرژەوەندیە گشتیەکان بکات، هەربۆیە بەهۆی ئەو پێویستیەی کەبەوان هەیەتی بۆ هەریەکەیان بەهرەیەك لەڕۆزی دیاری دەکات هەروەك باسمانکرد، خەرجیەکانیان لەگەڵ خەرجی لەشکریەکان و ئەو پیشەگەرانەی کەپێویستیەکانی خەڵکی فەراهەم دەکەن بەرابەر نیە هەرچەندە پیشەو سەرمایەی ئەوان لەڕووی ئاینی و مەراسیمە شەرعیەکانەوە شەریفترە،

بەڵکو ئەو بەپێی پێویستی گشتی و کۆمەڵگە خەرجیەکان دابەشدەکەن هەربۆیە بەشی ئەوان بەئەندازەیەکی کەم دەبێت. وەهەروەها گروپی ناوبراو بەهۆی ئەوەی کە خاوەنی سەرمایەیەکی شەریفترن لەلای خەڵکی بەڕێزن و، لەم ڕووەوە لەلای خوداش پلەو پایە ناخوازن تاوەکو بەهرەیەکی باشتر بەدەست بهێنن کەببێتە هۆی زۆری ڕۆزی ئەوان، بەڵکو بۆ ئەم جۆرە پەیوەندیانە کاتیان نیە. چونکە ئەمان سەرگەرمی کاڵاگەلێکی شەریفن کە بریتیە لەبەکارهێنانی ئەندێشە و جەستە سەرەڕای ئەمەش بەهۆی ئەو سەرمایە شەریفانەی کەهەیانە نایانەوێت خۆیان لەلای خەڵکی دونیا کەم بکەنەوە و، ئەوان لەم جۆرە کارانە بەگشتی بەرکەنارن و هەربۆیە بەزۆری سەروەت و سامانیان زۆر نابێت. من لەم بارەیەوە قسەم لەگەڵ هەندێك خەڵكی بەڕێزدا کردووە و ئینکاری قسەکانیان کردووم. بەڕێککەووت چەند وەرەقەیەکی کۆنی حیساباتی دیوانی مەئمونم بەدەست گەیشت کەزۆرێك لەداهاتوو خەرجیەکانی ئەو سەردەمەی تێدا بوو لەوانەش لەو وەرەقانەدا ئەندازەی ڕۆزی و خەرجیەکانی قازی و پێشنوێژەکانم خوێندەوە و، ئەو بەڕێزەم لەوە ئاگادار کردەوە و نیشانم داو دواتر باوەڕی بەقسەکانم کرد و وازی لەئینکاریەکانی هێنا و سەرمان لەنهێنی و حیکمەتی خودا لەناو ئافرێنراوەکانی و هۆکارەکانی سوڕما، خوداش ئافرێنەر و ئەندازە گیرە.

# بەشی هەشتەم

## لەبارەی ئەوەی کە کشتووکاڵ هۆکاری مەعاشی گوند نشینانی چەوساوە و دەشتەکیە سەلامەت خوازەکانە

چونکە کشتووکاڵ بەپێی ئەصڵی سروشت لەشتە ئاسایی و سادەکانە هەربۆیە بەزۆری هیچکام لەشارنشینان و ئەهلی جوانخوازی نایکەنە پیشەی خۆیان و، ئەوانەی کەسەرقاڵی کاری کشتووکاڵن هاوشانی زەلیلخۆرین. پێغەمبەر(ص) کاتێك گاسنێی لەهەندێك ماڵی ئەنصارە کاندا بینی، فەرمووی: ئەم شتە بچێتە ماڵی هەرنەتەوەیەکەوە ئەوا تووشی زەلیل خۆری دەبن و بوخاریش ئەم حەدیسەی وەك زۆر بەکارهێنانی ئەو شتە ئاراستە کردووە و مرۆڤ لەزیادەڕەوی لەکارو پیشە و کەسابەتدا و مرۆڤەکان ئاگادار دەکاتەوە. هۆکارەکەی خوداش داناترە ئەوەیە کە کاری کشتووکاڵ و جوتیاری بەباج و خەراجدان کۆتایی دێت و ئەم شتەش هۆکاری زۆرگۆیی و زاڵی زبر دەستانە بەسەر خەڵکیدا و، لەئەنجامدا کەسی باجدەر بەهۆی ئەوەی کە دەکەوێتە بەردەك دەستدرێژی و ڕق و زاڵیەوە پەست و بەدبەخت دەبێت. پێغەمبەر(ص) دەفەرمێت: قیامەت نایەت مەگەر ئەوکاتەی کەزەکات دەگۆڕدرێت بەماڵیات و خەراج. ئەمەش ئاماژەیە بەپاشایەتیەکی سەختگیر کەجەورو ستەم دەکاتە پیشەی خۆی لەگەڵ خەڵکیدا و مافەکانی خودا لەبارەی ماڵ و داراییەوە لەبیر خۆی دەباتەوە و هەموو مافەکان وەك باجو خەراجی پاشاو دەوڵەتەکان سەیردەکات و وەردەگرێت، خوداش هەرشتێك کەبیەوێت بەتوانایە.

# بەشی نۆیەم

## لەبارەی مانای بازرگانی و شێواز و بەشەکانیەوە

دەبێت ئەوە بزانین کە بازرگانی و هەوڵدان لەڕێگەی کەسابەت و سود و قازانجدا بەهۆی بەهرەدار کردنی ماڵ و دارابیەوەیە بەکڕینی کاڵاکان بەهەرزان و فرۆشتنەوەیان بەنرخێکی گرانتر لەو نرخەی کەکڕدراوە، ئیتر کاڵاکان هەرچیەك بن جیاوازی نیە، وەك ئارد یان بەرهەمە کشتوکاڵیەکان یان حەیوان یان چەك و چۆڵە یان قوماش. وەئەو ئەندازەیەی کە لەم ڕێگەیەوە زۆر دەبێت پێی دەڵێن سود و قازانج و هەوڵ و کۆشش لەم ڕێگەی بەدەستهێنانی ئەم سود و قازانجە دوو جۆرە:

١ – کۆگاکردنی کاڵا و چاوەڕێکردنی هەلەگونجاوەکانی بازاڕ بەوەی کە نرخەکان گران بن و ئەوکات سودی کاڵا زۆر دەبێت.

٢ – گواستنەوەی کاڵاکان بۆ شارێکی تر، کە ڕەواجی کاڵاکانی تێدا زیاترە لەو شارەی کەکاڵاکانی تێدا کڕیوە و لەم کاتەشدا سودێکی فراوان دەبات. هەربۆیە یەکێك لەبازرگانە شارەزاکان بەو کەسەی کە بەدوای حەقیقەتی بازرگانیدا دەگەڕێت دەڵێت: من دوو ووشە فێری تۆ دەکەم: بازرگانی بریتیە (لەکڕینی شتومەك لەکاتی هەرزانی و فرۆشتنەوەی لەکاتی گرانبونیدا) بەم شێوەیە بازرگانی دێتەدی، ئەمەش ئاماژەیە بەمانای ئەو قسەیەی کەئێمەباسمانکرد خودا ڕۆزی دەرو خاوەن هێزی مەتینە.[٧١]

---

[٧١] (إِنَّ اللَّهَ هُوَالرَّزَّاقُ ذُوالْقُوَّةِ الْمَتِينِ) س الذاريات ئا ٥٨.

# بەشی دەیەم

## لەبارەی هەناردەکردنی کالا بازرگانیەکانەوە

ئەو بازرگانەی کەلەمەسەلەی بازرگانیدا چاوکراوەیە تەنها یەك جۆر لەکالاّکان هەناردەی دەرەوە دەکات کەهەموو چینەکان لەبەتواناوە تاوەکو هەژار و سولّتان و کەسی بازاڕیش پێویستیان پێی هەبێت، چونکە ڕەواجی کالاّکان وابەستەن بەم مەسەلەیەوە، بەلاّم ئەگەر لەهەناردەکردنی کالاّدا تەنها نیازمەندیەکانی چینێکی تایبەت لەبەرچاو بگرێت ئەوکات ڕەواجی کالاّکانی دژواردەبێت، چونکە لەوانەیە بەهۆی پێشهاتێکەوە ئەو چینە نەتوانن کالاّی ناوبراو بکڕن، ئەوکات بازاڕی دەوەستێت و هیچ سود و قازانجێك ناکات. وەهەروەها هەرکاتێکیش کالاّی پێویستی هەموان هەنادرە دەکات دەبێت بەدلّنیابیەوە لەجۆرە مامناوەندەکەی بێت چونکە بەشەگرانەکەی هەرکالاّیەك تەنها خاوەن دارایی و کاربەدەستەبەتواناکانی دەولّەت دەتوانن بیانکڕن و، ئەمانەش کەمینەن و خەلّکی بەگشتی پێویستیان بەجۆری مامناوەندی کالاّیە. کەواتە دەبێت لەمبارەیوە ئەوپەڕی هەولّی خۆی بدات چونکە ڕەواج و بێ نرخی کالاّ پەیوەستە بەم شتانەوە. وەهەروەها هەناردەکردنی کالاّ لەشارێکەوە بۆ ناوچەیەکی دوور کەڕێگەکانی مەترسیدارن بۆ بازرگانان سودێکی زۆرتری دەبێت و کێشەکانی بازاڕ ناهێلّێت و، دلّنیایی دەداتە ڕەوتی کڕین و فرۆشتن لەبازاڕدا ناهێلّیت کەم وکورتی لەکالاّو شتومەکەکانی بازاڕدا هەبێت چونکە هەناردەکردنی کالاّکان لەشوێنە دوور و مەترسیدارەکانەوە هۆکارێکە بۆ کەمی کالاّی ئەو شوێنانە لەبازاڕدا و، کەمتر دەستی

خەڵکی دەکەون و بەهۆی کەمیەکەشیانەوە نرخەکەیان گران دەبێت. بەڵام ئەگەر شوێنی هەناردەکردنی کاڵا شارێکی نزیك بێت و مەترسی نەبێت لەسەر بازرگانان و کاڵاکانیان ئەوکات هەناردەکارانێکی زۆری دەبێت و، لەئەنجامدا کاڵاکان زۆرو فراوان دەبن و نرخەکەشیان هەرزان دەبێت و بەئاسانی دەستی خەڵکی دەکەون. هەربۆیە دەبینین ئەو بازرگانانەی کەحەز دەکەن بۆ بازرگانی بچنە ناوسودانەوە ڕەفاهیترین و بەتوانترینی خەڵکن چونکە دەبێت ڕێگەیەکی دوور و درێژ ببڕن و ناڕەحەتیەکی زۆر بچێژن و کاڵاو شتوومەکەکانیان بەڕێگە مەترسیدارەکاندا وەك مەترسی چەتەو ڕێگر و تینویەتی بیابانەکان، کەبێجگە لەهەندێك شوێنی تایبەت نەبێت ئاو لەو جێگایانەدا دەست ناکەوێتو ئەم شوێنانەش تەنها دەلیل و چاوساغەکانی ڕێگا دەیانزانن. هەربۆیە بێجگە گروپێکی کەم نەبێت لەخەڵکی کەس لەم مەترسی ئەم ڕێگا دوور و درێژانە بەدوور نابێت. ئەمەیە کەدەبینین کاڵاکانی سودان لەووڵاتی ئێمەدا گران و دەگمەنن و ئەو بازرگانانەشی کەئەوشتانە هەناردەی ئەو وولاتە دەکەن سەرمایە و سودێکی فراوان بەدەست دەهێنن و بەخێرایی دەوڵەمەند دەبن.

وەهەروەها ئەو گەشتیارانەی کەلەووڵاتی ئێمەوە دەچنە خۆرهەلات بەهۆی دووری ڕێگەکەو تەحەمول کردنی ناڕەحەتیەکانەوە قازانجێکی زۆر دەکەن، بەڵام ئەو بازرگانانەی کەلەنێوان شارو شارستانەکانی یەك وولاتدا هاتووچۆ و سەوداو مامەڵەدەکەن قازانجێکی کەم دەکەن چونکە هەم کاڵاکان فراوانن و هەم هەناردەکارانیش زۆرن، خوداش ڕۆزی دەرو خاوەنی هێزی مەتینە[٧٢].

---

[٧٢] (إِنَّ اللَّهَ هُوَالرَّزَّاقُ ذُوالقُوَّةِ المَتِين) س الذاريات ئا ٥٩.

# بەشی یازدەهەم

## لەبارەی ئیحتیکـــارەوە

لەو مەسەلانەی کەلەلای خاوەنانی تێڕوانین و ئەزموون لەشارەکاندا ناوبانگی دەرکردووە، بریتیە لەوەی کە خەڵکانێك لەکاتی هەرزانیدا بەروبوومی کشتووکاڵی دەشارنەوە و(احتکار) دەکەن بۆ ئەوەی لەکاتی گرانیدا بیانفرۆشنەوە و قازانجێکی زۆر بکەن، ئەمەش کارێکی ناشیرین و ناپەسەندە و سودەکەی دەبێتە هۆی لەناو چوون و فەوتان هۆکارەکەشی ئەوەیەکە خەڵکی بەهۆی پێویستیان بەخۆراکەوە ناچارن ماڵ و دارایی خۆیان لەڕێگەی کڕینی ئەو مادە خۆراکیانەدا خەرج بکەن، لەئەنجامدا نەفسەکان پەیوەست دەبن بەم مانایەوە ولەپەیوەست بوونی نەفسەکانیشدا بەماڵ و داراییەکانی خۆیانەوە نهێنیەکی گەورەی تێدایە و بەنەمانیشیان دەبێتە هۆی بەدبەختی کۆمەڵێك و کەبەخۆڕایی لەلایەن ئیحتیکار چیەکانەوە لێیان وەردەگیرێت، وەلەوانەیە ئەم نهێنیە هەمان ئەو شتەیە کەشاریع ناوی ناوە وەرگرتنی ماڵ و سامان بەخۆڕایی و بەتاڵ لەخەڵکی. ئەم جۆرە ماڵ و داراییانە ئەگەرچی خۆڕایی نین بەلآم نەفسەکان پێیانەوە پەیوەستن، چونکە بەهاکەی لەڕووی ناچاری و بەبێ ئەوەی کەتوانای هێنانەوە بیانوویەکیان هەبێت تەسلیمی دەکەن و هەربۆیە ئەم جۆرە کڕینە وەك مامەڵەی بەزۆر و ناچاری وایە. لەئیحتیکاردا بێجگە لەکالآ خۆراکیەکان کالآکانی تر زیانێکی ئەوتۆ بەخەڵکی ناگەیەنن چونکە لەکڕینی شتەکانی تردا ناچارنین و زۆر پێویستیان نیە و ئەگەریش نەیانبێت نابێتە کێشە بۆیان، هەربۆیە کەسێك کەبە ئیحتیکار دەناسرێت هێزی

ڕۆحی نەفسی خەڵکی بەئاراستەی ئەوە چونکە ماڵ و سامانەکانیان بەزۆر لێوەردەگرێت، خوداش داناترە. بەسەرهاتێکی شیرین کە گونجاوی ئەم بابەتەیە و لەمەشایخی مەغریبەوە بەم شێوەیەم بیستووە: شێخی ئێمە ئەبو عبدالله ئەبلی پێی گوتم لەسەردەمی سوڵتان ئەبو سەعید و لای قازی فاس فەقیە ئەبو الحسن دانیشتبووم کەپێشنیاری بۆ کرا ئایا بۆ ئەرك و کاروبارەکانی لەناو هەموو ماڵ و داراییەکاندا کامیان هەڵدەبژێرێت؟ قازی ئەبو الحسن بۆ ماوەیەك چووە ناو بیرکردنەوە و دواتر گوتی باجی شەراب ئامادە بووان پێکەنین و سەریان سوڕما و حیکمەتەکەیان لێپرسی؟ گوتی: لەکاتێکدا خەراجەکان بەگشتی حەرام بن من جۆرێکیان هەڵدەبژێرم کەدڵ و نەفسی ئەوانەی کە لێیان سەنراوە بەدوایەوە نەبێت، واتەدڵەو دوا نەبن بۆ ئەو باجەی کەبۆ شەرابەکانیان داویانە، شەرابیش لەو شتانەیە کەکەمتر دەگونجێت کەسێك هەموو ماڵ و سامانەکەی لەپێناویدا خەرج بکات، مەگەر کاتێك لەکاتی بەدەست هێنانیدا دڵخۆش و شادمان بێت ئەو کات لەکڕینیدا خەمی بۆ نەخوات و دڵی نادات بەپارەکەی، ئەمەش تێبینیەکی نامۆیە و خوداش داناترە بەنهێنی و شاراوەکانی ناو دڵەکان [٧٣].

---

[٧٣] (وَرَبُّكَ يَعلَمُ مَاتُكِنُّ صُدُورُهُم وَمَا يُعلِنُونَ) س القصص ئا ٦٩.

# بەشی دوازدەیەم

## لەبارەی ئەوەی کە دابەزینی نرخەکان بەهۆی هەرزان بوونی کاڵاکانەوە زیان بە پیشەوەران دەگەیەنێت

هەروەك چۆن باسمانکرد کەسب و مەعاشی. مرۆڤ بەهۆی پیشەسازیەکان یان بازرگانیەوە دێتە دی. وەبازرگانیش بریتیە لەکڕینی شتوومەك و کاڵا و هەڵگرتنیان بۆ کاتی جووڵەی بازار لەبواری کڕین و فرۆشتندا و فرۆشتنیان بەنرخێکی زیاتر و بەو زیادەیەش دەڵێن قازانج یان سود کەبەهۆیەوە هۆکارەکانی ژیان و گوزەرانی ئەو کەسانەی کەسەرقاڵی بازرگانی کردنن بەدەست دێت. هەربۆیە ئەگەر هەرزانی یەك کاڵا ئیتر خۆراکی بێت یان پۆشاك یان هەرجۆرە سەروەتێك بەشێوەیەکی گشتی بەردەوام بێت و جووڵەی بازاڕ بۆ بازرگان بەدی نەیەت ئەوا لەماوەی ئەم ئەو حاڵەتەدا سودو زۆری سەروەت و سامان لەدەست دەچێت و، بازاڕی ئەو جۆرە کاڵایانە دەوەستێت و کەساد دەبێت و بێجگە لەماندوبوون هیچی تر نابێتە بەشی بازرگانان و لەوانەشە واز لەکارو کەسابەتەکەیان بهێنن و سەرمایەکەشیان لەدەست بدەن.

بۆنمونە سەرەتا سەیری بارودۆخی غلات دەکەین ئەگەر بۆ ماوەیەکی دوور و درێژ نرخەکەیان بەردەوام بەهەرزانی بمێنێتەوە بەچ شێوەیەك جووتیاران لەهەموو کاروبارەکاندا دووچاری خراپ حاڵی دەبن، چونکە قازانج ناکەن و سود لەسەروەت و سامانەکەیان وەر ناگرن و لەسەرمایەکانیان خەرج دەکەن و تووشی تەنگی و گرفتی دارایی دەبنەوە و سەرئەنجام دەکەونە گێژاوی هەژاری و بێنەواییەوە و دەکەون. ئەم

بارو دۆخەش بەرۆکی پیشەوەرانی ئاشەوان و نانەواخانەکانیش دەگرێت و هەموو ئەو پیشانەی کەپەیوەستە بەکشتووکاڵەوە هەرلەسەرەتای چاندنەوە تاوەکو بەرهەمهێنان و دروێنەکردن و تاوەکو کۆتایی کەمادەکە دەبێتە خۆراك دەگرێتەوە.

هەروەها ئەگەر سوڵتان ڕۆزی سوپای لەڕێگەی کەرتەکشتووکاڵیەکانەوە دابین بکات ئەم حاڵە پەرێشانە ڕوودەکاتە ئەوانیش چونکە بەهۆی ئەم بارودۆخەوە ماڵیات و خەراجەکانیان کەم دەبێتەوەو، لەبەڕێوەبردنو بەخێو کردنی لەشکر کەسوڵتان لەداهاتەچێنراوەکان ژیانی دابین کردبوون نامێنێتو ناتوانن ژیانیان دەستەبەر بکەن و لەئەنجامدا ڕۆزیەکەیان دەبڕدرێت و توشی پەرێشان حاڵی دەبن. وەهەروەها ئەگەر هەرزانی هەنگوین یان شەکر بەردەوام بێت تەواوی ئەو کارانەی کەپەیوەستن پێیانەوە دەلەخشێن و ئەو پیشەوەرانەی کەسەرقاڵی بازرگانی کردنن بەم پیشەیەوە وازی لێدەهێنن.

دەتوانین پۆشاکەکانیش بەم شێوەیە پێوانە بکەین کەئەگەر هەرزانییان درێژە بکێشێت، ئەوا پیشەوەرەکانی ئەو بوارەش بێکار دەبن. کەواتە هەرزانی لەڕادەبەدەری کاڵاو بەروبوومەکان دەبێتە هۆی ئەوەی کە بازرگانەکانیان بەتەواوەتی دووچاری تەنگەتاوی ببنەوە و مەعاشی خۆیان لەدەست بدەن.

بەهەمان شێوەش گرانی لەڕادە بەدەریش زیانەکانی وەك زیانەکانی هەرزانی لەڕادەبەدەرە هەرچەندە زۆر بەکەمی ئیحتیکاری کاڵاکان دەبێتە هۆی زۆری و فراوانی پارە و پول و قازانج و سەرمایەکان. بەڵام مەعاش و کەسابەتی خەڵکی لەوەدایە کە سنوری مامناوەند و سازگار لەم مەسەلەیەدا هەبێت، بەخێرایی بازاڕ جووڵەی تێدەکەوێت، پەی بردن بەوەش پەیوەستە بەداب و نەریتگەلێکەوە کەلەنێو شارنشینان و خەڵکانی نیشتەجێی ئاوەدانیدا باوی هەیە تەنها هەرزانی غلات و دانەوێڵە لەنێو هەموو شتوومەك و کاڵاکاندا باشترینە و پەسەندە، چونکە پێویستی خەڵکین بەگشتی و هەموو چینەکانی خەڵك لەبەتوانا و هەژار و توفەیلیەکان کەزۆربەی کۆمەڵگە پێك دەهێنن،

ناچارن ئەرزاق و مادە خۆراکیەکانی خۆیان فەراهەم بکەن، هەربۆیە هەرزانیەکەی یارمەتیدان و هاو خەمی کردنی خەڵکیە بەگشتی وەلایەنی قوت و خۆراکی خەڵکی لەم جۆرە دا بە تایبەت باشترە لەلایەنی بازرگانی. خودا رۆزی دەرو خاوەنی هێزی مەتینە[٧٤].

[٧٤] (إِنَّ اللهَ هُوَالرَّزَّاقُ ذُوالقُوَّةِ المَتِين) س الزاريات ئا ٥٨.

# بەشی سیازدەیەم

## لەبارەی ئەوەی کە کام بەش لەخەڵکی بازرگانی دەکەنە پیشەو کام چینیان شیاوی ئەوەن واز لەو کارە بهێنن و نەیکەنە پیشەی خۆیان

لەبەشەکانی پێشوودا باسی ئەوەمان کرد کە بازرگانی بریتیە لەبەهرەمەند کردن و بەگەڕ خستنی ماڵ و دارایی بەجۆرێك کەشتوومەك و کالاْکان دەکڕن و هەوڵدەدەن کەبەنرخێکی گرانتر لەنرخی کڕینیان بیانفرۆشنەوە، یان لەڕێگە چاوەڕێ کردنی دروستبوونی جوڵەی بازاڕەوە قازانج بکەن یان بەهۆی هەناردە کردنیانەوە بۆ شارێك کەلەوێدا ڕەواجیان زیاترە و گرانترن سود وەربگرن، یان کالاْ و شتومەکەکان بەقەرز و بەنرخێکی گرانتر بفرۆشن. ئەم سودەش بەبەراورد بەو سەرمایەی کەبەکاری دەهێنن زۆر کەمە، بەلاْم شتێك کەهەیە ئەوەیە کاتێك ئەصڵی ماڵ زۆر بێت قازانجەکەیشی فراوان دەبێت، چونکە کەم لەناو زۆردا زۆرە. لەپاشان دەبێت هەوڵبدەین کە ئەم سود و قازانجەی کەبەهۆی کڕین و فرۆشتنی کالاْوە لەدەستی سەوداو مامەڵەکەراندا دەمێنێتەوە بەتەواوی نرخەکەی تەسلیم بکرێت و، بەلاْم لەنێو ئەم گروپەدا خاوەن ویژدانەکان زۆر کەمن هەربۆیە بمانەوێت و نەمانەوێت نادروستی کەم فرۆشی دەکەنە پیشەی خۆیان و دەگە لەشتوومەك و سەرمایەش دەدەن و لەتەسلیمکردنی نرخەکەیاندا دواخستن و چاوپۆشی دەکەن کە زەرەر بەقازانجەکە دەگەیەنێت، چونکە لەماوەی تەسلیم نەکردنی نرخی کالاْکاندا بازرگانەکان لەچالاکی بازرگانی دوا دەکەون چونکە سود وەرگرتن لەسەرمایە بەو دەستکەوتنی پارەی کالاْ فرۆشراوەکان دێتە دی. وەئەگەر مامەڵە خاوەن

سەنەد و گەواهینامەیەك نەبێت ئەوا فێڵبازان و قەرزکوێران بەتەواوەتی ئینکاری لەدانی پارەی کاڵاکان دەکەن کە دەبێتە هۆی لەناو چوونی سەرمایە دەسەڵاتی فەرمانڕەوایان لەم شتانەدا کەمە، چونکە بەگشتی حوکم بەڕواڵەتی شتەکان دەکرێت هەربۆیە بازرگان زۆرماندو دەبێت و دووچاری کێشە دەبێت بەزۆریش ئەم قازانجەکەمەش لەپاش ماندوبوونێکی زۆر دەستی دەکەوێت و یان ئەوەی کە بەهیچ شێوەیەك ناتوانێت واصڵی بکات و یان سەرمایەکەی لەدەست دەدات. هەربۆیە کەسێك کەبازرگانی کردووەتە پیشە پێویستە خاوەنی یەکێك لەم دومەرجەبێت: یان ئەوەی کە لەکاتی گیرو گرفت و کێشەکاندا گورج و گۆڵ و لەحیساباتیشدا چاو کراوەبێت و، بەسەرسەختیەوە لەلای دەسەڵاتداران بەرگری لەمافەکانی خۆی بکات، چونکە چاونەترسی و سەرسەختی لەم کاتانەدا باشترین هۆکارە بۆ ئەوەی فەرمانڕەوا و سەوداگەران ناچار بکرێن کومل بۆ عەدالەت گەچ بکەن.

وەگەرنا یان دەبێت خاوەنی پلەو پایە و مەنصەبێك بێت کەبتوانێت لەپەنایاندا مافەکانی بپارێزێت و هەیبەتی بکەوێتە دڵی سەوداو مامەڵە کارانەوەو، دەسەڵاتداران والێبکات کەویژدانیان هەبێت و بەدادگەریەوە حوکم بکەن و ئەو قەرزانەی کەلەلای خەڵکی هەیەتی وەریان بگرێتەوە. بەم شێوەیە بازرگان دەتوانێت ببێتە خاوەنی ئینصاف و دادگەری و سامانەکەی لەدەستی خەڵکی وەر بگرێتەوە سەرەتا بەویست و ئیرادەو دواتریش بەزۆر و تۆپزی. بەڵام کەسێك کەئەم دوو مەرجەی تێدا نەبێت واتە نەخۆی چاونەترس و سەرسەخت بێت و نەلەلای فەرمانڕەوایان خاوەن دەسەڵات بێت نابێت ببێتە بازرگان و تەنانەت پێویستە خۆشی لەو کارە بەدوور بگرێت، چونکە ئەم کەسە سەروەت و سامانەکەی دەخاتە بەر مەترسی تاڵانکردنەوە و، دەیکاتە پارویەکی ئاسان کەسەوداگەران بەئاسانی بتوانین هەڵیلوشن و کەمتر دەتوانێت حەقی خۆی لەوان وەربگرێتەوە، چونکە خەڵکی بەزۆری حەزدەکەن سامانی یەکتری داگیر بکەن و ئەگەر بهاتبایەو فەرمان و بڕیار و سزای فەرمانڕەوایان نەبوایە هیچ کەس هیچ سەروەت و

سامانێکی لەدەستدا نەدەما و کەس متمانەی بەسەروەت و سامانی خۆی نەدەما، بەتایبەت سەوداگەران و چینەکانی خوارەوە کەبەهیچ شێوەیەك پابەندی ئوصولێ نین، وەئەگەر خودا هەندێك لەخەڵکی بەکۆ هەندێکی تردا نەدەکرد زەوی توشی فەساد دەبوو بەڵام خودا خاوەن فەزڵە بەسەر مرۆڤەکانەوە.[٧٥]

[٧٥] (ولَولا دَفعُ اللهِ النَّاسَ بَعضَهُم بِبَعضٍ لَّفَسَدَتِ الأرضُ وَلَكِنَّ اللهَ ذُو فَضلٍ عَلَى العالَمِين). س بقرة ئا ٢٥٢.

# بەشی چواردەیەم

## لەبارەی ئەوەی کە خوی بازرگانەکان بەبەراوورد بەخوی ئەشرافەکان لە پلەیەکی پەستتردایە

چونکە بازرگانان زۆربەی کاتەکانیان سەرقاڵی کرین و فرۆشتنن و لەم کارەشیاندا بەناچاریەوە دەبێت سەختگیری بکەن و، لەچەسپاندنی لایەنی زۆری نرخەکاندا ئەو پەڕی موبالەغە و زیادەڕەوی بکات یان چەنەی زۆر بدات لەکاتی مامەڵە کردندا، وەکەسێکیش کەبەردەوام بەم شێوەیە بژی بمانەوێت و نەمانەوێت کاردەکاتەسەر ئەخلاقی ئەوو پابەند دەبێت پێیەوە، ئەمەلەکاتێکدا چەنەدان دوورە لەسیفەتی جوامێران و پاشا و ئەسرافەکانە کەپابەندن پێیەوە. بەڵام ئەگەر خووەکەی ئەو لەدەرئەنجامی ئەو ڕەفتارە خراپانەی کەبەدوای نەریتی چەن دانەوە لەنێو چینی پەستی ئەم گروپەدا بەربڵاوە لەناو بچێت، وەك لەجوجی و شەڕەنگێزی و تەزویر و خەڵەتاندن و سوێنی درۆ خواردن لەسەر نرخەکان لەسەودا و مامەڵەکاندا، شایەنی ئەوەیە کەوەها خوویەك لەو پەڕی پلەی پەستیدا دابینێین هەروەك چۆن ئەم جۆرەکەسانە بەم سیفەتانەوە بەناوبانگن. هەربۆیە دەبینین گەورەو سەرکردەکانی نەتەوە و هۆزیان لەئەستۆدایە لەم پیشەیە دوور دەکەونەوە تاوەکو نەوەك بکەونە ژێر کاریگەری ئەم خووە ناپەسەندەوە.

هەندێك جاریش لەوانەیە بازرگان گەلێك هەبن کەخۆیان لەم خووە بەدوور بگرن و بەهۆی شەرافەتی زاتی گەورەییانەوە لەو سیفەتانە دوور دەکەونەوە. بەڵام ئەم جۆرە کەسانە بەدەگمەن لەناو خەڵکیدا دەبینرێن، خوداش هەرکەس کەبیەوێت بەفەزڵ و کەرەمی خۆی ڕێنمایی دەکات و هەرئەوە پەروەردگاری پێشینان و پاشینان.

# بەشی پانزەیەم

## لەبارەی ئەوەی کە خوی بازرگانی بەبەراورد بەخوی سەرۆکەکان لەقۆناغێکدا پەست و دوورە لەجوامێرییەوە

لەبەشی پێشوودا باسی ئەوەمانکرد کە بازرگان سەرقاڵی کڕین و فرۆشتن و قازانجە و لەم کارەشدا بەردەوام کارو مومارەسەدەکات و، ناچارە بۆ پێشخستنی پیشەکەی خۆی دەست بکات بەچەنە لێدان و لەجوجی و سەرسەختی و لاف و گەزاف لێدان و هەراو هۆریا و، ئەمانە لەپێویستیەکانی پیشەی بازرگانی دادەنرێن ئەم جۆرە سیفەتانەش لەپاکداوێنی جوامێری مرۆڤ کەم دەکەنەوە، چونکە شوێنەواری ڕەفتاری مرۆڤ بمانەوێت و نەمانەوێت زیان بەنەفس دەگەیەنن هەروەك چۆن ڕەفتارە باشەکان سود بەنەفس دەگەیەنێت و ڕەفتارە خراپ و پەستەکان شوێنەواری خراپ و پەست بەجێدەهێڵن. وەئەگەر ئەم جۆرە سیفەتانە پێش نەفس بکەون و دووبارە ببنەوە تێیدا جێگیر دەبێت و ڕەگ و ڕیشە دادەکوتێت و، ئەگەر ماوەیەکی زۆری پێ بچێت سیفەتی باش لەنەفسدا جێگیر نەبێت ئەم سیفەتەکەم و کورت دەبێت و سیفەتە خراپەکان لەدەروندا وەك مەلەکەیان لێدێت. ئەم شوێنەوارەش بەپێی جیاوازی چینەکانی بازرگانانە لەهەڵسووکەوت و حاڵەتەکانیاندایە، چونکە گروپێك لەوان کەخاوەنی سیفەتی پەستی بازرگانی بن لەگەڵ سەودا گەرانی خراپەکاردا کە تەزویر و کاری ناپەسەند دەکەن و، لەنرخی کاڵاکاندا سوێندی درۆ دەخۆن شەریك و هاوکار بن زیاد لەپێویست ئەم سیفەتە وەردەگرن و مایەپوچی ڕوویان تێدەکات و، بەگشتی لەفەزیلەت و جوامێری دوور دەکەونەوە. وەگەرنا بەناچارییەوە دەبێت چەنە لێدان و دەمەقاڵێ کاریکاتە سەر

جوامێریان و نەبوونی تێیاندا زۆر کەمە. بەڵام گروپی دووەمی بازرگانان کەلەبەشی دەیەمدا باسمانکردن لەپەنای پلە و پایەدا مافەکانی خۆیان بپارێزن و ئەم پلە و پایە و هێزەش ئەوان لەوەبێ نیاز دەکات کەبەتەنها خۆیان ئەم کاروبارە بازرگانیانە بگرنە ئەستۆ، کەزۆر کەمن و بەپەنجەی دەست دەژمێردرێن. ئەم گروپەش کەسانێك جاری واهەیە بەشێوەیەکی سەر سوڕ هێنەر سامانیان زیاد دەکات و یان کتوپڕ لەڕێگەی میراتەوە سامانەکەیان زۆر دەبێت بەهۆی مردنی کەسێکی ساماندار لەناو خێزانەکەیاندا کە لەگەورەترین کەسانی ساماندار و بەتوانان، لەبواری ئابوریدا و بەهۆی ئەم سامانەوە پەیوەندیان لەگەڵ لێپرسراوانی دەوڵەتدا بەهێز دەبێت و لەناو خەڵکی سەردەمی خۆیاندا دەناسرێنەوە و دەبنە خاوەن پلە و پایە و، کاروبارەکانی بازرگانی دەدەنە دەستی نوێنەرەکانیان و ئەوکات لەبەر ئەوەی کە فەرمانڕەوایانی دەوڵەت دیاریەکی زۆریان لەلایەن نوێنەرەکانی ئەمانەوە پێبەخشراوە کاروبارەکانیان لەناو دام و دەزگاکانی دەوڵەتدا بەئاسانی ڕایی دەکرێن و جێبەجێ دەبن و، مافەکانیان بۆ دەستەبەر دەکەن و بەگریشیان لێدەکەن لەبەرامبەر هەرداگیر کاریەکەوە.

هەربۆیە گروپی ناوبراو بەهۆی ئەوەی کە ئەوکارانەیان ئەنجام نەداوە کە دەبنە هۆی سیفەتەپەستەکان، هەروەك پێشتر باسکرا، لەخووە زشت و ناپەسەندە بازرگانیەکان دوور دەکەونەوە و دڵێریان پتەو تر دەبێت و لەهەر دەستدرێژیەك کەلەم ڕێگایەدا دێتە ڕێگەیان پارێزراو دەبن، بەڵام لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا لەوانەیە بەشێوەیەکی نهێنی نمونە گەلێك لەشوێنەواری ئەم جۆرە سیفەتانە بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ لەواندا دروست ببێت، چونکە ناچارن چاودێری نوێنەرەکانیان بکەن لەکاروبارەکاندا لەئەنجامدان و ئەنجام نەداندا دەبێت هەڵوێستیان هەبێت ئیتر ڕازی بن یان ناڕازی. بەڵام ئەم نمونانە زۆر کەمن و شوێنەواریان کەمتر دەردەکەون، خوداش ئێوە و ئەوەی کەئەنجامی دەدەن دروستی کردووە[٧٦].

---

[٧٦] (وَاللهُ خَلَقَكُم وَما تَعلَمُون) س الصافات ئا ٩٤.

# بەشی شازدەهەم

## لەبارەی ئەوەی کە پیشەکان دەبێت فێرکارێکیان هەبێت

پیشە بریتیە لەمەلەکەیەك کەلەشتێکی کرداری فیکریدا بەدی دێت و لەبەر ئەوەی کەکرداریە لەڕیزی کارە جەستەییە هەستپێکراوەکان دەژمێردرێت. وەفێربوونی چۆنیەتیە هەستپێکراوەکان بۆ فێرخواز جامیعتر و کاملتر بەدی دێت، چونکە ئەنجامدانی کۆمەڵێك کار کەپەیوەستن بەچۆنیەتیە جەستەییە هەستپێکراوەکانەوە بەهرە دارترن. مەلەکەش بریتیە لەسیفەتێکی ڕاسیخ و ڕۆچوو کەبەهۆی ئەنجامدانی کارێکەوە و بەردەوام دووبارەکردنەوەی دێتەدی، هەروەك چۆن شێوەکەی لەنەفسدا ڕۆدەچێت، و مەلەکە لەسەر ڕێژەی ئەصڵ دێتەدی. یان فێرکردنی شتێك لەڕێگەی بینینەوە بەچاو جامیعتر و کاملترە لەفێربوونی ئەو شتە لەڕێگەی گواستنەوە و زانستەوەیە، هەربۆیە مەلەکەیەك کەبەشێوەی سەرەتا بەدەست دێت کاملتر و ڕاسیختره لەمەلەکەیەك کەلەڕێگەی هەواڵەوە دێتەدی[٧٧] وەلێزانی فێرخواز لەهونەر و هاتنەدی مەلەکەکەی بۆ ئەو پەیوەندی بەئەندازەیەکی باشی فێربوون و مەلەکەی فێرخوازەوە هەیە. لەپاشان دەبێت ئەوە بزانین کەپیشەکان دوو جۆرن: بەسیت (ئاسایی) وپێکهاتوو(مرکب) بەسیت تایبەتی شتە زەروریەکانەو، مورەکەبیش پەیوەستە بەشتە جوانەاری و کەمالیاتەکان و، قۆناغی

٧٧ بۆچوونی دانەر لێرەدا بەتەواوی گونجاوە لەگەڵ بۆچوونی بۆچوون و تیۆری زانانیانی نوێی پەروەردەو فێرکردندا کەشێوازی هەستپێکراو کرداریان پێ باشترە لەشێوەی نەزەری.

کەماڵی ژیانەوە بەسیت لەڕووی فێرکردنەوە لەمورەکەب لەپێشترە، چونکە لەلایەک سادەیە و لەلایەکی تریشەوە تایبەتە بەزەرووریاتەکانی ژیانەوەکەخەڵکی گرنگیەکی زۆرتر دەدەن بەفێربوونیان هەربۆیە لەڕووی فێرکردنەوە لەقۆناغی یەکەمدایە، هەربۆیە هەم فێرکردنەکەی ناتەواوە و بەردەوام ئەندێشەی مرۆڤ هەموو جۆرە جیاوازەکان و بەشە مورەکەبەکانی دەردەهێنێت ئاشکرا دەکات و کەم کەم و پلەبەپلە لەقۆناغی باالقوە دەگەیەنێتە کردار و تاوەکو سەرئەنجام کامڵ دەبن ، بەدیهێنانی پیشە جۆراو جۆرەکانی بەسیت و مورەکەب هیچکات بەیەکجار نایەنە دی، بەڵکو بەدرێژایی سەردەمە دوور و درێژ و نەوەیەك لەدوای یەکەکانەوە بەدی دێت، چونکە گەشتنی شتەکان و بەتایبەت کاروبارە هونەریەکان لەقۆناغە بالقوە بۆ کردار بەیەکجار بەدی نایەت و بەناچاریەوە ماوەیەکی دەوێت.

هەربۆیە دەبینین کە پیشەسازیەکان لەشارە بچووکەکاندا ناتەواون و بێجگە لەهەندێك جۆری ئاساییان نەبێت لەم جۆرە شارانەدا بەدی ناکرێن، بەڵام کاتێك شارستانیەتیان فراوان ببێت و فراوان ببونی سەروەت و سامان و شتە جوانکاریەکان وایان لێبکات پێویستیان بەپیشە جۆراو جۆرەکان هەبێت، ئەوکات پیشەو صەنعەتەکان لەقۆناغی باالقوە دەگەنە کردار، خوداش داناترە. وەهەروەها پیشەسازیەکان لەتێڕوانینێکی ترەوە دەبن بەدوو بەشەوە: پیشەسازی گەلێکی تایبەت کەپەیوەستن بەکاروبارەکانی مەعاش ئیتر زەروری بن یان زەروری نەبن. وەپیشەسازی گەلێکی تایبەت بەوئەندێشانەی کەتایبەتمەندی مرۆڤەکانە وەك زانستەکان و هونەر و سیاسەت. پیشەسازیەکانی جۆری یەکەم وەك چنین و پێڵاو دوری ئاسنگەری و قیرتاسیە و کتێب نوسی (وراقە) کەپیشەی کۆپی کردن و بەرگ و تەجلید کردنی کتێب و مۆسیقا و شیعر و فێر بوونی زانستەکان و نمونەی ئەمانە و پیشەسازیەکانی جۆری سێیەم وەك لەشکروانی و هاوشێوەکانی، خوداش داناترە.

# بەشی حەڤدەیەم

## لەبارەی ئەوەی کە پیشەسازیەکان بەهۆی کاملبوون و فراوانبوونی کۆمەلگەی شارنشینیەوە کامڵ دەبن

چونکە تائەوکاتەی کە کۆمەڵگەی شارستانی و شارستانیەت نەگاتەقۆناغی کامڵبوون خەڵکی تەنها هەوڵی بەدەستهێنانی شتە زەروریەکان دەدەن، وەك مادەخۆراکیەکانی نمونەی گەنم و هاوشێوەکانی، بەلاّم هەرکاتێك شار بگاتە قۆناغی شارستانیەت و بەهرەی کارەکانی خەڵکی زۆر ببێت و، بۆ پێویستیەکانیان بەس بێت و بەڵکو هەندێك جاریش زیادەش بێت ئەوکات ئەو زیادەیە لەبوارە جوانکاریەکانی مەعاشدا سەرف دەکەن. لەپاشان دەبێت ئەوە بزانین کە پیشەسازی و زانستەکان تەنها لەڕوانگەی ئەندێشەی ئادەمیزادە وە تایبەت دەبێت بەوەوە و لەگیانەوەرانی تر جیا دەبێتەوە، بەلاّم مادەی خۆراکی لەڕوانگەی حەیوانی خۆراکیەکەیەوە پێویستە بۆ ئەو هەربۆیە مادەخۆراکیەکان لەڕووی پێویستی و زەرورەتەوە لەزانست و پیشەسازیەکانی تر لەپێشترن، جۆری دووەم بەبەراورد بەزەروریاتەکان لەپلەی دووەمدایە. باشی پیشەسازی بەپێی کۆمەڵگەو گەشەی شارێك پێشدەکەوێت، چونکە لەم قۆناغەدا گوێ دەدەنە جوانیەکەیان و هەوڵدەدەن پیشەسازی جوانتر و باشتر بەرهەم بهێنن بۆ ئەوەی جێگەی پەسەندی خەڵکی بن کەگەشتوونەتە قۆناغی تواناو جوانپەرستی. بەلاّم لەکۆمەڵگەی دەشتەکی یان کۆمەڵگە بچووك و شارە کەم دانیشتوانەکان تەنها پێویستیان بەپیشەسازی بەسیت

هەیە، بەتایبەت ئەوانەی کەلەزەروریاتەکانی ژیاندا بەکار دەهێنرێن وەك ئاسنگەر و خەیات و چنەر و قەساب. وەکاتێکیش ئەم پیشەسازیە ناوبراوانەش لە کۆمەڵگەکاندا دەبینرێن بەهیچ شێوەیەك تەواوو باش نین، بەڵکو لەئاستی زەرورەت تێپەڕناکەن، چونکە هەموویان هۆکارگەلێکن بۆ کۆمەڵێك شتی تر و زاتەن و سەربەخۆ جێگەی تێڕوانین نین. وەکاتێك کۆمەڵگە زۆر ببێت و شارستانیەتەکەی زیاد بکات و هونەرەکانی جوانکاری تێیدا زۆر بن ئەوکات جوانکاری باشترکردنی هونەرەکانیش دەبنە بەشێك لەخواستەکانی وەها کۆمەڵگەیەك، وەپیشەسازیەکان بەهەموو هۆکارە تەواو کەرەکانیانەوە بەرەو کەماڵ دەچن و، ئەو پیشەسازیانەشی کەپێویستی داب و نەریتی جوانکاریەکانن لەگەڵ ئەواندا بەدی دێن و وەك پێڵاو دور و پێستەخۆشکەر (دباغ) و ئاوریشم دوور و زەڕەنگەر و نمونەی ئەمانە، وەهەندێك جاریش کەکۆمەڵگە زیاد لەئەندازە فراوان دەبێت جۆرەکانی پیشەسازی ناوبراو دەگەنەئاستێك کەلەنێوانیاندا زۆرێك لەهونەرەکان و کەمالیاتەکان بەدی دێن و، لەو پەڕی جوانی و ڕازاوەییدا دروستیان دەکەن و دەبنە هۆکاری مەعاشی کەسانێك کەلەو شارەدا ئەو پیشانەیان هەیەو، لەڕووی سود و بەهرەبەرداریەوە بەگرنگترینی کارەکان دەژمێردرێن چونکە پێشکەوتنی سەروەت و جوانخوازی ئەوپیشانەدەکاتە شتانێکی زەروری دانیشتوانی ئەو ناوچەیە وەك: عەتر سازی و ناتری و چێشتلێنەری و دروستکەری شیلە و دۆشاوی ترێ (شەمع سان) و دروستکەری هەریسە(کەجۆرێکی خواردنە) و، مامۆستایی کە گۆرانی و تەپڵ لێدان و سەماکردن فێری خەڵکی دەکات و ئەو وەرەقە چیانەی کە لەپیشەسازی کۆپی کردن و تەجلیدی کتێبدا شارەزاییان هەیە، چونکە ئەم پیشەیە لەپێویستیەکانی فراوان بوون و ڕەفاه و جوانخوازیە لەشاردا کەسەرقاڵی کاروبارە فیکریەکان دەبن و پیشەگەلێکی تری هاوشێوەی ئەمانە.

وەهەندێکجاریش کەگەشە و پێشکەوتنی کۆمەڵگە لەسنور دەردەچێت دەبینین پیشەسازیش بەهەمان ئەندازە پێشدەکەوێت، هەروەك چۆن لەبارەی خەڵکی میسرەوە

دەبیستین کەلەنێویاندا کەسانێك هەن کە باڵندە بێزمان و گوێدرێژەماڵیەکان فێر دەکەن‌و شتانێکی سەرسوڕ هێنەر وێنا دەکەن و، بەجۆرێك زاتێك دەگۆڕن بەزاتێکی تر و گۆرانی و سەماو ڕۆشتن بەسەر پەتەکاندا لەبەرزاییەکانەوە فێری خەڵکی دەکەن‌و بارەقورسەکانی وەك حەیوانات و بەردە قورسەکان بەرز دەکەنەوە، و پیشەسازی گەلێکی تر کەلەلای ئێمەی خەڵکی مەغریب بوونیان نیە دەیانزانن، چونکە ئاوەدانی و شارستانیەتی شارەکانی مەغریب نەگەشتووەتە ئاستی شارستانیەتی میسر و قاهیرە، وەخوداش دانای حەکیمە[٧٨].

---

[٧٨] (وَاللهُ عَلِيمٌ حَكِيم) س النساء ئا ٣١.

# بەشی هەژدەیەم

## لەبارەی ئەوەی کە جێگیر بوونی پیشەسازیەکان لەشارەکاندا وابەستەیە بەڕۆچوون و جێگیر بوونی شارستانیەت و درێژی ماوەکەیەوە

هۆکارەکەشی دیارو ئاشکراو ڕوونە، چونکە هەموو پیشەسازیەکان لەنەریت و جۆرەکانی ئاوەدانی و شارستانیەت دەژمێردرێن، نەریتەکانیش بەهۆی دووبارە بوونەوەو تێپەڕبوونی کاتەوە جێگیر دەبن و ڕەگ و ڕیشە دادەکوتن و، دواتریش صیبغە و نەریتەکەی بەهێز دەبێت و ڕەگ و ڕیشەی لەنەوەکانی دواتردا ڕۆدەچێت و هەرکاتێکیش نەریتێك پایەدار بێت نەهێشتن و لەناو بردنی دژواردەبێت. هەربۆیە دەبینین کەشارە کۆنەکان کەشارستانیەتیان تێدا فراوان بووە و ئەگەر بێت و شارستانیەت و دانیشتوانەکەیان کەم بکات و دووچاری دواکەوتن ببنەوە، دیسانەوە شوێنەواری پیشەسازی سەردەمی ئاوەدانی تێیاندا هەردەمێنێتەوە، بەجۆرێك کەپیشە ناوبراوەکان لەشارە تازە دروستکراوەکاندا کەلەقۆناغی شارستانیەت و ئاوەدانیدان نابینین هەرچەندە ئەم جۆرە شارانە لەڕووی شارستانیەت و دانیشتوانەوە گەشتبنە ئاستی شارەکۆنەکانیش، تەنها هۆکاری ئەوەش ئەمەیە کە لەشارە کۆنەکاندال بەهۆی تێپەڕبوونی کاتەوە و دەستاو دەستکردن و دووبارە بوونەوەی داب و نەریتەکانی ژیانەوە پایەدار بووە و ڕەگ و ڕیشەی داکوتاوە، ئەمە لەکاتێکدا شارە تازە بنیاتنراوەکان هێشتا نەگەشتوونەتە ئەم پلەی کامڵبوونە. ئەم چۆنیەتیەش لەم سەردەمەدا لەسەر ئەندەلوس جێبەجێ دەکرێت، چونکە دەبینین لەو وولاتەدا چۆنیەتی شێوەکانی پیشەسازی

لەهەموو ئەو داب و نەریتانەی کەلەشارەکاندا کاریان پێدەکرێت بەردەوام بونیان هەیە، وەك وەستایی خانوو هونەرەکانی چێشت لێنان و جۆرەکانی گۆرانی و سرود چرپەکان و هۆکارەکانی سەرگەرمی وەك ئامێرە موسیقیەکان و سەما و هونەری فەرش و شتوومەکی کۆشکەکان و بەکارهێنانی هەستی سەلیقە لەتەرتیب و دانانی بیناو باڵەخانەکان و، دروستکردنی دەفر و هەموو پێداویستیەکانی چێشتخانە و ئەساسەکانی ژیان و، مادە کانزاییەکان و سفالین و، شێوازەکانی بەرپاکردنی میوانداری و جەژنە جۆراو جۆرەکان و هونەرەکانی تر، کەپێویستی ژیانێکی پڕلەجوانی و خۆشگوزەرانی و پێشکەوتنە. هەربۆیە دەبینین کەخەڵکی ئەندەلوس لەم پیشەسازیانەدا لێزانتر و شارەزاترن پیشەسازیەکانی ڕابوردوویان بەردەوام لەو وولاتەدا ماونەتەوە، هەروەك چۆن ئێستاکەش بەهرەیەکی فراوانیان لەهونەر دا هەیە و لەم بارەیەوە بەبەراورد بەخەڵکی وولاتانی تر زۆر جیاوازترن، هەرچەندە ئاوەدانی شارستانیەتی ئەو وولاتە کەمی کردووە و بەشێکی زۆری شارستانیەتەکەی لەگەڵ مەملەکەتەکانی کەناری مەغریب (موریتانیا) بەرابەر نیە.
ئەم بارو دۆخەش هیچ هۆکارێکی نیە بێجگە ئەوەی کەئێمە باسمانکرد، چونکە بەهۆی پایەداری دەوڵەتی ئەمەوی و دەوڵەتەکەی پێش ئەو واتە (گتەکان) و دەوڵەتەکانی دوای ئەو لەملوك التوایفەوە بیگرە تاوەکو ئەم سەردەمە، شارستانیەت لەو سەرزەویەدا ڕەگی داکوتاوە بەهێز و پایەدار بووە هەربۆیە شارستانیەت لەئەندەلوسدا گەشتووەتە قۆناغێك کەهیچ سەرزەویەکی تری بێجگە لەعێراق و شام و میسر پێی نەگەشتوون، چونکە ئەو هەواڵانەی کەلەبارەی وولاتانی ناوبراوەوە دەیانگێڕنەوە نیشاندەری ئەوەیە کەبەهۆی بەردەوامی دەوڵەتەکان لەو مەملەکەتانەدا پیشەسازیەکانیشیان بەهێز و پێشکەوتوو بوون، هەمووجۆرەکانیان لەڕووی جوانیەوە کامڵن و شێوە و شێوازی ئەوان تاوەکو ئێستەش لەکۆمەڵگەی ئەم سەردەمەشدا ماوەتەوە و لەو سەرزەویانە دوور ناکەوێتەوە، مەگەر ئەوەی کەبەگشتی ئاوەدانیان نەمێنێت، هەروەك ڕەنگێکی نەگۆڕی پارچە قوماشێك کەتاوەکو قوماشەکە بمێنێتەوە ڕەنگەکەشی هەردەمێنێت. بارودۆخی تونسیش بەبەراورد بەو شارستانیەتەی کە لەسایەی فەرمانڕەوایی دەوڵەتەکانی

صەنهاجە و داتریش کەمووەحیدان بەدەستیان هێناوە و بەهۆی کاملی پیشەسازیەکانیانەوە لەهەمووبوارەکاندا هاوشێوەی ئەندەلوسە، هەرچەندە وولاتی ناوبراو لەم بوارەدا بەبەراورد بەئەندەلوس لەپلەی دووەمدایە، بەلآم بەهۆی ئەو داب و نەریتەی کەخەلکی تونس لەمیسریەکانەوە وەری دەگرن پیشەسازیەکانیان تائێستەش لەپیشەسازی ئەو وولآتە زیاترن، چونکە ماوەی نێوان هەردوو وولآتی تونس و میسر نزیکە و گەشتیاران هەمووسالێك لەو وولآتەوە گەشت دەکەن بەرەو میسر و سالآنێکی زۆر لەوێدا دەمێننەوە و، ئەو داب و نەریت و پیشەسازیەی کەلەوێدا هەیە و حەزیان لێیەتی بەباشی وەری دەگرن و فێری دەبن.

هەربۆیە بارودۆخی تونس بەهۆی ئەوەی کەباسمانکرد، لەڕوانگەی پیشەسازیەوە لەلایەکەوە لەمیسر دەچێت و لەلایەکی تریشەوە وەك ئەندەلوس وایە، چونکە زۆربەی دانیشتوانەکەی لەخەلکی خۆرهەلآتی ئەندەلوسن کەلەکاتی ئاوارە بوونیاندا لەسەدەی حەوتەمدا پەنایان بردووەتە بەر تونس، بەهۆی ئەو بنەماو چۆنیەتیانەی کەلەبواری پیشەسازیدا لەم وولآتەدا ڕەگی داکوتاوە و هەبووە ئەمانیش وەریانگرتووە، هەرچەندە لەم سەردەمەدا بارودۆخی ئاوەدانی تونس گونجاونیە لەگەل پێشکەوتنەناوبراوەکاندا، بەلآم کاتێك کە صیبغەو نەریتی هونەر لەوولآتێکدا جێگیر ببێت کەمتر دەکرێت تێیدا نەمێنێت، مەگەر ئەوەی کە بەتەواوی وێران بوبێت. وەهەروەها دەبینین کەلەقەیرەوان و مەراکیش و قەلعەی ئیبن حەماددا شوێنەوارێك لەم پیشەسازیانە ماونەتەوە هەرچەندە هەموو شارەناوبراوەکان ئەمڕۆکە یان وێرانن یان بەرەو وێرانی دەچن و، بێجگە لەخەلکانی بەصیر و بینا کەسی تر ناتوانێت ئەم شوێنەوارانە ببینێت و لەپیشەسازیە ناوبراوەکان شوێنەوارێك لەو شارانەدا دەبینێت، کەچۆنیەتی و بارودۆخی ڕابوردووی ئەوان نیشاندەدات وەك ئەو خەتەی کەلەپاش سڕینەوەی لەکتێبدا هێشتا شوێنەواری هەردەمێنێت، خوداش ئافەرینەری دانایە.[٧٩]

---

[٧٩] (وَهُوَالخَلاقُ العَلیم) س یس ئا ٨١.

# بەشی نۆزدەیەم

## لەبارەی ئەوەی کە پیشەسازیەکان کاتێك باشتر دەبن و گەشەدەکەن و فراوان دەبن کەخوازیارانیان زۆربن

هۆکارەکەشی ئەوەیە کە مرۆڤ ڕێگە نادات کەکارەکەی بەخۆڕایی ئەنجام بدرێت، چونکە کاری هەرکەسێك هۆکاری بەهرەبەرداری ئەوە کەمەعاشی خۆی لێوە مسۆگەر دەکات و لەهەموو ژیانی خۆیدا سود لەهیچ شتێك وەرناگرێت بێجگە کارەکەی. هەربۆیە کارەکەی خۆی تەنها لەڕێگەی کارێکدا سەرف دەکات کەبەرهەمەکەی لەوشارەی کەتێیدا دادەنیشێت نرخ و بەهایەکی هەبێت بۆ ئەوەی کەڵك لەسود و قازانجەکەی وەر بگرێت. وەهەرکات پیشەیەك خواستی لەسەر بێت و بەهۆی خواستی خەڵکەوە ڕەواج پەیدا بکات لەم کاتەدا پیشەی ناوبراو وەك کاڵایەك وایە کەبازاڕی هەیەو دەهێنرێت بۆ فرۆشتن. لەم هەلومەرجەشدا خەڵکی شار هەوڵی ئەوە دەدەن کەئەو پیشەیە فێرببن بۆ ئەوەی بەهۆیەوە مەعاش و ژیانی خۆیانی پێ دابین بکەن. بەڵام ئەگەر پیشەیەك خواستی لەسەر نەبێت ئەوکات بازاڕی ڕەواجی نابێت و کەسیش حەزناکات و هەوڵیش نادات کەفێری ببێت و هەربۆیە ئەو پیشەیە نامێنێت و لەناو دەچێت، لەئیمامی علی ڕەزای خودای لێبێت دەگێڕنەوە کەفەرموویەتی: (بەهای هەرکەسێك ئەو کارەیە کەبەباشی ئەنجامی دەدات). بەومانایەی کەپیشەسازی هەرکەسێك بەهای کەسەکە دەگەیەنێت و واتە بەهای هەرکەسێك لەو کارەیدایە کەکردوویەتیە هۆکاری مەعاشی خۆی. وەهەروەها لێرەشدا ڕازێکی شاراوەی تر هەیە کەبریتیە لە وەی کە پێشکەوتن و باشتر بوونی

پیشەسازی کاتێك دەستەبەر دەبێت کەدەوڵەت خواستی لەسەری هەبێت و بیەوێت چونکە هەردەوڵەتە دەتوانێت لەبازاڕدا ڕەواجی پێبدات، کاتێك دەوڵەت خوازیاری پیشەسازیەك نەبێت هیچکات ڕەواجەکەی لەگەڵ ئەو کاتەدا یەکسان نیە کە دەوڵەت خواستی لەسەر پیشە و صەنعەتێك هەیە، چونکە دەوڵەت بەگەورەترین بازاڕ دەژمێردرێت و ڕەواجی هەرشتێك لەو دەزگایەدایە کەم و زۆر تێیدا خاوەنی ڕێژەیەکە هەربۆیە هەرشتێك تێیدا ڕەواج پەیدا بکات بەناچاریەوە دەبێت گەورەترین ژمارە نیشان بدات، بەڵام خەڵکی بەگشتی هەرچەندە خوازیاری صەنعەت و پیشەسازیەك بن ئەو خواستەیان لایەنێکی گشتگیری نابێت و بازاڕیان ڕەونەق و ڕەواج پەیدا ناکات. وەخودا سبحانە وتعالی هەرچیەك کەبیەوێت دەتوانێت بیکات[٨٠].

---

[٨٠] (وَهُوَ الخَلاقُ العَلیم) س یس ئا ٨١.

# بەشی بیستەم

## لەبارەی ئەوەی کە هەرکاتێك شارەکان لەکەناری وێرانیدابن پیشەسازیەکانیشیان بەرەو لەناو چوون دەچن

لەو ڕووەوەی کەباسمانکرد پیشەسازیەکان تەنها ئەو کاتە پێشدەکەون کەپێویستی خەڵکی بن و خواستی زۆریان لەسەر بێت، هەربۆیە هەرکات گەشانەوەی شارەکان گۆڕدرا بۆ دواکەوتن بەهۆی تێکشکانی ئاوەدانی و کەمبوونەوەی دانیشتوانەکەی دەکەوێتەناوکیشەو ئاڵۆزی فەتوتیەوە، ئەوکات جوانخوازی و سەروەت و سامان تێیدا کەم دەکات و خەڵکی وەك سەردەمی گوندنشینی تەنها شتەپێویستیەکانیان بەس دەبێت و، لەئەنجامدا ئەو پیشانەی کەلەپێویستیەکانی جوانخوازین ڕەونەقیان نامێنێت، چونکە دروستکەرەکەیان لەوەها هەلومەرجێکدا ناتوانێت لەڕێگەی ئەو پیشەیەوە مەعاشی خۆی دابین بکات و، ناچار بەرەو شوێنێکی تر دەچێت یان لەناو دەچێت و دەمرێت و هیچ جێنشینێکیشی لەدوا بەجێ نامێنێت و لەئەنجامدا نیشانە و شوێنەواری ئەم جۆرە پیشەسازیە دەسڕێتەوە. هەروەك چۆن وێنەکێشان زەڕەنگەرەکان و نوسەران‌و کۆپی کارانی کتێب و صەنعەتگەرەکانی تری وەك ئەوان، شتوومەکی جوانخوازی دروستدەکەن لەنێو دەچن و صەنعەتەکان بەرەو کەمبوونەوە دەچن و تاوەکو بەتەواوەتی دەسڕێنەوە، خودای ئافەرێنەریش داناترە[81].

---

[81] (وَهُوَ الخَلاقُ العَلیم) س یس ئا ٨١.

# بەشی بیست و یەکەم

## لەبارەی ئەوەی کە تازیەکان لەهەموو خەڵکی لە پیشەسازیەوە دورن

چونکە ئەوان لەدەشتەکیەتەوە نزیکتر و لەشارنشینی و شارستانیەتەوە کە مرۆڤ لەپیشەسازی و پێداویستیەکانی شارنشینی نزیك دەکاتەوە، دوورترن نەتەوە غەیرە عەرەبەکانی خۆرهەڵات و نەتەوە مەسیحیەکانی کەناری دەریای ڕۆم لەهەمووخەڵکی زیاتر لەصەنعەتدا مەهارەتیان هەیە، چونکە ئەوان لەکۆمەڵگەی شارنشینی و شارستانیەتدا پیشەدارترن و لەکۆمەڵگەی دەشتەکیەتەوە دوور ترن. تەنانەت ئەم نەتەوان بەهیچ شێوەیەك حوشتریان نیە کەعەرەب والێدەکات لەبیابانەکاندا بژی و لەوەرگە و شوێنی بەخێوکردنی حوشتریان نیە. هەربۆیە دەبینین لەسەرزەوی عەرەب و ئەو شوێنانەشی کەلەسەردەمی فتوحاتی ئیسلامیدا داگیریان کردوون پیشەسازیەکی ئەوتۆ بوونی نیە و زۆربەی شتومەکەپیشەسازیەکانیان لەناوچەکانی ترەوە هێناوە. پێویستە لەمەملەکەتە غەیرە عەرەبیەکانی وەك هیند وچین و سەرزەوی تورکەکان و نەتەوە مەسیحیەکان وورد ببینەوە، کەچۆن لەنێو ئەواندا پیشەسازی و صەنعەت گەشەی کردووە و گەلانی تر بەرهەمەکانی ئەوان هاوردەی وولآتانی خۆیان دەکەن. نەتەوە غەیرە عەرەبەکانی مەغریب وەك بەر بەرەکان لەڕووی پیشەسازی و صنعەتەوە وەك تازی و دەشتەکیەکانن چونکە لەچەندین سەدە لەوە و بەرەوە دەشتەکیەتی و ژیانی بیابانگەڕی لەنێویاندا ڕەگ و ریشەی داکوتاوە، بەڵگەش لەسەر ئەمە ئەوەیە کەلەسەرزەوی ئەواندا شارگەلێکی کەم بوونیان هەیە و هەروەك چۆن لەبەشەکانی

پێشوودا باسمانکرد هەربۆیە پیشەسازی لەمەغریبدا کەمە. ئەوەشی کەهەیە هێندە بەهێز و شارەزایانە نیە بێجگە لەوەی کە پەیوەستە بەپیشەسازی خوریەوە وەك خۆشەکردنی پێست و دروستکردنی پێڵاوو بۆنی میسك، بەڵام هەرکە نەتەوە ناوبراوەکان بەرەو شارنشینی چوون لەپیشەسازیەباسکراوەکاندا شارەزاییان پەیدا کرد و گەیاندیانە باشترین قۆناغی بەرهەمهێنان، چونکە دروستکراوەکانیان پێویستی گشتی بوون هۆکاری ئەوەی کەتەنها ئەو دووپیشەیە لەو شوێنەدا هەبوون ئەوەیە کەئەوان بەهۆی دەشتەکیەتەوە شارەزای ئەو پیشانە بوون، بەڵام لەخۆرهەڵاتدا پیشەسازیەکان هەرلەسەردەمی فەرمانڕەوایی نەتەوە کۆنەکانەوە لەو ناوچەیەدا ڕەگی داکوتابوو، وەك ئێرانی نەبەتی و قیبتی و بەنی ئیسرائیل و یۆنانی و ڕۆمیەکان کەلەماوەی چەندین سەدەی دوور و درێژدا دەسەڵاتیان هەبووە، هەربۆیە هەر وەك باسمانکرد داب و نەریتی کۆمەڵگە و شارنشینی لەوانەش پیشەسازیەکان لەنێویاندا جێگیر بوبون و تاوەکو ئێستەش شوێنەواریان هەرماوە.

بەڵام یەمەن و بەحرەین و عومان و جەزیرە (جزیرەالعرب) هەرچەندە لەژێر دەسەڵاتی عەرەبدا بووە بەڵام فەرمانڕەوایی ناوچە ناوبراوەکان بۆ ماوەی هەزاران ساڵ لەنێو نەتەوەکانی ئەو ناوچەیەدا دەستاو دەستی کردووە و، نەتەوەباوبراوەکانی ئەو ناوچەیە شارو وولاتەکانی ئەو ناوچەیان دروستکردووە و گەشتوونەتە کۆتا قۆناغی شارستانیەت و جوانپەرستی و خۆشگوزەرانی وەك عاد و سەمود و عەمالیقە و لەپاش ئەمانیش حەمیر و تەبابیعە و ئەزوا[82]. هەربۆیە ماوەی پاشایەتی شارستانیەت لەو ناوچەیەدا درێژەی کێشاوە و نەریت و صیبغەکەی جێگیر بووە و پیشەسازیەکانی گەشەیان کردووە. هەربۆیە هەروەك باسمانکرد کۆنی دەوڵەت کاریگەری نەبووە لەسەریان و نەپوکاونەتەوە، هەروەك چۆن کەتاوەکو ئێستەش پیشەسازیەکانیان بەڕەونەق و نوێن و

---

[82] گروپێکن لەمەلیك و پاشاکانی یەمەن کە ناوەکانیان بەزووی عەرەبی دەست پێدەکات وە زوالازعار و زوالقرنەین و....هتد.

تایبەتن بەو سەرزەمینەوە واتە یەمەن و وەك پیشەی پارچەكانی زریفت و عەبای سەرشان (برد و عصب)[٨٣] و ئەوپارچانەی تر كە لەبەن و ئاوریشم لەو شارەدا دەچنرێن. خوداش واریسی سەرزەوی‌و ئەوانەشیەتی كەلەسەری دەژین[٨٤].

---

[٨٣] بورد عەبای خەتدار و عەصەبیش جۆرێكە لەعەبای یەمەنی، كەسەرەتا بەنەكەی ڕەنگ دەكەن و دواتر دەیچنن، عەصەب بەگوتەی هەندێك ڕەنگێك بووە كەگیاكەی تەنها لەیەمەندا دەست كەوتووە (اقرب الموارد).

[٨٤] (نَحنُ نَرِثُ الأرضَ وَمَنْ عَلَيهَا) س مريم ئا ٤١. (وَأنتَ خَيرُ الوارِثِين) س انبياء ئا ٨٩.

# بەشی بیست و دووەم

## لەبارەی ئەوەی کە هەرکات بۆ کەسێك مەلەکەی ( تواناو لێهاتن ) ی لە صنعەتێکدا بۆ دەست بدات

کەمتر دەگونجێت، دواتر ئەو کەسە لەپیشەیەکی تردا مەلەکەی بۆ بێتە دی..

باوەك نمونە باسی خەیات بکەین کەهەرکات بەباشی و پایەداری مەلەکەی خەیاتی بۆ دەست بدات و لەگیان و نەفسیدا پچەسپێت لەوە بەدواوە ئیتر ناتوانێت مەلەکەی وەستایی بەباشی وەربگرێت، مەگەر ئەوەی کە مەلەکەی یەکەم هێشتا لەناخیدا جێگیر نەبوبێت و نەریت و صیبغەکەی ڕەگی تێیدا دانەکوتابێت. هۆکارەی ئەمەش ئەوەیە کەمەلەکەکان بۆ نەفس وەك سیفەت و ڕەنگ گەلێکن کەبەیەکجار ناکەونە سەری و ناینەخشێنن، کەسێکیش کەلەسەر فیترەتی خۆی بێت ئاسانتر مەلەکەکان وەردەگرێت و ئامادەباشیەکی باشتری بۆ هاتنەدی ئەوان هەیە، وەکاتێك نەفس بەمەلەکەیەکی تر ڕەنگرێژ ببێت و لەفیترەت بچێتە دەرەوە و توانای بەهۆی جێگیر بوون و نەخشانی ڕەنگی ئەو مەلەکەیەوە لاواز ببێت ئەوکات بۆ وەرگرتنی مەلەکەیەکی تر لاوازتر دەبێت. ئەمەش شتێکی ئاشکرایە و نمونەکان باشترین گەواهیدەرن لەسەر ڕاستیەتی ئەوەی کەگوترا، هەروەك چۆن کەمتر صنعەتگەرێك دەبینین کەهونەرەکەی خۆی بەلێزانی و پایەداریەوە وەرگرتبێت و، دواتریش بتوانێت لەهونەرێکی تردا لێزانی و مەهارەت و شارەزایی پەیدا بکات و لەهەردووکیاندا لێهاتوویی و شیاوی خۆی بسەلمێنێت و ئاشکرای بکات. تەنانەت خاوەن زانستەکان کەمەلەکەی فیکری (نەوەك زانستی) بەدەست دەهێنن

وەك ئەم هونەرمەندانەن و زانایەك کەمەلەکەی یەکێك لەزانستەکانی بەو پەڕی باشی و پایەداریەوە بۆ وەدی دێت کەمتر دەگونجێت، بەهەمان ڕێژە لەزانستێکی تردا هەمان شارەزا و لێهاتوو ببێت و مەلەکەکەی بەباشی وەر بگرێت. بەڵکو ئەگەر بتوانێت فێری ببێت ئەوا دۆش دادەمێنێت و دەکەوێت مەگەر لەهەندێك شوێنی زۆر کەم و دەگمەندا نەبێت بتوانێت سەرکەوتوو بێت، سەرچاوەی ئەمەش بەپێی ئەوەی کەباسمانکرد هەمان ئەو چۆنیەتیەی تواناو گۆڕانەیەتی بەو ڕەنگە مەلەکەییە کەلەنەفسدا بەدی دێت، و خوداش داناترە.

# بەشی بیست و سێیەم

## لەبارەی ئاماژە بەدایکی پیشەسازی و صنعەتەکان

دەبێت ئەوە بزانین کەپیشەسازیەکان بەهۆی زۆری کاروبارەکانەوە لەکۆمەڵگەدا چەندین جۆریان لەنێو مرۆڤەکاندا کاریان پێدەکرێت کەلەژمارەنایەن، بەلأم لەنێو هەموویاندا دوودانەیان بەتایبەت باسدەکەین و ئەوانی تر دەخەینەلاوە، دووجۆری نابراو بریتین لە:

١ – ئەوپیشەسازیانەی کەلە کۆمەڵگەدا پێویستن.

٢ – پیشەسازی گەلێك کەلەڕووی بابەتەوە بەشەریف دەژمێردرێن.

جۆری یەکەم وەك کشتووکاڵ و وەستا بەنایی و خەیاتی و چنەری.

جۆری دووەمیش وەك مامانی و نوسەری و وەراقی یان صەحافی و مۆسیقا و پزیشکی.

بەلأم مامانی لەو پیشەسازیانەیە کەلەکۆمەڵگەدا زۆر پێویستە، چونکە بو منداڵەساواکان گیانیان بەبەردا دێتەوە و و بابەتی ئەم پیشەیەش تایبەتە بەساواکان و داکەکانیانەوە. پزیشکیش بریتیە لە پاراستنی تەندروستی مرۆڤ و دوورخستنەوەی نەخۆشی لێی. وەلەزانستی سروشتی جیادەبێتەوە و بابەتەکەی بەم شێوەیە دەبێتە جەستەی مرۆڤ. وەنوسەری و هونەرەکانی تری وابەستەبەوەوە وەك صەحافیو کەپێویستی مرۆڤ دەپارێزێت و لەلەبیر چوونەوە بەدووری دەگرێت و، ئەندێشەو یادگاریەدەرونیەکانی مرۆڤ دەگەیەنێت بەو کەسانەشی کەلەمەوە دوورن و لەلای نین،

دەرئەنجامی ئەندێشە و زانستەکان کتێبەکان بەنەمری دەیانهێڵنەوە پلەکانی بوون بەشێوەیە کی سەیر بەرز دەکەنەوە. بەلآم مۆسیقاو گۆرانی بریتیە لەڕێژەکانی ئاوازودەرکەوتنی جوانیەکەیانە بۆ گوێکان. وەهەموو ئەم سێ هونەرە دەبنە هۆی ئەوەی کە خاوەنەکەیان ببێتە هاوبەزمی پاشاکان و بچێتە ناو کۆڕی خەڵوەت و ئونسی ئەوانەوە. هەربۆیە هەرسێ پیشەساز یەکە لەم ڕێگەیەوە شەرەفێکە کەصەنعەتەکانی تر نیانە و صنعەتەکانی تر شوێنکەوتەی ئەوانن و بۆ بەدەست هێنانی ڕۆزی دەیانکەنە پیشەی خۆیان هەندێك جاریش ئەم پیشانە بەپێی جیاوازی خواست و مەبەستەکان دەگۆڕدرێن، خوداش ئافەرێنەری دانایە.[٨٥]

---

[٨٥] (وَهُوَ الخَلاقُ العَلِيم) س یس ئا ٨١.

# بەشی بیست و چوارەم

## لەبارەی صەناعەت و کشتووکاڵەوە

دەرئەنجامی ئەم پیشەیەش بەدەستهێنانی مادە خۆراکی و دانەوێڵەکانە هەربۆیە زەوی دەکێڵن و تۆو دەوەشێنن و لەپاش سەوز بوونی چاودێری دەکەن و ئاوی دەدەن و، بەباشی ئاگاداری دەبن تاوەکو دەگاتە قۆناغی بەهەمهاتن و دواتر دروێنەی دەکەن و دەیکوتن و دانوێڵە کەی جیادەکەنەوە بەشەن و کەو کردن، بەهۆی کەرەستەی تایبەت بەو کارەوە زۆر بەلێزانیەوە ئەم کارە ئەنجام دەدەن. کشتووکاڵ لەکۆنترینی پیشەسازیەکان دەژمێردرێت، چونکە بەهۆیە وە مادەی خۆراکی مرۆڤەکان بەدەستدێت کەبەزۆری تەوا کەری ژیانی ئەوە، چونکە مرۆڤ لەوانەیە بەبێ هەمووشتێك بژی بەلاّم ناتوانێت بەبێ مادە خۆراکیەکان ژیان بگوزەرێنێت هەربۆیە ئەم پیشەسازیە تایبەتە بەبیابانشین و دەشتەکیەکانەوە، هەروەك لەبەشەکانی پێشوودا باسمانکرد کەژیانی دەشتەکیەتی کۆنترە لەشارنشینی و لەپێش ئەوە وە یە هەربۆیە پیشەسازی کشتووکاڵ لەپیشەکانی سەردەمی بیابانگەڕیە کەشاریەکان نایکەنە پیشەی خۆیان و بنەماکانی نازانن، چونکە هەموو داب و نەریتەکانی ئەوان بەبەراورد بەنەریت و چۆنیەتیەکانی ژیانی دەشتەکیەتی لەپلەی دووەمدایە و، پیشەسازیەکانیشیان بەهەمان شێوە لەپلەی دووەمی پیشەسازیەکانی دەشتەکیەکاندان و لەدوای ئەوانەوەیە، وەخودای ئافەرێنەر داناترە.[٨٦]

---

[٨٦] (وَهُوَ الخَلاقُ العَليم) س يس ئا ٨١.

# بەشی بیست و پێنجەم

## لەبارەی پیشە و صەناعەتی وەستا بەننابیەوە

بەننایی لەیەکەمین صەناعەتەکانی کومەڵی شارنشینی و کۆنترینیانە و بریتیە لەناسینی کارێك کەجەستەی مرۆڤ بۆ حەسانەوە و پەناگەی خۆی خانوو شوێنگەلێك ئامادە دەکات، چونکە مرۆڤ لەسەر سروشتێك ئافرێنراوە کەبیر لەسەرئەنجام و ئایندەی ژیانی خۆی دەکاتەوە، هەربۆیە ناچارە بەخێزی بیر کردنەوەی خۆی خانوو گەلێك کەخاوەنی دیوار و سەقفن لەهەموو لایەکەوە و دەیپارێزن لەسەرماو گەرما دروست بکات. وەکۆمەڵە مرۆییەکان لەم ئەندێشە سروشتیەدا کەمانای مرۆڤایەتیە لەگەڵ یەکتریدا جیاوازن، کەواتە ئەوانەیان کەلەناوچە سازگار و مامناوەندەکاندا دەژین هەرچەندە لەڕووی حەز و سەلیقەوە لەیەکتری جیاواز بن، بەڵام ئەم بیرۆکەیە جێبەجێ دەکەن و خانوو بۆ خۆیان دروستدەکەن، وەك دانیشتوانی هەرێمی دووەم و دوای ئەویش تاوەکو هەرێمی شەشەم، بەڵام دانیشتوانی هەرێمی یەکەم و حەوتەم لەهەڵبژاردنی وەها خانوو گەلێك بەدوورن، چونکە لەلایەکەوە لەناوچەی ناسازگارو نامامناوەندادا دەژین و لەدەرککردنی چۆنیەتی پیشەسازیە مرۆییەکان بێتوانان، هەربۆیە پەنادەبەینەبەر ئەشکەوت و پەناگە کانی شاخەکان و، هەروەك چۆن خۆراکیان بەبێ لێنان و کوڵاندن دەخۆن.

لەپاشان دەبێت ئەوەش بزانین ئەوانەی کەلە ناوچە مامناوەندەکاندا دەژین و بۆ پەناگەی خۆیان خانوو دروستدەکەن و هەندێك جار خانووی فراوان بنیات دەنێن و وایان

لێدێت بەهۆی زۆری و فروانی ڕووبەری خانووەکان و، شارەوە یەکتری ناناسن و ئاگاداری حاڵی یەکتر نین هەربۆیە لەوەدەترسن کەشەوانە هەڵبکوتنە سەر ماڵی یەکتری. ئەمەیە کەناچارن پێگەی کۆمەڵایەتی خۆیان لەدەستدرێژی بپارێزن و بۆ ئەم مەبەستەش بەچواردەوری ناوەندی خۆیاندا حەصار و دیوار گەڵێك دروستدەکەن بەدەوری هەمووخانووەکانیاندا و بەوهۆیەوە شارێك دروستدەبێت. حاکم و فەرمانڕەواکانیش ئەوان لەدەستدرێژی کردنە سەر یەکتری ڕێگری لێدەکەن و هەندێك جاریش بۆ پاراستنی خۆیان لەهێرش و دەستدرێژی دووژمنان پێویستیان بەجێگە ئەمن و شاخە بەرزەکان دەبێت و، دەیانکەنە پەناگەی خۆیان و ژێر دەستەکانیان لەهێرشی دووژمن دەپارێزن ئەم کەسانەش وەك پاشاکان و ئەو کەسانەن کەوەك ئەوانن وەك ئەمیر و سەرۆك هۆزەکان. ئەوکات دەبێت ئەوەبزانین کە چۆنیەتی بیناو خانووەکان لەشارە جۆراو جۆرەکاندا جیاوازیان هەیە و لەشارێکدا کەبەپێی داب و نەریت و ئاوو هەواکەی دروستکردنی خانووەکانی لەشارو شوێنێکی تر جیاوازترە.

وەهەروەها تەنانەت لەنێو یەك شاریشدا هەموو خانووەکان وەك یەك نین هەروەك چۆن هەندێك کۆشکو تەلاری گەورە دروستدەکەن کەزۆر فراوانن و ژووری زۆریان تێدایە و بەهۆی بوونی منداڵ و خزمەتکار و ژنان و پەیڕەوانی زۆرە ناچارن ژووری زۆریان هەبێت. چینە ناوبراوەکان دیواری خانووەکانیان لەبەرد دروستدەکەن و بەڕەنگەکانی گەچ ناوەیان گەچکاری دەکەن و دەیانڕازێننەوە و دەرەوەشیان بەقصلێ بەند کەشی دەکەنو، زۆر هەوڵی ڕازاندنەوەی خانووەکانیان دەدەن بۆ ئەوەی لەبەر چاوان جوانتر بەشکۆ تر دەربکەوێت و، سەرەڕای ئەمانەش لەهەر بینایەکدا سەرداوو ژێرزەمین گەلێك دروستدەکەن بۆ هەڵگرتن و کۆگا کردنی مادە خۆراکیەکان وەك غلات و دانەوێڵە و....هتد. وەئەگەر لەلەشکریەکان و ئەو چینانەبن کە خزم و خزمەتکاری زۆریان هەبێت وەك ئەمیرەکان و هاوشێوەی ئەمان ئەوکات گەوڕگەلێکی گەورە بۆ ئەسپەنازدارەکانیان ئامادە دەکەن. هەندێکیش کەپرە خراپ و ناپەسەندەکان بۆ ژیانی خۆیان و منداڵەکانیان

هەڵدەبژێرن و لەم ئاستەش تێپەڕ ناکەن، چونکە تەنگدەستی و هەژاری زۆر ترلەم ڕێگەیان پێ نادات و ناچار تەنها بەپەناگە سروشتیەکان ڕازی دەبن. لەنێوان چینەجیاوازەکاندا لەم بارەیەوە پلەگەلێکی دیاری نەکراوهەن کە هەریەکە و بەپێی خواستی خۆی، خانوو شوێنی نیشتەجێ بوون بۆ خۆی دروستدەکات هەندێك جاریش لەکاتی بنیاتنانی شارە گەورەکان بەدەستی پاشاکان و ئەهلی دەوڵەت و دروستکردنی باڵەخانە بەرزو بەشکۆکان پێویستیان بەم پیشەسازیە دەبێت و، لەم جۆرە شوێنانەشدا لەجوانی و مەحکەمی و بەرزکردنەوەی پایەو دیوارەکانیاندا ئەوپەڕی هەوڵدەدەن تاوەکو ئەم پیشەسازیە بگەیەننە ئەوپەڕی و صەنعەتی بەننایشە کەپێویستیەکانی دەدات بەدەستەوە.

ئەم پیشەسازی و صنعەتەش زیاتر لەهەرێمە مامناوەند و سازگارەکاندا واتە هەرێمی چوارەم و هەرێمەکانی نزیك بەو باوی هەیە، چونکە لەهەرێمە نامامناوەندەکاندا بەننایی بوونی نیە، بەڵکو دانیشتوانەکانیان لەبری دروستکردنی خانوو بەقامیش و قوڕ خانوو پەناگەی خۆیان دروستدەکەن، یاپەنا دەبەنە بەر ئەشکەوت و تاشەبەردی گەورەی کێوەکان. ئەهلی ئەم صنعەتەش کەکردوویانەتە پیشەی خۆیان لەڕووی لێهاتن و مامۆستایەتیەوە جیاوازیەکی زۆریان لەگەڵ یەکتریدا هەیە هەروەك چۆن هەندێکیان وورد و لێزانن و هەندێکیشیان بەپێچەوانەوەن. وەهەروەها دەبێت ئەوە بزانین کەصنعەتی ناوبراو چەندین جۆری هەیە: لەوانەش هەندێك لەخانووەکان لەبەردی تاشراو یان خشت دروستدەکەن ناوەڕاستی دیوارەکانیش قوڕو قصڵی تێدەکەن و ئەم قوڕ و قصڵەش بەجۆرێك دەلکێت بەخشت و بەردەکەوە وەك یەك قاڵبیان دێنە پێش چاو. وەجۆرێکی تریان ئەو خانوانەیەکە بەتایبەت لەخاك دروستیان دەکەن و دیوارەکانیان بەم شێوەیە بەرز دەکەنەوە و دووپارچە تەختەی دارین دەهێنن کەوەك یەکن و، گەورە و بچووکیان بەپێی ناوچەکان دەگۆڕێت و وەك پایە لەتەنیشت یەکەوە دایاندەنێن و بەچەند پارچەتەختەیەکی بچووك دەیانبەستن بەیەکەوە و بەزنجیر یان پەت دەیانبەستنەوە و،

ئەو دوولا خاڵیەش کەدمێنێتەوە بەهەمان شێوە بەدوو تەختەی تر بۆشاییەکە پڕ دەکەنەوە و دوای ئەوەی کەدڵنیا بوونەوە لەمەحکەمی و بەهێزیەکەی پڕی دەکەن لەقوڕو قصڵ و بەکووتەی تایبەت دەیانکوتنەوە، کەبۆ ئەم مەبەستەئامادە کراوە بەجوانی دەیکوتن و تێکەڵی دەکەن و، دواتر دیسانەوە قوڕ و قصڵی تێدەکەنەوە و ئەم کارە دووبارە دەکەنەوە تاوەکو تەختەکان پڕدەبن و، پایەکە دروستدەبێت و لەئەنجامی ئەم کارەش قوڕ و قصڵەکە هێندە دەلکێن بەیەکەوە هەردەڵێیت یەك قاڵبە و هەربەو جۆرە بووە بۆ دروستکردنی هەرچینێکی دیوارەکە ئەم تەختانە بەیەکەوە دەلکێنن و، پڕیان دەکەن لەقصڵ و قوڕ تاوەکو دیواری بینایەکی گەورە دروستدەکەن و، دواتر دیوارەکانی تەوا و دەکەن و هەیکەلی خانووەکە ئامادە دەبێت، ئەم شێوازەش تابیە پەیڕەوی دەکەن و پێیان دەڵێن تواب واتە چینی دیوار دروستکەر.

یەکێکی تر لەپیشەسازیەکانی ئەم بوارە سواق دان و سافکردنی دیواری خانووەکانە بەقصڵ و قوڕ و بۆماوەی چەند ڕۆژێك دەیهێڵنەوە لەشوێنی مامناوەنددا، بۆ ئەوەی ئەوگەرمایەی کەدەبێتە هۆی لەناو چوونی چەسپەندەییەکەی لەناوبچێت و دواتردەیدەن لەدیوارەکان بەجۆرێك هێندە دەست بەو قصڵ و قوڕەدا دەهێنن تاوەکو بەجوانی بلکێتو درز نەبات و نەکەوێتە خوارەوە. یەکێکی تر لەپیشەسازیەکانی بەننایی دروستکردنی سەقفی بینایە هەروەك چۆن کۆڵەکەی تاشراو یان سادە لەسەر هەردوو لای دیواری ژوورەکانەوە وەلەسەریانەوە تەختەگەلێك کەهەم دارتاشەکان تاشیویانە بزماری لێدەدەن و، دواتر خاك و قصڵ دەڕێژن و بەکوتە بەجوانی توندیان دەکەنەوە بۆ ئەوەی بەجوانی تێکەڵ بەیەکتر ببن و بیبەستێت.

وەهەروەها بەسەر ئەو قصڵ و خاکەوە چینێك قصڵی لێدەدەن و و دیوارەکانیشی بەهەمان شێوە قسڵ کاری دەکەن. یەکێکی تر لەپیشەکانی بەننایی (وەستایی) کەپەیوەستە بەڕازاندنەوەی ماڵ و بیناکانەوە بریتیە لەدروستکردنی شێوە بەر جەستەکانە بەگەچبڕین، بەو شێوەیەی کەگەچەکە تێکەڵ بەئاوەکە دەکەن و لەپاش

ئەوەی کەدەیبەستێت و هێشتا شێی هەیە و جەرمەیە بەئامێری تیژی ئاسنین شێوە و نەخش و نیگاری گونجاوو جۆراو جۆری لەسەر دەکەن و، هێندە کاری لەسەر دەکەن کەزۆر جوان و ڕەونەقدار دەبێت. هەندێك جاریش دیوارەکان بەبەردی مەڕمەڕ یان سوالەت یان صەدەف دەڕازێننەوە، بەجۆرێك چەندین بەشی جیاوازیان هاوشێوەیان لێ جیادەکەنەوە و بەقصلێ دەیانلکێنن.

لەپاش دروستکردنی دیوارەکان هێندە جوان دەبن هەر دەڵێی دیمەنێکە لەباخچەی پڕ لەگوڵی جوان. لەو هونەرانەشی کەلەبیناکاندا بەکار دێن دروستکردنی چاڵ و حەوزەکانە بۆ تێپەڕینی ئاو لەنێو ماڵەکاندا لەپاش ئەوەی لەناو سەرچاوەی ئاوەکاندا حەوزخانە گەلێك دروستدەکەن و، حەوزی بچوکیان تێدا لەبەردی مەڕ مەڕ دادەتاشن و لەناوەڕاستیاندا فوارە دروستدەکەن بۆ ئەوەی ئاویان لێوە بڕژێتە خوارەوە و بچێتە ناو حەوزەکەوە و، ئەم ئاوانەش کەلەکەناڵگەلێکەوە کەلەنێو ماڵەکاندا بوونیان هەیە دەبەنە حەوزە بچوکەکانەوە، نمونەی ئەمانە لە چەندین جۆری تری بیناو باڵەخانەکان. وەصەنعەتگەران و وەستا بەنناکان لەهەموو ئەمانەدا بەڕێژەی ئەولێهاتن و چاو کراوەییەی کەهەیانە جیاوازن و، هەرچەندە ئاوەدانی شارستانیەتی شار زۆرتر بێت دروستکردنی بیناو باڵەخانەکانیش بەهەمان ئەندازە زۆر دەبن. هەرچەندە کەفەرمانڕەوایانی شار لەم جۆرە شتانەدا لەدیدی بەناکان و صەنعەتگەرانەوە سود وەردەگرن. چونکە ئەوان بیناو ترو لێزانترن لەکاروبارەکانی خانوو باڵەخانەکان، چونکە دەبینین کەخەڵکی لەشارە قەرەباڵغەکاندا لەبارەی ئەم کاروبارانەوە کێشە و گرفتیان لەگەڵ یەکتریدا هەیە لەبارەی بەرزی و دیمەنی ناوەوە ودەرەوەی بیناکانەوە، بەجۆرێك هەندێك لەدەرو دراوسێ خۆیان تێکەڵ بەو کێشانە ناکەن مەگەر ئەوەی کە خاوەن هەق بن.

وەهەروەها لەبارەی سەرچاوەکانی ئاوو ڕۆکردنی پاشەڕێو ئاوەڕۆکانەوە دەمەقاڵێ دەکەن و، بۆنمونە کەسێك لەبەرزی دیواری دراو سێکەی یان کۆن بوونی دیوارەکان و

مەترسی کەوتنیان و بۆ ئەم کارانەش ناچارن پەنا ببنە بەر حاکم و، ئەویش حوکمی ڕووخاندنەکەی بەپێی بۆ چوونی ئەو کەسەی کەبەشێوەیەکی بێ زەرەرو زیان دەیڕووخێنێت دەربکات و یان بۆ دابەشکردنی خانوویەك لەنێو دووکەسدا پێویستیان بەکەسێکی ژیرو بیناو لێزان هەیە بۆ ئەوەی هیچکامیان زەرەر نەکەن و، نمونەی ئەم جۆرە مەسەلانە زۆرە کەلەلای زۆرێك لەخەڵکی شاراوەیە بێجگە لەوانەی کەلەمەسەلەی خانوو باڵەخانەکاندا شارەزاییان هەیە، وەك چۆنیەتی دانانی دارو بەردەکان لەشوێنی گونجاودا و ئەو ڕەمزانەی کەلەمەحکەمی بیناکاندا بەکار دێن و زانینی شوێنەکانی لاری و ڕاستی دیوارەکان و دابەشکردنی خانووەکان بەپێی پایەکان و باشتر بوونیان ڕێکردنی ئاو لەئاوەڕکانیانداو، گەیاندنی ئاوی سازگار بەژوورەکان ئیتر بۆ دەرەوە بێت یان بۆ ناوەوە بەجۆرێك کەنەگاتە لای دیوارەکان و، بەگشتی شارەزای هەموو ئاشکراو نهێنی بیاسازین و ئەزموون و شارەزاییەکی باشیان هەیە کەخەڵکی تر نایانزانن.

بەڵام ئەم گروپە لەگەڵ هەموونەمانەشدا لەڕووی تواناو بێتواناییەوە لەم پیشەیەدا بەپێی نەوە یەك لەدوای یەکەکان و، لەڕووی تواناو بێ هێزی دەوڵەتەکانەوە جیاوازیان هەیە و ئێمەش لەبەشەکانی پێشودا باسمانکردکەکامڵبوونی صەنایع وابەستەیە بەکامڵبوونی شارستانیەت و شارنشینیەوە و فراوانبوون و، گەشەکردنەکەشی پەیوەستە بەزۆرێك لەخوازیارانیەوە. هەربۆیە کاتێك دەوڵەت لەقۆناغی دەشتەکیەتیدایە لەسەرەتادا ناچارە لەووڵاتانی ترەوە وەستاو بەننا بهێنێت و، پێویستی بەووڵاتانی دراوسێی هەبێت هەروەك چۆن ئەم شتە بۆ وەلیدی کوڕی عبدالملك ڕوویدا، کاتێك کەبڕیاریدا مزگەوتی مەدینە و قودس نۆژەن بکاتەوە و مزگەوتی شام بەناوی خۆیەوە بنیات بنێت، هەربۆیە نوێنەرێکی بەرەو قوستەنتینیە نارد بۆلای پاشای ڕۆم، بۆ ئەوەی وەستا و کرێکار گەلێك کەلەکاری بیناسازیدا شارەزاییان هەیە بنێرێت بۆ لایان و ئەوەبوو ئەویش وەڵامی دایەو، داواکاریەکەی جێبەجێ کرد و کۆمەڵێك شارەزای لەوەستاو کرێکار بۆ نارد.

وەهەندێك جاریش ئەم صەنعەتگەرانە لەمەسەلەگەلێكی وەك ئەندازیاری و هەندەسەدا دەستێوەردان دەكەن وەك هەموار كردنەوەی دیوارەكان لەڕووی وەزن و بەرزی سەر ڕووی زەوی بۆ ڕۆكردنی ئاو (واتە بەدەستەواژەی ئەمڕۆكە ترازی دەكەن). هەربۆیە بەنناكان ناچارن لەم جۆرە مەسەلە هەندەسی و ئەندازیاریانەدا بەصیر و لێزان بن، و شارەزای ڕەمزی ڕاكێشان و بەرزكردنەوەی قورساییەكان لەڕێگەی مەكینە و ئامێری تایبەت بەو بوارەوە بن، چونكە هەركاتێك بیانەوێت خانووی گەورە دروستبكەن هێزی كرێكار لەگواستنەوەی قورساییە لەڕادە و توانابەدەرەكان بەس نیە، هەربۆیە دەبێت ئەم كارە لەڕێگەی دەزگا تایبەتیەكانەوە چارەسەر بكرێت و هێزی گوریسەكان دەكەنە دووهێندە و لەو كونانەی كەبەشێوەیەكی ئەندازیاری دروستكراون، دەكەنە ناو چنگە مەنجەنیقەكانەوە و ئەوكات بارە قورسەكان لەكاتی بەرز كردنەوەیاندا سوك دەبن و ئەم ئامێرەش پێی دەڵێن میخال یان مەنجەنیق.

بەم شێوەیە بەبێ ئەزیەت و ماندوبوونێكی زۆر كارەكە دەكرێت. ئەم كارەش لەڕووی بنەما هەندەسیە ناسراوەكانەوە كەلەنێو مرۆڤەكاندا باوە دروستدەبێت بەهۆیەوە بیناگەلێكی گەورە و بەرزیان كەتاوەكو ئەم ڕۆژگارەش دیارن بنیاتناوە. ئەو بینا سەرسوڕ هێنەرانەی كەخەڵكی وادەزانن ئەوانە لەخانووەكانی سەردەمی نەفامین و خەڵكی ئەو ڕۆژگارە باڵایان بەو ئەندازەیە بووە و بەهێز بوون، ئەمە لەكاتێكدا ئەم بیر كردنەوەیە دروست نیە بەڵكو ئەوانەیان بەڕێكسازیە ئەندازیاریەكان دروستكردووە هەروەك باسمانكرد. كەواتە دەبێت لەم خاڵانە تێبگەین. خوداش ئەوەی كەبیەوێت دروستی دەكات[٨٧].

---

[٨٧] (وَيَخلُقُ مايَشَاء) س مائده ئا ٢٠.

# بەشی بیست و شەشەم

## لەبارەی پیشەی ئامێر و کەرەستە دارینەکان (خەڕاتی)

ئەم پیشەسازیە لەپێویستیەکانی کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی دادەنرێت و مادەکەشی دارە، چونکە خودای گەورە لەهەموو بوونەوەراندا سود گەلێکی بۆ مرۆڤەکان دیاری کردووە کەبەهۆیانەوە پێویستی و نیازەکانیان دابین دەکەن، یەکێك لەوانەش درەختە کەمرۆڤ سود گەلێکی زۆری لێوەر دەگرێت و هەموو کەسێکیش دەیانزانێت. یەکێك لەو سودانەش ئەوەیە کاتێك ووشك دەبێت کۆمەڵێك سودی لێوەردەگرن کەیەکەمین سودەکانی بریتین لە: سوتاندن بۆ ژیان و گوزەران و دروستکردنی عاسا بۆ لەنگەرگرتن و بەرگری لەخۆو نمونەی ئەمانە لەپێویستیەکانیان. وەهەروەها کۆڵەکەگەلێکی لێ دروستدەکەن کەلەکاتی لاربوونەوەی دیواری لار و بارەقورسەکاندا دەیکەن ڕاگر و دار چەندین سودی تریشی هیە کەدەشتەکیی و شاریەکان سودی لێ وەر دەگرن. هەروەك چۆن دەشتەکیەکان بۆ کۆڵەکەو مێخی خێمەکانیان لەکەژاوەکاندا بەکاری دەهێنن و، چەك و چۆڵەگەلێکی وەك تیر و کەمان و نەیزەی لێ دروستدەکەن. وەهەروەها شاریەکانیش بۆ سەقفی خانوو ژوورەکان بەکاری دەهێنن و تەختەگەلێکیان لێدروستدەکەن بۆ دانیشتن لەشێوەی مێزدا. مادەی سەرەکی هەریەکە لە ئامێرە ناوبراوەکان دارە و بێجگە لەپیشەسازیەکاندا ناکرێت بەشێوازێکی تایبەت بەکەرەستەیەکەوە بڕوێت و تەنها لەڕێگەی پیشەی ئامێر و کەرەستەدارینەکانەوە شتەکانی لێ دروستدەکرێت بەچەندین جۆری جیاواز. دروستکەری ئامێرە دارینەکان سەرەتا دەبێت دارەکە بتاشێت و بەشێوەیەکی بچوکتر لەوەی کەهەیە

شێوەی پێبدات و بیکاتە تەختە و، لەپاشان ئەم پارچە تاشراوانە بەپێی شێوەی داواکراو ڕێکبخات و لەهەموو کارەکەیدا وەستا هەوڵدەدات بەشێوەیەکی ڕێکو پێك ئەم پارچەتەختانە بکاتە ئامێرێك یان شتێکی تایبەت و، بەوەستای ئەم کارەشە دەگوترێت دروستکەری ئامێرە دارینەکان کەپێویستی کۆمەڵگەن.

لەپاشان کاتێك شارستانیەت بگاتەلوتکەی گەورەیی و پێشکەوتن و سەردەمی جوانخوازی بێتە پێشەوە و خەڵکی سەر بکەنە هۆکارەکانی خۆشگوزەرانی ژیان و، حەزدەکەن کەهەموو ئامێرەکانی خانووەکانیان هەرلەدارو دیوار و سەقفەوە بیگرە تادەگاتە دەفر و کەرەستەکانی بەکارهێنانی ژیانی ڕۆژانە لەتەختەی جوان و ڕازاوە بێتو پڕبێت لەنەخش و نیگار، ئەوکات ئارایش و جوانی لەپیشەسازی کەرەستە دارینەکاندا بەدی دێت و بەچەندین شێوەی جۆراو جۆر دەیانڕازێننەوە بەجۆرێك لەشتە سەر سوڕ هێنەرەکانی هونەر دادەنرێن و، بەهیچ شێوەیەك ناکەونە قاڵبی پێویستیەکانەوە وەك نەخش و نیگار و هێڵکاری کەرەستەکان و لەبەر ئەوەی کە ئامادەکردنی پارچە تەختەکان بەهۆی هونەری خەڕاتیەوە بەشێوەیەکی زۆر جوان دەتاشن و، لەسەر شێوەیەکی تایبەت دروستیان دەکەن و بەپارچە داری بچووك و بزمار بەجۆرێك دەیانلکێنن بەیەکەوە هەردەڵێی یەك پارچەیە و بەشێوەیەکی زۆر جوان دەنوێنێت!

ئەم هونەرەش لەهەموو کارە دارتاشیەکاندا بەکار دەهێنن. وەهەروەها لەدروستکردنی کەشتی و بەلەمەکاندا پێویست بەهونەری ئامێر و کەرەستە دارینەکان هەیە کەخاوەن تەختەو بزمارە[88]. ئەم کەشتیانەش بریتین لەساختەگەلێکی ئەندازیاری کەوەك مەلەکردنی ماسی بەهۆی باڵ و سنگەکەیانەوە لەسەر شێوەی ئەو گیانەوەرە دروستی دەکەن، بۆ ئەوەی لەناوئاودا توانایەکی زیاتری هەبێت بۆ ڕۆشتن و خۆڕاگری زیاتر و لەبری جوڵە حەیوانیەکە کەلەماسیدا هەیە بۆ جوڵەپێکردنیان لەهەوا و لەڕێگەی چارۆکەوە دەیانجوڵێنن، یان لەڕێگەی سەوڵ لێدانەوە ئەوکارە دەکەن هەروەك چۆن

---

[88] (وَحَمَلْناهُ عَلى ذاتِ أَلْواحٍ وَدُسُرٍ) س القمر ئا ١٣.

لەپاپۆڕەجەنگیەکاندا بەکاری دەهێنن، ئەم پیشەیەش لەهەموو بەشەکانیدا پێویستی بەبەشێکی گرنگ لەئەندازیاری و هەندەسە هەیە، چونکە پێویستی دەرهێنانی وێنەکان لەقۆناغی بالقوەوە بۆ کردار پەیوەستە بەگونجانی نێوان ئەندازەکانەوەیە ئیتر تایبەتی بن یان گشتی و دەبێت ئاگاداریان بین و، دەبێت لەم گونجانەشدا پەنا بەرینە بەر ئەندازیارەکان. هەربۆیە هەموو گەورەکان و پێشەوایانی زانستی ئەندازیاری لەیۆناندا بەگەورەکانی ئەم پیشەیەش دادەنران، هەروەك چۆن ئقلیدس خاوەنی کتێبی بنەماکانی هەندەسە، وەستای دروستکردنی ئامێرە دارینەکان (خەراتی) بووە و بەو هونەرەوە ناسراوە وەهەروەها ئبلونیوس دانەری کتێبی مەخروتاتو میلاوش و نمونەی ئەمانە خەراتیان زانیوەو پێیەوە بەناوبانگ بوون.

هەروەك دەڵێن مامۆستای ئەم صەنعەت لەنێو خەڵکیداو لەسەردەمی پێغەمبەر نوحدا خودی نوح (ع) و بەهونەرە کەشتی ڕزگاری دروستکرد و لەکاتی تۆفانەکەدا بەیەکێك لەموعجیزەکانی ئەو دەژمێردرێت. ئەم هەواڵەش هەرچەندە لەڕیزی ئیمکاناتدایە واتە دەتوانین بڵێنین ئەو خەرات بووە، بەلآم بەڵگەیەکی ئەقڵی ئەوە ناسەلمێنێت کەئەو یەکەمین دروستکەر کەشتی بێت چونکە سەردەمێکی دورو درێژ لەو کاتەوە تێپەڕیوە، بەڵکو مانای قسەی نابراو ئاماژەیە بەتواناو هێزی خەراتی پێغەمبەر نوح (ع)، چونکە ئەو چیرۆکەی کەلەوە و بەرلەنوحەوە نەسەلمێنراوە هەربۆیە ڕووداوی نوحیان بەو جۆرە گێڕاوەتەوە کەهەروەك بڵێی ئەو یەکەمین کەسێکە کە صەنعەتی ناوبراوی فێری خەڵکی کردبێت. ئەمەیە کەدەبێت ئاگاداری نهێنی پیشەکان بین لەنێو خەڵکیداو، خوداش ئافەرێنەری دانایە[٨٩].

---

[٨٩] (وَهُوَ الخَلاقُ العَلِيم) س يس ئا ٨١.

# بەشی بیست و حەوتەم

## لەبارەی پیشەی چنین و خەیاتیەوە

دەبێت ئەوە بزانین گروپێك لەمرۆڤ کەلەهەرێمە مامناوەند و سازگارەکاندا دەژین دەچنە ناو مانای ڕاستی مرۆڤایەتیەوە و ناچارن کەبیر لەپۆشاك بکەنەوە،[٩٠] هەروەك چۆن کە بیر لەخۆیان دەکەنەوە. مەسەلەی پۆشاکیش بەو جۆرە دێتە دی کە پارچە چنراوەکان بۆ پاراستنی جەستە لەگەرماو سەرما یەکسەر لەبەر دەکەن، واتە بەبێ بڕین دورین بۆ بەدەستهێنانی وەها پۆشاکێکیش پێویستە بەنەکە بچنرێت بۆ ئەوەی پارچەقوماشەکە دروست ببێت و بەم کارەش دەگوترێت چنین. کەواتە ئەگەر خەڵکی دەشتەکی بن ئەوا تەنها ئەو پارچەیان بەس دەبێت، بەڵام ئەگەر بەرەو شارنشینی بچن ئەوا ئەو پارچانە دەبڕن و دەیاندورن بەپێی قیاسی جەستەیان و بەم پیشەیەش دەگوترێت خەیاتی. ئەم دوو پیشەیە لەکۆمەڵگەدا پێویستن چونکە مرۆڤ بۆ پۆشاکی خۆی پێویستی بەوانە هەیە هەروەك چۆن یەکەمین پیشەسازی بۆ چنینی بەنە خوری و لۆکەییەکان لەدورینی پارچەکاندا بەکار دێن و بۆ بەهێزی پارچەکە بەتوندی دەبەستێت بەیەکەوە و، لەئەنجامدا کۆمەڵێك قیاسی جل و بەرگی جیاواز دروستدەبن وەك گلێم[٩١]ی خوری کەیەکسەر جەستە دادەپۆشێت و پارچەکەتانی و لۆکەییەکان بۆ عەبا بەکار دێن.

---

[٩٠] (وَالأنعامَ خَلَقَهَا لَهُم فِيها دِفءٌ وَمَنافِعُ وَمِنها تَأكُلُون) س ١٦ تا ٥.

[٩١] هەمان ئەو پارچە زبرەیە کەلە خوری و مووی حەیوانات دەچنرێت و دەشتەکیەکان لەبەری دەکەن بەبێ دوورین.

وەپیشەی دووەم بۆ ئەوەیەکە چنراوەکان بەپێی جیاوازی شکڵ و شێواز و داب و نەریتیان بەپێی پێوانەی جەستەدەیاندوورن بەو پارچانەی کەبەئەندازەی قیاسی جەستەیانە. لەپاشا برین جل و بەرگەکان بەشێوەیەکی لێزانانە دەبڕن و هەندێك جار عەباکە لەچەند پارچەیەك پێکهاتووە و یان حاشیە دوورینی هەیە و یان بەشێوازەکانی تر بدورێت.

ئەم پیشەیەی دووەمیش تایبەتی شارنشینیەو خەڵکی دەشتەکی پێویستیان پێی نیە و پارچە قوماشەکان یەکسەر لەجەستەیان دەپێچن بەجۆرێك کەهەموو جەستەیان دادەپۆشێت بەبێ ئەوەی بەئەندازەی ئەندامەکانی جەستەبن، بەڵکو برینی پارچەکان و ئەندازەگیریان لەگەڵ ئەندامانی جەستەدا نەریتی شارنشینەکانەو لێرەشەوە دەبێت لە ڕازی حەرامکردنی لەبەر کردنی جلی دوراو لەکاتی حەجکردندا تێبگەین، چونکە فەریزەی حەج لەڕووی شەرعەوە مانای وازهێنانە لە هەموو ئەو شتانەی کەپەیوەستن بەدونیاوە و گەڕانەوەیە بۆلای خودای گەورە هەروەك یەکەمجار دروستی کردوین[٩٢]، بۆ ئەوەی بەندەی خودا لەجوانپەرستیەکانی وەك بۆنی خۆش ژن و جل و بەرگی جوان و...هتد دوور بکەوێتەوە، چونکە لەکاتی مردندا هەموویان لەدەستدەدات، و دەبێت وەك کەسێك بێت کەدەچێتە ناو مەحشەرەوە، حاجی ئەوکەسەیە کە لەدڵەوە و پاك بۆ خودا ملکەچ ببێت و بەم شێوەیە پاداشتێکی گەورەی بۆ هەیە و وەك ئەو ڕۆژەی لێدێتەوە کەلەدایك بووە و لەهەمووگوناهو تاوانەکانی پاك دەبێتەوە، پاك و بێگەردی ئەی پەروەردگار چەندە لەگەڵ بەندەکانتدا میهرەبانی و چەندە یارمەتیدەری ئەوانەی کەبەشوێن هیدایەتو ڕێنماییدا دەگەڕێن. وەئەم دوو پیشەیەش لەنێو خەڵکیدا هەرلەسەردەمە کۆنەکانەوە بوونی هەبووە، چونکە پۆشاك لەکۆمەڵگەکانی ناوچە مامناوەندەکاندا بۆ مرۆڤ پێویستە بەڵام دانیشتوانی هەرێمە مەیلە و گەرمەکان پێویستیان بەپۆشاك نیە، هەربۆیە دەبیستین کەلەشکریەکانی هەرێمی یەکەم زیاتر بەڕووتی دەژین و زۆربەی

---

[٩٢] (كَما خَلَقناكُم أوَّلَ مَرة) س الانعام ئا ٦٤.

خەڵکی لەو ڕووەوەی کە پیشەسازیە ناوبراوەکان زۆر کۆنن دەیانگێڕنەوە سەر ئیدریس (ع) کەلەکۆنترینی پێغەمبەران دەژمێردرێت، هەرچەندە یەکەمین داهێنەر و دروستکەریان دەڵێن گوایە هرمسە. وەهەندێك جاریش گوتراوە کە هرمس هەمان پێغەمبەر ئیدریسە و خوداش پاك و بێگەردی بۆ ئەو ئافرێنەری دانایە[٩٣].

[٩٣] (وَهُوَ الخَلاقُ العَليم) س یس ئا ٨١.

# بەشی بیست و هەشتەم

## لەبارەی پیشەی مامانی (منداڵبوون)

ئەوەش پیشەیەکە کەپێناسەکەی بەم جۆرەیە: مامانی بریتیە لە ناسینی کارێکە کە مامان لەکاتی منداڵبووندا ساوای مرۆڤ بەشێوەیەکی نەرم و لەسەر خۆ لەسکی دایکەکەی دەهێنێتە دەرەوە و پێویستی و هەلومەرجەکانی منداڵبوون فەراهەم دەکات و، لەپاش دانانی حەملەکەشەوە بەو شێوەیەی کەباسی دەکەین هۆکارەکانی باشکردنی حاڵی منداڵەکە لەبەر چاو دەگرێت. ئەم هونەرەش بەزۆری کاری ژنانە، چونکە ئەوان ئاگاداری عەورەتی یەکترن و کەسێك کەئەم کارە ئەنجامدەدات پێی دەڵێن (قابلە) مامان. ئەم مانایەشیان لەبەخشین و وەرگرتنەوە وەرگرتووە، هەروەك بڵێی کەئەو ژنەی منداڵەکەی دەبێت ساواکەی دەبەخشێتە مامانەکە و ئەویش قبوڵی دەکات. چونکە لەپاش ئەوەی کەساوا قۆناغەکانی کامڵبوونی بڕی گەشتە ئەوکاتەی کە نزیکی لەدایك بوونی بێت و ئەو ماوەیەی کەخودا بۆی دیاریکردووە کەلەسکی دایکیدا بێت تەواو ببێت، کەبەزۆری نۆ مانگە ئەو کات لەدایك دەبێت و ئەمەش زۆر بەسەختی ڕوودەدات و هەندێك جاریش عەورەتی ئەو ئافرەتە لەهەندێك شوێندا دەدڕێت و، هەندێك جاریش هەندێك لەپەردەکان بەهۆی لکانیانەوە بەڕەحمەوە دەدڕێن و، ئەمەش دەبێتە هۆی ئەو ئازارانەی کەدەرد و ئازاری منداڵبوون زیاد دەکەن و مانای (طلق) یش هەرئەمەیە.

لەم کاتەدا مامانەکە دایکەکە تاوەکو ئاستێك بەدەستپیاهێنان بەپشت وئەو شوێنانەی کەهاوکاری دایکەکە دەکەن منداڵەکەی ببێت، وەك ڕان و شوێنەکانی نزیکی ڕەحم

یارمەتی دەدات و لەم ڕێگەیەوە هاوکاری هاتنەدەرەوەی کۆرپەلەدەدات و بەپێی توانا ڕێنمایی دەکات بۆ ئەوەی کە لەناڕەحەتیەکان و ئازارەکانی منداڵبوونەکەی کەم بکاتەوە، ئەوکات لەپاش هاتنەدەرەوەی کۆرپەلە شەریکەکەی دەمێنێتەوە کەسەرچاوەی خۆراکپێدانی بووە لەسکی دایکیدا. ئەم پەیوەست و شەریکەش ئەندامێکی زیادەیە کەهاوکاری کۆرپەلەدەکات لەمەسەلەی خۆراکدا لەسکی دایکدا و مامان دەبێت ئەوەش ببڕێت و بۆ ئەوەی لەشوێنی منداڵبوونەکە تێپەڕ نەکات و، زیان بەڕەحمی ژنەکە و کۆرپەلەکەش نەگەیەنێت و لەپاشان شوێنی برینەکە بەسوتاندن کەلەکۆندا بۆ تیماری برینەکان بەکار هاتووە و، بەهەندێك دەرمانی تایبەت چارەسەری برینەکەیانکردووە. لەپاشان دەبێت ئەوە بزانین کۆرپەلە کەلەوەها ڕێڕەوێکی تەسکدا دێتە دەرەوە خاوەن ئێسقانگەلێکی نەرم و تازەیە کەبەئاسانی دەجوڵێن و دەچەمێنەوە، چونکە بەهۆی نزیکی کات و شێداری مادەکانەوە شێوەی ئەندامەکان دەگۆڕێت، هەربۆیە مامان دەستی پیادەهێنێت و هەوڵی جوانکردن و ڕاستکردنەوەی دەدات بۆ ئەوەی هەرئەندامێك لەسەر شێوەی سروشتی خۆی بوەستێت خیلقەتێکی ڕاستی هەبێت.

ئەوکات مامان دەچێت بۆلای ژنەمنداڵبووەکە (النفسط) بۆ هاتنە دەرەوەی پەردەکانی کۆرپەلە بەنەرمی دەستی پیا دەهێنێت، چونکە هەندێك جار لەوانەیە پەردە ناوبراوەکان کەمێك درەنگتر بێنە دەرەوە و ئەوکات ترسی ئەوە هەیە کە ماسکەکە بەرلەوەی کەپەردەکان بێنە دەرەوە بگەڕێتەوە سەر حاڵەتی سروشتی خۆی و، ئەم پەردانەش شتانێکی زیادە و گەنیون چونکە دەرنەهێنانیان و مانەوەیان دەبێتە هۆی بۆگەنکردن و لەدواییشدا مردنی ژنەکە. ئەمەیەکە مامان لەم پێشهاتە هەراسان دەبێت و یارمەتی دایکەکەدەدات کەبەزۆترینی کات ئەو پەردانە بێنە دەرەوە و، دوای ئەوەی کەپەردە ناوبراوەکان هێنرانە دەرەوە مامان دەچێت بۆلای دایکەکە و چەندەها جۆری دەرمان و

ڕۆنەکان دەدات لەجەستەی دایکەکە وەك زرور[٩٤] بۆ ئەوەی ئەندامەکانی جەستەی بەهێزبکاتەوە و شێی ڕەحم ووشك ببێتەوە و بۆ بەرزبوونەوەی زمانە بچکۆلەی خورما، یان شتێکی تر دەخەنە دەمیەوە و دەرمان دەکەنە لوتیەوە بۆ ئەوەی ئاو لەلوتیەوە بێتە دەرەوە، بۆئەوەی هەرچیەك لەلوتیدایە بێتە دەرەوە و بۆ لابردنی بەربەست و ووشك بوونەوەی بۆریچکەکان لەدەرمانەکانی تایبەت بەغەرغەرەکردن سود وەردەگیرێت. دیسانەوە دەست دەکاتەوە بەدەرمانکردنی کەناڵی منداڵبوونی دایکەکە و بۆ ئەو سستیو لاوازیەی کەبەهۆی ئازاری منداڵبوونەکەوە لەزێیدا تووشی بووە، چونکە کۆرپەلە هەرچەندە ئەندامێکی سروشتی دایك نیە، بەڵام چۆنیەتی پێکهاتنی ئەو لەسکی دایکیدا ئەوی بەهۆی لکانیەوە بەناوڕەحمی دایکیدا، وەك ئەندامێکی جەستەی دایکەکە وەهایە هەربۆیە لەکاتی جیابوونەوەیدا ئێش و ئازارێکی زۆر بەدایکەکە دەگات کەوەك ئێشی بڕینی ئەندامێکی جەستە وەهایە.

سەرەڕای ئەمەش مامان ئەو برینەی کەبەهۆی دڕانی عەورەتەوە لەکاتی پەستان کەوتنە سەریدا لەودا دروستدەبێت دەرمانی دەکات. وەهەموو ئەمانە ئەو دەردانەن کەمامان دەرمانەکەیان بەباشی دەزانێت. وەهەروەها ئەو دەردو نەخۆشیانەی کەبەسەر منداڵدا دێن هەرلەشیرە خۆرەییەوە تاوەکو لەشیر بڕانەوە مامان لەهەر پزیشکێك باشتر شارەزایە تێیاندا و تەنها هۆکاری ئەمەش ئەوەیە کەجەستەی مرۆڤ لەم حاڵەتەدا بەحاڵەتی بالقوەی جەستەی مرۆڤ دەژمێردرێت و، هەرکاتێکیش لەقۆناغی شیرە خۆری تێپەڕ ببێت ئەوکات جەستەی مرۆڤ دەچێتەوە حاڵەتی کرداری و، لەم کاتەشدا زیاتر پێویستی بە پزیشك دەبێت هەربۆیە هەروەك تێبینی دەکرێت ئەم پیشەیە لەکۆمەڵگەی مرۆڤایەتیدا پێویست و زەروریە و، بوون و مانەوەی تاکەکانی بەزۆری بەبێ پیشەی مامانی (قابل) ی شتێکی نەگونجاو دەبێت.

---

[٩٤] دەرمانێکە کەبۆ چاوو سارێژی برینەکان بەکار دێت (اقرب الموارد).

وەهەندێك جاریش خەڵكانێك لەجۆری مرۆڤ بێ نیازن لەم پیشەیە و ئەمەش بەهۆی ئەوەوەیە کەخودا بەشێوەیەکی موعجیزە ئاسا لەدایك بوونیان ئاسان دەکات، وەك پێغەمبەران (ص) وەیان بەهۆی ئەو ئیلهام هیدایەتەوەیە کەبەکۆرپەلەدەدرێت و لەسەری رادەهێنرێت و لەئەنجامدا بەبێ بوونی خاوەن پیشەیەکی لەم جۆرەش لەدایك دەبێت. بەڵام لەبارەی کاری موعجیزەوە دەبێت بڵێین کەموعجیزەگەلێکی زۆر لەم بارەیەوە رووياندا‌وە، لەوانەش ئەو هەواڵەی کەلەپێغەمبەرەوە (ص) بەم شێوەیە گێڕدراوەتەوە پێغەمبەر بەناوك بڕدراوی و خەتەنە کراوی لەدایك بووە، لەکاتێکدا کەهەردوو دەستی بەسەر زەویەوە بوون و چاوەکانی بڕیبوە ئاسمان.

وەهەروەها باروئۆخی عیسا لەبێشکەکەدا یەکێکی ترە و لەو موعجیزە و پەرجوانەی کەدەیدەنە پاڵ پێغەمبەران وەك ئەم چۆنیەتیە. بەڵام نابێت مەسەلەی ئیلهامیش ئینکاری بکەین، چونکە هەرکات حەیواناتگەلێکی بێزوبانی وەك هەنگ و نمونەی ئەمانە بەئیلهامگەلێکی سەر سوڕهێنەر تایبەتکراون، ئەوا لەبارەی مرۆڤەوە کەلەگیانەوەرانی تر لەپێشترە چۆن دەتوانین گومانمان هەبێت بەتایبەت کەسێك کەکەرامەت و چاکەی خودایی تایبەتکرابێت پێیەوە. سەرەڕای ئەمەش ئەو ئیلهامەی کە خودا بەکۆرپەلەی داوە لەپاش لەدایکبوون کە یەکسەر دەم دەنێت بەمەمکی دایکیەوە ئاشکراترینی ئیلهامە مرۆییەکانە. چونکە چۆنیەتی ئیلهامی خودا لەوە گەورەترە کە بتوانرێت هەمووی بزانرێت لێرەدایە کەپەی بەناڕاستی بیر و باوەڕەکەی فارابی و حەکیمەکانی ئەندەلوس دەبەین، کەپشتیان بەلەناو نەچوونی جۆرەکان و مەحاڵ بوونی پچڕانی لەدایك بوونەکان بەتایبەت جۆری مرۆڤ بەستووە و گوتوویانە ئەگەر جۆری تاکەکان لەناو بچن ئەوا دروستبوونی هەمان جۆر مەحاڵ دەبێت، چونکە بوونی جۆر لەسەر ئەم صەناعەتە وەستاوە کەهەستی مرۆڤ بێجگە بەو نایەتەدی، چونکە ئەگەر وادابنێین کەکۆرپەیەك بێتە دونیاوە و لەم صەناعەت و چاودێریەی ئەو تاوەکو کاتی بڕینەوەی لەشیر مەحروم بێت بەهیچ شێوەیەك ناتوانرێت تەصەوری ئەوەبکرێت کەوەها بوونەوەرێك بمێنێتەوە و،

بوونی صەنایع بەبێ ئەندێشە نەگونجاوە، چونکە صەنعەت و پیشەکان شوێنکەوتەو بەرهەمی ئەندێشەن. ئیبن سینا بەزۆر لەخۆکردن (تکلف) ئەم تیۆرەی ڕەتکردووەتەوە چونکە ئەو دژی بیرو باوەڕی ناوبراو بووە و پەیڕەوی لەو تیۆرە کردووە کەلەناوچوونی جۆرەکان و وێرانی جیهانی بوون دووبارە گەڕانەوەیان گونجاوە. پچڕانی جۆرەکان و وێرانی جیهانی تەکوین بەهۆی داخوازیە فەلەکیەکان و ئەوباروذۆخە سەرسوڕهێنەرەی کەبەگومانی ئەو زۆربەکەمی لەدرێژایی سەدەکاندا ڕوودەدات ئەوکات پێویستیە ناوبراوەکان واپێویست دەکات کەهەویری قوڕیەتی گونجاو لەگەڵ میزاجی مرۆڤدا لەگەڵ گەرمایەکی گونجاودا دروست ببێت و لەئەنجامدا مرۆڤێك بێتە بوون.

ئەوکات تەقدیر بۆ ئەو حەیوانێك بەدی دەهێنێت کەبۆ پەروەردەکردن و پەرستاری لەو مرۆڤە ئیلهامی تێدا دروستدەبێت بۆ ئەوەی بوونەکەی بگاتە کەماڵ و لەشیر ببڕدرێتەوە. وەئیبن سینا لەڕاڤەی ئەم بابەتەدا لەڕیسالەکەیدا کەناوی ناوە ڕیسالەی حەی کوڕی یەقزان باسی کردووە. بەڵام ئەم بەڵگەهێنانەوەیە دروست نیە هەرچەندە ئێمەلەمەسەلەی پچڕانی جۆرەکاندا لەگەڵیداین، بەڵام لەگەڵبوونەکەی ئێمە لەسەر ئەو ڕێگەیە نیە کەئەو بەڵگەی پێ هێناوەتەوە چونکە بەڵگەکەی ئەو پشت بەستووە بەکردارەکان و هۆکارەکانیان، ئەمەلەکاتێکدا کەبەڵگەی باوەڕبوون بەبکەری سەربەخۆو خاوەن ئیختیار بۆچوونەکەی ئەو ڕەتدەکاتەوە و بەپێی بیروباوڕ بەبکەری خاوەن ئیختیار نێوەندێك لەنێوان کردار و هێزە کۆنەکاندا نابێت و، پێویست بەم تەکلیفەناکات. ئەوکات ئەگەر لەڕووی جەدەلەو تەسلیمی تیۆرەکەی ببین ئەوپەڕی ئەوشتەی کەلەو دەکەوێتەوە دەرکردنی بوونی ئەم کەسەیە بەخەلقی ئیلهامەوە بۆ پەروەردەکردن لەحەیوانی بێزماندا، ئەمەلەکاتێکدا دەبێت بپرسین کەچ شتێك ئەمە دەخوازێت ؟ وەکاتێك کەئیلهام لەحەیوانە بێزمانەکاندا دروستدەبێت چ ڕێگریەك هەیە کە ئەم چۆنیەتیە لەخودی ئەو کۆرپەیەشدا دروستبکرێت، هەروەك چۆن ئێمە لەسەرەتای باسەکەماندا ئاماژەمان پێکرد کە ئافراندنی ئیلهام لەبوونەوەرێکدا بۆ بەرژەوەندی خۆی

لەقبوڵەوە نزیکترە لەوەی لەبوونەوەرێکی ترو بۆ بەرژەوەندی غەیری خۆی دروستبکرێت، کەواتە هەردوو بیروباوەڕەکە بەهۆی ئەوەی کەسەلماندمان دەبێتە بەڵگەلەسەر خۆیان و بەتاڵ بوونەوەی مەبەستەکانیان. خوداش ئافەرێنەری دانایە.[٩٥]

[٩٥] (وَهُوَ الخَلاقُ العَلِيم) س يس ئا ٨١.

# بەشی بیست و نۆیەم

## لەبارەی پیشەی پزیشکی و ئەوەی کەئەم پیشەیە لە پایتەخت و شارە گەورەکاندا پێویستە نەوەك لەنێو دەشتەکیەکاندا

ئەم پیشەسازیە لەوولآت و شارە گەورەکاندا زۆر پێویستە چونکە لەو کۆمەڵگەیانەدا پەیان بەسودەکانی بردووە کەنەتیجە و بەرهەمە کەی بریتیە لەپاراستنی تەندروستی تەندروستان و چارەسەرکردنی نەخۆشی بیماران بەدەرمان و، چارەسەر بۆ ئەوەی لەنەخۆشیەکەیان رزگاریان ببێت. وەدەبێت ئەوەبزانین کەئەصڵ و سەرەتای نەخۆشیەکان لەخۆراکەکانەوەیە هەروەك چۆن پێغەمبەر(ص) لەحەدیسێکدا کەکۆکەرەوەی پزیشکیە فەرموویەتی: گەدە خانەی نەخۆشیەکان و نهێنی دوورکەوتنەوەیە لەدەرمانەکان، ئەصڵی هەردەردێکیش توخمە یان تەداخولە، واتە تێکەڵبوونی دووژەمە خۆراکە لەگەدەدابەبێ ئەوەی یەکەمیان هەرس بوبێت. ئەوەی کەدەفەرمێت گەدە خانەی نەخۆشیەکانە. ماناکەی دیارو ئاشکرایەو مەبەستیش لە نهێنی دوور کەوتنەوەیە لەدەرمانەکان ئەوەیەکەدوورکەوتنەوەیە لەبرسیەتی کەبەهۆیەوە مرۆڤ لەخۆراك دوور دەکەوێتەوە، بەدەستەواژەیەکی تر برسیەتی دەرمانێکی گەورەیە کەبنەماو ریشەی هەموو دەرمانەکانە مانای توخمە بریتیە لەتەداخول لەنێو ماوەکانی ژەمەخۆراکەکاندا، واتە بەرلەوەی کەخۆراکی یەکەم هەرس ببێت مرۆڤ ژەمێکی تر بخوات. وەراڤەکەشی بەم شێوەیە کەخودای گەورە مرۆڤی دروستکردووە و ژیانی ئەوی بەهۆی خۆراکەوە پاراستووە کەلەرێگەی خواردنەوە بەکاری دەهێنێت و هێزەکانی

هەرسکردن کاری تێدەکات و تاوەکو ببێتە ئەو خوێنەی کەگونجاوە لەگەڵ ئەندامانی جەستەداو دەبێت بە گۆشت و ئێسقان. وەئەو خوێنەش هێزی گەشەکردن وەری دەگرێتو دەیکاتە گۆشت و ئێسقان. مانای هەرسیش کولآنی خواردنە بەهۆی گەرمای غەریزیەوە قۆناغ بەقۆناغ، تاوەکو بەکردار دەبێتە بەشێك لەجەستە و تەفسیرەکەشی ئەوەیە کە هەرکات خۆراك دەچێتە دەمەوە و لەژێر ددانەکاندا دەجوێندرێت لەژێر کاریگەری گەرمای دەمدا کەمێك ئامادە دەبێت و میزاج و پێکهاتەکەی کەمێك دەگۆرێت، هەروەك چۆن کاتێك پارویەك لەخواردنەکە دەخەینە دەممانەوە و دەیجوین ئەم مانایە رۆشن دەبێتەوە و، هەستدەکەین کەپێکهاتەکەی جیاوازە لەپێمهاتەی خواردنەکە. ئەوکات هەمان پاروی جوێنراو دەچێتە گەدەوە و لەژێر کاریگەری گەرمای گەدەدا دەکولێت تاوەکو دەبێت بە کیموس[٩٦]، کەف و شیلەی ئەم کولێنراوەیە ئەوکات ئەم کیموسە دەچێتە جگەرەوە و زیادەکانی لەگەدەوە دەچنە ریخۆڵەکانەوە و، لەهەردو رێگەی میز و پاشەرۆی جەستەوە دەیانداتە دەرەوە.

ئەوکات گەرمای جگەر ئەو کیموسە دەکولێنێت و دەبێتە خوێنی تازە بەهۆی کەفێکەوە کەوەك سەرشیر وەهایە و، لەسەریەوە دروستدەبێت کەبریتیە لەسفر و بەشە ووشەکەکانی کەسودابن دەنیشنە تەنیشتیەوە دەزگای حەرارەتی غەریزی تائەندازەیەك لەکولآنی کولآنی توندیدا دەمێنێتەوە کەبەلغەمە. لەپاشان جگەر ئەوانە دەنێرێت بۆ دەمارە بچووك و گەورەکان لەوێدا دەزگای گەرمای غەریزی لەکولآنیدا کاریگەرە و ئەوکات لەخوێنی پاڵفتە هەڵمێکی گەرمتر و، تازەتر دروستدەبێت یارمەتی رۆحی حەیوانی دەدات و هێزی گەشە کارەکەی لەخوێندا دەستپێدەکات و لەکۆی خوێن و گۆشت و لەناسکی یان چرپەکەی ئێسقان دروستدەبێت و، ئەوکات جەستە زیادەکان و

---

[٩٦] واتەئەو خۆراکەی کەلەناو گەدەدایە و هێشتا نەبووەتە خوێن و ووزە، ئەم ووشەیەش لە خیموسی یۆنانیەوە وەرگیراوە.

ئەوشتانەی کەزیادن لەپێویستی ئەو دەنێرێتە دەرەوە ئەم زیادانەش جیاوازن وەك ئارەق و چەوری و ئاوی لوت و فرمێسك.

بەم شێوەیە شێوازی خۆراك و گەشتنی لەقۆناغی بالقوەوە بۆ قۆناغی کردار کەگۆشتە. لەپاشان دەبێت ئەوە بزانین کە سەرچاوەی نەخۆشیەکان و بەشێکی زۆریان بریتین لەجۆرەکانی تا و بەرزبوونەوەی پلەی گەرمای لەش.

هۆکاری تاش ئەوەیە کەدەزگای گەرمای غەریزی هەندێکجار لاوازدەبێت و ناتوانێت لەهەرقۆناغێك لەقۆناغە ناوبراوەکاندابەباشی بکوڵێنێت و، لەئەنجامدا خۆراکەکە بەنەکوڵاوی و ئامادەنەکراوی دەمێنێتەوە. هۆکارەکەشی بەزۆری زیادی خۆراکە لەگەدەدا هەروەك چۆن بەهۆی زۆری دەزگای گەرمای غەریزیەوە لەکوڵاندنیان بەجێ دەمێنێت. یان دەبێتە هۆی تا تێکەڵبوون و بەیەککەشتنی خۆراکی کۆن و نوێ لەگەدەدا واتە بەرلە کوڵانی خۆراکە کۆنەکەو مرۆڤ خۆراکێکی نوێ بخوات و ئەوکات دەزگای غەریزی واز لەئامادەکردنی ژەمەخۆراکی یەکەم دەهێنێت و، دەستدەکات بەئامادەکردن و کوڵاندنی خۆراك یان ژەمی دووەم یان هێزەکەی دابەشدەبێت بەسەر هەردووکیاندا و، گەدەش ئەو خۆراکەی کەبەتەواوەتی نەکوڵاوە دەنێرێت بۆ جگەر و گەرمای جگەریش بەو ئەندازەیە بەهێز نیە کەبتوانێت وەها خۆراکێك بکوڵێنێت، کەهێشتا کەمێك خۆراکی پێشووی نەکوڵاو لەجگەردا مابێتەوە و جگەریش ئەم خۆراکە هەرس نەکراوانە وەك خۆیان بنێرێت بۆ دەمارەکان و، لەپاش ئەوەی کەجەستە ئەو پێویستیە گونجاوەی کەبەو هەیەتی وەردەگرێت و ئەگەر گونجاوبێت لەگەڵ شتە زیادەکانی وەك ئارەق و فرمێسك و ئاوی دەم دەیانکاتە دەرەوە، بەڵام لەکردنەدەرەوەی زۆرێك لەوان دۆش دادەمێنێت و لەئەنجامدا مادەگەلێکی ئامادەنەکراوو نەکوڵاو لە دەمار و جگەردا دەمێننەوە رۆژ بەرۆژیش رێژەکەیان زۆر دەبێت. وەهەرپێکهاتەیەکی شێدار کەنەکوڵێت کەنەکوڵێت و هەرس نەکرێت ئەوا دەگەنێت و بۆگەن دەکات هەربۆیە ئەو مادە خۆراکیە هەرس نەکراوانەش بۆگەندەکەن و پێی دەڵێن خلگ، لەهەرتەنێکی بۆگەنکردووشدا

حەرارەت و گەرمای غەریزی هەیە ئەم حەرارەتە سەیرە هەمان ئەو گەرمایە کەلەجەستەی مرۆڤدا پێی دەڵێن (تا) یان بەرزبوونەوەی پلەی گەرمای لەش. دەتوانین ئەم شتەش لەخۆراکە شەومەنەکاندا کەبۆگەندەکەن وەهەروەها لەسەتڵ و سەلەی خۆڵەکاندا کە خۆراکەکانیان تێدا گەنیوە تاقیبکەینەوە، کەچۆن لەم کاتەدا گەرما دەچێتە ناویانەوە. ئەمەیە مانای تاکان لەجەستەی مرۆڤدا کەبەبنەماو نهێنی هەموو نەخۆشیەکان دادەنرێت، هەروەك چۆن لەحەدیسی ناوبراودا هاتووە. ئەم جۆرە تایانە دەرمانیشیان هەیە بەجۆرێك کەچەندمەفتەیەکی دیاری کراو نەخۆشەکە لەخواردن دەگرنەوە و خۆراك گەلێکی گونجاوی پێی دەدەن تاوەکو چاك دەبێتەوە. وەرەچاوکردنی چۆنیەتی و ئەندازەی خۆراك لەحاڵەتی تەندروستیدا خۆی بۆ خۆی دەستورێکە بۆ پاراستنی جەستە لەنەخۆشیە تا دارەکان وەهەندێك جاریش ئەم جۆرە بۆگەنکردنە لەیەکێك لەئەندامانی جەستەدا ڕوودەدات و، بەو هۆیەوە نەخۆشیەکی تایبەت لەو ئەندامەی جەستەدا دەردەکەوێت ئیتر ئەندامی سەرەکی بێت یان ناسەرەکی برینگەلێك دەردەکەون هەندێك جاریش ئەو هێزەی کەتیایەتی دەبێتە نەخۆشی. ئەمانەن ئەو کۆمەڵە نەخۆشیە و سەرچاوەکانیان کەزۆرتر لەخۆراکەوەیە و، بۆ چارەسەریان دەبێت سەردانی دکتۆر و پزیشك بکرێت.

دەرکەوتنی ئەم جۆرە نەخۆشیانە لەنێو شارنشیناندا زیاترە چونکە ژیانیان ڕەفاهیترو خۆراکیان زۆرترە کەمتر یەك جۆر خۆراك دەخۆن و کاتێکی دیاری کراویشیان نیە بۆ خواردن و خۆراکەکان لەکاتی کوڵاندندا بەداوودەرمان و، سەوزەو میوەوە ئیتر تازەبێت یان کۆنە لەگەڵ خواردندا دەیخۆن و تەنها یەك جۆریش بەبەس نازانن، چونکە لەیەك ڕۆژدا جاری وامەیە چل جۆر شت لەگیاو حەیوان تێکەڵ بەیەکتری دەکەن و ئامادەی دەکەن. ئەمەیە کەخۆراك دەبێتە خاوەن پێکهاتەیەکی نامۆ کەلەوانەشە ئەم خۆراکانە گونجاو نەبن لەگەڵ جەستە و ئەندامەکانی لەشیدا. سەرەڕای ئەمەش لەشارەکاندا بەهۆی تێکەڵبوونی هەوا لەگەڵ بۆنی شتە گەنیو و پاشەڕوو خۆڵ و خاشاکەکاندا خراپ

دەبێت و ئەمەلەکاتێکدا هەوا چالاکی دەبەخشێتە ڕۆح و چالاکی ڕۆحیش بەهۆی کاریگەری حەرارەتی غەریزیەوە یارمەتی بەهێزکردنی هەرسی خۆراك دەدات. وەهەروەها لەنێو شارنشینەکاندا وەرزش بوونی نیە، چونکە ئەوان بەزۆری لەحاڵی هێمنی و ئارامیدان و بەهیچ شێوەیەك لەبەرهەمەکانی وەرزش بەهرەمەند نابن و هیچ نیشانەیەکی وەرزش لەنێویاندا نابینرێت. ئەمەیە کەنەخۆشی گەلێکی زۆرو زەوەند لەشار و وولاّتەکاندا دەردەکەوێت و بەپێی زۆربوونی نەخۆشیش پێویستیان بەفێربوون و زانینی ئەم هونەرو پیشەیە هەیە. بەلاّم دەشتەکیەکان بەزۆری خاوەنی خۆراکی کەمن و زیاتر بەهۆی ئەوەی کەدانەوێڵە لەلایان کەمتر دەستدەکەوێت دەست و پەنجە لەگەڵ برسیەتیدا نەرم دەکەن و وایان لێدێت خوو دەگرن بەبرسیەتیەوە و، بەهۆی بەردەوامی ئەم بارودۆخەوە هەندێکیان وادەزانن برسیەتی تێیاندا شتێکی سروشتیەو بووەتە خوویان.

سەرەڕای ئەمەش خەڵکی دەشتەکی لەگەڵ خۆرشی کەمدا سەروکاریان هەیە وەیان بەتەواوەتی بێبەشن لێی و بەکارهێنانی داوودەرمان و سەوزە و میوەکان لەگەڵ خۆراکەکاندا نەریتی شارنشینەکانە و، دەشتەکیەکان بەگشتی لەم نەریتەوە دوورن هەربۆیە گروپ و تایفە دەشتەکیەکان خۆراکی سادە دەخۆن و ئاشنایەتیان لەگەڵ ئەو خۆراکانەدا نیە کەزیانیان بۆ گەدە و جەستەی مرۆڤ هەیە. ئەو هەوایەی کەتێدا دەژین بەتایبەت ئەگەر جێگیر و نیشتەجێ بن بەهۆی کەمی ڕادەی شێو و نەبوونی شتە گەنیوو بۆگەنکردووەکانەوە کەمتر دەگەنێت و خراپ دەبێت، وەئەگەر لەحاڵی کۆچکردنیشدا بن ئەوا بەهۆی جۆراو جۆری هەواو گۆڕینیەوە هەوای خراپ بوو کەمتر هەڵدەمژن. سەرەڕای ئەمەش ئەوان بەردەوام لەحاڵی وەرزشکردندان، لەبەر ئەوەی کەبۆ ئەسپ سواری یان ڕاوکردن یان ئەنجامدانی کاروبارە تاکەکەسیەکان کەپێویستیەکانی ژیانیان فەراهەم دەکات و بەردەوام لەجوڵەدان، هەربۆیە بەهۆی ئەم هەمووە جوڵە و بزوتنەیانەوە خۆراکەکانی ناوگەدەیان بەباشی هەرس دەبێت و، هیچکاتێك خۆراك یان ژەمێك تێکەڵ

بەژەمێکی تر نابێت لەگەدەیاندا، واتە توشی تەداخولی خۆراك نابن و ئاشنا نین پێی. هەربۆیە میزاجیان بەبەراورد بەمیزاجی شارنشینەکان سەلامەتتر و تەندروستترە و دوورن لەنەخۆشیەکانەوە و کەمتر پێویستیان بەپزیشك دەبێت، هەربۆیە لەنێو دەشتەکیەکاندا بەهیچ شێوەیەك پزیشك نیە و پێویستیان بەکەسێکی لەو جۆرە نابێت. چونکە ئەگەر پێویستیان بەو بوایە ئەوا بەدڵنیاییەوە لەنێویاندا هەڵدەکەوت و، ئەم پێویستیەی دەشتەکیەکانیش بەپزیشك دەبوویە هۆی فەراهەمکردنی ژیان و گوزەرانی چەند کەسێکی پسپۆری ئەو بوارە و لەنێویاندا دەژیا. سوننەتی خودایە لەنێو بەندەکانیدا و هەرگیز دەستوری خودا نەگۆڕی.[٩٧]

---

[٩٧] س الفتح ئایەتی ٢٣.

# بەشی سی هەم

## لەبارەی ئەوەی کەخەت و نوسین لەهونەرەکانی جۆری مرۆڤە

ئەوانەش بریتین لەنیشانەو شێوەگەلێك لەپیتەکان و ئەم شێوانەش ووشە بیستراوەکان نیشان دەدەن کەدەلالەت لە نیەت و مەبەستەکانی دەروونی مرۆڤ دەکەن، کەواتە خەت بەنیسبەتی ووشەکانەوە لەگەڵ دەلالەتە زمانەوانیەکاندا لەپلەی دووەمدایە. ئەم فەننەش لەهونەرە شەریقەکانە، چونکە نوسین لەوجۆرە تایبەتمەندیە مرۆییانەیە کەلەحەیوان جیای دەکاتەوە و، هەم هونەرێکیشە کەمرۆڤ لەنیەتی دەرونی یەکتر ئاگادار دەکاتەوە و مەبەستەکانی مرۆڤ دەگەیەنێتە ناوچە دوور دەستەکان و نیاز و، پێویستیەکانی مرۆڤ بەدی دەهێنێت و لەنارەحەتی بڕینی ڕێگا دوورەکان دووری دەخاتەوە و بێ نیازی دەکات لێیان. بەیارمەتی نوسین مرۆڤ ئاگاداری زانست و مەعریفە و هەموو نوسراوەکانی پێشینان و نوسراوەکانیان لەبارەی زانست و مێژوویان دەبێت. کەواتە لەبەر هەموو ئەم مەبەستانە و سودەکانی خەت لەهونەرە شەریفەکانەو، تەنها لەڕێگەی فێربوونەوە دەتوانین لەقۆناغی بالقوەوە بیگەیەنینە کردار و لەهەرشارێکدا جوانی و باشی خەت پەیوەستە بەئاستی ئاوەدانی کۆمەڵگە و خەڵکەکەیەوە و، پێشبڕکێیان بۆ گەشتن بەقۆناغی کامڵبوون و پێشکەوتنە، چونکە لەڕیزی صنعەتەکاندایە و لەبەشەکانی پێشوودا باسی ئەوەمانکرد کەپێشکەوتنی صەنایع وابەستەیە بە بارودۆخی شارستانی نەتەوەکانەوە و شوێنکەوتەی ئاوەدانیەکەیانە، هەربۆیە دەبینین زۆربەی دەشتەکیەکان نەخوێندەوارن و خوێندنەوە و نوسین نازانن و، ئەوانەشیان

کەمێکی لێدەزانن نەلەخوێندنەوەدا توانایەکی ئەوتۆیان هەیە و نەلەنوسینیشدا لێهاتوون. لەلایەکی ترەوەلەو شارانەی کەشارستانیەت بەشێوەیەکی لەڕادەبەدەر پێشکەوتووە فێربوونی خەت و نوسین ئاسانترو باشترە لەشارەکانی تر و، بۆ بەهێزکردنی پێگەکانی خەت شێوازگەلێکی ئاسانتر لەنێویاندا باوە هەروەك چۆن لەم سەردەمەدا لەبارەی میسرەوە دەگێڕنەوە و دەڵێن، لەو وولاتەدا بۆ فێر بوونی خەت و نوسین مامۆستایانێك دیاری کراون کە یاساو ڕێسای ئەم هونەرە فێری فێرخوازەکان دەکەن، سەرەڕای ئەمەش ئەوان ناچاردەکەن کەبەپشت بەستن بەخۆیان فێری خوێندنەوە و نوسین ببن کاری پێبکەن و، دواتر بەیارمەتی زانست و هەست فێرخوازەکە لەگەڵ هونەرەکەدا ئاشنا دەکەن و لەئەنجامدا مەلەکەی ئەو بەباشترین و کامڵترینی شێوەکان تێیاندا جێگیر دەبێت و ڕۆدەچێت.

وەئەم پێشکەوتنە بۆ ئەوان لەسایەی گەشە و فراوانبوونی پیشەسازیەکاندا کەخۆی دەرئەنجامی فراوانی دانیشتوان و کارە جۆراو جۆرەکانە دێتە دی. بارودۆخی فێربوونی خەت لەئەندەلوس و مەغریبدا بەم شێوەیە نیە کەهەرپیتێك و بەتەنها و بەپێی بنەماو یاسا گەلێك مامۆستا فێری قوتابیەکەی بکات، بەڵکو قوتابی لەڕێگەی چاولێکەری خەت و نوسینی ڕستەی ووشەکانەوە، فێری نوسین دەبێت واتە قوتابی دەنوسێت و لەوکاتەشدا مامۆستاکە چاودێری دەکات و تاوەکو بەتەواوەتی شارەزایی پەیدا دەکات و لەپەنجەکانیدا مەلەکەی نوسین جێگیر دەبێت و، بەم جۆرە کەسەش دەڵێن خۆشنووس (مجید). خەتی عەرەبیش لەکاتی دەوڵەتی تەبابیعەکاندا لەجوانی درە و شاوەییدا گەشتبووە لووتکە، چونکە دەوڵەتی ناوبراو گەشتبووە قۆناغی شارنشینی و جوانخوازیو شکۆ و خەتی نابراو بەناوی (خەتی حەمیریەوە) ناوزەد کرابوو، لەتەبابیعەشەوە گوازرایەوە بۆ خەڵکی حیرە کەلەو دەوڵەتەدا خاندانی مونزیر دروست بوبون و ئەم خاندانەش لەعەصەبیەتدا خزمان و نزیکانی تەبابیعەبوون و پاشایەتی عەرەبیان لەسەرزەوی عێراقدا تازە کردەوە، بەڵام هەروەك چۆن تەبابیعە لەخەتدا لێهاتوبوون

ئەمان نەگەشتنە ئەو قۆناغە، چونکە لەنێوان هەردوو دەوڵەتدا جیاوازیەکی زۆر هەبوو دەوڵەتی خاندانی مونزیر لە شارستانیەت و پێویستیە کانیدا وەك صنعەت و پیشەسازیەکان و....هتد نەگەشتبوونە ئاستی دەوڵەتی حەمیر و خەڵکی تائیف و هۆزی قورەیش، هەروەك گوتراوە لەخەڵکی حیرەوە فێری خەت بوون و دەڵێن ئەو کەسەشی کەخەتی واتە نوسینی لەخەڵکی حیرەوە وەرگرتووە و فێربووە سوفیانی کوڕی ئومەیە بووە و هەندێکیش دەڵێن گوایە حەربی کوڕی ئومەییەبووە.

وەدەڵێن ئەو نوسینی لەئەسلەمی کوڕی سدرەوە وەرگرتووە و فێری بووە و ئەم قسەیەش گونجاوە و لەقسەی ئەو کەسانەشی کەگوتوویانە قورەیش نوسین لەهۆزی ئەیادی عێراقەوە فێربوون نزیکترە لەڕاستیەوە و، ئەوان ئەم شیعرەیان کە هۆنراوەی یەکێك لەشاعیرەکانی ئەیادە بەبەڵگە دەهێننەوە: گەلێك کەهەرکات هەموویان بجولێن ساحەتی عێراق و خەت و نوسین و قەڵەم لەوانەوەیە. ئەم قسەیەش دوورە لەحەقیقەتەوە، چونکە ئەیاد هەرچەندە هاتنەناو عێراقەوە، بەلاّم بەلاّم لەسەر داب و نەریتی خۆیان و دەشتەکیەتیان بەردەوام بوون ئەمەلەکاتێکدا نوسین لەپیشەو صنعەتی شارنشینیە. بەڵکو مانای قسەکەی شاعیر ئەمەیە کەئەمان نزیکترن لەنوسین و قەڵەمەوە تاوەکو نەتەوەکانی تری عەرەب، چونکە ئەوان لەشارەکان و دەورووبەریانەوە نزیکترن. کەواتە بۆچوونی ئەوانەی کەدەڵێن خەڵکی حیجاز خەت و نوسینیان لەخەڵکی حیرەوە وەرگرتووە و فێری بوون و، خەڵکی حیرەش لەتەبابیعەوحەمیرەوە فێربوون لەهەموو قسەکانیتر نزیکترە لەڕاستیەوە و شایستەترە.

وەلەکتێبی تکامەی ئیبن الابار دا لەو بەشەی کەلەبارەی ئیبن فروخی قەیرەوانی فارسی ئەندەلوسی لەهاوەڵانی مالیك خودای لێ ڕازی بێت قسەی کردوە و بینیومە کەنوسیویەتی: وەناوی عبداللەی کوڕی فروخی کوڕی عبدالرحمانی کوڕی زیادی کوڕی ئەنعەمە و لەباوکیەوە دەگێڕێتەوە کەگوتوویەتی: بەعبداللەی کوڕی عباسم گوت ئەی هۆزی قورەیش لەبارەی ئەم نوسینە عەرەبیەوە هەواڵم پێ بدەن کەئایا ئێوە بەرلەوەی

کەخودا محمد(ص) بکاتە پێغەمبەر بەم خەتە دەتان نوسیو وەك ئەمڕۆ کەپیتگەلێك دەلکێنن بەیەکەوە ئێوەش دەتانلکاندن و، وەکەبەجیاش دەیاننوسین ئێوەش بەجیا دەتاننوسین وەك ئەلف و لام و میم و نون. گوتی بەڵێ، گوتم ئەم هونەرە لەکێوە فێربوون ؟ گوتی لەحەربی کوڕی ئومەییەوە.

گوتم ئەی حەرب لەکێوە فێری بووە ؟ گوتی لەعبداللەی کوڕی جودعانەوە. گوتم ئەی ئەو لەکێوە فێری بووە؟ گوتی لەگەشتیارێکی خەڵکی یەمەنەوە. گوتم ئەی ئەو لەکێوە فێری بوبو ؟ گوتی لەخەلجانی کوڕی قاسم کەنوسەری وەحی و سروشی هودپێغەمبەر بووە و ئەو کەسەیە کەئەم شیعرانەی چڕیوە: ئایا لەهەرساڵێکدا سوننەتێکی تازەمان بەسەرجدا فەرز دەکەن.

وەبیروباوەڕێك بەپێچەوانەی ڕێگە و شێوازی ژیانەوە دەگۆڕن ؟.

مردن لەو ژیانەی کەبەخراپە ناومان بهێنن باشترە، بەتایبەتیش کەجرهم و حەمیریش لەخراپە گۆیان بن.

کۆتایی ئەو ووتارەی کەئیبن الابار لەکتێبی تکملەدا هێناویەتی، وەلەکۆتایی ووتارەکەیدا دەڵێت: زنجیرەی سەنەدی ئەم حەدیسە بەم شێوەیە: ئەبو بەکری کوڕی حەمیرە بۆمنی گێڕایەوە لەکتێبەکەی خۆیدا لەئەبو بەحری کوڕی عاصیەوە و، ئەویش لەئەبو الولیدی وقشی و ئەویش لەئەبو عەمرەوە و تەلمەنکی کوڕی ئەبی عبداللەی کوڕی مفرح و بەخەتی خۆی گێڕامەوە لەسعیدی کوڕی یونسەوە و، ئەویش لەمحمدی کوڕی موسای کوڕی نعمان ئەویش لەیەحیای کوڕی محمدی حشیشی کوڕی عومەری کوڕی ئەیوبی مغافری تونسی لەبەهلولی کوڕی عوبەیدەالحمی، ئەویش لەعبدالله کوڕی فروخەوە، کۆتایی.

هۆزی حەمیر جۆرێك خەتیان هەبوو کەپێیان دەگوت مەسنەد. کەهەموو پیتەکانی مونفەصیلەبوون فێربونیان قەدەغەکرابوو مەگەر کەسێك مۆڵەت لەوان وەربگرێت. هۆزی موزەڕیش خەتی عەرەبی لەحەمیرەوە فێربوون، بەلآم ئەوان وەك هەموو ئەو پیشانەی

کەلەنێو دەشتەکیەکاندا هەبوو بەباشی فێری نەبوبون و جوان نەیاندەنوسی، چونکە دەشتەکیەکان بەباشی صەنعەت و پیشەکان فێر نەبوبون و کاریان لەسەر نەدەکردن چونکە ژیانی دەشتەکیەتی لەپیشەسازیەوە دوورە و بەزۆری بێنیازن لێی. هەربۆیە خەت‌و نوسینی عەرەب لەشێوەی دەشتەکیەتی بوو وەك ئەو خەت ونوسینەی کەلەم رۆژگارەدا هەیانە، بەڵکو ئێستە خەتەکەیان زۆر لەوکاتانە باشتر و جوانترە، چونکە ئێستە یان شارنشینن وەیان نزیکن لەشار نشینی و پیاوانی دەوڵەتەوە. هۆزی موزەڕ بەبەراورد بەخەڵکی یەمەن و شام و عێراق لەدەشتەکیەتەوە نزیکتر و لەشارنشینیەوە دوور تربوون، هەربۆیە خەت و نوسینی عەرەبی لەسەرەتای ئیسلامەوە لەڕوی پایەداری‌و جوانی و باشیەوە نەگەشتبوویە قۆناغی کۆتایی و کامڵبوون و تەنانەت مامناوەندیش نەبوو، چونکە عەرەب لەبارودۆخی دەشتەکیەتی و وەحشیگەریدا دەژیان و لەپیشەسازیەکانەوە دوور بوون.

دەبێت ببینین لەم ڕێگایەدا چ تێورگەلێك بەهۆی رسم الخەتی قورئان کەصەحابە بەخەت و دەستنوسی خۆیان نوسیویانەتەوە هاتووەتە ئاراوە. ئەوان بەخەت گەلێکی نارێك لەڕووی جوانی و بنەماکانی خەتەوە قورئانیان نوسیەوە و لەئەنجامدا زۆرێك لەرەسم الخەتەکانی ئەوان (واتە شێوازی نوسینەکانیان) پێچەوانەی یاساو رێساکانی صنعەتی خەت‌و ئەهلی هونەری خۆشنووسی بەپێچەوانەی قیاسەوە داویانەتە قەڵەم. لەپاشان تابیعینەکان وەك تەبەرك و پیرۆزی لەصەحابەی پێغەمبەرەوە (ص) ئەو شێوازەی خەتیان پەیڕەوکرد. هەمان ئەو صەحابانەی کەلەپاش پێغەمبەرەوە بەباشترینی مرۆڤەکان دێنە هەژمار و وەحیان لەکتێبەکەی خودا و فەرموودەکانی پێغەمبەرەوە وەرگرتبوو. هەروەك چۆن ئێستاکەش کەسانێك خەتی وەلی یان زانایەك بەپیرۆز دەزانن و شێوازی خەتەکەی ئیتر ڕاست بێت یان بەپێچەوانەوە پەیڕەوی لێدەکەن و، بەڵام هیچ لێکچوونێك لەنێوان ئەمان و ئەوەی کەصەحابە نوسیویانە بوونی

نیە، چونکە شێوەی صەحابە پەیڕەوی کراوە و پایەدارە و، زانایانیش ئاگاداری ئەو ڕەسم الخەتەن و لەبابەتەکاندا ڕوون بووەتەوە.

لەم بارەیەوە نابێت باوەڕ بەبۆچوونی هەندێك لەبێخەبەران بکەین کەدەڵێن صەحابە بەتەواوی ئاشنای هونەری خەت و نوسین بوون و بەباشی نوسیویانە، وەهەروەها ئەوانەشی کەپێیان وایە خەتەکەیان بەتەواوەتی پێچەوانەی بنەماکانی ڕەسم الخەت و نوسین بووە ڕاست نیە، بەڵکو هەموو ئەو جێگایانەی کەبەپێچەوانەی قیاسەوە دراونەتە قەڵەم دەتوانرێت ئاراستە بکرێن و دەڵێن لەبابەتێکدا وەك ئیزافەبوونی ئەلیف لە (لا اذبحنة)[98] ئەم زیادەیە تەنبیهیە لەسەر ئەوەی کەزبیح و سەربڕین ڕووی نەداوە و لەزیادکردنی یا دا لە(باييد)[99] ئەو یا زیادەیە تەنبیە و، ئاگادار کردنەوەیەکە لەسەر کامڵی و هێزی پەروەردگار، نمونەی ئەمانە لەو ئاراستەکردنانە کەهیچ بنەمایەکیان نیە و بێجگە لەوەی کەپشتیان بەبانگەشەی بێ بەڵگە بەستووە هیچی ترنیە و تەنها شتێکیش کەئەمانیان ناچار بەم ئاراستەکردنانە کردووە، ئەوەیە کەئەمان پێیان وایە بەم جۆرە ئاراستەکردن و تەوجیهانە صەحابە لەهەڵە و وەهم و لێنەهاتوویی لەخەت و نوسیندا بەدوور دەگرن و، پێیان وایە کەخەت نیشانەی کامڵی مرۆڤە هەربۆیە بەم کارەیان بەبڕوای خۆیان صەحابە لەنوقصانی ئەم کەماڵە بەدوور دەگرن و، کەماڵیان لەنوسین و خەتدا دەدەنە پاڵ و لەو حاڵەتانەی کەهەندێك جار خەتی صەحابە گونجاو نیە لەگەڵ بنەماکانی خەتدا ئەم جۆرە هەوڵانە دەدەن لەکاتێکدا شێوازێکی ڕاست نیە.

وەدەبێت ئەوە بزانین کەخەت و نوسین بۆ ئەوان لەکەماڵات نیە، چونکە ئەم هونەرە هەروەك باسمانکرد لەصنعەتە مەدەنیەکانە کەبۆ بەدەستهێنانی مەعاش بەکار دێت و کەماڵ لەشتە نیسبیەکانە و ڕەها نیە، چونکە نوقصانیەکەی لەزاتیدا ناگەڕێتەوە بۆ ئاین یان خەصڵەتەکان، بەڵکو نوقسانی صنعەت پەیوەستە بە هۆکارەکانی مەعاشی مرۆڤەوە

---

[98] س النمل ئا ٢١

[99] (والسَّماء َ بَنَيناهَا بِأيدٍ) س الزاريات ئا ٤٧.

بەپێی ئاوەدانی و هاوکاری لەپێناویدا پێشدەکەوێت بەپێی ئەو دەلالەتانەی کەلەدەروونەکاندا هەیە. پێغەمبەر (ص) نەخوێندەوار بووە و ئەم سیفەت بۆ ئەو پلە و پایەی ئەو لەکەمالاَتەکان دانراوە، چونکە ئەو لەوەرگرتنی پیشەسازیە کرداریەکان کەهەموویان بەهۆکاری مەعاش دادەنران بەدوور بووە. بەلاَم نەخوێندەواری و نُومی بوون بۆ ئێمە کەمالاَت نیە چونکە پێغەمبەر تەنها ڕووی لەخودای خۆیەتی و ئێمەش لەڕێگەی ژیانی دونیادا هاوکاری یەکتری دەکەین وەك هەموو پیشەسازی و تەنانەت زانستە زمانەوانیەکانیش، هەربۆیە کەمالّ لەبارەی پێغەمبەروە دووریە لەهەموو ئەمانەوە بەلاَم بەپێچەوانەوە لەبارەی ئێمەوە بەم شێوەیە نیە. ئەوکات لەبەر ئەوەی کەتازیەکان گەشتنە فەرمانڕەوایی و دەولّەتداری و شارە جۆراو جۆرەکانیان داگیر کرد چوونە بەصرە و کوفەوە و دەولّەتەکەیان پێویستی بەخەت و نوسین هەبوو، هونەری خەتیان بەکارهێناو لەگەڕان بەدوای ئەو هونەرەدا تێکۆشانیانکرد فێری بوون و بلاَویانکردەوە و لەئەنجامدا گەشتە قۆناغی پێشکەوتن و گەشانەوە و، لەبەصرە و کوفەدا لەڕووی جوانیەوە گەشتە پلەیەکی بەرز.

بەلاَم ئەلّبەت خوارتربوو لەقۆناغی گەشانە وەی کۆتایی، وەڕەسمی خەتی کوفی لەم سەردەمەدا بەناوبانگ بووە. ئەوکات تازیەکان لەسەرزەمین و وولاَتە جۆراو جۆرەکاندا بلاَو بوونەوە ئەفریقا و ئەندەلوسیشیان فەتح کرد و خاندانی عەباسیەکان شاری بەغدادیان بنیات ناوە و، لەو شارەدا لەپاش ئەوەی کە لەڕووی ئاوەدانیەوە گەشەی کرد خەت و نوسینیش گەشتە قۆناغی کۆتایی و ئەو شارە وەك پایتەختی ئیسلام (دارالاسلام) و ناوەندی دەولّەتی عەرەب دەژمێردرا و، چۆنیەتی خەت لەبەغدادا لەوەی کەلەکوفەدا بوو لەڕووی باشی و حەزکردن بەجوانکاری تێیدا جیاواز بوون و، ئەم جیاوازیەش لەسەردەمە جۆراو جۆرەکاندا جێگیر بوو تائەوەبوو لەبەغدا علی کوڕی مقلەی وەزیر دەرکەوت و ئالاَی خەتی بەرزکردەوە و، دوای ئەویش علی کوڕی هیلالی نوسەر (کاتب) ناسراو بەئیبن الابواب هەمان ئەو شێوازەی ئەوی پەیڕەو کرد و، سەنەدی فێربوونی خەت

لەسەدەی سێیەم و دواتریشدا لەسەر ئەو سەلمێنرا و شێوازەکانی خەتی بەغدادی و شێوەی پیتەکانی لەگەڵ خەتی کوفیدا جیاوازی پەیدا کردوو، تاوەکو سەرئەنجام بەتەواوەتی لەیەکتر جیابوونەوە. وەلەپاش سەردەمی جیاوازی ناوبراو لەئەنجامی تەفەنون واتە هونەرکردن شارەزاو پسپۆرانی شێوازەکانی خەت زۆر بوون تاوەکولەپێشینانەوە گەشتە پاشینان، وەك یاقوت و علی عجمی کەیەکێکە لە ئەولیاکان‌و سەنەدی فێربوونی خەت بۆ ئەوان سەلمێنرا و، ئەم شێوازە گوازرایەوە بۆ میسر و لەهەندێك بەشدا دژی شێوازی خەتی عێراقی بوو ئەو ئێرانیانەی کەلەعێراقدا دەژیان فێری بوون و لەئەنجامدا بەتەواوی لەگەڵ خەتی خەڵکی میسردا جیاوازی پەیدا کرد. وەڕەسمی خەتی ئەفریقایی کەشێوە کۆنەکەی تاوەکو ئەم ڕۆژگارەش بەناو بانگە نزیك بوو لەخەتی خۆرهەلاتەوە.

وەلەبەر ئەوەی کەسەڵتەنەتی ئەمەویەکان لەووڵاتی ئەندەلوسدا جێگیر بوو نەژادی ناوبرا و لەڕووی شارستانیەت و پیشەسازیەکان و خەتەوە بوونە خاوەنی بارودۆخێکی تایبەت و، لەئەنجامدا خەتی ئەندەلوسی کەتایبەت بوو بەو نەژادەوە لەناو خەتەکانی تردت دەناسرایەوە، هەروەك چۆن ڕەسمی خەتەکەشی تاوەکو ئەم سەردەمەبەناوبانگ بووە. وورده وورده ئاوەدانی کۆمەڵگەئیسلامیەکان گەشەیانکرد وەك دەریایەکی گەورە فراوانبوون و دەوڵەتی ئیسلام گەشتە هێز و دەسەلات و بازاڕی زانستەکان ڕەواجی پەیدا کرد و، کتێبەکان کۆپی دەکران و بەخەتی جوان و خۆش دەنوسرانەوە بەشێوەیەکی زۆر جوان بەرگیان دەگرتن و کۆشك و گەنجینە و تەلاری پاشاکان پڕبوون لەو کتێبانەی کەهاوشێوەیان زۆر کەم بوو، هەموو ناوچە وسەرزەمینەکان دەستیانکردە کێبڕکێ لەم بوارەدا. بەلأم لەپاش ئەوەی کەپێکهاتەی دەوڵەتی ئیسلامی لەیەك ترازا و هەموو ئەو پێشکەوتنانەش وەستان و بەهۆی لەناوچوونی دەزگای خەلافەتەوە ئەو هەموو یاساو ڕێسای زانست و هونەرە کەلەبەغدا بوو ئەویش لەناوچوو کوژایەوە، مەسەلەی خەت و نوسین و بگرە زانستیش لەبەغدادەوە گوازرایەوە بۆ میسر و قاهیرە کەتاوەکو ئێستەش

ڕەونەق و بازاڕیان لەو وولاتەدا هەرماوە و، مامۆستاگەلێکی تایبەتیان هەیە بۆ خەت و نوسین کەشێوە و تایبەتمەندیەکانی پیتەکانیان بەپێی یاساو ڕێساگەلێکی دیاری کراو کەلەنێویاندا باو بووە وێنا دەکەن و بەم شێوەیە خەت و نوسین فێری قوتابیەکانیان دەکەن کەبەشێوەیەکی حیسی واتە هەستپێکراو فێری دەبن و، وەهەم لەڕووی زانستی واتە لێزانی و شارەزاییەوە لەنوسینیشدا و هەم لەڕوانگەی تیۆریشەوە واتە فێربوونی یاسا زانستیەکانیەوە توانا پەیدا دەکەن و، باشترین شێواز بەدەست دەهێنن. بەڵام لەئەندەلوسدا و لەپاش ئەوەی کە فەرمانڕەوایی عەرەبو بەربەرەکان، کەلەپاش ئەوان گەشتنە فەرمانڕەوایی لەو سەرزەویەدا لەناو چوو نەتەوە مەسیحیەکان ئەو ناوچانەیان داگیر کرد و، موسوڵمانانی ئەندەلوسی لەکەنارەکانی مەغریب و ئەفریقادا بڵاوەیانکردو لەسەرەتای دەوڵەتی لمتونیەوە تاوەکو ئەم سەردەمە لەو ناوچانەدا نیشتەجێ بوون و بەهۆی ڕەواجدان بەو پیشەسازیانەی کەدەیانزانی لەگەڵ خەڵکی ئەو سەرزەمینانەدا لەئاوەدانی شارستانیەتدا بەشداریانکردو، خۆیان لەدەزگای دەوڵەت نزیککردەوە کەم کەم خەتی ئەوان زاڵبوو بەسەر خەتی ئەفریقادا و، ڕەواجێکی زیاتری پەیدا کردو بەهۆی لەبیرکردنی ئەو داب و نەریت و پیشەسازیانەی کە لەقەیرەوان و مەهدیەدا هەبوون خەتی ئەوانیش لەبیر چوویەوە.

ڕەسمی خەتی ئەندەلوسی کەلەتونس و ناوچەکانی نزیك لەو کاری پێدەکرا بوویە جێگری هەموو خەتەکانی خەڵکی ئەفریقا، چونکە لەوکاتەی کە خەڵکی ئەندەلوس لەخۆرهەلاتی ئەو وولاتەوە کۆچیانکرد و پەنایان بردە ئەفریقا کۆمەڵێکی زۆریان لەتونسدا نیشتەجێ بوون و، لەخەتی کۆنی ئەفریقی تەنها کۆمەڵێك نیشانە لەوولاتی جرید مابوویەوە کەخەڵکەکەی لەگەڵ خۆشنووسە ئەندەلوسیەکاندا تێکەڵیان نەدەکرد و لەگەڵیاندا نەژیابوون، چونکە ئەندەلوسیەکان تەنها هاتووچۆی تونسی پایتەختی ئەفریقایان دەکرد. هەر لەبەر ئەمەیە کەخەتی خەڵکی ئەفریقا بەباشترین خەتەکانی خەڵکی ئەندەلوس دادەنرێت ئەم بارودۆخەش لەئەفریقادا بەردەوامبوو تائەوکاتەی هێزو

توانای مووەحیدان کەمیکرد و، بەهۆی دواکەوتنی ئاوەدانیەوە بارودۆخی شارستانیەت و جوانپەرستیش هەرەسی هێنا. لەم کاتەشدا خەتیش دووچاری هەمان چارەنوسی پیشەسازیە شارستانیەکانی تر بوویەوە و داب و نەریتەکانی لەناو چوون و، بەهۆی خراپ بوونی شارستانیەت و نوقسان بوونی ئاوەدانی شێوەی فێربوونی ئەو خەتەشیان لەدەستدا و تەنها شوێنەوارگەلێك لەخەتی ئەندەلوسی مایەوە کەگەواهیدەری ئەندازەی شارستانیەت و گەشانەوەی ئەوان بوو لەخەت و نوسیندا، چونکە لەلاپەڕەکانی پێشوودا باسی ئەوەمانکرد کە هەرکات پیشەسازیەکان لەشارستانیەتدا ڕەگ و ڕیشە دابکوتێت ئەوا سڕینەوەیان زۆر دژوارە.

لەدەوڵەتی خاندانی مەرینیەکاندا کەکەوتووەتە مەغریبی ئەقصاوە (مەراکیش) جۆرێك لەخەتی ئەندەلوسی کاری پێدەکرا چونکە ئەوان لەتونسەوە نزیك بوون بەهۆی ئەم نزیکیەشەوە ئەو ئەندەلوسیانەی کەلەو وولاتەدا بەهۆکار گەلێك دەچوونە دەرەوە بەرەو فاس دەڕۆشتن، دەوڵەتی مەرینیەکان لەسەردەمی فەرمانڕەوایی خۆیدا سودی لەوان وەردەگرت. لەپاش ئەوەش خەت و نوسین لەبارەگای دەوڵەت و پایتەختدا بەجۆرێك لەبیر چوویەوە کەهەروەك بڵێی لەسەرەتاوە بوونی نەبووبێت و، لەئەفریقاو مەغریبدا خەت بەرەو لاوازی و خراپی ڕۆشت و جوانی خەت و نوسین بەتەواوەتی لەناوچوو. بارودۆخی کتێبەکان گەشتە ئاستێك کەئەگەر کتێبێك کۆپی بکرایە ئەوا خوێنەرەکەی بێجگەلە نارەحەتی و ماندوبوون هیچ سودێکی وەر نەدەگرت، چونکە فەساد و تەصحیفێکی فراوان چووبووە ناوخەتەوە شێوەی پیتەکان و ڕەسمەکەیان بەگشتی گۆڕابوو هیچ جوانیەکی پێوە نەمابوو، وای لێهاتبوو کە زۆر بەسەختی بتوانرێت بخوێنرێنەوەئەم داڕوخانەش بەهۆی نوقسانبوونی شارستانیەت و کۆمەڵگەوە خراپ بوونی دەوڵەتانەوە نەوەك تەنها لەخەت و نوسیندا، بەڵکە کاریشی کردبوویە سەر بوارە

پیشەسازیەکانی تریش، خودا حوکم دەکات کەس ناتوانێت ئەو حوکمەی ڕەت بکاتەوە[100].

وەمامۆستا ئەبو الحسن علی کوڕی هیلال کاتیبی بەغدادی ناسراو بەئیبن الابواب قەصیدەیەکی هەیە لەبەحری بەسیتدا بەڕوەیی ڕا، کەتێیدا صەناعەتی خەت و مادەکانی باسکردووە و قەصیدەی ناوبراو لەباشترینی ئەو یاساو دەستورانەیە کەلەمبارەیەوە نوسراوەو، منیش پێم باش بوو لەم بەشەدا ئاماژەی پێبکەم بۆ ئەوەی کەئەوانەی حەزبەفێربوونی ئەم هونەرە دەکەن سودی لێوەربگرن و قەسیدەکەش بەم شێوەیە دەست پێدەکات:

ئەی ئەوکەسەی کەدەتەوێت بەجوانی نوسین فێرببی.

وەبەشوێن جوانی خەت و تەصویردا دەگەڕێیت.

ئەگەر لەهونەری نوسیندا لەسەر عەزمی خۆت پایەداری.

ئەوا بۆ ئاسانکاری و پێشکەوتن پەنا بۆ مەولای خۆت بەرە.

لەنێوان (نی) قامیشەکاندا جۆرێك هەڵبژێرە کەڕاست و ڕەق بێت بۆئەوەی بەباشی توانای هونەری نوسینت هەبێت.

وەهەرکات بتەوێت قەڵەمەکەت دابدەیت لەکاتی ئەندازەگیریدا ناوەڕاستەکەی لەبەر چاو بگرە.

سەیری هەردوو سەرەکەی بکە و ئەوکات ئەو سەرەی کەباریکترە دایبدە.

هەرلەجێگەی دادانی قەلەمەکەوە تاوەکو نوکەکەی بەجۆرێك دایبدە کەبەشێوەیەکی ڕاست بێت و نەدرێژ بێت نەکورت.

سەری قەڵەمەکە لەناوەڕاستەوە دروستبکە بۆ ئەوەی دادانەکە لەهەردوو لاکەیەوە یەکسان و یەك ئەندازە بێت.

---

[100] (وَاللَّهُ يَحكُمُ وَلامُعَقِبَ لِحُكمة) س الرعد ئا ٤١.

وەهەرکات ئەم یاساو ڕێسایانە بەلێزانیەوە وەك کەسێك کەلەکارەکەی خۆیدا گورج و گۆڵە بەئاگاییەوە ئەنجامیان بدەیت.

ئەوکات هەموو بڕیاری خۆت بۆ بڕین ئامادە بکە چونکە بڕین لەدادان و تاشینی قەڵەمدا لەهەموو شتەکان گرنگترە.

نابێت چاوەڕێی ئەوە بکەیت کەمن هەموو نهێنیەکانی ئەم هونەرەت بۆ ئاشکرابکەم چونکە من لەم کارەدا بەخیلی دەکەم.

بەڵام پوختەی یاساو ڕێساکەی من ئەوەیەکە دەبێت سەری قەڵەمەکەی خڕو بازنەیی بێت و لەهەمانکاتیشدا نوکەکەی زۆر تیژ بێت.

ئەوکات مرەکەبێك بکەرە ناو دەواتەکەتەوە کەلەخەڵوزی ڕەش لەگەڵ سرکەدا یان ئاوی غورە دروستکرابێت.

وەدەبێت گڵی سوور کە لەگەڵ زرنیجی زەردو کافوردا کوترابێت تێکەڵی بکەین.

وەکاتێك کەئەم تێکەڵیە بەپێی پێویست تێکەڵ ببێت و بترشێنرێت.

ئەوکات دەبێت کاغەزێکی سپی نەرمی تاقیکراوە هەڵبژێری لەپاشان کاغەزەکە لەپاش بڕین دەبێت بیخەیتە ژێر کەرەستەیەکی قورسەوە بۆ ئەوەی پەستان بکەوێتەسەری. بۆ ئەوەی لەچرچ و لوچ بوون بەدوور بێت.

لەپاش ئەوە سەرباسی نوسینەکەت بەژیری و لێزانیەوە بنوسە، چونکە هیچکەسێك وەك مرۆڤی لەسەر خۆو لێزان ناتوانێت بگات بەئامانجەکانی.

سەرەتا لەسەر لەوحەکە نوسینەکە دەست پێبکە.

وەعەزمی خۆت وەك شمشێری بڕان ئامادە بکە.

لەسەرەتای دەستپێکردنی ڕاهێنان و نوسیندا نابێت لەناخۆشی خەتەکەت شەرم بکەیت.

چونکە هەرکارێکی دژوار و سەخت سەرئەنجام ئاسان دەبێت.

ئیتر ئەگەر بێت و ئەو شتەئاسانە لەپاش دژواریەوە بەدی بێت.

تائەوکاتەی کەبگەیت بەئارەزوەکانت.

ئەوکات زۆر خۆشحاڵ و شادمان دەبیت.

کەواتە سوپاسی خودای خۆت بکە و بەشوێن ڕەزامەندی ئەودا بگەڕێ و، ئەڵبەت خودا وەلآمی سوپاسگوزاران دەداتەوە.

وەهەمیشە حەزت لەوەبێت کەپەنجەو دەستەکانت بابەت سودبەخش و چاکەکان بنوسن بۆ ئەوەی لەم دونیا هەڵخەڵەتێنەرەدا یادگاریەکی باش لەدوای خۆت بەجێ بهێڵی، چونکە لەڕۆژی قیامەت و لەکاتی ڕووبەڕوو بوونەوەی مرۆڤدا لەگەڵ زیندوو بوونەوە و حەشر و نەشردا هەموو کارەکانی دەهێنرێنەوە پێش چاوی.

وەدەبێت ئەوە بزانین کەخەت کوفتارو قسەی مرۆڤ بەیان دەکات و، هەروەك چۆن کەگوفتار و قسە ئەو مانایانەی کەلەناخ و ویژدانی خەڵکیدا بوونیان هەیە دەردەخات هەربۆیە بەناچاریەوە خەت و گوفتار هەردووکیان دەبێت لەڕووی دەلالەتەوە ڕوون و ئاشکرابن و مەبەست بگەیەنن. خوداش دەفەرمێت: مرۆڤی دروستکرد و فێریشی کرد[١٠١].

وەئەوەش هەموو دەلالەتەکان دەگرێتەوە. کەواتە کامڵبوونی خەتی باش لەوەدایە کەماناو دەلالەتەکەی ڕوون و ئاشکرابێت بەجۆرێك ئەو پیتانەی کەدانراون بەڕوونی مانابگەیەنن و شێوە و ڕەسمی هەریەکەیان بەجیا زۆر جوان و لەیەکتریش جیابن، مەگەر ئەو پیتانەی کەلەبەکارهێنانی خۆشنووسەکاندا دەبێت لەیەك ووشەدا بلکێن بەیەکەوە (حروف متصله)، وەگەرنا پیتە جیاکان (حروف منفصله) وەك ئەلف و ڕاو زاو دال زال و..... هتد کاتێك کەدەکەونە سەرەتای ووشەوە جیان و کاتێکیش کەدەکەونە کۆتاییەکەیەوە دەلکێنرێن بەیەکەوە.

بەلآم لەنێو نوسەرە تازەکاندا واباوە کە لەهەندێك لەووشەکاندا بەشەکانیان دەلکێنن بەیەکەوە و ئەو پیتانەشی کەلەلای ئەوان دیارن دایاندەنێن، هەروەك چۆن بێجگەلەئەهلی زاراوە کەسی تر نایانزانێت و هەربۆیە خەڵکی تر لەدەرکی ئەم ووشانە بێتوانا دەبن،

---

[١٠١] (خَلَقَ الإنسانَ عَلَّمَهُ البَيان) س الرحمن ئا ٢، ٣.

ئەمانەش کاتبەکانی دیوانەکانی سوڵتان و نوسینگەکانی دادگان. هەروەك بڵێی تەنها ئەم گروپە ئاشنایەتیان لەگەڵ زاراوەکاندا هەیە و خەڵکی تر نایانزانن، چونکە ئەوان بەردەوام سەروکاریان لەگەڵ جۆرەهاخەت و ڕەسمدا هەیە شێوازی خەتەکەیان بەناوبانگە و کەسانێکی تری بێجگە لەخۆشیان دەیانزانن. بەڵام ئەگەر ئەم شێوەیە بۆ کەسانێك کەزاراوەکانی ئەمان نازانن بنوسنەوە ئەوا شتێکی ڕاست نیە، بەڵکو دەبێت لەم جۆرەکاتانەدا لەم شێوازە لابدەن و تائەندازەیەکی باش ووشەکان بەجۆرێك بنوسن کەبەئاسانی بخوێنرێنەوە، وەگەرنا خەتەکەیان وەك خەتێکی بێگانەی لێدێت چونکە لەڕووی مانا نەبەخشینەوە یەکسانن.

لەم بارەیەوە تەنها دەتوانین بیانووی ئەو کاتیبانە قبوڵبکەین کەلەدیوانە سوڵتانیەکاندا کار دەکەن و، ئەرکی ئەوەیان پێ سپێردراوە کە دارایی و لەشکرەکانی سوڵتانەکان لەدەفتەرەکاندا تۆمار بکەن و هەوڵبدەن کەنەکەونە دەست کەسانی تر و یان ئەگەریش بکەون ئەوا بەجۆرێك بیاننوسن کەهیچ کەسێك بێجگە لەخۆیان لێیان تێنەگات، چونکە ئەم جۆرە بابەتانە لەنهێنی پاشاکانن کەدەبێت بەنهێنی بیانهێڵنەوە. هەربۆیە ئەوەندە لەنوسینی ئەو جۆرە زاراوانە کەتایبەتن بەم بوارەوە زیادە ڕەوی دەکەن وەك مەتەڵێکیان لێدێت و، زاراوەکانیشیان بریتین لەبەکارهێنانی ناوگەلێکی وەك ناوی بۆنخۆشی و میوەکان و باڵندە و گوڵەکان و شێوەگەلێکی تر دادەنێن، بێجگە لە شێوەی پیتە ئاساییەکان کەخەڵکی لەنوسیدا بۆ دەربڕینی دەستەواژەکانی خۆیان بەکاریان دەهێنن. وەهەرچەندە کەنوسەرەکان بۆ زانینی ئەم جۆرە شێوازانە یاساگەلێك دادەنێن، هەرچەندە لەسەرەتاوە دایان نەناون، کەپێوەرگەلێکی دیاری کراویان هەیە و بەنیسبەتی تێگەشتنی خۆیان دەریان دەهێنن و ناوی دەنێن (کلیلی مەتەڵەکە). لەم بارەیەوە لەنێو خەڵکیدا دەفتەرگەلێکی بەناوبانگ بوونیان هەیە. خوداش دانای حەکیمە[١٠٢].

---

[١٠٢] (إِنَّهُ هُوَالعَلِيم الحَكِيم) س یوسف ئا ٨٣.

# بەشی سی و یەکەم

## لەبارەی صەنعەتی صەحافیەوە[١٠٣]

لەسەردەمی کۆندا بەهۆی گەورەیی دەوڵەت و پێشکەوتنی پێداویستیەکانی شارستانیەتەوە گرنگیەکی زۆر بەکۆپیکردن و تەجلید (بەرگ تێگرتنی) و، ڕاستکردنەوە (تصحیحی) دیوانە زانستی تۆماری (نوسینگەکان)[١٠٤] دراوە لەڕێگەی ڕیوایەت وضبط[١٠٥] هەوڵی زۆر دراوە. بەلام لەم سەردەمەدا بەهۆی لەناوچوونی دەوڵەتەوە (دەوڵەتی گەورەی ئیسلامی)، هەرەسهێنانی ئاوەدانی ئەم ئاراستەیەبوونی نیە ئەمە لەکاتێکدا لەسەردەمە پێشووەکاندا گەشەی صەحافی لەعێراق و ئەندەلوسدا وەك دەریایەکی بێبن وابووە، چونکە هەمووکاروبارەکانی پەیوەست بەم هونەرەوە لەپێداویستیەکانی ئاوەدانی دەژمێردرا هۆی پێشکەوتن و گەشەو فراوانبوونی فەرمانڕەوایی دەوڵەتە نابراوەکان بوو بەهۆکاری ڕەواجی ئەم هونەرە دەژمێردرا، لەهەردوو دەوڵەتی ناوبراوو زۆربوونی دانراوە زانستی دیوانە جۆراوجۆرەکان دەژمێردرا وەخەڵکی هەر سەردەم و هەر سەرزەمینێك حەزیان بەگواستنەوەی کتێبە ناوبراوەکان بوو، هەربۆیە کتێبەناوبراوەکان کۆپی و

---

[١٠٣] پیشەی صەحافی لەو ڕۆژگارەدا سەرەڕای صەحافی و بەرگ تێگرتنی کتێب بەکۆپیکردن و تەصحیحی کتێبیش گوتراوە کە (وراقە) شیان پێ گوتووە.

[١٠٤] وەرگیراوە لەووشەی لاتینی sigillum وە وەرگیراوە کەچەندین مانای هەیە، لەوانەش بە دەفتەری تۆمارە گشتیەکانی قەید و مقاولات و مامەڵەکان گوتراوە کەلەعەرەبیشدا هەربەم مانایە بەکار دێت (یاداشتی دسلان لا ٤٠٦ ب ٢)

[١٠٥] لیرەدا ووشەی ضبط بەمانای ڕاستکردنەوە و نیشانە دانانی خەت هاتووە.

تەجلید دەکران و صەنعەتی صەحافی دەرکەوت و صەحافەکان کۆپی تەجلیدو تەصحیح و کاروبارەکانی تری صەحافی نامەکانی دیوان و کەرتەکانو، چەکەکانیان لەسەر چەرمو پێستەی ناسك دەنوسیەوە کەپیشەگەران بەشێوەیەکی زۆر جوان و هونەری دروستیان کردبوون، ئەمەش بەهۆی زۆری خۆشگوزەرانی و هەروەك باسیدەکەین کەمی دانراوەکان لەسەرەتای ئیسلام فراوان نەبوونی نامەکانی دیوان و چەکەکان بوو لەو سەردەمەدا، هەربۆیە لەڕووی گرنگیدان بەنوسینەکان و ڕاستی و دروستیان تەنها کاریان لەسەر کاغەزە پێستەییەکان دەکرد.

بەڵام هێندەی نەخایاند کە دانان و تەدوین وەك دەریایەکی بێبن فراوانبوو گەشەی کردو نامەکانی دیوان و چەکەکانیش زۆربوون و کاغەزە پێستەییەکان کەمبوونەوە و، بەشی پێویستیەکانی نەدەکرد، هەربۆیە فەزڵی کوڕی یەحیا فەرمانیدا کەکاغەز دروستبکەن و کاتێکیش کەکاغەز دروستکرا فەرمانیدا نامەکانی دیوان و چەکەکانی سوڵتان لەسەر کاغەزی ئاسایی بنوسن و دواتریش خەڵکی ئەم کاغەزەیان لەو نامەو نوسراوانەی کەبۆ کاروبارەکانیان بۆ سوڵتان و دارودەستەکەیان دەنارد سودیان لێوەرگرت و، وەهەروەها بۆ نوسینی کتێب و کارەزانستیەکانیش بەکاریان دەهێنان و تائەو جێگەیەی کەویستیان پیشەسازی کاغەزیان پەرەپێدا و، بەباشترین شێوە دروستدەکرا. لەپاش ماوەیەك زاناکان و پیاوانی دەوڵەتەکان دەستیانکردە ڕێکخستن و ڕاستکردنەوەی دیوانە زانستیەکان بەجۆرێك کەڕیوایەتەکەیان دەگێڕایەوە سەر نوسەر و دانەرەکان. چونکە گرنگترین مەبەست لە تەصحیح و زەبتی کتێبەکان هەرئەمەیە بەم شێوەیە قسەکان بۆ بێژەرەکان و فتوا بۆ موفتی و موجتەهیدەکان کە دەریان هێنابوون، دەگێڕدرایەوە چونکە تاوەکو هەر دەقێك لەڕێگەی ئیسنادەکەیانەوەنەگەیەنرێتە دانەرەکانیان و ڕاستکردنەوەی بۆ نەکرێت ئەوکات دانەپاڵی قسە یان فتوایەك بۆلای هەر کەسێك دروست نیە. وەئەرکی زانایانیش لەسەردەمەکانی پێشوو لەسەرزەمینە جۆراو جۆرەکاندا بەم شێوەیە بووە، هەروەك چۆن سودی هونەری حەدیس لەبارەی ڕیوایەتەوە

تەنها لەسەر ئەم بەڵگەیە کورتکرابوویەوە، چونکە گەورەترین بەرهەم و دەرئەنجامی ناسینی حەدیسە صەحیح و حەسەن و موسند مرسل مقتوع و موقوف لەناو چووەو ناوەڕۆکی حەدیسەکان بریتی بوون، لەو حەدیسە دایکانەی (امهات) کەلەلای ئومەتەوە قبوڵکرابوون و مەبەست لەوەش بەلەغو دەهاتە هەژمار بۆ سود وەرگرتن لەڕیوایەتەکانو، سەرقاڵبوون پێیەوە هیچ ڕێگەیەك نیە بێجگە لەڕاستکردنەوەی دایکەکانی زانستی حەدیس و کتێبە فیقهیەکانی تایبەت بەفتوا و دیوان و دانراوە زانستیەکان و پەیوەندی سەنەدەکانیان بەدانەرەکانیانەوە بۆ ئەوەی گێڕانەوە لەو دایك (امهات)و ئیسنادانە بۆلای ئەوان ڕاستبێت، وەڕێگەی ئەم نەریت و یاسایانە لەخۆرهەلاتو ئەندەلوسدا ساف و هەموار بوو.

هەربۆیە دەبینین ئەو دیوانانەی کەلەو ڕۆژگارەدا لەسەرزەمینەکانی خۆرهەلات و ئەندەلوسدا کۆپی کراون لەو پەڕی پایەداری و ڕاستیەتی و ووردەکاریدان و ئەو دەقەکۆنانەی کەئەمڕۆکە لەدەستی خەڵکی گێتیدا ماون، گەواهی ئەوە دەدات کەزاناکانو هونەمەندانی ئەو سەردەمە لەمبارەیەوە گەشتوونەتە ئەوپەڕی کامڵبوون خەڵکی جیهانیش تاوەکو ئەم سەردەمە لەوانەوە دەگێڕنەوە لەڕووی تۆکمەیی و دەگمەنی نوسخەکانەوەو بەئەمانەت دانیان بەیەکتری ئیرەیی بەیەکتری دەبەن. بەلأم لەم سەردەمەدائەو داب و نەریتە بەگشتی لەناو مەغریب و مەغریبیەکاندا نەماوە، چونکە هونەرەکانی خەت و زەبت و ڕیوایەت بەهۆی نوقسانی ئاوەدانیەوە لەو سەرزەمینەدا و خوی دەشتەکیەتی و خەڵکەکەی بەرەو لەناوچوون ڕۆشتوون کار گەشتووەتە جێگەیەك کەئومەهات و دیوانە زانستیەکان بەخەتی دەشتەکیەکان دەنوسنەوە و قوتابیانی بەربەر ئەوانیان لەکتێبە پڕ لەهەڵەکاندا و بەخەتێکی خراپەوەو، تەصحیف و کۆپی دەکەن و ئەوکات کەسێکیش کەبیەوێت ئەم جۆرە کتێبانە بخوێنێتەوە و لێکۆڵینەوەیان بکات ئەوا کارەکەی دژوار دەبێت و بیجگە لەهەندێك شوێنی کەمدا نەبێت سودێکی ئەوتۆیان لێوەرناگرێت. وەهەروەها بەهۆی ئەم بارودۆخەوە کەموکورتیش دەکەوێتە فتواکانەوە،

چونکە زۆربەی ئەوقسانەی کەلەپێشینانەوە دەگێڕنەوە لەپێشەوای مەزهەبەکانەوە نەگێڕدراوەتەوە، بەڵکو ئەوانەیان لەم دیوانە لێکۆڵینەوە نەکراوا نەدا بەوجۆرەی کەهەیە وەریانگرتوون و ئەم شێوازەش لەنوسین و دانانەکانیاندا پەیڕەو دەکەن و هەندێك لەپیشەواکانیان کەدەستدەکەن بەنوسین و دانانی کتێب بەهۆی نەبوونی بەصیرەت بەهونەری دانان و، نەبوونی هونەر و فەنەپێویستەکانەوە بۆ ئەم مەبەستە دەبینین کتێبگەلێکی کەم بەها دادەنێن.

وەلەم هونەرەش لەئەندەلوسدا بێجگە هەندێك پاشماوە شتێکی ئەوتۆ نەماوەتەوە کەئەویش بەرەو نەمان دەچێت، وەنزیکە کەزانستەکە بەتەواوەتی لەمەغریبدا بنەو بارگەی بپێچێتەوە و نەمێنێت، خوداش زاڵە بەسەر کاروبارەکانیدا. بەڵام بەپێی ئەو هەواڵانەی کەبەئێمە گەشتووە ئێستەش لەخۆرهەڵاتدا هونەری ڕیوایەت و گێڕانەوە بەردەوامە و کەسێکیش بیەوێت دیوانەکان ڕاستبکاتەوە ڕووبەڕووی کێشەی ئەوتۆ نابێتەوەو ڕێگەبۆ خوازیاری کراوە و کارەکەی ئاسانە، چونکە هەروەك باسی دەکەین بازاڕی زانست و هونەرەکان لەو سەرزەمینەدا ڕەونەقی هەیە، بەڵام خۆشنووسی کەلەوێدا بۆ کۆپیکردن ماوەتەوە تایبەتەبەخەڵکی ئێرانەوە و بەخەتی ئەوان دادەنرێت، بەڵام لەمیسردا کاری کۆپیکردنی کتێبەکان وەك مەغریب خراپ بووە بەڵکو لەو سەرزەمینەشدا نەماوە، خوداش زاڵە بەسەر کارەکانی خۆیدا.

# بەشی سی و دووەم

## لەبارەی هونەری گۆرانیەوە ( دەنگ خۆشی )

ئەم هونەرەش بریتیە لەئاوازدان بەشیعرو هەڵبەستەوەزنو قافیەدارەکانە لەڕێگەی پچڕ پچڕ کردنی ئاوازەکان بەڕێژەگەلێکی ڕێکی دیار (لەزانستی مۆسیقادا) یە کەلەسەر هەرئاوازێکی لەکاتی پچڕاندا (توقیع)[١٠٦] ێکی تەواو دروستدەبێت. وەئەوکات یەك نەغمەو ئاوازی خۆش دروستدەبێت، لەپاشان ئەم ئاوازە بەپێی نیسبەتگەلێکی دیاریکراو تێکەڵ بەیەکتری دەبن و بەهۆی ئەم گونجاویەشەوە ئەو چۆنیەتیە تایبەتەی کەلەودا لەم ئاوازانەوە بەدی دێت بیستنیان لەزەت بەخش و خۆش دەبێت، چونکە لەزانستی مۆسیقادا ئەوە باسکراوە کە ئاوازەکان خاوەن گونجانێکی تایبەتن، هەروەك چۆن

[١٠٦] لەزمانەوانیدا هەروەك لەمنتهی الاربدا هاتووە بەمانای جۆرێکە لەڕەفتاری ئەسپ، وەك تەلقیف وایە و بریتیە لەبەرزکردنەوەی هەردوو دەست. منتهی الارب. وەئەگەر ئەم ووشەیە تحریفی ئیقاع نەبێت دیسانەوە دەتوانین بڵێین لەبەکارهێنانی مەغریبدا بەم مانایە کەلەگەڵ هەنگاودا گونجاوە و لەبری ئیقاع بەکاریان هێناوە وەئیقاع یان هەنگاو لەمۆسیقادا بابەتێکی دوور و درێژە. خواجە نەصیر دەڵێت: لەزانستی ئیقاعی هونەری مۆسیقادا وادانراوە کە ڕوودانی وەزنەکان لەنوکە پەنجە وەشاندنە یەك لەدوای یەکەکانەوە بێت وەلەو سکونو وەستانە گونجاوانەی کەدەکەوێتە نێوان وەشاندنی نوکە پەنجەکاندا، لەبەر ئەوەی کەئەیانەوێت تەعبیری لێبکەن و بەپێی نوکە پەنجەوەشاندنەکانی حەرفە موتەحەڕیکەکان بیهێنن تایبەتمەندی ئەوپیتانەی کەلەدەرچوونی هەناسە لەمەخرەجی ئەو پیتانەوە لەپاش ڕاگرتنی تەواو ڕوویدات، وەك تا و تانی عەرەبی و بتوانێت بەپێی سکونی حەرفەکان ساکن ببێت بۆ نمونە دەڵێن تن تن، بەڵام لەوەزنی شیعریدا حەرفە موتەحەڕیکەکان لەهەر ڕەگەزێك بن لەبری وەشاندنی سەرپەنجەکان بن و پیتە ساکنەکانیش لەبری ساکنەکان (معیار الاشعار لا ١١).

ئاوازێك نیوەی ئاوازێكە و ڕوبعێكی ئەویترە و پێنج یەكی ئەوی دیكەیە و بەشێكە لەیازدە ئاوازەكەی تر، وەلەكاتی گەشتنی ئاوازەكە بەگوێ جیاوازی ئەم ڕێژەو نیسبەتانە ئەو ئاوازە لەسادەییەوە دەگۆڕێت بۆ تەركیب یان پێكهاتوو، بەڵام هەرجۆرە تەركیبێك لەوانەوە لەكاتی بیشتندا خۆش نیە، بەڵكو تەركیب گەلێكی تایبەت دەبنە مایەی خۆشی كەمۆزیك زانەكان دیاریان كردوون و باسیان كردوون. هەندێكجار كاری تەرەنم و ئاواز لەئاوازەكانی گۆرانیدا سەردەكێشێت بۆ ئەوەی كە دەستدەكەن بەتەقتیعی ئاوازگەلێكی تر لەبێگیانەكانەوە (جمادات)، وە ئەوەش بەهۆی ژەنین یان لێدانە لەشتانێك كەبۆ ئەم مەبەستە هەڵدەبژێردرێن بەم شێوەیە ئاوازەكە لەكاتی بیستندا خۆشیەكی وپاتر دەبەخشێت.

لەم سەردەمەشدا لەمەغریب لەو شتەناوەبراوانە چەندین جۆر بوونیان هەیە لەوانەش میزماری قامیش كەپێی دەڵێن شبابە[١٠٧] كەقامیشێكی نێو بۆشە و لەتەنیشتەكانیەوە كۆمەڵێك كونی تێدایەو كاتێك كەفوی پیادەكەن ئاوازێكی لێوە دەردەچێت و، ئەو ئاوازەش لەنێو كونەكانەوە دێتە دەرەوە و بەدانانی پەنجەكانی هەردوو دەست لەسەركونەكان بەو شێوە و تەرتیبەی كەلەنێو موسیقا زانەكاندا هەیە، ئاوازەكان پچرپچڕ دەبن و بەم شێوەیە نیسبەتی نێوان ئاوازەكان بەدی دێت و بەشێوەیەكی گونجاو پەیوەست دەبن بەیەكەوە و، بەهۆی ئەو گونجانەشی كەباسمانكرد ئاوازەكەی لەزەت بەخش وخۆش دەبێت. یەكێكی تر لەجۆرەكانی ئەم ئامێری نەیانە (فودارەكان) زوات الانفاخ، ئامێرێكە بەناوی زولامیەوە كەدارێكی نێو بۆشە و بەشێوەیقامیش لەهەردوو سەرەوە تاشیویانە و، لەدوو بەشی جیا پێكهاتووە و كونگەلێكی دیاریكراوی تێدایە و لەڕێگەی قامیشێكی بچووكەوە كەبەستویانەپێیەوە فوی پیادەكەن و، هەوا بەهۆی ئەو قامیشەبچووكەوە دەچێتە ناویەوە و ئاوازگەلێكی تیژی لێوە دەردەچێت و بەهۆی

---

[١٠٧] قامیشێكی ناوبۆشە و پێشی دەڵێن مزماری عێراقی، واتە شمشاڵ.

پچڕپچڕی (تقتیع) ئاوازەکانەوە بەپەنجەکان بەهەمان شێوەی شبابە یان شمشاڵ هەروەك باسمانکرد لەکونەکانیەوە ئاواز دێتە دەرەوە.

باشترین ئاواز و ئامێرەکان لەم سەردەمەدا بوقە واتە شەیپور کەئامێرێکی ناوبۆشە بەئەندازەی یەزیراعە (دەست) کەلەمس دروستی دەکەن و، لەشوێنی فوپیاکردنەکەیەوە وورده وورده فراواندەبێت و تاوەکو کەمێك لەلەپی دەست گوشاد دەبێت و، ئەو گوشادیەش لەدەمەکەیەوە تەسك دەبێتەوە و وەك شێوەی نوکی تاشراوی قەڵەم وایە و فوی پیادەکەن و ئاوازەکانی لێوە دێتەدەرەوە کەوەك هەلکردنی هەوا وایە. ئەم ئامێرەش چەند کونێکی دیاریکراوی تێدایە کەئاوازەکان پیایدا بەگونجانێکی تایبەت بەهۆی پەنجەکانەوە دەپچڕێن و، ئەوکات لەزەت بەخش دەبن. یەکێکی تر لەئامێرە مۆسیقیەکان ئامێرە تاڵدارەکانن (زوات الاوتار) یان (گیتار) کەهەموویان ناوێکی بۆشیان هەیە و هەندێکیان بەشێوەی نیوە گۆ و هەندێکیشیان وەك قانون (کەجۆرێکە لەسەنتور) چوار گۆشەن. تاڵەکان لەسەر بەشی ڕووبەر فراوانی ئامێرەکە بەشێوەیەکی یەکسان ڕادەکێشن و بەهۆی بزمارگەلێکەوە دەیانبەستن بەو بەشەی کەلەنوکەکەیدایە و دەکرێت ئەم بزمارانەش لەکاتی توندکردن یان شل کردنی تاڵەکاندا بسوڕێنرێن.

لەپاشان ئەم تالأنە بەهۆی پارچە دارێکەوە (میزراب) دەژەنن وەیان بەهۆی تاڵێك کەدەیبەستن بەدارێکی کەمان ئاساوە و دواتر لەسەرتاڵەکانی تر دایدەنێن و بەمۆم یان کندر چەوری دەکەن و ئەم سەرو ئەو سەری پێدەکەنو، بەهۆی سوکی و قورسی دەستەوە لەدانان یان گواستنەوەیدا ئاوازە پچڕپچڕەکان دروستدەبن پەنجەکانی دەستی چەپ لەگەڵ ئەم کارەدا لەهەموو تاڵەکان دەخشێندرێنو، دەنگ و ئیقاع و ئاوازە خۆشو لەزەت بەخشەکان دروستدەبن. وەهەندێك جاریش بەهۆی ژەنینی چیلکە گەلێکەوە و لێدانیان لەتەشت و یان لێدانی تەشتەکان لەیەکتری بەپێی ئیقاعە گونجاوەکان ئاوازگەلێك بەدی دەهێنن کەبیستنیان خۆش و لەزت بەخشە. ئێستەش باسی ئەو لەزەتو خۆشیەدەکەین کەلەئاوازی خۆشەوە بەدی دێت: هەروەك چۆن لەجێگەی خۆیدا

باسکراوە کەلەزەت بریتیە لە ئیدراکی هەرشتێك کەگونجاو بێت لەگەڵ ڕۆحدا و هەرشتێك هەستی پێبکرێت کەچۆنیەتیەکی لێوە دەرك دەکرێت و، هەرکات ئەم چۆنیەتیەش بۆ ئیدراککەر گونجاوو سازگار بێت ئەوا لەزەت بەخش دەبێت و هەرکاتێکیش نەگونجاوو نەفرین لێکراو بێت ئەوا ناڕەحەتی لێدەکەوێتەوە هەربۆیە چێژە گونجاوو سازگارەکان ئەوانەن کەچۆنیەتیەکەیان لەگەڵ هەستی چەشتندا گونجاو بێتو، گونجاویش بێت لەگەڵ ئەوبۆنانەی کەلەزەت بەخش و خۆشن و گونجاون لەگەڵ ڕۆح و دڵدا چونکە ئەو ڕۆحە دەرککەری بۆنەکانە لەڕێگەی هەستی بۆنکردنەوە بۆنەکانی پێدەگات هەربۆیە ئەم ڕۆحە بۆنی خۆشی گیاکان و گوڵە بۆنخۆشەکان باشتر و گونجاوتر دەرك دەکاتو، چونکە حەرارەت کەسروشتی میزاج و ڕۆحی دڵە تێیدا زاڵە. بەڵام لەبارەی بینین و بیستن ئەوانەیان سازگار و گونجاون کەبارودۆخیان لەڕووی شێوە و چۆنیەتیەوە گونجاوبێت. کەواتە گونجانی بارودۆخەکان لەنەفسدا سازگار تر و گونجاوترن و هەربۆیە هەرکات شتێکی بینراو لەڕووی شێوەو نەخش و نیگارەوە، وەك ئەوەبێت کەمادە تایبەتەکەی کەی ئەو دەیخوازێت خوازیاری کامڵبوونی گونجان و دانان بێت دەرنەچێت ئەوا باش و جوان دەبێت.

مانای جوانی و باشی لەهەرشتێکی ئیدراککراودا هەرئەمەیە، ئەوکات ئەم جۆرە بینینانە بۆ نەفسی دەرککەر گونجاو دەبێت و لەزەت لەئیدراکە سازگارەکەی دەبات هەربۆیە دەبینین دڵدۆڕاوە شەیدا و بێ ئۆقرەکان ئەوپەڕی عەشق و خۆشویستن بۆ خۆشەویستەکانیان بەم شێوەیە دەردەبڕن کەڕۆحیان لەگەڵ ڕۆحی خۆشەویستەکانیاندا ئاوێتە بووە. لەم مانانیەدا ڕازێکە کە ئەگەر ئەهلی ڕازبیت هەستی پێدەکەیت کەبریتیە لەیەکبوونی مەبدەئو بیروباوەڕ و هەرکات سەیری هەرکەسێکی تر بێجگە لەخۆت بکەیتو، لێی وورد ببیتەوە دەبینی لەنێوان تۆو ئەودا جۆرێك لەیەکبوون و بیروباوەڕ بوونی هەیە کە گەواهیدەری یەکبوونی نێوان تۆ و ئەوە، ماناکەی بەشێوەیەکی تر ئەوەیە کەبەگوتەی حەکیمەکان بوون لەنێو بوونەوەراندا هاوبەشە هەربۆیە مرۆڤ

حەزدەکات بوونی ئەو لەگەڵ بوونی کەسێکدا کەکامڵبوونی تێدا بینیەوە ئاوێتەببێت بۆ ئەوەی لەم ڕووەوە لەگەڵ ئەودا ببێتەیەك و یەکبوونی هەبێت. بەڵکو نەفس لەم کاتەدا حەزی لەوەیە کەلەجیهانی وەهمدا بێتە دەرەوە بچێتە ناوحەقیقەتێکەوە کەبریتیە لە یەکیەتی مەبدەئو جیهانی هەستی. وەلەبەر ئەوەی گونجاوترینی شتەکان بۆ مرۆڤ و نزیکترینیان بەئیدراك و کەماڵ لەڕووی گونجاوی بابەتەوە هەمان ئەو شێوەی مرۆڤە هەربۆیە دەرکی جوانیەکانی نەخش و نیگارە مرۆییەکان و ئاوازەکانی ئەو لەو ئیدراکاتانەیە کەنزیکترە لەسروشت و فیترەتی مرۆڤەوە، ئەمەیە کەهەرمرۆڤێك بەپێی سروشت حەزیان لەبینین یان بیستنی جوانیەکانە، جوانیش لەبیستندا ئەوەیە کەئاوازەکان گونجاوو خۆش بن نەوەك بەپێچەوانەوە، چونکە ئاوازەکان خاوەنی چۆنیەتی جۆراو جۆرن وەك هێمنی، بەرزی، نەرمی، سەختی، جوڵەو بزوتن، فشار، و نمونەی ئەمانە.

گونجاویش لەئاوازەکاندا شتێکە کە ببێتە هۆی جوانیان کەخاوەن هەلومەرج گەلێکی تایبەت بەخۆیەتی. یەکەمیان نابێت گۆرانیبێژ بەیەکجار ئاوازەکان بەپێچەوانەوە دەربهێنێت، بەڵکو دەبێت کەم کەم بێت، وەهەروەها لەو وەهمەشدا بەناچاریەوە دەبێت لەنێو دووئاوازی وەك یەکدا ئاوازێکی لێك نەچوو بهێنێت. وەلەم بارەیەشەوە دەبێت شێوازی قسەزانان لەبەر چاو بگرێت کەچۆن ڕستە پێکهاتووەکان (مرکب) لەڕستە دژۆ جیاکان (متنافر)، یان نزیك بەیەك مەخرەج بەناشیرین دەزانن چونکە ووردی لەجوان دەربڕیندا بەهەمان شێوە لە خاڵ و یاساکانی هونەری مۆسیقایە. دووەم ئەوەیە کەدەبێت هەروەك چۆن لەسەرەتای بەشەکەدا باسمانکرد پچڕانی بەشەکانی ئاواز ڕەچاو بکرێت، واتە لەیەك ئاواز یان نیوە یان یەك لەسەر سێ یان بەشێك لەم ئاوازانە دەربچێت کەدەرچوون و گواستنەوە لەبەشێکەوە بۆ بەشێکی تر بەپێی دابەشکردنەکانی مۆسیقا زانان گونجاوبێت. کەواتە هەرکات ئاوازەکان بەپێی یاساو ڕێساکانی زانیارانی ئەم هونەرە لەچۆنیەتیە جۆراو جۆرەکاندا بەپێی گونجانی دیاریکراوبێت، ئەوکات سازگار و

لەزەت بەخش و خۆش دەبێت. هەندێك لەم گونجانانە سادەن و زۆرێك لەخەڵكی بەشێوەیەكی سروشتی دەیانزانن و پێویستیان بەبنەماكانی ئەم هونەرە نیە لەو شتانەی كەدەیانزانن، هەروەك چۆن دەبینین هەندێك شیعر دەزانن و بەبێ فێربوونی هونەری عەروز ئاشنای وەزن و قافیەی شیعرەكانن، یان ئەوانەی كەبەبێ فێربوون یاساكانی مۆسیقا بەكرداری لەئیقاعەكانی سەما دەزانن و نمونەی ئەمانە پێویستیان بەفێربوون نیە. خەڵكی بەگشتی ئەم جۆرە توانایانە ناودەنێن مچمار (واتە گۆڕەپانی پێشبڕكێی ئەسپ)، وەزۆرێك لەخوێنەران دەتوانین لەڕیزی ئەم گروپەدا دابنێین كەقورئان بەئاواز گەلێكی دڵگیر دەخوێنن‌و هەروەك بڵێی مزمار لەقوڕگیاندایەو، بەگونجانی ئاوازەكانیان لەگەڵ ڕۆحی خەڵكیدا بەبیستنیان گوێگر دەووروژێن و هەست بەخۆشیەكی زۆر دەكەن. وەجۆرێكی تری گونجان بریتین لەگونجاوە تێكەڵ یان پێكهاتەكان (مركب) كەهەموو خەڵكی لەناسینیاندا یەكسان نین و، هەموو تەبعەكان لەكرداردا گونجاو نین لەگەڵ خاوەنەكانیاندا، هەرچەندە فێری ئەو گونجاوانەش بووبن، ئەم جۆرە گونجاوانەش بریتین لە ئاوازگەلێك كە لەڕێگەی زانستی مۆسیقاوە فێریان دەبن، هەروەك چۆن لەبەشی زانستەكاندا لەبارەیانەوە گفتوگۆ دەكەین.

بەڵام مالك خودای لێی ڕازی بێت دژی قورئان خوێندن بوو بەئاوازەوە، بەڵام ئیمامی شافیعی (رح) ڕێگەی بەو كارەدابوو لێرەدا مەبەست لەئاوازی هونەری مۆسیقا نیە، چونكە گونجاو نیە لەڕێگری كردنیدا جیاوازی هەبێت، لەو ڕووەوەی كە مۆسیقا و گۆرانی دژی قورئانە. بەڵام قورئانخوێنان لەئەداكردنی ئایەتەكاندا بەجوانی پێویستیان بە ئاوازی تەجوید هەیە، هەروەك چۆن بۆ دیاریكردنی ئەدای پیتەكان لەڕووی تێركردنی حەرەكاتەكانەوە لەجێگەی خۆیدا هەندێك ئاواز پێویستە و هەم ئەوانەشی ئاوازەكان پێدەدەن. واتە درێژیان دەكەنەوە یان بەكورتی دەریاندەبڕن بەهەمان شێوە پێویستیان بەهەندێك ئاواز هەیە. وەلەدەنگە مۆسیقیەكانیشدا هەندێك ئاواز پێویستن كەبەبێ ئەوان ئەنجام نادرێن بەهۆی ئەو گونجاویەی كەلەحەقیقەتی ئاواز گوتندا، هەیە هەروەك

باسمانکرد، بەلاَم کاتێك ئەم دووهونەرە (ئاواز و مۆسیقا) دژی یەکتری بن ئەوکات ڕەچاوکردنی یەکێکیان کەموکورتی لەویتریاندا دروستدەکات، بەلاَم بەرلەمانە هەموویان ئەوە پێویستە کەخوێندنی قورئان لەبەر چاو بگیرێت بۆ ئەوەی نەوەك ئەو ڕیوایەتانەی کەلەقورئاندا نەقڵ کراون بگۆڕدرێن هەربۆیە کۆبوونەوەی ئاوازی گۆرانی ئەدای موعتەبەر لەقورئاندا بەهیچ شێوەیەك نیە، بەڵکو مەبەست لەجیاوازی ئیمامەکان ئەو ئاوازە سادەیە کەخاوەنانی ئامێرە مۆسیقیەکان یان ئەوانەی توانای سروشتیان هەیە ڕێنمایی دەکرێن، هەروەك باسمانکردو، ئاوازەکەیان بەپێی ئەو نیسبەتانەی کەهەم مۆسیقازانەکان و هەم خەڵکانی تریش دەرکیان دەکەن و بەجۆرێکی تایبەت تەرجیع[١٠٨] دەدەن[١٠٩].

جیاوازیەکە لێرەدایە و وادیارە کەدەبێت لەقورئاندا لەم شێوازە (ترجیع) دوور بکەوینەوە هەروەك چۆن عەقیدەی ئیمام مالیك یش بەم شێوەیە بووە، چونکە قورئان باسی قیامەت و ترسی پاش مردن و سزا تۆڵەی خودایە و جێگەی ئەوەنیەکە بەئاوازێکی زۆر لەزەت بەخش بخوێنرێت، خوێندنەوەی صەحابەش خوا لێیان ڕازی بێت بەشێوەی ناوبراو بووە هەروەك چۆن لەحەدیسەکانی تایبەت بەوانەوە هاتووە.

بەلاَم ئەوەی کەپێغەمبەر (ص) فەرموویەتی: یەکێك لەمەزامیرەکانی خاندانی داوودی پێبەخشراوە[١١٠] کەواتە مەبەست لەقەدەغەکردنی تەرجیع خوێندنەوەی قورئان نیە بەئاوازەوە، بەڵکو مەبەست ڕەچاو نەکردنی باشی و جوانی ئاواز و ئەدای خوێندنەوە کەو ڕوونی ووشەکانیەتی لەمەخرەجی پیتەکان و دەربڕینیاندا. ئێستە کەمانای گۆرانیمان باسکرد دەبێت ئەوە بزانین کەئەم هونەرە لەکۆمەڵگەدا کاتێك دەبێتە باوو بەکاردەهێنرێت کەئاوەدانی مرۆڤایەتی گەشەبکات و لەئاستی نیازمەندیە پێویستەکان

---

[١٠٨] بریتیە لەگوتنی شایەتمان بەدەنگی بەرز لەپاش ئەوەی کەبەدەنگێکی نزم و گێڕانەوەی ئاوازی گەرو دەگووترێت.

[١٠٩] ئەم شێوەیەش بەهیچ شێوەیەك شیاو نیە هەروەك مالك گوتوویەتی.

[١١٠] پێغەمبەر کاتێك ئەم حەدیسەی فەرموو کەئەبو موسای ئەشعەری عبداللەی کوڕی قەیس بەدەنگی بەرز قورئانی خوێندووە.

دەربچێت و بگاتە قۆناغی شارنشینی و خۆشگوزەرانی جوانکاریەکان. ئەوکات ئەم هونەرەبەدی دێت چونکە تەنها کەسانێك گرنگی پێدەدەن کەلەڕووی پێویستیە گرنگەکانی ژیانەوە وەك مەعاش و خانوو نمونەی ئەمانەوە تۆکمە و ئاسودە بێت، کەواتە بێجگە لەوکەسانەی کەلەهەموو بوارەکانی ژیاندا لەخۆشگوزەرانی و ڕەفاهو ئارامی و ئاسایشدان کەسانێکی تر بەشوێن ئەم هونەرەدا ناگەڕێن، شارنشینە کانیش ئەم هونەرەیان بۆ بەدەستهێنانی شێوازە جۆراو جۆرەکانی لەزەت و خۆشیەکان دەوێت و دڵیان بەندە پێیەوە، بەرلەهاتنی ئیسلام لەسەردەمی هێزی دەوڵەتە غەیرە عەرەبیەکاندا هونەری گۆرانی و مۆسیقا لەشارو پایتەختی وولاتە ناوبراوەکاندا ڕەواجێکی زۆری هەبووەو، وەك دەریایەکی بێبن گەشەی کردووە. لەپاشان ئەوان ئەمەیان ڕەواج پێدەدا و حەزیان لێدەکرد هەروەك چۆن پاشاکانی ئێران گرنگیەکی تایبەتیانم بەم هونەرمەندانە دەداو، لەم سەردەمەشدا وولاتە غەیرە عەرەبیەکان لەهەر سەرزەمین و هەر وولاتیکدا ئەم شێوازە قەیرەو دەکەن.

بەلآم تازیەکانی بەر لەئیسلام سەرەتا گرنگیان بەهونەری شیعر دەدا و قسەیان بەشێوەی شیعر دەهۆنیەوە کەبەپێی گونجانی نێوان بەشەکانی قسە لەهەندێك لەپیتە بزوێنەکان و نەبزوێنەکاندا هەندێك بەشیان یەکسان بوون، ئەم بەشانەی قسەیان هێندە درێژە پێدەدا کەهەربەشێك بەشێوەیەکی سەربەخۆ مانای خۆی دەبەخشی و نەدەچوویەوە سەر بەشەکەی تر و ئەم جۆرە قسەیەش بەیت، هەربۆیە سەرەتا بەهۆی دابەشبوون و پچڕانەوە و لەپاشان بەهۆی گونجانی بەشەکانەوە لەهەر کۆتاییو سەرەتایەکدا و دواتریش بەهۆی ئەداکردنی مانای مەبەست و جێبەجێ کردنی قسەکە لەسەری لەگەڵ تەبعی مرۆڤدا دەگونجا. ئەمەیە کەحەزیان لێکردووە و لەئەنجامی ئەم جۆرەقسانەی ئەماندائیمتیازێکی تایبەتی پەیدا کرد و لەبەر ئەوەی کە تایبەت بوو بەگونجانی ناوبراوەوە کردیانە دیوانی هەواڵ و حیکمەت و گەورەیی خۆیان و، مەحەکی قەریحەکانیان لەپێکانی مانا ڕاست و باش و شێوازەکان و لەسەر ئەم شێوەیە بەردەوام

بوون. ئەم گونجانەش کەبەهۆی بەشەکانی قسە و پیتە بزوێن و نەبزوێنەکانەوە بەدەست دێت وەك دڵۆپێکە لەدەریای ئاوازە کان هەروەك چۆن لەکتێبەکانی مۆسیقا و زانستەکاندا هەیە، بەڵام ئەوان بێجگە ئەم شێوازە گونجاویەکانی تریان نەدۆزیوەتەوە چونکە ئەوان لەو سەردەمەدا نەلەزانستێکدا مومارەسەیان هەبووە نەصنعەتێکیشیان زانیوە و خوی دەشتەکیەتی بەسەر هەموو بوارەکانی ژیانیاندا زاڵبووە.

ئەگەر لەقۆناغی شیعری جاهیلی تێپەڕبکەین تازیەکان لەو سەردەمەدا گورانی ووتنیشیان هەبووە بەجۆرێك کەحوشتروانەکانیان لەکاتی جولاندن و ڕێکردنی حوشتر و ووڵاخەکانیاندا لەشوێنەچۆڵەکاندا لاوەکانیان گۆرانی و سرودیان چڕیوە بەشێوەی تەرجیع و تەرەنوم و، ئەگەر شیعرێکیان بەتەرەنومەوە بخوێندایەتەوە ئەوا بەشێوەی گۆرانی دەیانگوت، وەهەرکات لەبارەی تەهلیلەوە (واتە باسی تاکی خودایان بکردایە) ئەوا جۆرێك لەخوێندنەوە بوو کە پێیان دەگوت (تغبیر) وەئەبو ئیسحاقی[111] زەجاج، ووشەی (تغبیر) یان بەم شێوەیە مانکردووە کە بریتیە لەبیرهێنانەوە غابر واتە ڕۆشتوو(دونیا)، یان باقی واتەبیرکەوتنەوەی ئەوەی کەدەمێنێتەوە (ڕۆژی قیامەت) . هەرچەندە لەگۆرانیدا خۆی لەنێو ئاوازەکاندا جۆرێك لەگونجانیان لەبەرچاو گرتووە هەر وەك چۆن ئیبن ڕەشیق لەکۆتایی کتێبی عومدە و ئەوانی تریش گوتوویانە و بەم گونجان‌و تەناسوبەیان گوتووە سناد[112] . وە زۆربەی شیعرەکانیان لەبەحری خفیف دایە[113] کەلەسەمادا بەکاری دەهێنن و دەف و جوزەلەی لەگەڵدا لێدەدەن، کەدەبێتە هۆی

---

[111] ئەبو ئیسحاق ئیبراهیمی زەجاج زانای ناودار لەزمانەوانی و زانستی صەرف و نحو (ڕێزمانی عەرەبی) دا زۆر شارەزابووە و لەساڵی ٣١٠ ك مردووە.

[112] لەزانستی قافیەدا واتە جیاوازی نێوان دوو ڕیزە.

[113] لەزمانەوانیدا مانای سوك و خێرا دەگەیەنێت لەڕۆشتندا لەزاروەشدا یەکێکە لەبحوری عەروز کەسوکترینی بحورەکانە و لەعەرەبیدا بەمسدس دێت و فارسەکانیش زۆر بەکەمی مپمن یان هێناوە. نمونەی بحری خەفیف مسدس ی سەرەتای سالم و تەواو و باقی مخبون، لەجامیەوە بەم شێوەیە هاتووە: سبزەها نو دمید و یار

وورووژاندن و هەڵچوون و ڕۆح سوکی و تازیەکان پێیان گوتووە (هزج)[١١٤] هەموو ئەم ئاوازە سادانە ئەوانەن کەلەسەرەتای بەدی هاتنی ئەم هونەرەوە مەعلوم بووە و بەیەکەمین ئاوازەکان دەژمێردرێن و، دوور نیە کەتەبعەکان بەبێ هیچ جۆرە فێرکردنێك وەك هەموو صنعەت سادەکان دەرکی بکەن.

بارودۆخی عەرەب لەکاتی دەشتەکیەتی و سەردەمی جاهیلیەتدا لەسەر ئەم شێوازە بووە، کاتێکیش ئیسلام هات و تازیەکان (غەزاکارە موسوڵمانەکان) دەستیان گرت بەسەر وولاتانی جیهاندا و وولاتی ئێرانیان داگیر کردو، دەسەلاتیان کەوتە دەست و لەڕووی دەشتەکیەتی و زیریەوە لەسەر حاڵەتێك بوون کەهەمووان دەیزانن، لەگەڵ ئەوەی کە لەئاییندا شێوازێکی توند و سادەیان هەبوو ئەوەی کە پەیوەست بوو بەئاسودەییەوە و بۆ ئاین و مەعاش سودی نەبوو وازیان لێدەهێنا، هەربۆیە هەندێك لەهونەرەکانی گۆرانیان واز لێهێناو هیچ شتێکی تر لەلایان بێجگەلەتەرجیع و خوێندنەوەو تەرەنومی شیعر کەلەنەریت و شێوازەکانیان دەژمێردرا خۆش و لەزەت بەخش نەبوو، بەلام کاتێك کەگەشتنە قۆناغی خۆشگوزەرانی جوانخوازی و بەتوانایی و بەهۆی بەدەستهێنانی دەستکەوت و، غەنیمەکانی نەتەوەکانی ترەوە کەوتنە لانکەی خۆشگوزەرانی و ئاسودەییەوەو ئەوکات پەیان بەژیانێکی خۆش و تەڕو تازە و هاونشینانی جوان و شیرینی ژیان برد. لەم سەردەمەدا گۆرانی بێژانی ئێرانی و ڕۆمی کەلەوولاتەکانی خۆیان ئاوارە بوبون، کەوتبوونە ناوچەی حیجازەوە و هەموویان بەئامێرەکانی عود و ئەرغون و مزمار و شمشاڵ و جوزەلەیان دەژەنی و تازیەکانیش

---

نیامد – تازە شد باغ و ان نگار نیامد (فاعلاتن، مفاعلن، فعلاتن) کەبەچەندین شێوە هاتووە. حەوت پەیکەری نیزامی و حەدیقەی سەنائی لەم بەحرەدایە (اقرب) و (غیاس).

[١١٤] لەبەر ئەوەی بەم بحرە دەڵێن هزج کەئەم ووشەیە لەزمانەوانیدا ئاوازو نەغمەی خۆشەو، عەرەب زۆریەی ئەو شیعرانەی کە بەدەنگێکی خۆش لەسرودەکاندا دەیخوێنن لەم بحرەدایە. ئەم بحرە بەسی و چوار وەزن هاتووە ئێمە تەنها هزجی سالم و تەواو بەنمونە باسدەکین الا یاایها الساقی ادر کاسا وناولها – کە عشق اول نمود اسان ولی افتادە مشکلها (حافز) (غیاس).

کەئەم ئاوازانەیان بیست و بەپێی ئاوازەکانیان شیعریان دەنوسی و لەشاری مەدینە چالاکی ئێرانی و طویس[115] سائب خاثر[116] مەولای عبدالله کوڕی جعفر[117] دەرکەوتن و، شیعرەکانی عەرەبیان بیست و ئاوازی خۆش و دڵنشینیان بۆ دانان و تێیدا بەتەواوەتی قاڵ بوون، دواتریش معبد [118] و ئیبن سریج[119] و هاوشێوەی ئەمان ئەم هونەرەیان لەوانەوە وەرگرت و فێری بوون و، گۆرانی وتن بەجۆرێك بەرەو پێشەوە دەچوو تاوەکو لەسەردەمی عباسیەکاندا و لەکاتی دەرکەوتنی ئیبراهیمی کوڕی مەهدی و ئیبراهیمی موصڵی و، کوڕەکەشی ئیسحاقی موصڵی و کوڕی ئەمیش حەمماد بەتەواوەتی کامڵ بوو لەسەردەمی فەرمانڕەوایی ئەم نەژادەشدا لەبەغدا ئەم بارودۆخە هاتە ئاراوە، کەلەپاش ئەو سەردەمەوە تاوەکو ئێستەش باسی ئەو هونەرە و کوڕەکانی دەکرێت ئاوازە مۆسیقیەنوێکان لەکۆڕی وانەکانی ئەو شارەدا، تاوەکو ئێستەش پەیڕەوی لەشێوازی ئەو سەردەمە دەکەن و لەوسەدەمەشدا گرنگیەکی تایبەتیان بەهۆکارەکانی گەمە و گاڵتە دەدا بۆ سەماکردنیش کەرەستەو شتانێکیان بەکار دەهێناو، لەبەریان دەکردن و

---

[115] ئیسحاقی کوڕی عبداللەی تویس لەمەوالیەکانی هۆزی مخزوم دانیشتووی مەککە کەلەساڵی ٩٢ ك مردووە (عیون الاخبار ب ١ لا ٣٢١.

[116] سائب خاسری بەڕەگەز ئێرانی کەلەمەدینەدا ژیاوە و لەساڵی ٦٣ ك لەجەنگی الحره دا کوژراوە.

[117] نەوەی ئەبو تالیبە و لەساڵی ٨٠ ك مردووە.

[118] ئەبو عبادی معبد ی کوڕی وەهەب مەولای عبدالرحمانی کوڕی قەتتان (اغانی ب ١ لا ١٩.

[119] لەچاپەکانی میسر و بەیروتدا بەهەڵە ئیبن شریح هاتووە. ئەبو یەحیا عوبەیدی ناسراو بە ئیبن سریج گۆرانی بێژی بەناوبانگ کەلەسەردەمی عومەری کوڕی خەتتابدا لەمەککە لەدایك بووە، لێدانی عودی لەوەستایان و هونەرمەندانی ئێرانیەوە فێر بوو کەبۆ نۆژەنکردنەوەی کەعبە هاتبوون لەڕیوایەتێکدا ئەو یەکەمین کەسێکە کە لەنێو عەرەبدا ئەم هونەرە فێربووە. ئیبن سریج ئاوازگەلێکی بۆ غەزەلەکانی عەمری کوڕی ڕەبیعە داناوە و لەشیوەنەکانیشدا ئاوازگەلێکیشی داناوە و لەسەردەمی خۆیدا ناوبانگێکی زۆری پەیدا کرد و، لەسەردەمی خەلافەتی هیشامدا مردووە (لغتنامەی دهخدا و اغانی ب ٥ لا ١٠.

دارگەلێکی تایبەتیان دەگرت بەدەستیانەوە لەکاتی سەماکردندا[١٢٠] وەئەو شیعرانەی کەلەو کاتەدا بەئاوازگەلێکی گۆرانی ئامێزەوە دەیانچڕین و لەگەڵیاندا سەمایاندەکرد ئەم شیعرانە بەجۆرێکی تایبەت دەژمێردران، وەشتانێکی تریشیان لەسەماکردندا بەکار دەهێنا و پێیان دەگوتن کرج[١٢١] .

کەبریتی بوون لەپەیکەری دارینی ئەسپ گەلێکی خاوەن زین بەرگ بوون کەبەکەناری کەواگەلێکەوە شۆڕیان دەکردنەوە و، ژنانی سەماکەر ئەم جۆرە جل و بەرگەیان لەبەر دەکرد و بەهۆیانەوە لاسایی ئەسپ سواریان دەکردەوە و لێهاتنی خۆیان نیشان دەداو هەروەك ئەمانە چەندین یاریچەی تریان بۆ ئەم مەبەستە بەکار دەهێنا لەکاتی میوانیو ئاهەنگەکانی بووك گواستنەوە و جەژنەکان و، بەزمەکانی کات بەسەر بردنەکاندا. ئەم جرە یاریچە و سەرگەرمیانە لەبەغدا و شارەکانی تری عێراقدا زۆربوو لەوولاتەوە بەرەو ناوچەکانی تریش بلاوەی کردوو بویە شتێکی باوی ناوخەڵکی. وەموصلیەکان[١٢٢] غولام و خزمەتکارێکیان هەبوو بەناوی زریابەوە[١٢٣]. کەهونەری مۆسیقا لەوانەوە فێر بوبو بەتەواوەتی شارەزایی تێدا پەیدا کردبوو، هەربۆیە موصلیەکان ئیرەییان پێ بردو ڕاویان نا بۆ مەغریب، زریابیش چوویە دەرباری حەکەمی کوڕی هیشامی کوڕی عبدالرحمانی داخل ئەمیری ئەندەلوس و ڕێزێکی زۆر و لەڕادەبەدەری لەزریاب گرتوو بانگی کردە لای خۆیو، دیاریەکی بەنرخی پێبەخشی و بەشی تایبەت و مووچەی تایبەتی بۆ بڕیەوە و ئەوی لەدەرباری خۆیدا لەنێو نەدیمەکانیدا خستە پلەیەکی بالاوە.

---

[١٢٠] سەماکەران ئەم درانەیان لەئاهەنگەکاندا بۆ شمشێر بازی بەکار دەهێنا، یان لەکاتی خوێندنەوەی شیعرەکان و ووشە نایابەکاندا دەیانگکێشان بەزەویدا (حاشیەی دسلان) لا ٤٢١ ب ٢.

[١٢١] خاوەنی منتهی الارب دەڵێت: مانای بێچووی ئەسپ و هێستر دەگەیەنێت کەبەعەرەبی کراوە. وەخاوەنی اقرب الموارد دەڵێت: شتێکە وەك بازنە ئەسپ کەوەك یاریچەیەك بەکاری دەهێنن.

[١٢٢] لێرەدا مەبەست ئیبراهیمی موصلی و منداڵەکانیەتی.

[١٢٣] واتە علی کوڕی نافیعی زریاب.

هەربۆیە لەئەندەلوسدا و بەهۆی زریابەوە هونەری مۆسیقا پێشکەوتنێکی شایستەی بەخۆیەوە بینی و لەپاش ئەویش تاوەکو سەردەمی ملوك التوایف یادگار و شوێنەوارەکانی ئەو (زریاب) هەرمابوویەوەو، کاریان پێدەکرا و لەنەوەیەکەوە دەگوازرایەوە بۆ نەوەیەکی تر. هەروەك چۆن لەئیشبیلیەدا نمونەگەلێکی هونەری ئەم بەجۆرێك فراوانبوو کە وەك دەریایەکی بێبنی لێهات و لەپاش نەمانی ڕەونەق و شکۆی ئەو شارە هونەر و شاکارەکانی زریاب گوازرایەوە وولآتانی کەناری ئەفریقا و مەغریب و لەشارەکانی ئەو سەرزەمینەدا دابەشبوو، لەگەڵ ئەوەی کە ئاوەدانی گەشەو شارستانیەتی ئەفریقا پاشەکشەی کردووە و دەوڵەتەکانی کەموکورتی ڕووی تێکردوون بەڵام هێشتا پاشماوەی هونەر و شاکارەکانی زریاب لەبواری مۆسیقاو گۆرانیدا لەو سەرزەمینەدا هەرماون.

مۆسیقا کۆتا صنعەت و پیشەیە کەلەئاوەدانی شارستانیەتدا بەدی دێت، چونکە ئەم هونەرە لەهونەرەکانی خۆشگوزەرانی و جوانخوازیە و پەیوەستە بەسەردەمی کامڵبوونی کۆمەڵگەوە و، بێجگە لەتایبەتمەندی ئاسودەیی و خۆشی پەیوەست نیە بەهیچکام لەتایبەتمەندیەکانی کۆمەڵگەوە، وەهەروەها ئەم هونەرە یەکەمین صنعەتێکە کە لەکاتی وێرانی و بێسەروبەری کۆمەڵگەدا لەناو دەچێت و نامێنێت، خودا ئافەرێنەرە.

# بەشی سی و سێهەم

## لەبارەی ئەوەی کەصنعەتەکان هەرکەسێك بیانکاتە پیشە سەربەرزی و ڕێزێکی تایبەتی پێ دەبەخشێت بەتایبەت هونەری نوسین ژمێریاری ( حساب )

لەم کتێبەدا باسی ئەوەمانکرد کەنەفسی گۆیای (ناتیقە) بالقوە لەمرۆڤدا بوونی هەیە وەگەیاندنی لەقۆناغی بالقوەوە بۆ کردار، سەرەتا بەهۆی زانست و ئیدراکاتی بەرهەمهاتوو لەهەستپێکراوەکانەوە تازەبەتازە بەدی دێت و دواتریش لەو زانیاریانەوەی کەلەپاش ئیدراکاتی هەستپێکراو بەهۆی هێزە تیۆری (نەزەری) یەوە بەدەستدێن، تاوەکو ئیدراك دەبێتە ئیدراکێکی کرداری و ئەقڵی ڕووت و ئەوکات زاتێکی (خود) ڕۆحانی بەدی دێت و لەم کاتەشدا بوونی ئەو کامڵ دەبێت، وەپێویستە کە هەرجۆرە زانستێك ببێتە سودێکی نەزەری و ئەقڵێکی بێ وێنە بۆ ئەو. وەلەصنعەت و مەلەکەکەیەوە بەردەوام یاسای زانستی بەدی دێت، کەسودێکی زۆر لەو مەلەکەیە دەبینێت. هەربۆیە لەپایەداری لەتاقیکردنەوە و ئەزموونەکاندا سودێکی تایبەت دەبینێت. ئەومەلەکانەی کەلەهونەرەکانەوە دێنەدی بەهەمان شێوە دەستمایەیەکی تایبەت لەڕێزدێنێتەدی و هەم شارستانیەتی کامڵی ئەقڵی و مەعنەوی پێ دەبەخشێت، چونکە وەها شارستانیەتێك لەیەك بەشی صنعەتەکاندا لەبارەی شتەکانی خوارەوە پێکدێت: ڕێکخستنی ماڵ (ماڵداری) هەڵسووکەوت لەگەڵ هاوشێوەکان و بەدەستهێنانی نەریتەکانی ئاوێتە بوون و گونجان لەگەڵ مرۆڤدا لەپاشان ئەنجامدانی ئەرکە ئاینیەکان و ڕەچاوکردنی ئاداب و هەلومەرجەکانی. ئەمانە هەموویان یاساگەلێکن کەزانستگەلێکیان

لێوە ڕێکدەخرێت و لەئەنجامدا لەزانستە ناوبراوەکانەوە ژیری زۆر بەدی دێت. بەڵام نوسین لەنێو هەموو صنعەتەکاندا بۆ ئەم مەبەستە واتە زۆربوونی ژیری بەسود ترە، چونکە ئەم هونەرە زانست و تیۆرگەلێکی تێدایە ئەمەلەکاتێکدا صنعەت و پیشەکانی تر بەم شێوەیەنین. وەڕاڤەی ئەم شاراوەییە بەم شێوەیە کەلەنوسیندا جۆرێکە لەگواستنەوە لەشێوەی خەتی پیتەکانە بەوشە زارەکیە جێگیرەکان لەخەیاڵدا وە لە ووشە جێگیرەکان لەخەیاڵدا گۆڕینیانە بەماناجێگیرەکان لەنەفسدا.

هەربۆیە نوسەر لەحاڵی نوسیندا بەردەوام لەبەڵگەیەکەوە دەگوازێتەوە بۆ بەڵگەیەکی تر و ووردە ووردە نەفس خوی پێوە دەگرێت، لەئەنجامدا مەلەکەی گواستنەوە لەدەلیلەکانەوە بۆ مەدلولەکان دێتەدی و، مانای نەزەری ئەقڵی کەبەهۆیەوە زانستە نادیارەکان بەدەستدێن هەرئەمەیە. هەروەك چۆن بەهۆی مەلەکەی ناوبراوەوە مەلەکەیەکی تەعەقولی بەدەستدەهێنێت کە ژیری زیاد دەکاتو، بەو زۆربوونەش هێزی هۆشمەندی و زیرەکی لەکارەکاندا بەهۆی خووگرتنی نەفس بەگواستنەوە لەدەلیلەوە بۆ مەدلول بەنەزەری ئەقڵی دێتەدی. هەربۆیە ئەنوشیروان کاتێك کەبەڕێوەبەرەکانی لەو هۆشمەندی زیرەکیەدا بینی گوتی: شێت واتە شەیتانەکان و شێتی. وەدەڵێن ئەم ووشەیە ئەصڵی ئیشتیقاقی دیوانی کاتیبەکانە (نوسەرەکان). لەنێو ئەوپیشانەی کەوەك نوسەری بۆ زۆربوونی ژیری بەسودە دەبێت حیسابیش لەڕیزی نوسەریدا دابنێین، چونکە هونەری حیساب و بیرکاری لەڕێگەی کۆکردنەوە و لێدەر کردنەوە جۆرێکە لەدەستوەردان لەژمارەکاندا، کەتێیدا پێویستمان بەبەڵگە هێنانەوەی زۆر هەیە هەربۆیە ئەم هۆنەرە هێزی بەڵگە هێنانەوە و(بیرکردنەوە) لەمرۆڤدا جێگیر دەکات و زەین خوی پێوە دەگرێت مانای ژیریش بێجگەلەبەڵگەهێنانەوە و نەزەر (بیرکردنەوە) شتێکی تر نیە، خوداش ئێوەی لەسکی دایکتانەوە هێناوەتە دەرەوە کەهیچتان نەدەزانی و گوێ و دیدە (چاو) دڵی پێبەخشین، کەواتە سوپاسگوزاری بکەن[١٢٤].

---

[١٢٤] (وَاللهُ أخرَجَكُم مِّن بُطُونِ أُمَّهاتِكُم لاتَعلَمُونَ شَيئاً وَجَعَلَ لَكُمُ السَّمعَ وَالأبصارَ وَالأفئِدَةَ لَعَلَّكُم تَشكُرُونَ) س النحل ئا ٧٨.

# بابی شەشەم لەکتێبی یەکەم

## لەبارەی زانست و جۆرەکانیەوە و چۆنیەتی فێربوون و شێوازەکانی و ئەو حاڵەتانەی کەلە هەموو ئەمانەوە دێنەدی کە پێشەکی و چەند پاشکۆ یەکی هەیە

پیشەکی: لەبارەی ئەندێشەی مرۆڤەوە کەبەشەر بەهۆیەوە لەبوونەوەرانی تر جیا دەبێتەوە و دەناسرێتەوە و بەهێزی ئەو مەعاشی خۆی لەڕێگەی هاوکاری و یارمەتیدانی نێوان هاوشێوەکانی خۆیەوە بەدەست دەهێنێت و، بەیارمەتی ئەو لەبارەی پەرستراوی خۆی و ئەوەی کەپێغەمبەران لەلایەن ئەوەوە هێناویانە ڕێنمایی دەکرێت، هەربۆیە هەموو گیانەوەران موسەخەری ژێر فەرمانی ئەو بوون و خوداش لەهێزو تواناکانی خۆیی پێ بەخشیوە وبەم هێزە لەزۆرێك لەدروستکراوەکانی خودا لەپێشتر و باشترە.

# بەشێك

## لەبارەی ئەندێشەی مرۆڤەوە

دەبێت بزانین کەخودا سبحانە وتعالی مرۆڤی بەبیرو ئەندێشەوە لەگیانەوەرانی تر جیاکردووەتەوە و ئەم ئەندێشەیەی کردووەتە مەبدەئو بنەمای کەماڵ و، ئەوپەڕی فەزیلەت و شەرەفی ئەو لەنێو بوونەوەراندا. چونکە ئیدراك یان شعور و هەستێك کەبەهۆی ئەو بوونەوەرە دەرککەرەوە زاتەن شتانێك لەدەرەوەی زاتی خۆیدا بزانێت تەنها لەنێو بوونەوەرانی تر و کائیناتدا تایبەتە بەگیانلەبەرانەوە، هەربۆیە گیانەوەران بەهۆی ئەو سروشتەی کەخودا لەواندا ئافراندوویەتی واتە هەستە دیارو ئاشکراکان (بیستن بینین بۆنکردن چەشتن و لەمسکردن) دەتوانن ئەوشتانەی کەلەدەرەوەی زاتی ئەواندایە دەرك بکەن و مرۆڤ لەنێو گیانەوەراندا بەهێزێکی بالآتر جیاکراوەتەوە، واتە دەتوانێت دەرەوەی زاتی خۆی بەو ئەندێشەیەی کە لەهەستی ئەو لەپێشترە تێبگات کەهێزێکە لەناخی دەماغیدا دانراوە. بەو شێوازانەش هەستپێکراوەکان لەیەکتر جیادەکاتەوە و بیری خۆی تێیاندا دەخاتە جوڵە و لەپاشان شێوەگەلێکی تریان لێ جیادەکاتەوە. کەواتە ئەندێشە بریتیەلە هێزێك کەلەپشتەوەی (ماوڕا) هەستەوە لەم شێوە جیاکراوانەدا کاردەکات و، زەینیان تێدا دەخاتە گەڕ و پێکیان دەهێنێت و لەیەکتریان جیادەکاتەوە مانای ئەفئدە (دڵەکان) لەگوتارەکانی خودای گەورەدا هەمان ئەو ئەندێشەیە کەدەفەرمێت: (گوێ و چاوو دڵمان پێداون)[١٢٥] ووشەی ئەفئدە کۆی فوئادە کەلێرەدا مەبەست لێی ئەندێشەیە. ئەندێشەش چەند پلەیەکی هەیە:

---

[١٢٥] (جَعَلَ لَكُمُ السَّمعَ وَالأبصارَ وَالأفئِدَةَ) س النحل نا ٨٠.

یەکەم: تەعەقولی شتانێك کەلەدەرەوەی مەرتەبەدان ئیتر خاوەن تەرتیبێکی سروشتی بن یان وەزعی (دانراو). تاوەکو بەهێزی ئەو تەعەقولە ئاوازی بەدیهێنانیان بکات ئەم جۆرە ئەندێشەیەش زیاتر تەصەوراتە[126]. وەپێی دەڵێن ئەقڵی جیاکەرەوە(تمییزی) (هەستی یان ناسینەوە) کەبەهۆیەوە مرۆڤ سودو مەعاشی خۆی بەدەستدەهێنێت و زیانەکان لەخۆی دوور دەخاتەوە.

دووەم: ئەندێشەیەك کەبەهۆیەوە لەبیرو باوەڕو نەریتەکانی ژیان بەهرەمەند دەبین و لەشێوازی ڕەفتار و سیاسەت لەگەڵ هاوڕەگەزەکانماندا بەکاردەهێنین کەزۆربەیان تەصدیقگەلێکن (٣)[127] کە کەم کەم بەئەزموون بۆ مرۆڤ دێتەدی تاوەکو ئەوکاتەی کەسودمەند دەبین لێیان. کەپێی دەڵێن ئەقڵی ئەزموونی (تجربی).

سێیەم: ئەندێشەیك کەمرۆڤ لەزانست یان گومان بەداخوازێکی لەپێشتر لەجیهانی هەستی بەهرەمەند دەکات، هەروەك چۆن هیچ کردارێکی پێوە پەیوەست نابێت. کەپێی دەڵێن ئەقڵی نەزەری کەبریتیەلەتەصەوور و تەصدیقاتێك کەبەشێوە و هەلومەرجێکی تایبەت ڕێکدەخرێت مرۆڤ ڕێنمایی دەکات بەمەعلومێکی تر لەهەمان ڕەگەز لەتەصەور یان تەصدیق، لەپاشان بەمەعلومگەلێك بێجگە لەڕەگەزی خودی ئەوان ڕێکدەخرێت و ئێمەئاشنادەکات بەسودی زانستگەلێکی تر و، زۆرترین سودێك کەئێمە لەوەوە وەری دەگرین ئەوەیە کەبوون بەوشێوەیەی کەهەیە لەڕێگەی ڕەگەز و بەشەکان و هۆکارەکانەوە تەصەووری بکەین، لەئەنجامدا بەهێزی وەها ئەندێشەیەك بوون لەکەماڵی حەقیقەتیدا دەبینین و ئەوکات ئەم جۆرە ئەندێشانە ئەقڵی ڕووت و نەفسی ئیدراککەر دەبێت و مانای حەقیقەتی مرۆڤایەتیش هەرئەمەیە.

---

[126] تصور: لەزاراوەی مەنتیقدا بریتیە لەحاصڵبوونی شێوەی شتێك لەئەقڵدا بەغەیری حوکم وەك تەصەوری زەید و عەمر و بەکر و تەصەوری غلامی زەید (غیاس).

[127] تصدیق: لەزاراوەی مەنتیقدا تەصەوورە بەحوکم هەروەك دەڵێن زەید نوسەرە یان نوسەر نیە. (غیاس)

## بەشێك

## لەبارەی ئەوەی کەکردارەکان لەجیهانی حادپات تەنها بەهێزی ئەندێشە بەئەنجام دەگات

دەبێت ئەوەبزانین کەجیهانی هەستی بریتیەلەکۆمەڵێك زاتی مەحز و ڕووت وەك توخمەکان و شوێنەوارەکانیان و ئەو بەرهەمهاتووە سێقۆڵیانەی کەلەوانەوە بەرهەم دێن و وەك جەماد(بێگیان) و ڕووەك و گیانەوەر. هەموونەمانە لەوشتانەن کەپەیوەستن بەهێزی خوداوە سەرەڕای ئەمانەش ئەوکردارانەی کەلەگیانەوەرانەوە دەردەچن و بەمەبەست ڕوودەدەن پەیوەستن بەهێزێکەوە کەخودا لەواندا ئافراندوویەتی و، وایلێکردوون بتوانن ئەو کارانە ئەنجام بدەن هەروەك چۆن هەندێکیان خاوەن نەزم و تەرتیبن وەك کردارە مرۆییەکان، وەهەندێکیش بەپێچەوانەوەن وەك کرداری گیانەوەرانی تر. وە ڕێکسازی و تەرتیبی نێوان ڕووداوەکان ئیتر سروشتی بن یان وەزعی و دانراو دەتوانرێت بەهێزی ئەندێشە دەرك بکرێن. هەربۆیە هەرکات کەسێك بیەوێت شتێك بەدی بهێنێت بەهۆی ئەو نەزم و تەرتیبەی کەلەنێو حەوادیسەکاندا بەرقەرارە، ئەوا بەناچاریەوە دەبێت هۆکار یان هەلومەرجەکانی بەشێوەیەکی گشتی کەبریتین لەبنەماو مەبادیئەکانی بەباشی بزانێت، چونکە ئەو شتە نایەتە بوون مەگەر ئەوەی کەلەقۆناغی دووەمدا و لەپاش بنەماناوبراوەکانەوەبێت. وەدواخستنی شتێك کەدەبێت لەپێشەوەبێت یان بەپێچەوانەوە پێشخستنی شتێك کەدەبێت لەدواوە بێت گونجاونیە. وەبنەما (سەبەب یان هۆکار یان مەرج)ـی ناوبراو هەندێکجار خاوەنی مەبدەئو بنەمایەکی ترە کەناکرێت

بێتەدی، مەگەر ئەوەی کە لەدوای بنەمای یەکەمەوە بێت و هەندێك جاریش لەم پلەیەش تێپەڕدەکات و ئینجا ئەنجام دەدرێت. کەواتە هەرکات بگات بەکۆتا بنەما ئیتر دوو یان سێ پلەش زیاتر بێت و کارێك کەدەبێتەهۆی بەدیهاتنی ئەو دەست پێبکات، ئەوکات دەبێت کۆتا بنەماو مەبدەئێك کەئەندێشە پێی گەشتووە دەستپێبکات، هەربۆیە ئەم بنەماو مەبدەئە ناوبراوە دەبێتە دەستپێکی کارەکە و دواتریش بنەمای پاش ئەو تاوەکو کۆتایی موسەبیب و هەلومەرجەکان بەدوای یەکدا دێن، کەبەیەکەمین ئەندێشەی ئەو دەژمێردران.

بۆنمونە کەسێك کەلەبارەی دروستکردنی سەقفێکەوە بیربکاتەوە سەرەتا زەینی ئەو دەچێت بۆلای دروستکردنی دیوارەکە و دواتریش پایەو بینایەك لەبەرچاو دەگرێت کەدیوارەکەی لەسەر بنیاتدەنرێت.[128] کەواتە دروستکردنی پایەکان یەکەمین ئەندێشەی ئەوە ئەوکات لەکارکردن لەپایەکانەوە دەستدەکات بەدروستکردنی دیوارەکان و دواتریش سەقفەکە، کەواتە دروستکردنی سەقف کۆتا قۆناغی کارەکە دەبێت، ئەمەیە مانی ئەو قسەیەی کەدەڵێن: سەرەتای کار کۆتایی ئەندێشەیەو سەرەتای ئەندێشەش کۆتایی کارە. کەواتە کردەوەی مرۆڤ لەدەرەوە بێجگە بەهاوکاری ئەنێشە و بیرکردنەوە لەپلەناوبراوەکاندا کۆتایی نایەت، چونکە هەریەکە لەقۆناغە ناوبراوەکان لەسەر ئەویتر وەستاوە لەپاش بیرکردنەوە لەپلە ناوبراوەکاندا کارەکە دەستپێدەکات و یەکەمین ئەندێشەش کۆتا موسەببیبە (مسبب) کەلەکرداری هەموو بنەماکاندایە، یەکەمین کارێکیش یەکەمین موسەببیبە و کەلەئەندێشەدا لەدوای هەمووانەوەیە بەهۆی ئاگاداربوون بەم تەرتیبە لەکردارەکانی مرۆڤدا ڕێکسازی دروستدەبێت.

بەڵام کرداری گیانەوەرانی تر خاوەنی ڕێکسازی نیە، چونکە لەو ئەندێشەیەی کەبەیارمەتی ئەو ئەنجامدەری کار نەزم و تەرتیب دەدۆزێتەوە بێ بەهرەدەبن، چونکە

---

[128] سعدی دەڵێت: اول اند یشەو انگهی گفتار — پای بست امده است پس دیوار (واتە سەرەتا ئەند یشەو لەپاش ئەو گوفتار — دەبێت پایە ئامادەبێت ئینجاوەکو دیوار.

تێگەشتنی گیانەوەران تەنها لەڕێگەی هەستەکانەوەیە و ئیدراکاتەکانیان بڵاوون و خاڵین لەپەیوەندیەکان.

هەربۆیە ئیدراکی ڕێکو پێك و پەیوەست بەیەکەوە بێجگە بەهێزی ئەندێشە نایەتەدی. وەلەبەر ئەوەی لەجیهانی هەستیدا یان جیهانی کائینات و بوونەوەران و هەست و ئیدراکاتە مونەزەمەکان ریکوپێکەکان بەخاوەن ئیعتیبارو ئەصڵ وەرگیراون و، هەستی نامونەزەم بەدوای ئیدراکاتە مونەزەمەکان و وەك لقێکی ئەوان ژمێردراوە، هەربۆیە کرداری گیانەوەران دەچێتە ناو بەشی کۆتاییەوە و هەربۆیە موسەخەر و دەستەمۆ بوون بۆ مرۆڤ و کردارەکانی مرۆڤ زاڵن بەسەر ئەوەی کە لەجیهانی حەوادیسدا هەیە. وەهەموویان کەوتوونەتە ژێر فەرمانی ئەوەوە و موسەخەری ئیرادەی ئەو بوون، مانای جێنشینی مرۆڤ کەلەفەرموودەی خودادا ئاماژەی پێکراوە ودەفەرمێت (من لەسەرزەویدا جێنشینێك دیاری دەکەم)[129] هەرئەمەیە. کەوتە ئەندێشە تایبەتمەندی مرۆڤە کەجۆری مرۆڤی لەگیانەوەران پێ جیادەکرێتەوە و بەئەندازەی هاتنەدی پلەکانی سەبەب و موسەبەبەکان لەئەندێشەی کەسێکدا دەتوانین پەی بەپلەو پایەی مرۆڤایەتی ئەو بەرین، هەروەك چۆن هەندێك کەس لەسەبەبیەتدا دووتاوەکو سێ قۆناغ بیردەکەنەوە و هەندێکیش لەم قۆناغە تێپەڕناکەن و هەندێکیش تاوەکو پێنج شەش قۆناغ بیر دەکەنەوەو ئەم جۆرەکەسانەش لەپلەو پایەبالآ مرۆڤایەتیەکاندان، دەتوانین ئەم بابەتە لەبارەی یاریزانانی شەترەنجەوە لەبەرچاو بگرین و ئەندازەی ئەندێشەیان هەڵیسەنگێنین، چونکە هەندێك لەیاریزانان بیر لەسێ جوڵە دەکەنەوە و پێنج جوڵەش کەتەرتیبیان وەزعی و دانراوە تەصەوور دەکەن و هەندێکیش بەهۆی بیرکۆڵیەوە ناتوانن تەصەوری بکەن. هەرچەندە ئەم نمونە بەرابەرنیە چونکە لێهاتوویی لەیاری شەترەنجدا لەڕێگەی مەلەکە و ڕاهێنانەوە (تمرین) بەدی دێت ناسینی سەبەب و موسەبەبەکان بەشێوەیەکی سروشتیە بەڵام نمونەی ناوبراو دەتوانین وەك نمونەیەکی گریمانی

---

[129] (إنّي جاعِلٌ فِي الأرضِ خَلِيفَه) س البقرة ئا ٢٨.

دابینێین‌و لەتەعەقول و بیرکردنەوە لەو یاسا و بنەمایانەی کەبەبیرو زەینی مرۆڤدا دێن بخەینە بەر لێکۆڵینەوەوە. خوداش مرۆڤی دروستکردووە وفەزڵی داوە بەسەر زۆرێك لەدروستکراوەکانیدا[130].

[130] (وَفَضَّلْنَاهُمْ عَلَى كَثِيرٍ مِمَّنْ خَلَقْنَا تَفْضِيلاً) س الاسرى ئا ٧٢.

## بەشێک

## لەبارەی ئەقڵی ئەزموونی و چۆنیەتی ڕوودانیەوە

لەکتێبی حەکیمەکاندا قسەکانیانت لەم بارەیەوە بیستووە کەدەڵێن مرۆڤ بەتەبع بوونەوەرێکی مەدەنیە. ئەوان ئەم قسەیەلەسەلماندنی پێغەمبەرایەتی ونمونەی ئەودا باسدەکەن و ووشەی مەدەنی دراوەتە پاڵ شاری (مدینە) لەلای حەکیمەکان کینایەیە لەکۆمەڵگەی مرۆڤایەتی و، مانای گوتەی ناوبراو ئەمەیەکە ژیانی مرۆڤ بەشێوەیەکی تاکەکەسی نەگونجاوە و بوونی ئەو بێجگەلە تێکەڵی لەگەڵ هاوڕەگەزەکانیدا ناگاتە کەماڵ، چونکە مرۆڤ بەجۆرێك دروستکراوە کەناتوانێت بەتەنهایی بژی و بوون و ژیانی بگەیەنێتە کەماڵ، هەربۆیە ئەو تەبیعەتەن لەهەموو نیازمەندیەکانی ژیانی خۆیدا بەردەوام پێویستی بەهاوکاری و یارمەتی هەیە. لەم هاوکاریەشدا سەرەتا بەناچاریەوە دەبێت سازش و تەوافوق و لەپاشان بەشداری و تایبەتمەندیەکانی پاش ئەو بێنەدی. هەرچەندە لەکاتی یەکسانبوونی تواناکاندا سەوداو مامەڵەیان سەردەکێشێت بۆ کێشەو شەڕو ئاژاوەو لەنێوانیاندا سیفەتگەلێکی دژبەیەکی وەك هەڵهاتن لەیەکتر و پێکەوەژیانو دۆستی و دووژمنی و دێتەئاراوە و، کاردەگاتە شەڕو ئاشتی لەنێو دەوڵەتاندا. ئەم چۆنیەتیانەش بەهەرشێوەیەك ڕوودەدات وەك ئەوەنیە کەلەنێو گیانەوەراندا دژایەتی دروستدەبێت و یەکتری لەناودەبەن، بەڵکو حاڵەتەناوبراوەکان تایبەتن بەمرۆڤەوەو چونکە بەهۆی ئەوەی کەخودا مرۆڤی بەهۆی هێزی ئەندێشەوە لەکردارو ئاکاری ڕێكو پێك بەهرەمەند کردووە، هەروەك لەبەشەکانی پێشوودا باسمانکرد، هەرکارێك لەنێویاندا

خاوەنی نەزم و ڕێکخستنێکە و توانای ئەوەیان دەبێت ڕێکخستنگەلێکی ڕێك و پێك بەشێوە جۆراو جۆرە سیاسی و فەلسەفیەکان بەدی بهێنن بەهۆی ئەم جۆرە ڕێکخستنەوە لەخراپە و لەناوچوون ڕوو وەردەگێڕن و، ڕوودەکەنە بەرژەوەندی و کاروبارە شیاو شایستەکان و لەناشیرینی و خراپیەوە ڕوودەکەنە چاکە و حەزی لێدەکەن لەپاش ئەوەی لەئەنجامی ئەنجامدانی هەرکارێك ئەزموونێکی ڕاست فێر دەبن و نەریتی باش و جوان لەنێویاندا دەبێتەباوو خراپەو ناشیرینیەکان دیاری دەکەن و، لەڕەفتاری دوورکەوتنەوە و ڕاکردن لەلەغاوکردنی حەیوانی دوور دەکەوتنەوە دەرئەنجامی ئەندێشە لەکردارە ڕێك و پێك و دوورکەوتنەوەی ئەمان لەخراپە بەتەواوەتی دەردەکەوێت. بەهاوکاری ئەم مانایانەیە کەمرۆڤ سیفەتی باسکراو بەدەستدەهێنێت و ماناناوبراوەکان بەتەواوی لەهەستەوە دوور نین پێویست ناکات تێیاندا قوڵ ببینەوە، بەڵکو هەموویان لەڕێگەی ئەزموونەوە بەدەستدێن و بەهۆی ئەوەوە سودیان لێوەردەگیرێت، چونکە مانا ناوبراوەکان لەمانا ناسەرەکیەکانە کەپەیوەستن بەهەستپێکراوەکانەوە و ڕاستی و درۆییان بەزوویی لەجیهانی واقیعیەتدا ئاشکرا دەبێت و، عەودالّی ئەوان لەبەدەستهێنانی ئەوزانستەی کەلەئەنجامی ئەم تاقیکردنەوە بەدەست دەهێنێت سود مەند دەبێت ئەوکات هەرتاکێکی مرۆڤ بەوئەندازەی کەلەجیهانی واقیعیەتدا بۆ ئەو فێربوونی ئەزموونەکان دەرەخسێت لەهەڵسووکەوتیدا، لەگەڵ هاوڕەگەزەکانیدا بەکاریان دەهێنێت هەروەك چۆن بۆی ئاشکرادەبێت کەچ شێوازێك هەڵبژێرێت و، ئەنجامی بدات و کام شێوازیش بخاتەلاوە، ئەزموونی ناوبراو بۆ ئەو کەلەئەنجامی مومارەسەکردنەوە وەك نەریت و مەلەکەی لێدێت و لەهەڵسووکەوت کردنی لەگەڵ هاوڕەگەزەکانیدا بەکاری دەهێنێت و، کەسێکیش کەئەم شێوەیە لەڕێڕەوی ژیانیدا پەیڕەوی دەکات ئاگاداری هەموو مەسەلەیەك دەبێت و، ئەزموونی فێربوون بەناچاریەوە دەبێت بەگوزەشتی کات بەدی بێت بەڵام هەندێك جار خودا بەدەستهێنانی ئەزموون لەنزیکترین کاتەکاندا بۆ زۆرێك لەتاکەکانی مرۆڤ بەئاسانی بەدەستدێت، ئەوەش ئەوکاتەیە کەمرۆڤ چاولێکەری

لەباوباپیران و گەورە و شێخەکانی نەتەوەکەی دەکات و ئەزموونەکانیان فێرببێت و فێری ڕاسپاردەکانیان ببێت، ئەوکات پێویست ناکات کەبۆ ماوەیەکی دوور و درێژ لەگەڕان بەشوێن ڕووداوەکاندا سەرقاڵ ببێت و، مانا ناوبراوەکانیان تێدا دەربهێنێت. بەڵام هەرکەسێك کەپەی بەم شێوازە نەبرد و لەچاولێکەری و تەقلید بێئاگابوو یان لەسیفەتی باشی بیستن و پەیڕەویکردن لەگەورەکان و خەڵکانی بەئەزموون دوور بکەوێتەوە، ئەوکات دەبێت لەڕێگەی پەروەردەکردنی خۆیدا ڕەنج و ناڕەحەتیەکی زۆر تەحەمول بکات، هەروەك چۆن ڕێگەیەکی نائاسایی تەی دەکات و دەبڕێت ئەزموونەکان بەو جۆرە فێردەبێت کەلەنێوانیاندا پەیوەندی و نیسبەتێکی ڕاست نیە و ئەوکات ئاداب و ڕەفتارەکانی بەشێوەیەکی ناجۆر دەبینین‌و، لەئەنجامیشدا لەڕووی مەعاشەوە لەنێو هاوڕەگەزەکانی خۆیدا دووچاری چارەڕەشی و هەژاری و بێنەوایی دەبێتەوە. لێرەدایە دەتوانین کەپەی بەمانای ئەم گوفتارە بەناوبانگەببەین: (کەسێك کەلەباوکەوە پەروەردە فێرنەبێت ئەوا ڕۆژگار پەروەردەی دەکات). واتە هەرکەس نەریتەکانی ژیان لەبارەی چۆنیەتی هەڵسووکەوت لەگەڵ خەڵکیدا لەباوك و دایك و مەشاییخ و گەورەکانیەوە وەرنەگرێت و لەبری ئەو شێوازە فێربوونی سروشتی لەجیهانی واقیعیاتەوە بەتێپەڕبوونی کات و هاتنی یەك لەدوای یەکی سەردەم و ڕۆژگارەکان بگرێتەبەر، ئەوکات مامۆستاو فێرکارو پەروەرشیاری ئەو ڕۆژگاردەبێت[131] ئەم شتەش بەهۆی ئەوەی کە بەشێوەیەکی پێویست هەستی هاوکاری و یارمەتیدان لەناخیدا ئافراندووە ناتوانێت خۆیی لێ لابدات.

بەم شێوەیە مانای ئەقڵی ئەزموونی کەلەپاش ئەقڵی جیاکەرەوە(تمییزی) (حسی) کەبەهۆیەوە کردارو ڕەفتارەکان لەمرۆڤەوە سەرچاوە دەگرێت، هەروەك باسمانکرد. ئەقڵی نەزەری پلەیك لەدوای ئەقڵی تەمییزی و ئەزموونیەوەیە، لەبەر ئەوەی کەزاناکان

---

[131] اگر پەند خرد مندان بجان و دل نیاموزی – جهان ان پند بەسختی بیاموزد ترا روزی (زەبیح اللـه بهـروزی) (واتە: ئەگەر پەندو ئامۆژگاری ژیران و دانایان بەدڵ فێر نەبی و وەری نەگری – ئەوا جیهان ئەو پەند و ئامۆژگاریە ڕۆژێك لەڕۆژان بەسەختی و توندی فێری تۆ دەکات).

چەمك و مانای ئەقڵی ئەزەریان ڕاڤەکردووە هەربۆیە پێویست ناکات لەم کتێبەدا باسی بکەین. خوداش گوێ و چاوو دڵەکانی (ئەندێشە) ی بەئێوە بەخشیوە.

## بەشێك

## لەبارەی زانستی مرۆڤ و زانستی فریشتەكانەوە

ئێمە بەویژدانی ڕاست لەنەفسی خۆماندا بوونی سێ جیهان دەبینین: یەكەمیان جیهانی هەستی كەبەهەمان ئەو مەشاعیرە هەستیانە پەیان پێ دەبەین و گیانەوەرانیش لەڕووی ئیدراك لەواندا شەریكن لەگەڵماندا. دووەم ئەوەی كەلەناخی خۆماندا ئەو ئەندێشەیەی كەمرۆڤ تایبەتەپێیەوە تێبینی دەكەین و، بەناچاری لەوەوە پەی بەبوونی نەفسی ئینسانی دەبەین لەبەرئەوەی كەلەخۆماندا مەشاعیر و ئیدراكاتی زانستی نەفس كەلەمەشاعیرە هەستیەكان لەپێشترن دەبینین لەوە تێدەگەین كەئەندێشەی جیهانێكی تر لەپێشترە لەجیهانی هەستی. دواتریش ڕێنمایی دەكرێین بۆجیهانێكی سێیەم كەلەپێشترە لەجیهانی خۆمان، چونكە لەبوونی خۆماندا شوێنەوارەكەی كەلەدڵەكانی ئێمە (ئەندێشە) تەڵقین دەبێت دەستماندەكەوێت. وەك ئەو ئیرادەو ئاوازانەی كەبەرەو جوڵەكرداریەكان دەیانكەین هەربۆیە لەوە تێدەگەین كەلێرەدا بكەر یان بزوێنەرێك بوونی هەیە كەئێمە هاندەدات بۆ جوڵەی كارە ئیرادیەكان و ئەو بزوێنەرەش لەجیهانێكی باشتردایە لەجیهانی ئێمە كەهەمان جیهانی ئەرواح و فریشتەكانە لەو جیهانەدا زاتگەلێكی ئیدراككەر بوونیان هەیە، چونكە شوێنەوارەكانیان لەخۆماندا دەدۆزینەوە لەگەڵ ئەوەی كەلەنێوان ئێمە و ئەواندا جیاوازی زۆر هەیە. وەهەرچەندە كەمرۆڤ بەیارمەتی خەون ڕێنمایی دەكرێت بۆ ئەو جیهانی زات و ڕۆحانیەبەرینەكان، وەلەڕێگەی شتانێكەوە پەیان پێدەبەین كەلەخەودا دەیانبینین و لەوكاتەدا ئەوشتانەی كەلەكاتی بەخەبەریدا بێئاگاین

لێیان و، گونجاون لەگەڵ واقیعیەتە ڕاست و دروستەکاندا بۆ ئێمە ئاشکرادەبن و دەخرێنە پێش چاومان و ئەوکات بەئاگادێینەوە کەئەو دەرکەوتن و ئاشکرابوونە گونجاون لەگەڵ حەقیقەت و لەدونیای حەق و ڕاستین. بەلاَم خەوە پەرێشان و ئالۆزەکان بریتین لەو شێوە خەیاڵیانەی کەهێزی ئیدراك لەویژدانی مرۆڤدا کۆگایان دەکات ئەندێشەی پاش دیارنەمان لەجیهانی هەستی لەواندا دەکەوێتە هاتوو چۆکردن.

ئێمەش بۆ سەلماندنی جیهانی ڕۆحانی بەڵگەیەکی ئاشکراترمان لەجیهانی خەون نیە چونکە ئەو بەشێوەیەکی گشتی و تەواو دەیزانین، بەلاَم تێگەشتنی ئەوبەدوورو درێژی بۆ ئێمە ئاسان و بەردەست نیە. وەئەوەی کەحەکیمەخوداییەکان لەبارەی شیکردنەوە و درێژەدان بەباسی زاتەکانی ئەو دونیا گوماندەکەن و تەرتیبەکانیان بەناوی ئەقڵەکانەوە ناوزەد کردووە، هیچ بەڵگە و دەلیلێکیان زانستی.نیە و نامانگەیەنێتەیەقین و دڵنیایی، چونکە ئەوانیان مەرجدار کردووە بەبەڵگە نەزەریەکانەوە هەروەك چۆن گوفتاریان لەمەنتیقدا وایدادەنا و دەیگوت مەرجی بەڵگەی نەزەری ئەوەیە کەمەسەلەکانی ئەوەڵیو زاتی (سەرەتایی و خودی) بن ئەمەلەکاتێکدا زاتیاتی ئەم بوونەوە ڕۆحانیانە نادیارە، کەواتە بۆ سەلماندنیان ڕێگەیەك نیە بۆ بەڵگە و هیچ بەڵگەیەکمان لە درێژەدان بەڕوونکردنەوەی ئەم جیهانە ڕۆحانیانە بۆ ئێمە نامێنێتەوە بێجگە لەوەی کەلەکتێبەکانی شەرعدا هاتووە، کەباوەڕ ڕوون و بەهێزیاندەکات بۆ ئێمە. وەئەوەی کەلەتێگەشتنی ئێمەدا دەگونجێت و دەرککردنی لەهەموو جیهانەکانی تردا بۆ ئێمە ئاسانترە هەمان جیهانی مرۆڤە، چونکە ئەم جیهانە لەئیدراکاتە جەستەییەکان (جسمانی) و ڕۆحانیەکان (باتینی) ئێمە دیارە و لێی تێدەگەین و مرۆڤ لەجیهانی هەستیدا لەگەڵ گیانەوەران و لەجیهانی ئەقڵ ئەوڕاحدا لەگەڵ فریشتەگەلێکدا هاوبەشە، کەزاتیان لەڕەگەزی زاتەکانی جیهانی ئەقڵە کەبریتین لەزاتگەلێکی جیا لەجەستە و مادەو، ئەقڵی ڕووتن کەتێیاندا ئەقڵ و مەعقول یەکن هەروەك بڵێی فریشتە زاتێکە کەحەقیقەتەکەی ئیدراك و ئەقڵە کەواتە زانستی فریشتەکان بەشێوەیەکی سروشتی گونجاوە لەگەڵ زانیاریەکانی ئەماندا و

بەهیچ شێوەیەك كەموكورتی ڕووی تێناكات. بەڵام زانستی مرۆڤ بریتیە لەهاتنەدی شێوەیەكی دیار لەزاتی ئەماندا لەپاش قۆناغێك كەشێوەی ناوبراوی تێدا بەدی نەهاتبێت. كەواتە هەموو زانستەكانی مرۆڤ بەدەستهاتوون (اكتسابی) ین ئەو زاتەی كەلەو شێوەی زانیاریانەدا نەخش دەبەستێت واتە (نەفس) مادەیەكی هیولاییە[١٣٢] شێوەكانی بوون بەشێوەی ئەو زانیاریانەی كەتێیدا كەكەم كەم تێیدا بەدی دێن دادەپۆشێت، تاوەكو دەگاتە كەماڵ و بوونی ئەو بەهۆی مردنەوە لەهەمان مادە و شێوەی كەهەیەتی بەباشی دەمێنێتەوە.

كەواتە ئەو زانیاریانەی كەبەدوایدا گەڕاوین تێیدا بەردەوام لەنێوان نەفی ئیسباتی گوماناویدایە وەیەكێك لەدووبەشەكەی نەفی یان ئیسبات بەهۆی ئاستی مامناوەندی كەپەیوەندی نێوان هەردوولایەنی نابراوە دەدۆزرێتەوە. كەواتە هەركات شێوەیەكی تێدا بێتەدی و بەزانیاری دابنرێت ئەوكات پێویستی بەباسكردنی بەرابەربوون دەبێت هەرچەندە كەبەڵگەی صەناعی (مەنتیقی) ڕوونی دەكاتەوە بەڵام ڕوونبوونەكەی لەپشتی پەردەوەیە وەك ڕوونی ئەو چارەسەرە نیە كەلەزانستی فریشتەكاندا بوونی هەیە و، هەندێك جاریش لەپشتی پەردەوە دەردەكەوێت و بەرابەر دەبێت لەگەڵ هەستدا و بەچاو دەبینرێت. كەواتە ئەوە دەركەوت كەمرۆڤ بەهۆی ئەو گومانەی كەلەزانستی ئەودا دروستدەبێت بەسروشت نەفام و لەڕێگەی بەدەستهێنان وصەناعەتەوە زانیاری پەیدا دەكات، چونكە داخوازی خۆی بەیارمەتی ئەندێشە بەهەلومەرجی صەناعی (بەدەستهێنان) بەدەست دەهێنێت و ئەوپەردەیەی كەئاماژەمان پێكرد كاتێك لەبەردەم دیدە و ویژدانی مرۆڤدا لادەبرێت، كەلەڕێگەی زیكر و دوعاوە دەستبكەین بەڕیازەت و پەرستش و باشترین زیكر و دوعاش نوێژە كەمرۆڤ لەخراپە و خراپەكاری دوور دەخاتەوە. وەهەم لەڕێگەی پاراستنی نەفس و دوور كەوتنەوە لەلەزەت و خۆشیە

---

[١٣٢] وەك دانەپاڵێكە بۆ هیولی كە چیەتی مادە هەرشتێك بێت، حەكیمەكانیش بەم شێوەیە پێناسەیانكردووە (جەوهەرێكە كەشوێنی شێوەی جەستەیەك داگیر بكات).(اقرب الموارد).

دونیاییەگرنگەکانەوە دەبێت کەمرۆڤ دەتوانێت وەدەستیان بخات و سەری هەموو خۆگرتنەوەکانیش ڕۆژووە بەرزتر لەهەموویان ڕووکردنە خودایە بەهەمووهێزو تواناوە، کەرێگەیەکی تری لابردنی پەردەیە لەسەر دیدەی نەفامی خوداش مرۆڤی فێری ئەوەکرد کەنەیدەزانی[١٣٣].

---

[١٣٣] (عَلَّمَ الإِنسانَ مالَم يَعلَم) س الفلق ئا ٥.

## بەشێك

## لەبارەی زانستی پێغەمبەرانەوە درودو سلاوی خودایان لەسەر بێت

ئێمە ئەم بەشە لەمرۆڤ بەم جۆرە دەبینین کەحاڵەتێکی خودایی بەدەر لەئەحواڵ و هەڵسووکەوتەکانی مرۆڤ بەسەریاندا دێت و، ئاراستەی ڕەببانیەت لەناخیاندا زاڵدەبێت بەسەر ئاراستەی مرۆییاندا لەڕووی هێزە ئیدراکی و ئینفیعالیەکانەوە وەك هەواو ئارەزوو تورەیی و حاڵەتەکانی تری جەستەدا زاڵدەبێتو، هەربۆیە دەبینین کەئەمان لەحاڵەتەمرۆییەکاندا بێجگە لەشوێنە پێویستیەکان خۆیان بەدوور دەگرن و ڕوودەکەنە چۆنیەتیە ڕەببانیەکانی وەك پەرستش و زیکری خودا، بەپێی داخوازی ئەو مەعریفەتەی کە بەو هەیانە و ئەوەی کەلەحاڵەتی وەحیدا پێیان دەگوترێت وەك پێشەوایی کردنی ئومەت بەشێوەیەکی یەکسان و ئەو نەریتە دیارانەی کەهەیانە هەواڵ بەخەڵکی دەدەن و بەهیچ شێوەیەك شێوازیان ناگۆڕێت، هەروەك بڵێی شێوازی بانگەوازەکەیان وەك سروشتێکە کەخودا ئەوانی لەسەر ئافراندووە و ئێمەش لەسەرەتای کتێبەکەدا و لەبەشی غەیب گۆیاندا لەبارەی وەحیەوە گفتوگۆمانکرد و، لەوێدا ئەوەمان ئاشکراکرد کەسەرانسەری جیهانی هەستی ئیتر لەجیهانی بەسیت (ئاسایی) یان (مرکب) پێکهاتە لەسەرەوە بیگرە تاوەکو خوارەوە هەموویان لەسەر پەروەردەیەکی سروشتین و هەموویان پەیوەستن بەیەکەوە و لێك جیانابنەوە و، ئەو زاتانەی کەلەکۆتایی هەریەکەلەئاسۆکانی جیهانە کاندان بوونیان هەیە بەسروشت ئامادەباشی ئەوەیان هەیە کەبگۆڕێن بەزاتی دراوسێی و نزیك لە خۆیان ئیتر هی سەرەوە بێت یان خوارەوە.

هەروەك چۆن لەتوخمەكانی مادەی ئاساییدا (بەسیت) دەبنین و لەنەخل و تاك دا لەكۆتایی ئاسۆی گیاكان لەگەڵ حەلەزون و صەدەف لەئاسۆی گیانەوەراندا تێبینی دەكەین وەك بوزینە كەتێیدا ئەقڵ و ئیدراك كۆبووەتەوە كەبەرابەرە لەگەڵ مرۆڤی خاوەن فیكر و ئەندێشەدا. وەئەم توانایەی كەلەهەردووسەری هەرئاسۆیەكی جیهانەكانەوە دەبینرێت بریتیە لەمانای پەیوەستبوونی ئەوان بەیەكتریەوە. وەلەسەر جیهانی بەشەریەوە جیهانی ڕۆحانی هەیە بەڵگەیەلەسەر ئەو شوێنەوارانەی كە لەوەوە لەناوئێمەدا بوونی هەیە و لەهێزی ئیدراك و ئیرادەی ئەو جیهانەدا بەئێمە بەخشراوە. كەواتە زاتەكانی جیهانی ڕۆحانی یەكسەرە ئیدراكی تەواوو تەعەقوڵی ڕووتە ئەوەش بریتیە لەجیهانی فریشتەكان.

وەلەهەموو ئەو خاڵانەی كەباسمانكردن پێویستە كەنەفسی مرۆڤ خاوەنی ئامادەباشی بێت بۆ داڕنین و ڕووتبوونەوە لەبەشەریەت و گۆڕان بەفریشتەیی بێت تاوەكو لەكاتێكی دیاریكراوو چركەساتێكی تایبەتدا بەكردار (بالفعل) ببێتە یەكێك لەفریشتەكان و، دواتر بگەڕێتەوە بۆ جیهانی بەشەریەت و لەجیهانی فریشتەییدا ئەوەی كەئەركەلەسەرشانی بیگەیەنێت بەنەوەكانی مرۆڤ و هاوڕەگەزەكانی خۆی و فێرببێت و مانای وەحی و خیتابو گفتووگۆ لەگەڵ فریشتەكاندا هەرئەمەیە و، هەمووپێغەمبەرانیش بەشێوەیەكی سروشتی لەسەر ئەم چۆنیەتیە ئافرێنراون هەروەك بڵێی ئەم حاڵەتە شتێكی زاتی و سروشتیە لەواندا لەم چركەساتەی داڕنیندا سەختی و جۆش و خرۆشێكی تایبەت مومارەسە دەكەن، كەلەبارەیانەوە(پێغەمبەران) بەناوبانگە لەوكاتانەی كەوەحیان بۆ دێت و چەندە ناڕەحەت دەبن و زانستەكانیان لەم حاڵەتەدا زانستی بینین و موشاهەدەیەو هیچ هەڵەو خلیسكان و پەڵەو وەهمێكی تێدا ڕوو نادات، بەڵكو زانیاریەكانی ئەمان لەگەڵ حەقیقەتی زاتیدا دەگونجێت چونكە پەردەی غەیب لەبەر چاویان لادەبرێت و، لەپاش جیابوونەوە لەو حاڵەتە و گەڕانەوە بۆ جیهانی بەشەریەت، شاهێدی ئاشكرا بۆ ئەوان ڕوودەدات و هەرگیز لەزانستی ئەوان ڕوونی جیا نابێتەوە.

لەڕووی جێبەجێ کردنی داواکردنی هاوڕێیەتیەوە بەسەر حاڵەتی یەکەمدا یان وەحی و بەهۆی ئەوەی کەئەمان خاوەن زیرەکی و هۆشێکن کەدەبێتە هۆی حاڵەتی یەکەم هەربۆیە زانستەکانی ئەمان بەردەوام لەزەینی ئەواندا هاتووچۆ دەکات و تەواو کردنی ڕابەری ئومەتێك کەلەنێو ئەواندا سەری هەڵداوە بەدەستدەهێنن، هەروەك چۆن لەفەرموودەی خودای تەعالادا هاتووە. (پێیان بڵێ من مرۆڤێکم وەك ئێوە و وەحیم بۆکراوە و خودای ئێوە تاك و تەنهایە و ڕووی تێبکەن و داوای لێخۆشبوونی لێبکەن)[١٣٤].

کەوتە لەم بابەتە تێبگە و ئەوەی کەلەسەرەتای ئەم کتێبەوە لەبارەی غەیب گۆکانەوە باسمانکرد سەیری بکەرەوە و ئەوکات شەرح و بەیانی ئەو بۆ تۆ ڕۆشن دەبێتەوە، چونکە ئێمە ئەم بابەتەمان لێرەدا زۆر بەتێرو تەسەلی باسکرد، خوداش سەرفرازی بەخشی مرۆڤەکانە.

[١٣٤] (قُل إِنَّمَا أَنَا بَشَرٌ مِّثْلُكُم يُوحَى إِلَيَّ أَنَّمَا إِلَهُكُم إِلَهٌ وَاحِدٌ فَاستَقِيمُوا إِلَيهِ وَاستَغفِرُوُهُ) س فصلت ئا ٥. وەهەروەها لەئایەتی ١١٠ ی س البقرە شدا ئاماژەی پێکراوە.

## بەشێك

## لەبارەی ئەوەی کە مرۆڤ لەزاتیدا نەزان ( جاهل ) و لەڕێگەی بەدەستهێنانەوە دەبێتە زاناو خاوەن زانیاری

لەسەرەتای ئەم بەشەوە باسمانکرد کە مرۆڤ لەڕەگەزی گیانەوەرانە خودای گەورە ئەوی لەوان بەهێزی ئەندێشەیەك کەلەودا ئافراندوویەتی جیا کردووەتەوە، ئەو بەهێزی ئەندێشەکەی کردارەکانی خۆی ڕێکدەخات و بەم ئەندێشەیەش دەڵێن ئەقڵی تەمییزی، گوتمان ئەگەر بەیارمەتی ئەندێشەی خۆی لەڕێگەی بۆچوون و عەقیدە و بیروباوەڕ و مەصڵەحەت و خراپە و مەفسەدەکانەوە زانست فێرببێت، بەم ئەندێشەیەش دەڵێن ئەقڵی ئەزموونی تەجریبی. وەهەرکات بەهێزی ئەندێشەی خۆی لەتەصەوری بوونەوەران ئیتر دیار بن یان نادیار مەلەکەیەك بەدەست بهێنێت بەو جۆرەی کەهەن بیانزانێت بەم جۆرە فیکرە دەڵێن ئەقڵی نەزەری (تیۆری). وەئەندێشەش تەنها لەپاش کامڵبوونی قۆناغی حەیوانیەت لەمرۆڤدا بەدی دێت، وەلەتەمییز (لەیەکترجیاکردنەوە) وە دەست پێدەکات،چونکە ئەو بەر لەتەمییز بەتەواوەتی بێ بەهرەیە لەزانست و لەڕیزی گیانەوەراندایە لەبنەمادا پێکهاتەی خۆی پەیوەستە بە نوتفەو عەلەقە و موزغە[١٣٥] وە، ئەوەشی کەلەپاش ئەم قۆناغانەوە بۆ ئەم بەدی دێت بەهۆی ئەوەیەکەخودا مەشاعیرو

---

[١٣٥] (فإِنَّا خَلَقناكُم مِّن تُرابٍ ثُمَّ مِنْ نُطفَةٍ ثُمَّ مِن عَلَقَةٍ ثُمَّ مِن مُضغَةٍ مُخَلَّقَةٍ وَغَيرِ مُخَلَّقَةٍ) س الحج ئا ٥، تەرجەمەکەی بەم شێوەیە ئێوەمان دروستکرد لەخاك و دواتر لەمەنی و دواتریش لەپارچەیەك خوێنی بەستوو لەپاش پارچەکەش گۆشتێکی تەواو خیلقەت و ناتەواو خیلقەت.

هەست و ئەفئدە(ئەندێشە) لەناخی ئەودا دەئافرێنێت. خودای گەورە لەوەی کەمنەتی خستوەتە سەر ئێمە دەفەرمێت: (خودا گوێ و چاوو و ئەفئدە (دڵەکانی) پێبەخشین چونکە ئەو لەحڵەتی سەرەتادا و بەرلەتەمییز (هەستکردن) هیولایەك زیاتر نیەو بێئاگایە لەهەموو زانست و مەعریفەکان، ئەوکات شێوەی ئەو هیولایە لەرێگەی ئەو زانستانەی کەبەهۆی کەرەستەکانی جەستەی خۆیەوە بەدەستیان دەهێنێت کامڵ دەبن زاتی ئینسانی ئەو لەووجودی خۆیدا دەگاتە کەماڵ و بەفەرموودەی خودای گەورە لەسەرەتای وەحیەوەسەیر بکەکەچی بەپێغەمبەرەکەی فەرموو: (بخوێنە بەناوی ئەو خودایەی کەخولقانی، مرۆڤ لەخوێنی بەستوو بخوێنە کەخوداکەی تۆ کەریم ترینە ئەو خودایەی کەنوسینی فێر کردن بەقەڵەم، مرۆڤی فێری ئەوشتانەکرد کەنایانزانێت)[١٣٦]. واتە لەپاش ئەو قۆناغەی کەخوێنێکی بەستوو پارچەگۆشتێك زیاتر نەبووە ئەوی والێکرد کەزانستەکان بەدەست بهێنێت کەپێشتر بۆی نەلوابوو.

کەواتە سروشت و زاتی مرۆڤ کەبریتین لەقۆناغەکانی جەهلی زاتی و زانستی کەسبی ئەون بۆ ئێمە ئاشکرابوون و، ئەو ئایەتە بەرێزەش کەخودا تێیدا منەتی خستووەتە سەرمان ئاماژەی بەیەکەمین پلەکانی بوونی مرۆڤ و هەردووحاڵەتی فیتری و کەسبی ئەو لەسەرەتای دابەزینی وەحیەوە کردووە، خوداش داناو حەکیمە[١٣٧].

---

[١٣٦] (إقرَأ بِاسمِ رَبِّكَ الَّذي خَلَقْ، خَلَقَ الإنسانَ مِن عَلَقْ، إقرَأ وَرَبُّكَ الأكرَم، الَّذي عَلَّمَ بِالقَلَمْ، عَلَمَ الإنسانَ مَالَمْ يَعلَمْ) چەند ئایەتێك لە س العلق .

[١٣٧] (وَكانَ اللهُ عَليماً حَكِيماً) س النسا ئایەتەکانی ٢١، ٩٤، ١٠٥، ١١١، ١٦٨، و ئایەتی ٤ س الفتح.

# بەشی یەکەم

## لەبارەی ئەوەی کەزانستەکان و فێربوون لەئاوەدانی و کۆمەڵگەی مرۆڤایەتیدا لەشتە سروشتیەکانە

چونکە هەمووگیانەوەران لەتایبەتمەندیە حەیوانیەکانی وەك هەست و جوڵە و خۆراك و پەناگەی ژیان و نمونەی ئەمانەدا هاوبەشن و، تەنها شتێك کەمرۆڤ لەگیانەوەرانی تر جیادەکاتەوە، بریتیە لەو ئەندێشەیەی کەلەڕێگەیەوە ڕێنمایی دەکرێت بۆ بەدەستهێنانی مەعاشی خۆی و، لەگەڵ هاوڕەگەزەکانیدا لەوبارەیەوە هاوکاری یەکتری دەکەن ئەو کۆمەڵگایەشی کەبۆ ئەم هاوکاری و تەعاونە ئامادەیە و ئەوئەحکامانەی کەپێغەمبەران لەلایەن خوداوە هێناویانە قبوڵیان دەکات و، کاریشیان پێدەکات وبەئەحکامانەش ڕەچاوی بەرژەوەندی قیامەتیشی دەکات، کەواتە بەردەوام ئەو لەهەمووئەمانەدا بیردەکاتەوە و بەئەندازە یەك چاو تروکانیش لەبیر کردنەوە تێیاندا سست نابێت، بەڵکو جوڵە و بزاتنی ئەندێشە لەچاوتروکانیش خێراترە، وەلەم ئەندێشەوەیە کە هەموو زانستو صەنعەتەکان کەلەبەشەکانی پێشوودا باسمانکردن بەدی دێن، وەهەم لەبەر ئەم ئەندێشەو سروشتەی کەمرۆڤ و بەڵکو حەیوانیش لەسەری دروستکراوە بۆ بەدەستهێنانی خواستەکانی تەبعی خۆی بەردەوام کۆشش دەکات. کەواتە ئەندێشە عەودالی بەدەستهێنانی ئیدراکاتێکە کەتێیدا نیە هەربۆیە مرۆڤ دەگەڕێتەوە بۆ کەسانێك کەلەزانستێکدا پێش ئەو کەوتوون یان مەعریفە و ئیدراکێکی زیاتریان هەیە لەو. یان زانیاریەکانی خۆی لەبەرهەم و ئەحکامی پێغەمبەرانی ڕابوردوو وەردەگرێت و بەو

کەسانەیان ڕادەگەیەنێت کەئەیانەوێت فێریانت ببن هەربۆیە ئەحکامەکان لەوانەوە فێر دەبێت و وەریان دەگرێت و بەحەزێکی زۆرەوە هەوڵی وەرگرتنی زانست و ڕاسپاردە و ڕێنماییەکانی ئەوان دەدات، لەپاشان ئەندێشە و نەزەری ئەو ڕوودەکاتە یەکێك لەحەقیقەتەکان و ئەو شتەی کەلەو یەك حەقیقەتەدا بۆ ئەولەزاتیدا عاریز دەبێت و دێتە پێشەوە یەك لەدوای یەك سەیریان دەکات و، ڕاهێنانیان تێدا دەکات تاوەکو گەشتن و پەیوەست بوونی عەواریزەکان (پێشهاتەکان)ی ئەو حەقیقەتە بۆ ئەو لەبوونیدا دەبێتە مەلەکەو، لەم کاتەشدا ئاگایی ئەو لەوەی کەلەو حەقیقەتەوە بۆی دێتە پێشەوە و عاریز دەبێت بەزانستێکی تایبەت دەژمێردرێت.

وەنەوەی نوێش عەودالّی بەدەستهێنانی ئەو زانستانە دەبن و هەوڵی فێربوو نیان دەدەن و ڕوودەکەنە ئەو زاناو مامۆستایانەی کەشارەزان لەو بوارەدا و لەئەنجامیشدا مەسەلەی فێرکردن دێتەدی. کەواتە ئەوە ڕوون بوویەوە کەزانست و فێربوون لەشتە سروشتیەکانی نێوان مرۆڤەکانن. خوداش داناترە.

# بەشی دووەم

## لەبارەی ئەوەی کەفێربوونی زانست لەڕیزی پیشەو صنعەتەکاندایە

چونکە لێزانی مامۆستایی هونەرکردن لەزانست و وەرگرتنی بەگشتی تەنهابەیارمەتی بەدی هاتنی مەلەکەیەکە کەمرۆڤ لەیاساو ڕێساکانی شارەزا دەکات و ئاگاداری دەکاتەوە لەمەسەلەو دەرهێنانی ئوصولّ و بنەماکانی لەفەرعەکان تاوەکو ئەم مەلەکەیە نەیەتەدی ئەوا مرۆڤ لەهونەرێکدا کەلەدەستیدایە مامۆستایی شارەزایی بەدەست ناهێنێت. مەلەکەی نابراویش بێجگە لەتێگەشتن و دەرخکردنە، چونکە دەبینین کەلەتێگەشتن و فەهمدا مەسەلەیەك لەهونەرێکدا قوتابی سەرەتایی و کەسێکی نەخوێندەوار کەهیچ زانستێك فێر نەبووە، لەگەڵ زانایەکی بلیمەتدا یەکسانن و هیچ جیاوازیەکیان لەنێواندا نیە. وەمەلەکە تەنها تایبەتە بەزانا یان قوتابیەوە و بێجگە بۆ ئەوان نایەتەدی. کەواتە دەرکەوت کەمەلەکەی ناوبراو جیاوازە لەتێگەشتن و لەبەرکردن وەئەو مەلەکانەی کەلەمرۆڤدا دێنەدی هەموویان جەستەیین، ئیتر لەجەستەدا بن یان لە مێشکدا وەك ئەندێشە و هێزەکانی تری وەك حیسابکردن. وەهەموو شتەجەستەییەکان هەستپێکراون هەربۆیە پێویستیان بەفێرکردن هەیە، هەربۆیە لەهەر سەرزەوی و هەر سەردەمێکدا سەنەدی فێربوون لەهەموزانست و هونەرەکاندا پێویستی بەمامۆستاگەلێکی بلیمەت و شارەزا هەبووە کەلەهونەر و زانستی خۆیاندا باوەڕپێکرابوون و ئەمەش ئەوە نیشاندەدات کەفێربوونی زانست و هونەرو پیشەیەکی تایبەتە کەزاراوە گەلێکی جیاوازی تێدایە، چونکە هەریەکە لەپێشەوایانی بلیمەتی زانست خاوەن دەستەواژەگەلێکی

تایبەتن لەفێرکردنی زانستدا کەتایبەتە بەخۆیانەوە، هەروەك چۆن جیاوازی زاراوەکان لەهەموو پیشەکاندا باوە و ئەم جیاوازیەش ئەوە نیشاندەدات کەزاراوە نابراوەکان زانست نین، چونکە ئەگەر زانست بوونایە ئەوا دەبوایە لەلای هەموو زانایان وەك یەك بوونایە. مەگەر نابینی لەفێربونی زانستی کەلامدا زاراوەی پێشینان و دواییینان چەندە جیاوازیان هەیە. وەهەروەها لەزاراوەکانی ئوصولّی فیقهو زانستەکانی زمانی عەرەبی فیقهدا، وەهەر زانستێك کەپێویستت بەخوێندنەوەی هەبێت دەبینی کەلەفێربوونیدا زاراوەگەلێکی جۆراو جۆر بوونیان هەیە.

ئەم جیاوازیانەش ئەوە نیشاندەدەن کەپیشەو صنعەتگەلێك بۆ فێرکردن دەبن و، ئەمە لەکاتێکدا چیەتی زانست یەکێکەو (بنەماکانی لەهەموو کات و شوێنەکاندا یەکسانن) لەبەر ئەوەی خالّە باسکراوەکان سەلمێنران دەبێت ئەوە بزانین کەسەنەدی زانست لەم سەردەمەدا نزیکە لەنێو خەڵکی مەغریبدا نەمێنێت، چونکە خراپە و وێرانی ڕووی لەئاوەدانی ئەو شوێنە کردووە و دەوڵەتەکانی بچووك لاواز بوون_ هەروەك چۆن لەبەشەکانی پێشوودا باسمانکرد کەوێرانی ئاوەدانی و زەبوونی دەوڵەتان هۆکاری نەمانی صنعەت و پیشەکانە و بارودۆخی کۆمەڵگە لەکەمی و زۆریاندا کاریگەری دەبێت. وەهۆکاری گریمانی لەناو چوونی سەنەدی زانست لەمەغریبدا ئەوەیەکە قەیرەوان و قورتوبە لەڕابووردودا کەپایتەختی مەغریب و ئەندەلوس بوون و، لەلوتکەی ئاوەدانی گەشەسەندندا بوون و بازاڕی زانست و هونەرەکان لەو دوو وولآتەدا ڕەواجی تەواوی هەبووە و وەك دەریایەکی بێبن وابووە، هەروەك چۆن فێربوونی زانست و هونەر لەو دووشارەدا بەهۆی ئەوەی کەلەسەردەمانێکی دوور و درێژدا خاوەنی شارستانیەت بوون، ڕەگ و ڕیشەی داکوتاوە.

بەلآم هەرئەوەی کەشارە ناوبراوەکان بەرەو وێرانی چوون، فێربوونی زانست و هونەر لەمەغریبدا لەناوچوو بێجگە ئەندازەیەکی کەم نەبێت کەدەوڵەتی مووەحیدانی مەراکیش کەلەو دووناوەندەوە سودیان لێوەر دەگرت وەگەرنا لەشوێنەکانی تر هیچ شوێنەوارێکی

نەمابوویەوە و لەمەراکیشیش شارستانیەت جێگیر نەبوو، چونکە دەوڵەتی مووەحیدان لەسەرەتای کاردا لەسەر هەمان شێوەی دەشتەکیەتی بوون و لەلایەکی تریشەوە دەوڵەتەکەیان هێندە بەردەوام نەبوو سەردەمی لەناوچوونی ئەو دەوڵەتە نزیك بوو لەمێژووی دامەزراندنیەوە، هەربۆیە چۆنیەتیەکانی شارستانیەت بێجگە لەهەندێك شوێندا لەو شارەدا جێگیر نەبوو لەپاش لەناوچوونی ئەو دەوڵەتە لەمەراکیشدا قازی ئەبوالقاسمی کوڕی زەیتوون لەناوەڕاستەکانی سەدەی حەوتەمدا لەئەفریقاوە بەرەو خۆرهەڵات کۆچی کرد، لەگەڵ قوتابیانی ئیمام ئیبن الختیبدا (فخرالدینی ڕازی) بوویە هاونشین و زانستەکانیان لێوە فێربوو لەمەنقول و مەعقولدا شارەزایی باشی پەیدا کرد و بەزانستی فراوان و شێوازی باشی فێربوونی زانستەوە گەڕایەوە بۆ تونس. بەدوای ئەویشدا ئەبو عبداللەی کوڕی شوعەیبی دکالی کەلەمەغریبەوە چووبویە خۆرهەڵات لەو سەرزەویەدا گیرسایەوە و لەپاش فێربوون و دەستخستنی زانست و زانیاری لەزاناو مەشایخەکانی میسرەوە فێربوو گەڕایەوە بۆ تونس و، لەو شارەدا نیشتەجێ بوو شێوازی فێرکردنەکەی ئەمیش وەك ئەوانیتر بەسود بوو.

هەربۆیە خەڵکی تونس لەکۆڕی دەرس و وانەکانیان فەیزو بەرەکەتی زانستیان بوویە نسیب و سەنەدی فێربوونی ئەوان ئەوە لەدوای ئەوە دەگەیشتە قوتابیەکانیان تاوەکو گەیشتە قازی محمدی کوڕی عبدالسلام شاریحی ئیبن الحاجیب و شارگردەکانیدا کۆتایی هات. ئەم سەنەدەش لەتونسدا گەشتە تلمسان واتە گەشتە ئیبن الامام و قوتابیەکەی، چونکە ئەو لەگەڵ ئیبن عبدالسلامدا لەلای مەشایخەکان تەنها لەکۆڕی یەك دەرس و وانەدا بۆ فێربوونی زانست و گوێگرتن لەحەدیس ئامادە بووە، ئێستاکەش قوتابیەکانی ئیبن عبدالسلام لەتونس و ئیبن الامام لەتلمسانن، بەڵام ژمارەیان هێندە کەمە کەترسی ئەوەهەیە سەنەدەکەیان بپچڕێت. دواتریش ئەبو علی ناصرالدینی مشدالی[١٣٨] لەکۆتایی سەدەی حەوتەم لەهۆزی زواوە بەرە و خۆرهەڵات ڕۆشت و لەکۆڕی قوتابیانی ئەبو

---

[١٣٨] المشدالی: تیرەیەکن لەهۆزی بەر بەر کەناوزەدکراون بە زواوە.

عومەری کوڕی حاجیبدا بەشداری کرد و حەدیس و زانستیان لێوە فێربوو لەگەڵ چۆنیەتی فێربوونیانداو لەگەڵ شەهابەدینی قەرافیدا لەکوڕی دەرسی چەند مامۆستایەکی کەمدا قوتابیەتی کردو لەزانستە مەعقول و مەنقولەکاندا شارەزاییەکی باشی پەیدا کردو، بەزانستێکی فراوان و شێوازێکی فێرکردنی بەسود گەڕایەوە مەغریب و لەبجایەدا نیشتەجێ بوو، سەنەدی فێربوونەکەی گەیشتە قوتابیانی ئەوێ و هەرچەندە کەدەڵێن عیمرانی المشدلی چووەتە تلمسان بۆلای قوتابیانی ئەوو لەو شارەدا ژیاوە و شێوازی ئەوی لەتلمساندا بلاّو کردووەتەوە.

لەم سەردەمەشدا قوتابیەکانی ئەو لەبجایە و تلمساندا کەمن و بەپەنجەکانی دەست دەژمێردرێن. وەلەسەردەمی لەناو چوونی فێرکردن لەقورتوبە و قەیرەوان و فاس و ناوچەکانی تری مەغریب لەفێربوونی باش بێبەهرەن و سەنەدی فێربوونیان پێنەگەشتووە و هەربۆیە بەدیهاتنی مەلەکەی لێهاتن و مامۆستایی و شارەزایی لەزانستەکاندا بۆ ئەمان زۆر دژوارە. وەئاسانترین شێوازەکانی بەدیهاتنی ئەم مەلەکەیە هێزبەخشینە بەزمان[١٣٩] لەڕێگەی حیوار و مونازەرەوە لەمەسەلە زانستیەکاندا. هەروەك چۆن بەم شێوازە چۆنیەتی جێگیر بوونی مەلەکە بەزوویی بەدی دێت و مرۆڤ دەگەیەنێتە مەبەست. ئەمەلەکاتێکدایە ئەگەر بێت و ڕوونەکەنە ئەم شێوازە ئەوا درەنگ دەگەنە ئامانج، هەربۆیە کەسانێك لەوانەی کەبەشوێن زانستدا دەگەڕێن دەبینین کەلەپاش تێپەڕبوونی ساڵانێکی دوور و درێژ لەتەمەنیان لەکوڕە زانستیەکاندا بێدەنگی هەڵدەبژێرن‌و بەهیچ شێوەیەك قسەناکەن و لەو بابەتانەی کەباسدەکرێت بەشداری ناکەن، بەڵکو زیاتر گرنگی بەلەبەرکردنی زیاد لەپێویست دەدەن هەربۆیە سودێکی ئەوتۆ لە مەلەکەی ڕۆچوون و شارەزابوون لەزانستدا نابەن.

وەتەنانەت لەم گروپەش کەسانێك دەبینین کە لەپاش لێبوونەوە لەکەسبی زانست ئەو مەلەکەیەشی کەلەزانستێکداهەیانە کەموکورتەو، ئەگەر بێت و دەستبکەن بەگفتوگۆو

---

[١٣٩] واتە گەشەکردن و فراوانکردنی زمان.

مونازەرە یان فێربوون بەباشی توانایان نابێت بەسەریدا. سەرچاوەی ئەم کەموکورتی و قصورەش تەنها دەگەڕێتەوە سەرچۆنیەتی فێربوونی زانست و لەدەستچوونی سەنەدەکەی[١٤٠]. وەگەرنا ئەندازەی لەبەرکراوەکانی ئەوان زیاتر و تەواترن لەخەڵکانی تر. چونکە زیاتر ڕووی تێدەکەن و وادەزانن لەبەرکردن تەنها مەبەستێکە کەبەهۆیەوە مەلەکەی زانستی بەدی دێت، ئەمەلەکاتێدا بەم شێوەیە نیە. وەلەو شتانەی کەلەمەغریبدا گەواهیدەرە لەسەر ئەم شتانە ئەوەیە کەماوەی دیاریکراوی مانەوە و نیشتەجێبوونی قوتابیانی زانست لەقوتابخانەکانی ئەماندا شانزەساڵە و لەتونسدا پێنج ساڵەو ماوەی کۆتاییش کەمترین کاتێکە کە زانستخواز تێیدا دەگاتە مەبەستی خۆی، واتە بەدەستهێنانی مەلەکەی زانستی، یان لەبەدەستهێنانی زانست زانست نائومێد دەبێت و لەم ماوەیەدا لەمەغریبدا بەهۆی دژواری هۆکارەکانی بەدەستهێنانی زانست بەتایبەت بەهۆی کەمی لێهاتن لەزانست و فێرکردنیدا و نەبوونی شێوازە باشەکانیەوە هەربۆیە دەتوانین بڵێین تەنها هۆکار هەرئەمەیە[١٤١].

بەڵام لەخۆرهەڵاتدا سەنەدی فێرکردن بەردەوام لەو سەرزەمینەدا پایەدارە، و تەنانەت بازاڕی زانستکەشی ڕەونەق و ڕەواجێکی زۆری هەیەو، دەریاگەلێکی بێبن و فراوانی زانست بوونیان هەیە و هۆکاری بەردەوامی ئاوەدانی و فراوان و پەیوەستبوونی سەنەدی فێربوونە لەناوچەکاندا، هەرچەندە ئەوشارەگەورانەی کەوەك کانزای زانست دەژمێردران وەك بەغداد و بەصرە و کوفە وێران بوون، بەڵام خودای گەورە زانستی لەو شارانەوە گواستوەتەوە بۆ شارانێکی تر و زانستی شارە ناوبراوەکانیش گوازراوەتەوە بۆ عێراقی عەجەم، وەك خۆراسان و ماوراء النهرین و لەخۆرهەڵات و لەپاشان بۆ قاهیرە و ناوچەکانی نزیك لەو لەمەغریب.

---

[١٤٠] لێرەدا ئیبن خەلدون شێوازی نوێی ڕاهێنان و کردار بۆ بەدەستهێنانی مەلەکەی زانست بەباشتر دەزانێت لەلەبەرکردن و بەهێزکردنی حافیزە (بیرگە).

[١٤١] ئیبن خەلدونیش بەشێواز و میتۆدی ڕاست لەفێرکردندا گرنگی بەشێوازی فێرکردنی فێرکارانی هاوچەرخ دەدات و وەك ئەوان دەکات.

لەوشارانەشدا زانست فراوانە و ئاوەدانیان بەردەوامە و سەنەدی فێربوون تێیاندا پایەدارە. هەربۆیە خەڵکی خۆرهەڵات بەگشتی لەهونەری فێربوونی زانستدا و بەڵکو لەهونەرەکانی تریشدا قوڵتر و ڕاسترن بەجۆرێك زۆرێك لەجیهانگەڕانی مەغریب کەبۆ فێربوونی زانست دەچنە خۆرهەڵات، اگوماندەکەن کەبەشێوەیەکی گشتی ئەقڵی خەڵکی خۆرهەڵات لەئەقڵی خەڵکی مەغریب کامڵتر و تەواوترن و، پێیان وایە کەخۆرهەڵاتیەکان بەیەکەمین فیترەت زیرەکتر و هۆشمەند ترن و نەفسی گۆیایان بەسروشت لەنەفسی گۆیاه خەڵکی مەغریب کامڵترە و باوەڕیشیان وایە کەجیاوازی نێوان ئێمە و ئەوان لەجیاوازی نێوان حەقیقەت و ماهیەت (چیەتی) یدایە، هەربۆیە پەیڕەوی لەم تیۆرەدەکەن و عەودالّن بۆی. چونکە ئەندازەی هۆشمەندی ئەوان لەزانست و هونەرەکاندا دەبینن، بەڵام حەقیقەت بەم جۆرە نیە و لەنێوان خەڵکی خۆرهەڵات و مەغریبدا بەوئەندازەیەش جیاواز نیە لەحەقیقەتدا مەگەر ئەوەی کەبڵێین لەنێوان دانیشتوانی هەرێمەلاربووەکاندا(نامامناوەند)، وەك هەرێمی یەکەم و حەوتەم لەگەڵ هەرێمەکانی تردا جیاوازی هەیە، چونکە هەروەك ڕابوور میزاجی دانیشتوانی هەرێمەناوبراوەکان لارەو نەفسەکانیشیان بەهەمان ئەندازە دەگۆڕدرێت.

وەتەنها شتێك کەوایکردووە خەڵکی خۆرهەڵات لەخەڵکی خۆرئاوا لەپێشتر بن بریتیە لەو کاریگەریانەی کە شارستانیەت لەنەفسەکاندا بەجێی دەهێڵێت هەروەك چۆن لەبەشەکانی پێشوودا باسمانکرد لەئەندازەی ئەقڵی مرۆڤ لەپیشەسازیەکاندا زیاد دەکات. ئێستەش بۆ سەلماندنی ئەم بابەتە دەستدەکەین بەڕاڤە و لێکۆڵینەوەی زیاتر. هۆکاری سەرەکی ئەم جیاوازیانە ئەمەیکە شارنشینەکان لەهەمووحاڵەت و چۆنیەتیەکانی مەعاش و شوێنی نیشتەجێ بوون و خانوو کاروبارەدینی و دونیاییەکاندا، ئاداب و یاساو ڕێساگەلێکیان هەیە، وەهەروەها لەکارونەر یتەکانی تریشدا پەیڕەوی لەکۆمەڵێك داب و نەریتی تایبەت پەیڕەوی دەکەن و هەروەك چۆن لەهەموو ئەم کاروبارانەدا داب و نەریتگەلێکیان هەیە کەلەهەمووکاروبارە باش و خراپەکانی مەعاشیاندا پابەندن

پێیانەوە. هەروەك بڵێی داب و نەریتی ناوبراو سنورگەلێکن کەناتوانرێت ببەزێنرێن. وەلەهەمانکاتدا داب و نەریتی ناوبراو وەك هونەرگەلێکن کە کۆتاییان لەیەکەمینیانەوە فێری دەبێت و گومانیش لەوەدا نیە کەهەرصەناعەت و هونەرێکی ڕێکوپێك کاریگەری دەبێت لەنەفسی مرۆڤدا کەلەئەنجامی ئەوەشدا ژیری و هونەرێکی تازە بەدەستدەهێنێت، بۆ وەرگرتنی هونەرێکی تریش ئامادە دەبێت و بەهۆیەوە ئەقڵ لەبەدەستهێنانی مەعریفەکاندا بەتوانای خێرایی گواستنەوە و بیر تیژی ئاراستە دەکرێت. بەڵام ئەو هەواڵانەی کەلەبارەی چۆنیەتی صەنایع و پیشەکانەوە لەنێو میسریەکاندا بیستومانە وەك ئارەزو گەلێکی دوورو درێژو ئامانجگەلێکە کە بەدەستهێنانیان زۆر دژوارە وەك ئەوەی کەئەوان لەکەرەماڵیەکان و گیانەوەرانی بێ زمان ئەوانەی کەدەلەوەڕێن بیگرە، تاوەکو باڵندەکان کردارو ووشەگەلێك فێر دەبن کەمایەی حەزلێکردن و سەرسامیە و خەڵکی مەغریبیش لێیان تێناگەن.

فێربوونی مەلەکەی باش لەفێرکردنی صنعەتەکان و چۆنیەتیە ئاساییەکانی تریشدا هۆشمەندی و ژیری زیاد دەکات و ئەندێشە ڕۆشن و پرشنگدار دەکات، چونکە مەلەکەگەلێکی زۆر لەدەروندا(نەفس) بەدی دێن. ئێمەش لەبەشەکانی پێشوودا باسمانکرد کەنەفسی گۆیای مرۆڤ بەهۆی ئیدراکات و ئەو شتانەی کەوابەستەیە پێیانەوە وەك مەلەکەکان پەروەردەدەبێت و ئیدراکات و مەلەکەکان بەهۆی گێڕانەوەی شوێنەوارە زانستیەکان بۆ نەفس ئەندازەی هۆشمەندیەکەی زیاد دەکات و، ئەوکات خەڵکی بەگشتی وادەزانن ئەم جۆرە هۆشە بەهۆی ئەو جیاوازیەوەیە کەلەحەقیقەتی مرۆڤایەتیدا بوونی هەیە، ئەم لەکاتێکدا بەم شێوەیە نیە وەئەگەر شارنشینەکان لەگەڵ دەشتەکیەکاندا بەراورد بکەین، دەبینین کەشاریەکان چەندەزیرەکن بەجۆرێك خەڵکی دەشتەکی ئەو باوەڕەیان لەلای خۆیان دروستکردووە کەشارنشینەکان لەمرۆڤایەتی و ئەقڵدا لەوان لەپێشترن و لەو تواناو بیرو هۆشەی شارنشینەکان بێبەشن، کەلەڕاستیدا ئەم بیرکردنەوەیەش ڕاست نیە، بەڵکو هۆشمەندی و زیرەکی شارنشینەکان هیچ هۆکارێکی نیە بێجگە لەوەرگرتنی مەلەکەباشەکان لەڕێگەی صەنایع و داب و نەریت و

چۆنیەتیەکانی شارنشینیەوەیە کەدەشتەکیەکان بەگشتی لێی بێئاگان. وەکاتێك کەکەسێکی شاری بەهۆی ئەو صنعەت و مەلەکانەی کەلێیانەوە فێریان دەبێت و لەباش فێرکردنی مامۆستایانی شارەزا دەبێتە هونەرمەندی ئەو بوارە، دەشتەکی وادەزانێت هەرکەسێك لەم مەلەکانەدا بگاتە قۆناغی کۆتایی و تواناییان تێدا بەدەست بهێنێت بەهۆی ئەو کەماڵەوەیە کەلەئەقڵی ئەودا بوونی هەیەو، پێی وایە نەفسی دەشتەکیەکان بەسروشت هەربەو جۆرە ئافرێنراوە کەلەوەرگرتن و فێربوونی ئەم جۆرە هونەرانەدا بێتوانان، بەلام حەقیقەتی شتەکە بەم شێوەیەنیە چونکە ئێمەخەڵکانێکی دەشتەکی دەناسین کەلەزات و فیترەتیاندا لەبالاترین پلەکانی کەماڵ و ژیریدان.

وەتەنها بەڵگەیەك کەسەرچاوەی هۆشی شاریەکان و تواناپانە هەمان ئەو ڕەونەق و گەشاوەییە لەپیشەسازیەکان و شێوازی فێربوونی باشە لەنێوانیاندا، چونکە صەنایع و تەعلیم هەروەك پێشتر باسمانکرد خاوەنی کاریگەری گەلێکن کەکاردەمەن سەر دەرونی مرۆڤ. دەبێت خەڵکی خۆرهەلاتیش لەسەر ئەم ڕێڕەوە پێوانە بکەین، چونکە ئەوان لەڕووی تەعلیم و صەنایعەوە لەپلەیەکی بالاتردان و هەنگاوگەلێکی بەرزتریان لەم ڕێگەیەدا هەڵگرتووە و خەڵکی مەغریبیش لەدەشتەکیەتەوە نزیکترن هەروەك لەبەشی پێشوودا باسمانکرد. ئەمەگومانی خەڵکی بێئاگایە کەلەیەکەمین سەیرکردندا پێیان وایە کەلەپێشتربوونی خۆرهەلاتیەکان بەهۆی ئەو کەماڵەوەیە کەلەحەقیقەتی مرۆڤایەتی ئەواندا بوونی هەیە و هەربۆیە بەبەراورد بەخەڵکی مەغریب لەپلەیەکی بالاتردان لەزانست و هونەردا، لەکاتێکدا بیرکردنەوەکەیان هەڵەیە. هەربۆیە دەتوانیت حەقیقەتی ئەم شتە بەباشی تێبگەیت. خوداش لەنێو ئافرێنراوەکانیدا هەرچیەك کەبیەوێت زیادی دەکات. وەخودای ئاسمانەکان و زەویە.[١٤٢]

---

١٤٢ (یزید فی الخلق مایشاء).

# بەشی سێیەم

## لەبارەی ئەوەی کەزانستەکان لەشوێنێکدا زۆر دەبن کەئاوەدانی گەشەبکات و شارستانیەت بگاتە هێز و گەورەیی

چونکە فێربوونی زانست هەروەك باسمانکرد لە پیشەسازیەکانە و ئێمەش لەبەشەکانی پێشوودا ئەوەمان وەبیر هێنایەوە کەپیشە سازیەکان تەنها لەشارە گەورەکاندا زۆر دەبێت بەئەندازەی کەم و زۆری ئاوەدانی و، ئەندازەی شارستانیەت و هۆکارەکانی جوانپەرستی و نازو نیعمەت لەواندا گەشە دەکات و زۆردەبێت، چونکە صنعەت شتێکی زیادەلەمەسەلەی مەعاش هەربۆیە هەرکات کەسانێك دەستدەکەنە کاری ئاوەدانی سەرەڕای کارەتایبەتیەکانی ئامادەکردنی مەعاش هەل گەلێکی زیاتر بەدەست بهێنن، ئەوکات سەرقاڵ دەبن بەکاروبارگەلێکی باشتر و لەپێشتر لەمەسەلەی مەعاش وەك دەستێوەردان لەتایبەتمەندیەکانی مرۆڤ و کەبریتیە لە زانست و صنعەتەکان و کەسێکیش کەلەگوند و شار بێ شارستانیەتەکاندا پەروەردە دەبێت و، بیەوێت بەفیترەتی خۆی و بەبێ هۆکاری پێویست زانست بەدەست بهێنێت ناتوانێت ئەو شێوازە فێرکاریەی کەلایەنی هونەری هەیە بەدەست بهێنێت، چونکە دەشتەکیەکان هەروەك باسمانکرد صنعەت و هونەریان نیە وئەم جۆرە کەسەش بەناچاریەوە دەبێت سەردانی شارەگەورەکان بکات کەزانست و هونەریان تێدایە، هەروەك چۆن دەشتەکیەکان بۆ فێربوونی صنعەت و پیشەسازیەکان دەچنە شارەکانەوە. وەدەبێت ئەوەی کەلەبارەی بارودۆخی بەغداد و قورتوبە و قەیرەوان و بەصرە و کوفەوە باسمانکرد پەند وەربگرین

لەبەرئەوەی لەسەرەتای هاتنی ئیسلامدا شارەناوبراوەکان فراوان بوون و بنەماکانی شارستانیەت تێیاندا جێگیر بوو زانست تێیاندا زیادی کرد و وەك دەریایەکی بێبنیان لێهات لەزانست و هونەردا و لەزاراوەکانی تەعلیم و بەشەکانی زانستەکان و دەرهێنانی مەسەلەوهونەرەکاندا جۆرەها شێوازیان داهێناو، لەپێشینانیان تێپەڕیانکرد و کەوتنە پێش دوایینان و خەڵکانی سەردەمی خۆشیانەوە، بەڵام هەرکە کەموکورتی کەوتە ئاوەدانی و شارستانیەتیانەوە و دانیشتوانەکانیان بڵاوەیان کرد و بەند و بەساتیان پێچرایەوە و ئەو هەموو زانست و فێربوونەیان لەدەستدا و زانستەکانیان گوازرایەوە شارەئیسلامیەکانی تر هەروەك چۆن لەم سەردەمەدا دەیبینین کەیەکێك لەناوەندەکانی زانست و فێربوون شاری قاهیرەیە لەووڵاتی میسر، لەبەر ئەوەی کە ووڵاتی میسر هەزاران ساڵ لەمەو بەر خاوەنی ئاوەدانیەکی فراوان بووە و شارستانیەتێکی بەهێزی هەبووە هەربۆیە پیشە سازیەکانی ئەو ووڵاتە لەوانەش تەعلیمی زانست لەوپەڕی بەهێزی و جۆراو جۆریدایە.

وەئەو ڕووداوانەی کەلەسەدەکانی کۆتایدا لەدووسەد ساڵ لەوە و بەرەوە لەدەوڵەتی تورکدا لەسەردەمی صلاح الدینی کوڕی ئەیوبدا تاوەکو ئەم سەردەمە لەو ووڵاتەدا ڕوویداوە یارمەتی بەهێزبوون و پاراستنی صەنایع و پیشەسازیەکانی میسری داوە، چونکە ئەمیرە تورکەکان لەدەزگای دەوڵەتی خۆیاندا لەجەنگاوەرانی سوڵتانیان دەترسان لەو ڕووەوەی کەئەندامانی خاندانی خۆیان لەوان لەپێشتر دەزانن، لەبەرئەوەی کە ئەو گروپە لەڕێگەی بەندەیی یان لەڕێگەی وەلائەوە لەدەرباری سوڵتاندا هەڵبژێردراون و لەلێپرسینەوە نەگبەتبار و توندی سوڵتان دەترسن. ئەمیرە ناوبراوەکان قوتابخانە و زاویە و ڕیباتگەلێکی زۆر دروستدەکەن و ئەو موڵکانەی کەدەرامەتێکی فراوانیان هەیە وەقفیان دەکەنەسەریان و سودێکیش بۆ منداڵەکانیان دیاری دەکەن کەچاودێری شتە وەقفکراوەکان دەکەن یان بەشی خۆیان لەوانە هەڵدەگرن، سەرەڕای ئەمانەش ئەوانە زیاتر خوازیاری کاری چاکە و ئەجرو پاداشتن لەکارو کردەوە

باشەکانیاندا و لەئەنجامدا ئەوقاف لەو وولاتەدا زۆربووەو، بەرهەم و سودگەلێکی گەورەیان لێوە بەدەست دێت. هەربۆیە قوتابیانی زانست و مامۆستایانێکی زۆر لەو وولاتەدا بوونیان هەیە، چونکە وەزیفە و مووچەگەلێکی زۆر لەو وەقفانەوە دەگات بەوان و خەڵکیش لەعێراق و مەغریبەوە بۆ بەدەستهێنانی زانست دەچنە ئەو سەرزەمینە و بازاڕی زانست ڕەونەقێکی زۆری هەیە و وەك دەریایەکی بێبن و فراوان وەهایە، خوداش ئەوەی کەبیەوێت دەیئافرێنێت"[١٤٣].

---

[١٤٣] (وَاللهُ يَخْلُقُ مايَشاء) س المائده ئا ٣٠.

# بەشی چوارەم

## لەبارەی هەمووئەو جۆرە زانستانەی کەتاوەکو ئەم سەردەمەش لەئاوەدانی کۆمەڵگەی مرۆڤایەتیدا بەدیهاتوون

دەبێت ئەوە بزانین کەئەوزانستانەی کەمرۆڤ تێیاندا ڕۆدەچێت و قوڵدەبێتەوە و لەشارە گەورەکاندا ئیتر بەمەبەستی بەدەستهێنان یان فێربوونەوە بێت باویان هەیە لەسەر دووشێوەن: جۆرێکیان بۆ مرۆڤ ئاساییە کەبەیارمەتی ئەندێشەی خۆی بۆ ئەوانە ڕێبەری دەکرێت، وەجۆری دووەمیش نەقڵین کە لەو کەسانەوەی کەدایانناون فێریان دەبن یان وەریاندەگرن. جۆری یەکەم بریتیە لە زانستەکانی حیکمەت و مەسەلە فەلسەفیەکانە کەمرۆڤ دەتوانێت بەپێی سروشتی ئەندێشەی خۆی پەی بەوانەبباتو بەیارمەتی مەشاعیرە مرۆییەکانی خۆی ڕێنمایی بکرێت بۆ بابەت و مەسەلە و بەڵگەو ڕووە کانی فێربوون بۆ ئەوەی نەزەری بوەستێنێت و باش و خراپ لەیەکتر جیابکاتەوە. دووەمیان زانستە نەقڵیە دانراوەکانە کە هەموویان سەندیان دەگەڕێتەوە سەروازیعێك (دانەرێکی) شەرع و ئەقڵ تێیاندا هیچ ڕۆڵێکی نیە مەگەر لەپەیوەستکردنی فەرعەکان بەئەصڵەکانەوە[١٤٤]، چونکە بەشەکانی ڕووداوێکی یەك لەدوای یەك تەنها بەدانانیان ناچنە ژێر نەقلێکی گشتیەوە، بەڵکو دەبێت ئەو جوزئیاتە (ناسەرەکی) یانە بەشێوەیەکی قیاسی پەیوەست بکەین بەوانەوە. بێجگە لەوەی کەقیاس لەخەبەر جیادەبێتەوە

---

[١٤٤] مەبەست لێرەدا قیاسە کەیەکێکە لەمصادری شەریعە.

لەڕێگەی سابیت بوونی حوکمەکە لەئەصڵەکەدا کەئەویش نەقڵیە، کەواتە ئەم قیاسە دەگەڕێتەوە سەر نەقڵ، چونکە لەوەوە جیادەبێتەوە. ئەصڵی هەموو ئەم زانستە نەقڵیانە بریتین لەشتە شەرعیەکانی وەك کتاب (قورئان) سوننەت کەلەلایەن خوداوپێغەمبەرەوە بۆ ئێمە تەشریع کراون و، ئەو شتانەشی کەپەیوەستن بەوانەوە وەك ئەوزانستانەی کەئامادەکردنیان بۆ سود وەرگرتنە. کەواتە پێویستی فێربوونی ئەم زانستانە بریتیە لەزمانی عەرەبی کەزمانی نەتەوەی ئیسلامە و قورئانیش بەو زمانە دابەزیوە. وەزانستە نەقڵیەکان چەندین جۆریان هەیە، چونکە پێویستە لەسەر هەموو مرۆڤێکی موکەلەف حوکمەکانی خودا کەبۆ ئەوو هاوڕەگەزەکانی نێردراون و واجب کراون بزانێت و حوکمە ناوبراوەکانیش لەقورئان و سوننەتەوە وەرگیراون ئیتر بەنص (دەق) یان ئیجماع[١٤٥] یان بەپەیوەستکردن (الحاق) کەواتە ناچار دەبێت لەیەکەمین قۆناغدا دەستبکەین بەشەرح و ڕاڤەی زاراوەکانی قورئان کەپێیان دەڵێن زانستی تەفسیر، لەپاشان لەبارەی نیسبەتدانی نەقڵ و ڕیوایەتی قورئان بەپێغەمبەرکەلەلایەن خوداوە هێناویەتی و جیاوازی ڕیوایەتەکانی قورئان خوێنان لە قیرائەتدا و باسدەکەین، کەپێی دەڵێن زانستەکانی قورئانخوێندن (علوم القرائە).

دواتریش دەست دەکەین بەباسی زانستی حەدیس کەبریتیە لەگفتوگۆ لەبارەی نیسبەتدانی سوننەت بەخاوەنەکەیەوە و ناسین و شەرحکردنی حاڵی ڕاوی (گێڕەرەوەکان) و، عەدالەتیان ئەوانەی کەفەرمووده دەگێڕنەوە تاوەکو ئەخبارەکانیان بەپێی ئەو زانستە بێت کەلەو بارەیەوە هەیە، ئەمەش بەمەبەستی بەدیهاتنی متمانە(وسوق) و دواتریش بەناچاریەوە دەبێت حوکمەناوبراوەکان لەئەصڵەکانیان دەربهێنین بەلام بەشێوازێکی یاسایی کەبەپێی چۆنیەتی دەرهێنانی زانستەکان بەسود بێت، بەم جۆرە زانستەش دەڵێن (ئوصوڵی فیقە). لەدوای ئەمانەشەوە دەگەینە زانستێك کەحوکمەکانی خودای گەورە لەکرداری کەسە موکەلەفەکانەوە بەدی دێن و بەمەش دەڵێن زانستی فیقە لەپاشان دەبێت ئەوە بزانین کەتەکلیفە ناوبراوەکان یان جەستەین

---

[١٤٥] واتە کۆدەنگی زانایانی موسوڵمان لەسەر مەسەلەیەك).

یان قەلبی بەشی دووەم تایبەتە بەباوەڕ و ماناکانەوە کەدەبێت لەنێوان پارچەیەك لەمانا سەلبیەکاندا باوەڕیان پێبهێنین و، بەمانەش دەڵێن بیرو باوەڕە ئیمانیەکان کەلەبارەی زات و صیفاتی خوداو ڕۆژی حەشر و قیامەت و بەهەشت و دۆزەخی ئەو دونیا و قەدەرەوەیە بەڵگەهێنانەوە لێیانەوە بەبەڵگە ئەقڵیەکانە و بەبەڵگە ئەقڵیەکان دەیانگەیەننە سبوت و دەیانسەلمێنن، بەم جۆرە زانستەش دەڵێن زانستی کەلام (علم الکلام). بەڵام زانستە پەیوەستەکان بەزمانەوە، لەبەحس و بیرکردنەوە لەقورئان و حەدیسەوە لەپێشترە واتە وەك پێشەکی ئەوانی وەهان، چونکە زانستەکانی کۆتایی لەسەر زانستگەلێك وەستاون کەپەیوەستن بەزمانەوە کەبریتین لە: زانستی زمانەوانی (لغت) زانستی ڕێزمانی عەرەبی (نحو)، زانستی بەیان (بلاغە) و، زانستی ئەدەبیات، کەلەبارەی هەموویانەوە گفتوگۆدەکەین.

هەموو ئەم زانستە نەقڵیان تایبەتن بەئومەتی ئیسلام و نەتەوە موسوڵمانەکانەوە هەرچەندە هەرمەزهەبێك بەشێوەیەکی گشتی بەویست و بێ ویست بەناچاریەوە دەبێت هاوشێوەی ئەم زانستانەیان هەبێت. هەربۆیە زانستە ناوبراوە کان لەجنسی بەعیددا[١٤٦] لەڕووی ئەوەی کە پێیان دەڵێن علومی شەرعی (زانستە شەرعیەکان) وەلەلای خوداوە بۆ خاوەنی شەریعەت و کەسێك کە ڕایاندەگەیەنێت بەخەڵکی نازڵ دەبن، لەنێو هەموو مەزهەبەکاندا هابەشە، بەڵام لەڕووی تایبەتمەندیە لەمەزهەبەکانی تر جیاوازن، چونکە ئەحکامە ناوبراوەکان ناسخ (سڕەرەوە) ی هەموو ئەو مەزهەب و زانستانەیە کەلەپێش ئەوانەوە لەناو خەڵکیدا هەبوون، هەربۆیە هەموو مەزاهیبەکانی تر وازلێهێنرا ون و بیر کردنەوە لێیان قەدەغەیە، چونکە خوێندنەوەی شەرع و تێڕوانین لەکتێبە ئاسمانیەکانی بێجگە لەقورئانی قەدەغەکردووە.

پێغەمبەر (ص) دەفەرمێت:(نابێت بەئەهلی کیتاب بڵێین ڕاستن یان درۆن، بەڵکو بڵێن ئەوەی کەبۆ پێغەمبەری ئێمە و ئێوەش نازڵ بووە باوەڕمان پێیەتی و خودای هەردووکمان یەکە. وەکاتێك کەپێغەمبەر لەدەستی عومەردا لاپەڕەیەکی تەورات دەبینێت

---

[١٤٦] لەزاراوەکانی مەنتیقە کەلەپێناسەکاندا جنس دابەشدەکەن بەقریب (نزیك) بعید (دوور).

هێندە توڕەدەبێت کەدەمووچاوی چرچ دەبێت و پێی دەڵێت: ئایا ووشەی بەیزام (قورئان) بۆ نەهێناون، سوێند بەخودا ئەگەر موسا زیندوو بوایە هیچ چارەیەکی نەبوو بێجگە لەوەی کە دەبوو پەیڕەوی لەمن بکات).

لەپاشان دەبێت ئەوە بزانین کەئەم زانستە نەقلّیە شەرعیانە لەنێو موسوڵمانانددا زیاد لەپێویست ڕەواجیان پەیدا کردووە تێگەشتن و ئیدراکی لێکۆڵەرەوان و خوێنەرانی ئەو زانستانە گەشتووەتە قۆناغێکی کامڵ و تەواو کەلەسەرویەوە تەسەووڕناکرێت، زاراوەکان پاڵفتەکراون و هونەری هەریەکەیان ڕێکخراوە و لەباشی ڕێکخستن و دانان و شێوازی ئامادەکردنی جواندا گەشتوونەتە پلەیەکی بەرزتر لەخولیاو ئارەزووی مرۆڤ. وەبۆ هەر هونەرێك کۆمەڵێك زانا هەبوون کەلەو زانستەدا خەڵکی دەگەڕانەوە بۆ بۆچوونەکانیان و هەر هونەرێکیش کۆمەڵێك ئوصولّ و بنەمای هەیە کەلەفێربووندا سودیان لێوەردەگرن. خۆرهەڵات و خۆرئاواش هەریەکەیان کۆمەڵێك هونەرتایبەتن پێیانەوە کەزۆر بەناوبانگن و ئێمەش بەمزوانە لەژماردنی هونەرە ناوبراوەکان باسیاندەکەین. لەم سەردەمەدا بازاڕەکانی زانست بێ ڕەنەقن، چونکە ئاوەدانی لەو سەردەمەدا کەمبووەتەوە و سەنەدی زانست و فێرکردن لەوێدا پچڕاوە هەروەك لەبەشی پێشوودا باسمانکرد. وەنازانم کەخودا چی بەسەر خۆرهەڵاتدا هێناوە، بەڵام وادەزانم کەبازاڕی زانست بەردەوام لەو سەرزەمینەدا ڕەونەقی هەبێتو، بەردەوام سەنەدی تەعلیم لەزانستەکان و صنعەتە پێویست و کامڵەکانی تردا لەو ناوچەیەدا بەهۆی فراوانی ئاوەدانی و گەشەی شارستانیەت و یارمەتیدانی زانستخوازان لەڕێگەی فەرمانبەری و دابینکردنی مووچەوە کەئەوقاف بۆی دیاری کردوون، بەهۆی فراوانبوونی ئەوقاف و هۆکارەکانی خۆشگوزەرانی زانستخوازان فەراهەم دێت. وەخوداش ئەندازە گیری شەوو ڕۆژە.[147]

[147] (وَاللَّهُ يُقَدِّرُ اللَّيلَ وَالنَّهار) س المزمل ئا ٢٠.

# بەشی پێنجەم

## لەبارەی زانستەکانی قورئان لەوانەش تەفسیر و خوێندنەوەکان ( قراءت )

قورئان کەلامی خودایە کەنازڵبووەتە سەرپێغەمبەرەکەی و نوسراوەتەوە و بەرگی تێگیراوە (تجلید) کراوەو، لەنێو هەموو نەتەوە موسوڵمانەکاندا بڵاو بووەتەوە، بەڵام دەبێت ئەوە بزانین کەصەحابە ئەم قورئانەیان لەپێغەمبەرەوە (ص) لەهەندێك لەفز یان دەربڕینی چۆنیەتی ئەدای پیتەکاندا بەچەندین شێوەی جیاواز گێڕاوەتەوە و هەموو ئەم ڕیوایەت و گێڕانەوانەش لەوانەوە نەقڵ کراون و، ناوبانگیان دەرکردووە تاوەکو حەوت شێواز لەخوێندنەوە (القراء السبعه) ناوبانگیان دەرکردووە و سەلمێنراون وەنەقڵکردنی شێوازی دەربڕین و ئەدایان بەشێوەیەکی موتەواتیر گەشتووە بەئێمە و، نیسبەتیش دراونەتەپاڵ گروپێکی زۆر لەوانەی کەلەڕیوایەت و گێڕانەوەدا بەناو بانگن. هەربۆیە حەوت خوێندنەوە نابراوەکە وەك بنەماو ئوصوڵیان لێهاتووە بۆ خوێندنەوەی (قرائەت) قورئان. هەرچەندە لەدوای ئەوانیشەوە قیرائەتگەلێکی تریش بۆ حەوت قیرائەتەکە زیاد بوون، بەڵام ئیمام و پێشەوایانی قیرائەت ئەو هێزەی کەحەوت قیرائەتەکە کەلەپێغەمبەرەوە گێڕدرابوونەوە و ڕیوایەتکرابوون هەیانبوو لەوانی تردا ئەو هێزە بوونی نەبوو، بەڵام لەکتێبی قیرائەتەکاندا تۆمار کراون.

وەهەندێك کەس لەتەواتوری ڕێگەکانی ڕیوایەتیاندا جیاوازیان تێکەوتووە، چونکە بەبیروباوەڕی ئەوان قیرائەتە ناوبراوەکان بریتین لەچۆنیەتی گەلێك بۆ ئەداو دەربڕینی پیتەکان و ئەوەش مونزەبیت نیە. بەڵام ئەم دژایەتیەی ئەوان ڕووشاندنی تەواتوری

قورئان نیە، بەلأم زۆربەی قورّا (قورئان خوێنان) ئەو بۆچوونەیان بەلاوە پەسەند نەبووەو باوەڕیان بەتەواتوریان هەبووە و، هەندێکی تریش باوەڕیان بەتەواتورێکی وەك: مەد و تەسهیل(ئاسانکاری) هەیە چونکە بەپێی چۆنیەتیەکەی لەکاتی خوێندنەوەدا ناتوانین بوەستین، ئەم بۆچوونەش ڕاستە. قاریئەکانیش لەسەردەمانێکی زوەوە ئەم قیرائەت و ڕیوایەتانەیان سینە بەسینە و بەلەبەر نەقڵیاندەکردن تائەوکاتەی کەزانستەکان نوسرانەوە و تەدوین کران.

ئەوکات ئەم بەشەشیان خستە ڕیزی زانستەکانەوە و تەدوینیانکرد (واتە کردیانە کتێبێکی سەربەخۆ) و، بەصنعەتێکی تایبەت و زانستێکی سەربەخۆ دەژمێردرا و خەڵکیش لەخۆرهەلأت و ئەندەلوسدا سینە بەسینە و بەلەبەر نەقڵیان دەکرد، تائەوکاتەی کەلەخۆرهەلأتی ئەندەلوس موجاهید کەلەمەوالیەکانی عامریەکان بوو گەشتە فەرمانڕەوایی و لەنێو هونەر و زانستەکانی قورئاندا گرنگیەکی تایبەتی دەدا بەم زانستەو، چونکە مەولاکەی مەنصوری کوڕی ئەبی عامیر ئەوی بۆ ئەم مەبەستە هەڵبژاردو، لەفێرکردنی قیرائەتدا بەموجاهید هەوڵێکی لەڕادەبەدەری دەدا و ئەوی بردە لای کۆمەڵێك لەقاریئەکان کەلەدەرباری خۆیدا بوون (واتە مەنصور). هەربۆیە بەهرەیەکی زۆر و فراوانی لەم هونەر و زانستەدا وەرگرت و لەوە بەدواوە مەنصور ئەویکردە فەرمانڕەوای دانیە و دوورگەکانی خۆرهەلأت (بالئار). موجاهید لەو ناوچانەدا بازاڕی هونەری قیرائەتی ڕەواج پێدا، چونکە خۆی لەپێشەوایانی ئەو هونەرە دەژمێردرا، بەهۆی ئەو گرنگیە زۆر و لەڕادەبەدەرەی کەبەم هونەرەی دەدا واتە هونەری قیرائەت. هەروەها لەسەردەمی ئەودا ئەبو عەمری دانی دەرکەوت و، ئەوهونەرەی گەیاندە قۆناغی کەماڵ و ناسینی لەسەر ئەو کورتکرایەوە و ئیسنادەکانی بەو کۆتاییان دەهات و کتێبگەلێکی زۆری لەم هونەرەدا دانا کەجێگەی متمانەی خەڵکی بوون و وازیان لەکتێبەکانی تر هێنا و لەنێو دانراوەکانی ئەمیشدا زیاتر گرنگیان بەکتێبی (التیسیر) دەدا و، متمانەیەکی زۆریان پێی هەبوو. دواترو لەسەردەمەکانی تریشدا ئەبولقاسم ئیبن فیرە کەخەڵکی شاتیبە بوو

دەرکەوت و نیەتی ئەوەی هێنا ئەوەی کە ئەبوعەمری دانی لەتەجویدا نوسیبوی پاڵفتە(تهزیب) و کورتی بکاتەوە و دواتریش هەمووی لەقەصیدەیەکدا بهۆنێتەوە و ناوی قورِائەکان بەشێوەی مەتەڵ بەپێی ڕیزبەندی پیتە ئەبجەدیەکان و بە شێوەیەکی بەهێز لەو قەصیدەیەدا کۆی کردبوویەوە بۆ ئەوەی کەسێك ئەگەر بیەوێت بەکورتی فێریان ببێت ئاسان بێت بەلایەوە و، هەروەها بەهۆی شێوەی شیعرو قەصیدەییەکەیانەوە ئاسانتر لەبەر بکرێن.

ئەوەبوو بەشێوەیەکی گشتگیر ئەو هونەرەی کۆکردەوە و خەڵکیش گرنگیەکی تایبەتیان دەدا بەلەبەرکردن و فێربوونی بەتایبەت بۆ منداڵەکانیان لەمەکتەبخانەکانداو، ئەم هونەر و زانستەش (تجوید) بەهۆی خۆشی و ئاسانی ئەم قەصیدەیەوە لەشارەکانی مەغریب و ئەندەلوسدا بڵاو بوویەوە. وەهەندێك جاریش هونەری ڕەسم (خەت) یان خستوەتە ناو هونەری قیرائەتەوە کەبریتیە لەدانانی پیتەکانی ئایەتەکانی قورئان و ڕەسمی خەتەکەیانە لەموصحەفی عوسماندا، چونکە لەو پیتانەدا زۆرێکیان شکڵ و ڕەسمی نوسینیان بەپێچەوانەی ئەو یاساو ڕێسایانەوەیە کەلەخەتی ئاساییدا هەیە وەك زیادکردنی یا ء لە(بايید)[١٤٨] وەزیادنی الف لەووشەی (لااذبحنة)[١٤٩] ولااوضعوا[١٥٠] و (واو) لە جزاؤ الظالمین[١٥١] وەلابردنی الف لەشوێنێکداو هێشتنەوەی لەشوێنێکی تردا، وە تا ئی هائێك کەبەشێوەیەکی مەمدود ڕەسمکراوە، ئەصڵەکەشی ئەمەیەکەتای پەیوەست بەشێوەی ها ء بنوسرێ و نمونەی ئەمانە. ئێمەش هۆکاری ئەم جۆرە رسم الخەتە تایبەتەی قورئان لەبەشی خەتدا باسمان لێوەکرد. وەلەبەر ئەوەی ئەم جۆرە جیاوازیە لەبارەی شێوە و یاساکانی خەتەوە بەدیهاتوون ناچاربوون کەهەژماریان بکەن.

---

[١٤٨] ئایەتی ٤٧ س الزاریات.

[١٤٩] س النمل ئا ٢١.

[١٥٠] س التوبه ئا ٤٧.

[١٥١] س الحشر ئا ١٧.

هەربۆیە خەڵکی (زانایان) کاتێك کەلەبارەی زانستەئاینیەکانەوە کتێبیان دەنوسی لەم بارەیەشەوە دەستیان دەکردە لێکۆڵینەوە و باس و لەمەغریبدا ئەم هونەرە ئەبو عەمری دانی کەناومان هێنا کاملی کرد و، چەندین کتێبی نوسی کەبەناوبانگترینیان کتێبی (مقنع) بووکەجێگەی گرنگی متمانەی خەڵکی بوو لەنێویاندا بلاّو بوویەوە و ئەبو القاسمی شاتیبی (ئیبن فیره) بابەتەکانی لەقەصیدەیەکی ڕائیددا[١٥٢] هۆنیەوە و خەڵکی حەزێکی تایبەتیان بۆ لەبەرکردنی هەبوو. لەپاشان لەبارەی ڕەسمی ووشە و پیت گەلێکی تر جیاوازی ڕوویدا کەئەبو داوود و سولەیمانی کوڕی نەجاح لەمەوالیەکانی موجاهید لەکتێبەکانی خۆیاندا باسیانکردوون، ئەو لەقوتابیەکانی ئەبو عومەری ویدانیە و بەنابانگ بووە بەوەی کە زانست و ڕیوایەتەکانی کتێبەکانی ئەوی لەلابووە.

دواتر لەپاش ئەبو داوودیش جیاوازیەکی تریش ڕیوایەتکراوە کەخەڕاز لەپاشاینانی مەغریب ئورجوزەیەکی تری هۆنیوەتەوە و زیاد لەوەی کەلەکتێبی موقەنەعدا هاتووە جیاوازی گەلێکی تری زۆری لەکتێبەکەی خۆیدا هێناوە و، هەریەکە لەبیروباوەڕو بۆچوونەکانی خۆی داوەتە پاڵ ئەو کەسەی کەگوتوونی و لەوەبەدواوە خەڵکی تەنها ئورجوزەکەی خەڕازیان لەبەر دەکرد و کتێبەکانی ئەبو داوود و ئەبوعومەرو شاتیبیان خستەلاوە.

تەفسیر: دەبێت ئەوە بزانین کەقورئان بەزمانی عەرەبی و لەسەر شێوەی بەلاغەت و ڕەوانبێژی ئەو نەتەوەیە نازڵبووە و دابەزیوە و، هەموو نەتەوە عەرەبەکان لێی تێدەگەن و ماناکانی ماناکەی لەموفرەدات و تەرکیباتەکەیەوە تێدەگەشتن و فێری دەبوون. وەقورئان بۆ باسکردنی تەوحید (یەکتاپەرستی) و واجبات و ئەرکە ئاینیەکان بەپێی ڕووداوەکان ڕستە ڕستە و ئایەت ئایەت دادەبەزی، بەجۆرێك هەندێکیان لەبارەی بیروباوەڕو ئیمانەوە بوون و هەندێکیشیان لەبارەی ئەحکام پێشهاتەکان و گیروگرفتەکانی ڕۆژانە کەهەندێکیان پێشتر و هەندێکیشیان پاش هەندێکی تریان

---

[١٥٢] واتە ئەو قەصیدەیەی کەلەسەریەوە پیتی ڕا هەیە.

دادەبەزین و دەبوونە ناسیخ و مەنسوخ. وەپێغەمبەر (ص) ئایەتە مجمل کانی ڕاڤەدەکرد و ناسیخی لەمەنسوخ جیادەکردەوە و فێری صەحابەکانی خۆی دەکرد. لەبەرئەمەبوو کەهاوەڵان (صحابە) فێری ئەم زانستانەدەبوون ئاگاداری هۆکاری دابەزینی ئایەتەکان و حاڵەتەکانیان دەبوونەوە و ڕیوایەتیان دەکردن، هەروەك چۆن لەقسەی ئەوەوە زانراوە کەمەبەست لەسورەتی (اذاجاء نصرالله والفتح)[١٥٣] خەبەردانی خودایە لەبارەی مەرگی پێغەمبەرەوە و نمونەی ئەمانە.

ئەم جۆرە ڕیوایەتانە لەصەحابەوە گێڕدراونەتەوە و دواتریش تابیعینی دوای صەحابە بەلەبەر پاراستوونیان و دواتریش ڕیوایەتە ناوبراوەکان لەتابیعینیشەوە گێڕدراونەتەوە و لەنێو خەڵکی سەرەتای ئیسلام و سەلەفەوە ڕیوایەتکراوە تائەوکاتەی کەزانیارییەکان بەشێوەی زانستەکانیان لێهات و کرانە کتێب و، زۆرێك لەو ڕیوایەتانە نوسرانەوە و ئەسەر و فەرموودەکان لەصەحابەوتابیعینەوە گێڕدرانەوە و دواتریش ئەم ڕیوایەتانە گەشتن بەتەبەری و واقیدی و سەعالیبی و باقی ڕاڤکاران (مفسرین)ی تر کەلەڕیزی ئەماندابوون، ئەوان ئەوەی کەخودا ویستی لەبارەی ئەسەرە ناوبراوەکانەوە نوسیان و کردیانە کتێب. لەپاشان زانستەکانی زمان لەڕووی ڕەوانبێژی لەبابەتەکانی زمانەوانی و ئەحکامەکانی ئیعراب و بەلاغەتی تەرکیبەکانە وە لایەنی هونەری[١٥٤] بەخۆیەوە گرت و کتێب و دیوانگەلێك ڕێکخران و لەوەبەدواوە کەزمانەوانی مەلەکەگەلێك بوون لەناوعەرەبدا ونەدەگەڕانەوە بۆ نەقلێ یان کتێبێك ئەوەبوو لەبیر چوونەوە هەربۆیە زمانەوانیان

---

[١٥٣] س النصر ئا ١، لەتەفسیری ڕازیدا بەم شێوەیە (خودا ئەم سورەتەی لەفەتحی مەککەدا ناردە خوارەوە. لەفەرموودەدا هاتووە کاتێك پێغەمبەر ئەم سورەتەی بیست و گوتی (نعیت الی نفسی) واتە هەواڵی مەرگیان بەمندا. گووتیان گوایە ئەم قسەیەی لەبەر ئەوە کردووە کەپێیان گووتبوو لەبەر ئەوەکە مەککە فراوان دەبێتو دەبێتە کۆتا سەردەمی تۆ و وەهەروەها دەڵێن لەبەر ئەوەبوو کەزانی هەرکارێك دەگاتە کۆتایی و لەناو دەچێت. (تفسیر ابو الفتوح ب ٥ لا ٥٩٧).

[١٥٤] لێرەدا مەبەست لەصنعەت یان هونەرێکە کە وەك زانست و هونەرێك لەڕێگەی خوێندنەوەو کردەوەوە فێری دەبن.

لەکتێبەکانی ئەهلی زمانەوە وەردەگرت و لەتەفسیری قورئاندا پێویستیان بەکتێبانە هەبوو، چونکە قورئان بەزمانی عەرەبی و لەسەرشێوەی بەلاغەت و ڕەوانبێژی ئەو نەتەوەیە. تەفسیریش بوو بەدوو بەشەوە:

یەکەمیان: تەفسیرێکە کە پشت بەستووە بەو ڕیوایەتانەی کەلەسەلەفی صاڵحەوە گێڕدراونەتەوە، کەبریتین لە ناسینی ناسیخ و مەنسوخ و هۆکارەکانی دابەزین و، مەبەستی ئایەتەکان و بۆزانینی ئەم شتانەش بێجگە لەنەقڵ لەصەحابەوتابیعینەوە هیچ ڕێگەیەکی ترمان نیە پێشینان لەمباریەوە کۆمەڵەگەلێکی زۆریان فەراهەمهێنا، بەلاَم لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا کتێب و گێڕانەوەکانیان غەس و سەمین و قبوڵکراو ڕەتکراوەیان تێدایە و هۆکارەکەشی ئەوەیەکە نەتەوەی عەرەب ئەهلی کتێب و زانست نەبوون، بەڵکو خوی دەشتەکیەتی و نەخوێندەواری زاڵبوو بەسەریاندا و هەرکات بیانویستایە شتانێك فێرببن کەنەفسی مرۆڤ حەزی لەفێربوونیانە، وەك تەکوین بووەکان و سەرەتای ئافرێنراوەکان و ئافەرینش و ڕازەکانی جیهانی هەستی، ئەوکات ئەم جۆرە بابەتانەیان لەکەسانێك دەپرسی کەبەرلەوان ئەهلی کیتاب بوون و واتە یەهودی مەسیحیەکان کەلەو سەردەمەدا لەنێو عەرەبدا دەژیان و وەك ئەمان دەشتەکی بوون، ئەوشتانەشی کەعەرەبە دەشتەکیەکان دەیانزانی تەنها ئەو شتانە بوون کەیەهودی و مەسیحیە دەشتەکیەکان دەیانزانین و، زۆرترینی پەیڕەوانی تەورات ئەو حەمیریانە بوون کە چووبونە سەر ئاینی یەهودی و کاتێکیش موسوڵمان بوون هەمان ئەو زانیاریانەیان هەبوو لەبارەی سەرەتای بوونەوەرو، ئەوەی کەپەیوەستە بەپێشگۆی و مەلحەمەکانەوە و نمونەی ئەمانە. ئەم گروپەش بریتی بوون لەکەعبی ئەحبار و وەهەبی کوڕی مونەبیهو عبداللەی کوڕی سەلام و نمونەی ئەمانە.

هەربۆیە تەفسیرەکان لەم جۆرە مەبەستانەدا لەوڕیوایەت و نەقڵکراوانەی کەلەسەر ئەم کەسانە وەستابوون کەڵەکە بوون و لەو مەسەلانە نەدەژمێردران کە بگەڕێنەوە بۆ ئەحکامەکان تاوەکو بۆ ئەوەی کاریان پێبکرێت لێکۆڵینەوە لەڕاستیەتیان بکرێت.

موفەسیران لەبارەیانەوە ئاسانکاریانکردووەو کتێبەکانی تەفسیریان پڕکردووە لەم جۆرە حەکایەتانە. وەڕیشەو سەرچاوەی ئەمانە هەروەك باسمانکرد پەیڕەوانی تەورات دەشتەکێن ئەوەی کەدەیگێڕنەوە لەڕووی تەحقیق و لێکۆڵینەوەیەکی ڕاست و دروستەوەنیە، بەڵام لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا ئەو گروپە ناوبانگیان دەرکرد و لەئاینی ئیسلام و لەناو نەتەوەی ئیسلامدا خاوەن پلە و پایەی بەرزن.. هەربۆیە ئەو سەردەمە گێڕانەوەکانیان قبولکرابوون، بەڵام هەرکە ئەو شتانە کەوتنە بەر لێکۆڵینەوەوە ئەبو محمدی کوڕی عەتیە لەزانا دواییەکان کەلەمەغریبدا دەرکەوت، هەموو ئەم تەفسیرانەیان کورتکردەوە و ئەو شتانەی کەلەڕاستیەوە نزیکتربوون هەڵیبژاردن کتێبێکی لەم بارەیەوە دانا و لەنێو خەڵکی مەغریب و ئەندەلوسدا ناوبانگی دەرکرد کەمەبەستەکانی بەباشی پێکاوە و قورتوبی لەکتێبێکی تردا بەهەمان شێوە و شێواز مەبەستەکانی ئیبن عەتیەی درێژە پێدا و کتێبەکەی لەخۆرهەڵاتدا ناوبانگی دەرکرد.

دووەمیان: دەگەڕێتەوە بۆ زمان، وەك ناسینی زمانەوانی و ئیعراب و بەلاغەت و ڕەوانبێژی لەئەدای مانادا بەپێی ئوسلوب و مەبەستەکان. ئەم جۆرە تەفسیرەش کەمتردەکرێت لەجۆری یەکەم جیابکرێتەوە و بەشێوەیەکی سەربەخۆ بکرێتە کتێب و تەئلیف بکرێت، چونکە جۆری یەکەم مەبەست لێی خودی ئەو بووە ئەم جۆرەش کاتێك باوی هەبووە کەزانستەکانی پەیوەست بەزمان لایەنی فێرکاریان وەرگرتووە. تەنها هەندێك جارو لەهەندێك تەفسیردا جۆری دووەم زاڵدەبێت بەسەر جۆری یەکەمدا. وەباشترینی ئەو تەفسیرانەی کە ئەم هونەرەیان تێدایە کتێبی کەشافی زەمەخشەریە کەدانەرەکەی لەخەڵکی خوارەزمی عێراقە(ئێرانە)، بەڵام زەمەخشەری پەیڕەوی بیروباوەڕەکانی موعتەزیلەیە و لەئەنجامدا هەرکات لەگەڵ ئایەتەکانی قورئان بەشێوەیەکی بەلاغی ڕووبەڕوو دەبێتەوە بەڵگە بەمەزهەب و بیرو باوەڕەخراپەکانی ئەمان دەهێنێتەوە، هەربۆیە لێکۆڵەرەوانی مەزهەبی سوننەت خۆیانی لێوە بەدوور دەگرن و بەهۆی ئەو داوو تەڵانەی کەتێدا شاردراونەتەوە خەڵکی بەگشتی لێ ئاگادار

دەکەنەوە، بەڵام لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا لێکۆڵەرەوانی نابراو دان بەڕۆچوونی ئەودا دەنێن لە و مەسەلانەی کەپەیوەستن بەزمان و بەلاغەتەوە. وەهەرکاتێك کەسێك کەدەیانخوێنێتەوە و بەتەواوی ئاگاداری مەزهەبەکانی ئەهلی سوننەت بێت و ڕێگە بەڵگەهێنانەوە بەباشی بزانێت ئەوکات لەخراپەکانی ئەو پارێزراو دەبێت. کەواتە دەبێت خوێندنەوەی بەهەلو غەنیمەت بزانین چونکە کتێبی نابراو لەجۆرەها هونەری زماندا خاوەن چەندین شتە سەرسوڕهێنەرە.

وەلەم سەردەمەشدا دانراوێك لەیەکێك لەزاناکانی عێراق شرف الدینی تیبی کەلەخەڵکی تەبرێزی عێراق ئێرانە بەئێمە گەشتووە کەتێیدا شەرحی زەمەخشەری دەکات و لەبارەی ئەلفازەکانیەوە لێکۆڵینەوەی کردووە بەبەڵگەگەلێك دژایەتی مەزهەبە ئیعتیزالیەکانی کردووە و ڕەتی کردوونەتەوە و، ئاشکرایدەکات کە بەلاغەت لەئایەتەکاندا بەپێی مەزهەبی ئەهلی سوننەت ڕوودەدات نەوەك بەپێی بیروباوەڕەکانی موعتەزیلە، لەمبارەیەوە ئەوەی کەبتەوێت لێزانی نیشانداوە لەگەڵ ئەوەی کە لەهەمان کاتدا لەهەموو هونەرەکانی بەلاغەت و ڕەوانبێژیدا بابەتگەلێکی بەسودیشی هێناون، وەلەسەر هەرخاوەن زانستێکەوە زاناو دانایەك هەیە.[١٥٥]

---

١٥٥ (وَفَوقَ كُلِّ ذِي عِلمٍ عَليم) س يوسف ئا ٧٤.

# بەشی شەشەم

## لەبارەی زانستی حەدیسەوە

زانستەکانی حەدیس زۆرو جۆراو جۆرن. لەوانەش باس و بابەت گەلێکن کەلەناسیخ و مەنسوخی حەدیسدا باسی لێوەدەکرێت، ئەمەش بەو هۆیەوەیە کەلەشەریعەتی ئێمەدا بڕیاردراوەکەنەسخ جایز و دروستە و ڕوودانیشی سۆزو بەزەییەکی خودایە بۆ بەندەکانی، ئاسانکاریەکە بۆ ئەمان و وەك پاراستنی بەرژەوەندیان وەهایە کەلەبەر ئەوە خراوەتە ئەستۆیان، خوداش دەفەرمێت: هەرئایەتێك نەسخ بکەینەوە ئەوا باشتر لەو یان ئایەتێکی وەك ئەو نازڵ دەکەین[156] وەناسینی ناسیخ و مەنسوخ هەرچەندە بەگشتی پەیوەستە بەقورئان و حەدیسەوە، بەڵام ئەوەی کەلەمبارەیەوە لەقورئاندا هەیە لەتەفسیرەکانیشیدا هاتووە ئەو بەشەشی کەتایبەتەبەحەدیسەوە لەنێوزانستەکانیدا بەبەشێکی تایبەت دەژمێردرێت. هەربۆیە هەرکات دوو حەدیس لەڕێگە نەفی ئیسباتەوە دژی یەك بووەستنەوە و کۆکردنەوەیان لەگەڵ یەکتریدا بەهەندێك تەئویل دژوار بێت و دەربکەوێت کەکامیان لەپێشترە ئەوکات دەردەکەوێت کەحەدیسی دواتر ناسیخە: وەناسینی ناسیخ و مەنسوخ لەگرنگترین و دژوارترینی زانستەکانی حەدیس دەژمێردرێت. زوهری دەڵێت: فەقیهەکان لەناسینەوە ناسیخی حەدیسی پێغەمبەر (ص) لەمەنسوخی بێتوانان) بەڵام شافیعی لەم زانستەدا زۆر قوڵبوبویەوە.

---

[156] (مانَنْسَخ مِن آيَةٍ أو نُنسِها نَأتِ بِخَيرٍ مِّنها أو مِثلِها) س البقرة ئا ١٠٠.

لەو زانستانەی حەدیسیش بریتیە لە بیرکردنەوە لەئیسنادەکان و ناسینی ئەو حەدیسانەیکە کارپێکردنیان واجیبە ئەم جۆرە حەدیسانە بەپێی ئەو سەنەدەی کەریوایەت دەکرێن کەمەرجەکانی کاملّ و تەواوین، چونکە کارکردن بەفەرموودەکانی پێغەمبەر (ص) کاتێك واجیب دەبێت کە صیدق و ڕاستیان زاڵدەبێت بەسەر زەنن و گوماندا[157].

زاڵبێت وئەوکات دەبێت لەڕێگەیەکەوە کەئەم زەننە بەدەستدێت ئیجتیهاد بکرێت ئەوەش لەڕێگەی ناسینی ڕاویانی حەدیس و دڵنیابوون لەعەدالەت و زەبتیان بەگێڕانەوە لەبەناوبانگ و گەورەکانی ئاین کەتەعدیل و بەرائەتی ئەوان لەجەرح و غەفڵەت پشتگیری بکەن دەگاتە سابت بوون و نەقڵکردنی ئەوان بۆ ئێمە، بەڵگەیەکە بۆ قبوڵکردن یان ڕەت کردنەوەی حەدیس. وەهەروەها پلەو پایەی ئەم ڕاویانە کەلەصەحابەو تابیعینن، و جیاوازیان لەپلەو پایەو ئیدراکیاندا لەیەکەیەکەی ئەمانەدا لەڕووی قبوڵکردن یان ڕەتکردنەوەی حەدیسەوە کاریگەری دەبێت. سەرەڕای ئەم ئیسنادانە(زنجیرەی حەدیس) لەڕووی پەیوەندی یان پچڕانیانەوە جیاوازی هەیە. بەجۆرێك ڕاوی ئەو کەسەی کەریوایەتەکەی لێوە کردووە نەیبینیوە. وەحەدیسەکەش لەو عیلەت و عەیبانە پارێزراو بێت و لەڕووی جیاوازیەوە بەدوو لاکۆتایی دێت کەحوکم دەکرێت بەقبوڵی باڵاو ڕەتکردنەوەی خوارەوە و لەناوەڕاستیشدا بەپێی نەقڵکراوەکە لەئیمامانی حەدیسەوە جیاوازە. وەزانایانی حەدیس لەمبارەیەوە زاراوەگەلێکی تایبەتیان داناوە لەم پلەو پایانەدا بەردەوام بەکاریان دەهێنن وەك: صحیح و حسن و زە عیف و مونقەتیع و موعەزەل شاز و غەریب و ناوگەلێکی تر کەلەنێویاندا باوە، وەئەم زاراوانەیان دابەشکردووە بەچەند بابێکەوە و جیاوازی یان تەوافوقی بۆچوونی ئیمامانی حەدیسیان لەبارەی هەریەکەیانەوە هێناوە. وەهەروەها لەبارەی ئەوەی کە بەچ شێوەیەك ڕاویەکان

---

[157] ظن: بەمانای باوەڕبوونی ڕاجیحە بەگریمانی پێچەوانەکەیەتی لەتەعیین و شکیشدا بەکار دێت.

حەدیس لەیەکترەوە وەردەگرن لێکۆڵینەوە دەکەن وەك پیرائەت یان کیتابەت یان موناوەلە[١٥٨] یان ئیجازەو، لەبارەی جیاوازی ئەم پلەو قۆناغانەو جیاوازی زانایانی حەدیس لەڕەت یان قبوڵی ئەو فەرموودانەوە باسدەکەن. دواتریش بەشوێن ئەم جۆرە فەرموودانەدا لەفز و زاراوەگەلێك کەلەدەقەکانی حەدیسدا هاتوون دەهێنن، وەك غریب یان مشکل یان تصحیف یان مفترق و مختلف و ئەوەی کەگونجاوی ئەو بێت ئەمانە بەشی گەورەی ئەو مەسەلانەن کەموحەدیسەکان لەبارەیانەوە بەحس و لێکۆڵینەوە دەکەن.

لەسەردەمەکانی پێشوودا بارودۆخی ناقیل و گێڕەرەوەکانی حەدیس وەك صەحابە و تابیعین لەلای هاوولاتیانیان ئاشکراو دیار بووە هەروەك چۆن گروپێك لەوان لەحیجاز و هەندێکیشیان لەشارەکانی عێراق وەك بەصرە و کوفەو، کۆمەڵێك لەشام و میسردا ژیاون هەموویان لەسەردەمی خۆیاندا بەناوبانگ و هەڵکەوتووی سەردەمی خۆیان بوون، بەلاّم شێوەی خەڵکی حیجاز لەو سەردەمانەدا لەڕوی ئیسنادی حەدیس و بەهێزی لەصیحەت و ڕاستیدا لەخەڵکانی تر باشتر و لەپێشتر بووە چونکە ئەوان لەهەلومەرجی نەقڵی حەدیسدا وەك عەدالەت و زەبت سەختگیریان دەکرد، و حەدیسێك کەڕاویەکەی نەناسراو بوایە قبوڵیان نەدەکرد و خۆیان لیّ بەدوور دەگرت.

وەلەزانستی حەدیسدا دەبێت یاساگەلێك بزانین کەئیمامان و پێشەوایانی حەدیس دایاننناون تاوەکو زنجیرە(اسناد) ی حەدیس و ڕاویەکان و ناوەکانیان بناسین و ئاشنای چۆنیەتی وەرگرتنی حەدیس لەیەکتر و ئەحواڵی چینەکانی موحەدیسان و جیاوازی زاراوەکانیان بن، کورتەی ئەم زانستەش ئەوەیەکە ئیجماع بڕیاری داوە کارکردن بەحەدیسی سەلمێنراو لەپێغەمبەرەوە (ص) واجبە بەو مەرجەی زەنن زاڵبێت بەسەر صیدقەکەیدا، ئەوکات واجبە لەسەر موجتەهید لەو ڕێگایانەی کەئەم زەننە بەدەستدەهێنێت لێکۆڵینەوە بکات و ئەم ڕێگەیەش لەڕێگەی خوێندنەوە لەبارەی

---

[١٥٨] موناوەلە بریتیە لەوەی کەبیستنی کتێب ببەخشنە کەسێكو پێی بگوترێت کەمۆڵەتم بەتۆدا کەئەم کتێبە لەمنەوە ڕیوایەت بکەیت، تەنها بەخشینی کتێبەکەش بەس نیە بەڵکو مۆڵەتی گێڕانەوەکەی گرنگە.

زنجیرەی حەدیسەوە بەدی دێت کەپەی بە عەدالەت و زەبت و پایەداری و ئیتقان و بەرائەتی ڕاویەکان ببات لەهەڵەو پەڵە و بێئاگایی وە عەدلەکانی ئۆمەتی پێغەمبەر (ص) باسی ئەم سیفەتانەبکەن لەبارەی ئەوەوە. وەلەپاشان جیاوازی پلەکانیان لەم سیفەتانەدا بزانێت و ئاگاداری چۆنیەتی ڕیوایەتی ئەوان بێت لەیەکترەوە، وەك ئەوەی کەڕاوی لەشەیخەکەیەوە بیستوویەتی یان حەدیسەکەی لەلای ئەو خوێندوەتەوە یان بیستوویەتی و نوسیویەتیەوە(کتابت) یان لەپاش وەرگرتنی حەدیسەکە یاداشتی کردووە، (مناولە) یان لەشێخەکەیەوە لەصیحەت و قبوڵی ڕیوایەتە نەقڵکراوەکاندا مۆڵەتو ئیجازەی وەرگرتووە.

وەباشترین و لەپێشترینی پلەو قۆناغە قبوڵکراوەکان لەلای ئەمان صەحیح و دواتر حەسەن و نزمترین پلەش زەعیفە و ئەم پلەیەش مرسل و مونقەتیع و موعەزەل موعەلەلو شازو غەریب و مونکەریش دەگرێتەوە. هەندێکیان حەدیسگەلێکن کە لەڕەتکردنەوەیانەوە هاوبۆچوونن، ئەم حاڵەتەش لەبارەی حەدیسی صەحیحیشەوە دێتە پێشەوە، واتە لەو حەدیسانەیە کەهاوڕان لەسەر قبوڵ و صیحەتیان و حەدیسگەلێکیش هەن کەلەبارەیانەوە جیاوازیان هەبووە و لەڕاڤە و تەفسیری ئەم ناونیشانانەدا جیاوازیەکی زۆر لەنێوانیاندا هەیە. دواتر و دوابەدوای ئەم بابەتانە قسەکەیان بەرەو لەفزو زاراوەگەلێك بردووە کەلەدەقەکاندا هاتوون: وەك غەریب یان مشکل یان تصحیف یان موفتەرەق. وەبۆ هەموو ئەم بەشانە یاسایەکیان داناوە کەباسی ئەم پلە و ناونیشانانە زامن دەکات و بەچەندین ڕێگەی تایبەت کەهەیانە ڕێگری لەنەقص دەکەن و دەیانپارێزن. یەکەمین کەسێکیش کەئەم یاسایەی داناوە ئەبوعبداللەی حاکیمە کەلەگەورەکان و ئیمامانی حەدیس دەژمێردرێت و زانایەکە کەئەم زانستەی تەهزیب کردووە و جوانیەکانی دەرخستووە، دانراوەکانی لەمبارەیەوە بەناوبانگن. دوای ئەمیش پێشەواو ئیمامەکانی تری حەدیس چەندین کتێبیان لەمبارەیەوە داناوە و بەناوبانگترین کتێبی پاشینان لەمبارەیەوە ئەبو عەمری کوڕی صەلاحە کەلەسەرەتاکانی سەدەی

حەوتەمدا ژیاوە، بەدوای ئەویشدا محی الدینی نەوەوی دێت کەوەك کتێبەکەی ئەبو عەمر کتێبێکی نوسی و هەمان ئەو شێوەیەی ئەوی هەڵبژارد. هونەری حەدیس خاوەنی ئامانجێکی بەرێزو شەریفە، چونکە ئەم هونەرە بریتیە لە ناسینی یاساگەلێك کەبەهۆیانەوە سوننەتە نەقڵکراوەکان لەخاوەنی شەریعەتەوە لەبەر دەکرێن بۆ ئەوەی وەرگیراوو وەرنەگیراو دیاری بکرێت.

وەدەبێت ئەوە بزانین کەصەحابە ئەو تابیعینانەی کەسوننەتیان ریوایەتکردووە لەشارە ئیسلامیەکاندا ناودار بوون و هەندێکیان لەحیجاز و کوفە و بەصرە و هەندێکیشیان لەشام و میسردا ژیاون و هەموویان لەسەردەمی خۆیاندا هەڵکەوتوو بەناوبانگ بوون. وەشێوەی خەڵکە حیجاز لەزنجیرەی حەدیسدا لەپێشتر بووە لەصیحەت و بەهێزتر بووە لەخەڵکانی تر، چونکە ئەوان لەهەلومەرجی نەقڵی حەدیسدا وەك عەدالەت و زەبت سەختگیری زۆریان دەکرد و لەوەرگرتن و قبوڵکردنی راویانی نەناسراو خۆیان بەدوور دەگرت. وەسەنەد و تەریقەی حیجازی لەپاش سەلەفی ئیمام مالیکی زانای مەدینە بووە، دواتریش هاوەڵانی ئەو وەك ئەبو عبداللەی محمدی کوڕی ئیدریسی شافیعی و ئیبن وەهەب و ئیبن بەکیر قعنبی و محمدی کوڕی حەسەن و لەپاش ئەمانیش ئیمام ئەحمەدی کوڕی حەنبەل و هاوشێوەی ئەمانە ئەم پلەو پایەیان بەدەستهێنا. زانستی شەریعەت لەسەرەتای کاردا نەقڵی رووت بوو بەحس و ئەندێشە و قیاسی تێدا نەبوو کەسەلەف پوویان تێکرد و صەحیحەکەیان دۆزیەوە و کامڵیانکرد. مالیکیش کتێبی مووتەئی بەشێوەی حیجازیەکان دانا کەتێیدا بنەمای ئەحکامگەلێکی صەحیحی تێدا نوسی کەهەموویان هاوڕابوون لەسەریان،و بەپێی بابەکانی فیقە ڕێکی خست.

لەپاشان حافیز[١٥٩] رووی کردە ناسین و ناساندنی رێگەکانی حەدیس و زنجیرە جیاوازەکانی حیجازی و عێراقی و نمونەی ئەمانە، چونکە ئیسنادی حەدیس بەرێگە جۆربەجۆرەکان و چەندین راوی دەبێت و هەندێکجاریش لەهەندێك حەدیسدا تەریق و

[١٥٩] مەبەست لێی حافیزی موزەنیە کەلەقوتابیانی نەوەوی بووە.

ڕاویان یەکێك بووە و لەبەشەکانی فیقهی حەدیسەکاندا بەپێی جیاوازی ئەو مانایانەی کەدەیانگرنەوە بەچەندین جۆری جیاواز و دووبارە بەکار دێن، دواتریش محمدی کوڕی ئیسماعیلی بوخاری کەلەسەردەمی خۆیدا پێشەوای موحەدیسەکان بووە دەرکەوت و بازنەی ڕیوایەتی فراوانکرد و، لەمەسنەدەکەی خۆیدا بەناوی حەدیسە صەحیحەکان سوننەتی بەپێی بابەکانی هەریەکەیان تەخریج کرد و هەموو ڕێگەکانی حیجازی و عێراقیو شامیەکانی لەبەرچاو گرت و، پشتی بەفەرموودە گەلێك بەست کەئیجماعیان لەسەر بوو جیاوازیان تێدا نەبوو وەیەك حەدیسی چەندجار باسکرد بەجۆرێك کەلەهەریابێکدا بەمانایەك کەگونجاوبوو لەگەڵیدا دەیهێنا، هەربۆیە حەدیسەکانی هەروەك ئاماژەمان پێکرد لەبابگەلێکی جۆراو جۆردا بەپێی جیاوازی ماناکانیان دووبارە بوونەوە، هەربۆیە کتێبەکی نزیکەی حەوت هەزار و دووسەد حەدیسە کەسێ هەزاریان دووبارەن و جیاوازی ڕێگە و زنجیرەکانیان هەریەکەو بەجیا لەهەریابێکدا هێناویەتی. لەپاشان ئیمام موسلیمی کوڕی حەجاجی قوشەیری (ر ح) دەرکەوت و مەسنەدی صەحیحەکەی خۆی فەراهەمکرد و لەنەقڵکردنی ئەو حەدیسانەی کەئیجماعیان لەسەر بوو ڕێگەکەی بوخاری پەیڕەوی کرد، بەڵام حەدیسەدووبارەکانی نەهێنا و ڕێگە و زنجیرەی حەدیسەکانی کۆکردەوە و بەشەکانی کتێبەکەی بەپێی بابی تەفسیرەکانی فیقە تەرتیب کرد، لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا صەحیحی بوخاری و موسلیم کۆکەرەوە (جامع) نەبوو موحەدیسەکان لەمبارەیەوە موستەدرەککگەلێکیان بۆ زیادکردن.

دواتر ئەبو داوودی سیستانی و ئەبو عیسای ترموزی و ئەبوعبدالرحمانی نەسائی و مەسنەدگەلێکی فراوانتریان لەصەحیحەین نوسی. بەجۆرێك کەگوتیان مەرجەکانی کارپێکردن لەمەسنەدەکانیاندا زۆرن: یان لەپلەی بەرزدا لەئیسنادەکان، کەئەوەش ڕاستە، بەپێی مەعروف وەیان ئەوەی کەلەحەسەن و غەیری ئەویش لەخوار پلەی ئەوەوە بێت، بۆ ئەوەی ئەم شێوازە بۆ سوننەت و کردار ببێتە سەرمەشقێك. ئەمانەن مەسنەدە بەناوبانگ و باوەڕپێکراوەکان لەئیسلامدا کەبریتین لەامهاتی (دایکانی) کتێبی حەدیس

لەسوننەتدا. وەهەرچەندە ئەم جۆرە کتێبان جۆراو جۆرین، بەزۆری بابەتەکانیان دەگەڕێتەوە سەرئەم امهاتانە. وەزانستی حەدیس بریتیە لەناسینی هەموو ئەم مەرج و زاراوانەیە هەرچەندە کەبەشی ناسیخ و مەنسوخ بەجیادنوسنەوە و بەهونەرێکی جیای دەدەنە قەڵەم وەهەروەها لەبارەی حەدیسە غەریبەکانیشەوە هەربەم جۆرەیەو ئەم شێوازە بەکار دەهێنن، موحەدیسەکان لەم بەشەدا کتێبگەلێکی بەناوبانگیان داناوە، سەرەڕای ئەمانەش موئتەلیف و موختەلیفیان بەجیا نوسیوە وتەئلیفیان کردووە. وەزاناکان لەزانستەکانی حەدیسدا کتێبگەلێکی زۆریان داناوە و لەگەورە و ناودارەکانیان دەبێت ئاماژە بەئەبوعبداللەی حاکیم بکەین، کەنوسینەکانی لەمبارەیەوە بەناوبانگە کەسێکە کەئەم زانستەی تەهزیب کردووە و جوانیەکانی دەرخستووە و بەناوبانگترین دانراوەکانی پاشینان بریتیە لەکتێبەکەی ئەبو عەمری کوڕی صەلاح کەلەسەرەتاکانی سەدەی حەوتەمدا ژیاوە و، لەدوای ئەویش محی الدینی نەوەوی وەك کتێبەکەی ئەبو عەمری نوسی و هەمان ئەو شێوازەی ئەوی هەڵبژارد.

هونەری حەدیس خاوەنی ئامانجێکی شەریفە، چونکە ئەم هونەرە بریتیە لەناسینی یاساگەلێك کەبەهۆیانەوە سوننەتە نەقڵکراوەکان لەخاوەنی شەریعەتەوە لەبەر دەکرێت و دەپارێزرێت. مەسنەدگەلێکی تر بۆ پێنج مەسنەدەکە زیاد کراوە وەك مەسنەدی ئەبو داوود و تەیالسی و بەزار و عبی کوڕی حەمید و دارەمی و ئەبو یەعلی موصڵی و ئیمام ئەحمەدی کوڕی حەنبەل، کەبەگوتەی ئیبن صەلاح بەمەبەستی ڕیوایەتی مەسنەدەکان لەصەحابەوە دانراوە، بەبێ ئەوەی کەبتوانرێت بەڵگەیان پێبهێنرێتەوە. وەلەئیمام ئەحمەدەوە ڕیوایەتکراوە کەئەولەبارەی کتێبی مەسنەدەکەیەوە بەکوڕەکەی خۆی عبدالله گوتوە: ئەم کتێبە نزیکەی سی و یەك هەزار حەدیسی تێدایە تەنانەت گروپێك لەهاوەڵانی ئیمام ئەحمەد گوتوویانە ئیمام ئەحمەد مەسنەدەکەی خۆی بۆ ئێمەی خوێندووەتەوە، گوتوویەتی ئەم کتێبە لەنێو حەوتسەد و پەنجا هەزار فەرموودەدا هەڵمبژاردووە هەر حەدیسێکی پێغەمبەر کەجێگەی جیاوازی موسوڵمانان بوبێت و لەم

مەسنەدەدا نەبێت، ئەوا وەها حەدیسێك نابێتە بەڵگە. ئەمەش ئەوە نیشاندەدات کەبەڵگەهێنانەوە بەهەموو حەدیسەکانی مەسنەدەکەی صەحیحە دژی قسەکەی ئیبن صەلاحە، ئەم بەشەش لەکتێبی مەناقیبی ئیمام ئەحمەد لەدانراوی ئیبن جەوزیەوە نەقڵم کردووە.

وەلەم ڕۆژگارەدا هیچ جۆرە حەدیسێك تەخریج ناکرێت مەگەر ئەوەی کە ئیستیدراکەکەی دەخەنە ئەستۆی پێشینان، چونکە نەریت گەواهیدەری ئەو ڕاستیەیەکە پێشەوایان بەهۆی ژمارەی زۆریان و نزیکی سەردەمەکانیان لەیەکترەوە و بوونی شیاوی توانای ئیجتیهادیانەوە کەسانێك نەبوون کەلەفەرموودەیەك بێئاگابن یان بیخەنەلاوە و پاشینان پابەند بن پێیەوە، وەها شتێك لەوانەوە بەدوورە، بەڵکو گرنگی نوسین و دانانەکانی زانایانی حەدیس لەم سەردەمەدا بەتە صحیحی امهاتەوە نوسراوەتەوە و زەبتیان بەگێڕانەوە لەدانەرەکانەوە دەبێت، وەهەروەها لەنیسبەتی ئیسنادی حەدیسەکانیشدا لێکۆڵینەوە دەکەن لەبارەی مەرج و ئەحکامەکانی حەدیس کەلەزانستی حەدیسدا هاتوون بۆ ئەوەی زنجیرەکان لەسەرەتاوە تاوەکو کۆتایی بەیەکەوە پەیوەست بن. زانایانی ئەمڕۆش لەمبارەیەوە بێجگە لەهەندێك شوێنی کەم نەبێت نەچووتە دەرەوەی بازنەی پێنج امهاتەکەوە و گرنگیان بەشتێکی زیاتر لەوان نەداوە.
بەڵام صەحیحی بوخاری لەڕووی پلەو پایەوە بەرزترین پلەی هەیە و شەرحەکەی بەلای خەڵکیەوە دژوارە و مەبەستەکەی داخراوە، چونکە خوێنەر بۆ دەرککردنی پێویستی بەناسینی ڕێگە جۆربەجۆرەکان و زانینی ئەحواڵی ڕاویەکانیان کەلەئەهلی حیجاز و عێراق و شامن و موحەدیسەکان جیاوازیان هەیە لەسەریان پێویستی دەبێت، هەربۆیە خوێنەر لەفێربوونی تەرجەمەکانیدا پێویستە ووردەکاری بکات چونکە ئەو تەرجەمەکە شەرح دەکات و حەدیسەکە بەهۆی سەنەد یان یان ڕێگەیەك دەهێنێت و دواتر دەستدەکات بەتەرجەمەیەکی تر و هەمان ئەو حەدیسەش لێرەدا وەك خۆی دەهێنێت، چونکە حەدیسی نابراو ماناگەلێکی تێدایە کەئەو بابەی پێ تەفسیر کردوون و لەناو چەندین

تەرجەمەدا دەیهێنێت و تاوایلێدێت لەچەندین بابی جیاوازدا بەپێی ماناجیاوازەکان دووبارە دەبێتەوە. لەبابەتە جێی سەرنج وتێڕامانەکان لەتەرجەمەکانی بۆخاریدا هەیە بریتیە لە گونجانی نێوان تەرجەمەکان و ئەو حەدیسانەیە کەلەوبارەیوە هێناویەتی، چونکە لەزۆرێك لەم تەرجەمانەدا ئەحواڵی گونجانی نێوانیان و ئەو حەدیسانەی کەهێناویەتی شاراوەدەبێت و، خەڵکیش لەبارەیانەوە گفتوگۆی دوور و درێژیان کردووە و لەکتێبی (الفتن) دا بابێك کەتەرجەمەی کردووە دەڵێت: بابی تەخریبی زوالسویقتین لەحەبەشە)[١٦٠] ئەم نەگونجانە ڕووی داوە، ئەو لەم بابەدا فەرموودەکەی خودای گەورە کەدەفەرمێت: ماڵی کەعبەمان کردە جێگەی سەواب و پیرۆزی و ئەمن و ئاسایش[١٦١] باسی کردووە و هیچ بابەتێکی بۆ زیاد نەکردووە ڕووی گونجانی نێوان ئەم تەرجەمەو ئەوەی کەلەبابەکەدا هاتووە لەخەڵکی شاراوەیە.

هەندێك خەڵکی دەڵێن دانەر (رح) تەرجەمەی ئەحواڵەکانی لەهەڵەنوسدا دەنوسیەوە و لەپاشان حەدیسەکانی بەو شێوەی کەبۆی گونجاوە لەهەر تەرجەمەیەکدا هێناویەتی بەرلەوەی کەبابەتە پەیوەستەکان بەتەرجەمەکانەوە کامڵ بکات مردووە و، کتێبەکەی بەمشێوەیە ڕیوایەتکراوە. وەلەصەحابە ئیبن بەکار قازی غەرناتە کەلەڕووداوی تەریفدا لەساڵی ٧٤١ ك دا شەهید بووە بەردەوام صەحیحی بوخاری تەدریس کردووە. بیستوومە کەئەو دەڵێت مەبەستی بوخاری لەم تەرجەمەیە تەفسیری ئایەتەکەبووە بەم مانایە کەئەمەش شەرعیە نەوەك موقەدەر بێت، چونکە شێوەکان لەوەوە پەیدا بوون کە (جعلنا) یان بە(قدرنا) واتە تەقدیرمانکردووە تەفسیر کردووە، بەڵام ئەگەر بە(شرعنا) واتە مەشروعمانکردووە تەفسیری بکەن ئەوکات لەڕووخاندنی زوالسویقەتەین بۆ ماڵی کەعبە هیچ شاراوەییەك بوونی نەبوو. من ئەم گوفتارەم لەشێخمانەوە ئەبوالبرکاتی بلفیقی بیستووە کەدەیدایە پاڵ ئیبن البکار کەلەگەورەترین قوتابیەکانی دەژمێردرا و

---

[١٦٠] زوالسویقتەین: بریتیە لەو سوپایەی کەهات کەعبەی ڕووخاند. (منتهی الارب).

[١٦١] (وَإِذ جَعَلنا البَيتَ مَثابَةً للنّاسِ وَأَمنًا) س البقرة ئا ١١٩.

کەسێك کەصەحیحی بوخاری شەرح بکات و هەموو ئەوشتانەی تێدا باس نەکات ئەوا مافی شەرحەکەی نەداوە وەك ئیبن بتاڵ و ئیبن مەهلەب و ئیبن تین و نمونەی ئەمانە. وەمن لەزۆرێك لەشێخەکانی وولاتی خۆمانم بیستووە کەدیانگوت شەرحی کتێبەکەی بوخاری قەرزێکە لەسەر شانی ئومەت، مەبەستیشیان ئەمەبوو کەهیچکام لەزانایانی نەتەوەی ئیسلام نەیانتوانیوە ئەو ئەرك و قەرزەی سەرشانیان ئەدا بکەن. صەحیحی موسلیمیش زانایانی مەغریب زۆر گرنگیان پێداوە و هەموویان ڕوویان تێکردووە و بەئیجماع لەکتێبەکەی بوخاری بەباشتریان زانیوە.

ئیبن صەلاح دەڵێت صەحیحی موسلیم لەو ڕووەوە باشترە لەصەحیحی بوخاری کە وەك صەحیحی بوخاری شتەزیادەکانی تێدا نیەو تەعزیب کراوە و ئەو حەدیسانەی کەبەپێی مەرجەکانی ئەو نەبوون لایبردوون. وەزۆربەی ئەم جۆرە فەرموودانەی لەتەرجەمەکاندا هێناوە. ئیمامی مازیری کەیەکێکە لەفەقیهەکانی مالیکی شەرحێکی لەسەر صەحیحی موسلیم نوسیوە و ناوی ناوە(المعلم بفوائدالمسلم). ئەم شەرحە بریتیە لە هەڵبژاردەیەك لەزانستی حەدیس و چەندین بەشە لەبەشەکانی فیقهە. دواتریش قازی عیاز لەپاش مازریەوە کامڵی کردووە و ناوی ناوە (اکمال المعلم). بەدوای ئەو دوانەشدا محی الدینی نەوەوی دەستی کردووە بەشەرحی تەواوی هەردوو کتێبی ناوبراوو چەندین شتی بۆ زیادکردووە و شەرحێکی تەواوی هێناوە. بەڵام شەرحی کتێبی حەدیسەکانی تر کەبەشێکی زۆری سەرچاوەی فەقیهەکانە و زیاتر لەکتێبە فیقهیەکاندا هاتووە و لەو بەشانەیە کەتایبەتە بەزانستەکانی حەدیسەوەو، زانایان کتێبگەلێکی زۆریان لەبارەی شەرحکردنیانەوە نوسیوە و ئەو مەسەلانەی کەلەزانستی حەدیسدا پێویستن بەتەواوی شەرحیانکردووە وەك ئەو بابەت و مەسنەدانەی کەحەدیسە باوەکانی تێدایە لەسوننەتدا. وەدەبێت ئەوەبزانین کەپلەی حەدیسەکان لەم سەردەمەدا وەك صەحیح و حەسەن و زەعیف و معلول و نمونەی ئەمانە لەیەکتری جیاکراونەتەوە و پێشەوایان و ڕەخنەگرانی حەدیس تەرتیبیانکردوون و ناسیونیان و ئێستە ڕێگەیەك بۆ تەصحیحی ئەوەی

کەلەڕابوردوودا بەصەحیح دانراوە نەماوەتەوە. پێشەوایانی حەدیس لەسەردەم پێشووەکاندا حەدیسیان بەڕێگە زنجیرەکانیانەوە دەناسی، بەجۆرێك ئەگەر حەدیسێك بەبێ زنجیرە و تەریقی خۆی ڕیوایەتیان بکردایە دەیانزانی کەگۆڕانکاری تێدا کراوە و هاوشێوە وەها شتێك بۆ ئیمام محمدی کوڕی ئیسماعیلی بوخاری ڕوویداوە، چونکە ئەوکاتێك کەچوویە بەغداد موحەدیسەکان دەستیان کردە تاپیکردنەوەی و پرسیاری کۆمەڵێك حەدیسیان لێدەکرد کەزنجیرەکانیان شەن و کەو کردبوون، بوخاریش گوتی: من ئاگاداری ئەم جۆرە حەدیسانە نیم بەڵام فلانەکەس بۆی گێڕاومەتەوە.....و دواتر حەدیسەکانی بەشێوەی ڕاست و دروست خوێندەوە و هەرمەتنێکی گەیاندەوە زنجیرەکەی و بەم شێوەیە موحەدیسەکانی بەغداد دانیان بەئیمامەت و پێشەوایەتی ئەودا (بوخاری) دا نا.

وەهەروەها دەبێت ئەوە بزانین کەڕیوایەتی ئیمامانی موجتەهیدان لەم بارەیەوە یەکسان نەبووە. هەندێك ڕیوایەتگەلێکی زۆر و هەندێکیشیان کەمیان هەبووە. هەروەك چۆن دەڵێن ڕیوایەتی ئەبی حەنیفە (رح) نزیکەی حەڤدە یان لەو سنورەدا کەدەگەیشتنە نزیکەی پەنجا فەرمووده بووە، ئەو ڕیوایەتانەشی کەلەلای مالك (رح) گەشتوونەتە سبووت هەمان ئەو ئەندازەیە کەلەکتێبی مۆتائدا هاتوون کەنزیکەی سێ سەد حەدیس یان نزیك لەو ژمارەیە، ئەحمەدی کوڕو حەنبەل (رح) لەمەسنەدەکەیدا سی هەزار حەدیسی هێناوە و ڕیوایەتی هەریەکەیان بەئەندازەیەکە کە ئیجتیهادەکەیان گەیانونیەتیە ئەو ئەندازەیە. وەهەندێك جاریش موتەعەصیب و لارو وێرەکان دەڵێن کەگوایە هەندێك لەپێشەوایانی گەورەی حەدیس توێشوویان نەبووەئەمەش بەهیچ شێوەیەك ڕاست نیە. چونکە شەریعەت بەشێوەیەکی حەتمی لەقورئان و سوننەتەوە دەردەهێنرێت و کەسێکیش کەلەحەدیسدا کەم توێشوو بێت پێویستە لەسەری بەدوایدا بچێت و ڕیوایەت بکات و لەمبارەیەوە هەوڵبدات و بەردەوام ئامادەی وەرگرتن و فێربوونی بێت بۆ ئەوەی بتوانێت ئاین لەبنەما ڕاستەکانیەوە وەربگرێت و ئەحکامەکان لەخاوەنی ئاین و کەسێك

کەلەلایەن خوداوە موبەلیغیەتی فێربیێت. ئەڵبەت کەسانێك لەپێشەوایان هەن کەکەمتر ڕیوایەتیانکردووە بەهۆی ڕەخنە لێگرتنیان لەم ڕێگەیەدا و هۆکار گەلێك کەدەبنە مایەی ڕووشاندن لەتوروقەکان (ڕیگەکان)ی حەدیسدا ڕیوایەتگەلێکی کەمتر هەڵدەبژێرن بەتایبەت کەلەلای زۆربەی موحەدیسەکان جەرح لەپێشترە، هەربۆیە ئیجتیهاد ئەم جۆرە کەسانە دەگەیەنێتە جێگەیەك کەلەڕیوایەتکردنی حەدیسە گوماناویەکان خۆیان بپارێزن و ئیحتیاتی زۆر دەکەن، هەربۆیە ڕیوایەتەکانیان بەهۆی لاوازی تروقەکانەو کەمتر دەبنەوە. سەرەڕای ئەمەش خەڵکی حیجاز لەعێراقیەکان زیاتر حەدیسی زیاتریان ڕیوایەتکردووە، چونکە مەدینە زێدی صەحابە و شوێنی کۆچیانەو ئەوکەسانەی لەصەحابە کەچوون بۆ عێراق زیاتر سەرقاڵی جیهاد بوون هەربۆیە ئیمام ئەبو حەنیفەڕیوایەتی هەبووە کەلەمەرجەکانی ڕیوایەت و نەقڵ و لاوازی ڕیوایەتی حەدیسێکی یەقینی لەکاتی دژایەتیکردنی لەگەڵ فیعلی نەفسیدا سەختگیری دەکرد و، بەهۆیەوە ڕیوایەتی ئەو کەمبوویەوە نەوەك بەهۆی ئەوەی کە وازی لەڕیوایەتی حەدیس هێنابێت لەبەر ئەوەی کە بەئەنقەست حەدیسی واز لێهێنابێت، چونکە ئاوازی موجتەهیدانی گەورەلەزانستی حەدیسدا بووە و شێوازی ئەو لەنێو زانایانی حەدیسدا پشتی پێدەبەستراو متمانەی پێدەکرا و تێڕوانینی ئەو لەقبوڵ و ڕەتکردنەوەدا ئیعتیباری هەبوو بەلأم موحەدیسەکانی تر کەزۆرینەیان پێکدەهێنا مەرجەکانی حەدیسیان فراوانکرد، لەئەنجامدا ڕیوایەتەکانیان فراوان بوو هەموویان موجتەهیدن و بەپێی ئیجتیهادی خۆیان کاردەکەن. هاوەڵانی ئەبو حەنیفە کەلەدوای ئەو مەرجەکانی حەدیسیان فراوانکرد و ڕیوایەتگەلێکی زۆریان هەبوو. تەحاویش ڕیوایەتیکرد و حەدیسگەلێکی زۆری هێناو مەسنەدێکی دانا و کەلەکتێبەگرنگەکان دادەنرێت، بەلأم لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا ناتوانن شان بدەن لەشانی هەردوو صەحیحەکە(صحیحین)، چونکە هەروەك گوتوویانە ئەو مەرجانەی کەبوخاری و موسلیم لەکتێبەکانیاندا پشتیان پێبەستوون ئیجماعیان لەسەرە، بەلأم مەرجەکانی تەحاوی هەمووان لەسەری یەکدەنگ نین و ڕیوایەتی تێدایە لەکەسانی بێناوو

نەناسراوەوە هەربۆیە صەحیحەین و بگرە کتێبەبەناوبانگەکانی تری حەدیسیش لەمەسنەدی تەحاوی لەپێشترن، چونکە مەرجەکانی ئەو لەدوای مەرجەکانی ئەمانەوەن هەربۆیە لەبارەی صەحیحەینەوە گوتوویانە کەبەئیجماع قبوڵیانکردووە، هەربۆیە بەئیجماع مەرجەکانی ئەو دوو صەحیحەیان قبوڵکردووە، کەواتە نابێت خوێنەر هیچ گومانێکی لەگەورە مەشایخەکانی ئاینەوە هەبێت لەوەی کە ڕیوایەتی کەمیان هەیە چونکە مەبەستیان ڕیوایەتکردنی صەحیحترینی حەدیسەکان بووە، چونکە ئەوان شیاوترینی ئەوکەسانەن کە لەبەرامبەریاندا گومانی باش بەرین و خوازیاری بەڵگەی ڕاستو دروست بین بۆیان.

یەکێکی تر لەزانستەکانی حەدیس بریتیە لەوەی کە یاسای ڕەخنە لەبارەی یەکەبەیەکەی حەدیسەکانەوە لەهەربابێکدا و لەتەرجەمەکانیاندا بەکاربهێنرێت، هەروەك چۆن ئەبو حافیز ئەبو عەمری کوڕی عبدالبر ئەبو محمدی کوڕی حەزم و قازی عیاز و محی الدینی نەوەوی و ئیبن العتار لەدوای عیاز و نەوەوی ئەم شێوازەی هەڵبژاردووە و زۆرێك لەپێشەوایانی خۆرهەڵات و خۆرئاوا (مغرب) پەیڕەویان لەوان کردوەو، هەرچەندە ئەوان لەکاتی باسکردندا لەبارەی حەدیسەکانەوە تەنها یاسای ناوبراویان بەبەس نەزانیوە بنەما گەلێکی تریان وەك ئیستیدراکی دەقەکان (متون) و زمانەوانی و ئیعرابیانەوە بەکارهێناوە و قسەیانکردووە، بەلآم گفتوگۆی ئەمان لەبارەی زنجیرەکانەوە لەڕووی هونەری حەدیسەوە جامیعتر و دوورو درێژترە. ئەمانەن جۆرەکانی زانستەکانی حەدیسن کەلەنێو پێشەوایانی سەردەمەکانی ڕابوردوودا و کەتاوەکو ئێستاکەش جێگەی باس و لێکۆڵینەوەن، خوداش ڕێنماکاری مرۆڤەکانە بۆ سەر ڕێگەی ڕاست.

# بەشی حەوتەم

## لەبارەی زانستی فیقه و بابەتگەلێك لەفەرائیز (میراس) کە پەیوەستە پێیەوە

فیقه بریتیە لە ناسینی ئەحکامەکانی خودای گەورەیە لەبارەی کردەوەی کەسانێکەوەیە کەموکەلەف دەبن بەجۆرێك کەبزانرێت کام کرداریان واجب یان حەرامەو کام کرداریشیان موستەحەب یان مەکروه یان موباح و رێگە پێدراوە. ئەم ئەحکامانەش لەقورئان و سوننەت و ئەو بەڵگانەی کەشاریع (خودا) بۆ ناسینی ئەحکامەکان بڕیاریداوە دەگرنەوە و هەربۆیە هەرکات ئەحکام لەبەڵگەنابراوەکان دەربهێنرێن، بەمجۆرە ئەحکامانە دەگوترێت فیقه. لەگەڵ ئەوەی کەلەنێو سەلەفدا جیاوازیگەلێکی بوونیان هەبووە، ئەوان ئەحکامەکانیان لەبەڵگەکانەوە دەردەهێنا. وەهۆکاری ئەوەی کەنەتوانراوە خۆیان لەو جیاوازیە لابدەن کەبەزۆری بەڵگە لەدەقەکانی قورئان و سوننەتەوە دەردەهێنران و دەقەکانیش بەزمانی عەرەبی بوون کەلەفزەکانی دەکرا چەندین مانا هەڵبگرێت، لەنێو سەلەفیشدا لەبارەی ئەم ئیمکاناتەی ئەحکامەشەرعیە دەرهێنراوەکانەوە لەم لەفزانە جیاوازی گەلێك بوو کەناسراوە. وەهەروەها رێگەکانی سوننەت لەڕووی سابتبوونەوە جۆراو جۆرە ئەوحوکمانەی کەلەسوننەتەوە وەردەگیرێن و بەزۆری دژی یەکترن و بۆلابردنی ئەو دژبوونەش بێجگە پشت بەستن بەتەرجیح چارەیەکی تر نیە کەلەوانیشدا جیاوازی ڕوودەدات. یەکیکی تریش لەوانەئەوبەڵگانەی کەلەدەقەکانن جیاوازیان تێدایە و دەقەکانیش بۆ ڕووداوە نوێیەکان بەس نین، و ئەوەی کەلەم جۆرە ڕووداوانەدا نەچێتە ناو دەقەکانەوە ئەوا حەمل دەکرێتە سەر ئەو ڕووداوەی

کە دەقی لەبارەوە هاتووە و لێکچوون (شباهت) یان لەگەڵ یەکتردا هەیە. ئەمانە هەموونەوشتانەن بۆ جیاوازیە حەتمیەکان دەبن و هەرلێرەشدا لەنێوان سەلەف و پێشەوایانی دوای ئەمان جیاوازی بۆچوون ڕوویداوە. سەرەڕای ئەمەش هەموو صەحابە ئەهلی بۆچوون و فتوا نەبوون نەدەکرا هەموویان ئەرکە ئاینیەکان فێربن، بەڵکو ئەم شتە تەنها پەیوەندی بەحافیزانی قورئان و کەسانێکەوە هەبووە کەئاشنایەتیان لەگەڵ ناسیخ و مەنسوخ و موحکەم و موتەشابیهو ڕێنماییەکانی تری قورئاندا هەبووە، چونکە ئەوان ڕاستەوخۆ ئەم ڕێنماییانەیان لەپێغەمبەرەوە(ص) یان گەورەکانی ئاینەکەیانەوە کەگوتارەکانی ئەو زاتەیان بیستبوو وەردەگرت هەربۆیە بەم کەسانە دەڵێن قرأ واتە ئەوانەی کەقورئان دەخوێننەوە، چونکە عەرەب نەتەوەیەکی نەخوێندەوارو ئۆمی بوون هەربۆیە ئەوانەی کەخوێنەری قورئان بوون بەم ناوەوە ناوزەد کرابوون و قورئان خوێنی لەوسەردەمەدا بەلای خەڵکی عامەی عەرەبەوە شتێکی سەرسوڕهێنەربوو. لەسەرەتای ئیسلامدا بارودۆخ بەم شێوەیە بەردەوام بوو.

لەپاش ماوەیەك شارەئیسلامیەکان فراوان بوون و گەورەیی گەشانەوەیان بەدەست هێناو نەخوێندەواری (امیت) بەهۆی مومارەسەکردنی قورئانەوە لەنێو عەرەبدا نەماو ئیستینبات (دەرهێنانی حوکمەکان لەقورئان و سوننەتدا) دەکراو فیقهیش کامڵبوو. چوویە ڕیزی هونەر و زانستەکانەوە و ناوی حافیزانی قورئان گۆڕدراو لەبری قارئ پێیان دەگوتن فەقیە یان زانا، فیقهیش لەنێوانیاندا بو بەدووبەشەوە: یەکێکیان شێوەی ئەهلی بۆچوون و قیاس کەلەنێو خەڵکی عێراقدا باو بووە و ئەویتریشیان شێوەی ئەهلی حەدیسە کەتایبەتبووە بە ئەهلی حیجازەوە لەبەر ئەوهۆیەی کەباسمانکرد حەدیس لەنێو خەڵکی عێراقدا کەمتر ڕەواجی هەبوو، هەربۆیە زیاتر سەرقاڵی قیاس دەبوون و شارەزاییان تێدا پەیدا کرد، هەربۆیە پێیان دەگوتن ئەهلی ڕەئی و بۆچوون. پێشەوای عێراقیەکان ئیمام ئەبو حەنیفە بوو کەشێوازی قیاس لەلای ئەوو هاوەڵەکانی جێگیر و پایەدار بوو پێشەوای حیجازیەکان یەکەم مالیکی کوڕی ئەنەس و دوای ئەویش شافیعی

بوو. هێندەی نەبرد کەدەستەیەك لەزانایان ئینکاری قیاسیانکرد و کارکردنیان پێی بەبەتاڵ دایە قەڵەم و، ئەمانەش بریتی بوون لە (زاهیریە) کەهەموو بەڵگەو حوکمەشەرعیەکانیان لەدەقەکان و ئیجماعدا قەتیس کردبوو قیاسی جەلی و عیلەتی مەنصوصیان دەگێڕایەوە سەر دەق (نص)، چونکە لەهەموو بوارەکاندا نەص لەپێشترە لەعیللەت هەروەك نەص وایە بەسەر حوکمدا.

پێشەوایانی ئەم مەزهەبە داوودی کوڕی علی و کوڕەکەی و هاوەڵەکانی بوون. ئەو سێ مەزهەبەی کەباسمانکردن مەزهەبی بەناوبانگی گروپگەلێکی زۆر بوون لەنێو ئوممەتدا خاندانی پێغەمبەر (ص) لەوان جیابوونەوە و مەزهەب و فیقهێکی جیایان هێنایەکایەوە و تاقانەبوون لەو مەسەلەیەدا و بەپێی بیروباوەڕی خۆیان لەقەدح و ڕووشاندنی هەندێك لەصەحابەدا بنیاتناو، باوەڕیان بەعیصمەتی ئیمامەکان پەیداکرد و جیاوازیان لەقسەکانی ئەواندا لابرد، هەموو ئەمانەش لەبنەما وەهمی و گوماناویەکانن. وەهەروەها خەواریجیش جیابوونەوە، بەڵام عامەی خەڵکی هێندە گوێیان بەمەزهەبەکەیان نەدا، و بەڵکو لایەنی ئینکاری و قەدحیان زیاد کرد، هەربۆیە شتێك لەمەزهەبەکەیان نازانین و ناناسین لەکتێبەکاندا باس لە مەزهەبەکەیان ناکەین و شوێنەوار و پاشماوەیەك لەوان بێجگە لەو شوێن و وولاتانەی کەتێیاندا سەریان هەڵداوە بوونی نیە.

هەروەك چۆن کتێبەکانی شیعەلەوولاتەکانی خۆیاندا و لەهەرشوێنێك کەدەوڵەتیان پێکهێناوە ئیتر لەمەخریب بێت یان مەشریق و یەمەن، باویان هەیە. کتێبەکانی خەواریجیش بەم شێوەیەن و هەریەکە لەم فیرقە و گروپانە خاوەن و کتێب و دانراوو بیروباوەڕگەلێکی نامۆن لەفیقهدا. بەڵام ئەمڕۆکە بەهۆی لەناوچوونی ئیمامەکانی زاهیریەو دژایەتیکردنی زۆربەی خەڵکی لەگەڵ شوێنکەوتوانیدا، مەزهەبەکەیان پەیڕەوی نیەو، بیروباوەڕەکانیان تەنها لەکتێبەکاندا ماوەتەوە و هەندێك جاریش زۆرێك لەشوێنکەوتوانی بەتاڵ کەبەزۆر لەخۆکردن (تکلف) خۆیان بەشوێنکەوتەی ئەمان دەزانن، لەکتێبەکانیاندا لێکۆڵینەوە دەکەن و سەرئەنجامەکەشی سودێکی گەورەش بەدەست ناهێنن و

ڕووبەڕووی دژایەتیکردنی زۆربەی خەڵکی دەبنەوە هەندێك جاریش کەسانێك بەهۆی فێربوونی زانست لەکتێبی ئەم فیرقەیەوە بەبێ ئەوەی کەیارمەتی لەمامۆستایانەوە وەربگرن، لەڕیزی ئەهلی بیدعەت دەژمێردرێن. هەروەك چۆن ئیبن حەزم لەئەندەلوسدا پلە و پایەیەکی بەرزو بەڕێزی هەبوو لەلەبەرکردنی حەدیسدا، چ چارەنوسێکی هەبوو چونکە ئەو گەڕایەوە سەرمەزهەبی زاهیریە و هەروەك خۆی پێی وابوو لەقەوڵ و بیرو باوەڕەکانیاندا گەشتە قۆناغی ئیجتیهاد و لەو مەزهەبەدا شارەزایی پەیدا کردو، لەگەڵ داوود پێشەوای ئەو فیرقەیەدا کەوتە کێبڕکێ و دژایەتیەوە و دژایەتی زۆرێك لەپێشەوایانی موسوڵمانانی کرد.

هەربۆیە خەڵکی ڕقیان لێی بوویەوە و لەڕادەبەدەر ئینکاری مەزهەبەکەیانکرد و بەناشیرین سەیریان دەکرد و کتێبەکانی ئەویان خستەلاوە بەجۆرێك لەبازاڕەکانیشدا کڕین و فرۆشتنیان پێوە نەدەکرا و، هەندێکجاریش دەیاندڕاندن و ئێستەش بێجگە لەمەزهەبەکانی ئەهلی ڕەئی عێراق و ئەهلی حەدیسی حیجازیەکان مەزهەبێکی تر نەماوەتەوە. بەڵام پێشەوای عێراقیەکان ئەبو حەنیفەی نوعمانی کوڕی سابیت کەمەزهەبەکەیان بەهۆی ئەوەوە جێگیر بووە لەفیقهدا پلەیەکی هەیە کەکەس پێی ناگات‌و هەموو ئەهلی هۆزەکەی بەتایبەت مالیك و شافیعی گەواهی بەرزی پلە و پایەی ئەویانداوە لەفیقهدا پێشەوای حیجازیەکان مالیکی کوڕی ئەنەسی ئەصبحی (رح) ئیمامی مەدینە (دارالهجرە) بوو. ئەو سەرەڕای بنەماگشتی و ئەو مەدرەکانەی کەلەلای خەڵکانی تر جێگەی باوەڕن بنەماو ئەصڵێکی تری دانابوو کەتایبەت بوو بەوەوە کەبریتی بوو لەکرداری ئەهلی مەدینە، چونکە ئەو پێی وابوو کەخەڵکی مەدینە لەوەی کەخۆیان بەشیاوی دەربڕینی بۆچوون لەو بارەیەوە نەدەزانی هەروەك کردار یان تەرککردنێك دەبوونە شوێنکەوتەی پێشینان و ئەم کارەشیان بۆ ئاین و شوێنکەوتەیی خۆیان بەپێویست دەزانی و، لەو نەوەیەی کەپێغەمبەریان بینیبوو لێیان وەردەگرتن،و چاویان لێدەکردن، ئەم ئەصڵ و بنەمایەش لەلای مالیك لەبنەمای بەڵگە شەرعیەکان دەژمێردرا و

زۆرێك گومانی ئەوەیاندەکرد کەئەم ئەصلە لەمەسەلەکانی ئیجماعە، بەلاّم مالیك باوەڕی پێی نەبوو، چونکە بەلگەی ئیجماع تەنها تایبەتنیە بەخەلّکی مەدینەوە، بەلّکو هەموو ئوممەت دەگرێتەوە.

وەدەبێت ئەوە بزانین کەئیجماع بریتیە لەڕێککەوتن و هاوڕایی لەگەلّ مەسەلەی ئاینیدا لەڕووی ئیجتیهادەوە. وەمالیك (رح) ڕەفتاری خەلّکی مەدینەی لەم ڕووەوە بەموعتەبەر دانەناوە، بەلّکو لەو ڕووەوە لەبەرچاوی گرتووە کەئەوەیەك بەبینین لەئەوەیەکی تر بەیرەوی ڕەفتارەکانیان وەك خۆی بکەن، تاوەکو دەگاتە شارع (ص) وەهێنانی ئەم مەسەلەیە لەبابی ئیجماعدا شتێکی باشە، چونکە ئەوبابە بۆ ئەوبابەتەشیاوترینی بابەکانە. چونکە لەم مەسەلەیەدا ڕێککەوتنێك هەیە کەلەگەلّ ئیجماعدا کۆی دەکاتەوە جگەلەوەی کە ڕیککەوتنی ئەهلی ئیجماع لەڕووی نەزەر و ئیجتیهادەوە لەبەلگەکاندایە و ڕێککەوتنیان لەم مەسەلەیەدا لەڕووی ئەنجامدانی کارێك یان نەکردنیەوە بەپشتبەستنە بەموشاهەدەی ئەو ڕەفتارەیە لەپێشینانەوە. وەئەگەر ئەم مەسەلە لەبابی فیعل و تەقریری پێغمبەرەدا (ص) یان لەبابی بەلگە ئیختیلافیەکانەوە وەك شەرعی بەرلەئێمە (شرع من قبلنا) مەزهەبی صەحابی و ئیستیصحاب باسدەکرا باشتر بوو. دوای مالیکی کوڕی ئەنەس محمدی کوڕی کوڕی ئیدریسی مەتلەبی شافیعی (ر ن) بوویە پێشەوای حیجازیەکان و ئەو لەپاش مالیك بەسەفەرێك چوویە عێراق و، هاوەلاّنی ئیمام ئەبو حەنیفەی بینی و ئوصولّیکی زۆری لێوە وەرگرتن و تەریقەی حیجازیەکانی تێکەلّ بەتەریقەی عێراقیەکان کرد و، مەزهەبێکی تایبەتی هێنایە کایەوە و دەستی کردە دژایەتیکردنی زۆرێك لەبیرو باوەڕەکانی مالیك.

لەپاش ئەویش ئەحمەدی کوڕی حەنبەل (رح) دەرکەوت ولەموحەدیسەگەورەکان دەژمێردرا و هاوەلاّنی بەو سەرمایە زۆرەی کەلەحەدیسدا هەیانبوو لەلای هاوەلاّنی ئیمام ئەبو حەنیفە حەدیسیان خوێندەوە و، پابەند بوون بەمەزهەبێکی ترەوە. وەتەقلید لەشارەکانی ئیسلامدا تەنها لەم چوار کەسە دەکراو کەسانیکی کەمی بیجگە لەمان

تەقلیدیان لێکراوە و زاناکان دەرگاکانی جیاوازیان داخستووە. چونکە لەزانستەکاندا زاراوەی گەلان فراوان بوون و بوونە ڕێگر لە بەردەم پلەی ئیجتیهاددا و ترسی ئەوەش هەبوو کەئەم پلەیە بدرێتەپاڵ کەسێك کەشیاوی نەبێت و نەتوانرێت باوەڕبە ڕەئی و دینی بکرێت، ئەمەیە کەبەڕاشکاوانە دانیان بەبێتواناییدا ناوە لەبەدەستهێنانی ئەم پلەیەدا. وەهەرکەسێك خاوەنی چاولیکاران بووەو وایلێکردوون کەچاولێکەری لەپێشەوا ناوبراوەکان بکەن‌و ڕێگریکرد لەچاولێکەری لەخۆیان بەجۆرێك لەگەمەی منداڵانە دەژمێردرێت و، شتێك بێجگە نەقڵ و ڕیوایەتی ئەوان نەمایەوە و هەرموقەلیدێکیش دەبێت لەدوای تەصحیحی ئوصوڵ و پەیوەستی سەنەدەکان بەڕیوایەتەوە، کاربەمەزهەبی پێشەواکەی خۆی لەو چوارکەسە دەکات. ئەمڕۆکەش بێجگەلەمە بەرهەمێکی نیە.

بانگەشەکاری ئیجتیهاد لەم سەردەمەدا ڕەتکراوەیە و کەسناگەڕێتەوە بۆی و تەقلید لەوەوە بەدووره نەتەوەی ئیسلامیش ئیستاکەش تەقلید لەم چوار پێشەوایە دەکەن. بەڵام پەیڕەوانی ئەحمەدی کوڕی حەنبەل گروپێکی کەمن و زۆربەیان لەشام و بەغداد وناوچەکانیان دەژین و زیاتر لەهەرکەسێك لەلەبەرکردنی سوننەت و ڕیوایەتی حەدیسدا گرنگیان هەیە و خواستی زۆریان بۆ ئیستینباتی حەدیس هەیە تائاستی توانا لەقیاس ڕوو وەردەگێڕن و، لەبەغدادا هێزو زۆرینەبوون بەجۆرێك لەگەڵ شیعەدا دەکەوتنە شەڕەوە موجادەلەیاندەکرد و فیتنەگەلێکی زۆر لەبەغداد سەریانهەڵدا تا کاتی داگیر کردنی بغداد لەلایەن تەتارەکانەوە، ئەم موجادەلانە سەریانهەڵداو نوێ نەبوونەوە و زۆربەیان لەشامدا نیشتەجێ بوون و لەو شارەدا بوونە زۆرینە. بەڵام موقەلیدانی ئەبو حەنیفە ئەمڕۆکە بریتین لەخەڵکی عێراق و موسوڵمانانی هیندستان و چین و ماوراء النهر و هەموو خەڵکی عەجەمی ئێرانن، چونکە مەزهەبەکەی ئەو تایبەتبووە بەعێراق و بەغدادەوە قوتابیەکانی ئەو لەهاوڕێیان و یارانی خەلیفەکانی بەنی عەباس بوون هەربۆیە دانراوو مونازەرەکانیان لەگەڵ شافیعیەکاندا زۆربوون و لەخیلافیات و مونازەرات و

جەدەلدا سەرقاڵی گوفتارو بابەتەباشەکانن. لەئەنجامی ئەوەدا زانستێکی باش و ئەندێشەگەلێکی سەرسوڕهێنەریان بەدیهێنا کەتاوەکو ئێستەش زانستی ناوبراو لەدەستی خەڵکیدایە و لەمەغریبیش هەندێکیشی باوی هەیە کەقازی ئیبن العربی و ئەبوالولیدی باجی لەسەفەرەکانیاندا بۆ مەغریب لەگەڵ خۆیاندا بردوویانە.

وەئیمامی شافیعیش خودای لێ ڕازی بێت زۆربەی موقەلیدەکانی لەمیسردان و لەڕووی ژمارەوە لەو وولاتەدا لەشوێنکەوتوانی مەزهەبەکانی تر زیاترن و، مەزهەبی ئەو لەعێراقو خوراسان و ماوڕا النهر بلاّو بووەتەوە لەهەمووشارەکاندا لەفتواو تەدریسدا دژایەتی حەنەفیەکانیان دەکرد و کۆڕو کۆبوونەوەی مونازەرەی گەورەیان لەگەڵ حەنەفیەکاندا بەرپادەکرد و، کتێبی خیلافیات (مونازەرات) پڕوبو لەبەلگەهێنانەوەکانی ئەمان، بەلاّم لەپاش ئەوەی کەخەلافەتی مەشریق و ناوچەکانی لەناوچوو نفوزی شافیعیەکانیش لاوازبوو نەما. وەئیمام محمدی کوڕی ئیدریسی شافیعی کاتێك کەلەمیسردا چوویە لای بەنی عبدالحکم گروپێکیان زانیاریان لەبارەی مەزهەبی شافیعیەوە وەرگرت و بوبتی و موزەنی بە قوتابیەکانیان دەژمێردران و، هەم لەمیسردا لەنێو مالیکیەکاندا گروپێك لەبەنی عبدالحکم و هەم لەنێو خاندانەکانی وەك ئەشهەب و ئیبن القاسم و ئیبن الواز و نمونەی ئەمانە هەبوون. دواتر حاریسی کوڕی مسکین و کوڕەکانی و دواتریش قازی ئەبوئیسحاقی کوڕی شەعبان و ماوەلاّنی،و لەوەش بەدوا فیقهی ئەهلی سوننەت و جەماعەت بەهۆی دەرکەوتنی دەوڵەتی ڕافیزیەکانەوە لەناوچوو لەو وولاّتەدا فیقهی خاندانی پێغەمبەرایەتی بلاّو بوویەوە و نزیّ بوو بێجگە لەفەقیهەکانیان ئەوانیتر لەناوبچن، تائەوەبوو قازی عبدالوهاب لەکۆتایی سەدەی چوارەمدا بەهۆی نەداری و خراپی مەعاشەوە کۆچی کرد بۆمیسر و، خەلیفەکانی عبیدیەکان (فاتمیەکان) لەڕووی ئەوەی کەسەرزەنشتی بەنی عەباسیاندەکرد کەوەها ئیمامێکیان لەدەستی خۆیانداوە ڕێزێکی زۆریان لێگرت و لەم ڕووەوە بازاڕی مالیکیەکان لەمیسردا کەمێك ڕەونەقی پەیداکرد، تاوەکو دەوڵەتی عبیدیان کەسەربە ڕافیزیەکان بوو بەدەستی صلاح الدینی

یوسفی کوڕی ئەیوب لەناوچوو فیقهی خاندانی نبوەتیش لەو ناوچانەدا نەما و فیقهی جەماعەت جارێکی تر لەناویاندا بڵاوەیکرد و، هەربۆیە فیقهی شافیعی هاوەڵانی کەلەخەڵکی عێراق بوون فراوان بوو گەڕایەوە باشترین بارودۆخ و بازاڕی ڕەونەقی پەیداکرد و کتێبەکەی ڕافیعی لەلەعێراقەوە برایە شام و میسر و لەفیقهی شافیعیدا زاناگەلێکی بەناوبانگ دەرکەوتن، وە محی الدینی نەوەوی و عزالدینی کوڕی عبدالسلام کەلەسێبەری دەوڵەتی ئەیوبیدا لەشام پەروەردەبوبو دوای ئەویش ئیبن الرفعە[١٦٢] لەمیسر و تقی الدینی دەقیق و دواتریش تقی الدینی سبکی و لەپاش ئەودوانەوە دەرکەوت، تائەوەبوو پلەی ناوبراو گوازرایەوە بۆ شێخ الاسلامی میسر لەم سەردەمەدا کەناوی سراج الدینی بلقینیە ئەو ئەمڕۆکە گەورەی شافیعیەکانە لەمیسر و بەڵکو گەورەو پێشەوای زاناکانیشە لەم سەردەمەدا.

بەلاّم مەزهەبی مالیك (رح) بەتایبەت لەنێو خەڵکی مەغریب و ئەندەلوسدا بڵاو بوویەوە هەرچەندە لەدەرەوەی ئەم ناوچانەش هەبوو، بەلاّم مەغریبیەکان و خەڵکی ئەندەلوس بێجگە لەکۆمەلێکی کەم نەبێت تەقلیدیان لەکەسیتر نەکرد، چونکە بەزۆری ئەوان سەفەریان دەکرد بۆحیجاز و ئەوپەڕی سەفەریشیان بوو مەدینە لەو سەردەمەدا بەناوەندێکی گەورەی زانست دەژمێردراو لەوێوە ڕووناکی چرای زانست بەسەرعێراقیشدا دەدرەوشایەوە، بەلاّم عێراق لەسەر ڕێگەی ئەمان نەبوو تەنها فێربوونی زانستیان لەزاناکانی مەدینەوە بە بەس دەزانی و شێخ و پێشەوای خەڵکی مەدینە لەو سەردەمەدا مالیك و بەرلەمالیکیش مامۆستاکانی بوون و، لەدوای ئەویش قوتابیەکانی و هەربۆیە خەڵکی مەغریب و ئەندەلوس گەڕانەوە بۆلای ئەوو بێجگەلەو لەهیچ پێشەوایەکی تر

---

[١٦٢] ئیمام نجم الدین ابوالعباس ئەحمدی کوڕی محمدی کوڕی الرفعە زاناترین فەقیهی سەردەمی خۆی بووە و چەندین کتێبی لەفیقهدا هەیە، کەیەکێکیان ناوی الکفایە یە و بیست موجەڵەدە و ئەویتریشیان بەناوی المطلب و نزیکەی شەست بەرگ بووە. وەهەروەها ڕسالەیەکیشی لەبارەی وەزنەکان و مەقادیرەوە نوسیوە و لەشاری قاهیرەی کۆندا لەساڵی ٧١٠ ك ٣١٠ ز کۆچی دوایی کردووە (حاشیەی دسلان ب لا ١٣)

کەتەریقەتەکەی نەگەشتبوویە ئەوان تەقلیدیان نەدەکرد و سەرەڕای ئەمەش خوی دەشتەکیەتی زاڵبوو بەسەر خەڵکی ئەندەلوس و مەغریبدا و ڕوویان نەدەکردە ئەوشارستانیەتەی کەخەڵکی عێراق هەیانبو، بەهۆی لێکچوونیانەوە لەگەڵ خەڵکی حیجازدا هاوسۆزتربوون هەربۆیە مەزهەبی مالیکی لەنێوانیاندا بەتازەیی مابوویەوە و تەنقیح و تەهزیبێك کەپێویستی شارستانیەتە نەچوبوویە ناویەوە هەروەك چۆن لەمەزهەبەکانی تردا ئەم جۆرە گۆڕانکاریانە ڕوویانداوە.

لەبەرئەوەی کە مەزهەبی هەریەکە لەئیمامەکان بەلای پەیڕەوانیانەوە وەك زانستێکی تایبەت وابوو ڕێگەی ئیجتیهاد و قیاسی تێدا نەبوو هەربۆیە پێویستیان کەوتە تنظیری[١٦٣] مەسەلەکان لەلکاندن و جیاکردنەوەیاندا لەکاتی هەڵەدا لەپاش بەڵگە هێنانەوە و پشت بەستن پێیان لەئوصوڵ و بنەماکانی مەزهەب و پێشەواکانیاندا، هەموو ئەمانەش پێویستی بەمەلەکەیەکی قوڵ و بەهێز هەبوو کەبتوانن بەهۆیەوە ئەم تەنزیر و تەفرقە لەیەك کاتدا بەپێی توانا لەپەیڕەوی لەمەزهەبی پێشەوای خۆیان بەدەست بهێنن، ئەم مەلەکەیەش لەم سەردەمەدا بریتیە لەزانستی فیقە و هەموو خەڵکە مەغریب تەقلیدی ئیمام مالیك دەکەن. وە قوتابیانی ئیمام مالیك لەمیسر و عێراقدا بڵاوەیانکردبوو، هەروەك چۆن لەعێراقدا لەمان قازی ئیسماعیل و چینەکەی ئەو وەك ئیبن خوازی منداد و ئیبن منتاب و قازی ئەبوبەکری ئەبهەری و قازی ئەبوحسینی کوڕی قصار قازی عبدالوهاب و ئەوانەی کەلەپاش ئەمانەوە دەرکەوتن و، ئیبن القاسم ئەشهەب ئیبن عبدالحکم و حاریسی کوڕی مسکین و چینی ئەمانە لەمیسردا دەژیان وەلەئەندەلوسەوە یەحیای کوڕی یەحیای لەیسی بەرەو میسر ڕۆشت و، چاوی بەمالیك کەوت و کتێبی مۆتائی لەوەوە ڕیوایەت دەکرد بەهاوەڵانی ئەو دەژمێردرا لەپاش ئەویش عبدالملیکی کوڕی حبیبیش لەئەندەلوسەوە چوویە میسر و لەئیبن القاسم و چینی ئەو فیقهی نوسیەوە و مەزهەبی مالیکی لەئەندەلوسدا بڵاوکردەوە و کتێبی الوازیحەی نوسی

---

[١٦٣] (بەرابەرکردنی هاوشێوە لەگەڵ هاوشێوەدا).

دواتریش عتبی کەیەکێك بوو لەقوتابیەکانی کتێبی العتیبەی دانا. ئەسەدی کوڕی فوراتیش ئەفریقای بەجێهێشت و یەکەمجار لەهاوەڵانی ئەبو حەنیفەوە دەینوسیەوە و دواتریش ڕوویکردە مەزهەبی مالیك و لەئیبن القاسیمەوە لەبابەکانی تردا فیقهی نوسیەوەو کتێبەکەی هێنا بۆ قەیرەوان و کتێبەکەی بە اسدیە کەوەك دانە پالێك بوو بۆ ئەسەدی کوڕی کوڕی فورات ناوبانگی دەرکرد، سەحنون لەلای ئەسەد خوێندیەوە و لەپاشان خۆی بەرەو مەشریق ڕۆشت و چاوی بەئیبن القاسم کەوت و ئوصوڵی لێوە فێر بوو لەمەسەلەکانی اسدیەدا دژایەتی کرد و لەزۆرێکیان پاشگەز بوویەوە و سەحنون مەسەلەکانی نوسیەوە و کردنیە کتێبێك و، ئەو مەسەلانەی کەخستبوونیە لاوە سەلماندی کەهەڵەن و سەحنون گەشت بەئیبن القاسم و بەنامەیەك داوانیان لەئەسەدکرد ئەوەی کە ئەمان سەلماندویانە کەهەڵەیە بیانسڕێتەوە و، کتێبەکەی سەحنون فێرببێت، بەڵام ئەو ئەم داوایەی ڕەتکردەوە و هەربۆیە خەڵکی کتێبەکەی ئەسەدیان خستەلاوە لەدانراوەکەی سەحنون پەیڕەویاندەکرد بەپێی ئەوەی کەلەودا تێکەڵی مەسەلەکان لەبابەکانیدا هەبوو ناویاننا دانراو، یان کتێبی تێکەڵ خەڵکی قەیرەوان ڕوویانکردەئەم دانراوە و خەڵکی ئەندەلوسیش گرنگیان بە وازیحە و عتیبەدەدا.دواتر ئیبن ئەبو زەید لەکتێبەکەیدا بەناوی کورتەیەی دانراو یان مودەوەنە و موختەڵەتەی کورتکردەوە و، ئەبو سەعیدی بەرادیعیش کەلەفەقیهەکانی قەیرەوان بوو کتێبەکەی خۆی بەناوی تەهزیب کورتی کردەوە و بویە جێگەی متمانەی مەشایخەکانی ئەفریقاو، فێری بوون و وازیان لەکتێبەکانی تر هێنا.

وەهەروەها خەڵکی ئەندەلوس کتێبی عتیبەیان بەباوەڕپێکراو دایەقەڵەم و وازیحە و کتێبەکانی تریان خستەلاوە و زانایانی مەزهەبە بەردەوام سەرقاڵی شەرح و ڕوونکردنەوە و کۆکردنەوەی امهات بوون. هەروەك چۆن خەڵکی ئەفریقا وەك ئیبن یونس و لەخمی و ئیبن محرز و تونسی و ئیبن بەشیر و نمونەی ئەمانە ئەوەی کەخودا ویستی لەسەریوو شەرح و تەفسیریان لەسەر مودەوەنە نوسی. خەڵکی ئەندەلوسیش وەك ئیبن ڕووشدو

نمونەی ئەو شەرحیان لەسەر عتیبە نوسی. ئیبن ئەبو زەید هەموو مەسەلەو جیاوازیەکانو ئەو قەولانەی کەلەامهاتدا هەبوون لەکتێبی النوادیردا کۆی کردنەوەو لەهەردوو ناوچەی ئەفریقا و ئەندەلوس تاوەکو لەناچوونی دەوڵەتەکانی قورتوبەو قەیرەوان مەزهەبی مالیکی وەك دەریایەکی بێبن فراوان بوو خەڵکی مەغریب دەستیان بەهەردوو کتێبەکەوە گرت و مەزهەبی مالیکیش بوبەسێ ڕێگەی جیاوازەوە:

یەکێکیان مەزهەبی قەیرەوان کەگەورەکەیان سەحنون بوو مەسەلە و ئوصولگەلێکی لەئیبن القاسمەوە وەرگرتبوو.

دووەمیشیان: تەریقەی قورتوبیەکان بوو کەسەرۆکەکەیان ئیبن حەبیب بەوو کەزانیاریەکانی خۆی لەمالیك و موتریف و ئیبن ماجشون[١٦٤] و ئصبغ [١٦٥] وە فێربووە.

سێیەمیشیان: تەریقەی عێراقیەکان و سەرۆکەکەیان قازی ئیسماعیل و هاوەڵانی ئەو بوون و تەریقەی میسریەکان شوێنکەوتەی عێراقیەکان بوو قازی عبدالوهاب لەبەغدادەوە لەکۆتاییەکانی سەدەی چوارەمدا کۆچیکرد بۆ میسر و، خەڵکی میسریش تەریقەی ناوبراویان لەوەوە وەرگرت و لەسەردەمی حاریسی کوڕی میسکین وئیبن میسر ئیبن لهیبو ئیبن رشیقدا ڕەواجی هەبوو، بەڵام بەهۆی دەرکەوتنی ڕافیزیەکان (فاتیمیەکانە) وە فیقهی خاندانی پێغەمبەر بەنهێنی مایەوە. بەڵام تەریقەی عێراقیەکان بەهۆی دووری و شاراوەیی مەدرەکەکەی و کەمی زانیاری خەڵکی قەیرەوان وئەندەلوسەوە لەلایان زۆر ڕوون و ئاشکرا نەبوو، چونکە عێراق لەوانەوە دوور بوو مەداریکەکانی ئەو تەریقەیە شاراوەبوون لەو سەرچاوەیەی کەلێیانەوە وەریانگرتبوو زانیاریەکی کەمیان هەبوو وەئەو قەومە ئەهلی ئیجتیهاد بوون هەرچەندە تەریقەیەکی تایبەت بوو باوەڕیان بەتەقلیدکردن لەوانەوە نەبوو بەڕەوایان نەدەزانی کەبەتەریقەیەك حیسابی بکەن. هەربۆیە دەبینین

---

[١٦٤] ئیبن ماجشوون لەمەدینە لەدایك بووە فیقهی لەمالیکەوە وەرگرتووە و لەساڵی ٢١٣ ك کەبەرابەرە لەگەڵ ٨٢٨ – ٨٢٩ ز کۆچی دوایی کردووە.

[١٦٥] ئەبو عبداللەی ئصبغ ئیبن الفرەج لەمیسر لەدایك بووە و فەقیهی مالیکی بووە و لەلای قوتابیانی ئیمام مالیك فێری فیقە بووە و لەساڵی ٢٢٥ ك ٧٤٠ ز دا مردووە.

کەخەڵکی مەغریب و ئەندەلوس ناچن بەلای بۆچوونی عێراقیەکاندا، لەوشتانەی کە ڕیوایەتێك لەئیمام یان یەکێك لەهاوەڵانیەوە لەبارەیەوە نەدۆزنەوە. لەپاش ماوەیەك تەریقەکان تێکەڵ بەیەکتری بوون و ئەبوبەکری تەرتوشی لەسەدەی شەشەمدا لەئەندەلوسەوە سەفەریکرد چوویە بیت المقدسەوە لەوێدا نیشتەجێ بوو خەڵکی میسرو ئەسکەندەریە لەوەوە فیقهی مالیکیان وەرگرت و تەریقەی ئەندەلوسیان لەگەڵ تەریقەی میسری خۆیاندا تێکەڵکردوو لەهاوەڵانی تەرتوشیش فەقیهی سەنەد صاحب التراز و هاوەڵانی بوون کۆمەڵێك فیقهی مالیکیان لێوە فێربوون، وەك خاندانی عەوف و هاوەڵانیان وەئەبو عەمرو ئیبن حاجیب و لەپاش ئەویش شەهاب الدینی قەڕافی فیقهیان لەخاندانی عەوفەوە وەرگرتووەو ئەم تەریقەیە چوویە ئەو شارانەوە، وەفیقهی شافیعیش لەمیسردا و لەسەرەتای دەوڵەتی عبیدیەکانەوە کەلەخاندانی پێغەمبەر بوون لەناو چوون‌و لەپاش عبیدیەکانیش لەنێو فەقیهەکاندا یەکێك لەو کەسانەی کەدەرکەوتن و فیقهی شافیعیان سەرلەنوێ بنیاتنایەوە، ڕافیعی فەقیهی خۆراسان بوو لەشامیش محی الدینی نەوەوی لەم گرووپە دەرکەوت.

لەپاشان تەریقەی مەغریبیەکان کەپشتی بەفیقهی مالیکی بەستبوو لەگەڵ تەریقەی عێراقیەکاندا لەسەردەمی شرمساحیدا تێکەڵ بەیەکتری بوون و ئەو لەئەسکەندەریە نیشتەجێ بوو تەریقەی تایبەتی مەغریبی میسری هەردووکیانی دەزانی. دواتر مستنصەری عباسی باوکی مستعصەم کوڕی الزاهیر مەدرەسەی مستەنصریەی لەبەغداد دامەزراند داوای لەخەلیفەی عەباسیەکان کەلەو سەردەمەدا لەقاهیرە خەلافەتیان دەکرد کەشرمساحی بنێرنە بەغداد، ئەوانیش ڕێگەیان پێدا و هەرکە شرمساحی چوویە بەغدادەوە کاروباری وانەووتنەوە(تدریس) یان پێ سپارد و لەوێ نیشتەجێ بوو تاوەکو ئەو سەردەمەی کەهۆلاکۆ لەساڵی ٧٥٦ دەستیگرت بەسەر بەغدادا و توانی لەشەپۆلەکانی ئەو شەڕە ڕزگاری ببێت و کاتێك بۆ خۆی بەدەست بهێنێت و لەوێدا بژی تائەوەی کەلەسەردەمی کوڕەکەی هۆلاکۆ ئەحمەد ئبغا کۆچی دوایکرد و هەروەك گوتمان

تەریقەتی میسریەکانی لەگەڵ تەریقەتی مەغریبیەکاندا تێکەڵکرد و لەمختصری ئەبوعەمری کوڕی حاجیبدا کورتی کردنەوە، بەجۆرێك باسی مەسەلە فیقهیەکانی هەربابێك لەناو مەسەلە جیاوازەکاندا کردوو قەولە جۆراو جۆرەکانی لەهەرمەسەلەیەکدا بەپێی ژمارەیان باسیکردوون و لەئەنجامدا مختصری ناوبراو بوویە بەرنامەیەك بۆمەزهەب هەرکە لەکۆتایی سەدەی حەوتەمدا لەمەغریب بڵاو بوویەوە، زۆرێك لەقوتابیانی ئەوسەرزەمینە ڕوویانتێکرد بەتایبەت خەڵکی بجایە. چونکە سەرۆکی مەشایخەکانی بجایە ئەبو علی ناصرالدینی زواوی کەسێکە کەئەوکتێبەی هێناوەتە مەغریبەوە چونکە ئەو لەمیسردا کتێبەکەی بۆ دانەرەکان خوێندبوویەوە و ئەو کورتەی ئەویان کۆپی کردبوو دواتریش هێنایە بجایە و لەوێدا لەنێو قوتابیەکانیدا بڵاو بوویەوە و بەهۆی قوتابیەکانیشیوە بەشارەکانی تردا بڵاوەی کرد و. تاوەکو ئەم ڕۆژگارەش لەنێوان قوتابیانی فیقهدا دەخوێنرێت، چونکە شیخ ناصرالدین هەڵبژاردبوو قوتابیانیشی هاندەدا بۆ خوێندنی.

وەکۆمەڵێك لەشیخەکانی ئەمان وەك ئیبن عبدالسلام وئیبن ڕووشد و ئیبن هاروون شەرحیانکردووە و هەموویان لەگەورە زانایانی تونسن یەکەمینیان کەباشترین شەرحی نوسیوە ئیبن عبدالسلامە و ئەوان لەهەمو وانەکانیاندا کتێبی تەهزیب دەخوێنن. خوداش هەرکەسێك کەبیەوێت ڕێنمایی دەکات[١٦٦].

---

[١٦٦] (وَاللهُ يَهدِي مَن يَشاء) س البقرة تا ١٣٦.

# بەشی هەشتەم

## لەبارەی زانستی فەرائیزەوە ( دابەشکردنی میراس )

کەبریتیە لەناسینی بەشە شەرعیەکانی ویراسەت و دروستکردنی بەشەکانی میراس لەو چەندیەتیەی کەبەئیعتیباری بەشە شەرعیەکان یان هەڵوەشاندنەوەی (مناسخات) بنەماو ئوصوڵەکانی ئیرس دروست دەبێت. وەموناسەخاتیش کاتێکە کەبەرلەدابەشکردنی میراسەکە یەکێك لەمیراسبەرەکان بمرێت ئەوا دیسانەوە دەبێت دابەشکردنی پێشووی ئەو میراسە هەڵوەشێتەوە و سەرلەنوێ دابەشبکرێتەوە. لەم کاتەشدا بەناچاریەوە دەبێت لەرێگەی حیسابەکانەوە میراسی یەکەم دروستبکەین تاوەکو هەموو واریسەکان لەهەردوو میراسەکەدا بەبێ جیاکاری بەشی شەرعی خۆیانیان پێ بدرێت. هەندێك جاریش ئەم موناسەخاتە زیاترە لەیەکو دوان و لەئەنجامدا ژمارەگەلێکی جۆراو جۆر پێك دێن و هەرئەندازەیەك کەموناسەخات جۆراو جۆربێت ئەوا پێویستمان بەحیسابێکی زیاتر دەبێت. هەروەها هەرکات میراس خاوەنی دووشێوە بێت وەك ئەوەی کەهەندێك لەمیراسبەرەکان وەراسەتی کەسێك بەڕاست دەزانن و هەندێکیش بەپێچەوانەوە. لەم کاتەدا دەبێت بەپێی هەردوو شێوازەکە تصحیح بکرێت و مەبلەغ و ئەندازەی بەشەکان (سهام) لەبەرچاو بگیرێت، لەپاشان میراسەکە (ترکە) بەپێی نیسبەتی بەشی میراسبەرەکان لەئەصڵی میراسەکە دابەشبکرێت و هەموو ئەمانە پێویستیان بەحیسابات هەیە، هەربۆیەئەم بەشەی فیقھ بەجیا باسدەکرێت چونکە هەردوو مەسەلەی فیقهو

حیسابیشی تێدا باسکراوە. کەتێیدا مەسەلە حیسابیەکان زاڵترو زۆرترن و کردویانە بەهونەرێکی سەربەخۆو خەڵکی لەم هونەرەدا کتێبگەلێکی زۆریان نوسیوە کەبەنابانگترینیان لەمەزهەبی پاشینانی مالیکیەکانی ئەندەلوسدا کتێبەکەی ئیبن سابیتو مختصری قازی ئەبو القاسم و حوفی و دواتریش مختصری جعدیە و لەپاشینانی ئەفریقاش کتێبەکەی ئیبن المنمری تەرابلسی نمونەی ئەمانە بەرچاو دەکەون. بەڵام شافیعی و حەنەفی و حەنبەلیەکان لەمبارەیەوە دانراوانێکی فراوان و بەرهەمگەلێکی قورس و ئاڵۆزیان هەیە کەگەواهیدەری ژیری و زیرەکیانە لەفیقهو حیسابدا بەتایبەت ئەبو المعالی (امام الحرمین) (رح) و نمونەی ئەو لەئەهلی مەزهەبە ناوبراوەکان خاوەن دانراوو کتێبگەلێکی بەنرخ و گرانبەهان.

بابەتی فەرائیزیش هونەرێکی شەریفە، چونکە کۆکەرەوە (جامع) ی نێوان نەقڵکراوو ئەقڵیە (منقول و منقول) لەمەسەلە ویراسیەکاندا کاتێك بەهرەی وەرەسە نادیارە و کارەکە لەسەر دابەشکاران قورس دەبێت بەهۆی ئەم هونەروە لەڕێگە ڕاستەکانەوە هەندێك لەتاکەکان مافی خۆیان بەدەستدەهێنن. وەزاناکان لەشارەگەورەکاندا گرنگیەکی تایبەتی پێدەدەن. هەندێك لەنوسەر و دانەران ڕووی تێدەکەن و زیاد لەپێویست لەمبارەوە لەحیساب وورد ببنەوە مەسەلەی گریمانی باسبکەن لەڕێگەی هونەرەکانی حیسابەوە وەك: جەبر موقابەلە و گرتنی ڕەگەکان و نمونەی ئەمانە کەپێویستیان بە دەرهێنانی نادیارەکان ببێت، هەروەك چۆن دانراوەکانیان پڕدەکەن لەم جۆرە نمونانە. ئەم جۆرە مەسەلانەش بەهۆی نامۆیی و کەمی ڕوودانیانەوە،هەرچەندە لەنێو خەڵکیشدا باونین و سودێکیان بۆ مەسەلەمیراسیەکان نیە، بەڵام بۆ خۆڕاهێنانی قوتابیانی زانست و بەدەستهێنانی مەلەکە بەشێوەیەکی بەردەوام بەتەواوی بەسودە، هەندێکجاریش زۆربەی خاوەنانی ئەم هونەرە بۆ باسی گەورەیی ئەم زانستە حەدیسەکەی ئەبی هریرە دەهێننەوە کەگوتوویەتی: (فەرائیز سێ یەکی زانستە یەکەمین شتێکیش کەلەبیر دەچێتەوە فەرائیزە)، وەلەڕیوایەتێکیشدا بە (نیوەی زانست) هاتووە ئەم فەرموودەیە

ئەبو نعیمی حافیز[١٦٧] تەخریجی کردووە خاوەنانی فەرائیز بەڵگەیان پێهێناوەتەوە و گوتوویانە مەبەست لەفەرائیز لەحەدیسەکەدا بەشەکان و ویراسەتە، ئەوەشی ئاشکراو دیارە ئاماژەیە بەدووری ئەم مانایە بۆ ئەو حەدیسە، بەڵکو مەبەست لەفەرائیز لەحەدیسی ناوبراودا واجبات و تەکالیفە ئاینیەکانە لەپەرستش و نەریت و میراس و نمونەی ئەمانە بەم مانایە ڕاستە کەبڵێین نیوە یان سێ یەکی زانستە، بەڵام فروزەکان[١٦٨] بەنیسبەت هەموو زانستەکانەوە کەمترە لەنیوە یان یەك لەسەر سێ ئەوەشی کەیارمەتیدەری ئەم مانایە ئەوەیە کەلەفزی فەرائیز بۆ ئەم هونەرە تایبەتە یان تایبەتکردنی بەفروزەکانی ویراسەتەوە بێگومان زاراوەیەکە کەفەقیهەکان لەکاتی دەرکەوتنی هونەری زاراوەکاندا بەکاریان هێناوە و، لەسەرەتای ئیسلامدا تەنها بەفەرائیزەکان بەگشتی و تەکالیفەکان گوتراوە و وەرگیراوە لەفەرزێکەوە کەلەزمانەوانیدا بەمانای تەقدیر یان بڕینەوەیە هەروەك باسمانکرد، کاتێك بەشێوەیەکی ڕەها بەکاریان هێناوە تەنها مەبەست فروزو واجیبەکان بووە، ئەمەش حەقیقەتە شەرعیەکەیەتی. ئەی کەواتە واباشتر نیە ووشەی نابراو بێجگە بەوەی کەلەوسەردەمەدا گوتراوە بەهیچ شتێکی تر مانا نەکرێت و ئەو مانایە شیاوترینە بەمەبەستەکەی ئەمان، خودای تەعالاش داناترە.

---

[١٦٧] ئەحمەدی ئەصفەهانی صوفی لەساڵی ٣٣٦ ك (٩٤٧ ٩٤٨) ز دا لەدایکم بووە، ئەم زاتە حاشیە و تەعلیقاتی لەسەر صەحیحی بوخاری و موسلیم نوسیوە و دووکتێبی تری لەبارەی هاوەڵانی پێغەمبەر و پیاوانی ئەصفەهانەوە هەیە. لەمحرمی ساڵی ٤٠٣ ك (زوئیە یان ئوتی ١٠١٢) ز مردووە، کەیەکێك بووە لەموحەدیسانی گەورەی سەردەمی خۆی.

[١٦٨] فەرزەکانی (بەشەکانی) میراس شەش فەرزن، نیوە، یەك لەسەر چوار، یەك لەسەر سێ، دوولەسەر سێ، یەك لەسەر شەش، یەك لەسەر هەشت.

# بەشی نۆیەم

## لەبارەی ئوصولی فیقهو ئەوەی کە پەیوەستە پێیەوە
## وەك جەدەل و خلافیات ( مناظرات )

دەبێت بزانین کەئوصولی فیقە، لەگەورەترینی زانستە شەرعیەکان، بەرێزترین و بەسودترینیانە کەبریتیەلەبیرکردنەوە و، لێکۆڵینەوە لەبەڵگە شەرعیەکان لەو ڕوانگەوەی کە ئەحکام و تەکالیفەکان لەوانەوە وەردەگیرێت. وەئوصولی بەلگە (ادلە) ی شەرعی بریتیە لەکتێبێك کەقورئانەو دواتریش سوننەت، کەڕوونکەرەوە و موبەینی قورئانە. چونکە لەسەردەمی پێغەمبەردا (ص) ئەحکامەکانیان لەئایتگەلێکی قورئانەوە وەردەگرت کەوەحی و نازڵ دەبووە سەرپێغەمبەر و بەکردارو گوفتار و بەخیتابێکی زارەکی ئاشکرایان دەکرد و هیچ نیازێك بەنەزەر و نەقڵ و قیاس نەبوو، بەلاّم لەدوای پێغەمبەر(ص) خیتابی زارەکی ئیمکانی نەبوو، قورئانیش بەتەواتور بەپارێزراوی مایەوە. وەهەروەها سوننەت لەم ڕووەوە لەبەڵگەشەرعیەکانە (ادلەالشرعیە) کەصەحابە (ر ن) گوتوویانە واجبە کار بەوەبکرێت کەلەگوفتار و کرداری پێغەمبەرەوە کەبەئێمەگەشتووەو ئیجماعیشیان کردووە لەسەر ئەمە، بەو مەرجە بەپێی نەقڵ و ڕیوایەتێکی ڕاست بێت کەصیدقەکەی زاڵبێت بەسەر زەننەکەیدا دەلالەتی شەرع لەکیتاب و سوننەتدا بەم ئیعتیبارە دیاری کراوە. لەپاشان ئیجماع دەبێتە جێگرەوەی ئەو دوانەو بەهۆی ئیجماعی صەحابە(ر ن) بەئینکاری لەبارەی دژەکانیانەوە، ئەم شتەش بێجگە لەرێگەی بونی موستەنەد و بەلگەیەکەوە ڕونادات چونکە نمونەی ئەمان بەبێ بەلگەیەکی سابیت و

نەگۆڕ نابنە هاوڕای یەکتری و بەگەواهی دانی بەڵگەکان (ادلە) لەسەر عیصمەت و دووری جەماعەتەوە لەتاوان و درۆ. کەواتە ئیجماع لەشەرعیاتەکاندا بەبەڵگەیەکی نەگۆڕ دادەنرێت. لەپاشان لەڕێگەی بەڵگەهێنانەوە (استدلات) ی صەحابە و سەلەفەوە سەیری کیتاب و سوننەتمانکرد و دەرکەوت کەئەوان لێکچووەکانی (اشباە) ی ئەوانیان لەگەڵ لێکچو ئەشباهی ئەواندا پێوانە دەکرد و، هاوشێوەی ئەوانیان لەگەڵ هاوشێوەکاندا بەرابەر دەکرد و ئەمەش بەئیجماعی ئەوان تەسلیمبوونی یەکێکیان بەیەکێکی تر بووە لەم بارەیەوە، چونکە زۆرێك لەڕووداوەکانی پاش پێغەمبەر (ص) لەڕیزی دەقە(نصوص) نەگۆڕەکاندا نەبووە ئەوان ئەم جۆرە واقیعە و ڕووداوانەیان لەگەڵ ئەو دەقانەی کەنەگۆڕن قیاسیانکردووە و، بەو مەرجانەی کەلەنێوان هەردوو مەسەلەکەدا بوونیان هەیەلەنێوان هەردووشتەلێکچووەکەدا و وەك یەکن و ئەوەی کەلەبارەیەوە دەق نەهاتووە قیاسیان دەکردە سەرئەوەی کەلەبارەیەوە دەق هاتووە بەمەرجی بوونی علەت و هۆکاری ئەصڵەکە لەفەرعەکەدا، ئەم شێوەیە بەئیجماعی صەحابە یەکێکە لەبەڵگە شەرعیەکان و کەقیاس یان چوارەمین بەڵگەی (ادلە) شەرعیە.

وەهەڵکەوتوانی زانایان هاوڕان لەسەر ئەوەی کەبنەماو ئوصوڵی بەڵگە شەرعیەکان بریتین لە و چواربەڵگە شەرعیەی کەباسکران (کتاب، سنت، اجماع، قیاس) هەرچەندە هەندێکیان لەئیجماع و قیاسدا دژایەتیانکردووە، بەڵام ئەم جۆرە کەسانە کەمن و زۆربەکەمی دەبینرێن و هەندێکیشیان بەڵگەیەکی تریان بۆ ئەم چوار بەڵگەیە زیاد کردووە کەلێرەدا پێویست ناکات باسیان بکەین، چونکە بەڵگە ناوبراوەکان لەڕووی مەدرەکەکانەوە زەعیفن و لەقەولە شازەکان دەژمێردرێن. هەربۆیە لەیەکەمین بابەتەکانی هونەری ئوصوڵی فیقە بریتیەلەتێڕوانین و لێکۆڵینەوە لەبەڵگەبوونی ئەمانەیە. بەڵام (کتاب) بەڵگەکەی ئەو موعجیزە قاتیع و بەبڕشتەیە کەلەدەقەکەیدا بوونی هەیە و تەواتورلەنەقڵەکەیدا هەیە هەربۆیە بواری گومان(تردید) ی تێدا نامێنێتەوە. بەڵام (سنت)و ئەوەی کەلەوەوە بەئێمە گەیشتووە هەروەك باسمانکرد بریتیە لەئیجماع و

بەواجب بوونی کارکردن بەوەی کە لەو سوننەتە صەحیحە و ئەمەش بەپشت بەستن بەو لەکاتی ژیانی پێغەمبەردا (ص) کاری پێکراوە وەك: ناردنی نامەکان و نێردراوان بۆ ناوچەکان بۆ ئەحکام شەریعەتەکان کەهەڵگری فەرمانکردن و ڕیگری لێکردنن (امر و نهی) ین. وەهەروەها (اجماع) بەو هۆیەوەیە کەصەحابە (ر ن) هاوڕا بوون لەسەر ئینکاریکردنی دژایەتیان بەعیصمەتی سابیت بۆ ئوممەت.

وە (قیاس) یش بەوهۆیەوەیە کەصەحابە ئیجماعیان لەسەر کردووە، هەروەك باسمانکرد. ئەمانەن بنەمانی بەڵگە شەرعیەکان (اصول الادله الشرعیه). دواتریش دەبێت ئەوە بزانین کەئەوەی لەسوننەتەوە نەقلّ دەکرێت بەناچاری دەبێت حەدیسەکە تەصحیح بکرێت، بەجۆرێك کەڕێگەکانی نەقڵکردنی تەحقیق و موتالآ بکرێت و عەدالەتی نەقڵکارەکان لەبەرچاو بگیرێت تاوەکو ئەوحاڵەتەی کەزانست بەصیدق بەدی دەهێنێت و دەبێتە چاووگی واجب بوونی کردار بەحەدیسەو دەناسرێتەوە، ئەمەش بەیاسای ئەم هونەرەدەژمێردرێت. مەسەلەی دژایەتی نێوان دووحەدیس و گەڕان بەشوێن حەدیسی لەپێشتردا و ناسینی ناسیخ و مەنسوخ پەیوەست دەبێت بەم یاسایانەوە مەسەلە ناوبراوەکان لەبەش و بابەکانی فیقه دەژمێردرێن. لەوە بەدوا دەگەینە دەلالەتی لەفزەکان کەتێڕوانین و تەحقیق تێیاندا پێویستە.

چونکە سودی ماناکان لەسەر پێکهاتەکانی قسەبەشێوەیەکی ڕەها لەسەر ناسینی دەلالەتەدانراوەکان (وضعی) یە، ئیتر تاك بێت یان تێکەڵ و پێکهاتە. وەیاساکانی پەیوەست بەزمان بریتین لە: زانستی نحو (زمانی عرەبی) تەصریف و بیان. وەکاتێك کەزمان بۆ گۆیاکانی مەلەکەیەك زیاتر نەبووایە بەبەشێك لەزانست و یاساکان نەدەژمێردرا فیقهیش لەو سەردەمەدا پێویستی بەوان نەبوو، چونکە زمان بۆ خەڵکی بوبوە شتێکی سروشتی و بوبوە مەلەکە تێیاندا، بەڵآم کاتێك کەمەلەکەی زمانی عەرەبی لەنێو خەڵکیدا لەناوچوو ئەوکات ڕەخنەگران (کهبدان) کەبۆ ڕێکخستنی ئەم هونەرە پشتوێنی هیممەتیان لێ بەستبوو، بنەماکانی زمانیان بەگێڕانەوەی صەحیح و ئەو پێوەرانەی

کەبەڕاستی ئەوانیان دەرهێنابوو زەبتیان کرد و کۆیانکردەوە. وەیاسا ناوبراوەکان لەڕیزی زانستەکاندا هەژمار کران کەفەقیە بۆ ناسینی ئەحکامەکانی خودای گەورە پێویستی پێیانە. سەرەڕای ئەمەش لێرەدا سودێکی تری هەیە بەتایبەت لەپێکهاتەکانی قسەدا ئەوەش بریتیە لەسودی ئەحکامەکان لەملاو لای ماناکانەوە بەهۆی بەڵگەتایبەتەکانی ئەوانەوە کەلەنێوان تەرکیبەکانی قورئان و سوننەتدایە کەبریتیە لەفیقهو تێیدا دەلالەتە وەزعیەکان بەڕەهایی بەس نین، بەڵکە بەناچاری دەبێت چەندین شتی تر بناسن کەئەم بەڵگە تایبەتانەیان لەسەر وەستاوە و بەهۆیانەوە بەپێی ئەوەی کە ئەهلی شەرع و ڕەخنەگرانی ئەم زانستە باوەڕیان بەئەصاڵەتیان هێناوە ئەحکامەکان سودیان لێ وەردەگیرێت و ئەوان بۆ ئەم سودی یاسایانە دانراون. وەك ئەوەی کە زمانەوانی قیاسی ناسەلمێنێت و لەووشە هابەشەکە ناتوانرێت هەردوو ماناکەی بەیەکەوە بهێنین.

وەپیتی (واو) تەرتیبەکە ناگەیەنێت وەهەرکات کەسانێکی تایبەت لەعام دەربچن ئایا لەباقی تاکەکانی تریدا ئیتمام حوجەتێك دەمێنێتەوە ؟ وەئایا ئەمرەکە بۆ واجب یان موستەحەب و بۆ خێرایی یان دواکەوتنە؟ نەهیش موقتەزای فەسادە یان صیحەت ؟ وە ئایا دەتوانین موتڵەق حەمل بکەینە سەر موقەیەد ؟ وەنەص لەسەرعیللەت لەتەعەدوددا بەسەیان نا؟ وەنمونەی ئەمانە کەهەمووەمەسەلە ناوبراوەکان لەیاساکانی هونەری ئوصوڵی فیقە دەژمێردرێت، بەڵام لەبەر ئەوەی کەلەبابەتەکانی دەلالەت بوون بەلوغەویان دەزانین. دواتر یش دەبێت ئەوە بزانین کەباس و بیرکردنەوە لەقیاس لەگرنگترین یاساکانی ئەم هونەرەیە، چونکە بەهۆی پێوانەکردن و چوواندنی ئەحکامەکانەوە لەگەڵ یەکتریدا ئەم دەرئەنجامانەی خوارەوە بەدەست دێن:

١ – تەحقیقی ئەصڵ و فەرع لەهەرحوکمێکدا کەقیاس دەکرێت و دەچوێنرێت.

٢ – تەنقیحی وەصفێك کەبەزەننی بەهێزی حوکم لەنێو وەصفەکانی ئەودا لە ئەصڵەکەدا.

٣ – بوونی ئەو وەصفە لەفەرعەکەدا بەبێ ئەوەی کەدژێك ڕێگری لەتەرتیبی حوکمەکەی بکات.

وەمەسەلەکانی تر کەشوێنکەوتەی ئەم بابەتەن هەموویان لەیاساکانی ئەم هونەرە دەژمێردرێن. وەدەبێت ئەوەبزانین کەئوصولی فیقھ لەهونەرە داهێنراوەکانی نەتەوەی ئیسلامە و سەلەف پێویستیان پێی نەبووە، چونکە لەسود وەرگرتن لەمانای لەفزەکان زیاتر لەمەلەکەی زمان کەلەواندا هەبوو پێویستیان نەبوو، سەرەڕای ئەمەش زۆربەی ئەو یاسایانەی کەبەتایبەت لەسود وەرگرتنی ئەحکامەکاندا پێویست دەبن لەخودی ئەمانەوە وەرگیراوە. وەلەبارەی زنجیرەی حەدیسەکانیشەوە سەلەف پێویستیان بەموتالا و تەحقیق نەبووە بەهۆی نزیکی سەردەم و مومارەسەی نەقڵکارانی حەدیس و زانستی ئەمان بەوان، بەڵام لەپاش ئەوەی سەلەف و چینی سەرەتای ئیسلام لەژیاندا نەمان هەروەك چۆن پێشتر باسمانکرد هەموو زانستەکان لایەنی پیشەسازیان لەخۆگرتووە فەقیهو موجتەهیدەکان بۆ دەرهێنانی ئەحکامی ئەدیللە یەکسەر دەستیانکردە فێربوونی ئەم یاساو ڕێسایانە، هەربۆیە یاسا ناوبراوەکان وەك هونەرێکی جیاواز و سەربەخۆ نوسرانەوە و ناونران (ئوصولی فیقھ).

یەکەمین کەسیش کەئەم ئوصولی فیقهەی نوسی ئیمامی شافیعی بوو کەڕیسالە بەناوبانگەکەی بۆ قوتابیانی خوێندوەتەوە و لەو ڕیسالەیەدا لەبارەی ئەوامیر و نەواهی و باسکردنی حەدیس و ناسیخ و مەنسوخ و حوکم و عیللەتی و مەنصوص (ئەوەی کەلەبارەیەوە دەق هاتووە) و، لەقیاس باسی کردووە. لەپاشان فەقیهەکانی حەنەفی لەمبارەیەوە دەستیاندایە نوسین و لەیاسانا وبراوەکاندا تەحقیق و بەدوادا چوونیانکرد و فراوانیانکردن و موتەکەلیمەکانیش بەهەمان شێوە کتێبگەلێکیان لەم هونەرەدا دانا. بەڵام نوسراوی فەقیهەکان لەم هونەرەدا وابەستەترە بەفیقهەوەو لەفەرعەکاندا شیاوترە چونکە نمونە و شاهید (بەڵگە)ی زۆرێك لەفەرعە باسکراوەکانیان لەفیقهەوە دەرهێناوە و بناغەی ئەم مەسەلانەیان لەبارەی ئەم هونەرەوە لەسەر خاڵەفیقهیەکان دامەزراندووە.

موتەکەلیمەکان شێوەکانی ئەم مەسەلانەیان لەفیقە جیاکردووەتەوە بەپێی توانا ڕوویانکردووتە بەڵگە هێنانەوەی ئەقڵی چونکە قاڵبی هونەرەکان و خواستی تەریقەکەیان لەسەر ئەو دامەزراوە. ئەمەیە کەفەقیهانی حەنەفی بەو هۆیەوە کەلەخاڵە ووردە فیقهیەکاندا وورد بین بوون و تائەو جێگەیەی کەبۆیانکرابێت ئەم یاسایانەیان لەمەسەلە فیقهیەکان کۆ دەکردەوە و دەریان دەهێنا، لەئوصوڵی فیقهدا لێزان و تەڕدەست بوون. ئەبو زەیدی بوسی[١٦٩] کەیەکێك بوو لەپێشەوایانی ئەمان دەرکەوت و لەبارەی قیاسەوە بەئەندازەیەکی فراوانتر لەهەموو زانایانی ئەمان کتێبی نوسی و ئەو باس و بابەت و مەرجانەی کەلەقیاسدا پێویست بوون کامڵی کردن و، هونەری ئوصوڵی فیقە بەکامڵبوونی قیاس بەتەواوەتی کامڵبوو مەسەلەکانی تەهزیب و قەواعیدەکانی کۆکرانەوە و ئامادەکران و زاناکانیش بەشێوازی موتەکەلیمەکان گرنگیان بەم هونەرە داو باشترین دانراوی ئەمان لەبارەی قیاسەوە بریتیە لە(کتاب البرهان) کەدانراوی ئیمام الحرمین و (المستصفی) کەدانراوی غەزالی و دووکەس لەئەشعەریەکانە و، هەروەها (کتاب العمد) بەزەممەی عەینەکە کەدانراوی عبدالجبار[١٧٠] و شەرحی (المعتمد) دانراوی ئەبوالحسین[١٧١]ی بەصری و دووکەس لەموعتەزیلە بوون.

ئەم چوار کتێبە بەیاسابنەڕەتیەکانی ئەم هونەرە دەژمێردران. دواتریش دووکەس لەگەورە بەڕێزەکانی پاشینانی عیلمی کەلام، ئەم چوار کتێبەیان کورتکردەوە

---

[١٦٩] ئەبوزەید عبداللەی عەمر لەبنەڕەتدا لەخەڵکی بوسیە کەشارێکە لەنێوان بوخاراو سەمەرقەندا یەکەمین کەسێکە کە بەجیاوازیەکانی مونازەرە و جەدەل شێوەیەکی زانستی بەخشی و چەندین کتێبی لەبارەی فیقە و حیکمەتی ئیلاهیە وە داناوە و لەساڵی ٤٣٠ ك (١٠٣٩ –١٠٣٨) ز لەبوخارا کۆچی دوایی کردووە. (حاشیەی دسلان)

[١٧٠] قازی عبدالجباری کوڕی ئەحمەدی کوڕی عبدالجباری هەمەدانی لەئەسەدئابادی هەمەداندا لەدایك بووە و خاوەنی چەندین کتێبە لەزانستی فیقهدا و نوسینی کتێبێکیشی لەبارەی تەرجەمەی زانایانی موعتەزیلەوە دەدەنە پاڵ. ئەم زاتە لەساڵی ٤١٥ ك (١٠٢٥ – ١٠٢٤) ز مردووە (حاشیەی دسلان).

[١٧١] بریتیە لەخەلیفە ئەبوالحسینی محمدی کوڕی علی بەصریە کەلەساڵی ٤٦٣ ك (١٠٧١ – ١٠٧٠) ز مردووە.

کەیەکێکیان ئیمام فخرالدینی کوڕی خەتیب بوو (فخری ڕازی) کەلەکتێبی (المحصول) دا کورتیانکردەوە، ئەویتریشیان سیف الدینی ئامێدی بوو کەکتێبە ناوبراوەکانی لەدانراوەکەیدا بەناوی (الاحكام) کورتکردەوە و شێوازی ئەمان لەم هونەرەدا لەڕووی تەحقیق و بەڵگە هێنانەوەلەیەکتری جیاواز بوون، چونکە ئیبن الختیب زیاتر بەهێنانەوە بەڵگەی فراوان کاریکردووە ئامێدیش زیاتر سەرقاڵی تەحقیق و دابەشکردن(تقسیم) و دەرهێنان (استخراج) ی مەسەلەکان بووە.

کتێبی (المحصول) کەقوتابیەکانی ئیمام (ئیبن الختیب) وەك سراج الدینی ارموی[۱۷۲] لەکتێبێکی تردا بەناوی (الحاصل) کورتیانکردووە تەوە شەهاب الدینی قەرافی[۱۷۳] لەم دوو کورتکراوەیە پێشەکی و یاساگەلێکی گوڵبژێرکرد و کتێبێکی بچووکی بەناوی (تنقیحات) ئامادەکرد و، هەروەها بەیزاوی کورتەیەکی لەهەردوو کتێبی ناوبراو بەناوی (منهاج) داناو قوتابیەسەرەتاییەکان ڕوویانکردە ئەم دوو کتێبە زۆرێك لەخەڵکی شەرحیانکردن، بەلاّم کتێبی (احكام) ی ئامێدی کەدانەرەکەی زیاتر سەرقاڵی تەحقیق بووە لەمەسەلەکاندا، ئەبو عەمری کوڕی حاجب لەکتێبە ناسراوەکەیدا بەناوی (مختصرکبیر) کورتی کردووەتەوەو دجیسانەوە هەمان کتێبی لەکتێبێکی تردا کورتکردەوە و لەنێو قوتابیانی وانستدا بلاّوبوویەوە بوویە جێی گرنگی خەڵکی خۆرهەلاّتو خۆرئاوا و گروپێکی زۆر دەستیانکردە موتالاّکردن و شەرحکردنی، کورتەی تەریقەی موتەکەلیمەکان لەهونەری ئوصوڵی فیقهدا لەم چەند کورتکراوەیەدا بەدەستهات، بەلاّم لەبارەی تەریقەی حەنەفیەکانەوە کتێبگەلێکی زۆر نوسراون باشترین

---

[۱۷۲] قازی سراج الدین ئەبو سەنا محمودی کوڕی ئەبوبکری ئەرمەوی کەنیسبەتە بۆلای ئورومیەلەساڵی ٦٨٢ ك (١٢٨٤ – ١٢٨٣) ز مردووە.

[۱۷۳] شەهاب الدین ئەبوالعباس ئەحمەدی کوڕی ئیدریسی قەڕافی فەقیهی مالیکی لەساڵی ٦٨٤ ك (١٢٨٦ – ١٢٨٥) ز مردووە.

کتێبی پێشینان لەم جۆرە دانراوانەدا ئەبو زەیدی دەبوسی و سیف الاسلام پزودی[١٧٤] یە کەلەپێشەواکانیان بووە و کتێب گەلێکی گشتگیر و جامیعی نوسیوە. دواتر ئیبن الساعاتی دەرکەوت کەلەفەقیهانی حەنەفی بووە و لەنێو کتێبی (احکام) و کتێبەکەی پزودیدا شێوازێکی داهێنا کەکۆکەرەوەی هەردوو تەریقەکە بوو کتێبێکی لەم بارەیەوە بەناوی (بدیعە) وە داناو، کەلەڕووی تەرتیبەوە بەباشترین و بەدیعترین کتێبەکان دەژمێردرێت کەتائەم سەردەمەش ئەو کتێبە لەنێو پێشەوایان و زنایاندا باوی هەیە و دەیخوێننەوە و باس و تەحقیقی تێدا دەکەن و، زۆرێك لەزانایانی غەیرە عەرەب حەزیان لەشەرحکردنیەتی و، تاوەکو ئەم سەردەمە باروو دۆخ هەربەم جۆرە بوو. بەم شێوەیە حەقیقەتی هونەری ئوصولی فیقە و دیاریکردنی بابەتەکانی و دانراوە بەناوبانگەکانی تاوەکو ئەم سەردەمە. خوداش بەزانست بەهرەمەندمان بکات بەچاکە و بەخششی خۆی لەڕیزی ئەهلی چاکەدا دامانبنێت، چونکە ئەو بەتوانایە بەسەر هەموو شتێکدا.[١٧٥]

---

[١٧٤] ناوەکەی ئەبوالبشری علی کوڕی محمدی پزودیە کەڕیسالەگەلێکی لەفیقهی حەنەفیدا ئامادەکردووە و لەساڵی ٤٨٢ ك (١٠٩٠ – ١٠٨٠) ز مردووە. یەکێك لەدانراوەکانی بەناوی ئوصولەوەیە کەشەرحێکی زۆری لەسەر نوسراوە. دوونازناوی هەبووە فخر الاسلام و سیف الاسلام زۆر بەکەمی کەسێك خاوەنی ئەم لەقەب و نازناوانە بووە. (حاشیەی دسلان).

[١٧٥] (وَهُوَعَلى كُلِّ شَيءٍ قَدير) س الروم ئا ٤٩.

# جیاوازیەکان

## (خلافیات)

دەبێت ئەوەبزانین کەموجتەهیدەکان لەم زانستی فیقهەدا کەلەبەڵگە شەرعیەکانەوە دەرهێنراوە بەپێی جیاوازی فیکرو مەشاعیرەکان لەگەڵ یەکتریدا جیاوازبوون، هەروەك باسمانکرد ئەم جیاوازیەش خۆلادان لێی ئەستەم بووە. جیاوازیەکانی ئەمان لەنێو نەتەوەی ئیسلامدا فراوان بووە و موقەلیدان سەرپشت بوون لەهەر موجتەهیدێك کەبیانەوێت تەقلید بکەن. دواتر و کاتێگ مەسەلەی تەقلید گەیشتە هەرچوار فەقیهەکە[176] کەلەزاناکانی شارەگەورەکان بوون و خەڵکی ئەوپەڕی گومانی باشی پێیان هەبووە. ئەوکات تەنها سەرچاوەی تەقلید ئەوان بوون تەنها لەوان تەقلید دەکرا و لەغەیری ئەوان تەقلید نەدەکراو قەدەغەبوو چونکە گەشتن بەقۆناغی ئیجتیهاد کارێکی دژواربووە و بەتێپەڕبوونی کات ئەوزانستانەی کەلەمادەکانی ئەو دەژمێردران بوبون بەچەندین بەشەوە و کەسانێکیش نەبوون کەجگە لەم چوار مەزهەبە(شافیعی حەنەفی حەنبەلی مالیکی) لەمەزهەبێکی تردا تەحقیق بکات، هەربۆیە ئیجتیهاد لەناو چوو هەرچوار مەزهەبەکە بوونە بنەمای مەزهەبی ئیسلام و جیاوازی نێوان ئەوکەسانەی کە پەیڕەوی هەریەکە لەمەزهەبەناوبراوەکان بوون، پابەند بوون بەئەحکامەکانیانەوە بوویە جێگرەوەی جیاوازی لەدەقە شەرعی و ئوصولی فیقهدا هەریەکە لەتەصحیحی مەزهەبی

---

[176] واتە ئەبو حەنیفە کەلەساڵی ١٥٠ ك مردووە و ئیمام مالیك کەلەساڵی ١٧٩ ك دا مردووە و ئیمامی شافیعی کەلەساڵی ٢٠٤ ك دا کۆچی دوایی کردووە و ئیمام ئەحمەدی کوڕی حەنبەل کەلەساڵی ٢٤١ ك دا ماڵئاوایی لەدوونیا کردووە.

پێشەوای خۆیدا لەگەڵ ئەوەیتردا باس و موجادەلەی دەکرد و مونازەرەگەلێك لەنێوان پەیڕەوانی مەزهەبە ناوبراوەکاندا ڕوویدەدا کەلەسەر ئوصولی صەحیح و شێوازە پایەدارەکان دامەزرا بوو هەر لایەو بەپێی ئەو بنەمایانە کەباوەڕی بەڕاستیەتی مەزهەبێك هەبوو تەقلیدی لێدەکرد و بەڵگەی بۆ دەهێنایەوە، مونازەرە لەهەموو مەسەلە شەرعیەکانداو لەهەموو بابەکانی فیقهدا بەردام هەبوو هەربۆیە جارێکیان جیاوازی و موجادەلە لەنێوان پەیڕەوانی مالیکی و شافیعیدا ڕوویداو، پەیڕەوانی ئەبو حەنیفە پشتگیری یەکێکیان دەکرد و دیاسانەوە موجادەلە لەنێوان حەنەفی و مالیکیەکاندا دروستدەبوو شافیعیەکان هاوڕادەبوون لەگەڵ یەکێکیانداو لەم مونازەرانەشدا سەرچاوەی پێشەوایان و شوێنی جیاوازیەکان و جێگەی ئیجتیهادەکانیان باسدەکرا و، بەم جۆرە زانستەشیان دەگوت جیاوازیەکان (خلافیات) مونازەرەکار ناچار بوو وەك موجتەهیدێك پابەندی ئەو یاساو ڕیسایانەبێت کەڕێنمایی دەکات بۆ دەرهێنانی ئەحکامەکان ئاشنا بێت.

بەم جیاوازیەی کەموجتەهید بۆ دەرهێنانی ئەحکامەکان پێویستی بەیاسا ناوبراوەکان هەیە و مونازەرەکار بەمەبەستی پاراستنی ئەم مەسەلە دەرهێنراوانە پێویستی بەویاسایانە هەبووە بۆ ئەوەی مەسەلە دەرهێنراوەکان لەدەستێوەردانی بەڵگە و دەلیلە دژەکان بپارێزێت. بەڕاستی ئەم شێوازە بۆ ناسینی سەرچاوە و بەڵگەی پێشەواکان ڕاهێنانی ئەو کەسانەی کەلەم مەبەستانەدا موتاڵادەکەن بێگومان بۆ بەڵگە هێنانەوە زانستێکی بەسود و بەنرخە. وەدانراوەکانی شافیعی و حەنەفیەکان لەم هونەرەدا لەدانراوەکانی مالیکیەکان زیاترە، چونکە هەروەك لەبەشەکانی پێشودا باسمانکرد و زانیمان کەقیاس لەلای حەنەفیەکان بۆ زۆرێك لەفەرعەکانی مەزهەبەکەیان بەیەکێك لەبنەماو ئوصوڵەکان دادەنرێت، هەربۆیە ئەم گروپە خاوەن بۆچوون و ئەهلی تەحقیق و بەحس کردنن، بەڵام مالیکیەکان زیاتر پشت بەبەڵگەی حەدیس دەبەستن و ئەهلی نەزەر نین و سەرەڕای ئەمەش زۆربەی پەیڕەوانی ئەو مەزهەبە لەخەڵکی مەغریبن

کەدەشتەکین‌و بێجگە لەهەندێك شوێنی کەمدا نەبێت لەهونەر و صنعەت بێئاگان.
ئەودانراوانەی کەلەم بەشەدا جێگەی گرنگین بریتین لە: کتێبی (مأخذ) ی دانراوی غەزالی‌و کتێبی (تلخیص) ی دانراوی ئەبوبەکری بن عەرەبی لەمالیکیەکان کەشێوازەکەی لەخەڵکە خۆرهەلأتەوە وەرگرتبوو، وەهەروەها کتێبی (تعلیقە) دانراوی ئەبوزەیدی بوسی و کتێبی (عیون الادلە) دانراوی ئیبن القصار کەلەگەورەکانی مەزهەبی مالیکی بووە. ئیبن الساعاتیش لەمختصرێکدا کەلەبارەی ئوصولی فیقهەوە دایناوە هەموو ئەو مەسەلانەی کەمونازەراتی فیقهی لەسەریان وەستاوە کۆکردووەتەوە و، لەهەرمەسەلەیەکیشدا هەموو ئەو بنەماو ئوصولانەی کەمونازەراتەکانی لەسەر وەستاوە باسکردووە.

## هونەری جەدەل (دەمەقالێ)

جەدەل بریتیە لەناسینی ئادابی مونازەرەیەك كەلەنێوان پەیڕەوانی مەزهەبە فیقهیەكان و بێجگە لەوانیشدا ڕوودەدات. ئەم هونەرە كاتێك بڵاو بوویەوە و كاری پێكرا كەبابی مونازەرە لەڕەتكردنەوە و قبوڵكردنی مەسەلەكاندا فراوان بوو هەریەكە لەمونازەرەكاران لەبەڵگەهێنانەوە و وەڵامدانەوەدا لەكاتی باس و شەڕەقسەكاندا بەشێوەیەكی ڕەها و توند قسەیاندەكرد و، هەندێك لەقسەكانیان ڕاست بوون و هەندێكیشیان هەڵەیان تێدەكەوت. هەربۆیە پێشەواو ئیمامەكان ناچار بوون ئاداب و ئەحكامگەلێك دابنێن بۆ ئەوەی مونازەرەكاران لەڕەتكردنەوە و قبوڵكردندا بەپێی ئەو یاسایانە قسەبكەن و لەسنوریان دەرنەچن و بارودۆخی بەڵگەهێنەرەوە و وەڵامدەرەوە ڕۆشن ببێتەوە كەبەچ شێوەیەك ڕەوایە واز لەبەڵگەهێنانەوە بهێنێت و لەچ شوێنێكدا ئیعتیراز و ڕەخنەی هەبێت و لەكوێدا دەبێت بێدەنگ بێت و، بەرامبەرەكەی قسەبكات و بەڵگەكانی باسبكات. هەربۆیە گوتوویانە: جەدەل بریتیە لەناسینی قەواعید و سنورو ئادابی بەڵگەهێنانەوەیە كەبەهۆیەوە مرۆڤ ڕینمایی دەكرێت بۆ پاراستنی بیروباوەڕ و بۆچوونی یان لەناوچوونی ئیتر ئەو بۆچوونە لەفیقهدا بێت یان لەزانستەكانی تردا. ئەم هونەرەش خاوەنی دووشێوازە: یەكێكیان شێوازی پزودی كەتایبەتە بەبەڵگە شەرعیەكانەوە وەك نەص و ئیجماع و بەڵگەهێنانەوە(استدلال) و دووەمیشیان شێوازی عەمیدیە[177]، ئەم شێوازە لەهەربەڵگەیەك كەپێی بهێنرێتەوە و لەهەرزانستێك بێت

---

[177] ركن الدين عميدی ئەبو حامیدی محمدی كوڕی محمد فەقیهی حەنەفی لەسەمەرقەندا لەدایك بووە و دانەری ڕیسالەیەكە بەناوبانگە لەجەدەلدا و لەساڵی ٦١٥ ك (١٢١٨ ز) مردووە.

گشتیەو زۆربەی بەڵگەهێنانەوەیە تەریقەی نابراو لەمەبەست و ئامانجە باشەکانە و هەڵەتێیدا لەنەفسدا زۆرە و ئەگەر لەڕووی مەنتیقیەوە سەیری بکەین زیاتر لەقیاسی هەڵەی سۆفستاییەکان دەکات، بەڵام لەهەمان کاتدا شێوەی بەڵگە و قیاسەکانی تێدا پارێزراوە بۆ ئەوەی کەبەشوێن شیاوی ڕێگەکانی بەڵگەهێنانەوەدا بگەڕێین. ئەم عەمیدیەش یەکەمین کەسێکە کە لەم شێوازەدا کتێبی نوسیوە هەربۆیە ئەم زانستە دراوەتە پاڵی ئەو کتێبە کورتەی کەئەو لەم بوارەدا نوسیویەتی و ناوی (ارشاد) دە. لەپاش ئەویش پاشینانێکی وەك نەسەفی[۱۷۸] و ئەوانیتریش پەیرەویان لێکردووە و شوێن شێوازەکەی کەوتوون و لەشێوازەکەیدا دانراوگەلێکی زۆر نوسراون، بەڵام تەریقەکەی لەم سەردەمەدا تەرککراوە، چونکە ئێستاکە زانست و فێربوون و پەروەردە لەشارە ئیسلامیەکاندا لەقۆناغی نوقسانیدایە. سەرەڕای ئەمەش شێوازی ناوبراو لایەنی هونەری هەیە و پەیوەستە بەقۆناغی کامڵبوونەوە و لەپێویستیەکان ناژمێردرێت. خوداش لەکارەکانیدا زاڵە.[۱۷۹]

---

[۱۷۸] حافیزەالدین ئەبوالبرکات عبداللەی کوڕی ئەحمەدی نەسەفی فەقیهی ناسراوی حەنەفی و خاوەنی دانراوگەلێك زۆرە و لەساڵی ۷۱۰ ك (۱۳۱۱ – ۱۳۱۰ ز) کۆچی دوایی کردووە.

[۱۷۹] (وَاللهُ غالِبٌ عَلى أمرِهِ).

# بەشی دەیەم

## زانســـــــتی کەلام

ئەوەش بریتیە لەوزانستەی کەسەلماندنی بیروباوەڕو عەقیدە ئاینیەکانی بەهۆی بەڵگە ئەقڵیەکان و ڕەتدانەوەی بیدعەچیەکان کەلەبیرو باوەڕ و عەقیدەی سەلەفی صاڵح و ئەهلی سوننەت لایانداوە لەخۆ دەگرێت. وەڕەمزی ئەم بیروباوەڕە ئیمانیانە تەوحیدە. هەربۆیە بەرلە دەستپێکردنی ئەصڵی بابەتەکە پێویستەلێرەدا خالێکی جوان لەگەڵ بەڵگە ئەقڵیەکان بهێنینەوە کەبەئاسانترینی شێوازەکان و نزیکترینی لێوەرگیراوەکان تەوحیدمان بۆ ئاشکرا دەکات و، دواتر دەست دەکەن بەباس و تەحقیق لەبارەی زانستی کەلام و ئەوبابەتانەی کەلەبەدیهێنانیاندا لەناو نەتەوەی ئیسلام و هۆکارەکانیدا. وەئەوخاڵەش ئەمەیەکە: هەموو حادیسەکان لەجیهانی هەستیدا ئیتر زات یان کردارە مرۆییەکان یان حەیوانی بەناچاری دەبێت خاوەن سەبەب و هۆکارگەلێکی پێشتربێت لەخۆیان کەبەهۆیانەوە لەجێگیری نەریتەکاندا بەدی بێن بوونی هەستی ئەوان بەوهۆیانەوە دەگاتە ئەنجام و، هەریەکە لەم سەبەبانە بەنۆرەی خۆیان دەبنە حادیس و بەناچاریەوە دەبێت هۆکار گەلێکی تریان هەبێت و ئەم سەبەبانەش بەردەوام گەشەدەکەن و تاوەکودەگەنەوەبە موسەببیب و بەدیهێنەریان کەخودای گەورەیە ئەم هۆکارانەش کاتێك گەشەدەکەن و بەردەوام لەدرێژی و پانیدا فراوان دەبن و دەبنە دووهێندە و ژیری لەژماردنیاندا سەرسام دەبێت، هەربۆیە هیچ شتێك بێجگە لەزانیتی موحیت (واتە زانستی خودا) ئەو سەبەبانە بەتایبەت کارو کرداری مرۆڤ و گیانلەبەران

کەس ناتوانێت بیانژمێرێت، چونکە دەتوانین مەبەست و ئیرادەکان بەسەبەب و کرداری مرۆیی بژمێرین چونکە لەجیهانی هەستیدا هیچ کردارێك بەدی نایەت مەگەر ئەوەی کە مەبەست و ئیرادەی لەسەر بکرێت و ئیرادەکانیش شتانێکی رۆحی و نەفسین و زیاتر لەو تەسەووراتانەوە بەشێوەیەکی یەك لەدوای یەك بەدی دێن کەپێشترن لەوان و ئەم تەسەووراتانەش بریتین لەسەبەب و مەبەستی کردارەکان. وەهەندیك جار هۆکاری ئەم تەسەووراتانە بریتین لەتەسەوور گەلێکی تر و هۆکاری هەرجۆرە تەسەووراتێك کەلەنەفسدا بەدی دێت نادیارە، چونکە هیچ کەسێك لەسەر بنەماو تەرتیب کردنی شتە نەفسیەکان ئاگادار نابێت، بەڵکو کاروبارە ناوبراوەکان بریتین لەشتانێك کەخودا دەیانکاتە ناوئەندێشەوە و لەکاتی ئەندێشەدا یەك لەدوای یەك بەدی دێن و مرۆڤ لەناسینی مەعریفە و مەبدەئو مەبەستەکانیان بێتوانایە، بەڵکو زۆرینەی زانستی مرۆیی بەهۆکارگەلێك دەزانرێت کەلەریزی تەبعەکاندا ئاشکرا دەبن و نەزم و تەرتیبێکی تایبەت لەمەداریکەکانی ئادەمیزاددا بەدی دێن، چونکە تەبیعەت لەچوارچێوەی نەفس و لەژێر حاڵەتی ئەودایە، بەڵام بازنەی تەسەوورات لەنەفس فراوانترە چونکە ئەوان پەیوەستن بەئەقڵەوە کەلەقۆناغێك لەپێشترن لەنەفس هەربۆیە نەفس زۆرێك لەوانە دەرك ناکات وچ بگات بەوەی کە زانیاریان لەبارەیەوە بەدەست بهێنێت.

وەدەبێت هەوڵ بۆ ئەم ئەندێشەیە بدەین و لەفەلسەفەو حیکمەتی خودا (شارع) تێبگەین و کەمرۆڤ لەبیرکردنەوە لەبارەی سەبەب و وەستان لەبەرامبەریانەوە نەهی کردووە. چونکە ئەم شتە وەك شیوێکی بێ بن وایە کەئەندێشەی مرۆڤی تێدا سەرگەردان دەبێت و سودێکی لێ نابینێت و حەقیقەتێك بەدەست ناهێنێت. ئەی پێغەمبەر بڵێ خودایە کەهاوکاری دەکات، لەپاشان وازیان لێبهێنە با لەگاڵتەجاڕیاندا رۆبچن[180] هەرچەندە کەمرۆڤ بەهۆی وەستان لەسەر سەبەب و هۆکارەکاندا لەبەرزبوونەوەی زیاتر لەوان دوور دەکەوێتەوە، لەئەنجامدا توشی هەڵخلیسکان دەبێت و دەچێتە ریزی

---

[180] (قُلِ اللَّهُ ثُمَّ ذَرهُم فِي خَوضِهِم يَلعَبُون) س الانعام ئا ٩١.

گومراکان و لەناوچووانەوە. پەنابەخودا دەگرین لەنائومێدی و زیانکاری ئاشکرا. ئەڵبەت نابێت گومانیش لەوە بکەین کەخۆڕاگری یان پاشەکشە لەو لەتواناو ئیختیاری ئێمەدایە، بەڵکو ئەم شتە وەك ڕەنگێك وایە کەلەنەفسدا نەخش دەبەستێت وەك داب و نەریتێك وایە کە بەهۆی ژێربینیەوە لەسەبەب و هۆکارەکاندا بەئەندازەیەك کەخۆشیان نایزانن تێیدا بەهێز دەبێت ڕەگو ڕیشەدادەکوتێت، چونکە ئەگەر لێی تێبگەشتینایە خۆمان لێ بەدوور دەگرت کەواتە باشتر وایە خۆمانی لێ لابدەین و بەشێوەیەکی یەکسەرە لەبیرکردنەوە لێی دوور بکەوینەوە.

وەهەروەها ڕووی کاریگەری ئەم سەبەبانە لەزۆرێك لەموسەبەبەکانیان نادیارن، چونکە ناسینی ئەو سەبەبانە لەسەر نەریت (ئەزمون) و پەیوەستبوونیان بەیەکترەوە وەستاوە لەڕێگەی پشتبەستن بەڕواڵەتە و حەقیقەتی کاریگەری و چۆنیەتیەکەی نادیارە. پێمان نەداون لەزانست مەگەر کەمێك نەبێت[181]. هەربۆیە فەرمان بەئێمە کراوە کەچاوپۆشی لێبکەین و هەڵیوەشێنینەوە و بەموسەبیبی سەبەبکانی هەموویان و ڕووبەکەینەبکەری بەدیهێنەریان تاوەکو یەکتاپەرستی بەپێی دەستوری شارع (خودا) کەبەبەرژەوەندیەکانی ئاین و ڕێگەکانی بەختەوەرەی ئێمە زاناترە لەنەفسەکانماندا جێگیر ببێت، چونکە شارع ئاگاداری پشتەوە هەستە. پێغەمبەر (ص) فەرمووی (هەرکەسێك بمرێت و ووشەی شایەتمانی لااله الاالله لەسەر زمان بێت دەچێتە بەهەشتەوە) هەربۆیە ئەگەر کەسێك لەلای ئەم سەبەبانە بوەستێت ناتوانێت بگاتە پلەیەکی بەرزتر. ووتنی ووشەی کوفری بۆ باشترە وەئەگەر لەدەریای ئەندێشەدا مەلە بکات و بەشوێن ئەو کاریگەریەکانی یەك لەدوای یەك بگەڕێت، من گرنتی ئەوەی دەدەمێ کەبەنائومێدیەوە دەگەڕێتەوە هەربۆیە شارع ئێمە لەتێڕوانین بیر کردنەوە لەهۆکارەکان نەهی کردووە و فەرمانی بەتەوحیدی ڕەها پێکردوین هەروەك چۆن دەفەرمێت: (ئەی محمد پێیان بڵێ هەرئەوە تاقانە خودا و بێ نیاز و لەکەس نەبووە کەسیشی لێنابێت و هیچ هاوشانێکی

[181] (وَما أُوتيتُم مِّنَ العِلمِ إِلّا قَليلاً) س الاسری ئا ۸۷.

نیە[١٨٢] ئەڵبەت نابێت متمانە بەوبۆچوونەی کەئەندێشەی پێت دەڵێت بکەیت و وابزانی کەفیکر توانای ئەوەی هەیە زانیاری لەسەر هەموو بوونەوەران و هۆکارەکانیان هەبێت و، هەموو ووردەکاریەکانی هەستی بزانێت و ئاگاداریان بێت ئەم بۆچوون و تێڕوانینە دوورە لەژیریەوە. وەدەبێت ئەوە بزانین کەبوون لەلای هەرئیدراککارێك لەیەکەمین تێڕوانیندا تەنها ئەو شتانیە کەبەهەستەکانی خۆی دەرکیان پێدەکات وز لەوەش تێپەڕ ناکات ئەمەلەکاتێکدا کەواقیعیەتی ئەمر خۆی لەخۆیدا بەشێکە لەم و حەقیش لەپشتەوەی (ماوراء) ئەودایە.

مەگەر نابینین کەجیهانی بوون لەلای مرۆڤی کەڕ بریتیە لەچوار هەستەکە مەعقولاتەکان و جۆری بیستنەکان بەلای ئەوەوە بەتەواوی لەجیهاندا بوونیان نیە. وەهەروەها لەلای کوێریش جۆری بینینەکان لەجیهانی بووندا لاچووە و ئەگەر لەم بارەیەوە کەسەکوێرەکان نەکەونە ژێرکاریگەری تەقلید لە باوباپیران و کەسوکارو خەڵکی سەردەمی خۆیانەوە بەهیچ شێوەیەك زانیاریان لەسەر شتە بینراوەکان نەدەبوو. بەڵام ئەوان لەسەلماندنی ئەم جۆرە بابەتانەدا پەیڕەوی لەعامەی خەڵکی دەکەن نەوەك بەپێی داخوازی فیترەت و تەبیعەتی ئیدراکی خۆیان. ئەگەر حەیوانی بێزمان قسەی بکردایە و لەبارەی مەعقولاتەوە پرسیاری لێبکرایە دەمانبینی کەجۆری مەعقولاتیان لەجیهانی هەستیدا ئینکاری دەکرد و ئەم جۆرە شتانە یەکسەر لەلای ئەو بوونیان نیە. لەبەرئەوەی کەلەم خاڵە تێگەشتین دەتوانین بڵێین کەلەوانەیە لەم جیهانەدا جۆرێك لەئیدراکات بوونیان هەیە کەپێچەوانەی مودریکاتی ئێمەیە، چونکە ئیدراکاتی ئێمە مەخلوق و موحدەسە و ئافەرینشی خودا لەئافەرینشی خەڵکی گەورەترە و ناتوانرێت هەمووی بزانرێت و بازنەی جیهانی بوون زۆر زیاترە لەوەی کەئێمە دەیزانین و خوداش لەپشت ئەوانەوە زاناترو بەئاگایە[١٨٣] کەواتە لەبارەی حەصرەوە بەنیسبەت صیحەتی ئیدراك و

---

[١٨٢] سورەتی الاخلاص لەئایەتی ١ تاوەکو کۆتایی.

[١٨٣] (وَاللهُ مِن وَرَائِهِمْ مُحِيط) س البروج ئا ٢٠.

مودریکاتی خۆیەوە لەگوماندا بێت. وەلەبیرو باوەڕو کرداری خۆتدا ئەوەی کەشارع فەرمانی پێکردویت پەیڕەوی بکە چونکە شارع حەزدەکات تۆ خۆشبەخت ببیت و بەرژەوەندیەکانت باشتر دەزانێت. چونکە ئەو لەقۆناغێکدایە لەسەروی ئیدراکاتی تۆوەیە بازنەی ئەو لەبازنەی ژیری تۆ فراوانترە و ئەم جۆرە تەریقەیە نابێتە هۆی لۆمەکردنی ژیری و ئیدراکاتەکانی ئەو، بەڵکو ژیری ئەندازەیەکی ڕاستە و ئەحکامەکانی یەقینین. وەدرۆناچێتە ناویانەوە، بەڵام لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا نابێت تەماعی ئەوە بکەیت کەمەسەلە تەوحیدیەکان و ئەودونیا حەقیقەتی پێغەمبەرایەتی و حەقیقەتی سیفەتەکانی خودایی و ئەوەی کەلەقۆناغێك لەپێش ژیری تۆوەیە بەو هەڵی بسەنگێنی چونکە ئەم جۆرە تەماعە لەشتە مەحاڵەکانە.

نمونەی ئەوەش وەك پیاوێك وایەکاتێك دەبینێت بەتەرازو زێڕ دەکێشن و دواتر تەماعی ئەوە بگرێت بەهەمان ئەو ترازووە کێوەکانیش کێشانە بکات. ئەم تەسەووره بەتالّی ئەوە نیشان نادات کەتەرازووی ناوبراو لەکێشانەکەیدا نادروستە، بەڵکو ئەوە ئاشکرا دەکات کەژیری ئاستێکی دیاریکراوی هەیە لەو ئاستەش تێپەڕناکات.

وەناکرێت بگاتە قۆناغێك کەشارەزای خودا و سیفاتەکانی ببێت چونکە ژیری زەڕەیەکە لەزەڕەکانی بوون کەبەویستی خودا بەدی هاتوون، لێرەوە دەتوانین پەی بە ئەندێشەی ئەو کەسانەی کە لەم جۆرە مەسەلانەدا ژیری بەلەپێشتر دەزانن لەبیستن ببەین و لەبەتاڵی بۆچوونەکەیان تێبگەین. وەلەوەی کەباسمانکرد ڕێگەی حەق ئاشکرابوو، چونکە لەو حەقیقەتە تێگەیشتین کەدەتوانین گومانی ئەوە بکەین کەلەوانەیە کاتێك کەسەبەبەکان لەبەرزبوونەوە لەبازنەی ئیدراکاتەکان و بوونی ئێمە تێپەڕدەکەن دەگەنە قۆناغێك کەتێگەشتن لێیان لەلەسنوری ئیدراکاتەکانی ئێمە بەدەرە و لەئەنجامدا ژیری لەبیابانی وەهمەکاندا گومڕاو سەرگەردان دەبێت و لەپاشانیش دەوەستێت. کەواتە تەوحید: بریتیەلەنەتوانینی دەرکی سەبەبەکان و چۆنیەتی کاریگەریەکانیان و ڕاسپاردنی ئەم شتەیە بەئافەرێنەری ئەو سەبەبانە کەهەرخۆی ئاگاداریانە، چونکە هیچ بکەرێك

هێندەی ئەو توانای نیە هەموو سەبەبەکان بەرەو لای ئەو بەرز دەبنەوە دەگەڕێنەوە بۆ هێزی ئەو زانستی ئێمەش سەبارەت بەو ئافەرێنەرە تەنها لەو ڕووەوەیە کەئێمە لەوەوە هاتووین و بەس.

ئەمەش مانای قسەی یەکێك لە صیدیقەکانە دەدەڵێت: نەتوانینی دەرککردن خۆی جۆرێکە لەئیدراك). لەپاشان دەبێت ئەوە بزانین کەموعتەبەر و وەهم لەم تەوحیدەدا تەنها باوەڕێك نیە کەبەهۆی تەصدیقەوە تەعبیر لەحوکمێك دەکەن، چونکە وەها تەصدیقێك لەحەدیسی نەفسە[١٨٤]، بەڵکو کەماڵ لەو بەدیهاتنەدا سیفەتێکە لەوو کەنەفس بەو ئەحواڵ و چۆنیەتیە جۆراو جۆرانەوە قبوڵدەکات.

هەروەك چۆن داواکراو لەکردارو پەرستشەکان بریتیەلە بەدیهاتنی مەلەکەی فەرمانبەرداری و ملکەچی و خاڵی بوونەوەی دڵە لەهەموو سەرگەرمیەکان بێجگە لەمەعبود (خودا) تاوەکو موریدی سالیك بگۆڕێت و، سیفەتی ڕەببانی لەخۆی بگرێت. وەجیاوازی نێوان حاڵ و زانست لەبیروباوەڕەکاندا وەك جیاوازی نێوان قەول و ئیتیصافە. باسەکەشی ئەوەیە کەزۆرێك لەخەڵکی دەزانن کەمیهر و بەخشندەیی بەنیسبەت خەڵکانی هەتیوو بێنەواوە نزیکبوونەوە بۆلای خودا و مستحب و موئەکەدە. ئەمەش بەزمان دەڵێن و دانیشی پێدا دەنێن و سەرچاوەکەشی لەشەریعەتدا باسدەکەن، بەڵام ئەم جۆرە کەسانە ئەگەر بێنەوا یان هەتیوێك لەمنداڵی بێنەواکان ببینن لێی دوور دەکەونەوە و نایگرنە خۆیان و پشتی لێهەڵدەکەن تاوەکو بگات بەوەی دەستی سۆز و میهرەبانی بهێنن بەسەریدا و خێری پێبکەن، ئەمەی کەباسمانکرد بۆ ئەم جۆرە کەسانە تەنها لەپلەو پایەی زانستدا دێتە دی و هێشتا نەگەشتوونەتە پلەیەك کەبەناویەوە نازەد بکرێن و کاری پێبکەن. بەڵام خەڵکانێکیش هەن کەبەپلەی زانست و داننان بەوەی کە بەخشندەیی و سۆز بەرامبەر بێنەوایان نزیکیە لەخودای گەورەوە و خاوەنی پلەیەکی

---

[١٨٤] حەدیسی نەفس لەبارەی خوداو هۆکارەکانیەوە بریتیەلەگفتوگۆکردن لەگەڵ خۆدا هەروەك بەنابانگە ئافەتی ئەقڵ حەدیسی نەفسە.

لەپێشترن لەپلەو پایەی پێشوو کەبریتیە لە وەسفداربوون بەبەخشندەیی و بەدیهاتنی مەلەکەی ئەو تێیاندا بەجۆرێك ئەم کەسانە هەرکە هەتیو یان بێنەوایەك ببینن یارمەتی دەدەن و داوای ئەوەی لێدەکەن کەلەلای خودا دووعای خێریان بۆ بکات، ئەم کەسانە هەرچەندە ڕێگریان لێبکرێت ناتوانن سەبر بکەن و هەرچیەکیان لەدەستدابێت دەیبەخشن. زانست بەتەوحید بەئیتیصافەوە بەم جۆرەیە.

وەزانست بمانەوێت و نەمانەوێت بەهۆی وەسفداربوونەوە(اتصاف) دێتە دی بنەمای وەها زانستێکیش بەچەندین پلە بەهێزترە لەوزانستەی کەبەرلە وەسفداربوون بەدی دێت، بەلاّم وەسفداربوون بەزانستی ڕووت بەدی نایەت مەگەر ئەوەی کەچەندین جار کاری پێبکرێت و بەئەندازەیەکی لەڕادەبەدەر دووبارە بکرێتەوە ئەوکات مەلەکە جێگیر دەبێت‌و قۆناغی وەسفداربوون و تەحقیق بەدی دێت. وەزانستی بەسودی دووەم لەئاخیرەتدا بەدی دێت، چونکە زانستی یەکەم کەخاڵیە لەوەسفداربوون کەم و سودەکەشی هەرکەمە ئەم زانستەش زیاتر زانستی موتەکەلیمەکانە و داخوازی زانستی (حالی) لەپەرستشەوە سەرچاوە دەگرێت. وەدەبێت ئەوەبزانین کەشاریع هەرتەکلیفێکی لەمرۆڤ کردووە بێگومان کەماڵەکەی لەوەها زانستێکدا دەزانێت. بەپێی ئەم بیروباوەڕەش، بەدوای هەرشتێکدا بگەڕێین ئەوا کەماڵەکەی لەزانستی دووەمدایە واتە زانستێك کەلەدوای وەسفداربوونەوە بەدەستدێت وداوای کارکردن بەهەریەکە لەپەرستشەکان بکرێت ئەوکات کەماڵ تێیدجا وابەستەیە بەهاتنەدی وەسفداربوون و تەحقیقەوەیە. سەرەڕای ئەوەی کەڕووکردنە پەرستش و بەردەوام بوون لەسەریان، ئەم بەرهەمە شەریفەی دەبێت. پێغەمبەر (ص) لەبارەی سەری پەرستشەکانەوە دەفەرمێت:(نوری چاوی من لەنوێژدایە). هەروەك چۆن تێبینی دەکرێت لەنوێژی پێغەمبەردا سیفەت و حاڵەتێك هەیە کەتێیدا ئەوپەڕی لەزەت و نوری چاوی خۆی بەدەست دەکەوێت، ئەم نوێژە لەکوێ و نوێژی خەڵکانێکیش لەکوێ کەئەم ئایەتەیان بەسەردا دەچەسپێت لەکوێ کەدەفەرمێت: (وەیل بۆ نوێژکەران ئەوانەی

کەلەنوێژەکانیاندا بێئاگان).[185] ئەی خودایا سەرکەوتوومان بکە و ڕێنماییمان بکە بۆ سەر ڕێگەی ڕاست ڕێگەی ئەوانەی کە نیعمەتی خۆتت بەسەردا ڕێژاون، نەوەك ئەوانەی کە غەزەبت لێگرتوون ئامین.[186] لەو هەموو بابەتانەی کەباسمانکردن بۆ خوێنەرەکان ڕوون بوویەوە کەداخوازی لە هەموو تەکالیفەکاندا بریتیە لە بەدیهاتنی مەلەکەیەکی جێگیر لەنەفسدا، کەزانستێکی پێویستی بۆ نەفس لێوە بەدی دێت و ئەو زانستەش بریتیەلەتەوحیدی و عەقیدەی ئیمانی و کورتەی وەسیلەیەکەکە بەختەوەری پێ بەدەستدێت.

ئەم مەلەکەیە لەهەموو تەکالیفە قەلبی و جەستەییەکاندا یەکسانە و لەوەوە تێدەگەین ئەو باوەڕو ئیمانەی کەئەصڵ و سەرچاوەی تەکالیفەکانە بەهەمان شێوە وەك ئەم مەلەکەیەوایە چەندین قۆناغی هەیە کەیەکەمینیان تەصدیقی قەلبیە (دڵ) و گونجاوە لەگەڵ زمان و لەپێشترین پایەی بریتیەلەبەدیهاتنی ئەو چۆنیەتیەی کەبەهۆی ئەم عەقیدە قەلبیە و کردارەکانی پەیوەست پێیەوەیە کەبەردەوام زاڵە بەسەر دڵدا و لەئەنجامدا ئەندامانی جەستەش پەیڕەوی لێدەکەن و هەموکاروکردەوەکان دەکەونە ژێر دەسەلآت و فەرمانڕەوایی ئەوەوە.

هەروەك چۆن کردارەکانی مرۆڤ یەکسەرەفەرمانبەری لەم تەصدیقە ئیمانیە دەکەن و ئەم چۆنیەتیە لەباشترین و بەرزترین پایەکانی ئیمان دەژمێردرێت و بریتیەلەئیمان و باوەڕێکی کامڵ و تەواو کەتاکی باوەڕدار بەوەها باوەڕێك هیچ گوناهێکی بچووك و گەورەش ئەنجام نادات، چونکە بەدیهاتنی مەلەکەو جێگیر بوونی ناهێڵێت تاك بەئەندازەی چاوتروکانێکیش لەڕێگەی ئیمان و باوەڕ لابدات. پێغەمبەر(ص) دەفەرمێت: (زیناکار لەکاتی زینا کردندا باوەڕدارنیە) و لەحەدیسەکەی هیرەقلیشدا هاتووە کاتێك

---

[185] (فَوَيلٌ لِّلمُصَلِّينَ الَّذينَ هُم عَن صَلَاتِهِم سَاهُونَ) س الماعون ئا ٥.

[186] (إهدِنَا الصِّراطَ المُستَقِيم صِراطَ الَّذينَ أنعَمتَ عَلَيهِم غَيرِ المَغضُوبِ عَلَيهِم وَلَاالضَّالِّين) س الفاتحة ئا ٥ تاکۆتایی.

هیرەقل لەبارەی پێغەمبەر و سیفەتەکانیەوە پرسیاری لەئەبوسوفیانی کوڕی حەرب کردو گوتی ئایا هیچکام لەوان بەهۆی ناڕەزاییەوە لەئاینەکەیان هەڵدەگەڕێنەوە؟ گوتی نەخێر، هیرەقل گوتی: ئیمان کاتێك کەڕووناکیەکەی لەدڵەکاندا جێگیر ببێت و ئاوێتەی نەفس ببێت بەو جۆرەیە. مانای قسەکەی ئەو ئەوەیە کە مەلەکەی ئیمان هەرکات پایەدارو جێگیر ببێت وەك هەموو ئەو مەلەکانە وایە کەجێگیر دەبن و سەرپێچی نەفس لێیان زۆر ئاستەم و دژوارە، چونکە مەلەکەی ناوبراولەناخی مرۆڤدا وەك خوو سیفەتێکی سروشتی لێدێت.

ئەم جۆرە ئیمانەش بەپلەی بەرزی ئیمان دادەنرێت و لەپلەی دووەمدا لەگەڵ عیصمەتدایە، چونکە عیصمەت بۆ پێغەمبەران واجبە و ووجوبێکی پێشوو ئەزەلیە و بەدیهاتنی بۆ باوەڕداران شوێنکەوتەی باوەڕو تەصدیقی ئەوانە و بەهۆی ئەم مەلەکەو جێگیر بوونیەوە جیاوازی لەباوەڕدا ڕوودەدات هەروەك چۆن لەگوفتارەکانی سەلەفدا بۆ مرۆڤ خوێندراوەتەوە، لەتەرجەمەکانی بوخاری لەبابی ئیماندا زۆرێك لەوان هاتوون وەك ئەوەی کە گوتوویەتی: ئیمان گوفتارو کردارە و کەم و زیاد دەکات) وەهەروەها دەڵێت: (نوێژو ڕۆژوو لەئیمانەوەیە و ئەنجامدانی تەکالیفەکانی ڕەمەزان لەئیمانەوەیە و شەرم و شکۆو حەیاش هەرلەئیمانەوەیە). مەبەست لەهەموو ئەمانە ئیمانێکی کامڵە کەئاماژەمان بە خۆی و مەلەکەکەی کرد. کەلایەنی کرداری هەیە. بەلأم لەتەصدیقێکدا کەلەیەکەمین پلەکانی ئیمان دەژمێردرێت جیاوازی بوونی نیە، چونکە ئەوانەی کەسەرەتای ناوەکانیان بەخاوەن ئیعتیبار داناوە و دەیانخەنە سەر تەصدیق ورێگری لەجیاوازیان بکرێت هەروەك چۆن ئیمامانی موتەکەلیمەکان گوتوویانە و ئەوانەشی کەکۆتایی ناوەکانیان بەخاوەن ئیعتیبار داناوە بیانخەنە سەر ئەوەی کەئەو مەلەکەیەی ئیمانی کامڵە جیاوازیەکەیان بۆدەردەکەوێت ئەمەشە لەیەکبوونی حەقیقەتی ئەوەڵیدا کەتەصدیقە مایەی لۆمە کردن نیە چونکە تەصدیق لەهەموو پلەکانی ئیماندال بوونی هەیە و، کەمترین پلەیەك کەناوی ئیمانی لێبنرێت ئەم پلەیە کەتاك لەوابەستەبوون بەکوفر ڕزگار دەکات. جیاکەرەوەی

نێوان کوفر و باوەڕە هەربۆیە ئیمان لەپلەیەکی جەزایی کەمتری نیە و ئەوەش خۆی بۆ خۆی یەك حەقیقەتە کەهیچ جۆرە جیاوازیەکی تێدا نیە، بەڵکو هەروەك گوتمان جیاوازی لەچۆنیەتیەکدایە کەلەسایەی کردارەکاندا بەدی دێت هەربۆیە پێویستەبەباشی لەم خاڵە تێبگەیت.

وەدەبێت بزانین کەشاریع بۆ ئێمە وەصفی هەمان ئەو ئیمانەی کردووە کەلەیەکەمین پلەدایە و بریتیەلە تەصدیق و شتانێکی تایبەتی دیاریکردووە کەئێمەی موکەلەف بەتەصدیقی قەلبی (دڵ) و بیروباوەڕی ناوەکی لەبارەیانەوە دەکات، لەوکاتەی کەدەبێت بەزمانیش ئیقراریان پێبکەین و دانیان پێدا بنێین و شتەناوبراوەکانیش بریتین لەعەقیدەگەلێك کەلەئایندا بڕیاریان لەسەر دراوە، هەروەك چۆن کاتێك پرسیاریان لەپێغەمبەر (ص) کرد لەبارەی ئیمانەوە فەرمووی: (ئیمان بریتیە لەباوەڕهێنان بەخوداو فریشتەکان و پێغەمبەران و کتێبەکانی و ڕۆژی دوایی و بەباشە و خراپەی قەزاو قەدەری خودا) ئەمانە بریتین لەهەمان بیروباوەڕو ئیمانێکە کەلەعیلمی کەلامدا باسکراوە. ئێستەش بەگشتی ئاماژەیان پێدەکەین تاوەکو حەقیقەتی ئەم هونەرەو چۆنیەتی ڕوودانی بۆتۆ ڕوون ببێتەوە: دەبێت بزانین کە شارع فەرمانی بەئێمە کردووە کەباوەڕ بەئافرێنەرێك بهێنین کەهەموو کاروبارەکانی گێڕاوەتەوە بۆ ئەو لەهەموویاندا بەتاك و تەنیا ناوی بردووە، هەروەك چۆن باسمانکرد و ئێمەی ئاگادار کردەوە کەسەرفرازیمان لەکاتی مردنماندا لەم ئیمانەدایە و ئێمەی لەحەقیقەتی ئەم ئافەرێنەرە ئاگادار نەکردەوە، چونکە وەها شتێك بۆ ئیدراکی ئێمە زۆر دژوارە لەپێشترە لەو چۆنیەتیەی کەئێمەی تێیداین، هەربۆیە ئێمەی موکەلەف کرد کەسەرەتا باوەڕ بەوەبهێنین کەئەو ئافەرێنەرە لەزاتی خۆیدا پاك و بەدوورە لەهاوشیوە و لێکچوون لەگەڵ بوونەوەراندا وەگەرنا دروست نەبوو کەئو ئافەرێنەری بوونەوەران بێت چونکە بەپێی وەها گریمانەیەك جیاوازیەك لەنێوان ئەم و بوونەوەراندا بوونی نەبوو. لەپاشان فەرمانی بەئێمەکرد کەئافەرێنەر بەدوو بزانین لەهەموو سیفەتێکی کەمو کورت وەگەرنا ئەوکات لەبوونەوەران دەچوو.

دواتریش فەرمانی پێکردین کەبەخودای تاقانەی بزانین وەگەرنا بەهۆی تەمانع[١٨٧] بوونەوەر نەدەخولقا، لەدوای ئەوەش فەرمانی پێکردین کەباوەڕمان وابێت ئەو ئافەرێنەرە دانایٍ بەتوانایە و چونکە بەم سیفەتە بەئەنجام گەشتنی کردارەکانی (مخلوق) بۆ کامڵی بەدیهاتنی ئافەرینش گەواهیدەری جێبەجێکردنی ئەحکامەکانی ئەوە. وەهەم خاوەنی ئیرادەشە وەگەرنا هیچکام لەبوونەوەران بەبەراورد بەویتر تایبەتمەندی ئیمتیازی نەبوو. وەهەروەها ئەو چارەنوسی هەربوونەوەرێك دیاری دەکات وەگەرنا ئیرادە حادیسی مەخلوقە. وەئەو لەپاش مردن بۆ کامڵکردنی گرنگیدانی خۆی بەبەدیهێنراوان و بوونەوەر سەرەتا زیندوومان دەکاتەوە و ئەگەر بهاتبایە و خیلقەتی مرۆڤەکان بۆ نەبوون بوایە ئەوا بەکارێکی بێهودەی بیٚ سود دەژمێردرا. کەواتە ئەم خیلقەتە بۆ مانەوی هەمیشەیی و جاویدانی پاش مەرگە.

وەفەرمانی ئەوەشی پێکردین کەباوەڕمان بەناردنی پێغەمبەران هەبێت بۆ ئەوەی ڕێگەی ڕزگاری و سەرفرازیمان بۆ ڕوونبکەنەوە، چونکە لەڕۆژی حەشردا حاڵی مرۆڤەکان لەڕووی بەختەوەری و بەدبەختیەوە جیاوازە و ئەوپەڕی سۆزو میهرەبانی خودایە کەمرۆڤەکانی لەچۆنیەتیەکانی ئەو ڕۆژە ئاگادار کردووەتەوە و دۆزەخی بۆ سزا و بەهەشتیشی بۆ پاداشت داناوە. ئەمانەن ئومەهاتی عەقیدە ئیمانیەکان کەبەبەڵگە ئەقڵیەکان سەلمێنراون و بەڵگە لەبارەیانەوە لەقورئان و سوننەتدا زۆر و زەوەندن سەلەف ئەو عەقیدانەیان لەئەدیللەی ناوبراوەوە بەدەستهێناوە لەڕووی زانیاریەوەئێمەیان ڕێنمایی کردووە بۆیان و پێشەوایانی ئاین تەحقیقیان کردوون و سەلماندویانن. بەڵام لەپاش ماوەیەك لەووردەکاری ئەم عەقیدانەدا جیاوازی ڕوویداوە و زۆربەی بیرۆکەی ئەم جیاوازیانەش ئایەتە (متشابە) و مانا ئاڵۆزەکانن. جیاوازیە نابراوەکان بەهۆی بگرە وبەردەو مونازەرەو بەڵگەهێنانەوەکانەوە بووە کەلایەنی ئەقڵیان لەنەقڵیان زیاترە و، لەئەنجامدا عیلمی کەلام دانراوە.

---

[١٨٧] ڕیگری وەمەنع کردنی یەکتری و پێکدادان و دژایەتی ئیرادەکان.

هەربۆیە دەست دەکەین بەتەفصیلو شەرحی ئەم موجمەلە: لەقورئاندا وەسفی مەعبود بەشێوەی تەنزیهی (پاك و بێگەردی) ڕەها هاتووە هەروەك چۆن وەسفی نابراو لەئایەتگەلێکی زۆردا بەڵگەی ئاشکرا لەسەر تەنزیهی ئەو هاتوون پێویست ناکات، هیچکامێکیان تەئویل بکەین هەموو ئەم ئایەتانەش سەلوبن و هەریەکە لەبابی خۆیاندا صەریح و ئاشکران، هەربۆیە باوەڕبوون پێیان بەواجب دادەنرێت، سەرەڕای ئەمەش لەقسەکانی شارع (ص) و صەحابە و تابیعیندا ئایەتە ناوبراوەکان بەپێی دەلالەتە ئاشکراکانیان تەفسیر کراون. لەلایەکی تریشەوە لەقورئاندا ئایەتگەلێکی کەم بوونیان هەیە کەدەبنە هۆی تەوەهومی لێکچوون (تشبیە)، ئەم لێکچوونەش جارێك لەزات و جارێکیش لەصیفاتدایە بەڵام سەلەف بەهۆی ئەوەی کەبەڵگە و ئەدیللەی تەنزیە زیاتر بوون و بەڵگەی ئاشکرایان هەبووە زاڵیان کردوون بەسەر ئایەتە کەمە موتەشابیهەکاندا[١٨٨] و پەیان بەمەحاڵ بوونی تەشبیە بردووە و فێری خەڵکیشیان کردووە و، گوتوویانە کەئایەتە موتەشابیهەکانیش کەلامی خودان و باوەڕیان پێ هێناون و لەماناکانیاندا بەحس و تەئویلیان نەکردووە.

ئەم شێوەمانای گوفتاری زۆرێك لەسەلەفە کەگوتوویانە: ئەوانە وەك ئەوەی کەنازڵ بوون بخوێننەوە. واتە باوەڕ بەوەبهێنن کەئەوئایەتانە لەلایەن خوداوە هاتوون و تەئویلو تەفسیریان مەکەن کەلەوانەیە ئایەتە ناوبراوەکان بۆ تاقیکردنەوەبن. کەواتە واجبە لەبەرامبەر ئەوانەوە لەهەرتەئویلێك بوەستین و گوێ لەوان بگرین. وەلەسەردەمی سەلەفدا گروپێکی کەم لەبیدعەچیەکان دەرکەوتن پەیڕەویان لەئایەتە موتەشابیهەکان کرد و لەچواندن و تەشبیهدا ڕۆچوون و باوەڕیان بەوە کرد کەخالیق خاوەنی دەستو پێی و دەموچاوە و، کاریان بەو مانا ئاشکرایانەکرد کە لەئایەتەکاندا هاتبوونو

---

[١٨٨] ئایەتە موتەشابیهەکان لەئوصولی فیقهدا بەو ئایەتانە دەگووترێت کەماناکەیان ئاڵۆزەو نازانرێت بۆ کام مانا بەکار بهێنرێت، وەك ئایەتی (الرَّحمانُ عَلى العَرشِ استَوى)، واتە خودا لەسەر عەرشەکەی وەستاوە لێرەدا چۆنیەتی ئەو وەستانەی خودای گەورە دیار نیە و نازانرێت و لەزانیاری مرۆڤ بەدەرە.

سەرئەنجام کەوتنە گێرەپانی بەرجەستەکردنی ڕاشکاوانە و، دژایەتیکردنی ئایەتەکانی تەنزیە، چونکە مەعقولیەتی تەن و جەستەیەك خوازیاری کەموکورتی و پێویستیە. ئەمەلەکاتێکدا زاڵکردنی ئایەتەکانی سەلوب لەبارەی تەنزیهی ڕەهاوە کەلەشوێنگەلێکی زیاتردا نازڵ بوون لەڕووی دەلالەتەوە ئاشکراترن.

ئەو لە تێکەڵکردنی ڕووی ئاشکرای ئەو ئایەتانەدا کەبێ نیازین لێیان و، هەم لەتێکەڵکردنی هەردوو گرووپی دەلیلەکە بەم تەئویلاتەی ئەوانەوە ناوی موشەبیهو موجەسەمە بۆ ئەوان زۆرشیاوەو، ئەم گروپە لەناشیرین و خراپیاندا پەنایان بۆ وەها گوفتارێك بردووە و گوتوویانە: جەستەیە بەڵام نەك وەك جەستەکان.

ئەمە لەکاتێکدا ئەم گوفتارە بەرگری لەعەقیدەکانیان ناکات، چونکە گوتەیەکی دژو کۆکردنەوەی ڕوونکردنەوەی نێوان نەفی ئیسباتە، هەرکات بۆ یەك مەعقولیەت بن لەجەستەداو ئەگەر دژی بن و مەعقولیەتی ئاسایی نەفی بکەن، ئەوکات لەتەنزیهدا هاوڕادەبن لەگەڵ ئێمە و لەتەوجیهاتەکانیان شتێك نامێنێتەوە، بێجگە لەوەی کە لەفزی جیسم (جەستە)یان کردووە بەیەکێك لەناوەکانی خوداو، وەها جەعل و دانانێك لەسەر مۆڵەت وەستاوە. وەهەندێکیشیان باوەڕیان بەتەشبیه بووە لە سیفاتدا هەروەك چۆن بۆ خودا لایەن و جێگیری و دابەزینو دەنگ و قسەکردنیان سەلماندووە کاری ئەم گروپەش دەگەڕێتەوە سەر (تجسم) بەرجەستەکردن، ئەم گروپەش وەك دەستەی یەکەم ئەم قسەیانکردووە کە: دەنگێکە بەڵام نەك وەك دەنگ لایەنێکە نەك وەك لایەنەکان دابەزینێکە نەك وەك دابەزینەکانی جەستەی مرۆڤ). بۆ ئەم دیاردە یان ئایەتەکانی (سلوب) ڕێگەیەکی تر بێجگە بیروباوەڕ و مەزهەبەکانی سەلەف و باوەڕهێنان پێیان، کەدەبوو هەبوایە نەماوەتەوە تاوەکو لەبەر نەفی کردنی ماناکانیان نەفیەکەش سەرنەکێشێت بۆ خودی خۆشیان، لەگەڵ ئەوەی کەئەوانە صەحیح و نەگۆڕنو لەقورئانداو تیۆرەکانی ئیبن ئەبوزەید لە(عقیده الرساله)و کتێبی (مختصر)و، نوسینەکانی حافیزی کوڕی عبدالبر لەدانراوەکەیدا و ئەوانی تریش بۆ ئەم مەبەستە

ئاراستەکراون، چونکە ئەمان لەناو ئەم مانایەدا قسەدەکەن و نابێت لەو قەرینانەی کەلەنێو قسەکانی ئەماندایە ودەلالەت دەکاتە سەر ئەم مانایە چاوپۆشی بکەین. دواترو لەپاش ئەوەی کەزانست و صنعەتەکان فراوان بوون و خەڵکەی بوونە عەودالّی نوسین‌و دانان لەبوارە جۆربەجۆرەکاندا و موتەکەلیمەکان لەبابەتی تەنزیهدا چەندین کتێبیان نوسی و، بیدعەی موعتەزیلە سەریهەڵداو ئەو تەنزیهەی گەدەچوویە ژێر ڕکێفی ئایەتەکانی سەلوبەوە گشتاندیان‌و، لەئەنجامدا دەستیانکردە نەفی سیفەتی ماناکان وەك زانست و هێز و ئیرادە و ژیان و زیاد لەوەی کە لەئەحکامەکانی ئەواندا بوو حوکمیانکرد، چونکە بەگومانی ئەوان بەپێی ئەم سیفەتانە فرەیی (تعدد)ی کۆن بەدی دێت. ئەمەلەکاتێکدا گومانەکەیان لەبەر ئەوە ڕەت دەکرێتەوە کەسیفەتەکان نەعەینی زاتی ئەوەونەبەشێکیشە لەزاتی ئەو.

وەهەروەها سیفەتی (ئیرادە)و بیستن و بینینیان لەخودا نەریّ (نفی) کردووە چونکە ئەم سیفەتانەیان لەعەواریزەکانی تەنەکان زانیوە ئێستاکەش دەبینین ئەم قسەیەی ئەمانیش ڕەت دەکرێتەوە، چونکە لەمانای ئەم زاراوانەدا ئەندام و جەستەیەك بەمەرج نەگیراوە بەڵکو مەبەست ئیدراکی بیسراوو بینراوە، وەهەروەها سیفەتی کەلامیشیان نەفی کردووە بەبیانووی لێکچوونی لەگەڵ ئەوەی کەلەبیستن و بینیندا هەیە صنعەتی ئەو قسەیەی کەقائم بەنەفسە دەرکیان نەکردووە هەربۆیە حوکمیان بەمەخلوق بوونی قورئان کردووە. ئەمەش بیدعەتێکە کەسەلەف بەپێچەوانەکەیەوە قسەیانکردووە و زەرەری ئەم بیدعەتە گەورەبووە و هەندێك لەخەلیفەکان لەئیمامەکانی سەردەمی خۆیانەوە قبوڵیان کردووە و خەڵکیان هانداوە لەسەری و پێشەوایانی ئاین دژایەتیان کردوون‌و، لەئەنجامدا جەڵد لێدانی زۆرێك لەپێشەوایانیان بەڕەوا زانیوە[189] و هەندێکیشیان کووشتوەو، ئەمەش بوویە هۆی ئەوەی کەئەهلی سوننە بەبەڵگە ئەقڵیەکان لەدژی ئەم

---

[189] ئەمەش لەساڵی ٢١٢ ك بوو کاتێك مەئمونی خەلیفە دەستی دایە گرنگیدان بەتیۆری مەخلوقبوونی قورئان‌و دژەکانی بەتوندی جەڵد لێدەدا و ڕووداوەکانی (میحنەت) دروستبوون.

بیرو باوەڕانە ڕاپەڕین بۆ ئەوەی ڕێگە لەبەرکەوتنی ئەم جۆرە بیدعەتانە بگرن‌و کەسێکیش کەگرنگی بەم شتە دا شیخ ئەبو الحسنی ئەشعەری پێشەوای موتەکەلیمەکان بوو، کەئاستی مامناوەندی ڕێگە جیاوازەکانی هەڵبژارد و تەشبیهی ڕەتکردەوەو سیفەتەمەعنەویەکانی سەلماندو لەبارەی تەنزیهەوە بەهەمان ئەنداوە کەسەلەف باسیانکردبوو ئەمیش هێندەی کردو بەڵگە تایبەتیەکان بەگشتگیر کردن بوونە گەواهیدەر بۆی، هەربۆیە هەرچوار سیفەتە مەعنەویەکە وەك بیستن و بینین و قسەی قائم بەنەفسیان بەڕێگەی ئەقڵ و نەقڵ سەلماندو، ڕەتی هەموو بیرو باوەڕەکانی بیدعەچیەکانیان دایەوەو ئەم مەسەلانەی کەبۆ بیدعە ئامادەیان کردبوون، وەك صلاح(باش) و ئەصلەح (باشتر) و تحسین (جوانکردن) و تقبیح (ناشیرینکردن) گفتوگۆی لەبارەوە کردن.

وەبیروباوەڕەکانی پەیوەست بەزیندووبوونەوە و مەعاد و بەهەشت و دۆزەخ پاداشت و سزای کامڵکرد و باسی ئیمامەتیشی لکاند بەم بابەتەوە، چونکە لەم کاتەدا بیدعەتی ئیمامیەکان هاتبووە ئاراوە و باوەڕیان وابوو کەئیمامەت لەڕیزی بیروباوەڕە ئاینیەکاندا دەژمێردرێت و دیاریکردنی واجبە لەسەر پێغەمبەر. وەدەبێت لەگەڵ دیاریکردنی کەسێکدا کەشایەنی ئیمامەتە توانای ئەم کارەی هەبێت. ئەم تەکلیفەش لەسەر ئوممەت واجب دەبێت. وەئامانج و ئەوپەڕی مەسەلەی ئیمامەت هەرئەمەیە کەمەسەلەیەکی پەیوەستە بە بەرژەوەندی ئوممەت و شتێکی کۆمەڵایەتیە نالکێت بەبیروباوەڕە ئیمانیەکانەوەی، هەربۆیە لکاندوویانە بەمەسەلەکانی ئەم هونەرەوە و ناویاننناون عیلمی کەلام یان بەهۆی ئەوەوەیە کەلەم زانستەدا بەپێچەوانەی بیدعەتەکانەوە باسی مونازەرە دەکرێت ئەم مونازەراتەش قسەی ڕووتەو ناگەڕێتەوە بۆ هیچ زانستێك، یان بەهۆی ئەوەوەیە بارودۆخی عیلمی کەلام و بەدوادا چوون لەو کێشەیەی ئەواندا لەسەلماندنی کەلامە نەسیەکاندایە.

لەپاش ماوەیەك شێخ ئەبوالحسنی ئەشعەری شوێنكەوتوانێكی زۆری پەیدا كردو لەدوای ئەویش قوتابیەكانی وەك ئیبن موجاهید و ئەوانی تریش ڕێگەكەی ئەویان درێژە پێداو، قازی ئەبوبەكری باقلانی لەوانەوە وەریگرت و لەو تەریقەیەدا بوویە پێشەواو تەهزیبی كردو دەستیكردە دانانی پێشەكی گەلێكی ئەقڵی كەبەڵگە و تیۆرو بیرۆكەكانیان لەسەر وەستاوە، وەك سەلماندنی جەوهەری تاك وكۆمەڵ و ئەوەی كەعەرەزی (قائم بە) نابێتە عەرەز و لەدووكاتدا نامێنێتەوە و نمونەی ئەمانە لەو مەسەلانەی كەبەڵگەكانیان لەسەر ئەوان وەستاون ئەم یاسایانەش لەڕووی واجببوونی باوەڕبون پێیان كردوونیەتیە شوێنكەوتەی عەقیدە ئیمانیەكان، چونكە ئەم بەڵگانە (بیروباوەڕی سەلمێنەری بیروباوەڕەكان) لەسەر ئەم بیروباوەڕانە وەستاوەو هەم لەو ڕووەوە پێی وابوو كەباتڵبوونی دەلیل دەبێتەهۆی باتڵبوونەوەی مەدلول سەرئەنجام ئەم ڕێڕەوە كامڵبوو چوویە ڕیزی باشترین هونەرەتیۆری و زانستەئاینیەكانەوە. بەڵام شێوازی بەڵگەكان لەو هونەرەدا هەندێك جار بەشێوەیەكی صەناعی نەبوو بەهۆی ئەوەی كەهێشتا ئەونەتەوەیە لەقۆناغی سادەیدا بوون،و لەلایەكی تریشەوە صنعەتی مەنتیق كەبەڵگەكانی پێ تاقیدەكەنەوە و قیاسەكان بەهۆیەوە ئیعتیباریان هەیە، لەو سەردەمەدا هێشتا لەناو نەتەوەی ئیسلامدا ڕەواجی پەیدا نەكردبوو ئەگەر كەمێكیشی هەبووبێت موتەكەلیمەكان بەكاریان نەهێناوە، چونكە هونەری مەنتیق لەڕیزی زانستەكانی فەلسەفەدا دەژمێردرا كەبەگشتی دژی عەقیدە شەرعیەكان بوو هەربۆیە هونەری مەنتیق لەناویاندا نەبوو. دواتریش لەپاش ئەبو بەكری باقلانی ئیمام الحرمین ئەبو المعالی دەركەوت لەم تەریقەدا كتێبی (شامل)ی نوسی و شەرحی كردووەو لەپاشانیش كتێبی (ارشاد)ی كورتكردەوەو خەڵكی وەك ڕێنمای بیروباوەڕەكانیان هەژماریانكرد و سودیان لێوەرگرت. لەپاش ماوەیەك زانستی مەنتیق لەناو نەتەوەی ئیسلامدا بڵاو بوویەوە و خەڵكی دەستیانكردە خوێندنی،و لەگەڵ فەلسەفەدا جیایانكردەوە بەوەی كە مەنتیق تەنها یاساو پێوەرێكە بۆ

بەڵگەکانەو هەروەك چۆن کەبەڵگەکانی زانستە فەلسەفیەکان بەمەنتیق تاقیدەکەنەوەو بەڵگەی زانستەکانی تریش هەربەمەنتیق هەڵدەسەنگێنن.

دواتریش بەم یاسایانە پێشەکیەکانی هونەری کەلام کەپێشینان دایانناون تێیانڕوانیو بەبەڵگەگەلێکی زۆر کەبەدەستیان گەشتبوون دژایەتیان کرد هەرچەندە زۆرێك لەبەڵگەکانیان لەکەلامی فەلسەفەوە لەبابەتە تەبیعیات و ئیلاهیاتەکان بوون. لەبەر ئەوەی کەبەپێوەری مەنتیق هەڵیان سەنگاندن ئەمەوایکرد کەبەرەو مەنتیق بێنو باوەڕیان بەباتڵبوونی دەلیل بەهۆی باتڵی مەدلولەوە نەبووەو هەروەك چۆن قازی ئەبوبەکری باقلانی باوەڕی پێی هەبوو تەریقەی نابراو بوویە بەشێك لەزاراوەکانی ئەمانو دژی تەریقەی یەکەمین بووەو بەتەریقەی پاشینان ناوزەدیانکردووە. هەرچەندە کەلەم تەریقەی ڕەتدانەوەی فەیلەسوفەکان لەم بارەیەوە مەسەلە گەلێك لەفەلسەفە کەدژی عەقیدە ئیمانیەکان بوو تێکەڵیانکردو فەیلەسوفانیان بەدجووژمنی عەقیدە دایە قەڵەم چونکە شێوەکەی ئەمان لەگەڵ زۆرێك لەمەزهەبی بیدعەچیەکاندا گونجاوبوو. یەکەمین کەسێکیش کەتەریقەی کەلامی بەم شێوەیە و لەسەر ئەم مەنهەجە نوسی و کردیە کتێب غەزالی بوو دوای ئەویش ئیمام ئیبن الختیب فخرالرازی و گروپێکیش لەزانایان دەستیانکردە تەقلیدکردن لەغەزالی و متمانەیان پێکرد. دواتریش پاشینانی دوای ئەمان دەستیانکردە ئاوێتەکردنی کتێبە فەلسەفیەکان و بابەتەکانی کەلام و فەلسەفەیان تێکەڵکردو بەهۆی هەڵەی ئەو دووزانستەوە بابەتی فەلسەفە و کەلامیان بەیەك شت دەزانی. وەدەبێت ئەوەش بزانین کەموتەکەلیمەکان لەزۆربەی چۆنیەتیەکاندا تەریقەی خۆیان بۆ سەلماندنی بوونی خوداو سیفەتەکانی بەڵگەیان بەکائینات و دروستکراوەکانی دەهێنایەوەو بەڵگە هێنانەوەکەشیان زیاتر بەم جۆرە بوو وەلەلایەکی تریشەوە فەیلەسوفیش لەتەبیعیات لەبارەی جسمی تەبیعیەوە بیر دەکاتەوە کەبەشێکە لەم بوونەوەرانە، بەڵام تێڕوانینی ئەو لەمبارەیەوە دژی تێڕوانینی موتەکەلیمەکان بوو چونکە فەیلەسوف لەجەستەدا لەڕووی جوڵە و نەجوڵانەوە سەیر دەکات و موتەکەلیمیش

لەمبارەیەوە بیری لێدەکاتەوە کەدەلالەت دەکاتە سەر بکەر، وەهەروەها ئەندێشەی فەیلەسوف لەئیلاهیاتدا تەنها تێڕوانینێکە لەبوونی ڕەهاو داخوازیەکانی زاتی ئەون بەلاّم تێڕوانینی موتەکەلیم لەبووندا لەم ڕووەوەیە کەدەلالەت دەکاتە سەر بەدیهێنەر (موجد) کورتەی بابەتی عیلمی کەلام لەلای ئەهلی ئەو زانستە بریتیە لەعەقیدە ئیمانیەکان، کەلەپاش گریمانی ئەوەی کە مەسەلەکان لەو لایەنەی شەرعەوە ڕاست بن دەکرێت بەبەڵگەی ئەقڵی بەڵگەیان پێبهێنرێتەوە بۆ ئەوەی بیدعەتەکان لەناو بچن و هەمووشك و گومانەکان لەم عەقیدانەدا بسرێنەوەو، هەرکات بیر لەچۆنیەتی بەدیهاتنی ئەم هونەرە بکەینەوە و ببینین کەچۆن قسەی زاناکان لەمبارەیەوە پشتاو پشت گۆڕانکاری بەسەردا هاتووەو، هەموویان عەقیدە ئیمانیەکانیان بەدادەنا و داوای بەڵگەیان دەکرد ئەوکات پەی بەڕاستیەتی ئەوەی کە ئێمە لەبارەی بابەتی ئەم هونەرەوە بڕیارمان لەسەریدابوو دەبەین‌و، لەوەش تێدەگەین کەلەوەش تێپەڕناکەن.

وەلەلای پاشینانیش دووتەریقە ئاوێتەی یەکتر بوون مەسەلەکانی عیلمی کەلام لەگەڵ مەسەلەکانی فەلسەفەدا بەجۆرێك تێکەڵبوون کەجیاکردنەوەیان زۆر سەختە و قوتابی ئەو هونەرە شتێکی دەست ناکەوێت، هەروەك چۆن بەیزاوی لە (توالع) دا ئەم شێوازەی بەکار هێناوە ئەوانەشی کەلەزانایانی ئێران تەقلیدی ئەمیانکردووە بەهەمان ڕێگەی ئەمدا ڕۆشتوون. شتێك هەیە کەهەندێك جار زانستخوازان بەهۆی ئەوەوە گرنگی بەم تەریقەیە دەدەن بۆ ئەوەی ئاگاداری تەریقەی شەڕەبەڵگە(محاججە)و مونازەرە ببنەوە چونکە لەم تەریقەیەدا بەڵگەهێنانەوە زۆرو فراوانە. بەلاّم بۆ پەیڕەوی لەتەریقەی سەلەف لەعەقیدەکانی عیلمی کەلامدا دەبێت تەنها بگەڕێنەوە بۆ تەریقەی کۆنی موتەکەلیمەکان کەئەصڵەکەی دەتوانرێت لەکتێبی (ارشاد) و دانراوی ئەوانەدا بدۆزینەوە کەلەخاوەنەکەی پەیڕەویان کردووە. وەهەرکەسێك کەبیەوێت لەعەقیدەکانیدا ڕەتی فەیلەسوفەکان بداتەوە پێویستە بگەڕێتەوە بۆ کتێبەکانی غەزالی و ئیمام ئیبن الختیب (فخرالرازی). لەم جۆرە کتێبانەدا هەرچەندە دژایەتی زاراوە کۆنەکان کراوە، بەلاّم مەسەلەکانیان لەگەڵ

فەلسەفەدا ئاوێتە نەبوون و بابەتەکەیان هەروەك چۆن لەتەریقەی پاشینان (متاخران) ی دوای ئەواندا هاتووەو دەبینرێت تێکەڵی یەکتری نەبوون. بەکورتی پێویستە کەبزانین ئەم زانستەی کە ناسراوە بەعیلمی کەلام لەم سەردەمەدا بۆزانستخوازان پێویست نیە، چونکە بێباوەڕان و بیدعەچیەکان لەناوچوون و کاری ئەهلی سوننەت لەوەی کەنوسیویانە و دایانناوە بۆ ئێمە بەسە و پێویستبوون بەبەڵگە کاتێك دەبێت کەلەکاتی بەرگریدا بن، بەڵام ئێستاکە لەو بەڵگانە کەبێجگە لەو کەلامەی کەخودای گەورە لەموبهەماتو زاراوەکانی تەنزیە بکات شتێکی ئەوتۆ نەماوەتەوە.

جونەید دایبەلای هۆزێکدا کەلەنێویاندا هەندێك لەموتەکەلیمانیان تێدا بووکەدووبارە خۆیان سەرقاڵی عیلمی کەلام کردبوویەوە. و پرسی ئەم گروپە کێن؟ گوتیان ئەمانە ئەوکەسانەن کەخودا بەبەڵگە لەسیفەتەکانی حدوس و نیشانەکانی نەقس بەدوور دەگرن. جونەیدیش گوتی: (نەفی عەیب لەشوێنێکدا کەعەیبی تێدا مەحاڵ بێت عەیبەیە) بەڵام لەگەڵ هەموو ئەمانەدا عیلمی کەلام بۆ تاکەکانی خەڵك و زانستخوازان سود گەلێکی بەئیعتیباری هەیە، چونکە کەسێك پارێزەری سوننەتە نەزانینی بەڵگە هێنانەوە نەزەریەکان لەبارەی سەلماندنی عەقیدەکانەوە شتێکی پەسەند نیە. خوداش دۆستی ئیماندارانە[١٩٠].

---

[١٩٠] (وَاللَّهُ وَلِيُّ الْمُؤْمِنِينَ) س ال عمران ئا ٦١.

# بەشێك

## لەبارەی ئاشكراكردن و جیاكردنەوەی حەقیقەت لەموتەشابیهاتی[١٩١] كیتاب ( قورئان ) و سوننەت و ئەو جیاوازیانەی كەبەهۆیانەوە لەعەقیدەی تایفە سوننیەكان( پەیڕەوانی سوننەت ) و بیدعەچیەكاندا ڕوویداوە

دەبێت ئەوە بزانین كەخودا (سبحانە) پێغەمبەری (ص) لەنێو ئێمەدا هەڵبژارد، بۆ ئەوەی ئێمە بانگبكات بۆ سەرفرازی و بەختەوەری لەنیعمەتەكانی خۆیداو، قورئانی بەزمانێكی عەرەبی ڕوون و ئاشكرا نازڵكرد و تێیدا كۆمەڵێك تەكلیفی خستە سەرشانی ئێمە كەدەبنە هۆی ڕێنمایی كردنمان بەرەو بەختەوەری و لەناوەڕۆكی ئەم خیتابەشدا پێویستبوو سیفەت و ناوەكانی خودا باسبكات تاوەكو زاتی خۆیمان پێ بناسێنێت بەپاراوی وابەستەبوونی مرۆڤ و وەحی باسبكاتو، ئەو فریشتانەشی كەمیانیگەری نێوان ئەوو پێغەمبەرانن ناویان بهێنێت و هەم لەو كتێبەدا باسی ڕۆژی دوایی و هەواڵە هەڕەشە ئامێزەكانی پەیوەست بەوەوە بكات، بەلاّم بەهیچ شێوەیەك كاتەكەی بۆ ئێمە دیاری نەكردووە. وەهەم لەم قورئانەدا حەرفە مەقتەعیەكان لەئەلف باوە لەسەرەتای هەندێك

---

[١٩١] موتەشابیە ئەوەیە كەماناو حەقیقەتەكەی دیار نیە و دژی موحكەماتە كەلەقورئاندا لەئایەتی ٥ ی سورەتی ال عمراندا ئامـاژەی پێكـراوە، بەسـورەتە موحكەمـەكان دەڵـێن سـورەتی غـەیرە مەنسـوخە، ئایەتـە موحكەمەكانیش بریتین لەئایەتە ڕوون و ئاشكراكان كەبیسەر بەهۆی ڕوونی ماناكەیانەوە پێویستی بەتـەئویل و تەفسیر نیە وەك چیرۆكی پێغەمبـەران. وەلەبەرامبـەر ئەمانەشـوە پێیـان دەڵێن موتەشـابیهات (موتەشـابیهات وەك: (الرَّحمانُ عَلى العَرشِ استَوى). (موحكەمات: (قُل تَعالَوا أتلُ ماحَرَّمَ ربُّكُم عَلَيكُم) س الانعام ئا ١٥١)

لەسورەتەکانەوە دەبینرێت کەرێگەیەکمان نیە بۆ تێگەشتن لێیان هەموو ئەمانەش دەچنە ژێر ئایەتە موتەشابیهەکانەوە و خوداش رێگەی نەداوە مرۆڤ بەشوێن ماناکەیاندا بگەرێت. هەروەك چۆن دەفەرمێت: (هەرئەوە کەکتێبی بۆتۆ نارد هەندێك لەئایەتەکانی موحکەماتن و هەندێکیشیان موتەشابیهاتن‌و ئەوانەی کەدڵ نەخۆشن ئەوا دەکەونە شوێن ئایەتە موتەشابیهەکان بەمەبەستی نانەوەی فیتنەو تەئویل کردنیان کەس بێجگە لەخودا لەتەئویلەکەیان نازانێت، زانایانی بلیمەت لەم ئایەتانەدا دەڵێن ئیمانمان پێیانەو هەموویان لەلایەن خوداوە هاتوون وتەنها خاوەن و دڵ و ژیریەکان والێدەکات کەبیر بکەنەوە)[192]. وەهاوەلآنی زانای سەلەف و تابیعین ئەم ئایەتەیان بەم شێوەیە ئاراستەکردووە کە (محکمات) بریتین لەو ئاپەتە روون و ئاشکرایانەی کەئەحکامەکانیان نەگۆرە، هەربۆیە فەقیهەکان لەزاراوەکانیاندا دەڵێن (موحکەم شتێکە کە ماناکەی روونە)، بەلآم لەبارەی موتەشابیهاتەوە چەندین بۆ چوونیان هەیە هەندێك گوتوویانە: موتەشابیە ئەو ئایەتانەن کەبەهۆی تەعاروزیانەوە لەگەڵ ئایەتەکانی تر یان ئەقڵدا، بۆ دەرخستنی مانای راستیان پێویست بەئەندێشەو تەفسیر دەکات بەهۆی ئەم تەعاروزەوە دەلالەت و ماناکەیان بەشاراوەیی دەمێنێتەوەو بەپێی ئەم تیۆرە ئیبن عەباس گوتوویەتی: موتەشابیە گوفتار گەلێکن کەئیمانی پێ دەهێنن، بەلآم کاری پێ ناکەن). موجاهید و عەکرەمەش گوتوویانە (هەرئایەتێك بەدەر بێت لەئایاتی ئەحکام و چیرۆکەکان ئەوە موتەشابیهە). قازی ئەبو بەکری باقلانی و ئیمام الحرمین لەگەڵ ئیبن عەباسدا هاورابوون.

سەوری و شەعبی و گروپێك لەزانایانی سەلەف گوتوویانە: موتەشابیە ئەو ئایەتانەن کەرێگەیەك بۆ زانینیان نەبێت وەك: نیشانەکانی هاتنی قیامەت و کاتی ئەو سزایانەی

---

[192] (هُوَالّذي أنزَلَ عَلَيكَ الكِتابَ مِنهُ آياتُ مُحكَماتٍ وَأُخَرُ مُتَشابِهات فَأَمّاالّذينَ فِي قُلُوبِهِم زَيغٌ فَيَتَبِعُونَ ماتَشابَهَ مِنهُ ابتِغاءَ الفِتنَةِ وَابتِغاءَ تَأويلِهِ وَما يَعلَمُ تَأويلَهُ إلّا الله وَالرّاسِخُونَ فِي العِلمِ يَقُولُونَ آمَنّا بِهِ كُلٌّ مِنْ عِندِ رَبِّنا وَما يَذَّكَّرُ إلّا أُولُوالألباب) س ال عمران ئایەتی ٧ تاوەکو کۆتایی ئایەتەکە.

کەخەڵکیان پێ ترسینراوە و پیتە تەهەجیەکانی سەرەتای سورەتەکان. لەئایەتێکدا دەفەرمێت: (ئایەتە موحکەمەکان بەئەصڵ و بنچینەی کیتاب دادەنرێن) واتە بەشی هەرەزۆریان. هەربۆیە موتەشابیه بەشی کەمی قورئانە و هەندێك جاریش هەندێکیان لەریزی موحکەمەکاندا دەهێنرێن. هەربۆیە خودا شوێنکەوتەکانی ئایەتە موتەشابیهەکانی لۆمە کردووە بەهۆی ئەوەی کە بەزمان و ماناگەلێك تەفسیریانکردوون کەلەتێگەشتنی عەرەبیەوە دوورن‌و خەڵکی لێیان تێ ناگەن. کەپێیان گوتوون ئەهلی زەیغ واتە لادەر لەحەق وەك کافران و بێباوەڕان و نەفامانی بیدعەچی و فەرموویەتی ئەم کارەشیان بەمەبەستی نانەوەی فیتنەیەو وەك شیرك یان هەڵەیە لەدژی باوەڕدارانە، وەیان بەپێی ئارەزووی خۆیان بەهەرشێوەیەك کەبیانەوێت تەئویلیان دەکەن و لەبیدعەکانیاندا پەیڕەویان لێدەکەن. لەپاشان خودا دەفەرمێت: کەتەئویلەکەیان تایبەتە بەخودا خۆیەوەو تەنها خۆی ماناکەیان دەزانێت (تەنها خودا تەئویلەکەیان دەزانێت)و دواتریش ستایشی زاناکان دەکات، ئەوانەی کەباوەڕیشیان بەئایەتە موتەشابیهەکان هەیە، هەربۆیە سەلەف (راسخون) بەشێوەی (استیناف)[١٩٣] باسکردووەو لەعەتفەکە بەباشتری زانیوە، چونکە ئیمان بەغەیب لەسوپاسکردندا لەپێشترە.

وەئەگەر واوەکە بەعاتیفە بزانین و (راسخون) بەعەتف وەربگرین ئەوکات دەبووە باوەڕ بەحازر و بینراو، چونکە ئەوان لەم کاتەدا تەئویل نازانن و لەئەنجامدا نابێتە غەیب‌و فەرموودەکەی خودا کەدەفەرمێت: (هەمووی لەلایەن پەروەردگارەوەیە) یارمەتیدەری ئەم مانایە و ئەوە نیشاندەدات کەتەئویلەکەی بۆ مرۆڤ نادیارە، چونکە لەزاراوەکانی عەرەبەوە مانا گەلێك تێدەگەین کەعەرەب بۆ ئەو مانایانە دایانناون. کەواتە هەرکات ئیسنادی خەبەر بەموسنەدو ئیلەیهی مەحاڵ بێت ئەوکات لەمانای قسەکە

[١٩٣] استیناف لەبەکار هێنانی زمانەوانیدا لەناو نەحوودا ئەوەیە کەووشەیەك عەتف نەکەینەوە سەر پێش خۆی‌و واوەکە بەواوی عەتف نەزانین و چونکە ووشەی ناوبراو لەزمانەوانیشدا بەمانای دەستپێکردنیش هاتووە..

تێناگەین. وەئەگەر وەها دەستەواژەگەلێك لەلای خودا بکەوێتە دەستمان ئەوکات زانینیان بەئەرکی خۆی دەزانین و خۆمان بەماناو مەدلولەکەیانەوە سەرقاڵ ناکەین چونکە ڕێگەیەکمان نیە بۆ تێگەشتن لێیان، عائیشە (ڕ ن) فەرموویەتی: (هەرکات کەسانێکتان بینی کەلە ئایەتەکانی قورئاندا موجادەلە دەکەن دەبێت بزانن ئەوانە هەمان ئەو کەسانەن کەخودا ویستوونی، واتە ئەو بەشەی ئایەتەکە (فی قلوبهم زیغ) دڵیان بەلارێدا چووە، کەواتە لێیان دوور بکەوەرەوە.

شێوە و عەقیدەی سەلەف لەبارەی ئایەتە موتەشابیهەکانەوە بەم جۆرەیەو لەسوننەتیشدا زاراوەگەلێك هاتوون کەوەك ئەم جۆرە ئایەتانەن و ئەو گروپە وەك ئایەتە موتەشابیهەکان تەئویلیان دەکەن. وەهەرکات جۆرەکانی موتەشابیە بەپێی ئەوەی کەباسمانکرد سەلمێنرا کەواتە دەبێت بگەڕێینەوە سەر ئەو شتانەی کەخەڵکی جیاوازیان هەیە لەبارەیانەوە. هەربۆیە ئەو ئایەتانەی کەپەیوەستن بە ڕۆژی دوایی و نیشانەکانیو شوێنی ئاگادار کردنەوە و ژمارەی فریشتەکان و دۆزەخیەکان (سندع الزبانیە)و پاسەوانانی دۆزەخ ناتوانرێت بەئایەتی موتەشابیهیان بزانین، خوداش داناترە. چونکە لەواندا زاراوەیەك نەهاتووە کەبتوانرێت ئاراستە بکرێن یان لێیان تێبگەین، بەڵکو ئایەتە ناوبراوەکان لەکاتەکانی ئەو ڕووداوانەیە کەبەپێی دەق (نص)ی قورئان زانیاری تێگەشتن لێیان تایبەتە بەخوداوە هەروەك چۆن ئەم مانایە لەقورئاندا لەزمانی پێغەمبەروە گوتراوە (زانیاریان لەلای خوداوەیە)، جێی سەر سوڕمانیشە کەهەندێك لەڕیزی موتەشابیهەکاندا دایانناون. بەڵام پیتە مەقتەعەکانی سەرەتای سورەتەکان لەڕاستیدا لەحەرفەکانی هەجائن دوور نیە کەماناگەلێکی تایبەتیان لێوە ئیرادە کرابێت هەروەك چۆن زەمەخشەری گوتوویەتی: ئەم پیتانە ئاماژەن بە ئامانجی بڵندی ئیعجاز، چونکە قورئانێك کەنازڵبووە لەو پیتانە پێکهاتووەو مرۆڤەکان لەتێگەشتنیاندا یەکسانن، بەڵام لەپاش تەرکیبکردنیان دەبینین جیاوازیەکی زۆر لەتێگەشتن و نێوانیاندا هەیە، وەئەگەر پیتە نابراوەکان کەمانای حەقیقەت دەگەیەنن لەمانای ڕاستەقینەیان لابدەن، واتە بەبێ

تەرکیب و بەشێوەی مەقتەع بهێنرێن لەم کاتەدا دەبێت وەك چۆن لەنەقڵە ڕاستەکەیاندا هاتوون بهێنرێن، هەروەك دەڵێن (طه) یان (طاهر) (هادی) و نمونەی ئەمانە. وەئێستەکە نەقڵی صەحیح دژوار و نەگونجاوە، هەربۆیە نەزەریەی موتەشابیە لەبارەیانەوە بەدی دێت. بەڵام لەبارەی وەحی فریشتەکان و ڕۆح و جنۆکەوە دەبێت بڵێین کەموتەشابیە بوونیان لەو ڕووەوەیە کەمانا دەلالەتی ڕاستەقینەیان شاراوەیە، چونکە ماناناویراوەکان لەمانا باوو ئاساییەکان نین کەهەمووان بیانزانن و بیانناسن هەربۆیە ئایەتە ناوبراوەکان لەریزی موتەشابیهاتدا هێنراون.

هەندێك جار هەندێك لەخەڵکی هەموو ئەو مەسەلانەی کەلەڕوانگەی ماناوە هاوشێوەی ئەوانن دەلکێنن بەبابەتی ناوبراوەوە وەك: چۆنیەتیەکانی ڕۆژی دوایی و بەهەشت و ئاگر و (دۆزەخ) دەجال و ئەو فیتنانەی کە بەرلەقیامەت ڕوودەدەن و نیشانە مژدە بەخشەکانی بەرەلەقیامەتو ئەوەی کەدژی نەریتە ئاساییەکانی خەڵکیەو ئەم بیرۆکەیەش هێندەش لەحەقیقەتەوە دوور نیە، بەڵام جمهوری زانایان و بەتایبەت موتەکەلیمان هاوڕانین لەگەڵ ئەم بۆچوونەدا، بەجۆرێك کەتەفسیر و تەوجیهی هەریەکەیان هەروەك چۆن لەکتێبەکانیاندا دەیبینین دیاریان کردووە هەربۆیە موتەشابیهێك نامێنێتەوە بێجگە لە سیفەتە تایبەتەکانی خودا کەلەکتێبەکەیداو لەسەر زمانی پێغەمبەرەکەیەوە باسی کردوون، وەك ئەو سیفەتانەی کەبەڕواڵەت باسی باسی نوقسان یان نەتوانی دەکات خەڵکیش لەپاش سەلەف کەشێواز و عەقیدەیانمان باسکرد لەبارەی ئەم دیاردانەوە جیاوازیان هەبووە دژایەتی یەکتریان کردووە و لەئەنجامدا بیدعە چووەتە ناو بیروباوەڕ و عەقیدەیانەوە ئێستەش باسی شێواز عەقیدەکانیان دەکەین، هەوڵدەدەن تیۆرە صەحیحەکان بەباشتر بزانین لەخراپەکان و لە سەرکەوتنیشمان لەمکارەدا تەنها داوای یارمەتی لەخودا دەکەین: دەبێت ئەوە بزانین کەخودا (سبحانە) لەکتێبەکەی خۆیدا خۆی بەم سیفەتانە وەسفکردووە: دانا —توانا — مورید — زیندوو — بیسەر — بینا — گۆیا — جەلیل — کەریم — جەواد — مونعیم — عەزیز — عەزیم و،

وەهەروەها بۆ خۆی دوو دەست و دوو چاوو دووگوێ و زمان و نمومەی ئەمانەی سەلماندووە هەربۆیە هەندێك لەم سیفەتانە ڕاستیەتی خودابوونی ئەو دەسەلمێنن وەك: زانست و توانایی‌و ئیرادەو ژیان کەمەرجی هەموویانەو دەستەیەکیان دەبنە سیفەتی کەماڵ وەك بیستن و بینین و قسەکردن و، هەندێکیش دەبنە مایەی گومانی نەقس وەك: جێگیر بوون و دابەزین و هاتن و ڕوخسار و دەستەکان و چاوو کەلەسیفەتی بوونەوەرانی حادیس دەژمێردرین. سەرەڕای ئەمەش شارع هەروەك لەصەحیحدا هاتووە (صحیحی بوخاری) پێی ڕاگەیاندووین کەئێمە پەروەردگاری خۆمان لەڕۆژی قیامەتدا وەك مانگ لەشەوی بەدردا دەیانبینین بەجۆرێك کەهیچ کەسێك بێبەش نابێت لەدیداری ئەو، بەڵام صەحابەی سەلەف و تابیعین سیفەتی سابیت و کەماڵیان بۆ خودا سەلماندووەو لەبارەی ئەوانەشی کە نوقسان و کەموکورتی دەگەیەنن بێدەنگ بوون و، سپاردوویانە بەخودا خۆی بەڵام لەپاش ئەمان لەنێو خەڵکیدا جیاوازی دروستبووەو لەپاش دەرکەوتنی موعتەزیلە ئەوان ئەم جۆرە سیفاتانەیان وەك ئەحکامگەلێکی ڕووتی زەینی وەرگرتووەو، وەك سیفەتێکی نەگۆڕ کەقائیم بێت بەزاتی ئەو سەلماندووەو بەم مانایان گوتووە یەکتاپەرستی (توحید)و، مرۆڤیان بەئافەرێنەری کردارە خراپەکانی خۆی زانیوەو نەیانبەستووەتەوە بەهێز و دەسەلاتی خودای گەورەوە، چونکە ئەنجامدانی ئەم کارانە لەلای حەکیم (خودا) وە قەدەغەن و ڕەچاوکردنی باشترین کاری لەسەر بەندەکانی واجب کردووەو بەم مانایەشیان گوتووە دادپەروەری.

سەرەڕای ئەمەش پێشتر باوەڕیان بە نەفی چارەنوس و قەزاو قەدەر ئەوەی کەهەرکارێك پێشتر زانیاریەکی حادیس و هێز و ئیرادەیەکی حادیس هەبووە، هەروەك چۆن لەصەحیحدا حەدیسێك لەمبارەیەوە هاتووە و عبداللەی کوڕی عومەر لەمەعبەدی جوهەنی یارانیەوە کەباوەڕیان بەم عەقیدەیە هەبووە تەبەری گەڕاوە بەدوایدا. نەفی

قەدەرەکان دواتر دراوەتە پاڵ واصیلی کوڕی عەتای غەزال[١٩٤] قوتابی حەسەنی بەصری کەلەسەردەمی عبدالملکی کوڕی مەروان[١٩٥] کەپێشەوای موعتەزیلەکان بووە کۆتایی دێت. وەدواتریش سەرئەنجام گەشتووە بەمعمری سەلەمی، بەڵام لەپاش ماوەیەك گروپێك لەپەیڕەوانیان لایانداو لەوانەش ئەبو الهزیلی عەلاف کەلەگەورەکانی موعتەزیلە بووەو ئەم تەریقەیەی لەعوسمانی کوڕی خالیدی تەویلەوە وەرگرتووەو کەلەیەکێك لەقوتابییەکانی واصیلەوە وەریگرتبوو. کەیەکێك بوو لەدژەکانی قەدەر. ئەبو الهزیل لەبابەتی نەفی سیفاتی وجودی لەعەقیدەی فەیلەسوفانی یۆنانەوە وەرگرتووە کەلەو سەردەمەدا تیۆرەکانیان دەرکەوتبوون.

دواتریش ئیبراهیمی نەزام[١٩٦] دەرکەوت باوەڕی بەقەدەر هەبوو گروپێك پەیڕەویان لێکردووە و کتێبی فەیلەسوفەکانی خوێندوەتەوە و بەتوندی نەفی سیفەتەکانی کردووەو بنەماکانی موعتەزیلەی پایەدار کردووە. دوای ئەوانیش جاحیز و کەعبی دەرکەوتن و تەریقەکەی ئەمانیان بەناوی عیلمی کەلامەوە دەخوێندەوە بەهۆی ئەوەی کەبەڵگە هێنانەوە و جیدال هەبووەو ناویاننناوە کەلام، یان بەهۆی ئەوەی کەئەصڵی تەریقەکەی ئەمان لەسەر نەفی سیفەتی کەلام دامەزراوە، هەربۆیە شافیعی دەڵێت: (ئەوانە شیاوی ئەوەن کە بەلقی دارخورما دارکاری بکرێن و بەناو کوچە و کۆڵانەکاندا بیانگێڕن) گروپی ناوبراو تەریقەی موعتەزیلەیان بەهێز کرد و، هەندێك لەئوصولەکەیان سەلماند و هەندێك یاساشیان ڕەتکردەوە، تائەوەبوو ئەبوالحسنی ئەشعەری هات و لەگەڵ هەندێك لەمەشایخەکانیاندا لەمەسەلەکانی صلاح (باشترو) باشترین (اصلح) مونازەرەی کرد و وازی لەتەریقەکەیان هێنا. ئەو بۆ چوون و ڕەئیەکانی عبداللەی کوڕی سعیدی کوڕی

---

[١٩٤] لەمەدینە لەساڵی ٨٠ ك (٧٠٠ – ٦٩٩ ن) لەدایك بووە، عەقیدەی موعتەزیلەی هەبووە و لەبەصرە فێری بووە و لەساڵی ١٣١ ك (٧٤٩ – ٧٤٨ ن) مردووە.

[١٩٥] پێنجەمین خەلیفەی بەنی ئومەییە.

[١٩٦] ئیبراهیمی کوڕی سیار نەزامی بەصری لەقوتابییەکانی ئەبو الهزیل بووە.

کیلاب‌و ئەبوالعباسی قلانسی‌و حەرسی کوڕی ئەسەدی محاسبی کەلەپەیڕەوانی سەلەف‌و تەریقەی سوننەت بوو پەسەند کردو، گوفتارەکانیان بەبەڵگەهێنانەوەکانی عیلمی کەلام پشتگیری کرد و سیفەتی قائم بەزاتی خودای گەورەی وەك عیلم و هێز و ئیرادەی سەلماند تاوەکو بەڵگەو دەلیلی تمانع[١٩٧]و ڕاستیەتی موعجیزەی پێغەمبەران بسەلمێت، لەوانەش لەمەزهەبی ئەماندا قسەو بیستن و بینینیان دەسەلماند چونکە هەرچەندە ڕواڵەتەکەیان هۆکارەکەی وەهمێکی نوقسانە، کەبریتیە لەئاواز و قسەکردن، هەردووکیشیان شتانێکی جەستەیین، بەلاّم بۆ قسە لەزمانی عەرەبدا، بێجگە لەقسەکردن مانای تریشی هەیەو بریتیە لەشتێك کەبەدڵدا بێت و حەقیقەتی مانانی کەلام جۆری دووەمە، ئەوەك مانای یەکەم.

لەم ڕووەوە ئەم مانایەیان بۆ خودای گەورە سەلماندووە و گومانی نەقسیان لێوە دوور خستوەتەوە ئەوەیان سەلماندووە کەئەم سیفەتە کۆنە و پەیوەستبوونی لەڕووی سیفەتەکانی ترەوە گشتیەو ووشەی قورئان ناوێکی هاوبەشبوو لەنێوان کەلامی نەفسانی کەسیفەتێکی کۆنە و، تایبەتە بەزاتی خوداوە و ئەو شوێنەوارە تازە و موحدیسە کەبریتیە لەپیتە پێکهاتووەکان و بەئاوازەوە دەخوێنرێتەوە. هەربۆیە هەرکات بگوترێت کۆن مەبەست دەستەواژەی یەکەمە و هەرکاتێکیش بگوترێت خوێنراوەتەوە، بیستراوە ماناکی دەلالەتکردنی خوێندنەوە و نوسینە لەسەری.

ئیمام ئەحمەدی کوڕی حەنبەل لەبەکارهێنانی لەفزی حدوس خۆی بەدوور دەگرت. چونکە لەئیمامانی سەلەفەوە نەبیسترابوو کەبڵێن قورئانە نوسراوەکان یان ئەو خوێندنەوەیەی کەبەسەر زماندا دێت کۆنە، بەلاّم لەبینین و موشاهەدەدا بەموحەدیس دەبینرێن. ئەوەی کە ئەوی لەپەیڕەویکردنی ئەم جۆرە تیۆرانە ڕێگری دەکرد پەرهیزکاری ئەو بوو ووردبوونەوە لەغەیری تەریقەی سەلەف لەدیدی ئەودا وەك ئینکاری

---

[١٩٧] تەمانوع لێرەدا بەمانای ڕێگری دوولایەنە یان بەریەککەوتنی ئیرادەکانە کەوەك دەلیلێك بۆ سەلماندنی تاك‌و تەنهایی خودا بەکاریان هێناوە.

زەروریاتی دین وابوو، هەریۆیە خۆی لەوەها ڕێگەیەك لادەدا. بەڵام بیستن و بینین هەرچەندە دەبنە مایەی وەهمی ئەندامەکان، بەڵام لەڕووی زمانەوانیەوە دەلالەتی دەکردە سەر ئیدراکی بیستن و بینینیش هەریۆیە وەهمی نەقس لەم کاتەدا لەو دادەڕنرێت، چونکە مانای ناوبراو یەك حەقیقەتی زمانەوانیە لەووشە ناوبراوەکاندا. بەڵام زاراوەکانی (استوا) جێگیر بوون و هاتن و دابەزین و ڕووخسار و دەست و چاوو نمونەی ئەمانە بەڕێگەیەکی تر لێکۆڵینەوەیانکردووە بەهۆی وەهمی نەقصی موشابەهەتەوە (لێکچوون) لەحەقیقەتی زمانەوانیان لایانداوە بەپێی شێوەی عەرەب کەلەکاتی دژواری دەرکی حەقیقەتی زاراوەکاندا ڕێگەی مەجازیان هەڵدەبژارد، ئەمانیش سەیری مانا مەجازیەکانیان دەکرد وەك گوفتاری خودای گەورە (لەبارەی دیوارەکەوە) کەئەیویست بێتە خوارەوە.[198] نمونەی ئەمانە کەلەلای عەرەب شێوەیەکی بەناوبانگیان هەیە هەموویان دەیانزانن و شتێکی تازە نیە. ئەوەی کەئەمانی ناچار بەم جۆرە تەئویلە کردووە لەگەڵ ئەوەی کەدژی مەزهەبی سەلەفیشە و بەخودایان سپاردووە، وەك موتەشابیهات و لەماناکەیان بێدەنگ بوون ئەوەیە کەگروپێك لەپەیڕەوانی سەلەف واتە موحەدیسەکان و پاشینانی گروپی حەنبەلی[199] توشی ئاراستەکردنی ئەم سیفەتانە بوون.

وەئەوانیان خستووەتە سەر سیفەتە نەگۆڕەکانی خودا کەچۆنیەتیەکەیان نادیارە و لەبارەی (وەستانیەوە لەسەر عەرش) (الرحمن علی العرش استوی) وە دەڵێن ئیستیلا و ئیستیقرار، بۆ ئەو بەپێی مەدلول و مانای لەفزەی (استوا) دەسەلمێت و ئەم

---

[198] (فوجد فيها جدارا يريد ان ينقض فاقامة) س کهف ئا ٧٦.

[199] پەیڕەوانی ئیمام ئەحمەدی کوڕی حەنبەلی مروزی (١٦٤– ٢٤١ك) پێیان دەگووتن حەنابیلە یان حەنبەلیەکان، کەزۆربەیان لەموحەدیسەکان بوون چونکە بەگووتەی خاوەنی بیان الادیان لاپەڕە ٣١ مەزهەبی حەنبەلی فیرقەیەکن لەفیرقەکانی موحەدیسەکان و لەقەب و نازناوی خودی ئەحمەدی کوڕی حەنبەل ئیمام المحدسین بووەو، بەگووتەی هەندێك لەمێژوو نووسانی بەهەزاران حەدیسی لەبەر بووەو، گروپێك لەگەورەکانی حەدیس وەك محمدی کوڕی ئیسماعیل بوخاری و موسلیمی کوڕی حەجاجی نەیشابوری حەدیسیان لەوەوە نەقڵکردووە و کتێبی مسند الامام لەدانراوەکانی ئەوە، کە سی هەزار حەدیسی تێدایە و بیست و چوار بەرگە.

ئاراستەکردنە لەم ڕووەوە بەپێویست دەزانن نەوەك مەدلولی لەفزەکە وەلابخرێت و دەڵێن ئێمە بۆ خۆلادان بەباوەڕبوون بەتەشبیهێك کەئایەتەکانی سەلوب نەفیان دەکەن باوەڕیان بەچۆنیەتی ئەوان نیە وەك ئەم جۆرە ئایەتانە: هیچ شتێك وەك ئەو نیە[٢٠٠] پاکو بێگەردی بۆ خودا لەو شتانەی کەباسی دەکەن[٢٠١]، خودا بەرزو بالآترە لەوەی کەموشریکان دەیڵێن[٢٠٢]، نەلەکەس بووە و نەکەسیشی لێدەبێت[٢٠٣]. نازانن کەئەوان لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا لەدەرگای تەشبیهەوە هاتوونەتە دەرەوە لەوەی کە باوەڕیان بەسەلماندنی (استوا) هەیە و ئەمە لەکاتیکدا (استوا) لەلای زمانەوانەکان بەمانای ئیستیقرار و جێگیر بوونە ئەمەش سیفەتی جەستەییە.

وەئەوەی کەبەشێوازی ناشیرینی خۆیان لەوازهێنان لەلەفزەکە بێزارن هیچ شتێکی تێدانیە کەجێگەی حەزەر لێکردن و سڵەمینەوەبێت، بەڵکو حەزەر کردن لە وەلاوەنانی ئولوهیەتدایە، وەهەروەها شێوازێکی ناشیرینی تەحەمول نەکراو لەئیلزامی تەکالیفەکاندا دەگرنە بەر لەکاتێکدا ئەم شێوازە وەهم و تەزویرێك زیاتر نیە، چونکە لەتەکالیفەکاندا شتانی موتەشابیە ڕوویاننەداوە ئەوکات بانگەشەی ئەوە دەکەن کەئەم شێوەیە مەزهەبی سەلەفە. ئەمە لەکاتیکدا ئەوان هەرگیز وەها مەزهەبێکیان نەبووە پەنا بەخودا لەوەها دانە پاڵێك. بەڵکو مەزهەبی سەلەف هەروەك پێشتر باسمانکرد بریتیە لە ڕاسپاردنی مەبەست لەو ئایەتانەیە بەخودا و بێدەنگ بوون لەبارەی هەڵبژاردنی ماناکەیانەوە.

وەهەندێك جاریش بۆ سەلماندنی ئیستیوا بۆ خودا بەڵگە بەقسەکەی مالیك دەهێننەوە کەگوتوویەتی: ئیستیوا دیارە بەڵام چۆنیەتیەکەی نادیارە، بەڵام مەبەستی مالیك ئەمە نیە کەسەلماندنی ئیستیوا بۆ خودا دیارو ئاشکرایە تاوەکو قسەیەکی لەو شێوەیەی

---

[٢٠٠] (لَيسَ كَمِثلِه شَيء) س الشورى ئا ٩.

[٢٠١] (سُبحانَ اللهِ وَتَعالا عَمَّا يَصِفُون) س المومنون ئا ٩٣.

[٢٠٢] (تَعالَى عَمَّا يُشرِكُون) س النمل ئا ٦٤.

[٢٠٣] (لَم يَلِدْ وَلَم يُولَد) س اخلاص ئا ٣.

بدرێتە پاڵ، چونکە ئەو دەزانێت کەمانای ئیستیوا لەزمانەوانیدا دیارە کەهەمان سیفەتی جەستەییە چۆنیەتیەکەی بەمانای حەقیقەتەکەیەتی، چونکە حەقیقەتی سیفەتەکان بریتین لەچۆنیەتیەکانیان و سەلماندنی ئەم چۆنیەتیانەش بۆ ئێمە نادیارن. وەهەروەها بۆ سەلماندنی شوێن بەحەدیسی (سوداء)[٢٠٤] بەڵگە دەهێننەوە کەپێغەمبەر (ص) لێی پرسی خودا لەکوێیە؟ ئەویش گوتی لەئاسمان. پێغەمبەر(ص) فەرمووی: دەبێت ئازاد بکرێت چونکە ئەو لە ژنە باوەڕدارەکانە، وەپێغەمبەر (ص) بەهۆی ئەوەی کەئەو شوێنی بۆ خودا دیاریکردووە.. بەڵام باوەڕەکەی تەصدیق نەکرد، بەڵکو بەهۆیەوە بوو کەبەئیماندار ناوی برد کەباوەڕی بەوە هەبووە کەخودا لەئاسماندایە، هەربۆیە لەڕیزی ئیماندارە بەهێزەکاندا هەژمار کرا و باوەڕیان بەئایەتە موتەشابیهەکان هەبووە بەبێ ئەوەی بەشوێن ماناکانیدا بگەڕێن.

وەدڵنیایی بەنەفی شوێن (مکان) بەدوو شت دێتە دی: یەکەم: بەڵگەی ئەقڵ کەپێویستبوون و ئاتاجی لەخودا دادەڕنێت، دووەمیش: بەڵگەکانی سەلوب کەبێگەردی و تەنزیهی ئەو ئاشکرا دەکەن وەك: هەر ئەوە خودا لەئاسمان و زەویدا[٢٠٥] چونکە یەك بوونەوەر ناکرێت لەیەك کاتدا لەدوو شوێن بێت. هەربۆیە بەشێوەیەکی قەتعی لەم ئایەتەدا مەبەست شوێن (مکان) نیە، بەڵکو مەبەست شتێکی ترە. دواتر حەنبەلیەکان ئەو ئاڕاستەکردنەی کەلەبارەی دیاردەکانی ڕووخسار و دووچاوو دوودەست و دابەزین و قسەکردنیان بەپیت و دەنگ دروستکردبوو خستیانە لاوە و، مانا گەلێك کەلە شتەجەستەییەکان گشتی ترن داناو خودایان لەمانای جەستەیی بەدوور دەگرن لەگەڵ ئەوی کە ئەم ئاڕاستەکردنە گونجاو نەبوو لەگەڵ بنەماکانی زمانی عەرەبیدا، بەڵام یەکەمین و کۆتا بەڵگە هێنانەوەیان پشتی بەوە بەستبوو.

---

[٢٠٤] سەوداء کەنیزی موعاویەی کوڕی حاکم بووە، کەدەیویست ئازادی بکات و لەمبارەیەوە ڕاوێژی لەگەڵ پێغەمبەر کرد بۆ ئەوەی باوەڕو عەقیدەی تاقیبکاتەوە بۆ ئەوەی ئەگەر شیاوی ئازاد کردن بێت ئەوا ئازادی بکات.

[٢٠٥] (وَهُوَ اللهُ فِي السَّموات وَالأرض). س الانعام ئا ٣.

هەربۆیە ئەهلی سوننەت و موتەکەلیمەکان ئەشعەری حەنەفی نەفرەتیان لێدەکردن عەقیدەی ئەمانیان لەمبارەیەوە واز لێهێناو، لەنێوان موتەکەلیمانی حەنەفی بوخارا و ئیمام محمدی کوری ئیسماعیلی بوخاری موناقەشەگەلێك ڕوویاندا کەزۆر بەناوبانگن. بەلاّم (موجەسەمیەکان) بەهەمان شێوە لەسەلماندنی جیسمیەتدا هەوڵی زۆریاندا و دەیانگوت: بەلاّم ئەو وەك جیسمەکان نیە. ئەمەلەکاتێکدا لەنەقڵکراوە شەرعیەکاندا ووشەی جیسم بۆ خودا نەبینراوە، بەڵکو سەلماندنی ئەم دیاردانە ئەوانیان لەدەرخستنی وەها تیۆرێکدا بوێر کردبوو. ئەوان تەنها دیاردە ناوبراوەکانیان بەبەس نەدەزانی، بەڵکو بەناویاندا ڕۆچوون و زیادەڕۆییان تێدا کرد و وەك بیروباوەڕی ئەو حەنبەلیانە جیسمیەتیان سەلماند و ئەویان لە پەستی بەدوور دەگرت کەدەیانگوت جیسمە نەك وەك جیسمەکان، ئێستەش ئەوەتا جسم لەزمانی عەرەبدا شتێکی قوڵ و سنوردارە. سەرەڕای ئەم تەفسیرەش دەیانگوت: ئەو قائم بەزات یان مورەکەبە لەگەوهەرەکانو نمونەی ئەمانە.

ئەوان زاراوەکانی موتەکەلیمەکانیان وەردەگرت و ماناگەلێکی تایبەتیان لێوە وەردەگرت کەدژی مەدلولی زمانەوانیان بوو، هەربۆیە موجەسەمیەکان لەبیدعەتو بەڵکو لەکوفریشدا زیاتر زیادەڕۆییان دەکرد، چونکە ئەوان سیفەتگەلێکیان بۆ خودا دەسەلماند کەدەبوویە هۆی وەهمکردن لەزاتی ئەودا، ئەم سیفەتانەش بەهیچ شێوەیەك نە لە کەلامی خودا و نە لە قسەی پێغەمبەرەکەیدا نەبینراوە. لەوەی کە ڕابوورد جیاوازی نێوان مەزهەبەکانی سەلەف و موتەکەلیمەکانی سوننی و موحەدیسەکانی حەنبەلیو بیدعە چیەکانی موعتەزیلەو موجەسەمیەکان ڕوون بوویەوەو لەنێو موحەدیسەکانیشدا گروپێك لەزیادەڕۆیان (غلات) دەبینرێن کەپێیان دەڵێن موشەبیهی، چونکە ئەوان خودا تەشبیە دەکەنو دەچوێنن بەشتەکانی ترەوە، بەجۆرێك کەدەگێڕنەوە یەکێکیان گوتوویەتی: تەنها لەمن پرسیار دەکەن لەبارەی ڕیش و ئەندامانی زاوزێی خوداوە، بێجگە لەمانە لەبارەی هەرشتێکی تریەوە کەبەبیرتاندا دێت پرسیارم لێبکەن. ئەگەر ئەم قسەیە

بەم شێوەیە ئاراستە نەکرێت کەمەبەستی ئەوان کورتکردنەوەی دیاردە وەهم هێنەرەکانی ناوبراو ئەوکات دەبێت بدرێنە پاڵ ئاراستەکردنێك کەئیمامەکانیان باوەڕیان پێیەتی، ئەوکات دەبێت بەقسەی ناوبراو بگوترێت کوفر و پەنا بەخودا لەم قسە کوفرانەو کتێبەکانی ئەهلی سوننەت پڕن لە دژایەتیکردنی ئەم جۆرە بیدعەت و کوفرانەو بەبەڵگەی ڕاست و دروستەوە ڕەتیان کردوونەتەوە. ئێمە بەکورتی ئاماژەمان پێکردن بۆ ئەوەی بەش و کۆمەڵەی ئەو گوتارە جۆراو جۆرانەی کەلەمبارەیەوە هاتوون لەیەکتریان جیابکەینەوە و بەباشی بیانناسین.

سوپاس و ستایش بۆ ئەو خودایەی کەئێمە بۆ ئەمە ڕێنمایی کرد و ئەگەر خودا ڕێنمایی نەکردینایە بەهیچ شێوەیەك ڕینمایی نەدەکراین.[٢٠٦] بەلاّم ئەو مەسەلانەی کەبەڵگەو ماناکان نادیارە وەك وەحی و فریشتەکان و ڕۆح و جنۆکە و بەرزەخ و قیامەت و فیتنەو ناوونیشانەکانیان (بەرلەهاتنی قیامەت)و ئەو شتانی تریش کەدەرککردنیان دژوار یان پێچەوانەی عادەت و نەریتە، ئەگەر بەپێی ڕوونکردنەوەی عەقیدەی ئەشعەریەکان کەسوننین ئاراستە بکەین ئەوا بەموتەشابیهات حیساب ناکرێن، بەلاّم ئەگەر باوەڕمان بەموتەشابیە بوونیان هەبێت ئێستاکە دەستدەکەین بەڕوونکردنەوەیان و حەقیقەتی مەسەلە ناوبراوەکان بەم شێوەیە ئاشکرا دەکەین: دەبێت ئەوە بزانین کەجیهانی مرۆڤ شەریفترین و لەپێشترینی جیهان و عالەمی بوونەوەرانە. هەرچەندە لەجیهانی ناوبراودا حەقیقەتی مرۆڤایەتی بەیەکسان و وەك یەك دێنە پێش چاو، بەلاّم لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا، لەم جیهانەدا قۆناغگەلێکی جۆراو جۆر هەن کەهەریەکەیان بەهۆی تایبەتمەند بوونیان بەچۆنیەتی گەلێکی تایبەتەوە لەگەڵ ئەویتردا جیاوازی هەیە هەروەك بڵێی حەقیقەتەکانیش لەودا جیاواز و جۆراو جۆرن. قۆناغە ناوبراوەکانیش بریتین لە:

---

[٢٠٦] (وَالحَمدُ للهِ الّذي هَدانَا لِهذا وَما كُنَّا لِنَهتَدِيَ لَولا أنْ هَدانًا الله) س الاعراف ئا ٤١.

١ – جیهانی جەستەیی مرۆڤ، کەپشت بەستووە بەهەستی زاهیری و ئەندێشەی کاروباری مەعاش و ئەو کاروکردەوانەیە کەبوون و ژیانی ئێستەی ئەوانەی بۆ ئەم فەراهەمکردووە.

٢ – جیهانی خەوو کەبریتیە چالاکیەکانی خەیاڵ و ئەو تەسەووراتانەی کەبەناخی مرۆڤدا دێن و مرۆڤ بەهەستە دیارەکان کەجیان لەکات و شوێن (زمان و مکان)و چۆنیەتیە جەستەییەکانی تر دەرکیان دەکاتو، شتەکان لەشوێنگەلێکدا دەبینێت کەخۆی تێیاندا نیە و لەخەوە خۆش و شایستەکاندا مژدەی گەشتن بەئارەزووە دڵخۆشکەرە دونیایی و قیامەتیەکان بۆ مرۆڤ دەست دەدات، هەروەك چۆن پێغەمبەری ڕاستگۆ (ص) مژدەی داوە. ئەم دووقۆناغەش لەهەموو تاکەکاندا بەشێوەیەکی گشتی دەبینرێت، بەڵام لەڕووی مەشاعیرەوە لەیەکتری جیاوازن، هەروەك لەمبارەیەوە گفتو گۆ دەکەین.

٣ – قۆناغی پێغەمبەرایەتی کەتایبەتە بەگەورەکانو کەسە شەریفەکانی مرۆڤەوە. واتە ئەوانەی کەخودا تایبەتی کردوون بەمەعریفەت و تەوحیدی خۆیەوە و فریشتەکانی خۆی بۆ وەحی بۆ سەرئەوان نازڵکردووە و تەکلیفی لێکردوون کەهەوڵی چاکسازی لەمرۆڤەکاندا بدەن لەو چۆنیەتیانەی کەهەموویان جیاوازن لەدیاردە ئاشکراکانی مرۆڤایەتی .

٤ – قۆناغی مردنە کەتێیدا تاکەکانی مرۆڤ واز لەژیانی دونیا دەهێنن و دەچنە جیهانی بەرەلەهاتنی قیامەت کەپێی دەڵێن بەرزەخ و بەپێی کاروکردەوەکانی ڕابووردویان لەو جیهانەدا پاداشت یان سزا دەدرێن و سەرەئەنجام ڕۆژی دوایی گەورە یان جێگای پاداشتی گەورە دەرك دەکەن، یان لەنازو نیعمەتەکانی بەهەشت پاداشت دەدرێنەوە یان توشی سزای ئاگری دۆزەخ دەبن گەواهیدەری بەڵگەی هەردوو قۆناغی یەکەم و دووەم هەستیە (حسی)و گەواهی قۆناغی چوارەم ئایەتیە کەبەهۆی وەحیەوە لەلایەن خوداوە نازڵ دەبێتە سەر پێغەمبەران و باسی مەعاد و ڕۆژی دوایی و بەرزەخیان بۆ دەکات. سەرەڕای ئەوەی کە ئەقڵ وا دەخوازێت کەقبوڵیان بکەیت هەروەك چۆن خودا لەزۆرێك

لەئایەتەکاندا زیندوو بوونەوە و قیامەتی وەبیر هێناوینەتەوەو ئاشکراترینی بەڵگەکانیش لەسەر ڕاستیەتی ئەمە ئەوەیە کەئەگەر بۆ تاکەکانی مرۆڤ ژیانێکی تر بێجگە لەوەی کەدەبینرێت لەپاش مردن نەبوایە لێپرسینەوەی لەکارو کردەوەکانی لێنەکرایە ئەوکات ژیان زۆر بێهودەدەبوو، چونکە ئەگەر مردن نەبێت ئەوا سەرئەنجامی مرۆڤیش دەبێتە نەبوون و ئەوکات هیچ حیکمەتێك لەبوونی مرۆڤ لەم جیهانەدا نامێنێتەوە، ئەمە لەکاتێکدا ڕەفتار و کاری بێهودە لەخوداوە بەدوورە.

لەبەرئەوەی هەرچوار قۆناغەکە سەلمێنرا و هەربۆیە دەست دەکەین بەشەرح و باسی مەشاعیرەکانی مرۆڤ لەقۆناغە ناوبراوەکاندا کەچۆن لەهەرچوار قۆناغەکەدا جیاوازیان لەیەکتری هەیە ئەوکات حەقیقەتی موتەشابیهمان بۆ دەردەکەوێت. قۆناغی یەکەم مەشاعیری مرۆڤ ئاشکرا و دیارە. خودای گەورە دەفەرمێت: خودای ئێوەی لەسکی دایکەکانتانەوە دەرهێنا کەهیچ شتێکتان نەدەزانی‌و گوێ دیدەو دڵی بۆ دروستکردن بۆ ئەوەی سوپاسگوزاری بکەن.[٢٠٧] کەواتە بەم مەشاعیرانەیە کە مرۆڤ دەتوانێت مەلەکی زانست‌و مەعریفەکانی تێدا بێت و حەقیقەتی مرۆڤ بوونی خۆی کامڵ بکات و حەقی ئەو عیبادەت‌و بەندایەتیەی کەدەبێتە هۆی سەرفرازی ئەو ئەدا و جێبەجێ بکات. بەڵام مەشاعیری مرۆڤ لەقۆناغی دووەم یان لەخەودا هەروەك هەمان ئەو مەشاعیرە هەستیە زاهیریانەیە بەڵام وەك حاڵەتی بێداری نیە لەئەندامانی جەستەیدا. بەڵام بینەر هەرچیەکی لەخەوەکەیدا دەرککردووە یەقین پەیدا دەکات و لەگەڵ ئەوەی کەئەندامەکانی ئەو بەشێوەیەکی ئاسایی بەکار نەهێنراون و بەتەواوەتی وەستاون، هیچ شك و گومانێکی لەوشتانەدا نیە کە لەجیهانی خەودا بینیویەتی.

لەڕاستیدا لەبارەی چۆنیەتی خەوەوە دوو تێۆر بوونیان هەیە یەکێکیان بیرو باوەڕی حەکیمەکانە کەدەڵێن: هێزی خەیاڵ وێنە خەیاڵیەکان بەهۆی جوڵەی ئەندێشەوە بەرەو

---

[٢٠٧] (وَاللهُ أخرَجَكُم مِّن بُطُونِ أُمَّهاتِكم لاتَعلَمُون شَيئاً وَجَعَلَ لَكُمُ السَّمعَ وَالأبصارَ وَالأفئِدَةَ لَعَلَّكُم تَشكُرُون) س النحل ئا ٨٠.

هەستی هاوبەش دەبات کەبەشی هاوبەشی نێوان هەستی دیار و نادیارە، ئەوکات هەستپێراوە دیارەکانی خەیاڵ لەهەموو هەستەکانەوە دروستدەبێت و بەرجەستە دەبێت. بەم جیاوازیەی کەئەو خەونە ڕاستانەی لەلایەن خودا یان فریشتەکانەوە پایەدار تر و جێگیر ترە لەخەونە خەیاڵیە شەیتانیەکان، بەلاّم بەو شێوەیەی کەسەلماندوویانە خەیاڵ لەهەموو حاڵەتەکاندا یەکسانە.

دووەم تێۆری موتەکەلیمان کەلەم بارەیەوە باسیانکردووە ئەوەیەکە دەڵێن: خەو ئیدراکێکە کەخودا لەهەستەکانی مرۆڤدا دەیئافرێنێتو ئەوکات بۆ ئەو هاوشێوەی ئەو چۆنیەتیانەی کەلەبێداریدا بۆی دەستدەدات لەجیهانی خەویشدا بەدی دێن. ئەم تیۆرە شیاوترە هەرچەندە ناتوانرێت چۆنیەتیەکەی بزانرێت. ئەو ئیدراکەش کەلەخەودا ڕوو دەدات ڕوونترین گەواهێکە لەسەر ئەو ئیدراکاتانەی کەلەپاش ئەو بەهۆی مەشاعیرە هەستیەکانەوە لەقۆناغەکانی دواتردا بەدی دێن. وەهەروەها قۆناغی سێیەم یان قۆناغی پێغەمبەران بەو شێوەیە کەچۆنیەتی مەشاعیرەهەستیەکان لەگەڵ ئەوەی کە لەو قۆناغەدا نادیارە، بەلاّم کاتێك ئەم چۆنیەتیە بۆیان دەستدەدات لەلای ئەوان لەیەقینیش ئاشکرا ترە. هەروەك چۆن پێغەمبەر خوداو فریشتەکان دەبینێت قسەی خودا لەخۆیەوە یان لەفریشتەکانەوە دەبیستێت و بەهەشت و ئاگر و عەرش و کورسیش دەبینێت و حەوت ئاسمانەکە لەشەوڕەویەکەیدا تەی دەکات[٢٠٨] و، سواری بوراق دەبێت و پێغەمبەران دەبینێت و سلاّویان لێدەکات و هەموو مەشاعیرە هەستیەکان دەرك پێدەکات و هەروەك چۆن ئەوانی لەقۆناغی جەستەیی لەکاتی خەودا دیانبینێت ئەم ئیدراکاتانەی ئەو بەهۆی زانستێکی زەروریەوەیە کەخودا بۆ ئەو دەیئافرێنێت، بەلاّم نەوەك بەهۆی ئیدراکی ئاسایی مرۆڤەوە کەبەیارمەتی ئەندامانی جەستەیە.

---

[٢٠٨] (سُبحانَ الَّذي أسرى بِعَبدِهِ لَيلاً مِنَ المَسجِدِ الحَرامِ إلى المَسجِدِ الأقصى الَّذي بارَكنا حَولَهُ لِنُرِيَهُ مِن آياتِنا)....الخ اية س الاسرى ئا ١.

لەمبارەیەوە نابێت گرنگی بەقسەکەی ئیبن سینا بدەین کەپێغەمبەرایەتی بەهۆی ئەوەی کە دەڵێت: (خەیاڵ شێوەیەك بەرەو هەستی هاوبەش دەبات) تاوەکو قۆناغی خەو دایدەبەزێنێت، چونکە باسکردنی پێغەمبەران لێرەدا بەهێزتر پایەدار ترە لەمەسەلەی خەو هەروەك باسمانکرد تەبیعەتو سروشتی خەیاڵ یەکسانە هەربۆیە لەم تەنەزولە واپێویست دەکات کەحەقیقەتی وەحی و خەونی پێغەمبەران لەڕووی یەقین و چیەتیانەوە یەکسان بێت، ئەمە لەکاتێکدا بەم شێوەیە نیە و بەپێی ئەوەی کە لەبارەی خەونی پێغەمبەرەوە زانیمان کەشەش مانگ بەرلەهاتنی وەحی ڕوویداوە وەك دەستپێكو پێشەکی وەحی هەژمار کراوە ئەوە دەردەکەوێت کەحەقیقەتی خەونی ناوبراو کەمتر بووە لەوەحی، هەروەك چۆن چۆنیەتی وەحی لەگەڵ خەونی ئەودا جیاواز بووەو لەصەحیحی بوخاریشدا هاتووە کەوەحی لەسەر پێغەمبەر زۆر قورس بووەو، ناڕەحەتی کردووە هەروەك چۆن قورئان لەسەرەتادا بەشێوەی ئایەتی پچڕ پچڕ دەهاتە خوارەوە بۆی لەپاش سورەتی بەرائەت لەجەنگی تەبووکەوە یەکسەر نازڵبوو بۆی و لەکاتێکدا لەسەر پشتی حوشترەکەی بوو ئەمە لەکاتێکدا ئەگەر ئەم وەحیە تەنها بەهۆی تەنەزولی فیکرەوە بۆ قۆناغی خەیاڵ و هاتنە خوارەوەی خەیاڵ بۆ ناو هەستی هاوبەش بوایە ئەوکات نەدەبوو لەنێوحاڵەتە کانیدا هیچ جیاوازیەك هەبوایە.

بەڵام قۆناغی چوارەم کەحاڵەتی مردووەکان یان لەجیهانی بەرزەخدا کەسەرەتاکەی لەقەبرەوەیە و لەجەستە جیان و یان لەوکاتەی کە زیندو دەکرێنەوە دەگەڕێنەوە ناو جەستەکان، لەهەرشێوەیەکدا مەشاعیری هەستی ئەوان بوونی هەیە هەروەك چۆن مردو لەگۆڕدا دوو فریشتەی نەکیر و مونکەر دەبینێت و پرسیاری لێدەکەن‌و شوێنی خۆی لەبەهەشت یان دۆزەخ و ئەوانەی کەبەسەرشان هەڵیانگرتووە بەچاوانی خۆی دەبینێتو دەنگی پێکانیان دەبیستێت و تەلقینی تەڵقین خوێن بەباشی دەبیسێت، لەصەحیحیشدا هاتووە کەپێغەمبەر (ص) لەقەراغ چاڵی بەدر وەستابوو کەکوژراوانی موشریکەکانی تێدا بوو پێغەمبەر یەکەبەیەکەیانی بانگ دەکرد. حەزرەتی عومەر فەرمووی ئەی پێغەمبەری

خودا ئایا قسەلەگەڵ ئەم تەرمانەدا دەکەیت ئەویش فەرمووی (بەوکەسەی کەگیانی منی بەدەستە ئێوە قسەکانی من لەوان باشتر نابیستن) بەکوورتی کاتێك لەڕۆژی قیامەتدا زیندوو دەکرێنەوە بەچاوو گوێ و هەستەکانیان هەروەك چۆن لەدونیادا بەکاریان دەهێنان بەهەمان شێوە هەست بەبەهەشت و دۆزەخیش دەکەن. فریشتەکان و خودای خۆیان دەبینن هەروەك چۆن لەصەحیحدا هاتووە: ئێوە خودای خۆتان لەقیامەتدا هەروەك مانگی تابانی شەوی چواردەدەبینن بەجۆرێك هیچ باوەڕدارێك بێبەش نابێت لەبینینی. ئەم مەشاعیرانەش لەژیانی دونیادا کامڵ نەبوون و وەك مەشاعیراەکانی ئەم دونیای هەستیەیە بەیارمەتی ئەندامەکان هەروەك باسمانکرد لەڕێگەی زانستێکی پێویست کەخودا دەیئافرێنێت بەئەنجام دەگات، ڕازەکەشی ئەمەیە کەبزانین نەفسی مرۆڤ بەهۆی جەستە و مەداریکەوە بەدی دێت هەربۆیە هەرکات بەهۆی خەوەوە یان مردن یان گەشتنی پێغەمبەرێك بەحاڵەتی وەحی لەقۆناغی مەشاعیری مرۆییەوە بۆ قۆناغی مەشاعیری فریشتەیی، جەستە لەنەفس جیا دەبێتەوە و ئەوکات نەفس و مەشاعیری مرۆیی کەلەگەڵیدا بووە بەجیا لەئەندامەکان لەگەڵ خۆیدا دەیانبات لەو قۆناغەشدا بەهۆیانەوە هەرجۆرە ئیدراکێك کەبیەوێت بەدەست دەهێنێت هەروەك چۆن ئیدراکی نەفس لەم حاڵەتەدا لەپێشترە لەو ئیدراکەی کەلەجەستەدا دەیدۆزیەوە. قسەی کۆتایی لەغەزالیەوە کەدەڵێت: نەفسی ئینسانی شێوازێکە کەلەپاش جیایی دووچاوو دوو گوێ ئەندامەکانی تری ئیدراك وەك نمونە و شێوازگەلێك دەمێننەوە).

منیش دەڵێم: غەزالی بەم قسەیە ئاماژە بەکۆمەڵێك مەلەکە دەکات کەلەبەکار هێنانی ئەم ئەندامانەدا لەجەستەدا سەرەڕای ئیدراك بەدی دێت. وەهەرکات هەموو ئەو خاڵانە بزانیت ئاگاداری ئەوە دەبیت کەمەشاعیرە ناوبراوەکان لەهەرچوار قۆناغەکەدا بوونی هەیە، بەڵام نەك بەو شێوەیەی کەلەژیانی ئەم دونیایەدا بووە، بەڵکو لەڕووی هێز و لاوازیەوە بەپێی ئەو حاڵەتانەی کەبەسەریاندا دێت جیاوازن و موتەکەلیمەکانیش بەدوورو درێژی ئاماژەی پێدەکەن و دەڵێن: خودا بەهۆی ئەم مەشاعیرانەوە لەهەر جۆرێك بن

زانستی زەروری تێدا دەپارێزێت. بەهەمان ئەو شێوەیەی کەڕوونمان کردەوە ئاگاداری دەبن. ئەمەیە ئەو کورتەیەی بۆ ڕوونبوونەوەی قسەجۆراو جۆرەکەی لەبارەی موتەشابیهەوە کەئاماژەمان پێکرد وەئەگەر زیاد لەمەش لەمبارەیەوە گفتوگۆمان بکردایە لەوانەبوو خوێنەر توانای دەرککردنی ئەوی نەبێت، کەواتە قسەکە کۆتایی پێ دەهێنین و لەخوداش داوا دەکەین کەوامان لێبکات دەرك و فەهمی پێغەمبەرانو کتێبەکانی بکەین و بەشێوەیەکی شیاو حەقیقی لەتەوحید تێبگەین و لەڕێگەی سەرفرازیدا سەرکەوتوو بین، خوداش هەرکەس کەبیەوێت ڕێنمایی دەکات[٢٠٩].

---

[٢٠٩] (وَاللّهُ يَهدِي مَن يَشاء) س النحل ئا ٩٥.

# بەشی یازدەهەم

## لەبارەی زانستی تەصەووفەوە

ئەم زانستە لەزانستەشەرعیە نوێکانی نەتەوەی ئیسلامە. بنەڕەتەکەشی ئەوەیە کە تەریقەی ئەم گروپە لەلای سەلەفی ئوممەت و گەورەکانی صەحابەو تابیعان و ئەوەی کەلەپاش ئەوانەوە هاتوون، شێوازی حەق بە هیدایەت دەژمێردرێت و ئەصڵەکەی بریتیە لەپابەند بوون و ڕووکردنە عیبادەت و خودای گەورە و وازهێنان لەهەموو کەس و لەوەی کەخەڵکی بەگشتی ڕووی تێدەکات وەك: لەزەت وماڵ و پلە و پایە و دوور کەوتنەوە لە خەلق و پەنا بردن بۆ کونجی خەڵوەت بۆ بەندایەتیە، ئەم شێوازەش لەنێو صەحابە و سەلەفدا شتێکی گشتگیر بووە، بەڵام هەرکە لەسەدەی دووەمدا و لەپاش ئەو ڕووکردنە دونیا بڵاو بوویەوەو خەڵکی ئالودەی دونیا بوون و ئەوانەی کەسەرقاڵی عیبادەت بوون بەصۆفی و موتەصەویفە تایبەتکران بەکاری پەرستش و عیبادەتەوە.

قوشەیری دەڵێت: بۆ ئەم ناوە ئیشتیقاقێك لەزمانەوانی عەرەبی و قیاسدا دەستناکەوێت، بەڕواڵەت ووشەی ناوبراو تەنها لەقەبێکە. کەسانێکیش کەگوتوویانە صۆفی موشتەقی صەفا یان صفەیە قسەکەیان دوورە لەقیاسی زمانەوانیەوە و دەڵێت: وەهەروەها ئیشتیقاقیشی لەووشەی صوف (خوریەوە) شتێکی بەدوورە، چونکە ئەوان تایبەت نەبوون بەپۆشینی خوریەوە. من دەڵێم: شتی ئاشکرا ئەوەیە کە بگوترێت ووشەی ناوبراو لەصوفەوە دروست و شەق نەکراوە چونکە ئەوان تایبەت بوون بەبەپۆشینیەوەو لەپۆشینی جلوبەرگی جوان و بەشانو شکۆ دژایەتیی خەڵکیان

کردووەو ڕوویانکردووەتە پۆشینی جلوبەرگی خوری. لەبەر ئەوەی ئەم گروپە ڕوویانکردە مەزهەبی خۆدوور گرتن لەدونیاو خەڵك و ڕووکردنە پەرستش و عیبادەتەکان‌و بوونە خاوەنی ویژدانەکانی (حاڵ و دڵ)ی ئیدراککەرێکی تایبەت کەلەخەڵکانی تر جیاواز بوو. لەو ڕووەوەی کەمرۆڤ لەڕووی ئیتیصافەوە بەچیەتی مرۆڤ لەگیانەوەرانی تر بەئیدراك دەناسرێتەوە و ئیدراکەکەشی لەسەر دووشێوەیە: یەکێکیان ئیدراکێکە بو زانست و مەعریفەکان وەك: یەقین و شك و گومان و وەهم. دووەمیشیان ئیدراکێکەکە بۆ ئەحواڵە ئاساییەکان کەلەئەستۆیدایە وەك: شادی و خەم و دڵتەنگی و سەرسوڕمان و خۆشنودی‌و ڕق و بەڕێزی و سوپاس و نمونەی ئەمانە، هەربۆیە ئەقڵی ژیر وکارا لەلەتەنێکدا لەیەك ڕشتە لەئیدراکات و خواست و ئیرادەکان و ئەحواڵەکان بەدی دێت، ئەمەش هەرئەوەیە کەمرۆڤی پێ جیادەکرێتەوە هەروەك گوتمان.

هەندێك لەم ئیدراکاتانەش لە شتانی ترەوە بەدی دێن هەروەك چۆن زانست لەبەڵگەوە بەدی دێت و خۆشی و خەم لەئیدراکی دەردناکەوە یان لەزەت بەخش بەدی دێن‌و چالاکی بەشوێن پشوودان و سستی تەمبەڵی بەهۆی ماندوو بوونەکانەوە بەرهەم دێت‌و، هەروەك کەسێکی خوازیار (مرید) کەسەرقاڵی موجاهیدەت و عیبادەتە بەناچاریەوە بمانەوێت و نەمانەوێت بەشوێن هەرموجاهەدەتێکدا بۆ ئەو (وجد) بەدەست دێت، ئەوەش وەك دەرئەنجامێکی ئەو خۆگرتنەوە و موجاهەدەتەیە. ئەم حاڵەش یان لەجۆری عیبادەتە کەجێگیر دەبێت و بۆ موریدەکە دەبێتە مەقامێك یان عیبادەت نیە و بەڵکو سیفەتێکە کەبۆ نەفس دێتەدی وەك: خەم یان شادی یان ماندوبوون یان نمونەی ئەمانە لەمەقاماتەکان. مورید بەردەوام لەمەقامێکەوە بۆ مەقامێکی تر بەرز دەبێتەوە تاوەکو سەرئەنجام دەگاتە مەقامی تەوحید و مەعریفەت کەئامانجی خوازراوی بەختەوەریە. پێغەمبەر (ص) دەفەرمێت: (هەرکەسێك بمرێت و ووشەی تەوحید لااله الاالله بڵێت و شاهێدی بدات دەچێتە بەهەشتەوە.) هەربۆیە مورید بەناچاریەوە دەبێت هەموو ئەو قۆناغانە ببڕێت و بگاتە مەقاماتێکی بەرزتر و ئەصڵی هەموو مەقاماتە ناوبراوەکانیش

ئیخلاصه، بەلاّم ئیمان لەپێش ئەوانەوەیە و بەردەوامیش لەگەڵیاندایە و ئەحواڵ و سیفەت لەوانەوە بەدی دێت کەدەرئەنجام و بەرهەمن ئەوکات لەوانەوە بەردەوام ئەحواڵو سیفەتیان لێوە بەدی دێت تاوەکو دەگاتە مەقامی تەوحید و عیرفان. وەهەرکات لەبەرهەم و دەرئەی نجامی کرداری موریددا کەموکورتی یان گرفتێك ڕوویدات لەوە تێدەگات کە ئەم کارە لەڕووی کەموکورتیەوە بووە لەکارەکەی پێشوویداو هەربەوجۆرەشە لە یاداوەریە نەفسی و ئیرادات دڵی (قلبی) یەکاندا.

هەربۆیە مورید دەبێت دەستبکات بەموحاسەبەی نەفسی خۆی و بەدوادا چوون بۆ هەمووکارو کردەوەکانی بکات و لەحەقیقەتیان وورد ببێتەوە، چونکە بەدەستهاتنی دەرئەنجامی کارەکان شتێکی زەروریە و کەموکورتیەکەیان لەو کەموکورتیەی کە چووەتەناویەوە بەهەمان شێوەیە. موریدیش ئەم چۆنیەتیانە بەزەوقی خۆی تێدەگات و بۆ بەدەستهێنانی هۆکارەکانی دەستدەکات بەموحاسەبەکردنی نەفس. بێجگەلەکۆمەڵێکی کەم نەبێت لەخەڵکی کەسانی تر لە (موحاسەبەکردنی نەفسدا) لەگەڵ صۆفیەکاندا بەشداری ناکەن، چونکە بێئاگایی لێی بەئەندازەیەکە هەروەك بڵێی لایەنێکی گشتی هەیە. ئامانجی شەرع دانەرەکان (پارساکان) هەرکات ئەم جۆرە عیبادەتە بەدەست بهێنن کەبەپێی ئوصوڵی فیقە لەچۆنیەتی جێبەجێ کردنی ئەحکامەکان و فەرمانبەری لێیان بەو پەڕی حەز و دڵسۆزیەوە پەرستش و عیبادەت بکەن. بەلاّم ئەم گروپە (موتەصەویفە) بەیارمەتی زەوق و ویجدەکان (حاڵ – دڵ)[٢١٠] لەدەرەنجامی عیبادەتەکاندا بۆی دەگەڕێن بۆ ئەوەی بزانن کەکارەکانیان لەتەقصیر و کەموکورتی بەدەرە یان نا؟ بنەڕەتی تەریقەتی ئەمان یەکسەر پشت بەموحاسەبەی نەفس لەکردار و وازلێهێنان و هەڵەکانی مرۆڤ و قسەکردنە لەبارەی ئەم زەوق و ویجدانەیە کەبەموجاهەدەت بەدەست دێن، دواتر بۆ مورید پلەیەك دەسەلمێت کەلەوەوە بەرەو مەقامێکی تر بەرز دەبێتەوە، سەرەڕای ئەمەش صۆفیەکان خاوەن ئاداب و زاراوەی

---

[٢١٠] حاڵ بریتیە لەکەماڵێکی زوو تێپەڕی هەستپێنەکراو. کلمە التصوف. سهروردی لا ٣٩٣.

تایبەتن لەگفتوگۆو حیوارەکانی ناوخۆیاندا، چونکە دانانە لوغەویەکان بۆ ماناکان بەکار هاتووە، بەلاّم هەرکات ناناگەلێکی تازە بێنە پێشەوە کەباوئەبن بۆ دەربڕینیان زاراوەگەلێك بەکار دەهێنن کەتێگەشتن لەمانا ناوبراوەکانیان تێدا ئاسان بێت. هەربۆیە صۆفیەکان تایبەت بوون بەم زانستەوە و کەسیتر لەئەهلی شەریعەت قسەی تێدا نەکردووە. بێجگە لەنێو ئەواندا لەشوێنانی تردا باونیەو پەیڕەوەکانی تری شەریعەت لەقسەو زاراوەکانیان ئاگادار نین. زانستی شەریعەت بووە بەدووبەشەوە:

جۆرێکیان تایبەتە بەفەقیهەکان و فتوا دەرەکان کەبریتیە لەئەحکامە گشتیەکان لەبارەی عیبادات و موعامەلاتەوە. ج

ۆری دووەمیش تایبەتە بە گروپی صۆفیەکانەوە و بریتین لەمانەی خوارەوە: چۆنیەتی ئەنجامدانی ئەم موجاهەدەتەو موحاسەبەی نەفسۆ قسەکردن لەبارەی زەوقەکان و ویجدەکان کەلەم ڕێگایەدا بەدەستدێن و، چۆنیەتی گەشەکردنیان لەزەوقێکەوە بۆ زەیوقێکی باشتر و شەرحی ئەو زاراوانەی کەلەنێوان ئەماندا باون.

لەپاش ئەوەی کەزانستەکان نوسرانەوە و کرانە کتێب و فەقیهەکان لەبارەی ئوصوڵی فیقه و فیقه و کەلام و تەفسیر کتێبگەلێکیان نوسی پیاوانێك[٢١١]، لەپەیڕەوانی ئەم ئوصوڵە لەبارەی تەریقەتی خۆیانەوە چەندین کتێبیان نوسی، لەوانەش ئەوکەسانەی کەلەمەسەلەی وەرع یان پەرهیزکاری و موحاسەبەی نەفسدا لەکارپێکردن و وازهێنان لێیان چەندین کتێبیان نوسیوە، هەروەك چۆن (محاسبی)[٢١٢] لەکتێبی (رعایە) دا ئەم شێوازەی هەڵبژاردووەو، هەندێکیش لەبارەی ئادابی تەریقەت و زەوقەکان و ویجدەکان و پەیڕەوەکانیان لەحاڵەتە جۆراو جۆرەکاندا، دەستیان کردووەتە نوسین و دانان. هەروەك چۆن قوشەیری لەکتێبی (رسالە) دا و سهرەوەردی لەکتێبی (عواریف المعاریف) و،

---

[٢١١] لەناو تەریقەی صۆفیەکاندا پیاوان (رجال) بەوکەسانە دەگوترێت کەلەمەقاماتەکانی سلوکدا دەگەنە پلەیەکی لەپێشتر.

[٢١٢] ئەبو عبداللە ی حارسی کوڕی ئەسەدی موحاسیبی دانەری کتێب لەبارەی تەرجەمەی ئەحواڵی صۆفیەکانو باسی عەقیدەکانیان کەلەساڵی ٢٤٣ ك (٨٥٨ – ی٨٥٧ ن) مردووە (ئیبن خلکان) ب ١ لا ١٣٧.

نمونەی ئەمانە لەمەسەلە ناوبراوەکاندا سەرقاڵی لێکۆڵینەوە بوون. غەزالی لەکتێبی احیا العلومدا هەردوو بەشەکەی کۆکردووەتەوە و سەرەتا ئەحکامەکانی پارێزکاری و ئیقتیدای داناو لەپاشان بابی داب و نەریتی ئەو گروپەی کردووە و زاراوەکانیان لەچەند دەستەواژەیەکدا کەبەکاریان دەهێنن شەرحی کردوون.

هەربۆیە زانستی تەصەووف لەنێو نەتەوەی ئیسلامدا گەشتووەتە قۆناغی زانستو دانان ئەمەلەکاتێکدا لەسەرەتاوە تەنها بەتەریقەیەکی عیبادەت هەژمار کراوەو ئەحکامەکانی لەنسینە و دڵەکاندا وەردەگیران هەروەك چۆن زانستەکانی تر کەلەکتێبەکاندا دانراون وەك: تەفسیر و حەدیس و ئوصوڵی فیقه نمونەی ئەمانەش سەرەتا لەسینەی زاناکاندا بوون. دواتریش دەبێت ئەوە بزانین ئەم جۆرە موجاهەدەتو خەڵوەت و زیکرە، زیاتر پەردەو حیجابی هەست لادەدات دەست دەکەوێت و خاوەنەکەی ئاگاداری چەند جیهانێکی کاروبارەکانی خودا دەبێت کەخاوەن هەستەکان بەئیدراك ئاگاداری هیچکامیان نین و نابن. ڕۆحیش لەو جیهانانەیە. سەبەبی کەشفی ناوبراو ئەمەیە کە هەرکات ڕۆح لەهەستی ئاشکراو دیاردا بگەڕێتەوە ئیدراکی شاراوە و ئەحواڵەکانی هەست لاواز دەبن و ئەحواڵەکانی ڕۆح بەهێز دەبن و دەسەلاتو فەرمانڕەواییەکەی زیاتر دەبێت و گەشەیەکی تازە بەدەست دەهێنێت زیکریش یارمەتی مورید دەدات بۆ حاڵەتەکە، چونکە ئەم زیکرە بۆ گەشەی ڕۆح وەك خۆراك وایە و بەردەوام گەشەدەکاتو زۆر دەبێت و تاوەکو دەگاتە قۆناغی شهود لەپاش ئەوەی کەتەنها زانستێك بوو، لەم قۆناغەشدا پەردەی هەست لادەبرێت و ئەو بوونە نەفسیەی کەلەزاتی خۆیەوە هەیەتی کامڵدەبێت و ئەوەش هەمان ئەو ئیدراکەیە.

لەم کاتەشدا بەخشەشە ڕەبانیەکان و نزیکبوونەوەی زات لەبەدیهاتنی حەقیقەتدا لەئاسۆکانی سەرەوە (افق الاعلی) و ئاسۆی فریشتەکانە وە بەدی دێت. ئەم جۆرە کەشفەش لەزۆربەی کاتەکاندا بۆ ئەهلی موجاهەدەت ڕوودەدات و دواتر لەحەقیقەتەکانی جیهانی بوون مەسەلە گەلێك دەرك دەکەن کەخەڵکانی تر توانای ئەو دەرککردنەیان نیە

و هەروەها بەرلەڕوودانی زۆرێك لەڕووداوەكان باس لەڕوودانیان دەكەن‌و بەهاوكاری هیممەت و هێزی نەفسیان لەبوونەوەرانی جیهانی خوارەوەدا كاردەكەن‌و ئەم بوونەوەرانە گوێڕایەڵ و دەستەمۆی ئیرادەی ئەمان دەبن. گەورەكانی ئەم گروپە گرنگیەكی ئەوتۆ بەم كەشف و هەڵسووكەوتە نادەن و باسی حەقیقەتی شتێك ناكەن كەفەرمانیان پێنەكرابێت باسی بكەن، بەڵكو ئەو حاڵەت كەشفیانەی كەبۆ ئەمان بەدی دێت بەجۆرێك لەتاقیكردنەوەی دەزانن و هەركاتێك بۆیان ڕوویدات بەدوای شوێنێك یان (التجا) یەكدا دەگەڕێن. صەحابە (ڕ ن) لەڕووی ئەخلاق و سیرەتەوە ئەم جۆرە موجاهەدەیان هەبووەو لەهەموو كەسێك لەم كەراماتانە بەهرەمەند بوون، بەڵام زۆر گرنگیان بەكەرامەتە ناوبراوەكان نەداوە.

لەفەزیلەتەكانی ئەبو بەكرو عومەر (ڕ ن) ئەم جۆرە كەرامەتانە زۆر بوون. لەپاش ئەمانیش گروپێك لەئەهلی تەریقەت كەلەڕیسالەكەی قشەیریدا ناویان هاتووەو ئەو پاشینانەشی كەپەیڕەوی ئەوان بوون لەصەحابە لەم شتەدا پەیڕەوییان لێكردوون. لەپاش ماوەیەك دەستەیەك لەپاشینان گرنگیەكی زۆریان بەكەشفی پەردەی حەقیقەت‌و ئیدراكاتی ماوەرائەكانی دەدا شێوازەكانی ڕیازەتیان لەبارەی ئەم بابەتەوە بەبەراوورد بەتەریقەكانی پێشینان گۆڕدرا و، ئەمەش بەپێی جیاوازی ڕێنماییەكانی ئەمان لەبارەی كەشفی هێزە هەستیەكان و تەغزیەی ڕۆحی ئاقڵ بەزیكر دەركەوت كەبەهۆی ئەم ڕیازەت‌و كەماڵ و نەشوونمایەوە تەغزیەی نەفسی ئیدراكی بۆ وەدی دێت كەلەزاتیدا بوونی هەیەو لەپاش بەدیهاتنی وەها ئیدراكێك پێیان وابوو كەلەم كاتەدا بوون تەنها لەئیدراكاتەكانی نەفسدایەو توانیویانە زاتەكانی بوون كەشف بكەن‌و، هەموو حەقیقەتەكانی لەعەرشەوە بۆ فەرش (لەئاسمانەوە بۆ زەوی) تەسەوریانكردووە. غەزالی لەكتێبی احیاء العلوم دا لەپاش باسكردنی شێوەی ڕیازەت بەم جۆرەی گوتووە: لەپاشان دەبێت ئەوە بزانین كەئەم كەشفە لەلای ئەوان صەحیح و كامڵ نیە مەگەر ئەوكاتەی كەلەڕاستی و ئیستیقامەتەوە سەرچاوەی گرتبێت، چونكە هەندێك جار

لەوانەیە بۆکەسانێك کەلەخەڵوەت و تەنیایی و برسیەتیدا دەژین کەشف ڕوودبدات هەرچەندە ئیستیقامەت و خۆڕاگریەکیشیان نەبێت. وەك ساحیر و مەسیحیان و مورتەزاکان. مەبەستی ئێمەش تەنها ئەوکەشفەیە کەلەخۆڕاگریەوە سەرچاوەی گرتووە بۆنمونە ئاوێنەیەکی ڕووناك لەبەرچاو دەگرین ئەگەر بێت و ئاوێنەکە لاربێت و باش نەبێت دەبینین ئەو شتەی کەنیشانی دەدات لارو لەوێرە و بەپێچەوانەی شێوەی ڕاستەقینەیەوە دەردەکەوێت، بەلاَم هەرکات ڕێکو پێك بێت شتەکان بەڕاستیەوە نیشاندەدات، هەربۆیە ئەم ئیستیقامەتە بۆ نەفس لەڕووی ئەو حاڵەت و چۆنیەتیانەی کە تێیدا نەخش دەبەستێت هەروەك ڕێكو سافیەکەی ئاوێنەکەوایە، کاتێکیش کەپاشینان گرنگیان بەم جۆرە کەشفە دا لەبارەی حەقیقەتی بوونەوەرانی سەروو (علوی) خواروو (سفلی)و حەقیقەتی فریشتەکان و ڕۆح و عەرش و نمونەی ئەمانە دەستیانکردە لێکۆڵینەوە. وەتێگەشتنی ئەوکەسانەی کە بەشدار نەبوون لەتەریقەکەی ئەماندا بێتوانا بوو لەدەرك و زەوق و ویجدەکانی ئەمان و گروپێك لەخاوەنانی فتوای ئینکاریکردنی ئەمان بوون‌و گروپێکیش هیچ دژایەتیەکیان لەگەڵ تەریقەتی ئەماندا نەبوو، لەڕەتکردنەوەو قبوڵکردنی ئەم تەریقەتەدا بەڵگە و دەلیل هیچ سودێکی نیە، چونکە تەریقەتی تەسەووف لەشتە ویژدانیەکانە، واتە ئەوانەن کەبەهەستەکانی ناخ دەرك دەکرێن.

(تەفصیل‌و تەحقیقیش) لەدووتوێی قسەی زاناکانی حەدیس و فیقهدا بەشێوەیەکی زۆر دەبینرێت کەدەڵێن: خودای گەورە لەدروستکراوەکانی خۆی جیاوازە. لەنێو قسەی موتەکەلیمەکانیشدا دەبینین کەدەڵێن: (خودا نەجیاواز نەپەیوەستیشە) فەیلەسوفەکان دەڵێن: (ئەو نەلەناو جیهان و نەلەدەرەوەیدایە). دیسانەوە موتەصەویفەی پاشینان لەمبارەیەوە پێیانوایە کە: خودا لەگەڵ مەخلوقاتەکانیدا یەکیەتی هەیە ئیتر بەم مانایە بێت کە لەنێویاندا تواوەتەوەو (حلول) ی کردووە یان بەو مانایە ئەوەی کەئەو خودی مەخلوقاتە و لەسەرانسەری دونیادا بێجگە لە شتێکی تر نیە و هیچ جۆرە جیاییەکیش بوونی نیە، لێرەدا بەدوور و درێژی مەزهەبە ناوبراوەکان باسدەکەین و شەرحی

حەقیقەتی یەکە بەیەکەیاندەکەین بۆ ئەوەی ماناکانیان ڕۆشن ببێتەوە: دەبێت ئەوە بزانین کە(مباینت) دژبوون بەدوومانا بەکار دێت: یەکێکیان دژ بوونە لە(حەیین) سنور و ئاراستە کەلەبەرامبەریەوە پەیوەستبوون هەیەو، ئەم بەرابەربوونەش بەپێی کۆتی ناوبراو (حەییز و جیهەت) مانای شوێن دەگەیەنن، کەئەگەر بەشێوەیەکی لازم بێت ئەوا دەبێتە تەشبیه (چواندن) وەك باوەڕبوون بەئاراستە.

وەهاوشێوەی مانای ناوبراو لەبارەی باسکردنی ئەم موباینەت و دژیەوە لەهەندێك زانایانی سەلەفەوە ڕیوایەتکراوە کەبەبەشێکی ئەم مانایان زانیوە و بەشێوەیەکی تر ئاراستەیان کردووە، هەربۆیە موتەکەلیمەکان ئەم دژبوون و جیاوازیەیان ئینکاری کردووەو گوتوویانە: (لەبارەی پەروەردگارەوە نەدەتوانین بڵێین ئەو دژو جیاوازە لە مەخلوقاتەکانی و نەپەیوەستیشە پێیانەوە، چونکە ئەم مانایە تایبەتە بە بوونەوەرانێکەوە کەسیفەتدار کرون بەسیفەتی مەکان. وەئەوەی کەگوتوویانە یەك بابەتی خاڵی لەوەسف بەماناو دژی ئەو نابێت، بەومەرجەیەکە لەسەرەتای وەسفدار بوونەکەوە صەحیح بێت وەگەرنا کاتێك کەئەم وەسفدار بوونە ڕێگە پێنەدراو بێت قسەی نابراو ڕاست نیە، بەڵکو باشتر وایە کەلەماناو دژەکەشی خاڵی بێت، هەروەك چۆن لەبارەی جەماداتەوە دەڵێین: (نەزانا و نەنەزان و نەبەتوانا و نەبێ توانا و نەنوسەر و نەنەخوێندەوار.. ڕاستیەتیو زەسفداربون بەم جیاوازی و دژبوونەوە بەپێی ئەوەی کەبەنیسبەت مەدلولەکەوە باسکراوە، مەرجدارە بەهاتنەدی لەجیهەتەوە و ئافەرێنەریش (سبحانە) پاك و بێگەردە لەم جۆرە نیسبەتانە.

قسەی سەرەوە ئیبن تلمسانی لە (شرح اللمع) دا کەدانراوی ئیمام الحرمینە گوتوویەتی: (لەبارەی خوداوە نەدەتوانین بڵێین کەئەو جیاوازە لەجیهان و نەدەشتواین بڵێین پەیوەستە پێیەوە و نەلەناویەتی و نەلەدەرەوە). ئەمەش مانای قسەی فەیلەسوفەکانە کەدەڵێن: خودا بەپێی گەوهەرە لامەکانەکان نەلەنێو جیهان و نەلەدەرەوەشیدایە. موتەکەلیمەکان ئینکاری ئەم قسەیە دەکەن لەو ڕووەوەی

کەیەکسانبوونی بۆ ئافەریدگار لەسیفەتە تایبەتیەکاندا پێویستە. ئەم بابەتەش عیلمی کەلامدا بەدوور و درێژی هاتووە، وە مانای دووەمی دژبوون یان جیاوازی (مباینت) بریتیە لەدژایەتی و لەیەکتر نەچوون (مخالفت مغایرت) هەروەك دەڵێن: ئافەریدگار لەزاتو شوناس (هویە) و بووندا (وجود) و سیفاتدا دژو جیاوازە لەگەڵ مەخلوقاتەکانیداو لەبەرامبەر ئەم دژبوونەشەوە یەکبوون و ئاوێتەبوون و تێکەڵی هەیە. ئەم جیاوازیو دژبوونەش مەزهەبی هەموو ئەهلی حەقە وەك هەموو گەورەکانی سەلەف و زاناشەرع زانەکان و فیقە و موتەکەلیمەکان و پێشینانی موتەصەویفە وەك ئەهلی ڕیسالە و ئەوانەی کەپەیڕەویان لەوانکردووە.

وەگروپێك لەصۆفیە هاچەرخەکان گروپێك لەصۆفیە هاوچەرخەکان کەلایەنێکی زانستی و نەزەریان داوەبە مەشاعیرە ویژدانیان (هەستی باتینی)و، پێیان وایە کەخودای گەورە لەهەوییەت و شوناسی بوون و سیفەتەکاندا یەکبوونی لەگەڵ مەخلوقاتەکانیدا هەیە. هەرچەندە گومانی ئەوەیانکردووە ئەم گوفتارەی مەزهەبی فەیلەسوفەکان بەر لەئەرستۆ وەك ئەفلاتوون و سوقرات بووەو، موتەکەلیمەکان کاتێك کەئەم گوفتارە لەعیلمی کەلامدا لەصۆفیەکانەوە نەقڵ دەکەن بەئاگاداریەکی تایبەتەوە هەوڵی ڕەتکردنەوەی دەدەن، چونکە ئەم یەکیەتیە دوو زات پێك دەهێنێت کەیەکێکیان لەناودەچێت یان وەك بەشێکی ئەویتری لێدێت، هەربۆیە لەتێڕوانینی ناوبراودا جۆرێکە لەدژایەتی ئاشکرا و موتەکەلیمەکان لەمبارەیەوە نالێن ئەم یەکبوونە هەمان ئەو توانەوە (حلول) یە کەمەسیحیەکان لەبارەی مەسیحەوە بانگەشەی بۆ دەکەنو سەرسوڕهێنەرترە، چونکە پێویستە کەکۆن لەموحدیسدا بتوێتەوە یان ببێتەیەك لەگەڵیدا، ئەم مانایەش وەك قسەی شیعە ئیمامیەکان وایە کەشەرحەکەی لەقسەکانی صۆفیەکاندا بەدووشێوە هاتووە: یەکەم ئەوەی کە زاتی کۆن (گەوهەری جاویدان) ئیتر لەمەحسوس یان لەمەعقولی موحدیساتدا شاردرابێتەوە لەگەڵ هەردوو تەسەووری ناوبراودا یەکدەگرێت و هەموو موحدیساتەکان دیاردەکانی ئەون ئەو زاتەش وەك

پەناگەیەکی موحدیساتەکانە، بەدەستەواژەیەکی تر بوونی موحدیسات وابەستەیە بەوەوە بەو مانایەی کەئەگەر ئەوزاتە نەبوایە جیهانی هەستی بەدینەدەهاتو نەبوون هەموودونیای دەگرتەوە.

دووەم تیۆری توانەوەو شێوازی پەیڕەوانی مەکتەبی یەکیەتی ڕەهایە هەروەك بڵێی ئەوان لەقسەی پەیڕەوانی تیۆری توانەوە بەشێوەیەکی دژ بەیەك کەدژی یەکبوونی مەعقولە پەیان پێ بردووە، هەربۆیە توانەوەیان لەنێوان کۆن یان ئەزەلی و مەخلوقاتدا لەڕوانگەی زات و بوون و سیفاتەوە نەفی کردووە و لەبارەی دژبوون وتەزادەوە ئەو دیاردانەی کەبەهەست و ئەقڵ دەرکیان دەکەن کەوتوونەتە هەڵەوە و لەمەشاعیرە مرۆییەکان هەژماریان کردوون و گوتوویانە ئەم مەشاعیرانە تەنها وەهمن، مەبەستی ئەمان وەهمێك نیە کەدابەشکاری زانست و زەنن و شکە، بەڵکو مەبەستیان ئەوەیە کەهەموو ئەوانە لەجیهانی حەقیقەتدا نەبوون (عدم) من و تەنها لەمەشاعیرە مرۆییەکاندا بوونیان هەیە و، هیچ بوونێکیان لەحەقیقەت نەبەئاشکراو نەبەپەنهان نیەو بێجگە بۆ قەدیم و کۆنی ئەزەلی ناتوانرێت بەدەست بهێنرێت هەروەك چۆن لەئایندەدا بەپێی بۆلوان لەمبارەیەوە گفتوگۆ دەکەین. هەروەك چۆن لەمەشاعیرە مرۆییەکاندا پشت بەئەندێشەو ئیستیدلال دەبەستن لەتەعەقولی تیۆری ناوبراودا ئەم پشت بەستنە سودێکی نیە، چونکە ئەم ئیدراکاتانە لەمەشاعیری مرۆییەوە نەقڵ دەکرێن و تەنها بۆ پێغەمبەران بەشێوەیەکی سروشتی دێنەدی و ئەوانەی کەلەپلەی دووەمدان وەك ئەولیاکان بەڕێنمایی پێغەمبەران ئەم پلەیە بەدەستدەهێنن و ئەوانەشی کەوادەزانن ئیدراکە ناوبراوەکان بەشێوەیەکی زانستیش دەکرێت بێنەدی بێگومان لەگومڕاییدان. هەرچەندە هەندێك لەدانەرەکان لەئاشکراکردنی بوونەوەران و تەرتیب کردنی حەقیقەتەکانیاندا پێیان وایە کەلەشێوازی ئەهلی دیاردەکان (مظاهر)[٢١٣] پەیڕەوی بکەن ئەو کات پەیوەندی لەگەڵ

---

[٢١٣] ئەهلی مەزاهیر ئەو صۆفیانەن کەپێیان وایە هەموو ئەو شتانەی کەجیهانی هەستی پێك دەهێنن دیاردەی حەقن.

ئەهلی نەزەر و خاوەنانی زاراوەکان و زانست و ئەو ئاساری دژوارتری لەدژوارەوە بەدی هێناوە. هەروەك چۆن فەرغانی شەرحکەری قەصیدەی ئیبن فاریز بەو ئاراستەیەدا چووە لەو دیباجەیەی کە لەسەرئەم شەرحەی نوسیوە لەبارەی دەرچوونی بوون لەکاراوە(فاعل) و تەرتیبەکەیەوە دەڵێت: سەرانسەری بوون لەو سیفەتە وەحدانیەتەی کەدیاردەی ئەحەدیەتە دەرچووە، ئەودوانەش بەیەکەوە لەزاتێکی کەریمەوە کەتەنها بێ گفتووگۆ عەین و وەحدەتە دەرنەچووە بەم دەرچوونەش دەڵێن تەجەلی و یەکەمین قۆناغەکانی تەجەلیات لەلای ئەمان تەجەلی زاتە لەسەر خودو ئەوەش لەگەڵ بوونو دەرکەوتنی کەماڵی تێدایە هەروەك چۆن لەحەدیسێکدا کەنەقڵی دەکەن هاتووە: (گەنجینەیەکی شاراوەبووم و خوازیاری ئەوەبووم کەبناسرێم هەربۆیە خەڵکم ئافراند بۆئەوەی من بناسن).

ئەم کەماڵەش لەبەدیهاتنی دابەزیو(نازل) لەبوون و ڕوونکردنەوەی ڕاستیەکانەو لەلای ئەمان پێی دەڵێن جیهانی مەعنا و حەزرەتی عمائی[٢١٤] و حەقیقەتی محمدی[٢١٥]. حەقیقەتەکانی سیفات و لەوح و قەڵەم و حەقیقەتەکانی هەموو پێغەمبەران و ئەنبیاءو پیاوانی تەواوی نەتەوەی محمدی تێدایە. هەموو ئەمانەش تەفصیلی حەقیقەتی محمدیە. لەحەقیقەتە ناوبراوەکانەوە حەقیقەتگەلێکی تریش لەحەزرەتی هەبائیەوە دەردەچێت ئەمەش پلەی نمونەیە دواتریش بەتەرتیب: عەرش و کورسی و ئەفلاك و توخمەکانو جیهانی تەرکیبەوە دەردەچێت. ئەمەش لەجیهانی ڕەتقدایە. بەڵام هەرکات دەربکەوێت ئەوکات لەجیهانی فتقدایە ئەم مەزهەبەش بەناوەکانی مەزهەبی ئەهلی تەجەلی و دیاردەکان و حەزرەتەکان ناویان دەهێنن. ئەمەش قسەیەکە کەئەهلی نەزەر توانای بەدەستهێنانی موقتەزاکەی نیە، چونکە زۆر دژوار و داخراوە ماوەی نێوانی قسەکانی خاوەنی موشاهەدەو ویجدو گوفتارەکانی خاوەنی دەلیل و بەڵگە (بەڵگەهێنەرەوەیەکی

---

[٢١٤] پلە و پایەی ئەحەدیەت و یەکتاییە واتە بەرزترین پلەو مەقامی دەرکەوتنی ڕەبانیە.

[٢١٥] بریتیە لەزات لەگەڵ تەعەلوقی یەکەمە و ئەوەش ئیسمی ئەعزەمە. (تعریفاتی جورجانی).

زۆرەن. هەرچەندە کەبەپێی زاهیری شەرع و ئەم تەرتیبەیان ڕەتکردووەتەوە چونکە تەرتیبی ناوبراو لەهیچکام لەمەبەستەکانی (مقاصد) ی شەرعدا دیارو ئاشکرانین. هەروەها گروپێکی تر لەصۆفیەکان باوەڕیان بە وەحدەتی ڕەها هەیە ئەمەش عەقیدەیەکە لەڕووی تەعەقول و ئەو بەشانەی کەهەیەتی لەتیۆری یەکەمین سەرسوڕهێنەر ترە. لەبەرامبەر ئەم عەقیدەیەوە ئەوان واگومان دەبەن کەبەشەجۆراو جۆرەکانی هێزگەلێکە کەحەقیقەتی بوونەوەران و شێوە و مادەکانیان بەهۆی ئەو هێزانەوە بەدیهاتوون.

توخمەکانیش بەهۆی ئەو هێزانەی کەتێیدایە بەدیهاتوون و هەروەها مادەکانیان لەنەفسی خۆیاندا هێزێکیان هەیە کەبەهۆیانەوە هاتوونەتەدی. لەپاشان لەبوونەوەرە مورەکەبەکانەوە، ئەم هێزانە لەگەڵ ئەو هێزانەی کەبەهۆی ئەو تەرکیبەوە دێنەدی هاوشانن وەك ئەو هێزە کانزاییەی کەتێیدا هێزی توخمەکان لەگەڵ مادەکەیانداو زۆری هێزی کانزایی بوونی هەیە. دواتر هێزی حەیوانی کەهێزی کانزایی تێدایەو لەگەڵ ئەو هێزەیە کەلەزاتیدا شاراوەیە هەروەها هێزی مرۆییە لەگەڵ حەیوانیدا. دواتر فەلەك کەهێزی ئینسانی و هێزی زیادەی خۆیەتی‌و، هەروەها زاتە ڕۆحانیەکانیش لەسەر ئەم سیفەتەن ئەو هێزەی کەکۆکەرەوەی هەموو ئەو هێزانەیەو خاوەنی بەش نیە بریتیە لەهێزی خودایەك کەلەهەموو بوونەوەراندا، ئیتر گشتی بن یان ناگشتی بلاَون و کۆی کردوونەتەوە و تەنها لەلای دیارو نادیارەوشێوە و مادە و بەڵکو لەهەرلایەکەوە دەورەی داون. کەواتە هەموو بوونەوەران یەکێکن کەئەویش زاتی خودایە و لەحەقیقەتی یەگانەو ئاساییدایەو ئەوەی ئەوان بەش بەش دەکات شتێکی ئیعتیباریەو وەك ئینسانیەت‌و حەیوانیەتە. مەگەر نابینین کە یەکەمینی تێهەڵکیش لەدووەم مەوجودی هەبوو بەبوونی ئەو یەکێکە هەریۆیە هەروەك باسمانکرد یەکجار ئەو حەقیقەتە لەبوونەوەرێکدا بەشێوەی جنس یان نەوع دەنوێنێت جارێکی تر لەوەوە بەشێوەی گشتی لەگەڵ ناگشتیدا هەواڵدەدەن و ئەمەش وەك نمونە وایە. ئەم گروپە لەصۆفیەکان لەهەموو

دەستەواژەکانی خۆیاندا لەتەرکیب و زۆریدا خۆیان بەدوور دەگرن، بەڵکو بەبۆچوونی ئەمان ئەم دوانە وەهم و خەیاڵ دروستیکردوون. ئەوەی کەلەقسەکانی ئیبن دماقەوە لەباس و شەرحی ئەم مەزهەبەدا دەردەکەوێت، ئەوەیە کە حەقیقەتی قسەکەی ئەوان لەبارەی وەحدەتی لێکچوو موشابیە قسەی حەکیمەکانە لەبارەی ڕەنگەکانەوەیە، کەدەڵێن بوونی ڕەنگەکان مەرجدارە بە بوونی ڕووناکی و نوور و هەرکات نورەکە نەمێنێت ئەوا ڕەنگەکان بەهیچ شێوەیەك بوونیان نابێت.

گرووپی ناوبراویش دەڵێن: بوونی هەموو بوونەوەرانی مەحسوس و هەستپێکراو بەهۆی بوونی ئیدراککەری هەستیەوەیە، بەڵکو بوونی بوونەوەرانی مەعقول و وەهمی مەرجدارە بەبوونی ئیدراککەری ئەقڵی. هەربۆیە بوونی هەموو بەشەکان هەربۆیە بوونی هەموو بەش و دابەشکاریەجۆراو جۆرەکانی جیهانی هەستی مەرجدارە بەبوونی ئیدراککەری مرۆیی. هەروەك چۆن ئەگەر وادابنێین ئیدراککەری بەشەری بەگشتی بوونی نەبێت ئەوکات لەجیهانی بوونیشدا هیچ جۆرە بەش و دابەشکاریەکی نابێت، بەڵکو تەنها بوونی ئاسایی و یەکتایە. هەربۆیە گەرمی و ساردی و زبری و نەرمی تەنانەت زەوی و ئاوو ئاگرو ئاسمان و ئەستێرەکان و هەموو ئەمانە تەنها بەهۆی بونی هەستگەلێکەوە پەیدابوون کەئەوانە دەرك دەکەن، چونکە لەو ئیدراککەرانەدا دابەشکاری تەفصیلاتێکی تێدایە کەهیچکامیان لەبوونەوەراندا نین، بەڵکو هەموویان تەنها لەمەشاعیر و هەستەکانی ئەو ئیدراککەرەدا بوونیان هەیە. کەواتە هەرکات ئەو هەستانە کەدەستدەکەن بەدابەشکاری ئەم جیهانە لەناوبچن ئەوکات هیچ جۆرە دابەشکاری و تەفصیلێك لەم جیهانەدا بوونی نابێت، بەڵکو هەموو ئەم ئیدراکانە یەکێکن کەبریتین لە(من) نەوەك بەشێکی. ئەم بارودۆخەش لەحاڵەتی کەسی خەوتوودا لەبەرچاو دەگرن لەبەر ئەوەی کەئەو هەرکات بخەوێت و هەستی زاهیری نەمێنێت ئەوکات هەرهەستپێکراوێك لەدەستدەداتو ئەو لەو حاڵەتەدا بێجگە لەوەی کەخەیاڵ بۆ ئەو دابەشکاری دەکات ئیدراکێکی تری نیە. دەڵێن بێداریش هەربەم شێوەیە و هەموو ئەك شتە دەرککراوانە بەشێوەی تەقسیم و تەفصیل

بەجۆری ئیدراکی مرۆیی خۆی لەبەرچاو دەگرێت، ئەگەر وادابنێین ئەم ئیدراکەی لێ بسەنن‌ەوە ئەوکات دابەشکاریەکەش نامێنێت. ئەمەش هەمان مانای قسەکەی ئەوانە کەدەڵێن: وەهم بەلأم نەوەك ئەو وەهمەی کەڕیزی مەداریکە مرۆییەکاندایە. ئەمەیە کورتەی عەقیدە و بیروباوەڕی ئەمان بەپێی ئەوەی کەلەقسەکەی ئیبن دهاق وەردەگیرێت ئەم بۆچوونەش لەوپەڕی هەڵەو خەتادایە، چونکە ئێمە دڵنیاین لەبوونی ئەو شارو ناوچەی کەسەفەری بۆ دەکەین هەرچەندە لەبەرچاوانیشمان دووربێت وەباوەڕمان بەبوونی ئاسمانی هەیە کەهەروەك سەقفێکی جوان کەلەسەرسەرمانەوەیە و ئەستێرەکانو شتەکانی تریش کەلەبەرچاومان نین، بێگومان یەقینمان هەیە کەبوونیان هەیە و هەموو خەڵکی لەبوونیاندا کەمترین گومانیان نیەو هیچکەسێك لەگەڵ خۆیدا لەسەر شتە یەقینیەکان موجادەلەو بەحس ناکات، سەرەڕای ئەوەی کەلێکۆڵەرەوە صۆفیەپاشینەکان دەڵێن: هەرچەندە کەلەکاتی کەشفدا بۆ مورید وەهمی ئەم یەکبوونە دەستدەدات و صۆفیەکان ئەم حاڵەتە ناودەنێن مەقامی جەمع[٢١٦]. دواتر صۆفی لەو پلەیە بەرزدەبێتەوەو دەگاتە مەقامی ناسینی بوونەوەران و ئەم چۆنیەتیەش پێی دەگوترێت مەقامی فەرق[٢١٧] تەعبیری دەکات و ئەوەش مەقامی عاریف و لێکۆڵەرە لەلای ئەمان هەر موریدێك بەناچاریەوە دەبێت لەگۆڕەپانی جەمع کەگۆڕەپانێکی دژوارە تێپەڕ بکات و ئەم مەقامە ببڕێت، چونکە ترسی ئەوەی هەیە کەمورید لەو مەقامەدا بمێنێتەوەو

---

[٢١٦] - فەرق، شتێکە کە دەدرێتە پاڵ مرۆڤ جەمعیش شتێکە کەلەمرۆڤ بسەنرێتەوە بەدەستەواژەیەکی تر ئەوەی کەبۆ بەندەی خودا بەدەست بێت وەك ئەنجامدانی ئەرکەکانی بەندایەتی و، پەرستش و ئەوەی کەشیاوی حاڵی مرۆڤایەتیە پێی دەڵێن فەرق وەئەوەی کەلەلای حەق تەعالاوە بێت وەك دەرخستنی ماناکان و دەستپێکردنی لوتف و چاکە پێی دەڵێن جەمع. هەربەندەیەکیش ناتوانێت لەم دوانە خۆی لابدات، چونکە هەرکەسێك فەرق یان تەفریقەی نەبێت عبودیەتی نیە و ئەوەشی کەجەمعی نەبێت مەعریفەتی نابێت و، هەربۆیە قسەی بەندەلەنوێژدا کاتێك دەڵێت: (إِیاكَ نَعبُدُ) سەلماندنی فەرقە لەڕێگەی سەلماندنی عبودیەتەوە وەکاتێکیش دەڵێت (إِیاكَ نَستَعِین) خۆی داواکردنێکە بۆ جەمع، کەواتە تەفریقە سەرەتای ئیرادەیە و جەمعیش کۆتاییەکەیەتی (تعریفات الجرجانی).

لەم مامەڵەیە زەرەر بکات. پلە و مەرتەبەکانی ئەهلی ئەم تەریقەتە لەوەی کەباسمانکرد ئاشکرا بوون.

## بەشێك

دەبێت ئەوەبزانین کەگروپێك لەصۆفیە پاشینەکان کەلەبارەی کەشف و ماوەرائی هەستەوە قسەیانکردووە لەم بابەتەدا زۆر ڕۆچوون، بەئەندازیەك کەزۆرێکیان هەروەك ئاماژەمان پێکرد سەرقاڵی حلول و وەحدەت بوون و کتێبگەلێکی زۆریان لەمبارەیەوە نوسیوە. وەك هروی[218] کەلەکتێبی مەقاماتی خۆیدا لەمبارەیەوە قسەی کردووەو خەڵکانی تریش ئەم تەریقەیان هەڵبژاردووەو، لەپاشان ئیبن العربیو ئیبن سەبعینو قوتابیانی ئەو دوانە پەیڕەویان لەهیروی کردووەو دواتریش ئیبن العفیفو ئیبن الفاریزو نەجمی ئیسرائیلی ئەم شێوازەیان لەقەصیدەکانیاندا هێناوە و، چینی بەرلەوان لەگەڵ ئیسماعیلیە پاشینانەکان لەگروپ و فیرقەی ڕافیزیەکان تێکەڵ بوبون، کەئەوانیش باوەڕیان بەبیروباوەڕی حلول و ئولوهیەتی ئیمامەکان هەبوو، ئەمەش مەزهەبێك بوو کەپێشینانی ئیسماعیلیەکان بەهیچ شێوەیەك نەیاندەناسی. هەربۆیە مەزهەبەکانی هەردوو گروپی نابراو ئاوێتەی یەکتری بوون و قسەکانیان تێکەڵ بوون و عەقیدەیان وەك یەکی لێهات. لەقسەی صۆفیەکاندا بابەتی باوەڕبوون بەقوتب دێتە پێشەوە کەبەمانای سەرۆك و گەورەی عاریفەکان دێت. هەروەك چۆن پێیان وایە تاکاتێك قوتب زیندووە ناکرێت هیچ کەسێك ئەو پلەیەی ئەو لەمەعریفەتدا بەدەست بهێنێت بەڵام دوای ئەوەی

---

[218] عبداللەی کوڕی محمدی کوڕی ئیسماعیلی ئەنصاری ناوزەدکراو بە هروی صۆفی بەناوبانگ و فەقیهی مەزهەبی حەنبەلی کەلەساڵی ٤٨١ ك (١٠٨٩ – ١٠٨٨ ن) مردووەو، کتێبە ناسراوەکەی بەناوی (السائرین) چەندین جار شەرحکراوە.

کەگیانی سپارد کەسێکی تر لەئەهلی عیرفان جێگەی دەگرێتەوە. ئیبن سینا لەبەشەکانی تەصەووفی کتێبی اشاراتدا ئاماژەی بەم مانایە کردووە و گوتوویەتی: خودا پاك و بێگەردە لەوەی کە ئاوەکەی بۆ هەر ئاوجۆیەك سازگار بێتو بگونجێت، یان کەسێك لەدوای کەسێکی ترەوە بچێتەلای، بەڵام ئەم قسە بەهیچ شێوەیەك پشتی بەهیچ بەڵگەیەکی ئەقڵی یان شەرعی نەبەستووە، بەڵکو بەجۆرێك لەخیتابەت دەژمێردرێتو قسەی ناوبراو وەك عەقیدەی ڕافیزیەکانە لەبارەی میراتگری ئیمامەتی ئیمامان لەیەکترەوە وەسەیرکە و بزانە بەچ شێوەیەك تەبعی ئەم گروپە عەقیدەی ناوبراوی لەڕافیزیەکان بردووە و شوێنی کەوتوون.

لەپاشان بەتەرتیب باوەڕیان بە بوونی ئەبدالەکان لەپاش قوتبەوە هەیە هەروەك چۆن شیعە باوەڕیان بە نەقیبەکان هەیە. .تەنانەت ئەمان کاتێك کەجلوبەرگی گروپی تەسەووفیان دیاریکرد بۆ ئەوەی بیانکەنە یەکێك لەبنەماو ئوصوڵەکانی تەریقەتەو مەزهەبەکەیان دایانە پاڵ علی خودا لێی ڕازی بێت ئەمەش لەهەمان ئەو ماناوەیە، (واتە پەیڕەوی لەڕافیزیەکان) وەگەرنا علی (ڕ ن) لەنێو صەحابەدا بەمەزهەبێکی تایبەت یان تەریقەیەکی جیاواز لەپۆشینی جلوبەرگدا بەناوبانگ نەبووە وەیان تایبەت نەبووە بەحاڵ (ویجد) کەوە، بەڵکو حەزرەتی ئەبوبەکر و عومەر (ڕ ن) لەپاش پێغەمبەر (ص) لەخواترسترینی خەڵکی بوون بەلەهەرکەسێکی تر عیبادەتیان دەکرد و هیچکامیان لەئاییندا تایبەت نەبوو بەشتێکەوە کەبەتایبەت پێی جیابکرێنەوە، بەڵکو هەموو صەحابە لەئاین و پارێزکارو موجاهەدەت پێشەنگو سەرمەشق بوون بۆ موسوڵمانانو گەواهیدەریش لەسەر ئەم شتە ئەو سیرەت و حەدیسانەیە کەلەبارەیانەوە ڕیوایەتکراوە. ئەوە ڕاستە کەشیعەکان بەپێی مەنقولاتگەلێك کەهەیانە وادەزانن علی تایبەتکراوە بەفەزیلەتگەلێکی تایبەتەوە کەصەحابەکانی ترنەیانبووە. ئەمەش بەبیرو باوەڕی تەشییعی ئەوانە کەبەناوبانگن پێیەوە. وادیارە کەلەپاش دەرکەوتنی یەکێك لەگروپەکانی شیعە، کەبەئیسماعیلیە ناسراون و ئاشکرابوونی قسەکانیان لەبارەی ئیمامەت و مەسەلە

گەلێکی بەناوبانگ کەپەیوەستەپێیەوە، صۆفیەکانی عێراق لەم تیۆرەی ئیسماعیلیەکان جۆرێك لەهاوتەریببوونیان لەنێوان دیارو نادیاردا دەستدەکەوت و ئیمامەتیان بۆ سیاسەتو بەرێوەبردنی خەڵکی لەملکەچبوون بۆ شەرع داناو، دواتریش قوتبیان بۆ فێرکردنی مەعریفەتی خودا دیاریکرد، چونکە قوتب بەبۆچوونی ئەمان گەورەترینی عاریفەکانە. هەربۆیە لەم ڕووەوە ئەویان بەئیمامی زاهیری چواندووەو تایبەتیانکردووە بەمەسەلەی مەعریفەی خوداوە بۆ ئەوەی لەباتین و نادیاریشدا ببێتە هاوپلەی ئیمام و یەکسانی بەرقەراربێت، بەو هۆیەشەوە ناویاننا قوتب کەخولگەی مەعریفەت وابەستەیە بەوەوە و ئەبدالیان لەڕووی موبالەغە و زیادە ڕۆییەوە لەتەشبیهو چواندندا وەك نەقیبیان دایە قەڵەم.

وەلەمبارەیەوە هەندێك لەقسەی گروپی صۆفیەکان لەمەسەلەی فاتیمیدا گەواهیدەری ئەوەیە کەچۆن کتێبەکانیان پڕیەتی لەم جۆرە نەزەریاتانە ئەمە لەکاتیکدا صۆفیە پێشینەکان لەمبارەیەوە تەنها ووشەیەکیشیان نەبەنەفی و نەبە ئیسبات باس نەکردووە، بەڵکو قسەکانی ئەم گروپە لەقسەی شیعەو ڕافیزیەکان و مەزهەبەکانیانەوە وەرگیراوە کەلەکتێبەکانیاندا هێناویانە. خوداش مرۆڤ ڕێنمایی دەکات بۆسەر ڕێگەی ڕاست.

تەزییل: لێرەدا بەباشم زانی بەشێك لەقسەکانی شێخی عاریفی خۆمان سرئامەدی و ئەولیاکانی ئەندەلوس ئەبو مەهدی عیسای کوڕی زیاد نەقڵ بکەم کەلەزۆربەی کاتەکاندا ئەم قسانەی لەبارەی شیعرەکانی هرویەوە باسدەکردو، هروی ئەم شیعرانەی لەکتێبی مەقاماتی خۆیدا هێناوە. شیعرگەلێکن کەهەرکەسێك بیانخوێنێتەوە تێدەگات کەشاعیر بەئاماژە یان بەڕاشکاوانە باسی لەوەحدەتی ڕەها کردووە:

تەوحید و وەحدانیەتی خودایان نەگوتووە.

چونکە هەرکەس تەوحید گۆیە ئەوا ئینکاری دەکات.

تەوحید گۆ واتە کەسێك کەلەبارەی سیفەتەکانیەوە قسەدەکات.

دوولوتە کەزاتی خودای یەکتا ئەم دوو لوتە بەتاڵ دەکاتەوە.

تەوحیدی ئەو هەمان ئەوتەوحیدەیە کەخۆی ئاشکرای کردووە و فەرموویەتی.

وەتەوسیف کەر، واتە کەسێك کە وەسفی خودا دەکات ئەوەش کوفرە.

ئەبو مەهدی وەك پۆزش هێنانەوەیەك بۆ هروی دەڵێت: ئەهلی تەریقەت لەفزی جحود (ئینکاریان) بەکەسێك گوتووە کەخودایان بەیەکتا داناوە ووشەی ئیلحادیشیان بەکەسانێك گوتووە کەباسی سیفەتە ئاشکرا و جەستەییەکانی خودا بکات، بەهەڵە و پەڵەیانزانیوە و ئەم چەند بەیتەیان بەئاڵۆز داوەتە قەڵەم و هۆنەرەکەیان بەپەست داناوە. ئێمەش بەپێی عەقیدەی ئەو فیرقەیە دەڵێین کەمانای تەوحید لەلای ئەمان نەفی کردنی عەینی حدوسە بەسابت بوونی عەینی قیدەم، و بوونی یەکسەرە، یەك حەقیقەت و واقیعیەتە. ئەبو سەعیدی جزار کەلە گەورەکانی قەوم دەژمێردرێت گوتوویەتی: (حەق بریتیە لەعەینی ئەوەی کە دیارە و عەینی ئەوەشی کەنادیارە)، وەپێیانوایە کەبەدیهاتنی تەعەدود و فرەیی لەم حەقیقەتەدا و بوونی دوویی‌و جیایی بەپێی هەرپێنج حەزرەتەکان[٢١٩] وەهمە و وەك تەصویری سێبەرەکانن وەك گەڕانەوەی ئاواز و پێچەوانە بوونەوەی شتەکانن لەئاوێنەدا، ئەڵبەت بەدوای هەرشتێکد بێجگە لەئەزەلیەت و قیدەم بچن دەبێتە عەدەم (نەبوون). ئەمەش مانای ئەو قسەیە کەدەڵێن: خودا هەبووە و هیچ شتێك لەگەڵ ئەودا بوونی نەبووە). ئەو ئێستاکەش لەسەر هەمان ئەو شێوەیە کەلەوە و پێش هەبووە. وەهەروەها ئەم مانایە وەك قسەکەی لوبەیدی شاعیر وایە کەلەیەکێك لەشیعرەکانیدا کەپێغەمبەری خوداش تەصدیقی کردووە دەڵێت:(ئاگادار بە هەرشتێك

---

[٢١٩] بریتین لە: الف – حەزرەتی غەیب و عالمی ئەو دوونیای ئەعیانی سابیتە. ب – حەزرەتی علمی و لەبەرامبەریەوە حەزرەتی شەهادەتی ڕەها و عالمی ئەو دونیا مەلائیکەیە ج – حەزرەتی غەیبی موزاف کەدەبێت بەدوو بەشەوە: یەکێکیان ئەوەیەکە لەغەیبی ڕەهاوە نزیکترە و عالمی ئەو دوونیای جەبەروت و مەلەکوتیە، واتە: جیهان و عالمی ئەقڵ و نەفسە موجەڕەد و تاکەکان. د – ئەوەیە کەلەشەهادەتی ڕەهاوە نزیکترە عالمی جیهانی نمونە و میسالە و پێی دەڵێن عالمی مەلەکوت. ه – حەزرەتی کۆکەرەوە هەرچوار حەزرەتە نابراوەکەو، زانای ئەو دوونیا ی مرۆڤ و کۆکەرەوەی هەموو جیهانەکان و زاناو عالمی هەموو بوونەوەر. (تعریفاتی جورجانی).

بێجگە لەخودا باتڵە) فیرقەی ناوبراو دەڵێن: کەواتە هەرکەسێك تەوحید گۆی خودا بێت و وەسفی بکات، ئەوەلەڕاستیدا لەبەرامبەر موجید و بەدیهێنەرێکی قەدیمەوە کەمەعبودی ئەوە باوەڕی بەموجید و بەدیهێنەرێکی تازە و موحدیس هەیە کەخودا ئەو تەوحیدێکی نوێی کەکرداری ئەوە هەیە. ئێمەش ئەوەمان باسکرد کەمانای تەحید نەفی کردنی عەینی حدوسە ئێستەش ئەوەیە کەعەینی حدوس سابیت و تەنانەت موتەعەدید و فرەییشە، هەربۆیە ئەم جۆرە تەوحیدە وەك ئینکار و دەعواو بانگەشەیەکی درۆینەیەو، وەك کەسێك وایە کەبەکەسێکی تر کەهەردووکیان لەخانوویەکان بڵێت: لەم ماڵەدا بێجگە لەتۆ کەسێکی تر نیە. دیارە کەزمانی حاڵی ئەویتر ئەوەیە کەبڵێت: ئەم قسەیە ڕاست نیە مەگەر ئەوەی کە تۆ نەبی. وەهەندێك لەلێکۆڵەرەوان گوتوویانە: لەئوصوڵی ئەم گوفتارەداکە (خودا زەمان و کاتی ئافراندووە) دژایەتیەك بوونی هەیە، چونکە ئافەرینش زەمانی پێشکەوتووە لەکات و زەمان چونکە ئەوە کارێکە کەبەناچاریەوە دەبێت لەکاتێکدا ڕوویدات، بەڵام ئەوەی کەئەو والیدەکات ئەم جۆرە قسانە بکات ئەوەیە کەبازنەی تەعبیر لەحەقیقەتە تەنگ و سنوردارەکانە و بەدەستەواژەکان ناتوانرێت بەتەواوی حەقیان ئەدا بکەین.

کەواتە هەرکات ئەوە بسەلمێت کەبەدیهێنەر هەمان بەدیهێنەرە و بێجگە لەو عەدەم و نەبوونە، ئەوکات مانای ڕاستەقینەی تەوحید ڕاستیەتی و صیحەت وەردەگرێت. ئەمەش مانای قسەی ئەو کەسانەیە کەدەڵێن: خودا بێجگە لەخودا کەسێکی تر ناناسن ئەوکات ئەو کەسانەی کەباوەڕیان بەمانەوەی نیشانە و شوێنەوارەکانی، دەبنە تەوحیدگۆی خودا هیچ گوناهێکیان نیە، بەڵکو ئەم جۆرە تەوحیدە لەو بابەیە کەدەڵێن چاکەی چاکەکاران وەك خراپەی ئەوانەیە کەلەخوداوە نزیکن چونکە پێویستیەکەی تەقیید و بەندایەتی و شەفیعیەتە. هەرکەسێکیش بگاتە پلەی جەمع بەزانستەوە بەپلەی خۆی ئەم جۆرە تەوحیدە بۆ ئەونوقسان دەبێتو ڕەفتارەکانی وەك تەلبیس هەژمار دەکرێن کەپێویستی بەبەندایەتی و عبودیەتە وەئەوەی کەشاهێدیەکانی بەرز دەکەنەوەو ئەو لەئالودەبوونی

حدوس پاك دەكاتەوە هەروەك مەقامی جەمعە. وەڕیشەدارترین گروپی صۆفیەكان لەم باوەڕەدا ئەوانەن كەباوەڕیان بەوەحدەتی ڕەها هەیە خولگەی مەعریفەت بەهەر ئیعتیبارێك مانای كۆتایهاتنە بۆتەنها یەكێك. مەبەستی بێژەری شیعرەكەی هروی ئەمەیە كەمرۆڤ بگەیەنێتە پلەیەكی لەپێشتر و ئاگاداری بكاتەوە، پلەیەك كەتێیدا شەفەعیەت تێیدا دەردەكەوێت و تەوحیدی ڕەها بەشێوەیەكی عەینی و حەقیقی نەوەك بەقسەو دەستەواژە دێتە دی. كەواتە هەركەسێك تەسلیم ببێت كەبەهۆی یەقینەوە بەدیهاتبێت و هەركە ئەوەی كە خوازیاری حەقیقەتەكەی بێت زەینی ئەو دەستدەكات بەدەرككردنی گوفتارەكەی پێغەمبەر (ص) و ئاشنا دەبێت پێی كەدەفەرمێت: (من دەبمە گوێ و دیدەی ئەو).

هەركات ماناكان دەرك بكەی، موناقەشەیەك لەئەلفازەكاندا نیە، هەركەسێكیش لەهەموو ئەم مانایانە بەهرەمەند ببێت، پلەیەكی لەپێشتری بۆ دەستدەدات لەم قۆناغە كەنەگوفتارێكە و نەباسیش دەكرێت. بۆ ئاماژەدان بەم بابەتە، ئەم ئەندازەیە بەسەو قوڵبوونەوە لەم جۆرە شتانەدا شاراوەیە و هەمان ئەو مەسەلانەن كەلەبابەتە بەناوبانگەكانی صۆفیەكاندا هاتووە.

**(كۆتایی قسەكانی شێخ ئەبو مەهدی كوڕی زیاد).**

منیش ئەم بەشەم لەكتێبی وەزیر ئیبن الختیب كەلەبارەی موحیتەوە دایناوە ناوی ناوە (التعریف بالمحب الشریف) نەقڵم كردووە، هەرچەندە ئەم قسانەش چەندین جار لەزاری شێخمانەوە ئەبو مەهدی بیستووە بەهۆی ئەوەی كە ماوەیەكی زۆر تێپەڕیبوو باوەڕم بەلەبەركردنەكەی خۆم نەبوو هەربۆیە نەقڵكردنەكەم لەكتێبەكەوە بەلاوە باشتر و ڕاستتر بوو خوداش یاریدەدەرە.

## بەشێك

دەبێت ئەوە بزانین کەزۆرێك لەفەقیهەکان و خاوەنانی فتوا بەهۆی ئەم جۆرە قسەو هاوشێوەکانیانەوە دژایەتی گروپی صۆفیە پاشینانەکانیان کردووە قسەکانیان ڕەتکردووەتەوەو، هەموو ئەو شتانەی کەلەڕێگەی تەریقەتدا بۆ ئەوان ڕوویانداوە ئینکاریان دەکەن، ئەمەلەکاتیکدا حەقیقەت ئەمەیە کەقسەکەی ئەوان خاوەنی درێژەپێدانە چونکە قسەی هەموویان لەبازنەی چوارشتدا بەم شێوەیە دەسوڕێتەوە:

١ – قسەکردن لەبارەی موجاهەدات و ئەوەی کەلەزەوق و ویجدەکانەوە (حالّ – دلّ) بەدەست دێت. وەموحاسەبەی نەفس لەسەر کردارەکان بۆ بەدەستهێنانی ئەو زەوقانەی کەمرۆڤ دەگەیەنێتە مەقامێك و دواتریش دەگاتە مەقام و پلەیەکی بالآتر هەروەك باسمان کرد.

٢ – قسەلەبارەی کەشف و حەقیقەتە دەرککراوەکان لەبارەی جیهانی غەیبەوە، وەك سیفەتە ڕەببانیەکان و عەرش و کورسی و فریشتە و ڕۆح و پێغەمبەرایەتیو حەقیقەتەکانی هەر بوونەوەرێکی دیار و نادیار و تەرتیبی جیهانی هەستی لەدەرچوونیان لەبەدیهێنەر و پێکهێنەریان. هەروەك ڕابورد.

٣ – قسەکردن لەبارەی هەڵسووکەوت لەجیهانە هەستیەکاندا بەهەموو جۆرەکانی کەرامەتەوە.

٤ – ئەو زاراوانەی کەبەڕواڵەت مانا ئاڵۆزن و زۆرێك لەپێشەوایانیان بەسەر زاریاندا هێناویانەو ناویان لێناون شەتەحیات[٢٢٠] کەڕواڵەتیان هەڵەیەو هەربۆیە هەندێکیان ناشیرینو هەندێکی تریشیان جوان و قابیلی تەئویلن. بەڵام باسکردن لەبارەی مەقاماتو موجاهەدەت و ئەوەی کەلەزەوق و ویجدەکانەوە لەدەرئەنجامی موجاهەدەتەوە بەدەستدێت و ،موحاسەبەی نەفس لەسەر کەموکورتی هۆکاری ئەو موجاهەدەتە شتانێکن کەهیچکەس ناتوانێت ڕەتیان بکاتەوە زەوقەکانیان لەمبارەیەوە ڕاستنو بەدیهاتنیان هەروەك بەختەوەری وەهایە.

بەڵام قسەکردن لەبارەی کەراماتی ئەو گروپەو باسکردنیان لەشتە غەیبیەکان و هەڵسوکەوتیان لەکائیناتدا شتێکی ڕاست و ئینکاری نەکراوە. ئەگەر هەندێك لەزانایان ئینکاریشیان کردبن ئەوا شێوازەکەیان·موافیقی حەقیقەت نیە. هەربۆیە دەبینین مامۆستا ئەبو ئیسحاقی ئیسفرایینی کەلەپێشەوایانی ئەشعەریەکانە بەڵگەی هێناوەتەوە کەلەگەڵ موعجیزەدا تێکەڵ دەبێت قبوڵکراو نیە، چونکە لێکۆڵەرەوانی ئەهلی سوننەت جیاوازیان خستووەتە نێوان موعجیزەو کەرامەتەوەو گوتوویانە موعجیزە دەبێت بەتەحەدیەوە بێت، واتە بانگەشەی ڕوودانی موعجیزەکە بەپێی ئەوەی کە هێناویەتی هاوکات بێت و گوتووشیانە ڕوودانی موعجیزە بەبانگەشەیەکی درۆ لەتوانای کەسدا نیە، چونکە دەلالەتی موعجیزە لەسەر صیدقی ئەقڵیە لەو ڕوەوەی کەصیفەتی نەفسی ئەو تەصدیقە، هەربۆیە ئەگەر لەڕێگەی درۆزنێکەوە ڕووبدات ئەوکات صیفەتی نەفس دەگۆڕێت و ئەمەش مەحاڵە.

سەرەڕای ئەم بوونە، بەڵگەیە لەسەر ڕوودانی زۆرێك لەکەراماتەکان و ئینکاری کردنیان جۆرێکە لەدەمەقاڵێ. هەروەك چۆن بۆ صەحابەو گەورەکانی سەلەف ڕوویداوە و زۆریش بەناوبانگە. بەڵام لەبارەی کەشف و بەخشینی حەقیقەتەکانی پەیوەست بەجیهانی

---

[٢٢٠] بەلای صۆفیەکانەوە گوتنی ئەو شتانەیە کەپێچەوانەی شەرعن زاراوەگەلێك کەبەپێچەوانەی شەرعەوەن. وەك قسەکەی جونەید: لیس فی جبتی سوی الله.

سەرەوە و تەرتیبی دەرچوونی کائینات دەبێت ئەوە بڵێین زۆربەی قسەکانیان لەمبارەیەوە لەموتەشابیهاتە لەو ڕووەوەی کەقسەناوبراوەکان بەلای ئەمانەوە ویژدانین (هەستەناخیەکان) و بێویژدان لەمبارەیەوە دورە لەزەوقەکانی ئەمانەوە و ناتوانێت لێیان تێبگات و زمانەوانیەکان مەبەست و ئامانجی ئەوان بۆ مەبەستە ناوبراوەکان بەدی ناهێنێت، چونکە زمانەکان تەنها بۆ مانا ناسراوەکان دانراون و زۆربەیان لەهەستپێکراوەکانن. کەواتە واباشە کەلەمبارەیەوە ڕووبەڕووی قسەکانیان نەبینەوە و وەك موتەشابیهات حیسابیان بۆ بکەین کەوازمان لێهێناون. وەهەرکەسێك کەخودا لەتێگەشتنی ئەم بابەتەدا بەپێی گونجاوی شەرع ڕێنمایی بکات ئەوا بەختەوەرە. لەبارەی ئەو زاراوە وەهمدارانەی کەپێیان دەڵێن شەتەحیات و لێپرسینەوەیان لەبارەوە دەکرێت، دەبێت ئەوە بزانین کەویژدان لەحەقی ئەم گروپەدا ئەوەیە کە ئەمانە ئەهلی غەیبەتن لەجیهانی هەستی و ئەو واریداتانەی[٢٢١] کەزاڵدەبێت بەسەر ئەماندا کەلێیانەوە قسەگەلێکی بێ ویستوو ئیرادە بەسەر زاریاندا دێن.

وەناتوانین خاوەنی غەیبەت بخەینە ڕیزی قسە لەگەڵ کراوانەوە بەناچاریەوە مەعزورە (پۆزشدارە). هەر بۆیە ئەوانەی کەفەزیلەت و ئیقتیداریان دیارو ئاشکرایە دەبێت ئەم جۆرە قسانەیان بەمەبەستی جوان مانابکەین. وەباسکردنی ویجدەکانیش زۆر دژوارە چونکە زاراوەیان بۆ دانەنراوە هەروەك چۆن بۆ بایەزیدی بستامی و نمونەی ئەو ڕوویداوە. وەئەوانەی کەفەزیلەتیان دیارو بەناوبانگ نیە ئەڵبەت لەسەر ئەم جۆرە قسانەی کەلێیانەوە دەردەچێت لێپرسینەوەیان لەگەڵدا دەکرێت، چونکە لەوانەوە بۆ ئێمە فەزیلەتگەلێك نەسەلمێنراوە کەوامان لێبکات قسەکانیان تەئویل بکەین. وەهەرەها کەسێك کەباسی گۆیای شەتەحیات بکات و لەجیهانی هەستیدا دیار بێت و حاڵی ویجد زاڵ نەبێت بەسەریدا بەهەمان شێوە لێپرسینەوەی لەگەڵدا دەکرێت، هەربۆیە فەقیهان و

---

[٢٢١] وارد لەبەکارهێنانی تەسەووفدا بریتیە لەهەر مانایەکی غەیبی کەبەبێ ویست و مەبەست بێتە ناودڵی بەندەوە. (تعریفات جرجانی).

گەورەی صۆفیەکان فتوای کوشتنی حەلاجیان دەرکرد، چونکە ئەو لەکاتی ئامادەبووندا کاتێك زاڵبوو بەسەر خۆیدا قسەی دەکرد خوداش داناترە. صۆفیە پێشینەکان لەلەڕیسالەکەی قوشێریدا ناویان هاتووە و لەهەڵکەوتوانی نەتەوە دەژمێردرێن و پێشتر ئامـاژەمان پێکردن حەزیان لەکەشفی حیجابو ئەم جۆرە ئیدراکەبووە، بەڵکو تائەو جێیەی کەبیانتوانیایە هەموو خەمیان پەیڕەوی و ئیقتیدا کردن بوو ئەگەر وەها حاڵەتێکیان بۆ دەستبدایە ئەوا لێی دوور دەکەوتنەوە و گوێیان پیێ نەدەداو، لەم جۆرە حاڵەتانە رایان دەکرد و پێیان وابوو کەئەم جۆرە پێشهاتانە ڕێگرن لەبەردەمیان و وەك تاقیکردنەوەن بەجۆرێك لەئیدراکاتەکانی نەفسیان دەزانی کەمەخلوقو حادیسەو دەیانگوت: بوونەوەران لەمەشاعیری مرۆڤدا ناگونجێت و زانستی خودا فراوانتر و خەلقی ئەو گەورەترەو شەریعەتەکەشی لەڕێنماکارێك زاڵتر و زیاترە.

هەربۆیە هەرچیەکیان لەم ڕووەوە دەرك بکردایە باسیان نەدەکرد، چونکە وورد بوونەوە و قوڵبوونەوە تێیدا بەڕەوا نەدەزانیو کەسانێك لەصەحابە کەکەشفی پەردەو حیجابیان بۆ دەست دەدا ڕێگریان لەمانەوەو ڕۆچوون لەو حاڵەتەدا لێدەکردن، بەڵکو تەریقەتی خۆیان لەپەیڕەوی و ئیقتیداکردندا وەك ئەوکاتەی کەلەجیهانی هەستو بەر لە کەشف بەواجب زانیوەو هاوڕێیان و یارانی خۆیان بۆی ناچار دەکرد و باشیش وایە کەحاڵی مورید بەم جۆرە بێت، خوداش داناترە بەحەقیقەت.

# بەشی دوازدەهەم

## لەبارەی زانستی ڕاڤەی خەوەوە ( تفسير الاحلام )

ئەم زانستەش لەزانستە شەرعیەکانەو لەنێو نەتەوەی ئیسلامدا کاتێك زانستەکان وەك هونەر و صەنعەتیان لێهات و، زانایان کتێبیان لەبارەیانەوە نوسی ئەم زانستەش باوی هەبووە. بەڵام خەوو تەعبیرەکەی لەنێو سەلەف پێشیناندا بوونی هەبووە هەروەك چۆن لەنێو خەلەف و پاشیناندا هەبووەو وەهەروەها لەنێو نەتەوەکانی بەرلەئیسلامیشدا ڕەواجی هەبووە، بەڵام هۆکاری ئەوەی کە نەگەشتووە بەئێمە ئەوەیە کەئێمە لەمبارەیەوە تەنها قسەی ڕاڤەکارانی موسوڵمانمان بەبەس زانیوە وەگەرنا خەوبینین لەنێو جۆری مرۆڤدا بەردەوام بوونی هەبووەو بەناچاریەوە تەعبیریان کردووە، هەروەك چۆن یوسفی صدیق (ع) بەو شێوەیەی کەقورئان باسی دەکات تەعبیری خەوی کردووە. وەهەروەها لەصەحیحدا لەپێغەمبەر (ص) و ئەبوبەکر (ڕ ن) ڕیوایەتکراوە کە خەون یەکێکە لەمودریکاتی غەیبی. پێغەمبەر (ص) گوتوویەتی: خەون یەکێکە لەچل و شەش بەشەکەی پێغەمبەرایەتی. وەفەرموویەتی: لەشتە مژدە بەخشەکان بێجگە لەخەو شتێك نەماوەتەوە کەپیاوی چاك دەیبینێت یان بەوەوە دەیبینن، وەیەکەمین جۆری وەحی کەبۆ پێغەمبەر ڕوویداوە وەحیە. هەروەك چۆن هیچ خەونێك بۆ ئەو ڕووی نەدەدا مەگەر ئەوەی کە وەك سپێدەی بەیانی و ڕوون و گونجاو دەبوو لەگەڵ واقیعدا. پێغەمبەریش کاتێك لەنوێژی بەیانی دەبوەوە بەصەحابەکانی دەفەرموو: ئایا کەستان ئەمشەو خەونتان بینیوە؟ ئەم پرسیارەی ئەو لەبەرئەوەبوو بۆئەوەی ئەو ڕووداوانەی کەلەبارەی

دەرکەوتنی ئاین و گەورەییەکەیەوە هەبوو ئاشکرا بکات. بەلأم هۆکاری ئەوەی کە خەون بەیەکێك لەئیدراکاتە غەیبیەکان دەژمێردرێت ئەوەیە کە: ڕۆحی قەلبی کەبریتیە لەهەڵمی بەرزبوەوە لەناخی دڵەوە گۆشتێکە لەلەمولولەکاندا بلأو دەبێتەوەو لەگەڵ خوێندا دەچێتە هەموو جەستەوە و بەهۆیەوە کردارەکانی هێزی حەیوانی و هەستەکانی کاملدەبن هەرکاتێکیش دەزگای هەستکردن بەهۆی پێنج هەستەکەوە چالاکی و هێزی لەڕادەبەدەری بکەوێتە کارو، سەر ڕووی جەستە هێندە بێ هەست ببێت هەروەك بڵێی سەرمای شەو لێی داوە و لەئەنجام ڕۆح ماندوو ببێت و ئەوکات ڕۆحی قەلبی لەهەموو بوارەکانی جەستەدا دەگەڕێتەوە ناوەندەکەی خۆی کەدڵە.

بەم گەڕانەوەیەش ماندوویەتی دەردەچێت و لەئەنجامدا هەموو هەستە زاهیریەکان لەکار دەکەون و، مانای خەویش ئەمەیە هەروەك چۆن لەسەرەتای کتێبەکەشدا باسمانکرد. لەپاشان دەبێت ئەوە بزانین کەئەم ڕۆحە قەلبیە وەك ئامێرێکی سواربوون وایە بۆ ڕۆحی ئاقڵی مرۆڤ و ڕۆحی ئاقڵیش لەزاتی خۆیدا هەموو ئەو شتانەی کەلەجیهانی ئەمردا[٢٢٢]هەیە دەرك دەکات، چونکە حەقیقەت و زاتی ئەو عەینە ئیدراکە ئەوەشی کەدەبێتە ڕێگر لەبەردەم پەیوەستبوونی ئەو بەئیدراکاتی غەیبیەوە سەرقاڵبوونیەتی بەجەستە و هێزو هەستەکانەوە کەوەك پەردەیەکن لەنێوان ڕۆح و ئیدراکاتی نابراودا. هەربۆیە ئەگەر لەم پەردەیە بێتە دەرەوە لێی جیا ببێتەوە و دەگەڕێتەوە سەر حەقیقەتە کەی خۆی کەعەینی ئیدراکە. لەم کاتەشدا هەرچیەك کەدەرك بکرێت لەهەرجۆرێك تەعەقولی دەکات و وەریدەگرێت. وەهەرکاتێك لەهەندێك لەم پەردەو سەرقاڵیە جیا ببێتەوە سەرقاڵیەکانی کەم دەبنەوە و بەناچاریەوە لەفتەیەك لەجیهانی خۆی دەرك دەکات و ئەم ئیدراکەی ئەو بەئەندازەی ئەو تەجەڕوود و جیابوونەوەیە کەبۆ ئەو دەستی داوە. لەم حاڵەتەشدا هەموو سەرقاڵیەکانی هەستی زاهیری ئەو کەبەگەورەترین سەرقاڵیەکانی دەژمێردرێت کەم دەبێتەوە و لەئەنجامدا ئامادەی

---

[٢٢٢] (وَيَسْئَلُونَكَ عَنِ الرُّوحُ قُلِ الرُّوحُ مِن أَمرِ رَبِّي) س الاسرى ئا ٨٧.

وەرگرتنی هەموو ئیدراکاتەکان دەبێت، کەشیاوی جیهانی ئەون و هەرئەوەندەی کەهەندێك ئیدراکاتی جیهانی خۆی بەدەستدەهێنێت دەگەڕێتەوە جەستەی خۆی. چونکە ئەو ڕۆحەی تاکاتێك لەقاڵبی جەستەی خۆیدایە جیسمانیە بێجگە لەئیدراکات و مەشاعیری جەستەیی ناتوانێت هەڵسووکەوت بکات. مەشاعیرە جەستەییە کانیش تایبەتی بەدەستهێنانی زانست و مەعریفەتن و بریتین لەئیدراکاتە مێشکی و دەماخیەکان کەهێزی کارایان خەیاڵە. ئەم هێزەش لەشێوە هەستپێکراوەکان، شێوە خەیاڵیەکان جیادەکاتەوەو دواتریش دەیانسپێرێت بەحافیزە و بیرگە بۆ ئەوەی بپارێزرێن بۆی و لەکاتی پێویستی و بەڵگە هێنانەوەدا دیسانەوە وەریانبگرێتەوە. وەهەروەها نەفس جیادەکاتەوە لەو شێوانەی تر کەنەفسی و ئەقڵین و ئەو کات تەجرید و جیاکردنەوە لە مەحسوس بۆ مەعقول بەرز دەبێتەوە و هۆکاری ئەو دوانەش خەیاڵە.

وەهەروەها هەرکاتێك نەفس لەجیهانی خۆیدا ئیدراکاتێك بدۆزێتەوە دەیانداتە خەیاڵ و خەیاڵیش وەك شێوەیەك کەگونجاوە بۆی نیشاندەدات و دەیسپێرێت بەهەستی هاوبەش (الحس المشترك). کەسی خەوتووش ئەوانە بەشێوەیەك دەبینێت کەهەروەك بڵێی هەستپێکراون و دواتریش ئەم ئیدراکاتانە لەڕۆحی ئەقڵیەوە دادەبەزنە جیهانی هەستی. خەیاڵ دەبێتە هۆکاری ئەم بەشەش، ئەمەیە حەقیقەتی خەون. لەم ڕوونکردنەوانەوە جیاوازی لەنێوان خەونی ڕاست و خەوەپەرێشان و درۆکان دەردەکەوێت، چونکە هەموو ئەم خەونانە لەکاتی خەودا دەبنە شێوەگەلێك لەنێوخەیاڵدا، بەڵام ئەگەر ئەم شێوانە لەڕۆحی ئەقڵی ئیدراککەرەوە دابەزین ئەوکات خەون دروستدەبێت وەئەگەر لەشێوەگەلێکەوە وەرگیرابن کەخەیاڵ لەکاتی بێداریدا سپاردوونی بەحافیزە ویادگە ئەوکات دەبنە خەوی ناخۆش.

وەدەبێت ئەوە بزانین کەخەونی ڕاست خاوەنی عامیل گەلێکە کەڕاستیەکەی ڕادەگەیەنن و گەواهی ڕاستیەکەی دەدەن هەروەك چۆن خەو بینەری مژدەیەك کەلەلایەن خوداوە لەکاتی خەودا بەو دەگوترێت لێی تێدەگات. لەوانەش نیشانەکانی ناوبراو

بەخێرایی لەخەوهەستانی ئەوکەسەی کەخەوەکە دەبینێت هەروەك بڵێی لەگەڕانەوەی بۆ جیهانی هەستەکان و لەڕێگەی لەخەوهەستانەوە ڕادەپەڕێت. وەئەگەر نقوم بێت لەخەودا بێت ئەو ئیدراکەی کەبەو گوتراوە بەئەندازەیەك قورس و بەهێزە کەلەو حاڵەتەوە دەچێت بۆ حاڵێکی ئیحساس کەنەفس تێیدا ڕۆچووەو، لەنێو جەستەو عەواریزەکانیدایە. نیشانەیەکی تر مانەوەی ئەو ئیدراکەیە لەو ڕوەوەی کە خەونی نابراو لەگەڵ هەموو بەشەکانیدا لەحافیزەیدا دەچەسپێت هیچ جۆرە سەهوو فەرامۆشیەك ناچێتە ناویەوەو بۆ یادخستنەوەی هیچ پێویستیەکی بەئەندێشەو گەڕانەوە بۆ حافیزەی خۆی نیەو بەڵکو هەرئەوەی کە لەخەوهەڵدەستێت لەزەینیدا خەونەکەی بەجۆرێك کەبینیوە دەمێنێتەوەو هیچ شتێکی لێ غائیب نابێت، چونکە ئیدراکی نەفسانی لایەنێکی زەمانیان نیەو بەتەرتیب پەیوەست نابن بەزەینەوە، بەڵکو بەیەکجار لەیەککاتدا دەرکیان دەکات.

بەڵام خەوە ناخۆشەکان لەکاتێکدان چونکە هەروەك گوتمان ئەم جۆرە خەوانە لەنێو هێزی دەماغگەلێکدا جێگیر دەبن هێزی خەیاڵ لەحافیزەوە وەریاندەگرێتو دەیانگەیەنێتە هەستی هاوبەش چونکە هەموو کردارە جەستەییەکان کاتێکە کە لەم ڕوەوە لەکاتی ئیدراکدا بەتەرتیب و لەڕووی پێشکەوتن و دواکەوتنەوە دێنە زەینەوە هەربۆیە دەبنە دەستەمۆی لەبیر چوونەوەیەك کەدەچنە ناوهێزەکانی دەماغەوە. بەڵام ئیدراکاتی نەفسی ناتیقە و گۆیا بەم شێوەیە نیە، چونکە ئەوان زەمانی نین و خاوەن تەرتیبێك نین و هەرجۆرە ئیدراکاتێکیش کەلەنەفسی گۆیادا دەنەخشێن بەیەکجارو لەکەمتر لەچاو تروکانیدا ڕوودەدەن. هەندێك جاریش خەون لەپاش لەخەوهەستان تاوەکو چەندین ڕۆژی دوورو درێژ لەبیردا دەمێنێتەوەو بەهیچ شێوەیەك لەئەندێشە دوور ناکەوێتەوە ئەمەش لەکاتێکدایە کەئیدراکی یەکەمین بەهێز بێت و، هەرکاتێکیش خەونێك لەپاش هەستان لەخەو بەهۆی بەکارهێنانی ئەندێشەو ڕووکردنە ئەو وەبیر دێتەوە و لەهەمان کاتیشدا زۆرێك لەووردەکاریەکانی هەرچەندە زەینیان بۆ وەیاد هێنانەوەیان بەکار بهێنێت و فەرامۆشیان بکات، ئەم جۆرە خەونە ناتوانین ناوبنێین خەوی ڕاست،

بەڵكو ئەم جۆرە خەونانە لەخەوە ناخۆشەكانن. نیشانە ناوبراوەكان لەتایبەتمەندیەكانی وەحیە و خوداش دەفەرمێت: زمانت مەجوڵێنە بۆ ئەوەی پەلەی تێدا بكەیت لەسەر ئێمەیە كۆكردنەوەی و خوێندنەوەی ئەگەر خوێندمانەوە پەیڕەوی لەخوێندنەوەكەی بكە و لەپاشان ڕوونكردنەوەی لەسەر ئێمەیە[٢٢٣]. خەون نیسبەتێكی بەوەحی و پێغەمبەرایەتیەوە هەیە هەروەك چۆن لەصەحیحدا هاتووە كەپێغەمبەر (ص) فەرموویەتی (خەون بەشێكە لەچل و شەش بەشەكەی پێغەمبەرایەتیە).

هەربۆیە بەهەمان ئەندازە تایبەتمەندیەكانی لەگەڵ تایبەتمەندیەكانی پێغەمبەرایەتیدا پەیوەندیان هەیە. كەواتە نابێت ئەم خاڵەمان لەبیر بچێت بەڵگەش ئەمانەیە كەباسمانكرد خوداش ئافەرێنەری هەرشتێكە كە بیەوێت. بەڵام لەبارەی ماناو تەعبیرو لێكدانەوەی خەونەوە دەبێت بزانین كە ڕۆحی ئەقڵی هەركات مانایەك ئیدراك بكات و بیسپێرێت بەخەیاڵ و خەیاڵیش تەصویری بكات، كەئەڵبەت لەشێوەكانی تەصویردا دەریدەخات تائاستێك گونجاوبێت لەگەڵ ئەو مانایەدا هەروەك چۆن ڕۆحی ئەقڵی مانای شاهەنشا دەدۆزێتەوە و خەیاڵەكەی بەشێوەی دەریا تەصویر دەكات. یان ئەگەرمانای دوژمنایەتی دەرك بكات خەیاڵ لەشێوەی ماردا بەرجەستە دەكات. هەربۆیە كاتێك شەخص لەخەو هەڵدەستێت لەجیهانی خەونەكانی خۆی شتێك بێجگە لە بینینی دەریا یان ماری لەبیر نیە، لەم كاتەشدا تەعبیركەری خەو بیر دەكاتەوە و بەهێزی تەشبیهو چواندن دڵنیا دەبێت كەدەریا شێوەیەكی هەستپێكراوو شێوەیەكی ئیدراككراو لەپشتەوەی ئەوە، ئەوكات ڕێنمایی دەكرێن بۆحەقیقەت و قەرینەگەلێكی تر كەئەو شێوانە بۆ ئەو دیاری دەكات. وەدەڵێت بۆنمونە تەعبیرەكەی شاهەنشایە، چونكە دەریا ئافرێنراوێكی گەورەیە كەچواندنی سوڵتان پێی زۆر گونجاوە وەهەروەها چواندنی مار بەدووژمن بەهۆی گەورەیی زەرەرو زیانەكەیەوە زۆر گونجاو دەبێت، هەربۆیە دەفرو ئامێرەكانیش

---

[٢٢٣] (لاتُحَرِكْ لِسانَكَ لِتَعجَلَ بِهِ إنَّ عَلَينَا جَمعَهُ وَقُرآنَه فإذَا قَرَئناهُ فَاتَّبِع قُرآنَه ثُمَّ إنَّ عَلَينَا بَيَانَه) س القیامة ئا ١٦ تا ٢٠.

دەچوێنن بەژنانەوە چونکە ئەوان وەك دەفرەکانن و نمونەی ئەمانە. هەندێك لەخەوەکانیش ئاشکران و بەهۆی ڕوونی و نزیکی گونجاوی نێوان شێوەی ئیدراککراوو شێوەی ئەو پێویستیان بەتەعبیر نیە هەربۆیە لەصەحیحدا هاتووە کەخەون سێ جۆرە: یەکەم لەلایەن خوداوەیەو، دووەم لەلایەن فریشتەکانەوەیە، سێیەم لەلای شەیتانەوەیە، هەربۆیە ئەو خەونەی کەلەلایەن خوداوەیە ئەو جۆرە صەریح و ڕاشکاوو ڕاستەیە کەهیچ پێویستیەکی بەتەئویل نیە. وەئەو خەوەی کەلەلای فریشتەکانەوە، خەونێکی ڕاستە کەپێویستی بەتەئویل هەیەو، ئەوەشی کەلەلای شەیتانەوەیە بریتین لەخەوەناخۆشەکان. وەدەبێت ئەوەبزانین کەهەرکات ڕۆحی ئیدراك خۆی بداتە دەستی خەیاڵ دەیکاتە قاڵبگەلێکەوە کەبۆ هەست ئاسایی بێت و، ئەوەی کەهەست هیچکاتێك دەرکی نەکردبێت لەقاڵبێکدا ئەڵبەتە بەهیچ شێوەیەك تەصویری ناکات.

هەربۆیە ناگونجێت کوێری زکماکی سوڵتان بەدەریاو ماریش بەدووژمن و ژنیش بەدەفر بەرجەستە بکات، چونکە ئەو هیچکام لەم چەمك و مانایانەی دەرك نەکردووە. بەڵکو خەیاڵ و نمونەی ئەمانە لەتەشبیهو گونجاوە لەگەڵیاندا لەجنسی ئیدراکی خۆی کەبریتین لەبیستن و بینین و بۆنکردنەکان تەصویر دەکات دەبێت تەعبیر کەری خەو خۆی لەمجۆرە شتانە بپارێزێت، چونکە تەعبیرەکەی لێ دەشێوێت و تێکەڵدەبێت و یاساکەی لەناو دەچێت.

زانستی تەعبیری خەو بریتیە لەزانینی ئەو یاسا گشتیانەی کەتەعبیرکەر هەرچیەکی بۆ دەگێڕنەوە تەعبیر و تەئویلیان لەسەر ئەو یاسایانە هەروەك چۆن تەعبیرکەرەکان لەهەمان ئەوکاتەدا کەدەڵێن دەریا مانای پاشادەگەیەنێت، لەوانەیە لەجێگەیەکی تردا بڵێن دەریا مانای تووڕەیی دەگەیەنێت و لەجێگەیەکی تردا مانای خەم و بەڵاو موسیبەت دەگەیەنێت. وەهەروەك چۆن دەڵێن مار نیشانەی دووژمن لەجێگەیەکی تردا لەوانەیە بڵێن نیشانەی ژیانەو لەشوێنێکی تردا بڵێن داپۆشەری ڕازەکان و نمونەی ئەمانەیە. هەربۆیە تەعبیرکەر ئەم یاساگشتیانە لەبەر چاو دەگرێت لەهەرجێگەیەکدا بەپێی

خواستی قەرینەکان کەنیشاندەری ئەوەن کەیاسا ناوبراوەکان بۆ خەون گونجاوترو باشترن خەونەکە تەعبیر دەکەن. هەندێکیش لەم قەرینانە لەحاڵەتی بێداریو هەندێکیشیان لەحاڵەتی خەودا وەردەگرێت و هەندێکیشیان لەسروشتی خودی تەعبیرکەرەوە بەهۆی ئەو تایبەتمەندیەی کەلەبوونی ئەودا ئافرێنراوە سەرهەڵدەدات. وەهەرکەسەو ئامادەی ئەوەیە کەلەسەری ئافرێنراوە. ئەم زانستەش لەنێوانم پێشینان و سەلەفدا بەردەوام لەکەسێکەوە گوازراوەتەوە بۆ کەسێکی تر.

وەمحمدی کوڕی سیرین[٢٢٤] کەبەناوبانگترینی زانایانی ئەم زانستە دەژمێردرێت یاساگەلێکیان لەوەوە بۆ تەعبیری خەو وەرگرتووە و کردویانەتە کتێب، خەڵکیش تاوەکو ئەم سەردەمە ئەو یاسایانە نەوە بە نەوە نەقڵیانکردووە. لەپاش ئەمیش کرمانی لەمبارەیەوە کتێبی داناوە لەپاشان پاشینان دانراوگەلێکی زۆریان نوسیوە و ئەوەی کەلەم سەردەمەدا لەنێو خەڵکی مەغریبدا باوە کتێبەکەی ئیبن ئەبوتالیبی قەیرەوانیە وەك الممتع و نمونەی ئەمە. وەهەروەها کتێبی الاشارە لەدانراوی سالمی کەبەسودترین و کورتترین کتێبە لەم بارەیەوە. وەهەروەها کتێبی المرقبە العلیا لەدانانی ئیبن راشد کەلەمەشایخەکانمانە لەتونس. ئەوەش زانستێکە کەبەنورو ڕووناکی پێغەمبەرایەتیەوە دەدرەوشێتەوە بەهۆی ئەو موناسەبەتەی کەلەنێوانیاندا هەیە و لەئیدراکات (مەشاعیری وەحیە) هەروەك چۆن لەصەحیحدا هاتووە، خوداش دانای نهێنی و شاراوەکانە.

---

[٢٢٤] ناوی محمدە و نازناوەکەشی ئەبوبەکرەو هاو زەمانی حەسەنی بەصری بووەو، لەتابیعینە و سیرینی باوکی مسگەر بووە و لەخەڵکی جرجرایا بووە کەبەدیل گیراوەو، دایکیشی ناوی صەفیەبووە و کەنیزی ئەبوبەکر بووە. ئیبن سیرین لەتەعبیری خەوو چیرۆکەکاندا زۆر بەتوانابووە شتانێکی زۆری لێوە ڕیوایەتکراوە و چەندین کتێبی دراوەتەپاڵ وەك منتخب الکلام فی تفسیر الاحلام و کتێبی الجوامع گۆڕەکەی لەبەصرەیە و لەساڵی ١١٠ ك مردووە. (لغتنامەی دهخدا).

# بەشی سیازدەهەم

## لەبارەی زانستە ئەقلی و جۆرەکانیەوە

بەلام زانستە ئەقلّیەکان کەبۆ مرۆڤ سروشتیە لەو ڕووەوەی کەئەو خاوەنی ئەندێشەیە هەربۆیە زانستە ناوبراوەکان تایبەت نین بەنەتەوە یەکەوە، بەلّکو خەلّکی هەموو نەتەوەکان بیری لێدەکەنەوە لەدەرکی مەسەلەو بابەتەکانیدا لەگەلّ یەکتریدا یەکسانن. ئەم زانستانەش لەمرۆڤدا هەرلەسەرەتای کۆمەلّگە و ئاوەدانی سروشتیەوە بوونی هەبووەو بەزانستە فەلسەفی و حیکمەتیەکان ناویان هێناون کەبریتین لەچوار زانست: یەکەم: زانستی مەنتیق کەزانستێکە زەین لەهەلّخلیسکان لەوەرگرتنی بابەتە نادیارەکان لەشتەکان وەدیهاتووە دیارەکان دەپارێزێت و، سودەکەشی ناسین و جیاکردنەوەی باشە لەخراپ لەوشتانەی کەکەسی بیرکەرەوە لەتەصەورو تەصدیقاتە زاتی عەرەزیەکاندا دەستدەکات بەگەڕان بۆ ئەوەی حەقیقەت لەبوونەوەراندا لەڕووی نەفی ئیسباتەوە، بەوپەڕی ئەندێشەی خۆی ئاگادار بێت و بزانێت. دواتر لەپاش زانستی مەنتیق بەبۆچوونی زاناکانی ئەم زانستانە مرۆڤ یان بیر لەمەحسوسات دەکاتەوە، وەك تەنەکان و توخمەکان و مەوالیدەکانیان وەك جەمات و ڕووەك و حەیوانات و تەنە ئاسمانیەکان جولّە سروشتی و نەفسیەکان و کەجولّەیان لێوە دەردەکەوێت و نمونەی ئەمانە. ئەم هونەرەشیان ناوناوە زانستی سروشتی فیزیا. ئەوەش دووەم جۆری زانستە ئەقلّیەکانە. وەیان ئەوەی کە بیر لەشتەکانی ماورائی سروشتەوە وەك ڕۆحانیەتەکان دەکەنەوەو پێی

دەڵێن زانستی ئیلاهی (میتافیزیك) کەبەسێیەمین جۆری زانستە ئەقڵیەکان دەژمێردرێت. وەزانستی چوارەمیش ئەوەیە کە بیر لەئەندازە و میقدارەکان بکەنەوە و ئەوەش چوار زانستە. بەوانەش دەڵێن تەعالیم (بیرکاری).

یەکەمینیان: زانستی هەندەسەو ئەندازیاریە کەبریتیەلەبیرکردنەوە لەمیقدارو ئەندازەکان کەپێیان دەڵێن مەقادیرە جیاکان لەڕووی ژمێردراویانەوە یان پەیوەست بوون و موتەصیل بوونیانەوە. ئەوەش خاوەنی یەك چەمکە کەبریتیە لەخەت و هێڵ یان دووچەمکە و لایە کەبریتیە لەڕووبەر یان خاوەنی سێ لاو بوعدە چەمکە کەبریتیە لەتەنی فێرکاری ئەندازیار (هندسی)، وەزانستی هەندەسە لەم ئەندازانەدا و ئەوەی کەبەسەر ئەواندا لەڕووی زات یان لەڕووی نیسبەتەوە یەکێك دێتە بەردەم ئەویتر باس و گفتووگۆدەکەن.

دووەم: زانستی ئرتوماتیقیە کەبریتیە لەناسینی کەمم و چەندیەتی مونفەصیل و جیابووەیەکە کە ژمارە بێت و بەدەستهێنانی ئەو خاسیەت و عەواریزانەی کەپەیوەست دەبن پێیەوە.

سێیەم زانستی مۆسیقایە: ئەوەش بریتیە لەناسینی نیسبەتی ئاوازو نەغمەکان لەگەڵ یەکتریدا و هەڵسەنگاندنیانە بەژمارە و دەرئەنجامەکەشی ناسینی ئاوازەکانی گۆرانیە.
چوارەم زانستی شێوازە (هیئت)، ئەوەش بریتیە لەدیاریکردنی شێوازەکانی فەلەك و حەصری ئەوزاع و تەعەدودیان بۆ هەریەك لەسەیارەکان و نەگۆڕەکانە ئەم شتانەش بەهۆی جوڵە ئاسمانیەکانەوەدەناسرێتەوە کەدەیانبینین لەهەریەکەیاندا بوونی هەیە وەك: گەڕانەوە و خۆڕاگری و وەستان و هاتن و پشت هەڵکردن و چوون. ئەمانەن بنەماکانی زانستە فەلسەفیەکان کەحەوت زانستن: یەکە م مەنتیق کەلەپێشترینیانە و دوای ئەویش تەعالیمەکان و دواتریش ئرتوماتیقی و ئەندازیاری (هندەسە) و شێواز (هیئت) و مۆسیقا و تەبیعیات و ئیلاهیات. وەهەریەکەیان خاوەنی چەندین بەش و لقن کەلێیان جیادەبنەوە هەروەك چۆن زانستی پزیشکی لەلقەکانی تەبیعیات و حیساب

وفەرائیز  وە موعامەلاتیش لەلقەکانی زانستی ژمارە و ئەزیاجەکانیش لقی شێواز و هەیئەتن. ئەزیاج یان زیج ناسی یاساگەلێکن بۆ هەژمارکردن و حیسابکردنی جوڵەی ئەستێرەکان و ڕاستکردنەوەیان بەمەبەستی ئاگادار بوون لەشوێنی هەریەکەیان کاتێك کەمرۆڤ بیەوێت بیانزانێت. یەکێکی تر لەشێوەکانی تەحقیق لەبارودۆخی ئەستێرەکاندا بەمەبەستی زانینی زانستی ئەحکامی ئەستێرەکانە ئێمەش باسی یەکەبەیەکە زانستەناوبراوەکان دەکەین. وەدەبێت بزانین نەتەوەکانی بەرلەئیسلام کەمێژووەکەیانمان بیستووە لەپێش هەموویانەوە دوونەتەوە گرنگیان بەزانستە فەلسەفیەکان داوە ئەوانەش ئێرانی و ڕۆمیەکانن کەبازاڕی زانستەکان بەپێی ئەو مێژووەی کەبەئێمەگەشتووە ڕەونەق‌و ڕەواجی هەبووە، چونکە ئاوەدانیان زۆر بووە و دەوڵەت و سەڵتەنەتی بەرلەئیسلام و لەکاتی دەرکەوتنی ئیسلامیشدا تایبەت بووە بەوانەوە.

هەربۆیە لەشارو ناوچەکانی تایبەت بەوان دەریایەکی بێبن لەم زانستان بوونیان هەبووە. کلدانی و بەرلەوانیش سریانیەکان و هاوچەرخەکانیان وەك قیبتیەکان سەرقاڵی جادوگەری و نجومگەری و شتەکانی تر بوون وەك (تأثیرات)و تەلیسمەکان و گرنگیەکی زۆریان پێدەدا و نەتەوەکانی تریش وەك ئێرانی و یۆنانیەکان ئەم هونەرانەیان لەوانەوە وەرگرتووەو، لەنێو هەموو قیبتیەکاندا تایبەت بوون بەزانستە ناوبراوەکان بەهۆی ئەمانەوە ئەو زانستانە وەك دەریایەکی گەورە و فراوان گەشەی کردووە. هەروەك چۆن لەقورئاندا باسی هاروت و ماروت[٢٢٥] و بارودۆخی ساحیرەکان و ئەفسونگەرەکان هاتووە و زانایانیش لەبارەی بەرابی صەعیدی میسر هەواڵگەلێکیان نەقڵکردووە دواتر نەتەوەکان لەڕێگری کردن لەو زانستانەدا پەیڕەویان لەیەکتری کرد لەئەنجامدا ئەم زانستانە بەجۆرێك بەرەو نەمان چوون، هەروەك بڵێی بوونیان نەبووە بێجگە لەهەندێك لەپاشماوەی ئەوزانستە کەزاناکانیان زۆر بەکەمی بۆ یەکتریان گواستووەتەوە شتێکی

---

[٢٢٥] ئاماژەیە بەئایەتی: (وَلَكِنَّ الشَيَاطِينَ كَفَرُوا يُعَلِمُونَ النَّاسَ السِّحرَ وَمَا أَنزَلَ عَلَى المَلَكَينِ بِبابِلَ هارُوتَ وَمارُوت) س بقره ئا ٩٦.

ئەوتۆ لەو زانستانە نەماونەتەوە، خوداش زاناترە بەراستیەتیان سەرەرای ئەوەش شمشێری شەرع بۆ دژایەتی کردن بەپشتیانەوەیە و رێگرە لەتاقیکردنەوەیان. ئێرانیەکانیش لەسەر شێوەیەك بوون کەگرنگیەکی زۆریان بەزانستە ئەقلّیەکان داوەو بازنەی ئەم زانستانە لەوولاتەکەیاندا گەشەی کردووە چونکە دەولّەتەکانیان لەوپەری گەورەیی عەزەمەتدا بوون، وەهەروەها دەلّێن ئەم زانستانە دوای ئەوەی کە ئەسکەندەر دارای کوشت و وولاتی کیانیەکانیان داگیر کرد ئەم زانستانە لەئێرانیەکانەوە گەشتووە بەیۆنانیەکان. چونکە ئەسکەندەر چەندین کتێب و زانستی زۆری لەوانەوە وەرگرتووە. کاتێك وولاتی ئێران بەدەستی عەرەبەکان فەتح کرا کتێبگەلێکی زۆریان لەو سەرزەویانەدا دەستکەوت سەعدی کوری ئەبی وەقاص نامەیەکی بۆعومەری کوری خەتتاب نوسی بۆ ئەوەی لەبارەی غەنیمەتی کتێبەکان و بردنیان بۆ موسولّمانان مۆلّەتی لێوەربگرێت و، بەلاّم حەزرەتی عەمەر لەوەلاّمدا بۆی نوسی کەبیانخەنە ئاوەوە چونکە ئەگەر باشیش بن ئەوا خودابەشێوەیەکی لەوان باشتر رێنمایی کردووین. ئەگەر کتێبی ئەهلی گومرایش بن کەواتە کتێبەکەی خودا ئێمەی لەوانە بێنیازکردووە هەربۆیە یان بیانخەنە ئاوەوە یان بیانسوتێنن. لەبەرئەمە بوو کەزانستەئەقلّیەکانی ئێرانیەکان لەناوچوون و شتێکیان بەئێمە نەگەشت، رۆمیەکانیش لەسەرەتای کاری دەولّەتەوە تایبەت بوو بەیۆنانیەکان گریکەکانەوە ئەم زانستانەش لەنێو ئەماندا گۆرەپانێکی فراوانی هەبوو پیاوانی هەلّکەوتوویان وەك ئەساتینەکانی حیکمەت[٢٢٦].

حەکیمەکانی مەشائی (پەیرەوانی ئەرستۆ) کەخاوەنانی رواق لەوان بوون شێوازێکی باشیان لەفێرکردندا هەبووە هەروەك چۆن لەرواقیکدا دەیانخوێندەوە کە ئەوانی لەخۆرو سەرما دەپاراست هەربۆیە ئەو گومانەیان دەکرد. وەسەنەدی تەعلیمیان لەم شێوازەدا هەروەك پێیان وابوو لەلوقمانی حەکیمەوە گەشتووە بەسوقراتی قوتابی ئەوو لەویشەوە بۆ ئەفلاتوون و لەویشەوە بۆ ئەرستۆو لەویشەوە بۆ ئەسکەندەری فیردەوسی و

---

[٢٢٦] مەبەست لەئەساتینەکانی حیکمەت بریتین لە: فیساغۆرس ئنبازقلس و سوقرات و ئەفلاتون و ئەرستۆ.

سامستیوس نمونەی ئەمانە. ئەرستۆ مامۆستای ئەسکەندەر پاشای ئەمانبووە کەوولاّتی ئێرانی داگیر کرد و مەملەکەتی ئەمانی خستە ژێر ڕکێفی خۆیەوە. ئەو لەهەموو حەکیمەکانی ئەوان لەزانستەکاندا شارەزاتر و بەناوبانگتر بوو وەك مامۆستای ئەو سەیریان دەکردو، لەسەرانسەری جیهاندا ناوبانگی پەیداکرد و ناسرا. کاتێکیش دەوڵەتی یۆنانیەکان لەناوچوو فەرمانڕەوایی کەوتە دەست قەیصەرەکانی ڕۆم و باوەڕیان بەئاینی مەسیحی هێنا، و بەپێی ڕاسپاردەکانی ئاینەکەیان وازیان لەو زانستانە هێناو کتێبەکانیان وەلانا بەلاّم پاراستیان و لەکتێبخانەکانیاندا بەنەمری مانەوە و شامیان داگیر کرد و کتێبی ئەو زانستانەیان بەردەوام لەکتێبخانەکانیاندا هەرمابوون.

دواتریش خودا ئاینی ئیسلامی نارد و شوێنکەوتووانی بەجۆرێك زاڵکرد کەوێنەی نەبوو ئەو مەملەکەتەی کەڕۆمیەکان لەخەڵکیان داگیر کردبوو موسوڵمانان لێیان وەرگرتنەوەو، لەسەرەتاوە بەسادەییەوە دەژیان و هیچ زانیاریەکیان لەبارەی هونەر و صنعەتەکانەوە نەبوو تاوەکو بەرەبەرە سەلتەنەت و دەسەلاّتیان جێگیر بوو دامەزرا و لەشارستانیەتدا گەشتنە قۆناغێك کەهیچکام لەنەتەوەکان نەگەشتبوونە ئەو قۆناغ و پلەیە و جۆرەها هونەر و صنعەت فێر بوون و بەهۆی بیستنی هەندێك لەبابەتەکانی زانستی حیکمەت و فەلسەفە لەئوسقوف و قەشەکانی پەرستگاکانەوە هەندێك شارەزاییان لەم زانستانەدا پەیدا کرد و، لەو ڕوەوەی کەفیکری مرۆڤ حەزی لەم مەسەلانەیە و هەوڵی بەدەستهێنانیان دەدات هەربۆیە ئەبو جەعفەری مەنصور کەسێکی ناردە لای پاشای گریکەکان بۆ ئەوەی کتێبەکانی فێربوونی بیرکاری لەپاش وەرگێڕانیان بۆ عەرەبی بۆی بنێرێت، ئەویش کتێبی ئیقلیدس و هەندێك لەکتێبی تەبیعیاتی بۆ خەلیفەنارد. موسوڵمانان خوێندنیانەوە و شارەزای بابەتەکانی بوون و زیاتر حەزیان لەو زانستانە کردوو دواتر سەردەمی مەئمون هاتە پێشەوە و لەبەرئەوەی کەخۆی زانستخواز بوو زۆر حەزی لەو زانستانە بوو خوازیاری فێربوونی زانستەتەبیعیەکان بوو لیژنەیەکی ناردە لای پاشای ڕۆم (ئاسیای بچووك) بۆ ئەوەی زانستەکانی یۆنان بەعەرەبی بنوسنەوە و کۆپیان

بکەن و لەگەڵ ئەوانەشدا گروپێکی تایبەتکرد بەتەرجەمەکردنیانەوە. ئەوەبوو ئەو زانستانەیان وەرگرت و بەتەواوەتی فێریان بوون و هیچیان لێ نەهێشتەوە بیرمەندو لێکۆڵەرەوانی ئیسلامیش لەفێربوونی ئەو زانستانەدا هەوڵێکی زۆریاندا و لەهونەرە جیاوازەکانیدا لێهاتنیان پەیدا کرد و تێڕوانین و ئەندێشەیان لەو زانستانەدا گەیاندە قۆناغی کۆتایی و دژایەتیەکی زۆریان لەگەڵ بۆچوونەکانی مامۆستای یەکەمدا کرد و ڕەتو قبوڵیان نوسیەوەو تەحقیقاتێکی زۆریان خستە سەر لێکۆڵینەوەی ئەوکەسانەی کەلەپێش ئەمانەوە بوون. لەگەورەکانی ئیسلامیش بریتیی بوون لەمانە: ئەبو نەصری فارابی، ئەبو علی سینا، لەمەشریق و قازی ئەبوالولیدی ئیبن ڕوشد و وەزیر ئەبوبەکری کوڕی الصائغ لەئەندەلوس، سەرەڕای ئەمانەش گروپێکی تریش هەن کەلەم زانستانەدا گەشتوونەتە کۆتایی قۆناغەکە، بەڵام گەورە باسکراوەکان ناودار و بەناوبانگ بوون و زۆرێك لەم گروپە تەنها سەرقاڵی بەدەستهێنانی تەعالیمەکان و زنجیرەکانیان وەك نجومگەری و جادوگەری و تەلیسمەکان بوون و، ئەوانەی کەلەهەمووان زیاتر لەبەدەستهێنانی ئەم زانستانەدا ناوبانگیان پەیدا کرد بریتیی بوون لە: جابری کوڕی حەییان لەمەشریق و مەسلەمەی کوڕی ئەحمەدی موجریتی لەخەڵکی ئەندەلوس و قوتابیانی ئەون. لەم زانست زانانەش بەهۆی ئەم زانست و زاناکانیەوە زیری لەنێو نەتەوەی ئیسلامدا نەماوە و زۆرێك لەخەڵکی بەهۆی حەزکردنیان لێیان و تەقلیدی عەقیدەکانیان ئەقڵی خۆیانیان لەدەستداوە و گوناهەکەشی لەئەستۆی ئەوانەیە کەتوشی ئەم جۆرە شتانە دەبنەوە، ئەگەر خوداش بیویستایە بەجێیان نەدەگەیاند[٢٢٧] لەپاشان دەبێت ئەوەبزانین کەلەمەغریب و ئەندەلوسدا لەو کاتەی کەئاوەدانیان بەباچوو زانستەکانیش بەهەمان شێوە کەموکورتیان تێکەوت و ئەم جۆرە زانستانەش لەو مەملەکەتانەدا نەمان و بێجگە کەمێك لەپاش ماوەکانیان نەبێت کەلەژێر چاودێری

---

[٢٢٧] (وَكَذَالِكَ جَعَلْنَا لِكُلِّ نَبِيٍّ عَدُوًّا شَيَاطِينَ الإِنسِ وَالجِنِ يُوحِي بَعضُهُم إِلى بَعضٍ زُخرُفَ القَولِ غُرُورًا وَلَو شَاءَ رَبُكَ مَافَعَلُوهُ) س الانعام ئا ١١٢.

زانایانی سوننەتدا هەبوو هیچیان لێ نەمایەوە بەڵام ئەوهەواڵانەی کەلەخەڵکی مەشریقەوە دەگات بەئێمە باسی ئەوەدەکەن کەسەرمایەکانی ئەم زانستە بەشێوەیەکی فراوان لەلای ئەوان دەستدەکەون بەتایبەت لەعێراق و ئێران و دوای ئەوانیش لەماوراء النهر دا ڕەونەقێکی زۆری هەیە شارستانیەتیان زۆربەهێزەو، من لەمیسردا چەندین کتێبم لەمەعقولدا بینیوە کەدانراوی پیاوێك بوون لەخەڵکی هرات کەیەکێکە لەشارەکانی خۆراسان، ئەو پیاوەش بەسعدالدینی تفتازانی بەناوبانگبوو لەو کتێبانەشی کەنوسیبوونی لەبارەی ئوصوڵی فیقه و کەلام و بەیانەوە بوون کەگەواهیدەری ئەوەبوون کەئەو مەلەکەیەکی قوڵی لەم زانستانەدا هەیەو، ئەوەش نیشاندەدات ئەو زانیاری لەبارەی زانستەکانی حیکمەتەوە هەیە و لەهونەرە ئەقڵیەکانی تردا خاوەن پلەیەکی بەرزە. خوداش بەیارمەتی خۆی ئەوەی کەئەیەوێت پشتگیری دەکات[٢٢٨].

وەهەروەها ئەو هەواڵانەی کەبەئێمە گەشتووە لەم سەردەمەدا بازاڕی زانستەکانی فەلسەفەی لەسەرزەوی ڕۆمدا لەمەملەکەتەکانی فەرەنگ و ناوچەکانی تری کەناری باکور ڕەونەقێکی زۆرو زەوەندی هەیە. پاشماوەی ئەوزانستانە لەوێدا ڕەواجی پەیدا کردو دەم بەدەم ڕووی لەگەشانەوە و پێشکەوتن کردو کۆڕەکانی ئەو زانستە جۆربەجۆرانەو کتێبەکانیان زۆر و زانایانیشیان فراوان بوون. قوتابیانێکی زۆر لەگەڕاندابوون بەشوێنیاندا بۆ ئەوەی فێریان ببن خوداش داناترە بەوەی کەلەو سەرزەمینەدا دەگوزەرێت، خودای تۆ دەئافرێنێت و هەڵیش دەبژێرێت[٢٢٩].

---

[٢٢٨] (وَاللهُ يُؤَيِّدُ بِنَصرِهِ مَن يَشاء) س ال عمران ئا ١١.

[٢٢٩] (وَرَبُّكَ يَخلُقُ مَا يَشاءُ وَيَختار) س قصص ئا ٦٨.

# بەشی چواردەیەم

## لەبارەی زانستەکانی ژمارەوە

یەکەمینیان ئرتوماتیقیە ئەویش بریتیە لەناسینی تایبەتمەندی زنجیرە ژمارەیەکە کە لەڕوی چۆنیەتی و دانانەوە یان بەیەك لەدوای یەکبوون (بەرەوسەری ژمارەکان)، یان چەند هێندەبیان (بەرەوسەری ئەندازیاری) هندسی وەك ئەوەی کەهەرکاتێك ژمارەی یەکێکیان دوای ئەویتریان بەئەندازەی یەك ژمارە زیاتر بێت لەوەی پێش خۆی و بەدوای یەکدا بێن کۆی هەردوولایان بەرابەرە لەگەڵ کۆی هەردوو ژمارەکەدا کەلەدوای ئەوانە لەهەردوولاوە بەیەك ئەندازە بن[٢٣٠]. وە وەك دووهێندەبوونی چوارگۆشە (مجزور) وئێوەند

[٢٣٠] ڕوونکردنەوەکانی جەنابی دکتۆر هشتڕوودی مامۆستای بەڕێزی زانکۆو سەرۆکی بەشی زانستەکان لەمبارەیەوە ڕوونکردنەوەی داوە بەم شێوەیە: ئەو نمونانەی کەلەدەقەکەدا ئاماژەی پێکراوە لەتایبەتمەندیەکانی زنجیرەی ژمارەکانە، نمونەی یەکەم پشتی بەزنجیرەیەك بەستووە کەئەمڕۆکە بەبەرەو سەرەوەیی ژمارەکان (تصاعدالاعدا) بەناوبانگە ئەم زنجیرەیەش هەروەك چۆن لەپۆلەکانی ئامادەییدا دەخوێنرێت، لەو کۆمەڵە ناموتەناهیەی ژمارەکانە کەجیاوازی دووژمارەی یەك لەدوای یەك پەیوەستەی ئەندازەیەکی نەگۆڕە وەك ئەم زنجیرە ژمارەیەی خوارەوە: ٣٠، ٢٣، ١٦، ٩، ٢ کەهەر ڕستە و حەوت ژمارەی لەوەی پێش خۆی زیاتری هەیە. ئەو تایبەتمەندیەی کەلەدەقەکەدا باسکراوە بەم شێوەیە کەئەگەر زنجیرەی تەصاعودی ژمارەیی بەڕستەیەك کۆتایی پێ بهێنین بۆنمونە ئەگەر ٦ زنجیرەی پێشوو بەڕستەی پێنجەم واتە ٣٠ کۆتایی پێ بهێنین، کۆی هەردو ئەو ڕستانەی کەلەهەردوولاوە وەك یەکن لەگەڵ کۆی ڕستەکانی یەکەم و کۆتاییدا بەرابەرن لەنمونەی یەکەمدا کۆی ٩ و ٣٢ کەڕستەکانی دووەم و پێش کۆتایین لەگەڵ کۆی ٢ و ٣٠ کە ڕستەکانی کۆتایین بەرابەرن، هەروەها ئەم کۆمەڵەیە لەگەڵ دووهێندەی

ڕستەی ناوەڕاستدا واتە ١٦ دا یەکسانن. دیارە کەزنجیرەی ژمارە جووتەکان لەگەڵ زنجیرەی ژمارە تاکەکاندا تەصاعودی ژمارەیی پێك دەهێنن چونکە لەم دوو نمونەیەدا جیاوازی دووژمارەی جووتی یەك لەدوای یەك یان دووژمارەی تاکی یەك لەدوای یەك بەرابەرن لەگەڵ دوو ژمارەدا، کەواتە تایبەتمەندی ناوبراو بۆزنجیرەی تەصاعودەژمارەییەکان لەواندا ڕاست و گونجاوە. نمونەی دووەمیش پشتی بەزنجیرەیەك بەستووە کەئەمڕۆکە بەتەصاعودو بەرەو سەری ئەندازیاری بەناوبانگە ئەویش بەو جۆرەیە کەنیسبەتی هەردوو ڕستەی یەك لەدوای یەك لەم زنجیرە ژمارەییەدا نەگۆڕە وەك زنجیرەی: ٠٠٠، ٤٠٥، ١٣٥، ٤٥، ١٥، ٥ کەتێیدا نیسبەتی هەر ڕستەیەك لەگەڵ ڕستەکەی پێش خۆیدا سێ ژمارەیە لەوەها زنجیرەیەکدا کەبۆ نمونە ڕستەی پێنجەم واتە ٤٠٥ سنوردارە ئەنجامی لێکدانی هەردوو ڕستەی چەمك یەکسان لەهەردوولاوە لەگەڵ ئەنجامی لێکدانی هەردوولادا بەرابەرە، واتە: ئەنجامی لێکدانی ١٣٥ × ١٥ لەگەڵ ئەنجامی ٤٠٥ × ٥ دا یەکسانن ئەم ئەندازەیەش لەگەڵ چوارگۆشەی ڕستەی ناوەندیدا واتە (٢ ٤٥) بەرابەرە. ژمارەی دوو دووی یەك لەدوای یەك لەدەقەکەدا هاتوون لەم جۆرەن چونکە هەموو ئەم ژمارانە لە هێزە یەك لەدوای یەکەکانی ژمارە دووەوە دروستدەبن. لەکۆندا لەنێو یۆنانیەکاندا باوبووە کەژمارەکانیان بەخاڵ نمایش کردووە، (پێویستە ئاگاداری ئەوەبین کە لەو سەردەمەدا نوسینی ژمارە دانەهێنرابوو) وەبەپێی ئەو شێوەیەی کەلەم خاڵانەوە وەریان دەگرت و وەك ژمارە ناویاندەهێنان بۆ نمونە ئەگەر نوقتە و خاڵگەلێکیان بەم شێوەیەی خوارەوە:

.

....

دەیانلکاندن بەیەکەوە و ئەم ژمارەیە واتە کۆی خاڵەکان پێیان دەگووت ژمارەی سێگۆشە لەم جۆرە تەصویرو شێوەی ژمارانەدا تەنها ژمارەی خاڵەکانی گۆشەی شێوە هەندەسیەکە جێگە تێڕوانینە نەوەك چۆنیەتی جێگیر کردنی گۆشەکان، بۆنمونە هەمان ژمارەی سێگۆشەی ناوبراو دەتوانین بەم شێوەیەش نمایشی بکەین و بیخەینەڕوو:

..

...

....

هەندێك لەو خاڵانەی کەلەدەقەکەدا ئاماژەیان بۆکرابوو سەردەکێشێت بۆ تایبەتمەندی ئەم جۆرە تایبەتمەندیانە بۆ نمونە ئەگەر ژمارە سێگۆشەیەك لەدوای یەکەکان لەزنجیرەیەکدا دایانبنێین بەم شێوەیە:

۰۰۰۰۰، ۲۱، ۱٥، ۱۰، ٦، ۳، ۱ . یەکەم: ئەوە دەبینرێت کەجیاوازی هەردووژمارەی سێگۆشە یەك لەدوای یەکەکە لەگەڵ پلەی ژمارە گەورەکەدا بەرابەرە واتە جیاوازی ژمارەی شەشەم (۲۱) لەگەڵ ژمارەی پێنجەمدا(۱٥) بەرابەری شەشن. دووەم: هەشت بەرابەری هەر ژمارەیەکی سێگۆشە کۆ یەك چوارگۆشە(مجزور) ی تەواوە:

۸×۳ + ۱ = ۲٥ = ٥ ۲

۸× ٦ + ۱ = ٤۹ = ۷ ۲

۸× ۱۰ +۱ = ۸۱ = ۹ ۲

سێیەم: کۆی دووژمارەی سێگۆشەی یەك لەدوای یەك دەکاتە یەك ژمارەی چوارگۆشە: ۲٥ = ۱٥ + ۱۰

چوارگۆشەی هەر ژمارەیەك کەهێزی دووەمی هەمان ئەو ژمارەیە هێشتاش ناوی چوارگۆشەیە، چونکە بەهۆی ئەو تەرتیبەی کەپێشینان ئەم ژمارەیان نمایش دەکرد شێوەی چوارگۆشە بەدەست دێت وەك چوارگۆشەی پێنج بەم شێوەیە:

. . . . .

. . . . .

. . . . .

لەتایبەتمەندیەکانی ئەم ژمارانەش بۆ نمونە یەکێکیان ئەوەیە کە کۆی ژمارە تاکەیەك لەدوای یەکەکان یەك ژمارەی چوارگۆشەیە، واتە لەواقیعدا کۆی چەند ژمارەی تاکی یەك لەدوای یەك لەگەڵ چوارگۆشەی ژمارەیاندا بەرابەرە وەك: ٦ ۲ = ۳٦ = ۱۱ + ۹ + ۷ + ۳ + ۱ بەم شێوەیە پێنجی و شەشی و حەوتیەکان و ئەوانی تریش دەتوانرێت وێنا بکرێت هەرکامێکیان تایبەتمەندی لێکچووی تایبەتمەندی ناوبراویان هەیە. لەفەزاشدا دەتوانرێت خاڵەکان بەپێی شێوە هەندەسیەپەهلەویەکان دابنێین و ژمارەکانی هەرەم و موکەعەب تەصەوور بکرێن کەلەنێوانیاندا، ژمارەی موکەعەب هێشتا هەر زاراوەیە لەبری هێزی سێیەمی هەر ژمارەیەك زاراوەکانی موکەعەبی ئەو ژمارەیە بەکار دێت. ئەم ژمارانەش هەرکامێکیان تایبەتمەندێکیان هەیە لەوانەش: کۆی موکەعەباتی ژمارەڕاستە یەك لەدوای یەکەکان لەگەڵ چوارگۆشەی ئەواندا بەرابەرن وەك ٤٤۱ = ۲ ۲۱ = ۲

۱ ۳+۲ ۳+ ۳ ۳+ ٤ ۳+ ٥ ۳ + ۷ ۳ = (۱ +۲ + ۳ + ٤ + ٥ +۷) ۲ = ( ٦ × ۷)
۲

وەدەبێت ئاگاداری ئەوەبین کەکۆی ژمارەڕاستە یەك لەدوای یەکەکان یەك ژمارەی سێگۆشەن. کەواتە ئەو دەرئەنجامە وەردەگیرێت کەکۆی موکەعەباتی ژمارە ڕاستە یەك لەدوای یەکەکان بەرابەرە لەگەڵ یەك ژمارەی سێگۆشەدا.

(ژمارەی نێوەند) لەکاتێکدا کەژمارەی ئەو ژمارە تاکانە بن هەروەك چۆن تاکەکان پەیاپەی و جووتەکانیش پەیاپەی یەکتری بن. وەك ئەوەی کەهەرکاتێك ژمارەکان بەنیسبەتی یەك بەدوای یەکدابێن بەجۆرێك کەژمارەی یەکیان نیوەی دووەم و دووەمیان نیوەی سێیەم و....هتد تاوەکو کۆتایی یان یەکەمیان یەك لەسەر سێی دووەم، دووەمیش یەك لەسەرسێی سێیەم بێت تاوەکو کۆتایی ئەوکات لێکدانی یەکێکیان لەولاکەی تر وەك لێکدانی هەردوو ژمارەکە دوای ئەوان لەهەردوولاوە دەبێت، کەبەیەك ئەندازە لەدوای ئەوانەوەبێت ئەوەش وەك ژمارەکانی جووت جووتی یەك لەدوای یەکە لە ٢، ٤، ١٦ وەك ئەوەی کەلەتایبەتمەندی ژمارەیەك لەدانانی سێگۆشەژمارەییەکان و چوارگۆشە و پێنج گۆشە و شەش گۆشەکانەوە ڕوودەدات، هەرکات بەشێوەیەکی بەردەوام لەسەر دێڕەکانی خۆیانەوە وەستابن بەجۆرێك لەیەکەوە تاوەکو ژمارەی کۆتایی کۆبکرێنەوە و سێگۆشەبن و سێگۆشە یەك لەدوای یەکەکانیش بەهەمان شێوە لەیەك دێڕدا لەژێرگۆشە یەك لەدوایەکەکاندا بن لەپاشان سێگۆشەی گۆشەدار کەلەپێش ئەوەوە و، دواتریش دەبێتە چوار گۆشە و لەهەرچوارگۆشەیەکدا وەك ئەوەی کەلەپێش خۆیەتی زیاد بکرێت و بکرێتە پێنجی و بەهەمان شێوە تاوەکو کۆتایی شێوەکان و یەك لەدوای یەکی گۆشەکان بن خشتەیەك دروست ببێت کەخاوەنی درێژی و پانی بێت، هەروەك چۆن لەپانی ئەو ژمارە یەك لەدوای یەکانە و دواتریش سێگۆشەکان بەدوای ئەواندا و پاشانیش چوارگۆشەکان و دوای ئەوانیش پێنج گۆشەکان و...هتد بن وەلەدرێژی هەرژمارە و شێوەیەکیدا بگەنە هەرئاستێك بوونیان هەبێت.

وەلەکۆکردنەوە و دابەشکردنی هەندێکیان بەسەر هەندێکی تریاندا لەڕووی درێژیو پانیەوە تایبەتمەندیەکی سەیرو سەمەرەیە کەلەوانەوە دەرهێنراوە لەکتێبو دانراوەکانیاندا مەسەلەکانیان باس کردووە و ڕوونیانکردووەتەوە.

وەهەروەها ئەو تایبەتمەندیانەی کەبۆ تاك و جووت و جووت و جووت جووت و تاك جووت و جووت و تاك ڕوودەدات، چونکە بۆ هەریەکە لەوان تایبەتمەندیەکی تایبەتە

بەخۆیان کەئەم هونەرە ئەوانیش دەگرێتەوە بێجگە لەویش دەستناکەوێت. ئەم هونەرەش یەکەمین بەشەکانی تەعالیم و ئاشکراترینینە و لەڕیزی بەڵگەکاندایە. حەکیمە کۆن و نوێکان لەمبارەیەوە دانراوگەلێکی زۆریان هەیە. زۆربەیان ئەم هونەرەیان لەڕیزی تەعالیم و ڕاسپاردە کاندا دایاندەنێن بەجیا لەبارەیانەوە نانوسن ئەم شێوازەش ئیبن سینا لەکتێبی شیفاو ڕزگاربووندا و پێشینەکانی تریش بەکاریان هێناوە. بەڵام پاشینان ئەم هونەرەیان پشتگوێ خستووە چونکە باوی نیە و سودەکەی لەبەڵگەکاندایە نەوەک لەحیسابدا. وازلێهێنانیشی بەهۆی ئەوەوەیە کەپاڵفتەکەی لەبەڵگە حیسابیەکاندا هێناوە و هەروەك چۆن ئیبن البنا ئەم کارەیان لەکتێبی رفع الحجاب و کتێبەکانی تردا ئەنجامیانداوە. خوداش باشتر دەزانێت.

یەکێکی تر لەبەشەکانی زانستی ژمارەکان صەناعەتی حیسابە کەصنعەتێکیشە لەحیسابی ژمارەکاندا لەڕێگەی پەیوەستکردنی کۆکردنەوە و لێدەرکردنەوە. وەپەیوەستکردنی ژمارەکان یان لەڕێگەی تاکەکانەوەیە کەکۆبکرێنەوە یان لەبەهۆی چەندبەرابەریەوە کەژمارەیەك دەخەینەسەر یەکانی ژمارەیەکی تر و دەبێتە دووهێندە، ئەمەش هەمان ئەو زەڕب و لێکدانەیە، وەلێدەرکردنی ژمارەکان یان بەتاکەکانە وەك جیاکردنەوەی ژمارەیەك و زانینی ئەوەی کەماوەتەوە ئەمەش پێی دەگوترێت لێدەرکردن یان جیاکردنەوە و دابەشکردنی ژمارەکان بەچەند بەشێکی یەکسانەوە کەپێی دەگوترێت دابەشکردن (تقسیم)، ئیتر ئەم کۆکردنەوە و لێدەرکردنە لەژارەکاندا ڕێك بێت یان کەسری هەبێت، مانای کەسریش نیسبەتی ژمارەیەکە بەژمارەیەکی ترەوە کەپێی دەڵێن کەسر، وەهەروەها کۆکردنەوە و لێدەرکردن لەجزور و چوارگۆشەکانیشدا هەیە ماناکەشی ژمارەیەکە کەلەنمونەی خۆیدا دەکاتە زەڕب و ژمارەی چوارگۆشە لەوە. ئەو ژمارەیەشی کەبەڕاشکاوی دەگوترێت پێی دەڵێن مەنتیق و چوارگۆشەکەشی بەم شێوەیەو تێیدا پێویست بەزۆر لەخۆکردن ناکات، لە کردارە حیسابیەکاندا وەئەو ژمارەشی کەبەڕاشکاوی ناگوترێت بەکەڕ ناودەبرێت چوارگۆشەکەشی مەنتیقە وەك ڕەگی ٣ کەچوارگۆشەکەی ٣

یە، بەڵام کەڕ وەك ڕەگی ٣ کەچوارگۆشەکی ڕەگی ٣ یە. ئەوەش کەڕە(اصم) و پێویستی بەکردارە حیسابیەکان هەیە. وەهەروەها لەم ڕەگانەشدا کۆکردنەوە و لێدەرکردن هەیە، ئەم صنعەتە حیسابیەش لەهونەرە نوێکانە کەلەحیسابی موعامەلاتدا پێویست دەبێت کۆمەڵێکی زۆر کتێبیان لەبارەیەوە نوسیوەو لەشارەگەورەکاندا مندالآنیان فێرکردووە.

باشترین جۆری فێرکردنیش ئەوەیە سەرەتا بەفێرکردنی حیساب دەست پێبکەن، چونکە مەسەلە ناوبراوەکان مەعاریفێکی ڕوون و ئاشکرا و بەڵگەکانی ڕێکن و بەزۆری بەهۆی فێربوونیانەوە ئەندێشەیەکی ڕوون لەتازە فێرخوازدا بەدی دێت کەلەسەر باشەو ڕاستی ڕایدەهێنێت.

هەندێکیش دەڵێن کەسێك کەلەسەرەتای فێربوونەوە حیساب فێرببێت ڕاستی بۆ ئاشکرا دەبێت، چونکە لەحیسابدا ڕاستیەتی بنەماو قوڵبوونەوە بوونی هەیە ئەمەش وەك خوویەك لەودا دەنەخشێت و لەسەر ڕاستی ڕادێت. وەهەروەها شێوە و مەزهەبێکی لێوە جیانابێتەوە، وەلەباشترین دانراوو نوسراوەکان لەمبارەیەوە کەتائێستەش لەمەغریبدا هەیە کتێبی حصارالصغیرە کەئیبن البنای مەراکیشی کورتی کردووەتەوەو یاساکانی کاری کەزۆر بەسودن ڕێکیان خستوون، دواتریش شەرحێکی بەناوی رفع الحجاب لەسەری نوسی بەڵام ئەم شەرحە بۆ فێرخوازی سەرەتایی قورس و دژوارە، چونکە بەڵگەکانی خاوەن بنەمایەکی بەهێزە. ئەوەش کتێبێکی بەنرخە کەدەستمان کەوتووە و مەشایخ و گەورەکانیش زۆر گرنگی پێدەدەن. دانەریش ڕەحمەتی خودای لێبێت لەم کتێبەدا باسی لەشێوازی کتێبی فیقهە الحساب کەدانراوی مونعیم و کتێبی الکامل کەدانراوی ئەحدەب بووە کردووەو پەیڕەویشی لێ کردووە، بەڵگەکانی ئەو دوودانەرەی کورتکردووەتەوەو لەزاراوەی ئەو پیتانەی کەتێیاندا زانست باوبووە گۆڕیویەتی و دەستی کردووەتە بەڵگە هێنانەوەی ئاشکرا کەبریتیی بووە لەنهێنی پیتەکان و، پاڵفتەکەیان کەهەموویان ئاڵۆز و

دژوار بوون[٢٣١] وەدژواری کتێبی ناوبراو (رفع الحجاب) وەك هەمووزانستی ڕاسپاردەو تەعالیمەکان بەهۆی شێوەی بەڵگەهێنانەوەیەتی وەگەرنا هەموو مەسەلەکانی ڕوونو ئاشکران و، هەرکاتێکیش کەسێك بیەوێت شەرحیان بکات تەنها دەبێت هۆکاری ئەم کردارانە باسبکات بەو ئەندازەیەی کەتێگەشتنی هۆکارەناوبراوەکان دژوارە لەبەکارهێنانی مەسەلەکاندا ئەم دژواریە بوونی نیە. کەواتە دەبێت بەباشی لەم خاڵەدا وورد ببینەوە. خوداش بەنووری خۆی هەرکەسێك کەبیەوێت ڕێنمایی دەکات[٢٣٢].

[٢٣١] (يَهدِى اللهُ بِنُورِهِ مَن يَشاء) س النور ئا ٣٦.

[٢٣٢] (إِنَّ اللهَ هُوَالرَّزَّاقُ ذُوالقُوَّةِ المَتِين) س الذاريات ئا ٥١.

## لەبەشەکانی زانستی حیساب جەبر و موقابەلەیە

ئەوەش صنعەتێکە کەبەهۆیەوە ژمارەی نادیار لەرێگەی ژمارەی دیاری گریمانکراوەوە دەردەهێنرێت بەو مەرجەی کەلەنێوانیاندا نیسبەتێك هەبێت کەخوازیاری ئەم کارە بێت. وەلەزاراوەی ئەماندا بۆ نادیارەکان پلە گەلێك کە لەرێگەی دووهێندەکردنەوە بەهۆی لێکدان و زەربەوە دیاری کراوە کەبەکەمینیان ژمارەیە، چونکە بەهۆی ژمارەوە خوازیاری نادیار لەرێگەی دەرهێنانی ئەوەوە لەنیسبەتی نادیار دیاری دەکرێت. دووەم: شت، چونکە نادیار لەرووی ئەو ئیبهامەوە کەهەیەتی کەئەویش رەگە چونکە لەدووهێندەکردنیدا پێویستە کەبکەوێتە پلەی دووەمەوە.

سێیەم: مالٓ، سەرمایە ئەوەش چوارگۆشیەکی نادیارە. ئەوەشی کەلەدوای ئەمانەوەیە بەپێی نیسبەت نوێنەری (اس) هێزە لەهەردوو لێکدراوەکەدا دواتر کاری گریمانکراو لەبارەی مەسەلەیەکەوە ئەنجام دەدەن و، بەشێوەی موعادەلەیەکی لێدەکەن و کەخاوەنی دوولای جیاواز یان زیاتر لەم جنس و رەگەزانەیە. دواتر هەندێکیان لەگەلٓ هەندێکی تردا موقابەلە و بەراورد دەکەن و ئەوەندە سەرقالٓی جەبر و کەسریان دەبنەوە تاوەکو هەمووژمارەکان ببنە راست پلەکان بەپێی توانا دەهێننە خوارەوە بۆ کەمترینی نوێنەرەکان تاوەکو دەگاتە پلەیەکی سیٓ دانەیی کەخولگەی جەبر لەلای ئەمان لەسەر ئەوەیە کەبریتیەلە: شت (ریشە) و مالٓ (چوارگۆشە). کەواتە ئەگەر موعادەلەیەك تەنها لەنێوان دوو ژمارەدا بێت ئەوکات مالٓ (چوارگۆشە) رەگی نادیارو ئیبهامەکەی بەهۆی موعادەلەی ژمارەوە دابین دەکات و وەلآمەکە ئاشکرا دەبێت. وەئەگەر مالٓ موعادیلی رەگەکان بێت دیسانەوە دەرئەنجامی ژمارەکەیان بەدەست دێت. وەئەگەر موعادەلەکە لەنێوان یەك و دوودا بێت وەلآمەکەی کرداری هەندەسی لەرێگەی تەفصیلی لێکدان و

زەربەوە لەهەردووکیان دەردەهێنرێت ئەم موعادەلەیەش موبهەم و نادیارە، بەڵام ئەم زەربە موفەصەلە ئەنجامەکەی دەدات بەدەستەوە و موعادەلە لەنێوان دووڕستەدا گونجاونیە[٢٣٣]. لایەنی زۆری ئەو موعادەلاتانەی کەئەمان بەکاریان دەهێنن بەشەش مەسەلە کۆتایی هاتووە، چونکە موعادەلە لەنێوان ژمارە و ڕەگ و ماڵ دا ئیتر تاك بێت یان جووتو، پێکهاتە لەشەش جۆر زیاتر نیە یەکەمین کەسێکیش کەلەم هونەرەدا کتێبی نوسیوە ئەبو عبداللەی خوارەزمی و دوای ئەویش ئەبوکامیلی شوجاعی بنی ئەسلەم بوون.

لەپاش ئەوانیش خەڵکی شێوازەکەیان پەیڕەوی کرد و کتێبەکەی ئەو لەمەسەلە شەش لایەنەکەی جەبردا بەباشترین دانراوەکان دەژمێردرا کەلەم بارەیەوە نوسرابن، زۆرێك لەزانایانی ئەندەلوسیش شەرحیان لەسەر نوسیوە و بەشێوەیەکی زۆرباش ئەم کارەیان کردووە باشترینی ئەو شەرحانەش کتێبەکەی قورەشیەو، بەپێی ئەو زانیاریانەی کەبەئێمە گەشتوون هەندێك لەپێشەوایانی تەعالیمی مەشریق موعادەلەکانیان لەم شەش دانەیە تێپەڕاندووە و گەیاندوویانەتە نزیکەی بیست موعادەلەو، بۆ هەموویان کردارگەلێکی پایەداری پشت بەستوویان بەبەڵگەی هەندەسی دەرهێناوە[٢٣٤] خوداش سبحانە وتعالی ئەوەی کەبیەوێت لەخەلقدا زیادی دەکات.

---

[٢٣٣] سێ موعادەلە کەدانەر باسیان لێوەدەکات بریتین لە: $x2=a$, $x=a$, $x2 = ax$ زانایانی جەبری ئیسلام پێیان دەڵێن موعادەلە سادەکان. وەموعادەلە مورەکەب وپێکهاتووەکان کەبریتین لەبوداز ئەمانەن:

$$x2+ax = B, x\ 2 + B = ax, x2 =axB$$

[٢٣٤] دسلان دەڵێ مەبەستی ئیبن خەلدون عومەری خەیامە کەشەش مەسەلەی ئیبن موسا، واتە موعادەلە دوونادیاریەکان موعادەلاتی سێ نادیاری بۆ زیاد کردووەو هەرئەوە کەبۆ خاڵی یەکتر بڕی دووقوچەکی ڕیشەی هەندەسی دروستکردووە. (ترجمە دسلان لا ١٣٧ ب ٣ لە وپك)

## یەکێکی تر لەلقەکانی زانستی حیساب موعامەلاتە

ئەوەش بەکارهێنانی حیسابە لەموعامەلاتی شارەکاندا وەك: کالاّ و ڕووبەرەکان و ماڵی زەکات و کاروبارەکانی تری موعامەلات کەتێیان ژمارە بەکار دێت صنعەت و پیشەی حیسابیش لەدیارە نادیار و کەسر و ڕاست.و ڕەگ و غەیری ئەمانەشدا بەکار دەهێنن، مەبەستیش لەمەسەلە مەفروزە زۆرەکان کەدەخرێنە بەرچاو بەدیهێنانی ڕاهێنان و عادەتە لەڕێگەی دووبارە کردنەوەی کارەوە بۆ ئەوەی مەلەکەی صنعەتی حیساب لەفێرخوازاندا جێگیر ببێت. زانایانی هونەری حیسابیش لەئەندەلوسدا لەمبارەیەوە دانراوگەلێکی زۆریان هەیە کەبەناوبانگترینیان موعامەلاتی زەهراوی و ئیبن السمح و ئەبوموسلیمی کوڕی خەلدونە کەلەقوتابیانی مەسلەمەی موجریتی نمونەی ئەمانەیە.

## یەکێکی تر لەلقەکانی زانستی حیساب فەرائیزە

ئەوەش صنعەتێکی حیسابیە کە لەتەصحیح و ڕاستکردنەوەی بەشی خاوەن فەرزەکان و وەراسەتەکان، کاتێك میراتبەرەکان زۆربن و هەندێکیان بمرن و بەشی ئەوانیش دابەشدەکرێت بەسەر میراتگرەکانی تردا یان فوروز لەکاتی کۆبوونەوەی ژمارەیەکی زۆر بەنیسبەت کۆمەڵەیەکی ترەوە کەزۆر بن. یان ئەوەی کەلەلایەن هەندێك لەواریسەکانەوە فەریزەکە ئیقرار یان ئینکار بکرێت. دواتر لەهەموو ئەم جۆرە پێشهاتانەدا پێویستیان بەکردار گەلێکە کە بەهۆیانەوە بەش و سەهمەکانی فەریزە بەئەندازەی ڕاست و بەشی واریسانیش لەهەر پشتێکەوە بەشێوەیەکی ڕاست دیاری بکرێت، بۆ ئەوەی بەشی واریسەکان لەتەریکەکە بەنیسبەتی بەشی هەریەکە لەکۆی بەشەکانی میراسەکە بەتەواوی دیاری بکرێت. بەم شێوەیە صنعەتی حیساب دەچێتە ناو فەرائیزەکانەوەو پەیوەست دەبێت بەبەشگەلێکی گرنگیەوە وەك مەسەلە ڕاستەکانو ڕەگ و دیار و نادیار، باسە ناوبراوەکان بەپێی بابەکانی فەرائیز فیقهین و مەسەلەکانی تەرتیب دەکرێن و لەم کاتەشدا صنعەتی ناوبراو بەشێك لەفیقە دەگرێتەوە، کەبریتیە لەئەحکام و واریسات وەك: فوروز و عەول (زیادکردنی بەش) ئیقرار و ئینکارو وەصیەتەکان و تەدبیر و مەسەلەکانی تریەتی و هەم بەشێکی تریش لەحیساب دەگرێتەوە کەبریتیە لەڕاستکردنەوەی بەشەکان (سهام)، بەپێی حوکمی فیقهی ئەم بابەتەی فەرائیزیش لەشەریفترینی زانستەکان دەژمێردرێت. هەندێك جاریش ئەهلی ئەو بۆ فەزیلەت و گەورەیی ئەم زانستە حەدیسەکانی پێغەمبەر بەبەڵگە دەهێننەوە وەك:

(فەرائیز یەك لەسەر سێی زانستەکانە) یان (فەرائیز یەکەمین بەهرەی زانستەکانە کەبەدەست دێت)و نمونەی ئەمانە، بەلاّم بەبڕوای من ڕواڵەتی هەموو ئەم حەدیسانە مەبەست لێیان تەکالیفەکانە نەوەك زانستی فەرائیز کەپەیوەستە بەوەراسەتەوە، چونکە ئەم فەرائیزانە لەڕووی چەندیەتیەوە لەوەکەمترە کەبەسێیەکی زانست بژمێردرێت لەکاتێکدا کەفەرائیزە عەینیەکان زۆرن.

خەڵکیش لەم هونەرەدا چ لەکۆن و چ لەسەردەمی نوێدا کتێبگەلێکی جامیعیان داناوە کەباشترینیان لەمەزهەبی ئیمام مالیکدا (ڕ ح) کتێبەکەی ئیبن سابیتە و موختەصەری قازی ئەبو القاسمی حوفی و کتێبی ئیبن المنمر و جعدی و صودی ونمونەی ئەمانە. بەلاّم فەزڵی تایبەت بۆ حوفیەیە چونکە کتێبەکی ئەو لەهەموو دانراوەکانی تر لەپێشترە. یەکێك لەشێخەکانمان کە ئەبوعبداللەی کوڕی سوڵەیمانی سەتی گەورەی مەشایخەکانی فاس شەرحێکی لەسەر نوسیوەو، هەوڵیداوە کەبابەتەکانی ڕوون بکاتەوە و کۆی بکاتەوە، امام الحرمین لەمبارەیەوە کتێبگەلێکی بەپێی مەزهەبی شافیعی نوسیوە کەگەواهیدەری لێهاتوویی و زیرەکی ئەوە لە زانستەکاندا. وەهەروەها حەنەفی و حەنبەلیەکانیش لەمبارەیەوە دانراوگەلێکیان نوسیوە. پلەو پایەی خەڵکیش لەزانستەکاندا جیاوازە. خوداش هەرکەسێکی کەبیەوێت ڕێنمایی دەکات.

# بەشی پانزەهەم

## لەبارەی زانستە ئەندازیاریەکان ( هندسیە )کانەوە

لەم زانستەدا باس لەمەقادیر دەکرێت ئیتر میقدارە پەیوەستەکان (متصل) بن وەك: خەت و ڕووبەر و تەن، یان میقداری جیاکان (منفصل) بن وەك: ژمارەکان. وەهەروەها لەبارەی عەوارزە زاتی و خودیەکانەوە (یاساو تایبەتمەندیەکان) کەبۆ مەقادیر و ئەندازەگیریەکان دێتە پێشەوە باس دەکرێت وەك ئەوەی کە گۆشەکانی هەرسێگۆشەیەك بەرابەرن لەگەڵ دووقائیمەدا: یەکەم: وەك دووهێڵی یەکسان کەلەهیچ سەرێکەوە ناگەنەوە بەیەکتری تاوەکو بێکۆتایی، وەدووەم: دووگۆشەی بەرابەر، هەردوو هێڵی ڕاستی یەکتر بڕ کەبەرابەری یەکترن. وەهەروەها هەرکات چوار ئەندازە گونجاوبن لێکدانی ئەندازەیەی یەکەمیان لەسێیەم وەك لێکدان و زەربی دووەمە لەچوارەم و نمونەی ئەمانە. وەکتێبێك کەلەیۆنانیەوە لەم زانستەدا تەرجەمە کراوەو ئقلیدس دایناوەو پێی دەڵێن کتێبی ئوصول و ئەرکانەکان (بنەماکان) ئاسانترین دانراوێکە کە بۆ فێرخوازان لەمبارەیەوە نوسرابێت. یەکەمین کتێبێکیشە کە لەیۆنانیەوە لەسەردەمی ئەبو جەعفەری مەنصوردا وەرگێڕدرابێتە سەر زمانی عەرەبی و لەبەردەستی موسوڵماناندا بێت. نوسخەکانیشی بەپێی موتەرجیمە جۆراو جۆرەکان جیاوازیان هەیە. لەوانەش ئەو نوسخەیەی کەتەرجەمەکراوی حەنینی کوڕی ئیسحاق و یەکێکی تریش تەرجەمەی سابیتی کوڕی قرە و، تەرجەمەی یوسفی کوڕی حەجاجە.ئەم کتێبە ١٥ بابەتە بەم شێوەیە: چوار مەقالە لەبارەی ڕووبەرەکانەوە،ئەویتریشیان لەمەقادیرە

گونجاوەکان و ئەویتریشیان لە بارەی نیسبەتی ڕووبەرەکانەوەیە لەیەکتریەوە و سێ مەقالەش لەبارەی ژمارەکان و مەقالەی دەیەمیش لەبارەی مەقادیرەکانی مەنتیق و هێزی مەقادیرە ناوبراوەکان و بەدەستەواژەیەکی تر لەبارەی ڕەگەکانەوەیە. وەپێنج مەقالەش لەبارەی موجەسەماتەوەیە. ئەم کتێبەیان چەندین جار کورتکردووەتەوە هەروەك چۆن ئیبن سینا لەتەعالیمەکانی شیفادا ئەم کارەی کردووە. بەشێکی جیای لەکتێبی شیفای بۆ تەرخانکردووە. وەهەروەها ئیبن الصلت لەکتێبی الاقتصاردا کورتی کردووەتەوە و خەڵکانی تریش کورتیان کردووەتەوە هەندێکی تریش شەرحگەلێکی زۆریان لەسەر نوسیوە کتێبی ناوبراو بەشێوەیەکی ڕەها بنەماو مەبدەئی زانستەکانی هەندەسەیە. وەدەبێت ئەوەبزانین کەهەندەسە سودێکی زۆر دەگەیەنێت بەخوێنەرەکەی ژیری ئەو ڕووناك دەکاتەوە و ئەندێشەش ڕێکدەکات، چونکە هەموبەڵگەکانی لەڕووی تەرتیبەوەو ڕێکیەوە ئاشکراو ڕوونن بەهیچ شێوەیەك هەڵە لەقیاسەکانیدا نیە، چونکە یاساو ڕێساکانی ڕێك و پێکن بەهۆی مومارەسەی زۆرەوە لەو زانستەدا ئەندێشە لەهەڵخلیسکان و هەڵە بەدوور دەبێت ئەقڵی تەمرینکارو ڕاهێنانکاری ئەو بەهەمان شێوە بەشێوەیەکی ڕێکوپێك پەروەردە دەبێت.

دەڵێن لەسەردەرگای ماڵەکەی ئەفلاتونەوە ئەم ڕستەیە نوسرابووە (هەرکەسێك هەندەسە نەزانێت نابێت بێتە ناو ئەم ماڵەوە). مامۆستایان و شێخەکانی ئێمە (ڕ ح) دەیانگوت: (مومارەسەکردنی زانستی هەندەسە بۆ بیرکردنەوە، وەك صابوون وایە بۆ جلوبەرگ کەلەپیسی و ئالودەیی پاکیان دەکاتەوە و، هیچ پەڵەیەکیان پێوە ناهێڵێت!) هەمووئەمانەش بەهۆی ئەو خاڵەوەیە کەئاماژەمان پێکرد و گوتمان زانستی ناوبراو خاوەن ئوصوڵ و بەڵگە و بنەماگەلێکی ڕێکوپێکە.

## لەلقەکانی ئەم هونەرەش هەندەسەی تایبەتە بەشێوە خڕ و قووچەکیەکانەوە

بەلاّم لەبارەی شێوە خڕەکانەوە دووکتێب لەبەرهەمی یۆنانیەکان بوونیان هەیە: یەکێکیان ثاوذوسیوس کەلەبارەی ڕووبەری خڕو قتوعەکانیانەوەیە کتێبەکی ساورنوسیوس لەتەعلیمدا لەپێشترە لە کتێبەکەی میلاوش، چونکە زۆرێك بەلٌگەکانی کتێبەکەی دوایی لەسەر ئەوەیە و کەسێك کەبیەوێت لەزانستی شێواز (هیئت) دا تەحقیق‌و موتالاّ بکات ناچار دەبێت هەردوو کتێبەکە بخوێنێتەوە، چونکە بەلٌگەکانی زانستی شێواز لەسەر شێوە خڕەکان وەستاوە هەموو بابەتەکانی ئەو زانستە لەبارەی تۆپەخڕە ئاسمانیەکان و عەواریز گەلێکەوەیە کەتێیاندا ڕوودەدات وەك: قەتع و ئەو بازنانەی کەبەهۆی جوڵەکانەوە بەدی دێن و، هەروەك چۆن لەم بارەیەوە گفتووگۆ دەکەین. چونکە هەندێك جار زانستی شێواز لەسەر ناسینی ئەحکامی شێوە خڕەکاندایە ڕووبەر و قوتوعەکانیشی خڕن کەڕووبەر و قوتوعی ئەوانن. وەهەروەها قوچەکەکانیش لەلقەکانی زانستی هەندەسەیە و زانستێکە کەلەبارەی شێوەو قوتوعی تەنەچووچەك شێوەکان گفتووگۆ دەکات و، هەموو ئەو عەواریزانەی کەلەمبارەیەوە بەدی دێن لەگەڵ بەلٌگە هەندەسیەکاندا کەلەسەر فێرکردنی یەکەم وەستاوە، (پێشەکیە بیرکاریەکان کەلەکتێبەکی ئقلیدسدا باسکراون) دەسەلمێنێت سودی ئەو لەصنعەتە کرداریەکاندا کەمادەکانیان تەنەکانە دەردەکەوێت وەك: وەستایی و ئاسنگەری و چۆنیەتی دروستکردنی پەیکەرە سەرنجڕاکێشەکان و بیناو باڵەخانە بەرزەکان و چۆنیەتی ڕاکێشانی شتە قورسەکان و گواستنەوەی خانووە گەورە و قورسەکان بەهندام و

مەنجەنیق و، نمونەی ئەمانە یەکێك لەدانەرەکانی ئەم هونەرە کتێبێکی جیای لەبارەی فێڵ و فەننە زانستیەکانەوە داناوە کەصنعەتە سەرسوڕهێنەرو فێڵە تازە دەرکەوتووەکانی تێدایە. هەرچەندە کەتێگەشتن لێی بەهۆی سەختی و دژواری بەڵگە هەندەسیەکانەوەیە. ئەوکتێبەش ئێستاکە هەیە و لەدەستی خەڵکیدایە و دەیدەنە پاڵ بەنی شاکر.

## لەلقەکانی ئەندازیاری و هەندەسەش ڕووپێویە (مساحت)

ئەوەش هونەرێکە کەلەڕووپێوی زەویدا پێویستە، ماناکەشی بریتیە لەدەرهێنانی ئەندازەی زەویەکی دیاریکراو بەپێی بست یان زیراع (دەست) یان نمونەی ئەمانە لەپێوەرەکان و نیسبەتی زەویەکە بەزەویەکی ترەوە، هەرکات پێوانە بکرێنو لەبڕیاردانی دانانی باج لەسەر زەویە کشتوکاڵیەکان و باغ و بێستانەکان و دابەشکردنو جیاکردنەوەی سنوری زەوی نێوان شەریکەکان و وەرەسە و نمونەی ئەمانە زۆر پێویست دەبێت و بەکار دێت نوسەرەکانیش لەمبارەیەوە کتێبگەلێکی باش و زۆریان نوسیوە.

## یەکێکی تر لەلقەکانی ئەم هونەرە هەندەسەو ئەندازیاری دیمەن و مەنزەرەکانە

ئەوەش زانستێکە کەبەهۆیەوە هۆکارەکانی هەڵەو پەڵە لەئیدراکی بەصەری و چاودا لەرێی ناسینی چۆنیەتی ڕوودانیەوە ئاشکرا دەبێت، ئەمەش لەسەر ئەوە وەستاوە کەئیدراکی چاووبەصەر بەهۆی قوچەکێکی تیشکیەوەیە کەسەری ئەو قوچەکە خاڵی بینەرەو قاعیدەکەی شتی بینراوە، هەرچەندە بەهۆی بەهەڵە بینینی شتێکەوە کەنزیکە بەگەورە نیشاندەدرێت و شتێکیش کەدوورە بەبچووک نیشاندەدرێت، هەروەها شەبەحە بچوکەکان لەژێر ئاودا و لەپشت تەنە ناسکەکانەوە گەورە دەنوێنن و ئەوقەترانەی کەلەبارانەوە دێنە خوارەوە وەك هێڵێکی ڕێك دەنوێنن و تیشك لەشتانێکی وەك ئاگردانەوە وەك بازنە دەبینرێن و، نمونەی ئەمانە کەلەم زانستەدا هۆکار و چۆنیەتی ئەم جۆرە هەڵەبەصەریانە یان بەڵگە هەندەسیەکان باسدەکرێت بەهۆیەوە جیاوازی دیمەن لەمانگدا بەهۆی گۆڕانکاریەکانی درێژی (البعد الجغرافی) یەکانەوە کەمەعریفەتی بینینی قۆناغەکانی مانگ (ئەهیللە)و، ڕوودانی مانگگیرانەکان لەسەر ئەو وەستاوە ئاشکرا دەکات زۆرێك لەم جۆرە مەسەلانە لەم زانستەدا خراوەتە بەرباس و لێکۆڵینەوە. لەم هونەرەشدا گروپێك لەیۆنانیەکان کتێبیان نوسیوەو بەناوبانگترین و هەڵکەوتووترین نوسەرە ئیسلامیەکان لەم زانستەدا ئیبن الهیسەمە و، زانایانی تریش لەمبارەیەوە دانراویان هەیە و زانستی نابراو لەزانستەکانی بیرکاری و یەکێك لەلقەکانی دەژمێردرێت.

# بەشی شانزەهەم

## لەبارەی زانستی شێوازەوە ( هیئت )

ئەوەش زانستێکە کەلەبارەی جوڵەی ئەستێرە نەگۆڕەکان‌و جوڵەدارەکانەوە باس دەکات و لەبارەی چۆنیەتی ئەم جولآنە ئەو شکڵ و شێوازەی کەئەفلاکە ڕاستەکان بەڕێگەی هەندەسی بەڵگەی بۆ دەهێنرێتەوە و، ئەو شێوانەی کەلەوانەوە ئەم جووڵە هەستپێکراوانە دروستدەبن وەك: ئەوەی کەبەبەڵگە دەسەلمێت کەناوەندی زەوی بەهۆی بوونی جووڵەی ڕووکردن و پشت هەڵکردن (اقبال، ادبار) جیاوازە لەگەڵ ناوەندی فەلەکی خۆردا. وەهەروەها بەهۆی گەڕانەوەو خۆڕاگری ئەستێرەکان لەبوونی ئەفلاك گەلێکی بچووك بەڵگە دەهێنرێتەوە کەهەڵگری ئەوانن لەنێو فەلەکی گەورەتر(ئەعزەم) دا دەجولێن. وەهەروەها بەهۆی جوڵەی ئەستێرەجێگیر و سابیتەکانەوە بەڵگە لەسەر بوونی فەلەکی هەشتەم دەهێنرێتەوە. وەهەم ئەفلاکە زۆرەکان بۆ یەك ئەستێرە بەهۆی زۆری میلەکانیەوە دەسەلمێت و هاوشێوەی ئەمانە. ئیدراکی هەبوو لەجوڵەو چۆنیەتی و جۆرەکانی ئەستێرەکان تەنها بەهۆی چاودێریکردنەوە (رصد) دەکرێت، چونکە ئێمەجوڵەی ئیقبال و ئیدبارمان بەهۆی ڕەصدەوە زانیوە. وەهەروەها ئاگادار بوون لەتەرتیبی ئەفلاکەکان لەچینەکانیاندا و هەم پەیبردن بەگەڕانەوە و جێگیربوون و نمونەی ئەمانە لەڕێگەی ڕەصدو چاودێریەوە دەکرێت، یۆنانیەکان گرنگیەکی زۆریان بەڕەصدداوەو شتانێکیان بۆ بەکار هێناوە کەبەتایبەت بۆ ئەم مەبەستە دانرابوون بۆ ئەوەی بەهۆیەوە جوڵەی ئەستێرەیەکی دیاریکراو چاودێری بکەن، ئەو شتەش لەلای

ئەوان ناوی زات الحلق بوو صنعەتی کار بەو شتەو بەڵگەهێنانەوە لەسەری لەبارەی موتابەقەتی جوڵەیەوە لەگەڵ جووڵەی فەلەکدا لەنێو خەڵکیدا سینە بەسینە و دەم بەدەم گوازراوەتەوە. بەڵام لەئیسلامدا و بێجگە لەهەندێك شوێنی کەم نەبێت گرنگیەکی ئەوتۆی پێنەدراوە هەرچەندە لەسەردەمی مەئموندا ڕەصد تائەندازێك گرنگی پێدەدراو فەرمانی دا ئامێرو کەرەستەی چاودێری و ڕەصد کەناوی زات الحلق بوو دروست بکەن‌و دەستیانکرد بەچاودێریکردن بەڵام نەگەشتە کۆتاییو، لەبەر ئەوەی کەمەئمون مرد شوێنەواری ئەویش لەناوچوون خەڵکی بێئاگابوون لێی و لەپاش مەئمون تەنها بەڕەصدە کۆنەکان کاریاندەکرد، بەڵام ئەو ڕەصدانە بەس نەبوو بۆیان چونکە جووڵەکان بەهۆی تێپەڕبوونی سەدەکانەوە گۆڕدرا، ئەڵبەت موتابەقەی جوڵەی ئامێرێکی چاودێری وڕەصد لەگەڵ جوڵەی ئەفلاك و ئەستێرەکاندا تەقریبیە و بەهیچ شێوەیەك نامانگەیەنێتە تەحقیق هەربۆیە هەرکاتێك سەردەمێکی زۆر تێپەڕ بکات جیاوازی ئەو نزیکبوونەوەیە دەردەکەوێت، شێواز (هیئت) صنعەتێکی شەریفە بەڵام بەو جۆرەی کەبەناوبانگە ئەم هونەرە شێوەی ئاسمانەکان و تەرتیبی ئەفلاك بەشێوەیەکی حەقیقی بۆ ئێمە ناسەلمێنێت، بەڵکو بەو ئەندازەیە ئێمە ئاگادار دەکاتەوە کە ئەم شکڵ و شێوەی ئەفلاکانە بەهۆی ئەم جووڵانەوە دروستبوون، ئێمەش دەزانین کەڕێگریەك نیە کەشتێك هۆکارو لازیمەی شتانێکی جۆراو جۆر بێت وەئەگەر بڵێین جوڵەکان لازیمەی ئەوانن ئەم جۆرە قسەیە بەڵگە هێنانەوە لەسەر لازمە بەهۆی بوونی مەلزومەوە.

بەهیچ شێوەیەکیش نامانگەیەنێتە حەقیقەتی مەسەلەکە، بەڵام لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا شێواز (هیئت) زانستێکی پایەبەرز و یەکێکە لەپایەکان تەعالیم. باشترین دانراویش لەم بارەیەوە (کتێبی مجستی) کەدراوەتە پاڵ بتلیموس ئەم بتلیموسەش لەپاشاکانی یۆنان نەبووە کەناوەکەی بتلیموسە، هەروەك چۆن هەندێك لەشەرحکارانی کتێبی مجستی تەحقیقیانکردووە. ئەم کتێبەش هەندێك لەپێشەوایانی حیکمەتی ئیسلام کورتیان کردووەتەوە هەروەك چۆن ئیبن سیناش کورتی کردووەتەوە و خستویەتیە ناو

تەعالیمەکانی شیفاوەو گونجاندوویەتی لەگەڵیاندا. ئیبن ڕوشد لەحەکیمەکانی ئەندەلوس‌و ئیبن السمحیش کورتی کردووەتەوە ئیبن الصلتیش لەکتێبی اختصاردا کورتی کردووەتەوە. ئیبن فەرغانیش هەیئەتێکی کورتی هەیە کەلەتێگەشتنەوە زۆر نزیکە بەلاّم بەڵگەکانی لابردووە، خوداش ئەوەی کەمرۆڤ نەیدەزانی فێری کرد.[٢٣٥]

---

[٢٣٥] (عَلَّمَ الإِنسانَ مَالَم يَعلَم) س اقرأ ئا ٥.

## لەلقەکانی شێواز( هیئت ) زانستی زیجە

ئەوەش پیشەیەکە پەیوەستە بەحیسابەوە و لەسەریاساکانی ژمارە وەستاوە، لەوەی کە هەرئەستێرەیەك ڕێگەیەکی جوڵە تایبەتەپێیەوە و ئەوەی کەبەبەڵگەیەی شێوازە دەبێت هۆی بارودۆخی وەك: خێرایی و خاوی و خۆڕاگری و گەڕانەوە و نمونەی ئەمانە. بەهۆی ئەم زانستەوە شوێنی ئەستێرەکان لەئەفلاکەکانیاندا، لەهەرکاتێکی دانراودا لەڕێگەی موحاسەبەی جوڵەی ئەوانەوە دەتوانین بیانناسین ئەمەش بەپێی یاساگەلێکە کەلەکتێبەکانی شێواز و هەیئەتەوە دەردەهێنرێت. ئەم صنعەتەش یاساگەلێکی هەیە وەك پێشەکی و بنەماکانی ئەو لەناسینی مانگ و ڕۆژ و مێژووە ڕابووردووەکان‌و بنەماگەلێکی نەگۆڕن وەك: ناسینی ئەوج و حەزیز و میلەکان و هەموو جۆرە جووڵەکان‌و دەرهێنانی یەك جووڵە لەجووڵەیەکی تر و، کەبنەما ناوبراوەکان بۆ ئاسانکاری فێرخوازان دەخەنە خشتەگەلێکی ڕێکەوە و پێیان دەڵێن زیج. وەدەرهێنانی شوێنی ئەستێرەکان لەکاتەدانراوو مەفروزەکاندا پێی دەڵێن تەعدیل و تەقویم. خەڵکیش لەمبارەیەوە ئیتر پێشینان بن یان پاشینان کتێبگەلێکی زۆریان نوسیوە وەك البتانی و ئیبن الکماد. پاشینانیش تاوەکو ئەم سەردەمەش لەمەغریبدا باوەڕیان بەزیجێك هەیە کەدراوەتە پاڵ ئیبن ئیسحاق (ئەستێرەناسی تونسی)و، پێیان وایە کەناوبراو لەم زیجەدا پشتی بەڕەصدە چاودێری بەستووە. لەبەر ئەوەی کە پیاوێکی یەهودی کەلەصەقەلیەدا بووە لەشێواز و تەعالیمەکاندا لێهاتووبووە و، گرنگیەکی زۆری بەڕەصد داوە و ئەوەی کەلەبارەی حاڵی ئەستێرە و جوڵەیانەوە کەشفی بکردایە دەینارد بۆ ئیبن ئیسحاق. هەربۆیە خەڵکی مەغریب باوەڕیان بەزیجەکەی ئیبن ئیسحاق هەبوو چونکە بنەماکانی

لەسەر قسەکانی پیاوە یەهودیەکە وەستابوون. ئەم زیجەش ئیبن البنا لەلەوحەیەکی تردا کورتی کردووەتەوە و ناوی ناوە المنهاج. وەلەبەر ئەوەی کارانێکی تێدا ئەنجامدراوە زۆرئاسان بوون خەڵکی خوازیاری بوون‌و تەنها بۆ ناسینی شوێنی ئەستێرەکان بەنیسبەت ئاسمانەوە پێویستی بەوە هەبوو تاوەکو ئەحکامە نجومیەکانی لەسەر دابمەزرێنێت‌و، ئەحکامی نجومیش ناسینی ئەو شوێنەوارانەیە کەبەهۆی بارودۆخیانەوە لەجیهانی مرۆڤدا شوێنەوارگەلێك حادیس دەبن وەك گۆڕانی گەلان‌و دەوڵەتەکان‌و مەوالیدەکانی مرۆڤ و بوونەوەرانی تر، هەروەك چۆن لەداهاتوودا ئەم بابەتە باسدەکەین‌و بەڵگەکانیان لەمبارەیەوە ڕووندەکەینەوە، انشط اللەتعالى.

# بەشی حەڤدەهەم

## لەبارەی زانستی ژیربێژی (مەنتیقەوە)

ئەوەش یاساگەلێکە کەبەهۆیەوە دەتوانین بەسنوری مەعریفەی چیەتی (ماهیەت)و بەڵگەکان (حجت) سوودبەخش و تەصدیقە ڕاستەکان لەدرۆو ناڕاستەکان جیابکەینەوە. باس و ڕوونکردنەوەکەشی بەم جۆرەیە ئەسڵ لەئیدراکدا مەحسوساتگەلێکن کەبەپێنج هەستەکە دەیانزانین، وەهەموو حەیوانات لەناتیقەوە بیگرە تاوەکو نمونە ئەمانە لەم جۆرە ئیدراکەدا لەگەڵ یەکتریدا هاوبەشن. مرۆڤیش لەهەمووگیانەوەرانی تر بەدەرکی گشتیەکان (کلیات) کەجیایە لەمەحسوسات (هەستپێکراوەکان) دەناسرێتەوە تەجریدو جیاکردنەوەکەشی بەم شێوەیە کە کەسەکان هەروەك شێوەیەك لەخەیاڵدا دەنەخشێن، هەروەك چۆن بەسەر هەموو ئەوکەسە مەحسوسانەدا جێبەجێ دەکرێت ئەمەش بریتیە لەگشتی (کلی) یەك. دواتر زەین لەنێو ئەم کەسانەدا وەك کەسەکانی تر کەلەهەندێك ڕووەوە وەك یەکن سەیردەکات و دیسانەوە شێوەیەکی تێدا بەدی دێت کەلەسەر ئەم دووجۆرەش لەڕووی ئەو لێکچوونانەی کەبەیەکەوە هەیانە جێبەجێ دەبێت. بەردەوامیش زەین لەتە جرید بەگشتیەك (کولیەك)بەرەوپێشەوە دەچێت تاوەکو لەئەنجامدا کولیەکی تر نادۆزرێتەوە کەلەگەڵ کولیەکەی یەکەمدا وەك یەك بن. هەربۆیە کولی ناوبراو بەئاسایی‌و بەسیت دەژمێردرێت. ئەم جۆرە تەجریدەش وەك ئەوەوایە کەزەین لەکەسەکانی مرۆڤەوە شێوەی جۆری جێبەجێکراوی لەسەر تەجرید دەکاتو دواتریش لەنێوان ئەوو حەیواندا بیر دەکاتەوە و دەستدەکات بەتەجریدکردنی شێوەی جنسی جێبەجێ

کراولەسەری و دواتریش سەیری حەیوان و گیاکان دەکات و تاوەکو سەرئەنجام دەگاتە جنسی عالی کەگەوهەرەو، دواتر کوللیەکی تریش کەلەهیچ شتێکدا لەو نەچێت نادۆزێتەوەو، لەئەنجامدا ئەقڵ لەم قۆناغەدا لەتەجرید دەوەستێت. سەرەڕای ئەمەش لەبەرئەوەی کەخودا لەخەڵکیدا ئەندێشەی ئافراند کەبەهۆیەوە لەزانست و هونەرەکان تێدەگات و زانستیش لەدووجۆر بەدەر نیە یەکێکیان تەصەووری چیەتیەکانە (ماهیەت) نە کەبەهۆی خوازیاری ئیدراکێکی سادەدەبین بەبێ ئەوە کەحوکمێکی لەگەڵدا بێت، وەئەویتریشیان تەصدیقە واتە حوکمکردن بەسابیت بوونی شتێك بۆ شتێکی تر. هەربۆیە هەوڵی ئەندێشە بۆ بەدەستهێنانی شتە خوازراوە کان بەدووشێوە ڕوودەدات: یەکێکیان ئەوەیە کەکوللیاتەکان کۆدەکاتەوە و بەشێوەی تەئلیف پەیوەستیان دەکات بەیەکەوە و دواتر لەزەیندا شێوەیەکی گشتی (کلی) دەنەخشێتو کەبەسەر هەموو تاکەکانی دەرەوەدا جێبەجێ دەبێت. ئەم شێوە زەینیەش هاوکاردەبێت بۆ ناسینی چیەتی ئەوکەسانە.

یەکێکی تریش ئەوەیە بەشتێك حوکم دەکرێت بەسەر شتێکی تردا بۆ زەینیش ئەو حوکمە دەسەلمێتو ئەم جۆرە ئیدراکەش پێی دەڵێن تەصدیق ئامانجیشی لەڕاستیدا دەگەڕێتەوە بۆ تەصەوور، چونکە سودەکەی هەرکاتێك بەدی بێت بریتیە لەناسینی حەقیقەتی شتانێك کەخوازیاری زانستن. ئەم هەوڵەی ئەندێشەش جارێك ڕاستو جارێکیش ناڕاستەو، هەربۆیە پێویستە شێوەیەك کەبەهۆەیەوە ئەندێشە بۆ بەدەستهێنانی بابەتە زانستیەکان هەوڵدەدات دیاری بکەین بۆ ئەوەی ڕاست لەناڕاست جیابکەینەوە ئەم شێوەیەش یاسای مەنتیقە. پێشینان یەکەمین جار کەباسی ئەم زانستەیان کردووە بەشێوەیەکی پارچەپارچەو بەربڵاو قسەیان لەسەر کردووە شێوەکانی پاڵفتەنەکراو و بابەتەکانی پەراگەندە بوون، تائەوەبوو لەیۆناندا ئەرستۆ دەرکەوت و دەستیکردە تەهزیب کردنی بابەتەکانی مەنتیق. بەشەکانی ڕێککردەوە و سەرەتا زانستی فەلسەفەی خستە پێشەوە و، هەربۆیە ئەم زانستە ناونرا یەکەمین زانست و کتێبە

تایبەتەکەی بەناوی (فص) وە ناوزەد کردبوو کەلەهەشت کتێب پێکهاتبوو، چوار کتێبیان لەبارەی شێوەی قیاس و، چوارکتێبی تریشیان لەبارەی مادەی ئەوەوەیە، چونکە بابەتە تەصدیقیەکان بەشێوەیەکی جۆراو جۆر باسدەکران: لەوانە ئەو تەصدیقاتانەن کەبەسروشت یەقین تێیاندا پێویستە لەهەندێکیشیاندا زەنن پێویستەو ئەوەش خاوەنی قۆناغگەلێکی تایبەتی خۆیەتی، هەربۆیە لەقیاسدا بەپێی پێویست بیردەکەنەوە و وەهەم لەوەی کەباشبێت پێشەکیەکانی بەم ئیعتیبارە بابەتێکی خوازراوی تایبەت دەژمێردرێت بەتایبەت لەڕووی بەرهەمهێنانیەوە، بەهەمان شێوە لەقیاس دەڕوانن و لەبارەی نەزەری یەکەمینەوە دەڵێن کەئەو لەڕووی مادەوەیەو مەبەستیش مادەیەکە کە بۆ شتێکی پێویستی تایبەت، ئیتر یەقین یان زەنن بەسود و بەرهەمدار بێت. وەلەبارەی نەزەری دووەمەوە دەڵێن کەئەو لەڕووی شێوەوبەرهەمەوە بەشێوەیەکی ڕەها قیاسە. هەربۆیە مەنتیقیان لەهەشت کتێبدا قەتیس کردووە:

١ – لەبارەی جنسە عالیەکانەوە کەتەجریدی هەستپێکراوەکان بەوان کۆتاییان دێت ئەوەش جنسێکە کە باشتر لەو دەستناکەوێتو بەم بەشەش دەڵێن کتێبی (مەقولات).

٢ – لەبارەی مەسەلە تەصدیقی و جۆرەکانیەوە کەبەمانەش دەڵێن کتێبی (عیبارەت).

٣ – لەبارەی قیاس و شێوەی بەرهەمهێنانیەوە بەشێوەیەکی ڕەها کەپێی دەڵێن کتێبی (قیاس) ئەمەش کۆتا نەزەرە لەڕووی شێوە(صورە) وە.

٤ – کتێبی (برهان) کەبریتیە لەبیرکردنەوە لەقیاسی بەرهەمهێنەر بەیەقینەو ئەوەی کە بەچ شێوەیەك دەبێت پێشەکیەکانی یەقینی بن و تایبەت بووە بەمەرج گەلێکی ترەوە بۆ ئیفادەی یەقین کەتێیدا باسکراوە، وەك ئەوەی کەزاتی ئەوەلی و نمونەی ئەمانە بێت. لەم کتێبەشدا لەبارەی موعەریفەکان (پێناسەرەکان) و سنورەکانیشەوە گفتووگۆ دەکرێت، چونکە داواکراو هەمان ئەو یەقینەیە بۆ واجببوونی موتابەقەت و گونجاوی لەنێوان سنورو سنوردارکراو (حدود، محدود) هەروەك چۆن گریمانی ئەوە هەبێت

کەبوەشێك نەبێت لەوان، هەربۆیە پێشینان مەسەلە ناوبراوەکانیان تایبەتکردووە بەم کتێبەوە.

٥ – کتێبی جەدەل ئەوەش قیاسێکە کەسودەکەی بڕینی هەراو هۆریاو داخستنی زمانی بەرامبەرەو ئەو بەڵگە بەناوبانگانەی کەدەبێت تێیدا بەکار بهێنرێن. ئەم قیاسەش لەڕووی ئیفادەیەوە بۆ ئەم مەبەستە تایبەت بووە بەهەلومەرجگەلێکی ترەوەو هەلومەرجە ناوبراوە کانیش لەبابی جەدەلدا باسکراوە. لەم کتێبەدا بابەت گەلێك باسدەکرێن کەخاوەنی قیاس لەوانەوە قیاسی خۆی هەڵدەبژێرێت ئەوەش لەڕێگەی دیاریکردنی جامیع و کۆکەرەوە نێوان دوولایەنی خوازراو کەناویان نێوەندە کەتێیدا وێنەی مەسەلە و ڕووداوەکان بوونیان هەیە.

٦ – کتێبی سفستەئەوەش قیاسێکە کەپێچەوانەی حەق دەگەیەنێت مونازەرەکار لەگەڵ بەرامبەرەکەیدا دەکەوێتە تێکەڵکردنەوە، ئەوەش لەڕووی مەبەست و بابەتەوە بەتاڵە و ئەوەش هەمان ئەو شتە نوسراوەیە بۆ ئەوەی قیاسێکی تێکەڵ‌و پێکەڵی پێ بناسرێتەوە و لێی دوور بکەوینەوە.

٧ – کتێبی خیتابە ئەوەش قیاسێکە کە بۆهاندانی جمهوور و خەڵکی عامەو بۆمەبەستێك کەهەیانە بەکاردەهێنرێت، لەم کتێبەدا ئەو بابەتانەی کەدەبێت لەم قیاسەدا سودی لێوەربگیرێت باسکراون.

٨ – کتێبی شیعر، ئەوەش قیاسێکە کە بەتایبەت ئیفادەی تەمسیل و تەشبیە دەکات‌و بۆ ڕووکردنە شتێك یان نەفرەتکردن لێی بەکار دەهێنرێت وەلەم کتێبەشدا مەسەلەگەلێکی خەیاڵاوی کەدەبێت بەکاربهێنرێن باسکردووە. ئەمانە هەشت کتێبەکەی مەنتیق لەلای پێشینان. بەڵام حەکیمەکانی یۆنان لەپاش ئەوەی کە ئەم صنعەتەیان تەهزیب کرد بابەکانیان ڕێکخست هاتنە سەر ئەو باوەڕەی کەدەبێت لەبارەی کوللیاتی خەمسەوە کەئیفادەی تەصەووردەکەن قسەبکەین، ئەو تەسەووڕەی کەلەگەڵ ماهیەتەکانی دەرەوە یان لەگەڵ بەش و یانلەگەڵ لەگەڵ عەوارێزەکانیاندا موتابیق بێت

کەبریتین لە: جنس و فەصڵ و نەوع و خاصە و عەرەزی عام. هەربۆیە تێیدا دەستیانکردە ئیستیدراکی مەقالەیەك کەبەشێوەیەکی پێشەکی لەسەرەتای هونەرەکەوە تایبەت بووە پێیەوە، لەئەنجامدا ئەم هونەرە بووتە خاوەنی نۆ کتێب و هەموو کتێبە ناوبراوەکانیش لەنێو نەتەوەی ئیسلامدا تەرجەمەکراون فەیلەسوفە موسوڵمانەکان شەرح‌و کورتیانکردوونەتەوە، هەروەك چۆن فارابی و ئیبن سینا و دواتریش ئیبن ڕوشد لەفەیلەسوفانی ئەندەلوس ئەم کارانەیانکرد. ئیبن سینا کتێبی شیفای دانا و تێیدا بەشێوەیەکی کۆو جامیع هەرحەوت زانستەکەی فەلسەفەی کۆکردەوە و دواتریش پاشینان دەرکەوتن و زاراوەی مەنتیقیان گۆڕی و، سودەکەیان لکاندووە بە کوللیاتی خەمسەوە کەبریتیە لەباسکردن لەبارەی سنور و ڕەسمەکانەوەو ئەم مەسەلانەی لەکتێبی برهانەوە گواستەوە بۆ ئەم کتێبە کتێبی مەقولاتیان لابرد، چونکە نەزەری مەنتیقی لەبارەیانەوە عەرەزیە و زاتی نیە.

عیبارەتی بەحسیان لەبارەی وێنەوە لکاند بەکتێبەکەوە، بابەتی ناوبراو هەرچەندە لەکتێبی پێشیناندا لەکتێبی جەدەلدا بوو بەڵام مەسەلە باسکراوەکان بەهۆی هەندێك لایەنەوە لەپاشگرەکانی بابەتی مەسەلەکانە. لەپاشان لەبارەی قیاسەوە لەڕووی بەرهەمهێنانیەوە بۆ بابەتەکان بەشێوەیەکی گشتی باسیانکردووە نەوەك بەپێی مادەکەی، بەڵکو باسکردن لەبارەی مادەکەیەوە کەبریتیە لەپێنج کتێبەکە: برهان و جەدەل و خیتابە و شیعر و سفستەیە لایانبردووە وەلەوانەیە هەندێك جار هەندێك لەوان گرنگی بەبەشێکی کەمی بدەن، بەڵام بەشێوەیەکی گشتی بەجۆرێك بابەتی نابراویان لەبیر کردووە کەهەروەك بڵێی بوونی نەبووە ئەمەلەکاتێکدا بابەتی ناوبراو گرنگ و شیاوی متمانە پێکردنە. دواتر لەپاش گۆڕانکاریە باسکراوەکان لەو مەسەلانەی کەخۆیان دایانناوە بەدوور و درێژی و بەشێوەیەکی گشتی‌و جامیع قسەیان لەبارەوە کردووەو بەجۆرێك لەمەنتیق وورد دەبوونەوە گوایە هونەرێکی سەربەخۆیە نەوەك لەو ڕووەوەی کەهۆکارێکە بۆ زانستەکان. لەبەر ئەمەیە کەگفتووگۆکردن لەبارەیەوە درێژەی کێشاوە

یەکەمین کەسێکیش کەئەم کارەی کرد ئیمام فخرالدینی کوڕی خەتیب بوو، لەپاش ئەویش ئەفزەل الدینی خونجی شێوازەکەی ئەوی پەیڕەو کرد و خەڵکی مەشریق تاوەکو ئەم سەردەمەش متمانەیان بەکتێبەکانی ئەو هەیەو، لەم صنعەتەشدا کتێبێکی بەناوی کشف الاسرار هەیە، بەلاّم کتێبی ناوبراو دووورودرێژە و کتێبێکی تری کورتی هەیە بەناوی مختصر الموجز ئەم کتێبەش بۆ فێربوون باشترە.

لەپاشان کتێبێکی تر بەناوی مختصر الجمل لەچوار لاپەڕەدا نوسی و تێیدا مەجامیعەکانی هونەرەکە و بنەماو ئوصولەکانی کۆکردەوە هەربۆیە فێرخوازان ڕوویان تێکردو تاوەکو ئەم سەردەمەش دەیخوێنن و سودێکی زۆری لێوەردەگرن، کتێبی پێشینان و شێوازەکانیان بەجۆرێك لەناوچووە هەروەك بڵێی بەهیچ شێوەیەك بوونی نەبووە ئێستاکەش کتێبە ناوبراوەکان پڕن لەدەرئەنجام و سودی مەنتیق هەروەك چۆن گوتمان. خوداش ڕێنماکاری مرۆڤە بۆ سەر ڕێگەی ڕاست.

# بەشێك

دەبێت ئەوە بزانین کەپێشینانی سەلەف و زانایانی زانستی کەلام بەمومارەسەت لەم هونەرەدا (مەنتیق) بەتوندی دژایەتیان دەکرد بەشێوەیەکی لەڕادەبەدەر ئەو کەسانەی کەسەرقاڵی فێربوونی مەنتیق بوون لۆمەو سەرزەنشتیان دەکردن‌و لەفێربوونی ئاگاداریان دەکردنەوە، بەکورتی فێربوون و فێرکردنی زانستی ناوبراویان قەدەغە کردبوو. بەڵام لەپاش ئەوەی کەپاشینان لەسەردەمی غەزالی و ئیمام ئیبن الختیب[٢٣٦] دەرکەوتن لەم دژایەتیەدا تائەندازیەك لێبوردنیان هەبوو، لەو ڕۆژەوە خەڵکی دەستیانکردە بەدەستهێنان و مومارەسەکردن لەو هونەرەداو تەنها گروپێکی کەم لەمباریەوە لەگەڵ بۆچوونی پێشینان‌دا بوون‌و، لەهونەری ناوبراو دوور دەکەوتنەوە و لەئینکاریکردنیدا زیادەڕۆییان دەکرد، وەئەوەی کە خاڵی قبوڵ و ڕەتکردنەوەی ئەم هونەرە ئاشکرا دەکەین بۆئەوەی مەبەستی زانایان لەشێوازە زانستیەکانیاندا ئاشکرا دەبێت: سەرچاوەی ڕەتکردنەوەی هونەری مەنتیق لێرەوە پەیدا بوو لەبەر ئەوەی موتەکەلیمەکان زانستی کەلامیان بۆ یارمەتیدانی عەقیدە ئیمانیەکان بەبەڵگە ئەقڵیەکان داناوە، شێوازی ئەوان لەمبارەیەوە پشت بەستووە بەبەڵگە گەلێکی تایبەت کەلەکتێبەکانی خۆیاندا باسیانکردووە، وەك ئەوەیکە بۆ حدوسی جیهان لەڕێگەی سەلماندنی عەرەزەکان و حادیس بوونیان بەڵگە دەهێننەوە خاڵی بوونی تەنەکان لەچۆنیەتی حدوس بەقەدەغەدەزانن و، دەڵێن هەرچیەك خاڵی نەبێت لەحەوادیس خۆی

---

[٢٣٦] مەبەستی فەخری رازیە.

حادیسە[237]، وەهەروەها سەلماندنی تەوحید بەبەڵگەی تەمانع[238] و سەلماندنی سیفاتی قەدیم بەهۆی جەوامیعە چوارینەکانەوە لەڕووی لکاندنی غایب بەحازرەوە و دەلیلەکانی تریش کەلەکتێبەکانیان باسکراوە. دواتر ئەم دەلیلانە لەڕێگەی فەراهەمکردنی قەواعید و ئوصوڵگەلێکەوە باسیانکردووە کەیاسا ناوبراوەکان وەك پێشەکی ئەوانن، وەك سەلماندنی جەوهەری تاك و زەمانی تاك و نێوانی تەنەکان و نەفی تەبیعەت و تەرکیباتی ئەقڵی بۆ ماهیەتەکان و ئەوەی کەعەرەز لەدوکاتدا نامێنێتەوەو، سەلماندنی حاڵی و ئەو سیفەتەیە بۆ بوون کەنەهەبووە و نەنەبووە، وەیاساکانی تر کەبەڵگەکانی تایبەت بەخۆیان لەسەر ئەوان دامەزراندووە.

دواتر شێخ ابوالحسنی ئەشعەری و قازی ابوبەکری باقلانی و مامۆستا ئەبوئیسحاقی اسفراینی گوتوویانە کەبەڵگەکانی عەقیدە ئاینیەکان پێچەوانەن بەو مانایەی کەهەرکات دەلیلەکە بەتاڵ ببێتەوە مەدلولیش بەتاڵ دەبێتەوە، هەربۆیە قازی ئەبوبەکری باقلانی پێی وایە کەدەلیلەکان وەك عەقایدی ئوصولْ و قەواعیدی دینین و لۆمەکردنیان وەك لۆمەکردنی عەقیدە وایە، چونکە عەقیدەکان لەسەر ئەوان دامەزراون. بەلاّم هەرکات بیر لەهونەری مەنتیق بکەینەوە دەبینین کەهەموو بابەتەکانی بەدەوری هەمبەستەگی و پەیوەستبوونی ئەقڵیدا دەسوڕێنەوەو لەسەر سەلماندنی کوللی تەبیعی لەدەرەوە وەستاوە بۆ ئەوەی کوللی زەینی کەدابەشبووە بەسەر پێنج گشتیی و کوللیەکەدا[239]، واتە جنس و نەوع و فەصلْ و خاصە و عەرەزی عام و عەرەزی خاص دابەشبوون بەسەریدا جێبەجێ بکرێت. بەلاّم ئەم تیۆرە موتەکەلیمەکان بەبەتاڵی دەزانن کوللی زاتی بەبیروباوەڕی ئەوان بریتیە لەئیعتیباری زەینی کەلەدەرەوە شتێك نیە تاوەکوبەسەریدا

---

[237] مەبەست صغری کبری بەناوبانگە کەدەڵێن جیهان موتەغەییرە و هەموو موتەغەییرێکیش حادیسە.

[238] مومانەعەتی دوولایەنە یان بەرخوردو تەصادومی حەزەکان، یەکێکە لەبەڵگەکان کەلەسەلماندنی خودادا دەیهێننەوە.

[239] کوللیاتی خەمس لەمەنتیقدا بریتین لە جنس (حەیوان) نەوع (مرۆڤ) فصل (ناتیق) خاصە (زاحیك) عەرەزی عام (ماشی). غیاس.

جێبەجێ بکرێت. یان بەبیروباوەڕی گروپێك کەباوەڕیان بەتیۆری حاڵەت هەیە کوللی بەحاڵەتێك دەزانن. هەربۆیە هەرپێنج کوللیەکە و ئەو پێناسەیەی کەلەسەری وەستاوە و دەمەقولاتەکە بەتاڵ دەبنەوەو هەروەها عەرەزی زاتیش بەتاڵ دەبێتەوەو لەئەنجامدا ئەو مەسەلە پێویستیە زاتیەکان کەبەعەقیدەی مەنتیقیەکان بەڵگە مەرجدارە بەوانەوەو، هەم هۆکاری ئەقڵی بەتاڵ دەبێتەوەو بمانەوێت‌و نەمانەوێت کتێبی برهان لەمەنتیق و ئەو بەشانەی کە پاڵفتە و ناوکرۆکی کتێبی جەدەلە بەهەمان شێوە مەحکومن بەبەتاڵبوونەوە، ئەوانەش مەسەلەگەلێکن کەناوەندی کۆکەرەوە و جامیعی نێوان هەردوولا لەقیاسدا لەوانەوە وەردەگیرێت و بێجگە لەقیاسی صوەری[٢٤٠] نامێنێتەوەو لەتەعریفاتە مەنتیقیەکان تەنها ئەوانە دەمێننەوە کەبەسەر خەڵکانێکی سنوردار لەجنسی خۆیاندا جێبەجێ دەبن بەجۆرێك بەلەگشتین‌و کەنمونەیان لەپێناسەکەدا داخڵ بکەن، نەلەتایبەتیشن کەهەندێك لەو کەسانە بکەنە دەرەوە ئەم جۆرە تەعریفەش هەمان ئەو تەعریفەیە کەنەحویەکان پێی دەڵێن جامیع و مانیع و، موتەکەلیمەکانیش پێی دەڵێن تەرد و عەکس، و پایەکانی مەنتیق یەکسەر دەڕووخێن.

ئەگەر ئێمەش ئوصولی موتەکەلیمەکان بەپێی قەواعیدەکانی مەنتیق بمانەوێت بیانسەلمێنین زۆرێك لەموقەدیمەکانیان بەتاڵ دەبنەوە هەروەك ڕابورد، دواتر ئەو بەڵگانەی کەبۆ سەلماندنی عەقیدە ئیمانیەکان هێناویانەتەوە مەحکوم دەبێت بەباتڵبوون. هەربۆیە موتەکەلیمانی پێشین لەناشیرینکردنی مومارەسەو فێربوونی مەنتیقدا ئەو هەموزیادەڕۆییەیان کردووە پێیان وابووە کەبەبەتاڵبوونەوەی دەلیل مەدلول بەتاڵ نابێتەوەو تێڕوانینی مەنتیقیەکان لەبارەی هەمبەستەیی و پەیوەستبوونی ئەقڵی بوونی ماهیەت‌و چیەتی سروشتی و کوللیاتەکانی لەدەرەوە بەڕاستیان زانیوە، هەربۆیە گوتوویانە کە مەنتیق دژ نیە لەگەڵ عەقیدە ئیمانیەکاندا هەرچەندە دژی هەندێك

---

[٢٤٠] قیاس یان شکڵ لەزاراوەی مەنتیقدا قسەیەکە کە لەدوو ڕستە پێکهاتووە، کەپێویستە لەوەوە دەرئەنجام وەربگیرێت. یان مەبەست ئەوقیاسەیە کەخاوەنی یەك موقەدیمە بێت.

لەدەلیلەکانیانە، بەڵکو هەندێك جاریش بەڵگەیان لەسەر بەتاڵبوونەوەی زۆرێك لەموقەدیمە کەلامیەکان دەهێنایەوە وەك نەفی جەوهەری تاك گشتی و مانەوەی عەرەزەکان و نمونەی ئەمانە، لەبری دەلیلی موتەکەلیمەکان لەسەر سەلماندنی عەقیدە ئیمانیەکان بەڵگەگەلێکی تر ئاشکرا دەکەنو دەهێننەوە کەبەئەندێشەو قیاسی ئەقڵی ڕاستیان دەکردەوەو بەهیچ شێوەیە ئەم شێوازە لەبەڵگە هێنانەوە بەلای ئەمانەوە لەعەقیدەکانی ئەهلی سوننەتدا لۆمە نەکراوە، ئەمەش نەزەریە و تیۆری ئیمامی غەزالیو ئەو کەسانەیە کەتاوەکو ئەم ڕۆژگارەش پەیڕەوی لەوان دەکەن.

کەواتەپێویستە خوێنەر لەمبارەیەوە بیربکاتەوە وپەی بەمەداریك و بەڵگەکانی زانایان لەشێوە و تیۆریکدا کەپەیڕەویان لێدەکەن بەجوانی پەیان پێ ببات. خوداش ڕێنماکارو ڕێنیشاندەری مرۆڤە بۆ ڕێگەی ڕاست.

# بەشی هەژدەیەم

## لەبارەی سروشتیەکانەوە ( طبیعیات ) ( فیزیك )

ئەوەش زانستێکە کە لەبارەی تەنەوە (جسم) لەڕووی ئەوەی کەلەجولآن نەجولآندا پەیوەست دەبێت پێیەوە، باس دەکات: هەربۆیە ئەم زانستە لێکۆڵینەوە لەم جۆرە مەسەلانەدا دەکات وەك: تەنەئاسمانی و توخمەکان و ئەوەی لەم تەنە توخمیانەوە دێتەدی وەك: حەیوان و ئینسان و گیاو بێگیان و ئەوەی کەلەزەویدا پێکدێت وەك سەرچاوەکان و زەوی لەرزەکان، وەیان لەهەوادا بەدیدێن وەك: هەور و هەڵمو هەورەبروسکەو نمونەی ئەمانەو، وەهەروەها لەبارەی سەرەتای جوڵەی تەنەکانو کەهەمان نەفس بێت بەپێی جۆراو جۆریان لەمرۆڤ و حەیوان و ڕوەکدا باس و لێکۆڵینەوە دەکات کتێبەکانی ئەرستۆ لەم زانستەدا بوونیان هەیەو دەستی خەڵکی دەکەون ئەوانیش لەگەڵ کتێبەکانی تری زانستی فەلسەفەدا، لەسەردەمی مەئموندا تەرجەمە کراونەتەوە زانایانیش پەیڕەویان لەشێوازەکەی ئەرستۆ کردووەو کتێبیان نوسیوەو، شەرحی ئەو زانستەیان کردووە کەجامیعترینیان کتێبەکانی ئیبن سینان.

ئەو لەکتێبی شیفادا هەروەك باسمانکرد هەرحەوت زانستەکەی فەیلەسوفەکانی کۆ کردووەتەوە و دواتریش لەکتێبی نجات و اشاراتدا کورتی کردوونەتەوە، هەروەك بڵێی ئەو لەزۆرێك لەمەسەلەکانی ئەو زانستەدا دژایەتی تیۆرەکانی ئەرستۆیان کردووەو عەقیدە و بۆچوونی خۆیان لەبارەی ئەوانەوە هێناوە. ئیبن ڕۆشدیش کتێبەکانی

ئەرستۆی کورتکردووەتەوە شەرحێکی تێرو تەسەلی لەسەرنوسیون بەلآم دژایەتی تیۆرەکانی ئەرستۆی نەکردووە. زانایانی تریش لەمبارەیەوە کتێبگەلێکی زۆریان نوسیوە بەلآم دانراوو نوسینە بەناوبانگەکان لەم صنعەتەدا تاوەکو ئەمڕۆکە هەمان ئەوانەیە کەباسمانکردن. خەڵکی مەشریق گرنگیەکی زۆریان بەکتێبی اشارات دەدەن وەئیمام ابن الختیب (فخرالرازی) شەرحێکی جوانی لەسەر نوسیوە، هەروەها ئامێدی شەرحێکی لەسەر اشارات نوسیوە. وەنصرالدینی توسی ناسراو بەخواجە کەخەڵکی عێراقە اشاراتی شەرح کردووە لەزۆرێك لەمەسەلەکانیدا بۆچوون و تیۆرەکانی فەخری ڕازی لێکۆڵینەوە کردووە لێکۆڵینەوەکانی بەباشترین لێکۆڵینەوە لەسەر نەزەریات و تیۆرەکانی ئیمام دانراون. وەلەسەر هەمووزانایەکەوە زانایەکی زاناتر هەیە.[٢٤١]

---

[٢٤١] (وَفَوقَ كُلِّ ذِي عِلمٍ عَليم) س يوسف ئا ٧٦.

# بەشی نۆزدەیەم

## لەبارەی زانستی پزیشکیەوە

ئەوەش پیشەو صنعەتێکە کەلەبارەی جەستەی مرۆڤەوە لەڕووی نەخۆشیو تەندروستیەوە گفتوگۆدەکاتو خاوەنی ئەم صنعەتەش هەوڵی پاراستنی تەندروستیو باشبوونەوەی نەخۆشی بەهۆی دەرمانو هۆکارەکانی دەخاتە ڕوو، ئەو دەرمانانەی کەبۆ ئەو نەخۆشیە بەسوودن لەڕێگەی تەرکیبات و تایبەتمەندی و هێزەوە دەیانناسێتو لەڕێگەی نیشانەکانەوە هەڵوەستە لەسەر نەخۆشیەکان دەکاتو لەپێگەشتنی نەخۆشیەکان هەواڵ دەداتو ئامادە باشی نەخۆش لەڕووی وەرگرتنی دەرمانو بەپێچەوانەشەوە ئاشکرا دەکات وەك ڕەنگی دەموچاوو پاشەڕۆو لێدانی دڵ. پزیشك ئەم نیشانانە بەهێزەکانی سروشت بەرابەر دەکات و هەڵیاندەسەنگێنێت، چونکە ئەم هێزە لەهەردوو حاڵەتەکەدا تەندروستی و نەخۆشی، دەبێتە ڕێکخەری جەستە و پزیشکیش لەگەڵ حاڵەت و نیشانەکانی تردا هەڵیان دەسەنگێنێت و ئائەندازەیەکیش یارمەتیان لێوە وەردەگرێت و، بەپێی ئەوەی سروشتی مادە (نەخۆشیەکە) فەصڵ (وەرزی ساڵ)و تەمەنی نەخۆش دەیخوازێت بەپێی توانا یارمەتی وەردەگرێت. وەزانستێکیش کەکۆکەرەوەی هەموو ئەم مەسەلانەبێت پێی دەڵێن زانستی پزیشکی. هەرچەندە بەشێوەیەکی جیاش باسو لێکۆڵینەوەی لەبارەی چەند ئەندامێکی جەستەوە کردووەو بەزانستێکی سەربەخۆی داوەتە قەڵەم وەك: چاوو نەخۆشیەکانی و دەرمانو

چارەسەرەکانی. وەهەروەها سودەکانی ئەندامەکانی جەستەشیان لکاندووە بەم زانستەوە و مانای ئەو دەستەواژەیەش مەبەست سودێکە کەلەهەریەکە لەئەندامانی جەستەدا ئافرێنراوە هەرچەندە ئەم بابەتە لەبابەتەکانی زانستی پزیشکی نیە، بەلاَم زاناکان وەك پاشکۆ و شوێنکەوتەی ئەو زانستەیان داناوە پێشەوای ئەم صنعەتەش کەکتێبەکانی لەمبارەیەوە لەنێو کتێبی پێشینیاندا تەرجەمە کراون جالینوس بووە. وەدەڵێن جالینوس هاوچەرخی پێغەمبەر عیسا بووە (ع)، وەهەروەها دەڵێن لەرێگەی گەڕان و غەریبی ناچاریەوە لەصەقەلیەدا مردووە.

وەدانراوەکانی ئەو لەبارەی زانستی پزیشکیەوە لەدانراوە دایکەکان دەژمێردرێن کەهەموو پزیشکەکان لەدوای ئەو ئیقتیدایان پێکردووەو، لەئیسلامیشدا پێشەوایانێك لەم هونەرەدا دەرکەوتن کەلەئاستی پێویستیش تێپەڕیانکرد وەك: ڕازی و مەجوسی و ئیبن سینا. وەلەئەندەلوسیشدا زانایانێکی زۆر دەرکەوتوون کەبەناوبانگترینیان ئیبن زوهرە، بەلاَم ئێستاکە لەووڵاتانی ئیسلامیدا هەروەك بڵێی ئەم صنعەتە بەرەو کەمی دەچێت، چونکە لەم ووڵاتانەدا پێشکەوتن‌و ئاوەدانی وەستاوەو بەڵکو داڕووخاوە و پزیشکی لەو صنعەتانەیە کەبێجگە لەلانکەی شارستانیەت‌و جوانخوازیدا پێش ناکەوێت‌و ئێمەش لەبەشەکانی پێشوودا ئەم خاڵەمان باسکرد.

## بەشێك

لەکۆمەڵگە دەشتەکیەکاندا جۆرێك لەپزیشکی بوونی هەیە کەزیاتر لەسەر ئەزموونە کورت و کەم مەزداکانی هەندێك لەخەڵك وەستاوە، ئەو پزیشکیەش بەشێوەیەکی بۆ ماوەیی لەمەشایخ و پیرەژنانی هۆزەوە وەچە بەوەچە گەشتووەتە نەوەکانیان. هەرچەندە کەهەندێك لەنەخۆشان بەهۆیەوە باشدەبن، بەڵام نەك بەپێی یاسای سروشتیو نەگونجاوە لەگەڵ میزاجدا هۆزە عەرەبەکان لەمجۆرە ئەزموونە پزیشکیانەدا بەهرەیەکی فراوانیان هەبووەو لەنێو ئەماندا پزیشکانێکی بەناوبانگ هەبوون، وەك حاریسی کوڕی کلدە و ئەوانیتر. وەئەو توبەی کەلەشەرعیاتدا نەقلّ دەکرێت لەم شێوەیەو بەهیچ شێوەیەك وەحی نیە، بەڵکو شتێکە کەبۆ عەرەبی ئاسایی بووە لەباسی ژیانی پێغەمبەردا (ص) باسی ئەم پزیشکیە، لەو جۆرە حاڵەتانەیە کەلەودا بووەتە نەریت نەوەك لەو ڕوانگەوەی ئەوەی کە ئەم شتە بەم شێوەیە مەشروعە، چونکە ئەو (ص) لەو ڕووەوە نێردرا کەئێمە لەشەرع ئاگادار بکاتەوە، نەوەك لەبەر ئەوەی پێناسەی توب یان شتە ئاساییەکانی ترمان فێر بکات، هەروەك چۆن لەبارەی پیتاندنی دارخورماکانی مەدینەوە ڕوویداو دواتر گوتی: ئێوە لەکاروباری دونیاتان شارەزا ترن. هەربۆیە باش نیە کە شتێك لەو توبەی کەلەحەدیسە صەحیحەکاندا نەقڵکراوە بخرێتە سەرنەمە و بگوترێ شەرعیە، چونکە لێرەدا بەڵگەیەك لەسەر ئەمە بوونی نیە. ئەوە ڕاستە ئەگەر ئەوان بەپێی تەبەرك و ئیمان عەقیدەی ڕاستگۆیانە بەکار بهێنین لەڕووی سود و قازانجەوە خاوەن سودێکی گەورەیە کەئەم کاریگەریە بەسودە لەتوببی میزاجیدا دەستناکەوێت، بەڵکو سوودی ناوبراو لەبەرهەمەکانی ڕاستگۆیی ووشەی ئیمانە هەروەك چۆن لەدەرمانی کەسێکدا کەبەهۆی هەنگوینەوە سك ئێشەی هەبوو ڕوویداو نمونەی ئەوانە، خوداش ڕێنمای مرۆڤەکانە بۆسەر ڕێگەی ڕاست.

# بەشی بیستەم

## لەبارەی جووتیارییەوە

ئەم صنعەتە لەلقەکانی تەبیعیاتە و بریتیە لەباس و بیرکردنەوە لەگیا لەڕووی سوود وەرگرتن و پەروەردە کردنیەوە، ئەمەش لەڕێگەی ئاودان و پەروەردەکردنی زەوی‌و باخەکان بەشێوازێکی دروست و شایستەی وەرزەکان و لەئەستۆگرتنی هەموو ئەو هۆکارانەی کەدەبنە هۆی باشکردن و پێشکەوتنی گیاکان، بەدی دێت. پێشینان گرنگیەکی زۆریان بەم هونەرەداوە و هەموولایەنەکانیان لەبەرچاو گرتووە وەك: چاندن و گەشەپێدانی گیاکان‌و ئەو تایبەتمەندیانەی کەتێیاندایە و لایەنی ڕۆحانیەتیان، (مەبەست ڕۆحی ڕوەکیە کەلەگەشەیدا فەرمانڕەوایی هەیە) کەلەڕۆحانیەتی ئەستێرەو هەیکەلەکان دەچێت، وەلەبابی سیحر و جادووگەریدا بەکار دەهێنرێت هەربۆیە گرنگیەکی زۆریان پێداوەو لەکتێبە یۆنانیەکان کتێبی جووتیاری نەبەتی کەدراوەتە پاڵ زانایانی نەبەت تەرجەمەکراوە کەلەم ڕووەوە مەسەلەگەلێکی زۆری تێدایەو لەبەر ئەوەی زانایانی ئیسلام ووردبوونەوە لەمەسەلەکانی‌و تێگەیشتن کەبابی سیحر لەئیسلامدا داخراوەو تەحقیق‌و بەحس تێیدا حەرامە، هەربۆیە تەنها گرنگیان بەو مەسەلانەدا کەتایبەت بوون بەچاندن و گەشەکردنی گیاکانەوە هەبوو ئەوەی کەبۆیان دێتە پێشەوە پەیوەندی هەبوو ساحریان لێدەرکردو ئیبن العوام کتێبی ناوبراوی کتاب الفلاحە النبتیە لەسەر ئەم شێوەیە کورتکردوەتەوە هونەرەکەی تری خستوەتەلاوە، بەلاّم مەسلەمەی مەجریتی لەکتێبە ساحیریەکانیدا ئومەهاتێك لەمەسەلەکانی ئەم بەشەی نەقلّکردووە هەروەك چۆن لەکاتی

بەحسکردندا لەبارەی ساحیریەوە باسیاندەکەین، انشاء الله. کتێبی پاشاینان لەبارەی جووتیاریەوە زۆرن، بەڵام ئەوان لەدانراوەکانیاندا تەنها لەبارەی چاندن و پارێزگاری لەئافەتەکانی گیاو ڕێگریەکانی و هەموو ئەو مەسەلانەی کەلەمباریەوە ڕوودەدەن باس و خواسیان کردووەو کتێبە ناوبراوەکانیش ئێستاکەش بوونیان هەیە.

# بەشی بیست و یەکەم

## لەبارەی زانستی ئیلاهیاتەوە

ئەوەش زانستێکە کە بەگومانی زاناکانی باس لەبوونی ڕەها دەکات (الوجود المطلق) هەروەك چۆن سەرەتا لەبارەی شتە گشتیەکانو چیەتیە جەستەیی و ڕۆحانی و وەحدەت و زۆری و وجوبی ئیمکانو نمونەی ئەمانە گفتوگۆدەکرێت دواتر لەبارەی سەرچاوەکانی بوونەوەران ئەوەی کەئەوان ڕۆحانین قسەی لەبارەوە دەکرێتو، دواتریش لەبارەی چۆنیەتی دەرچوونی بوونەوەران لەسەرچاوەو قۆناغەکانیەوە تەحقیق دەکرێتو دواتریش لەبارەی ئەحواڵی نەفس لەپاش جیابوونەوە لەجەستەکان و گەڕانەوەی بۆ سەرچاوەکەی قسەو گفتوگۆدەکەن. ئەم زانستەش لەلای زانایان زانستێکی شەریفەو پێیان وایە کەزانستی نابراو ئەوان والێدەکات کە بوون بەو جۆرەی کەهەیە بیناسن و ئەم ناسینەش بەبڕوای ئەوان وەك بەختەوەری وایەو، لەداهاتوشدا باسی ڕەتدانەوەیان دەکەین، هەروەك چۆن ئەوان زانستەکانیان تەرتیب کردووە زانستی ناوبراو بەدوای زانستەکانی تردا دێت هەربۆیە پێی دەڵێن زانستی ماوراء ی تەبیعەت. کتێبی مامۆستای یەکەم لەمبارەیەوە لەبەر دەستی خەڵکیدانو بوونیان هەیە ئیبن سینا لەکتێبی شیفاو نەجاتدا کورتی کردوونەتەوە، وەهەروەها ئیبن ڕوشد کەلەحەکیمەکانی ئەندەلوسە بەهەمان شێوە کورتی کردوونەتەوە، بەڵام دواتر پاشینان لەزانستەکانی ئەو گروپەدا دەستیانکردە نوسینی کتێب. غەزالیش هەندێك مەسەلەی ڕەت کردووەتەوەو دواتریش موتەکەلیمەکانی دوایی مەسەلەکانی زانستی کەلامیان تێکەڵ بەمەسەلە فەلسەفیەکان

کرد بەهۆی هاوبەشیانەوە لەبەحسو لێکچوونی بابەتی زانستی کەلام لەگەڵ بابەتی ئیلاهیاتدا، ئەوان هەردوو زانستی ناوبراویان بەجۆرێك تێکەڵ بەیەکتر کرد هەروەك بڵێی یەك هونەرن و موتەکەلیمەکان تەرتیبی حەکیمەکانیان لەمەسەلەی ئیلاهیات و تەبیعیاتدا گۆڕیو کردنیانە یەك هونەر و، باسکردنی مەسەلە گشتیەکانیان بەلەپێشتر دەزانیو شتەجەستەیی و شوێنکەوتەکانیان خستە دوای ئەوانەوە دواتر شتەڕۆحانیو شوێنکەوتەکانیان لەپلەی سێیەمدا باسکردو ئەم شێوازەیان تاوەکو کۆتایی زانستەکە بەردەوامی پێدا، هەروەك چۆن ئیبن الختیب (فخرالرازی) لەکتێبی مەباحیسی مەشریقیەدا ئەم شێوازەی بەکار هێناوەو، لەئەنجامدا زانستی کەلام تێکەڵ بەمەسەلەکانی حیکمەت بووەو سەرانسەری کتێبەکانی پڕبووە لەحیکمەت، هەروەك بڵێی مەبەستو مەسەلەکانی هەردوو زانستەکە یەکێکە و ئەم بارودۆخەش شتەکەی لەخەڵکی ئاڵۆز کردووەو شێوازێکی ڕاست و دروستیش نیە. چونکە مەسەلەکانی زانستی کەلام بریتین لە عەقیدەگەلێك کەئەوان وەك چۆن سەلەف نەقڵیانکردووە لەشەریعەتەوە وەریانگرتووە، بەبێ ئەوەی کە بگەڕێنەوە بۆ ژیری و ئەقڵ یان ژیری بکەنە پشتو پەنای خۆیانو وابزانن مەسەلە ناوبراوەکان تەنها بەژیری دەسەلمێنرێن، چونکە ژیری لەشەرع و ئەندێشەی ئەوانەوە بەدوورە ئەوەی کەموتەکەلیمەکان لەبارەی بەڵگە هێنانەوە و ئیقامە حوجەوە قسەیانکردووە هەمان ئەو بەحسەنیە کەحەقیقەتەکەی بەدەست بێت بۆئەوەی بەدەلیل بزانرێت ئەوکات کەنەدەزانرا هەروەك فەلسەفە بەم جۆرەیە، بەڵکو مەبەست گەڕانە بەدوای جۆرێك لەبەڵگەی ئەقڵیدا کەیارمەتی عەقیدەی ئیمانی موزهەب و شێوەکانی سەلەف لەمبارەیەوە بداتو، شوبهەی بیدعەچیەکان کەوادەزانن بەڵگەکانیان لەمبارەیەوە ئەقڵین لاببات. ئەمەش لەدوای ئەوەیە کەوادابنرێت کەبەبەڵگەی نەقڵی صەحیحە هەربەو جۆرەی کەسەلەف فێری بوون و باوەڕیان پێی هێناوەو، لەنێوان ئەم دوومەقامەشدا جیاوازیەکی زۆر هەیە، چونکە مەداریکی خاوەنی شەریعەت فراوانترەو بەهۆی فراوانی بازنەکەیەوە بەبەراوورد بەمەداریك و تێڕوانینە ئەقڵیەکان. چونکە جۆری

یەکەم لەسەروو جۆری دووەم و ئەویشی لەخۆ گرتووە لەو ڕووەوەی کەلەڕێگەی نورە یەزدانیەکانەوە هێز وەردەگرێتو لەژێر یاسای نەزەری لاواز و ئەو ئیدراکاتانەی کە دەوریانداوە دروست نابێت، هەربۆیە کاتێك شاریع ڕێنماییمان دەکات بۆ ئیدراك و تێگەشتنێك پێویستە لەئیدراکاتەکانی خۆمان لەپێشتریان بزانین و تەنها باوەڕ بەوان بکەین، نەوەك شتێکی تر و لەڕاستکردنەوەیدا یارمەتی لەئیدراکە ئەقڵیەکان وەرنەگرین هەرچەندە دژیشیان بێت، بەڵکو دەبێت لەڕووی ئیعتیقادو زانستەوە باوەڕمان بەوە هەبێت کەشاریع فەرمانی پێکردووەو لەبارەی ئەو مەسەلانەی کەلێیان تێناگەین بێدەنگ ببین و بەخودایان بسپێرین و ئەقڵیان لێ بەدوور بگرین، بەڵام بیرۆکە موتەکەلیمەکان بۆ بەڵگەهێنانەوەی ئەقڵی، قسەی پەیڕەوانی بێباوەڕان و مولحیدەکان لەبەرامبەر عەقیدەکانی سەلەفەوەیە کەلەڕێگەی بیدعەتە نەزەریەکانەوە دژایەتی کردووە، هەربۆیە موتەکەلیمەکان ناچار بوون تێۆرەکانیان ڕەت بکەنەوەو دەست بگرن بەدژایەتیکردن لەهەمان ڕەگەزی دژایەتیەکانی ئەوانەوەو، بەشوێن بەڵگە نەزەریەکاندا بگەڕێنو عەقیدەکانی سەلەفیان لەگەڵدا بەرابەر بکەن.

بەڵام باسکردن لەبارەی تەصحیح و بەتاڵی مەسەلەکانی تەبیعیات و ئیلاهیات نەلە بابەتەکانی زانستی کەلامەو نەلەنەزەریاتەکانی موتەکەلیمەکانیشە، وەدەبێت ئەوە بزانین کەبۆ ناسین و جیاکردنەوەی ئەو دوو هونەرەیە لەیەکتری، چونکە هەردوو هونەری ناوبراو لەلای پاشینەکان لەڕووی دانانەوە تێکەڵ بەیەکتر بووە، ئەمە لەکاتێکدا لەحەقیقەتی هەریەکەیان لەگەڵ ئەویتردا لەڕووی بابەت و مەسەلەوە جیاوازە هۆکاری تێکەڵبوونیشیان یەکبوونی بابەتەکانیانە لەکاتی بەڵگە هێنانەوەدا، چونکە جۆری بەڵگە هێنانەوەی موتەکەلیمەکان بەشێوەیەکە کەوەك بڵێی بەمەبەستی ئینشا لەڕێگەی دەلیلەوە داوای ئیعتیقاد دەکەن، بەڵام حەقیقەتی مەسەلەکە بەم شێوەیە نیە، بەڵکو مەبەست ڕەتدانەوەی مولحیدەکانە وەگەرنا صیدقی خوازرا و مەفروز و مەعلومە و پێویستی بەدەلیل نیە. وەهەروەها کۆمەڵێك لەزیادەڕەوەکانی پاشینانی صۆفیەکان کەلەبارەی

ویجد و حاڵەوە قسەیانکردووە، بەهەمان شێوە مەسەلەکانی هەردوو هونەری کەلام و حیکمەتیان تێکەڵ بەهونەری خۆیان کردووەو لەهەموو مەسەلەکاندا بەیەك شێوە قسەیانکردووە، وەك قسەیان لەبارەی بابەتەکانی: پێغەمبەرایەتی و ئیتیحادو حلولو وەحدەت و نمونەی ئەمانە، ئەمە لەکاتێکدا مەداریکەکان لەم سێ هونەرەدا لەیەکتر جیاوازن و ئەوەی کەپێش هەموویان لەڕەگەزی هونەر و زانستەکانەوە بەدوورە مەداریکی صۆفیەکانە، کەبانگەشەی ویژدان دەکەن و لەبەڵگە ڕادەکەن و ویژدانیش هەروەك باسمانکرد و لەداهاتووشدا زیاتر قسەی لەبارەوە دەکەین لەمەداریکە زانستی و بەحس و شوێنکەوتەکانیەوە بەدوورە، خوداش بەکەرەمی خۆی ڕێنماکاری مرۆڤە بۆ سەر ڕێگەی ڕاست.[٢٤٢]

---

[٢٤٢] (وَاللهُ يَهدِى مَن يَشاءُ إلى صِراطٍ مُستَقِيم) س البقرة ئا ١٣٦.

# بەشی بیست و دووەم

## لەبارەی زانستەکانی ساحیری و تەلیسمەکانەوە

ئەوەش بریتیە لەئاگادار بوون لەچۆنیەتی ئەو تواناو ئامادە باشیانەیە کەنەفسەکانی مرۆڤایەتی بەهۆیانەوە توانای کاریگەریان لەسەرجیهانی توخمەکان دەبێت، ئیتر ڕاستەوخۆو بەبێ واسیتە(نێوەند) بێت یان بەهۆی یارمەتی شتە ئاسمانیەکانەوە بێت. جۆری یەکەم ساحیری و جۆری دووەمیش تەلیسمیە. لەبەر ئەوەی ئەم زانستانە لەشەریعەتەکاندا گرنگیان پێ نادرێت، لەبەر ئەوەی کەزیانبەخشن لەبەر ئەوەی کەبەڕوانگەیەکی بێجگە لەخوداوە مەرجدارە وەك ئەستێرە و هاوشێوەی ئەوان، ئەوەیە کەکتێبەکانی ئەوان هەروەك ونبوویەکن لەنێو خەڵکیدا. مەسەلەی زانستە ناوبراوەکان بێجگە لەوەی کە لەکتێبی نەتەوە کۆنەکانی بەر لەپێغەمبەرایەتی حەزرەتی موساوە(ع) وەرگیراوە وەك نەبەتی و کلدانیەکاندا بینراوە لەهیچ جێگەیەکی تردا نابینرێت. چونکە هەمووئەو پێغەمبەرانەی کەبەر لەموسا(ع) هاتوون گرنگیان بەدانانی شەرع نەداوەو ئەحکامیان نەهێناوە، بەڵکو کتێبەکانیان تەنها ئەو بابەتانەیان تێدایە وەك: مەواعیزو نەصیحەت و بانگەواز ی خەڵکی بۆ یەکتا پەرستی و باسی بەهەشت و دۆزەخ بووە. ئەم زانستانەش لەنێو خەڵکی بابلدا وەك سریان و کلدان و قیبتیەکان و وڵاتی میسرو نمونەی ئەوان باوی هەبووە کتێبیان لەبارەوە نوسیوەو بێجگەلە هەندێکیشی تەرجەمە نەکراوە بۆزمانی عەرەبی، وەك جووتیاری نەبەتی لەدانراوی ئیبن وەحشیە کەلەدروستکراوەکانی ئەهلی بابلە و خەڵکی لەکتێبی ناوبراوەوە فێری ئەم زانستە

بوون‌وص داهێنان و جۆراو جۆریان تێدا کردووە. لەدوای ئەوانیش دەستیانکردە نوسینی کتێبی تری وەك: مەصاحیفی کەواکبی سەبعە کتێبی طمطم ی هیندی لەبارەی وێنەو پلەی ئەستێرەکان و نمونە ئەمانە. دواتر لەمەشریق جابری کوڕی حەیان سەروەری جادوگەرو ساحیرەکان لەنێو نەتەوەی ئیسلامدا دەرکەوتو دەستیکردە لێکۆڵینەوە لەکتێبەکانی ئەم نەتەوەیەداو صنعەتەکەی دەرهێناو، لەناوکرۆکەکەیدا دەستیکردە لێکۆڵینەوەو، ئەوەبوو سەرئەنجام ئەم زانستانەی دەرهێناو لەبارەیانەوە چەندین کتێبی نوسی و دەستیکردە باسکردنی دوور و درێژی زانستە ناوبراوەکان‌و لێکۆڵینەوەی لە صنعەتی کیمیای، صنعەتی کیمیاش بەشێکە لەزانستە باسکراوەکان چونکە گۆڕانی تەنە نەوعیەکان لەشێوەیەکەوە بۆ شێوەیەکی تر تەنها بەیارمەتی هێزە نەفسیەکان ئەنجامدەدرێت نەوەك لەڕێگەی صنعەتە کرداریەکانەوە، لەڕاستیدا هونەری کیمیاگەری لەجۆری ساحیریە هەروەك چۆن لەجێگەی خۆیدا باس لەم خاڵانە دەکەین.

دواتر مەسلەمەی کوڕی ئەحمەدی مەجریتی پێشەوای خەڵکی ئەندەلوس لەباسی زانستەکانی بیرکاری و زانستەکانی ساحیریدا دەرکەوت و دەستیکردە تەهزیب و کورتکردنەوەی ئەم جۆرە کتێبانەو شێوازەکانی ئەو زانستانەی لەکتێبەکانی خۆیدا بەناوی (غایەالحکیم) کۆکردەوە. لەدوای ئەم هیچ کەسێك لەم زانستانەدا کتێبی نەنوسی‌و لێرەشدا پێشەکیەك باسدەکەین کەتێیدا حەقیقەتی شاعیری ئاشکرا دەبێت: نەفسەکانی مرۆڤ هەرچەندە لەڕووی نەوعیەوە یەکێکن بەڵام لەڕوانگەی تایبەتمەندیەوە جیاوازن‌و دەبن بەچەند دەستەیەکەوەو، هەردەستەیەکیش تایبەتمەندی خۆی هەیە کەلەدەستەکەی تردا دەست ناکەوێت ئەم تایبەتمەندیەش بۆ ئەو دەستانە وەك سروشت‌و فیترەتێکی زاتی وەهایە.

هەروەك چۆن نەفسەکانی پێغەمبەران (ع) خاوەنی تایبەتمەندیەکە کەبەهۆیەوە دەبێتە خاوەنی توانا بۆ داڕنین و تەجەڕود لەڕۆحانیەتی بەشەری و بەرز بوونەوە بۆ ڕۆحانیەتی فریشتەیی بەجۆرێك کەتێیدا ئامارەی داڕنین و تەجەڕود دەبنە فریشتەو

ماناکەشی هەر ئەمەیە هەروەك لەشوێنی خۆیدا باسمانکردو لەم حاڵەتەدا مەعریفەت بەدەست دەهێنێت بۆ مەعریفەتی ڕەببانی. وەموخاتەبەی فریشتەکان لەلایەن خودا سبحانەوتعالی هەروەك باسکراو ئەوەشی کەبەدوای ئەودا بۆ ئەوان بەدی دێت، وەك کاریگەربوون لەجیهانی مەخلوقات و ڕاکێشانی ڕۆحانیەتی ئەستێرەکان تاوەکو تەسەڕوفی پێوە بکەن کاریگەریەکەیان بەهێزی نەفسانی یان شەیتانیە. بەڵام کاریگەری پێغەمبەران بریتیە لەمەدەدی ئیلاهی تایبەتمەندی ڕەببانیە. وەنەفسی کاهینەکانیش خاوەنی تایبەتمەندی ئاگاداربوونە بەسەر شتە غەیبیەکاندا بەهێزی شەیتانی. بەم جۆرە هەردەستەو بەشێك تایبەتە بەتایبەتمەندیەکەوە کەلەویتردا بوونی نیە. وەنەفسی ساحیران خاوەنی سێ قۆناغە بەم شێوەیە:

١ – قۆناغێك کەتەنها بەبێ یارمەتیدەرو موعینێك کاریگەری دەکات ئەمەش ئەو پلەیەکە فەیلەسوفەکان بەسیحری دەزانن.

٢ – کاریگەر بوون بەیارمەتی یارمەتیدەرێك وەك تەرکیب و تایبەتمەندی ئەفلاکەکان یان توخم یان تایبەتمەندی ژمارەیی و پێی دەڵێن تەلیسم ئەم قۆناغەش لەقۆناغی یەکەمین لاوازترە.

٣ – کاریگەربوون لەهێزەکانی خەیاڵ (متخیلە) و خاوەنی ئەم کاریگەریە ئیرادەو گرنگی خۆی دەخاتە سەر هێزەکانی خەیاڵ و، بەشێوەیەکی تایبەت تەسەڕوفیان تێدا دەکات و هەموو جۆرە خەیالات و تەسەووراتە صووەریەکان (وێنەکان) کەمەبەستیەتی لەواندا تەڵقینیان دەکاتو، دواتریش ئەو خەیالاتە بەهێزی نەفسی خۆی کەکاردەکەنە سەر جەستە دەیانهێنێتە خوارەوە بۆ دەزگای هەستی بینەرەکان بەجۆرێك کەبینەرەکان وادەزانن لەدەرەوە شتانێك دەبینن ئەمە لەکاتێکدا هیچ شتێك لەوێدا بوونی نیە. بەجۆرێك لەهەندێك خەڵکەوە دەگێڕنەوە کەئەو بێستان و جۆگەو کۆشکەکانی نیشان دەدا، ئەمە لەکاتێکدا هیچکام لەو دیمەنانە لەوێدا بوونیان نیە. فەیلەسوفەکانیش بەم جۆرەیان دەڵێن چاوبەست (شعوەزە). بەم شێوەیەبوو باسی دوور و درێژی قۆناغەکانی

ساحیری و جادووگەری. دواتر دەبێت ئەوەبزانین کەئەم تایبەتمەندیە لەساحیراندا وەك هەموو هێزەمرۆییەکان بالقوە بوونی هەیەو لەبالقوەوە بۆ کردارو بالفعل بەهۆی ڕیازەتەوەیەو، هەموو ڕیازەتە ساحیریەکانیش بریتین لەگرنگیدان بەئەفلاكو ئەستێرەکانو جیهانە بالأکان و شەیاتینەکان بەهەموو جۆرە تەعزیم و عیبادەتو ملکەچی و نیشاندانی کەمی و گوێڕایەڵیە.

هەربۆیە ساحیری لەم ڕوەوە بریتیە لە ڕووکردنە غەیری خوداو کڕنوش بردنە بۆ غەیری ئەوو ئەمەش کوفرە. هەربۆیە ساحیری بەکوفر دادەنرێت چونکە کوفرەکە لەمادەو هۆکارەکانیدایە هەروەك باسمانکرد. وەهەروەها بەم هۆیەوەیە کەفەقیهەکان لەکوشتنی ساحیرەکاندا جیاوازیان هەبووە کەئایا هۆکاری کافربوونەکە هۆکاری کارەکەیانە، یان بەهۆی کردارە خراپەکانیانەوەیە کەسەچاوەو خرایەن لەنێو بوونەوەرانداو هەمووئەمانەش لەساحیریەوە دێنەدی و لەبەرئەوە هەردوو قۆناغی یەکەمو دووەمی ساحیری خاوەنی حەقیقەتێکی دەرەکین و، قۆناغی سێیەمی ساحیری هیچ حەقیقەتێکی دەرەکی نیە، هەربۆیە زاناکان جیاوازیان هەیە کەئایا ئەم شتە حەقیقەتی هەیە یان خەیاڵیە، ئەوان پێیان وایە کەساحیری حەقیقەتی هەیەو سەیری هەردوو قۆناغی یەکەم و دووەمیان کردووەو، ئەوانەشی کەدەڵێن حەقیقەتی نیە حیسابیان بۆ قۆناغی سێیەم کردووە. هەربۆیە لەنەفسدا شتێکی جیاواز لەنێو ئەواندا بوونی نیە، بەڵکو ئەم جیاوازیە بەهۆی هەڵە لەقۆناغەکانیدا ڕوویانداوە و خوداش داناترە. وەدەبێت ئەوەبزانین کەژێر ئاقڵەکان لەبوونی ساحیریدا بەهۆی ئەو کاریگەریەی کەباسمانکرد هیچ گومانێکیان نیە، هەروەك چۆن قورئان باسیکردووەو خوداش فەرموویەتی: بەڵام شەیتانەکان کافربوون و ساحیریان فێری خەڵکی کردووە و ئەوەشی کەنێردرایە سەر هەردوو فریشتە هاروت و ماروت لەبابل کەسیان فێر نەدەکرد، تاوەکو بڵێن ئێمە تاقیکراوەین کەواتە کافر مەبەو ئەوانەلەوانەوە فێری ئەوەدەبوون کەجیاوازی بخەنە نێوان ژن و مێردەوە، ئەوان بەمکارەیان نەیاندەتوانی هیچ زیانێك بەکەس بگەیەنن

مەگەر بەئیزن و فەرمانی خودا نەبێت[٢٤٣] وەلەصەحیحیشدا هاتووە کەپێغەمبەر (ص) سیحری لێکراوە، هەروەك چۆن وایدەزانی کارێك دەکات بەلاّم هێشتا ئەنجامی نەدابوو، وەئەو سیحرەشی کەلەپێغەمبەر کرابوو بریتی بوو لەمووی شان و ئەندازێکیش لەمووی کلك و قاپێکی دروستکراو لەتۆوی خورما، ئامادە کرابوو خرابووە ناوچاڵی زەروانەوە لەمەدینەو دایانپۆشیبوو.

هەربۆیە خودای گەورە لەهەردوو سورەتی مەعوزەتەیندا (الفلق، الناس) دا ئەم ئایەتەی ناردووتە خوارەوە: پەنا دەگرم بەتۆ لەشەڕی ئەو ژنانە کە فودەکەن بەگرێی پەتەکاندا[٢٤٤].

عائیشە (ڕ ن) فەرمووی پێغەمبەر هەرکات دووعای بەسەر یەکێك لەگرفتەکاندا بخوێندایە کەجادوی لێکرابێت بەدڵنیاییەوە دەکرایەوە. بەلاّم بوونی سیحر و جادو لەنێو خەڵکی بابلدا کەبریتین لەکلدان و سریانەکان زۆر بووەو، قورئانیش باسیکردووە و حەدیسیشی لەبارەوە هەیە. بازاڕی سیحرو جادوو لەبابل و میسردا لەسەردەمی حەزرەتی موسا(ع) دا ڕەواجێکی زۆری هەبووە، هەربۆیە موعجیزەکەی موسا لەڕەگەزی ئەو مەسەلانە بوو کەجادووگەرانی ئەو سەردەمە بانگەشەیان بۆ دەکردو گرنگیان پێ دەدا، لە بەرهەمە سیحریەکانیان کەلەدوای خۆیانەوە ماوەتەوە لە(بەرابی) ناوچەی میسردا بوونیان هەیە کەگەواهیدەرێکی ئاشکراو ڕوونن لەسەر ئەم شتە، وەئێمە بەچاوی خۆمان بینیمان کەیەکێك لەساحیرەکان شێوەی کەسێك کەویستی سیحری لێبکات وێنەی دەکێشا و ئەم وێنەیەش بەرابەربوو لەگەڵ تایبەتمەندی شتەکاندا کەساحیر مەبەستی بوو، دەیویست نمونەی ئەم مانایانە وەك ناوووسیفەتەکان لەبارەی فەراهەم کردن و جیاکردنەوە لەکەسی سیحر لێکراودا لەبەرامبەر خۆیەوە دابنابوو بەچاو یان بەیارمەتی

---

[٢٤٣] (وَلكنَ الشَّياطِينَ كَفَرُوا يُعَلِّمُونَ النَّاسَ السِّحرَ وَما أُنزِلَ عَلى المَلَكَينِ ببابِلَ هارُوتَ وَمارُوت وَما يُعَلِّمانِ مِن أحَدٍ حَتى يَقُولا إِنَّما نَحنُ فِتنَةٌ فَلَا تَكفُرْ فَيَتَعَلَّمُونَ مِنهُما مايُفَرِّقُونَ بِه بَينَ المَرءِ وَزَوجِه وَماهُم بِضارِّينَ بِه مِن أحَدٍ إِلَّا بِأذنِ الله) س البقرة ئا ١٠٢.

[٢٤٤] (وَمِن شَرِّ النَّفّاثاتِ فِي العُقَد) س الفلق ئا ١، ٤.

موعینێك (یارمەتیدەرێك) قسەی دەكردو، دواتر هەرچیەك ئاو لەدەمیدا كۆدەبوویەوە وبەئاراستەی ناودەمی ئەوفوی دەكردو بەدووبارەكردنەوەی مەخرەجی پیتەكانی ئەو قسەیە و پەتێكی دەبەست بەم موعینەوە كەبۆ ئەم مەبەستە ئامادەی كردبوو بەنیشانەی قەتعی بوونی شتەكە و وەرگرتنی پەیمان لەجنۆكەكە لەكاتی فوكردنەكەدا دەبووە شەریكی جنۆكەكەو پێی وابوو بەم كارە ئەوە نیشان دەدات كەسیحرەكەی بەئیرادەوە ئەنجام داوە.

بەم جۆرە ووشە و ناوە خراپانە رۆحێكی پیس وابەستەیە پێیانەوە كەلەكاتی فوكردندا ئەو رۆحانەی لێوە دەردەچن‌و لەكاتی فوكردنەكەدا لەگەڵ ئاوی ناودەمدا تێكەڵ دەبێت‌و بەم شێوەیە رۆحە ناپاكەكان دێنە دەرەوە و بەپێی مەبەستی ساحیر دەكەونە سەر كەسی سیحر لێكراو، ئێمەش یەكێك لەساحیرەكانمان بینی كەئاماژەی بەعابایەكی پێست دەكردو ویردەكانی خۆی بەسەردا دەخوێندو بەشێوەیەكی یەكجارەكی ئەو عابایە دەدڕا و پارچە پارچە دەبوو. وەهەروەها ئاماژەی بە ووركی ئەو مەڕانە دەكرد كەلەلەوەڕگاكاندا دەلەوەڕان، بەمەبەستی ئەوەی كە ووركیان هەڵبدڕێت، كاتێكمان دەزانی كەیەكسەر ووركیان دەدڕاو ڕیخۆڵەكانیان دەڕژانە سەرزەوی. وەبیستوومە كەلەسەرزەوی هیندا لەم سەردەمەدا ساحیرێك هەیە كەئاماژە بۆمرۆڤ دەكات و كتوپڕ دڵی دەرفێنێت‌و كەسەكە دەكەوێتە سەرزەوی و دەمرێت و كاتێكیش بەشوێن دڵیدا دەگەڕێن هیچ شوێنەوارێكی لەو سەردەمەدا نادۆزنەوە. وەهەروەها ئاماژەدەكات بەهەنارو و كاتێك لەتی دەكات هیچ دەنكێكی تێدا نەماوە. وەهەروەها بیستوومانە لەسەرزەوی سودان‌و ناوچەی توركەكاندا كەسانێك هەن كە سیحر لەهەور دەكەن و لەئەنجامدا لەناوچەیەكی تایبەت باران دەبارێنێت. وەهەروەها ئێمە لەكرداری تەلیسمەكاندا شتانێكی سەرسوڕهێنەرمان بینیوە لەژمارە موتەحابەكاندا (خۆشەویستەكان) كەبریتین لە: (رك — رف د) كەهەریەكەیان بەرابەرە بە(٢٢٠) و یەكێكی تریشیان بە(٢٨٤)، مانای خۆشەویست (متحابە) ئەوەیە كەهەركات بەشەكانی

هەریەکەیەك کە لەهەر یەکێکیاندا هەیە وەك: نیوە و چواریەك و شەش یەك و پێنج یەك و نمونەی ئەمانە، کۆبکەینەوە بەرابەردەبێت لەگەڵ ژمارەکەی تردا[٢٤٥] هەربۆیە بەخۆشەویست ناوزەدیانکردوون‌و خاوەنی تەلیسمەکان ئەوەیان نەقڵکردووە کە ئەم ژمارانە لەئولفەتی نێوان دوویاردا بەیەککەشتنیان کاریگەریەکی تایبەتیان هەیە بەو مەرجەی بۆهەریەکەیان دووپەیکەر ئامادەبکەن و، یەکێکیان لەتالیعی[٢٤٦] زوهرەدا کەلەبیت یان شرفی خۆیدا بەتێڕوانینی خۆشەویستی‌و قبوڵی تێڕوانەری مانگ بێت تالیعی دووەمیش لەسابیعی یەکەمیندا دادەنێن‌و یەکێك لەدوو ژمارەکە دەخەنە سەر هەریەك لەپەیکەرەکانەوە[٢٤٧] و ژمارەگەورەکەی ئیرادە دەکەن کەدۆستی میهری خاوەنەکەی لەبەرچاو دەگیرێت، واتە خۆشەویستەکە. چونکە ژمارەی زیاتر لەڕووی چەندیەتیەوە بەگەورەتر نیشان بدرێت خاوەن بەش گەلێکی کەسری زیاترە.

وەبۆ ئەم لەڕووی ئولفەت و دۆستی بەهێزی نێوان دوویارەوە کاریگەریەکی دەبێت کەبەهیچ شێوەیەك لەیەکتری جیانابنەوە خۆشەویستیەکی بەهێزیان لەنێواندا دروستدەبێت، ئەمەش قسەی خاوەنی کتێبی الغایە و پێشەوایانی ئەم هونەرەیە و ئەزموونیش گەواهیدەرە لەسەر ئەمە وەهەروەها تابیع اسد کەپێی دەڵێن تابیعی حمصی (مۆری ووردەبەرد) ئەنجام کاریگەری دەبێت. چۆنیەتی دروستکردنەکەشی بەم جۆرەیە کەلەسەر قاڵبێکی هیندی اصبعی کەبەمانای پۆلای هێندی دێت، شێوەی شێرێك دەکێشن

---

[٢٤٥] هەروەك چۆن بەشەکانی ژمارەی (٢٢٠) بریتین لە١ – ٢ – ٤ – ٥ – ١٠ – ١١ – ٢٠ – ٢٢ – ٤٤ – ٥٥ – ١١٠ و هەرکات کۆیان بکەینەوە دەکەنە ٢٧٤. وەبەشەکانی ژمارە ٢٨٤ ئەمانەن ١ و ٢ – ٤ – ٧١ – ١٤٢ – کەسەرجەمیان دەکاتە ٢٢٠.

[٢٤٦] تالیع لەزاراوەی نجومگەرەکاندا بریتیە لەبورجێك کەلەکاتی لەدایکبوون یان لەکاتی پرسیارکردندا شتێك لەئاسۆی خۆرهەڵاتەوە دیار بێت و، شوێنەواری هەرتالیعێك لەسەر هەردوانزە بورجەکە لەنحوست و سەعادەتدا زۆرباشەو سابیعیش بریتیەلە بورجێك کە لەکاتی تالیع گرتنەوەدا لەئاسۆی خۆرئاواوە دەردەکەوێت، عاشیریش بریتیەلە بورجێك کەلەلای الراس وەیە و ڕابیع یش بورجێکە کە هاوشێوەی سمت القدم بێت.

[٢٤٧] سابیتی کوڕی قڕە یەکەمین کەس بوو کەئەم جۆرە تایبەتمەندیەی ژمارەکانی دۆزیەوە و دیکارتیش لەمبارەیەوە قسەی کردووە. (حاشیەی دسلان لا ٣٧٨ ب ٢).

کەکلکی خۆی بەرز کردووەتەوەو بەردێکی بەددانەکانی کردووە بەدووبەشەوەو لەبەرامبەر شێرەکەوە وێنەی مارێکە کە کەلەلای پێکانیەوە بەرامبەر بەدەمووچاوی بەرزبووەتەوەو، دەمی لەبەرامبەر دەمی شێرەکەوە کردووەتەوە. وەلەسەر پشتی شێرەکەوە کلك بڕێکیان کێشاوە کەلەکاتی سنکەخشێدایە.

کاتی کێشانی ئەم تەلیسمەش دەبێت لەکاتی گەشتنی خۆر بەشێوەی یەکەم یان سێیەمی بورجی ئەسەد بێت بەومەرجەی خۆر و مانگ لەدۆخێکی شیاوو خۆشەویستانەدا دووربن لەنحوسەوە. وەهەرکاتێك ئەم هەلومەرجە بێتەدی و دەستیان پێیان بگات لەم جۆرە شوێنە گونجاوانەدا ئەو مۆرە بەیەك مسقالٚ ئاڵتوون قاڵبڕێژی دەکەنو، لەپاشان دەیچەقێنن بەناوکەمێك زەعفەران و گوڵاوی تێکەڵداو، دواتر دەیخونە ناو پارچە پەڕۆیەکی حەریری زەردەوە و لەگەڵ خۆیاندا هەڵیدەگرن. چونکە پێیان وایە هەرکەسێك ئەوەی پێ بێت بەجۆرێك لەلای پاشاکان بەڕێز دەبێت و وەها موسەخەریان دەکات کەباس ناکرێت. وەهەروەها ئەو سوڵتانانەی کەئەوەیان پێ بێت بەرامبەر بەژێردەستەکانیان بەتوانا دەبن لەلایان بەڕێز دەبن. بابەتی باسکراو خاوەن تەلیسمەکان لەالغایەدا هێناویانەو ئەزموونیان کردووە. وەهەروەها ویفق[248]ی شەشیش کەتایبەتە بە خۆرەوە، خاوەن کاریگەری و تایبەتمەندی گەلێکە و گوتوویانە ئەم تەلیسمە کاتێك پڕدەکەنەوە کەخۆر لەشرفی خۆیدا حلولی کردبێت و لەنحوست پارێزراو بێت، قەمەریش دەبێت لەنحوسدا بێ کێشەبێت و لەتالیعی ملوکێکدا بێت و لەو نەزەرەدا میهرو قبولٚ خاوەنی عاشیر بەخاوەنی تالیعی جێی گرنگی دادەنێن. وەشایستەی ئەوەیە لەو دەلیلانەدا شەریفی مەوالیدی پاشاکان بوونی هەبێت و سەرەتا دەیچەقێنن بەناوبۆنێکی خۆشداو دواتر دەیپێچن بەپەڕۆیەکی زەردی حەریرەوەو لەگەڵ خۆیاندا هەڵیدەگرن.

---

[248] ووشەی ویفق تایبەتە بەتابلۆ ژمارەییەکانەوە کەپێی دەڵێن چوارگۆشەی سیحری. هەریەکە لەحەوت سەییارەکە خاوەن ویفقێکی تایبەتن و ووشەی ناوبراو لەبری تەلیسم بەکاردێت.

وەوادەزانن کەتەلیسمی نابراو لەهاونشینی و خزمەتگوزاری و پێکەوەژیاندا لەگەڵ پاشاکاندا کاریگەریەکی زۆری هەیە. نمونەی ئەمانە زۆرن.

وەلەکتێبی الغایە کەدانراوی مەسلەمەی کوڕی ئەحمەدی مەجریتی ئەم صنعەت تەدوین کراوە و مەسەلەکانی بەشێوەیەکی تەواو تێیدا کۆکردووەتەوە. وەبۆ ئێمەیان گێڕاوەتەوە کەئیمامن فەخری کوڕی خەتیب لەمبارەیەوە کتێبێکی بەناوی (سرالمکتوم)وە نوسیوەو هەوەسبازان ئەم هونەرەیان لەمەشریقدا کردبوویە باو، بەڵام ئێمە بەدەستمان نەگەیشتووەو واگومان دەکرێت کەئیمام فەخری ڕازی لەپێشەوایانی ئەم بابەتە نەبووەو، لەوانەشە شتەکە بەپێچەوانەی ئەمەوە بێت. لەمەغریبیشدا دەستەیەك هەن ئەمکارە جادووگەریانە دەکەن و بەوورگ هەڵدڕەکان ناسراون، ئەمانە هەمان ئەوکەسانەن کەلەسەرەتای بەشەکەدا باسمکرد ئاماژە بەعابای پێست دەکەن یەکسەر دەیدڕێنن و، وەهەروەها ئاماژە بەوورگی گیانداران دەکەن و دەیدڕێنن. کەیەکێکیان لەم سەردەمەدا بەناوی بەعاجەوە بەناوبانگە، چونکە ئەو زیاتر لەکارە جادووگەریەکانی پەیوەست هەڵدڕینی سکی مەڕوماڵاتدا مومارەسەت دەکات و، بەم شێوەیە مەڕەکان دەترسێنن و بۆ ئەوەی لەزەرەرو زیان گەیاندن بەکشتوکاڵ بەروبومەکانیان دووریان بخەنەوە.

ئەم گروپە بەم هۆیەوە بەنهێنی دەژین لەبەر مەترسی دەستدرێژی دەسەلاّتدارن بۆسەریان. من گروپێکیانم بینیوە و ئەم جۆرە کارانەیانم بینیوە. وەلەخۆیانم بیستووە کەخاوەنی ڕیازەتن کەتایبەتە بەبانگەوازە کوفرەکانەوە. وەڕۆحی جنۆکە و ئەستێرەکان لەکارەکانیاندا بەشەریك دادەنێن. لەبارەی ئەم بانگەوازانەوە ڕیسالەیەکیان نوسیوە کەبەخنزیریە بەناوبانگە دەیخوێننەوە و فێری دەبن و ئەو گرۆپە بەهۆی ڕیازەتی ناوبراوەوە ئەم جۆرە کارانە بەدەستدەهێنن. وەئەوان لەبوونەوەرگەلێکی بێجگە لەمرۆڤدا کاریگەریان هەیە. وەك: کاڵاو حەیوانات و عەبدەکان، ئەم شێوازەی خۆیان بەمجۆرە باسدەکەن کە: ئێمە تەنها لەشتانێکدا کاریگەریمان هەیە کەدیرهەمیان تێدابێت

واتە کالأبن و خاوەنیان هەبێت و کڕین و فرۆشتنیان پێوە بکرێت. ئەم شێوازەش خەڵکی لەبارەی ئەوانەوە نەقڵدەکرد من کەسێکیانم بینی کە لێمپرسی و تەصدیقی کردم. بەڵام کارەکانیان دیارو ئاشکران ئێمەش ئاگاداریانین و بەچاوی خۆمان بینیومانە. بەم جۆرەیە چۆنیەتی ساحیری و تەلیسمەکان و کاریگەریان لەجیهاندا.

بەڵام فەیلەسوفەکان جیاوازیان خستووەتە نێوان تەلیسم و سیحرەوە دوای ئەوەی کەسەلماندوویانە ساحیری‌و تەلیسمەکان هەردووکیان کاریگەری تایبەتیان لەسەر نەفسی مرۆڤ هەیە، بەڵگەشیان لەسەر ئەم کاریگەریە هێناوەتەوە کەکاریگەریەکانی لەنەفسی مرۆڤدا لەسەر ڕێڕەوی تەبیعی و هۆکارە جەستەییەکان نیە، بەڵکو هۆکار گەلێکە کە بەهۆی چۆنیەتیەکانی ڕۆحەوە دێنەدی هەروەك چۆن کاریگەریە ناوبراوەکان یەکجار بەشێوەی گەرمایەك بەدی دێت کەبەهۆی شادی و خۆشیەوە بەدیهاتووەو جارێکی تر لەڕێگەی تەسەووراتە نەفسانیەکانەوە دەردەکەون، وەك ئەو چۆنیەتیانەی کە لەلایەن وەهمەوە ڕوودەدات، چونکە کەسێك کەبەسەر دیوار یان پەتدا دەچێت بەڕیوە، ئەگەر هێزی وەهمی وزە وەربگرێت بێگومان دەکەوێتە خوارەوە هەربۆیە زۆرێك لەخەڵکی دەبینین کەخۆیان بەجۆرێك لەسەر ئەم کارە ڕاهێناوە کەئەم وەهمەیان پێوە لادەبات و دەبینین بەسەر دیوار و پەتدا دەڕۆن و ناترسن کەبکەون.

کەواتە ئەوە سەلمێنرا کە کاری ناوبراو لەکاریگەریەکانی نەفسی مرۆڤ تەسەووری کەوتن بەهۆی وەهمەوەیە. وەهەرکات بسەلمێت کەئەمکارە لەکاریگەریەکانی نەفس لەجەستەی مرۆڤدا بەبێ هۆکارە جەستەییەکان تەبیعیە کەواتە ڕەوایە کەبۆ نەفس لەغەیری نەفسی مرۆڤیشدا هاوشێوەی ئەمەش ببینرێت، چونکە نیسبەتی ئەو بەجەستەکانەوە لەم جۆرە کاریگەریانەدا یەکێکە. چونکە کاریگەری ناوبراو لەجەستەی مرۆڤدا تێکەڵ نەبووە و نەنەخشاوە. کەواتە ئەوە سەلمێنرا کەئەو کاریگەریانە لەتەنەکانی تردا کاریگەری دەبێت، بەڵام هۆکاری ئەو جیاوازیەی کە فەیلەسوفەکان خستوویانەتە نێوان ساحیری و تەلیسماتەوە بریتیەلەوەی کەلەساحیری و جادووگەریدا

پێویست بەیارمەتی دەر (معین) نیە. بەڵام خاوەنی تەلیسمات هەروەك چۆن نجومگەرەكان دەڵێن لەجیهانی ئەرواح و ئەستێرەكان و نهێنی ژمارەكان و تایبەتمەندی بوونەوەران و بارودۆخە فەلەكیەكان كەلەجیهانی توخمەكاندا كاریگەری هەیە یارمەتی وەردەگرن.

ئەستێرەناسان دەڵێن: ساحیری یەكبوونی رۆحێكە لەگەڵ رۆحێكی تردا و تەلیسم یەكبوونی رۆحە لەگەڵ تەنێكدا مانای ئەم دەستەواژەیەش بەبڕوای فەیلەسوفان بریتیەلەپەیوەستبوونی تەبایعی بەرین (سەرەوە)ی ئاسمانی لەگەڵ تەبایعەكانی خوارەوە. وەتەبایعی بەرین یان سەرەوە بریتیە لەجیهانی رۆح و ئەستێرەكان هەربۆیە خاوەنانی تەلیسمەكان زیاتر لەنجومگەرەكانەوە یارمەتی وەردەگرن بەبڕوای ئەستێرەناس و نجومگەرەكان جادووگەری هونەرێكی بەدەستهاتوو نیە، بەڵكو ئەو بەتێڕوانین بەم سروشتەتایبەتە بەم جۆرە كاریگەریەوە ئافرێنراوە. وەجیاوازی نێوان ساحیری و موعجیزە بەبڕوای فەیلەسوفەكان بریتیە لەوەی كە موعجیزە بریتیە لە: هێزێكی خودایی كەلەنەفسدا ئەم كاریگەریە ڕادەچەنێت، هەربۆیە خاوەنی موعجیزە بۆ ئەنجامدانی موعجیزەو پەرجوو لەلایەن خوداوە پشتیوانی لێدەكرێت. وەجادووگەر كردارە ساحیریەكان لەلای خۆی و بەهێزە نەفسانیەكان و لەبەشێك لەكردارەكاندا بەیارمەتی شەیاتینەكان ئەنجامیان دەدات، كەواتە جیاوازی نێوانیان لەمەعقولیەت و حەقیقەت و زاتە لەنەفسی ئەمردا واتە لەیەك شتدا. بەڵام ئێمە لەم جیاوازیەدا بەڵگە بەنیشانەگەلێكی دیارو ئاشكرا دەهێنینەوە، كەبریتیتن لەوەی كە بوونی موعجیزە تایبەتە بەخاوەنی خەیر و چاكەوە و لەمەبەستە خێرەكاندا پەیوەستە بەنەفسەكانەوەو كەتەنها لەخێردان و بەبانگەشەی پێغەمبەرایەتی تەحەددا دەكەن.

بەڵام ساحیری لەخاوەن شەڕەكان و لەكردارە خراپ و شەڕەكانەوەیە وەك جیاكردنەوەی نێوان ژن و مێرد و تێكدانی شیرازەی خێزان و زیانگەیاندن بەدووژمنانو نمونەی ئەمانە كەپەیوەستن بەنەفس گەلێكەوە كەتایبەتن بەخراپە و شەڕەوە. جیاوازی

نێوان ئەودوانە لەلای حەکیمە ئیلاهیەکان بەم شێوەیە. وەهەندێك جاریش لەلای هەندێك لەصۆفی و خاوەن کەرامەتەکان لەبارەی ئەحواڵی ئەم جیهانەوە کاریگەری گەلێك دەبینرێن کەبەساحیری نایەنە هەژمار، بەڵکو وابەستەیە بەیارمەتیە خوداییەکانەوە، چونکە مەزهەب و تەریقەتیان لەشوێنەوارەکانی پێغەمبەرایەتی‌و تەوابیعەکانیەتی‌و هەرکەسە و بەئەندازەی حاڵ و ئیمان و پابەندبوونەکەی بەووشەی تەوحیدەوە بەهرەیەکیان لەمەدەدی ئیلاهی هەیە.

وەهەرکاتێکیش کەسێك لەم گروپە توانای کارەخراپەکانی هەبێت ئەنجامیان نادات، چونکە ئەو ئەوەی کەدەیکات وازی لێدەهێنێت و پابەندە بەفەرمانی ئیلاهیەوە، هەربۆیە کاتێك لەلایەن خوداوە ئیزن و رێگەی کردنی کارێکی پێ نەدرێت بەهیچ شێوەیەك ئەنجامی نادات وەئەگەر یەکێکیش لەوان بەبێ مۆڵەتی خودایی کارێك ئەنجام بدات ئەوا بەدڵنیاییەوە لەرێگەی حەق لایداوە و حاڵ و ویجدی لێ سەندراوەتەوە، چونکە موعجیزە بەهۆی هێزە ئیلاهی و مەدەدەکانی رۆحی خوداوەیە هەربۆیە هیچ ساحیرێك توانای کێبڕکێی لەگەڵیدا نیە، هەربۆیە دەبێت لەبارودۆخی ساحیرانی سەدەمی فیرعەون لەگەڵ عاسای موسادا وورد ببینەوە کەبەچ شێوەیەك ئەوەی کەبەدرۆ دروستو ئامادەیانکردبوو لەناوی برد[٢٤٩]، ئەوەبوو سیحرەکەیان بەتاڵ بوویەوە و لەناوچوو بەجۆرێك هەروەك بڵێی بوونی نەبوبێت. وەهەروەها لەبەر ئەوەی کەلە هەردوو سورەتی مەعوزەتەیندا (فلق — الناس) نازڵ بوویە سەرپێغەمبەر (ص)، (وەلەشەڕی فوکەرەکان بەگرێکاندا) عائیشە (ر ز) فەرمووی: پێغەمبەر فوی بەهەرگرێیەك لەو گرێیانەدا بکردایە کە جادووی لێکرابوو یەکسەر دەکرایەوە. کەواتە جادووگەری بەناو زیکری خوداوە بەهۆی هیممەتی ئیمانیەوە بەپایەداری نامێنێتەوە. مێژونووسان باسی ئەوەیانکردووە کەلەئالآی خەسرەویەکاندا

---

[٢٤٩] (وَأَوحَينا إلى مُوسى أن ألقِ عَصاكَ فَإذا هِيَ تَلقَفُ ما يَأفِكُون) س اعراف ئا ١١٧.

ویفقی مێئەنی ژمارەیی (تەلیسمی صدی)[٢٥٠] پارچەی چنراو لەزێڕ بوونی هەبووە. وە لەتالیعە فەلەکیەکاندا بۆ دانانی تەرکیبی ئەم ویفقە ئامادەباشیان بۆ کردبوو پڕیانکردبوو. بەلاّم ڕۆژی کوژرانی ڕۆستەم لەقادسیەدا ئالاّ ناوبراوەکان لەپاش شکانو بلاّوەکردنی ئێرانیەکان لەسەر زەویدا بەدەمدا کەوتبوو. هەربەو جۆرەی کەهەوادارانی تەلیسم و ویفقەکان باوەڕیان وابووە کە ویفقی نابراو پەیوەستبووە بەزاڵبوونو سەرکەوتنەکانەوە لەجەنگەکاندا.

وەئەو ئالاّیەی کەئەو تەلیسمەی تێدابووە یان لەگەڵیدابووە هەرگیز دووچاری شکست نەدەبوویەوە، بەلاّم لەم جەنگەدا مەدەدی ئیلاهی کەبریتی بووە لەئیمانی هاوەلاّنی پێغەمبەری خودا (ص) دژایەتی ئەو تەلیسمەی کردووە و، هەرجۆرە جادوویەك کەتێیدا دایاننابووکرایەوە و بەتاڵ بوویەوە خۆی پێڕانەگیرا و، ئەوەی کەکردبوویان بەتاڵ بوویەوە[٢٥١] بەلاّم شەریعەت هیچ جیاوازیەکی نەخستووەتە نێوان ساحیری و تەلیسم و تەڕدەستیەوە و هەموویانی لەحەرامەکان زانیوە.

چونکە ئەوکارانەی کەشاریع بۆ ئێمە بەموباحی داناون ئەوانەن کەیان لەئاینەکەماندا گرنگن و چاکەی ڕۆژی دوایمانی تێدایە یان لەمەعاشماندا باشە بۆمان. وەئەوکارانەی کەبۆهیچکام لەم کارانە سوودی نەبێت لەدوو شێوە بەدەر نیە: ئەگەر تێیاندا زیان یان جۆرێك زەرەر هەبێت وەك سیحر کەڕوودانی زەرەی هەیە هەروەك تەلیسمەکان، چونکە هەردووکیان یەکێکن وەك ئەو ئەستێرەناسەی کەتێیدا لەڕووی عەقیدەوباوەڕبوون بەکاریگەری جۆرێکە لەزیان وەلەئەنجامدا عەقیدەی ئیمانی بەهۆی گەڕاندنەوەی شتەکان بۆ لای غەیری خودا خراپیان دەکات. هەربۆیە ئەم جۆرە کارانە بەهۆی زیانەکانیانەوە حەرامن. وەئەگەر کارەکانمان نەبۆمان گرنگ بن و نەزیانێکیشیان هەبێت ئەوکات باشتر

---

[٢٥٠] ووشەی مێئەنی بریتیە لەڕیزی نەسەبێك مێئن کۆی مأیە (سەد) و، لەبەکارهێنانی تەلیسم نوساندا تەلیسمێك کەلەسەر شێوەی سێگۆشە دروست ببوایەبەپێی سێگۆشەی ژمارەیی و ئەوەشی کەلەسەر چوارگۆشە بوایە بەپێی چوارگۆشەی ژمارەیی ناویاندەنا ویفقی مێئنی جۆری ئەخیریانە (یاداشتەکانی دسلان).

[٢٥١] (وَبَطَلَ ماكانُوا يَعمَلُون) س الانعام ئا ١١٨.

نیەکەبۆ نزیکبوونەوە لەخودا بەکاریان بهێنین؟ چونکە لەحەدیسدا هاتووەکە: لەجوانی مرۆڤی باوەڕدارو موسوڵمان بریتیە لەوەی کەواز لەکارێك بهێنێت کەپەیوەندی بەوەوەنیە، هەربۆیە شەریعەت ساحیری و تەلیسمەکان و تەردەستی لەیەك بابدا داناوە چونکە هەموویان زیانبەخشن ئەم بابەشی تایبەتکردووە بەحەرام و قەدەغەکراوەکانەوە. بەلأم جیاوازی نێوان موعجیزە و ساحیری لەشەریعەتدا بەپێی گوفتاری موتەکەلیمەکان دەگەڕێتەوە بۆ تەحەدی و تەحەدیش بریتیە لە بانگەشەو ڕوودانی موعجیزە بەپێی بانگەشە بۆکراوەکەیە. وەموتەکەلیمەکان گوتوویانە: ڕوودانی موعجیزە بەپێی بانگەشەو دەعوا درۆینەکە ناکرێت، چونکە ماناکانی موعجیزە بەپیی ڕاستیەتی دەلالەتە ئەقلّیەکانە، چونکە سیفەتی نەفسی ئەو تەصدیقە هەربۆیە ئەگەر بەدرۆبێتەدی ئەوا ڕاستگۆ دەبێتە درۆزن و ئەمەش مەحاڵە.

هەربۆیە موعجیزە لەکەسی درزنەوە بەهیچ شێوەیەك ڕوونادات. بەلأم جیاوازی نێوان موعجیزەو ساحیری لەلای حەکیمە کان هەروەك باسمانکرد هەمان فەرق و جیاوازی نێوان خەیر شەڕە، هەروەك چۆن لەساحیرو جادووگەرەوە خێر ڕوونادات و لەخێریشدا بەکاریان ناهێنێت و بەلأم لەخاوەنی موعجیزەوە خراپە ڕوونادات و لەخراپەشدا بەکاریان ناهێنێت، هەروەك بڵێی ئەودووانە لەئەصڵی فیترەتیاندا کەوتوونەتە دوولایەنی دژبەیەکی خێرو شەڕەوە. خوداش هەرکەسێك کەبیەوێت ڕێنمایی دەکات.[٢٥٢]

---

[٢٥٢] (وَاللهُ يَهدي مَن يَشاء) س البقرة ئا ١٣٦.

## بەشێك

یەكێكی تر لەمجۆرە كاریگەریە ڕۆحیانە چاو تروكانە ئەوەش كاریگەریەكە لەنەفسی كەسی چاو پیسدا ئەوەش كاتێكە كە شتێك دەبینێت و زۆر پیایا هەڵدەدات و، هێندە بەباشیەوە باسیدەكاتو وای لێدێت كەئیرەیی پێ دەباتو، حەزدەكات ئەوشتە لەخاوەنەكەی زەوت بكات و لەئەنجامی خراپەی ئەو حەزە لەڕادەبەدەرەدا كاردەكاتە سەرشتەكەو زیانی پێدەگەیەنێت. ئەم جۆرە چاوذانەش شتێكی سروشتیەو زاتیەو، جیاوازی نێوان ئەم سیفەت و كاریگەریە نەفسیانەش ئەوەیە كەدەرچوونی فیتریەو، دواتر وای لێدێت كەچاودانەكەی بەزایە ناچێت و، بەدەست خۆی نیە و شتێكی بەدەستهاتوونیە. بەڵام كاریگەریەكانی تر هەرچەندە هەندێكیان بەدەستهاتوونین بەڵام ئەنجامدانیان دەگەڕێتەوە بۆ بكەرەكەیان، وەهێزێك كەلەواندا هەیە فیتریە نەوەك خودی دەرچوونی كاریگەریەكە. هەربۆیە فەقیهەكان گوتوویانە: كەسێك كەبەساحیری یان كەرامەت كەسێكی تر بكوژێت دەكوژرێتەوە، بەڵام بكوژ بەچاودانی كەسێك كەبیكوژێت ناكوژرێتەوە. ئەمەش تەنها بەوهۆیەوەیە كەئەم كارەی ئەو لەڕیزی كردارە ئیختیاریەكاندا بێت كەقەصدو ئیرادەیاندەكات یان وازیان لێدەهێنێت، بەڵكو ئەو لەدەركردنیدا بەحوكمی سروشت ناچاردەبێت. خوداش داناترە.

# بەشی بیست و سێیەم

## لەبارەی زانستی نهێنی پیتەکانەوە

لەم سەردەمەشدا ئەم زانستە بەسیمیا ناوزەد دەکەن و ئەم لەفزەش لەلای خاوەنانی تەصەوفی صۆفیەکان لەتەلیسمەکانەوە بۆ ئەم ووشەیە (سیمیا) نەقڵکراوە، وەووشەکەش بەجۆری بەکارهێنانە گشتیەکەی لەتایبەتدا بەکار هاتووە ئەم زانستەش لەنێو نەتەوەی موسوڵماناندا لەپاش تێپەڕبوونی هاتنی ئیسلام دەرکەوتنی غالیەکان (غلات)ی صۆفیەکان بەدیهاتووە، کەگروپی ناوبراو حەزیان لەئاشکراکردنی پەردەکانی هەست و ئەنجامدانی خەوارقەکانو تەسەڕووفە لەجیهانی توخمەکانداو، دەستیانکردە دانان و نوسینی کتێب و زاراوەو بیروباوەڕەکانی خۆیان لەبارەی تەنەزولی بوون لەواحیدەوە و تەرتیب کردنی و وایانزانی کەدیاردەکانی کەماڵ ناوەکانی ئەرواح و ئەفلاکو ئەستێرەکان تەبایع و نهێنی پیتەکان لەناوەکاندا دەڕوات، وەبەپێی ئەم تەبایعو نهێنیە ناوبراوانە بەپێی ئەم سیستەمەش لە بوونەوەراندا بوونی هەیە. وەبوونەوەران لەدەستپێکی یەکەمین ئیبداعو داهێنانەوە لەقۆناغەکانی خۆیاندا نەقڵ دەبنو نهێنیەکانی خۆیان ئاشکرادەکەن هەربۆیە زانستی نهێنی پیتەکان هاتووەتە ئاراوە کەلەبەشەکانی زانستی سیمیایە، کەنەبابەتەکەی دەتوانین کامڵ بکەین وەنە دەتوانین هەموو مەسەلەکانی بژمێرین. بونی و ئیبن عەرەبی و ئەوانەشی کە شوێن بەرهەمەکانی ئەو دوانە کەوتوون دانراوگەلێکی زۆریان لەوبارەیەوە هەیە، وەدەرئەنجام و بەرهەمی ئەم زانستە لەلای ئەمان بریتیە لەدەستێوەردانی نەفسە ڕەببانیەکان لەجیهانی سروشتداو،

بەیارمەتی ناوەجوانەکانی خودا و ووشە ئیلاهیەکان کەلەپیتەکانەوە سەرچاوە دەگرن ئەم پیتانەش دەورەدراون بەو نهێنیانەی کەلەبوونەوەراندا هەن لەپاشان لەچیەتیو چۆنیەتی نهێنی ئەو دەستێوەردانەی کەلەپیتەکاندا بوونی هەیە جیاوازیانکردووە، بەجۆرێك کەگروپێکیان ئەو رازەیان بەمیزاجی پێکهاتنی پیتەکان زانیوە و پیتەکانیان بەپێی بەشەکانی تەبایع وەك توخمەکان کردوویانە بەچوار بەشەوەو هەرتەبعێکیش تایبەتکراوە بەسیفەتێکەوە، کەدەستێوەردانی لەتەبیعەتەکەیدا ئیتر کاربێت یان کاردانەوە بەهۆی ئەم بەشەوە روودەدات لەم روەوە پیتەکان بەپێی دابەشکردنی توخمەکان بەپێی یاسایەکی صەناعی کەپێی دەڵێن تەکسیر کراوە بەم بەشانەوە:

ئاگری و هەوایی و ئاوی و خاکی کە الف- هێمای ئاگرو ب- هەواو ج- ئاوو د- خاك. بەم شێوەیە یەك لەدوای یەك پیتەکان دابەشدەکەن بەسەر توخمەکاندا تاوەکو کۆتاییان دێت هەربۆیە بۆ توخمی ئاگر حەوت پیتیان داناوە کەبریتین لە: الف هاء طاء میم فاء شین ذال وەبۆ توخمی هەواش پیتەکانی: با واو یا نون تا ظاد ضاء، وەبۆ توخمی ئاویش حەوت پیتیان داناوە وەك: جیم زاء کاف سین قاف ظاء. وەبۆتوخمی خاکیش بەهەمان شێوە حەوت پیتیان دیاریکردووە وەك: دال حط لام عەین رإ خظ غەین. پیتە ئاگرینیەکانیان تایبەتکردووە بۆ لابردنی ئەو نەخۆشیانە داناوە کەبەهۆی سەرماوە توشی مرۆڤ دەبێت بەدوو بەرابەرکردنی پلەی گەرما، بەڵام لەو جێگەیدا کەدووهێندە کردنی پلەی گەرما بەشێوەیەکی هەستی (کرداری) یان حوکمی (بالقوه) پێویست بێت، هەروەك چۆن لەجەنگ و خوێنڕشتن و کوشتارەکاندا پێویست بەدووهێندەکردنی هێزەکانی مەریخ دەکات ئەمیش بەهەمان شێوە پێویست دەکات پلەی گەرماکە ببێت بەدووهێندە. وەپیتە ئاویەکانیان بۆ لابردن و چارەسەرکردنی ئەو نەخۆشیانە بەکارهێناوە کەبەهۆی گەرما یان پلەی گەرمای جەستە بەرز دەکەنەوە، وەك تاکان و نمونەی ئەوان ئەمەش بەدووهێندەکردنی هێزی سەرما هەوڵی لابردنی گەرماکەیانداوە، کاتێك کەپێویست بوبێت کەسەرماکەی بکرێتە دووهێندە بەکردار یان

بەقووە وەك دووهێندەكردنی هێزی مانگ. وەنموونەی ئەمانە. هەندێكیش نهێنی ئەو دەستێوەردانەی كەلەپیتەكاندا بوونی هەیە لەڕێژەی ژمارەكانەوە زانیویانە، چونكە پیتە ئەبجەدیەكان چ لەڕووی دانان و چ لەڕووی تەبیعەتەوە مانای ژمارەكان دەگەیەنن كەتایبەتكراون پێیانەوە، هەربۆیە بەهۆی تەناسوبی ژمارەكانەوە لەنێوان پیتەكانیشدا تەناسوب و گونجانێكی سەربەخۆ بوونی هەیە هەروەك چۆن لەنێوان (ب و ك و ر) دا وەها گونجاویەك هەیە، چونكە هەریەكە لەسێ پیتی ناوبراو لەپەلی خۆیاندا مانای دوو دەبەخشن بەجۆرێك كە(ب) لەپلەی یەكانەكاندایە و (ك) لەپلەی دەیانەكاندایە و (ر) لەپلەی سەدانەكاندایە، هەربۆیە دوو نیشاندەدەن وەك ئەو گونجاویەی كەلەنێوان (د م ت) دا هەیە، چونكە هەرسێ ژمارەی ناوبراو لەپلەی خۆیاندا مانای چوار دەبەخشن. وەلەنێوان چوارو دوودا نیسبەتی دووهێندەیی هەیە. وەبۆ ئیسم و ناوەكانیش ویفقگەلیكیان (تەلیسم) دروستكردووە، هەروەك چۆن لەژمارەكان تەلیسم و ویفق دروستدەكەن، وەهەربەشێك لەپیتەكان تایبەتكراوە بە دەستەیەك لەویفقەكان لەڕووی ژمارەی شێوەكان یان ژمارەی پیتەكان كەگونجاوە لەگەڵیاندا، وەدەستێوەردانی نهێنی پیتی و نهێنی ژمارەیی بەهۆی ئەو گونجاویەی كە لەنێوانیاندا هەیە ئاوێتەی یەكتری بوون.

بەڵام تێگەشتن لەنهێنی تەناسوب و گونجاوی كەلەنێوان ئەم پیتانە و تەركیباتی تەبایعەكان یان لەنێوان پیت و ژمارەكاندا هەیە بەشتێكی دژوار دەزانرێت، چونكە لەجۆری زانست و قیاسەكان نیە بەڵكو سەنەد و دەلیلەكەی لەلای ئەمان زەوق و كەشفە. بونی دەڵێت: نابێت گومانی ئەوەبكەیت نهێنی پیتەكان لەو مەسەلانەیە كەبەقیاسی ئەقڵی دەتوانرێت پێیان بگەین، بەڵكو ئەم شتە لەڕێگەی موشاهەدەو یارمەتی و تەوفیقی ئیلاهیەوەیە. بەڵام دەستێوەردان لەجیهانی تەبیعەتدا بەهۆی ئەم پیت و ناوانەوە كەلەوانەوە پێكدێن و كاریگەربوونیان لەبوونەوەراندا لەو شتەئینكاری نەكراوەیە. چونكە ئەم جۆرە هەڵسووكەوتانە بەهۆی زۆرێك لەمانەوە (صۆفیەكان) لەڕێگەی تەواتورەوە

سەلمێنراوە. وەلەوانەیە کەسانێك گومان بکەن کەهەڵسوکەوتەکانی ئەم گروپە لەبوونەوەرانی ئەم جیهانەدا بە هەڵسوکەوتەکانی ئەهلی تەلیسمەکاندا یەکسانە ئەمە لەکاتێکدا بەم شێوەیەنیە، چونکە بەپێی ئەوبەڵگانەی کەخوازیارانی تەلیسمەکان هێناویانە حەقیقەتی تەلیسم و کاریگەری ئەو هێزە ڕۆحانیانە لەسەرچاوەی گەوهەری قەهرەوەیە وەئەم هێزە لەهەرشتێکدا کەبۆی فەراهەم دەبێت بەشێوەی قەهرو زۆرەوە کاردەکات و کاریگەریەکەی بەیارمەتی نهێنیەئاسمانیەکان و نیسبەتە ژمارەییەکان و ئەو بخوراتەیە، کەڕۆحانیەت بەرەو تەلیسم دەبات لەکاتێکدا بەهیممەتی ئەو وزە دەبەخشنەهێزە ڕۆحانیەکان. وە سودەکەشی پەیوەستکردنی تەبایعەکانی سەرەوەیە بەتەبایعەکانی خوارەوە. وەبەباوەڕی ئەهلی تەلیسمەکان وەك هەویرو مادەیەکی خامی پێکهاتوو تێکەڵ لەمادە زەمینی و هەوایی و ئاوی و ئاگریەکانە، کەلەکۆی ئەوانەوە بەدی دێت. وەئەوەی لەوەوە دێتەدی دەگۆڕێت و لەزاتی ئەودا تەسەڕووف دەکات و وەك خۆی لێدەکات. ئەکسیریش بۆ تەنە کانزاییەکان وەك هەوێرێکە کەلەڕێگەی ئیستیحالەوە دەچێتە ناو هەر کانزایەکەوە و دەیگۆڕێت بەزاتی خۆیی هەربۆیە دەڵێن بابەتی کیمیا جەستەیە لەجەستەدا، چونکە هەموو بەشەکانی ئیکسیر جەستەیین.

وەلەبارەی تەلیسمەوە دەڵێن: بابەتەکەی ڕۆحە لەجەستەدا، چونکە تایبەتمەندی تەلیسم پەیوەستکردنی تەبایعەکانی سەرەوەیە بەتەبایعەکانی خوارەوە. وەتەبایعەکانی خوارەوەی جەستە تەبایعەکانی سەرەوە ڕۆحانین. وەتەحقیقی دروست لەبارەی جیاوازی نێوان هەڵسووکەوتی ئەهلی تەلیسمەکان و ئەهلی ناوەکان (صۆفیەکان) کاتێك بەدەست دێت، کەبزانین هەموو ئەو هەڵسووکەوتانە لەجیهانی تەبیعەتدا تایبەتە بەنەفسی ئینسانیو هەوڵە مرۆییەکانەوە هەیە، چونکە نەفسی مرۆیی فەرمانڕەوایە بەسەر تەبیعەت و ژینگەوە. بەڵام هەڵسووکەوتی ئەهلی تەلیسمەکان لەوەدایە کەڕۆحانیەتی ئەفلاك بهێنێتە خوارەوە و بیانبەستێتەوە بە شێوە و نیسبەتە ژمارەییەکانەوە تاوەکو بەهۆیەوە جۆرێك تەرکیب و پێکهاتە دروست ببێت کەبەسروشتو تەبیعەتی خۆی

دەستبکات بەمەحاڵ بوون و ئیستیحاله لەوەی کەتێیدا بەدیهاتووە وەك هەویرو مادەیەکی خاو کاریگەری بکاتو هەڵسووکەوتی ئەهلی ناوەکان (اسمط )، واتە صۆفیەکان بەهۆی ئەو ئامادە باشیەوەیە کەبۆ ئەوان لەئەنجامی موجاهەدە و کەشفی نوری ئیلاهی و مەدەدی ڕەببانیەوە بەدی دێت و دواتر لەم ڕێگەیەوە تەبیعەت بەجۆرێك دەخاتە ژێر فەرمانی خۆیەوە و موسەخەری دەکات و، بەهیچ شێوەیەك سەرپێچی لەویستی ئەوان ناکات. وەپێویستیان بەیارمەتی هێزە فەلەکیەکان و نمونەی ئەوان نیە، چونکە ئەو یارمەتی و مەدەدەی کەبەوان دەگات لەم جۆرە یارمەتیانە لەپێشترە. ئەهلی تەلیسماتیش کەمێك پێویستیان بەڕیازەت هەیە تاوەکو بۆ هێنانە خوارەوەی ڕۆحانیەت ئەفلاکەکان سود مەند بن و چەندە لایەنی ڕیازەت بەئاسان دەژمێرن و ئاسانکاری تێدا دەکەن.

بەپێچەوانەی ئەهلی ناوەکان (صۆفیەکانە) وە کەگەورەترین ڕیازەت دەکەن و مەبەستیشیان لەو ڕیازەتە دەستێوەردان نیە لەکائیناتدا، چونکە وەها مەبەستێك وەك حیجاب و پەردە وەهایە لەنێوان ئەمان و حەقیقەتدا بەڵکو دەستێوەردان بۆ ئەوان بەشێوەیەکی عەرەزی نەك ئەصڵی وەك کەرامەتێك وایە لەلایەن خوداوە بەرامبەر بەمان، کەواتە ئەگەر خاوەنی ناوەکان (صۆفی) لەناسینی نهێنی ناوەکانی خودا و حەقیقەتی مەلەکوت کەدەرئەنجامی موشاهەدەو کەشفە کەموکورتی بکاتو تەنها گرنگی بەگونجانی نێوان ناوو تەبعەکانی پیتو ووشەکان بداتو، لەم ڕووەوە دەستێوەردان بکات. کەبەپێی ئەوەی کەبەناوبانگە ئەم جۆرە کەسانە ئەهلی سیمیان ئەوکات جیاوازیەك لەنێوان ئەوو ئەهلی تەلیسمات نابێت، بەڵکو شێوەی خاوەنی تەلیسمەکانیش لەم دڵنیاکەرەوەترن، چونکە ئەو بۆ بنەما تەبیعیو زانستی و یاساگەلێکی ڕێکو پێك دەگەڕێتەوە. بەڵام ئەگەر خاوەنی نهێنی ئەوناوە کەشفیانەی کە بەهۆیانەوە حەقیقەتی ووشەو کاریگەری گونجاویەکان ئاگادار دەبێتەوە، بەهۆی نەبوونی ئیخلاصەوە گرنگیدانەکەی لەدەست بداتو یاسایەکی بەڵگەیش لەزانستەکانی زاراوەی لەدەستدا نەبێت کەپشتی پێ

ببەستێت. بەم شێوەیە حاڵی ئەو لەقۆناغێکی لاوازتردا دەبێت لەئەهلی تەلیسمات. وەهەندێك جاریش خاوەنی ناوەکان (صۆفیەکان) هێزی ووشە و ناوەکان لەگەڵ هێزی ئەستێرەکاندا تێکەڵ بەیەکتری دەکەن‌و بۆ باسکردنی ناوەجوانەکانی خودا یان ئەوەی کەلەویفقەکان (تەلیسمەکان)وە وێنا دەکەن‌و بەڵکو هەم بۆ ناوی کاتەکانیش (کاتژمێرە گونجاوەکان بۆ پڕکردنەوەی تەلیسم) هەڵدەبژێرن‌و ئەم کاتانەش دەبێت لەشوێنەکانی سەعد و بەختەکانی ئەو ئەستێرانەدا بێت کەگونجاون لەگەڵ ئەو ناوەدا، هەروەك چۆن بونی ئەم کارەی لەکتێبەکەی خۆیدا بەناوی (انمات) ئەنجامداوە. ئەم گونجاویەش بەبڕوای ئەمان لەبارەگای حەزرەتی عەمائی[٢٥٣]دایە و ئەم پلەیەی بەرزەخ کەماڵی ناوەکانە. وەدابەشکردنی ئەو گونجاویە بەسەر حەقیقەتی بوونەوەراندا لەو پلەیە دێتەخوارەوە بەبێ ئەوەی کە هیچ جۆرە گۆڕانکاریەکی تێدا ڕووبدات، هەروەك چۆن کەگونجاوی لەو پلەیەدایە دێتە سەر بوونەوەران.

وەسەلماندنی ئەم گونجاویە بەلای ئەمانەوە تەنها بەحوکمی موشاهەدەیە وەهەرکات خاوەنی ناوەکان کەموکورتی بکات لەم موشاهەدەیەداو چاولێکەری لەخەڵکانی تر بکات (واتە خاوەنی تەلیسمەکان)، ئەوکات کارەکەی وەك کاری خاوەنی تەلیسمی لێدێت. بەڵکو هەروەك باسمانکرد شێوازی ئەهلی تەلیسم شێوازی ئەهلی تەلیسم لەم بەهێزترە. وەهەروەها هەندێك جار خاوەنی تەلیسمەکان کردارەکانی خۆیان و هێزی ئەستێرەکانیان لەگەڵ هێزی ئەو دوعاگەلێکدا تێکەڵدەکات، ئەم دوعایانەش لەووشەگەلێکی تایبەت بۆ گونجاوی نێوان ووشەو ئەستێرەکان پێك دێت، بەڵام گونجاوی دوعاکان بەلای ئەمانەوە وەك ئەو موناسەبەت و گونجاویە نیە کەخاوەنانی ناوەکان لەکاتی موشاهەدەدا ئاگاداری دەبنەوە، بەڵکو دوعاکانی خاوەنانی تەلیسم بۆشتانێك دەگەڕێتەوە کەبنەماکانی شێوازی جادووگەری ئەوان دەیخوازێت، وەك دابەشکردنی ئەستێرەکان بەسەر هەموو ئەو

---

[٢٥٣] وادیارە پلەی حەزرەتی عەمائی بەرزەخێکە لەنێوان جیهانی مادی و جیهانی ڕۆحانی و ئەو حەقیقەتانەی کەتێیدا هێزی فەزیلەت بەتەواوی ڕاستیەوە بەدی دێت.

بوونەوەرانەی کەلەجیهانەکانی بووندا بوونیان هەیە وەك جەوهەرەکان و عەرەزو زات و ماناکان (کانزاکان)و پیت و ناوەکانیان لەڕیزی ئەم بوونەوەرانەدا هەژمار دەکەن، وەبۆ هەریەکە لەئەستێرەکان بەشێك لەبوونەوەران تایبەت دەکەن ئەم یاسایانەش لەسەر بنەماگەلێکی سەرسوڕهێنەری ئینکار بنیاتنراوە وەك: دابەشکردنی سورەتەکان‌و ئایەتەکانی قورئان‌و لەسەر ئەم شێوەیەن هەروەك مەسلەمەی مەجریتی لەالغایەدائەم شێوازەی بەکار هێناوە.

وەئەوەی ڕواڵەتی چۆنیەتی کتێبی ئەنماتی بونی دەردەخات ئەمیش ئەم شێوازەی لەبەرچاو گرتووە، چونکە ئەگەر کەسێك لێکۆڵینەوە لەکتێبی ئەنماتدا کردبێت ئەو دوعایانەی کەتێیدایە ببینێت سەیری سەعتەکانی هەرحەوت ئەستێرەکە بکات و، دواتر کتێبی الغایە بخوێنێتەوە و هەستانی ئەستێرەکان لێکۆڵینەوەبکات، واتە ئەو دوعایانەی کەتایبەتە بەهەر ئەستێرەیەکەوە پێیاندەڵێن قیام (هەستانی) ئەستێرەکان. بەمانایەکی تر ئەو دوعاو موناجاتەی کەبەهۆیەوە بۆ مەبەستی خۆیان ڕادەپەڕن و قیام دەکەن. ئەوکات گەواهی بەم دوعایەدەدا. وەگونجاوی نێوان هەردووکتێبی الغایە و ئەنمات ئەم گونجاویەش ئیتر لەمادەی ئوصوڵی بابەتەکانی ئەو ئیتر لەو تەناسوبە لەئەصڵی ئیبداع و بەرزەخدا زانست بوونی هەیە، دەتوانرێت بەدەست بهێنێت و بەهەموو ئەو خاڵانەوە کەباسمانکرد حوکم بکەین. وەهەرزانستێك کەشەرع حەرامی کردووە ناتوانین ئینکاری سەلماندنی بکرێت، چونکە ئەوە سەلمێنراوە کەجادووگەری و سیحر واقیعیەتی هەیە لەگەڵ ئەوەشی کەحەرامە، بەڵام ئێمە ئەو زانستانەمان بەسە کەخودا فێری کردووین. بێجگە کەمێك زانست نەبێت پێتان نەبەخشراوە[254] تەحقیق و نوکتە هەروەك سەلمێنرا سیمیا جۆرێکە لەسیحر و جادووگەری کەلەڕێگەی ڕیازەتە شەرعیەکانەوە دێتەدی، چونکە لەلاپەڕەکانی پێشوودا باسمانکرد کەدەستێوەردانی لەجیهانی هەستی بۆ دووجۆر لەبەشەکانی مرۆڤ ڕوودەدات کەبریتین لە: پێغەمبەران و هەڵسووکەوتیان بەهێزێکی

---

[254] (وَما أُوتِيتُم مِّنَ العِلمِ إلّا قَلِيلا) س الاسرى ئا ٨٧.

خوایيە كەخودا لەسەری ئافراندوونی، گروپێكی تریان ساحیرەكانن و هەڵسووكەوتیان بەهێزە نەفسیەكانە كەلەسەری دروستكراون. وەهەندێك جاریش بۆ ئەولیاكان تەسەرووفێك ڕوودەدات بەدەستهێنانی بەهۆی كۆمەڵێك عەقیدەی ئیمانیەوەیە كەلەدەرئەنجامەكانی تەجریدن، بەلأم ئەوان مەبەستی بەدەستهێنانیان نیە، بەڵكو بەبێ ئەوەی بەشوێنیەوە بێت بۆ ئەمان ڕوودەدات و ئەوانەشی كەجێگە پێیان قایمە هەركات وەها حاڵەتیكیان بۆ دەست بدات لێی دوور دەكەونەوە و پەنادەبەنە بەرخودا: هەروەك دەگێڕنەوە بایەزیدی بوستامی شەو كاتێك گەشتە كەناری دیجلە لەسەر هەردووپێكانی دانیشت و كوتوپڕ هەردوو كەناری ڕووبارەكە پەیوەست بوون بەیەكەوە، بەلأم ئەو پەنای بەخودا گرت و گوتی: بەهرەی خۆم لەبەرامبەر شتێكی كەمەوە نافرۆشم.

وەسواری كەشتیەكە بوو لەگەڵ بەلەمەوانەكاندا لەڕووبارەكە پەڕییەوە. بەلأم لەبارەی سیحر و جادوەوە دەبێت ئەوە بزانین ئەوكەسانەی كەبەقیترەت جادووگەرن بەناچاریەوە دەبێت ڕیازەت بكێشنو تاوەكو ئەو توانایەی لەقۆناغی قوەوە بگەیەنێتە كردار، هەندێك جاریش بەشێوەیەكی ناسروشتی و لەڕێگەی بەدەستهێنانەوە ساحیری فێردەبێتو، ئەم جۆرەش بێجگە لەساحیری فیتریە وەئەڵبەت لەم جۆرەشدا دەبێت وەك جۆری یەكەمین ڕاهێنان لەڕیازەتدا بكەن و هەوڵبدەن. ئەم جۆرە ڕیازەتە تایبەتانەی ساحیری بەناوبانگن وەجۆرو چۆنیەتیەكانیان مەسلەمەی مەجریتی لەكتێبی الغایەدا و جابری كوڕی حەیيان لەڕیسالەكانیاندا هێناویەتی و، خەڵكانی تریش لەبارەیەوە گفتووگۆیانكردووە و زۆرێك لەو كەسانەی كە ئەیانەوێت ساحیری فێربن ئەوانە بەكار دەهێننو ڕیازەتە ناوبراوەكان بەگونجاو لەگەڵ هەلومەرج و یاساكانیدا فێردەبن، بەلأم ئەو ڕیازەتە ساحیرانانەی كەپێشینان ئەنجامیان دەدا پڕبووە لەكوفر وەك ئەوەی كەڕوویاندەكردە ئەستێرەكانو، جۆرەها دووعایان بۆ دەخوێند و ناویان دەنان (قیامات) بۆ ئەوەی لەم ڕێگەیەوە ڕۆحانیەتی ئەستێرەكان بۆ خۆیان ڕابكێشن، یەكێكی تر لەڕیازەتە كوفرەكانیان ئەوەبوو كەلەپەیوەستدانی كردار بەتالیعە ئەستێرەییەكانەوە و بەرابەركردنی ئەستێرەكان

لەبورجەکاندا بۆ بەدەستهێنانی کاریگەری خوازراو باوەڕیان هەبووە، بێجگە لەخودا هۆکار گەلێکی تریش بەکاریگەر دەزانن هەربۆیە زۆرێك لەو کەسانەی مەبەستی دەستێوەردانیان لەجیهانی بوونەوەراندا هەبووە خۆیان لەم شێوازە دوور خستوەتەوەو بۆ بەدەستهێنانی ڕیگەیەکیان هەڵبژاردووە کەلەکوفرەوە دووریان دەخاتەوە. وەرپیازەتە ناوبراوەکان بەهۆی زیکر و تەسبیحات و دوعاو قورئان و حەدیسەوە بەشێوەیەکی شەرعیان لێکردبوو بۆ ئەوەی ئەوان والێبکات ئەوبەشانەی کە بۆ پێویستی ئەوان گونجاوە ڕێنمایی بکات هەروەك چۆن لەلاپەڕەکانی پێشوودا باسمانکرد، ئەوان ناچار بوون هەموو بوونەوەرانی جیهان بەزات و سیفەت و کردار بەپێی کاریگەری ئەستێرەکان حەوتەوانەکان دابەشیان بکەن لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا بۆ دابەشکردنی بوونەوەرانی ناوبراو ڕۆژ و سەعاتە گونجاوەکان لەگەڵیدا بەشوێن دابەشکردندا دەگەڕان، ئەم کردارەش لەژێر ڕیازەتە شەرعیەکاندا دەشاردەوە تاوەکو نەوەك ئالودەی ساحیریەکی دیار بن کەکوفرە یان نزیك ببنەوە لێی بۆ گشتگیر کردنی دڵسۆزی و ئیخلاصیان دەست دەگرن بەشەرعەوە، چونکە بوونی لەکتێبەکەی خۆیدا انمات و کتێبی کەسانیتریشدا ڕووی لەم شێوازە کردبوە و ناویان ناوە سیمیا بۆ ئەوەی بەم هۆیەوە بەشێوەیەکی زیادەڕۆیی لەناوی ساحیری دوور بکەونەوە، بەڵام ئەوان حەقیقەتی هەمان ماناو مەفهومی ساحیرییان گرتوەتەبەر و هەرچەندە ڕوانگە شەرعیەکەیان بەدەستهێناوە و هێندەش لەباوەڕبوون بەخودا دوور نەکەوتوونەتەوە.

سەرەڕای ئەمەش ئەوان لەسەر ئەوەن لەجێهانی بوونەوەراندا دەستێوەردان بکەن ئەمەلەکاتێکدا لەدیدی شاریعەوە وەها تەسەڕوف و دەستێوەردانێك حەرام و ڕێگە پێنەدراوە. وەبەڵام دەستێوەردانێك کەلەڕێگەی موعجیزەی پێغەمبەرانەوە ڕوویداوە بەفەرمانی خوداو ویستی ئەو بووە ئەوەشی کەبۆ ئەولیاکان هاتووەتەدی هەربەفەرمانی خودایە

کەلەواندا لەڕێگەی ئافراندنی زانستی پێویست بەهۆی ئیلهامەوە بەدی دێن ئەوان هیچکات بەبێ فەرمانی خودا ناتوانن بەدەستی بهێنن. کەواتە نابێت باوەڕ بەبانگەشەکانی ئەم کەسانەبکرێت لەبارەی جیهانی سیمیاوە، چونکە ئەم زانستە هەروەك باسمانکرد لەهونەرەکانی ساحیری و تەوابیعەکانیەتی خوداش بەکەرەمی خۆی ڕێنماکاری مرۆڤە بۆلای حەقیقەت و ڕاستی.

## بەشێك

لەلقەکانی زانستی سیمیا بەبیرباوەڕی ئەوان برتیە لەدەرهێنانی وەڵامەکان لەپرسیارەکان. ئەم شتەش بەهۆی پەیوەندی گەلێکە کەلەنێوان ووشە پێکهاتووەکان لەپیتەکان واتە پیتە نوسراوەکان بەرقەرارە و بوونی هەیە و بەگومانی ئەوان ئەم پەیوەندیانە بنەڕەتی ناسینی مەسەلە گەلێکە کەدەڵێن لەبارەی ئایندەی بوونەوەرانەوە بەدەستیانهێناوە، قسەکانیان تەنها بەمەتەڵ و مەسەلە ئاڵۆز و نادیارەکاندایە. ئەمان لەمبارەیەوە قسەی زۆریان هەیە وەك دوعاو ویردەکان. وەسەرسوڕهێنەرترین لەهەموویان قەصیدەی جیهانی سبتیە کەپێشتر باسمانکرد. لێرەدا دەستدەکەین بەباسکردنی خڵگەلێك کەلەبارەی چۆنیەتی کارکردن بەم قەصیدانەیە و ئەو قەسیدەیەی کەدراوەتە پاڵ سبتی، کەبەگومانی ئەوان لەمبارەوەیە باسی دەکەین و لەپاشان ئاماژەش بە سیفەتی قەصیدەکە دەکەین. وەئەو بازنە و خشتەیەی کە بۆ ئەو دەیکێشن باسدەکەین و دواتریش حەقیقەتەکەی ئاشکرا دەکەین و دەیسەلمێنین قەصیدەی ناوبراو لەمەسەلە غەیبیەکان نیە، بەڵکو تەنها موتابەقەتی نێوان پرسیارو وەڵامە کەلەشێوازە خیتابیەکەیەوە بەدەست دێت کەلەشیعرە خوێدارە (ملحی) کاندا لەدەرهێنانی وەڵام لەپرسیار بەصنعەتێك کەپێی دەڵێن تەکسیر سەرسوڕهێنەرە. کەلەلاپەڕەکانی پێشوودا باسمانکرد. وەئێمەش ڕیوایەتێکمان لەدەستدا نیە کەلەڕاستیەتی ئەم قەصیدەیەدا پشتی پێ ببەستین. بەڵام هەوڵی ئەوەماندا ڕاسترین نوسخەسەبارەت بەمەسەلەکە بەدەست بهێنین وەقەصیدەکەش ئەمەیە:

ڕوونکردنەوەی وەرگێڕی (فارسی)

پاشماوەی ئەم بەشانە لەو ڕووەوەی کە دانەر لەلاپەڕەی ٢١٩ تاوەکو لاپەڕەی ٢٣٠ ئەم تەرجەمەیە، لەبارەی ئەم قەسیدەیەوە و چۆنیەتی بەکارهێنانی بەدوور و درێژی قسەی کردووە بەو بەڵگانەی کەدواتر باسبکرێن تەرجەمەنەکراو بۆ ڕوونکردنەوە ئەوە وەبیر دەهێنینەوە کەدانەر لەم بەشەدا هەمان قەصیدەکەی سبتی کەبەپێی چاپی پاریس ١٠٨ و، بەپێی نوسخەی دەستنوسی (ینی جامع) ١١٥و، بەپێی چاپی داراللبنانی ١١٦ کە١١٦ بەیتە نەقڵی کردووە لەناوەڕاستی بەیتەکاندا دەستەواژەگەلێکی پەخشانی وەك: قسەکردن لەبارەی دەرهێنانی ڕێژە و چۆنیەتی کێشانە و پێوانەکانی بەرامبەر ئەوان و هێزی پلەی تایبەت و جیاکەرەوە بەنیسبەت شوێنی هەڵواسینی ئاوێتەبوونی تەبایعەکان زانستی تووب، یان صنعەتی کیمیا و توویبی ڕۆحانی وشوێن تالیعی تیشکەکان لەمەوالیدی پاشاکان‌و شازادەکان و کاردانەوەی ڕۆحانی و ملکەچی ڕەببانی و مەقامی خۆشەویستی‌و حەزی نەفسەکان‌و، موجاهەدەت و تاعەت و عیبادەت خۆشەویستی‌و خۆشویستن و فەناو ڕووتێکردن و چاودێری و هاوڕێیەتی و کردارە هەمیشەییە تەبیعیەکان، وەصیەت و نجومگەری و ئیمان و ئیسلام و حەرامکردن و ئەهلیەت و شیاوی‌و نمونەی ئەمانە بەناونیشانی ناوە بەشەکانی سەرەوەی بەیتگەلێکی دیاریکراو دەبینرێت، سەرەڕای ئەمەش لەتەنیشت یان سەرەوەی بەیتگەلێکی تایبەت لەقەصیدەی ناوبراو شێوازە ئاماژەییەکان‌و مەتەڵ و پیتە پچڕ پچڕەکان و ژمارەگەلێکی جۆراو جۆر هاتوون و لەپاش کۆتایی بەیتەکان و ئامازە ناوبراوەکانەوە شەرحێك لەپەراوێزیەوە بەناوی: (کاری دەرهێنانی وەڵامی پرسیارەکان لەقەصیدەی زاناکە بەیارمەتی خودا) دەبینرێت لەسەرەتای ئەم بەشەشەوە دانەر دەڵێت: بۆ هەرپرسیارێك دەتوانین ٣٦٠ وەڵام بەدەست بهێنین دواتریش لەبارەی بەهای ئەو پیت و ژمارانەی کە لەخشتەکاندا نوسراوە ڕوونکردنەوەی داوەو بەشێوەیەکی دوور و درێژ شێوازی کاری بەدەستهێنانی وەڵامەکەی باسکردووە. وەبۆ تاقیکردنەوەش ئەم پرسیارەی کردووە کە: ئایازانستی قەصیدەکە نویٚ یان قەدیم و کۆنە؟ بەپێی تیۆری دانراوو ڕێکراوە لەم بەشەدا

هەرپرسیارێك ٣٦٠ وەلامی هەیە چونکە یەکێك لەو شتانەی کەدەبێت بخرێتە ناو وەلامەکەوەو، کاری پێبکرێت بەدەستەواژەی ئەستێرەناسان و نجومگەرانی تالیعە دانەرانیش وەك یەکەمین تالیع دەرەجەی قەوسیان هەڵبژاردووەو دواتریش دەستیانکردووە بەباسکردنی شێوازی ئەم بابەتە بەم شێوەیە: پیتەتاکەکانی سەری کەوانەکە (رأس القوس) هاوشێوەی لەسەری جەوزا (رأس الجوزاء ) سێیەمی ئەو تاکەش سەری دۆڵچە (رأس الدلو) ی تاوەکو ئاستی ناوەند دادەنێین و پیتەکانی پرسیارەکەی بۆ زیاد دەکەین و لەژمارەکەی وورد دەبینەوە کەلانی کەمی ٨٨ و لایەنی زۆری ٩٦ دەبێتو کەکۆی دوورەکەیان ڕاستە.

کەواتە لەپرسیارەکەی ئێمەدا ٩٣ پیت هەبووە ئەگەر لەگەڵ ٩٦ دا کۆ بکرێتەوە، پرسیارەکە کورت دەکەینەوە بەم شێوەیەی کە هەموو دوانزە قۆناغەکەی لادەبەین و پاشماوەکەی دەپارێزین. لەپرسیارەکەی ئێمەدا حەوت دەور و قۆناغ مایەوە تاوەکو ئەوکاتەی کەتالیع نەگاتە ١٢ دەرەجە و ٩ یان لەپیتدا جێگیر بکە، بەلام ئەگەر تالیع بگاتە ١٢ دەرەجە ئەوکات نەبۆ ئەو ژمارەیەك تۆمار دەکرێت و نەرۆلێکیشی دەبێت. دواتریش دەبێت ژمارەکانی تۆمار بکەین بەو مەرجەی کەتالیع لەڕووی سێیەمدا لەبیستو چوار زیاتر ببێت، ئەوکات تالیع کە یەکەو سولتانی تالیع کەچوارەو دەوری گەورەتر کە یەکە تۆمار دەکرێت دەبێت تالیع و دەور کە لەم پرسیارەدا دەکەنە دوو کۆبکرێنەوە، ئەوەی کەلەم دوانە دەمێنێتەوە دەبێت لەسولتانی بورجەکەدا کەدەگاتە هەشت لێکبدەین و سولتانیش بخەینە سەر تالیع و ئەوکات دەکاتە پێنج. کەواتە حەوت ئەصڵ بەدی دێن ئەوەی کەلەلێکدانی تالیع و دەوری گەورەتر لەسولتانی قەوس بەدەستدێت، تاوەکو ئەوکاتەی کەنەگاتە ١٢ دەبێت لەگۆشەی هەشتدا لەخوارەوەی خشتەکە لەکاتی بەرزبوونەوەدا داخڵ بکەین. ئەم کردارە بەمشێوە دوور و درێژی بەردەوام دەبێت تاوەکو پیتێك بەدەستدێت و تۆماری دەکەن و دواتر کردارە کە بەردەوامی پێ دەدەن و، لەبارەی تەواوی ئەو پیتانەی کەپرسیارەکەیان پێکهێناوە کاردەکەن و بەم جۆرە

پیتگەلێکی جیا بەدەستدێن کەدەتوانرێت لەگەڵ یەکێك لەبەیتەکانی قەصیدەکەدا جێبەجێ بکەین بەو جۆرەی تاوەکو بتوانین لەپیتەکان ووشەی عەرەبی بەدەست بهێنین پەیوەستیان دەکەن بەیەکەوە، بەڵام دەبێت لەو نەزم و تەرتیبەی کەلەکاتی کارەکەدا بەدەستهاتووە بچووکترین گۆڕانکاری نەکرێت.

ئەم ووشانەش هەڵگری وەڵامن و وەڵامیش یەکێك لەبەیتەکانی هەمان ئەو قەصیدەیە دەبێت ئەمەیە ئەو وەڵامەی کەئیبن خەلدون لەبارەی پرسیاری قەصیدەکەوە بەدەستی هێناوە: تروحن روح القدس ابرز سرها – لادریس فاسترقابها مرتقا العلا.

لەم شیعرەوە ئەوە تێدەگەین کەقەصیدەکە خاوەن ڕیشەیەکی زۆر قەدیمی و کۆنەو داهێنەرەکەشی ئیدریس بووە کەهەندێك لەزانایانی ئیسلام ئەویان لەگەڵ (ئەخنوخ)دا بەیەك کەس زانیوە، پاشماوەی بەشەکە تایبەتکراوە بەکردار گەلێکی ترەوە کەدەتوانین هەریەم مەسەلەی قەصیدەیە ئەنجامیان بدەین، بەشەکەش بەدەستەواژەگەلێك کۆتایی دێت، کەدانەر تێیدا شێوازی کەشفی پەیوەندیە سەرسوڕهێنەرو نهێنیەکان کەلەنێوان پیت و چوار توخمەکەدا بوونیان هەیە باسکردووە دسلانیش وەرگێڕی پێشەکی بۆ سەر زمانی فەرەنسی وازی لەتەرجەمەی ئەم بەشەهێناوە و دەنوسێت: لەگەڵ ئەوەی کەئەم بەشە لەسەرەتای قەصیدەکەی سبتیەوە پڕیەتی لەزاراوە و دەستەواژەی ئاڵۆزو شێوە مەتەڵە من باوەڕم هەبوو کەدەکرێت تەرجەمە بکرێت، بەتایبەت زۆر حەزم دەکرد ئەو کارە دوور و درێژە و کەدانەر بەهۆیەوە لەدۆزینەوەی ئەم وەڵامەدا سەرکەوتوو بووە بەردەوام بم و خۆم بیهێنمەدی، هەربۆیە دەستم کردە بەرابەرکردنی دەقی چاپی پاریس‌و نوسخە دەستخەتەکانی (C D) لەگەڵ چاپی بولاقدا و بۆم دەرکەوت کەمن نوسخەی ڕاستم لەم قەصیدەیە کەکاترمر بینیویەتی لەدەستمدا نیە، هەروەك بڵێی ئەویش بەئەندازەیەکی فراوان لەچاپەکەی خۆیدا نوسخەی بەدەل و لەبری هەبوو.

نوسخە دەستنوسەکانی کتێبخانەی پاشایەتی و چاپی بولاقیش نوسخەگەلێکی لەبری زۆری خستەسەر دەقی ئەم مەنزومەیە کەلەڕووی نوسخەی دەستنوسی قوستەنتینیە

لەلایەن وەرگێڕی تورکەوە خراونەتە بەردەست وانەگەلێکی تری فێری من کرد ژمارەیەکی زۆر نوسخەی لەبری کەلەڕێگەی ئەم زانایەوە پێشکەشکرابوو، خرایە سەرژمارەی پێشوو نوسخە دەستخەتەکانی ژمارە ١١٦٦ و ١١٨٨ کتێبخانەی پاشایەتی خاوەن شەرحگەلێکی کورت بوو لەبارەی قەصیدەکەوە، وەلەوانیشدا نوسخەیەکی تر لەمەنزومەکە دەبینرا و لەم ڕێگەیەوە بەیت و وانەگەلێکی نوێ فێربووم کاتێك ئەم ژمارەزۆرەی نوسخە لەبرەکان تەیار بووم هەوڵمدا ئەم دەقە کەبەهۆی گرنگی پێنەدان و نەزانی کۆپی کرانەوە چیەتیەکەی ئاوەژوو بوەتەوە سەرلەنوێ ڕاستی بکەمەوە، بەڵام بینیم لەگەڵ هەموو ئەم هۆکارانەدا ناتوانم دەرئەنجامێکی دڵخۆشکەر بەدەست بهێنم. ئەو ڕستە ئاڵۆزانەی کەسبتی لەم قەصیدەیەدا بەکاری هێنابوون تاوەکو بەهۆیانەوە مانای قەصیدەکە شاراوە و ئاڵۆزبکات، بەجۆرێك ناڕاست نوسرابوو کەڕاستکردنەوەیان لەتوانا بەدەر بوو لەگەڵ بوونی نوسخە لەبرە زۆرەکان کەلەدەستمدا بوون ئەوەم بەبیردا هات کەدەبێت وازلەم تەرجەمەیە بهێنم، چونکە هەوڵمدا بەتەنها خۆم لەسەر ئەو ڕوونکردنەوانەی کەئیبن خەلدون دابووی کاربکەم و شێوازی کارەکەی تێبگەم.

بەڵام بەرلە سەرقاڵبوون بەم کارەوە لەوە تێگەشتم کەدەبێت نوسخەیەك لەقەصیدە لەبەرچاوم بێت بابەتی سەرسوڕهێنەر ئەوەیە کەهیچ یەك لەنوسخە دەستنوسەکانو چاپە بەردەستەکان نەیانبووە، یەك نوسخەی دەستنوسی کتێبخانەی الجزیرە چەند بازنەیەکی شێوە خشتەیی هەبووە بەڵام هیچکامیان وەك ئەو ڕوونکردنەوانەی کەئیبن خەلدوون داویەتی یەکیان نەدەگرتەوە. پاش ماوەیەك تەرجەمەی تورکی پێشەکی لەلایەن جەودەت ئەفەندیەوە دەستم کەوت تێیدا لاپەڕەیەکی گەورەم بینی کەلەسەر هەردوو بەرگی ئەو خشتەیە یەکێکیان بازنەیی و ئەویتریشیان چوارگۆشە چاپ کراوە لەژێر خشتەی چوارگۆشەکەدا نوسراوە، (زایرجە العالم) خشتەی یەکەمین کەلەبازنە ناوەند یەکگرتووەکاندا پێکهاتبوو بەهۆی ئەو شیعرانەوە دابەشکراوە چوار بازنەی بچوکتر لەناخیدا هەبوو، وەلەناو بازنە ناوەوەدا ژمارەیەکی زۆر ژمارە و پیت و ئاماژە کە

هەندێکیان بەئەلف بای فەرمی (رشم الزمام) ئەوانی تریش بە(رشم الغبار) نوسراوە دەبینرێت، خشتەیەکی تر بەشێوەی چوارگۆشەو بەهۆی هێڵەڕاستەکانەوە کراوە بەچەند هەزارخانەوە کەزیاترن لەحەوت هەزار خانە دەبێت، کەنزیکەی نیوەیان هەڵگری ژمارەو پیت و ئاماژە بووە لەئەنجامدا بیرم کردەوە ئەو هۆکارەی کەئارەزوم کردبوو دەستم کەوت، دووبارە دەستم کردەوە بەتەرجەمەکردنی پێشەکی ئیبن خەلدون‌و بۆ ئەو کارەی کەشەرحی کردبوو دەستم کردە لێکۆڵینەوە، خێرا لەوە تێگەشتم کە ئەم خشتانەش ئەو دەرئەنجامەی کە دانەر باسی کردوون نادات بەدەستەوەو دواتریش لەبارەی ڕاستیەتی قەصیدەکەی جیهانەوە کەوتمە گومانەوە خشتە شێوە چوارگۆشەکە لەگەڵ ڕوونکردنەوەکانی پێشەکیدا جێبەجێم کرد، بینیم کەلەبری هەبوونی حەوت هەزار و دوسەدو پێنج خانە تەنها حەوت هەزارو و چل خانەی هەیەو سێ تونی پەنجا خانەیی دیار نەماوە، ئەم مەسەلەیە هیوای گەشتنی منی بەئەنجامێك گۆڕی بۆ نائومێدی، چونکە بەدڵنیاییەوە من ئەو خشتەیەی کە ئیبن خەلدون بابەتەکانی لەسەر شەرحکردبوو لەبەردەستمدا نەبوو، سەرەڕای ئەمەش نوسخە دەستنوس و چاپیەکان لەزۆرێك لەژمارەو ڕەمزەکاندا لەگەڵ یەکتریدا نەدەگونجان هەموو ئەم هەڵانە کەئاماژەم پێکردن ئاڵۆزی بابەتەکە کەسەرانسەری بەشەکانی دەقەکەی گرتبوویەوە تایبەت نەبوونی نوسخەیەکی باش لەخشتەکان منی لەکالاتێك کەئەنجامێکی دڵخۆشکەری هەبێت نائومێد کردو ئەمەش زۆر جێگەی داخ نیە، چونکە بنەماکانی بابەتەکە لەڕووی واقیعیەت یان لەڕووی زانستیەوە گرنگیەکی ئەوتۆی نیە سبتیش کاتێك ئەم مەسەلەی دەخستە ڕوو بەدڵنیاییەوە تەنها مەبەستی بێئاگاکردنی خوێنەرەکانی بووە.

# بەشی بیست و چوار

## لەبارەی زانستی کیمیاوە

لەم زانستەدا باس لەمادەیەك دەكرێت كەبەهۆیەوە كانزاكان بەشێوەیەكی صەناعی بەرهەمدەهێنرین ئەو كارەشی كەئەم ئەنجامەی دەبێت توێكاری دەكرێتو هەروەك چۆن هەموو مەوالیدەكان لەپاش ناسینی پێكهاتەو تەركیبات و هێزەكانیان دەیخەنەبەر لێكۆڵینەوەوە بۆ ئەوەی مادەیەكیان دەستبكەوێت كەبۆ ئەم مەبەستە ئامادە بێت. كیمیاگەران نەك تەنها لەبارەی كانزاكانەوە لێكۆڵینەوەیان كردووە، بەڵكو ئەوان تەنانەت مادەحەیوانیەكانی وەك: ئێسقان و پەڕو موو هێلكەو پاشەڕۆكانیشیان لەتاقیگەكاندا شیكاری دەكرد. دواتر كارانێكیان توێكاری دەكەن كەبەهۆیانەوە ئەم مادە لەقوەوە دەبێتە كردار. حەلكردنی تەنەكان بەهۆی تصعید[٢٥٥] وتقطیر[٢٥٦] بۆ بەدەستهێنانی بەشە سروشتیەكانیان بەستاندنی مادە تواوەكان و لەڕێگەی تكلیسەوە[٢٥٧] نەرمكردنی تەنی ڕەق بەهۆی هاون و صلایەوە[٢٥٨] و نمونەی ئەمانە. بەگومانی ئەمان بەهەموو ئەم جۆرە كردارانە تەنێكی سروشتە بەدەستدێت كەپێی دەڵێن ئكسیر ئەم تەنەش بكەنە سەر هەرتەنێكی كانزایی كەتێیدا ئامادەباشی وەرگرتنی شێوەی كانزای تێدا بدۆزنەوەو

[٢٥٥] بەشی ناسكی هەندێك لەدەرمانەكان بەئاگر و بەكڵۆ كردنیان هەروەك نوشادەر و كافور وایان لێ دەكرێت.

[٢٥٦] دڵۆپاندن بەشێوەیەكی قەترە قەترە.

[٢٥٧] گەرمادان لەتەنێكی بەستوو لەپەنا هوادا

[٢٥٨] مانای دەستاڕ دەگەیەنێت كەگەنمی تێدەكەن و دەیكەنەئارد.

ئامادەباشیەکی کرداری تێدابێت، وەك ئرزیز و ڕووی و مس لەپاش گەرمکردنی لەئاگردا دەبێتە کانزایەکی نایاب. وەهەرکات کیمیاگەران بیانەوێت بەشێوەیکی ڕەمز و مەتەڵ زاراوەکانیان باسبکەن ئەوا ڕۆح دەکەنە کینایەی (ئکسیر) و تەرم بەکینایەی (جەستە)ی قابیل واتە ئەو تەنەی کەئکسیرەکەی دەکەنە سەر دەهێننەوە، کەواتە توێکاری ئەم زاراوانە و شێوەی کرداری صەناعی کەئەم تەنە ئامادەباشانە دەکەنە کانزا، پێی دەڵێن زانستی کیمیا.

خەڵکیش لەسەردەمە کۆنەکانەوە تاوەکو ئێستەش لەم زانستەدا کتێبیان نوسیوەو سەرەڕای ئەوەش گوتارە پەیوەستەکانیان بەم زانستەوە داوەتە پاڵ کەسانێك کەئەهلی ئەو نەبوون و پێشەوای دانەران و نوسەران لەم هونەرەدا جابری کوڕی حەییانەو، تەنانەت ئەم زانستە تایبەت دەکەن بەوەوە و پێی دەڵێن زانستی جابر. ئەو لەم زانستەدا حەفتا ڕیسالەی نوسیوە کەهەموویان وەك مەتەڵ وەهان و دەڵێن کلیلی ئەم زانستە کەسێك ناتوانێت بەدەستی بهێنێت، مەگەر ئەوەی کە هەموو بابەتەکانی ئەو ڕیسالانە بزانێت. توغرائی[259] کەلەحەکیمە پاشینانەکانی مەشریقە لەمبارەیەوە دیوانگەلێك و مونازەرەی لەگەڵ ئەهلی زانستدا هەیەو، مەسلەمەی مەجریتی کەلە حەکیمەکانی ئەندەلوس بووە لەمبارەیەوە کتێبێکی بەناوی (رتبەالحکیم) نوسیوەو کردویەتیە هاوشانی کتێبەکەی تری خۆی کەلەبارەی زانستی ساحیری و تەلیسماتەوەیەو وایزانیوە ئەم دووصنعەتە دەرئەنجامی حیکمەتو بەرهەمی زانستەکانن و، هەرکەسێك نەیانزانێت ئەوا هەموو بەرهەم و حیکمەتی زانستەکانی لەدەست دەردەچێت قسەکانی مەسلەمە لەکتێبە ناوبراوو ووتارەکانی هەموو نوسەرانی ئەم زانستەدا وەك مەتەڵگەلێکن

---

[259] حسینی کوڕی علی مویدالدین ئەبو ئیسماعیلی ئەصفەهانی (٤٥٣ – ٥١٥) شاعیرو مامۆستای هەڵکەوتوو بەناوبانگ خاوەنی قەصیدەی اصاله الرأی صانتنی عن الخطاء    وحیلة الفضل زانتنی لدی العطل    ناسراوە بەلامیەت العجم کەسەرەڕای مامۆستایەتی لەئەدەب و خۆشنوسی ئینشادا لەصەناعەتی کیمیاشدا چەندین کتێبی هەیە وەك: جامع الاسرار، تراکیب الانوار، حقائق الاستشهاد، زات الفواید والرد علی ئیبن سینا فی ابتال الکیمیا (لغتنامەی دهخدا)

کە تێگەشتن لێیان بۆ ئەوکەسانەی کەشارەزای زاراوەکانیان نەبێت زۆر دژوارە و ئێمەش هۆکاری پەنابردنی ئەمان بۆ ئەم شێوازە مەتەڵ باسکردنەی زانستەکان باسدەکەین، ئیبن موغەیربی کەلەپێشەوایانی ئەم هونەرەیە ووشەگەلێکی شیعری هەیە کەبەپێی تەرتیبی ئەلفبایی کەلە بەدیعترینی نمونەی شیعرە مەتەڵیەکانە و هەموویان بەشێوەی چیستان و مەتەڵە و زۆربەکەمی دەتوانین ماناکانیان دەرك بکەین.

هەندێکیش دانراوگەلێك لەمبارەیەوە دەدەنە پاڵ غەزالی (ر ح)، بەڵام تێروانینەکەیان ڕاست نیە، چونکە بەڵگەباڵاکانی ئەم پیاوە بەو شێوەیە نەبووە کەشوێن هەنگاوەکانی کارو شێوازی کیمیاگەران نەکەوێت تائەو ئەندازەیەش کەخۆی شێوازی ئەوان پەیڕەو بکات و سەرقاڵی کیمیاگەری بێت. هەرچەندە هەندێك لەشێوە و گوفتارەکانی ئەم هونەرە دەدەنە پاڵ خالدی کوڕی یەزیدی کوڕی موعاویە کۆڵەبەستی مەروانی کوڕی حەکەم، بەڵام بەشێوەیەکی ئاشکرادیارە کەخالد لەنەژادی عەرەب هەژمارکراوە نزیکبووە لەسەردەمی دەشتەکیەتەوە وەها کەسێك کەبەهەموشێوەیەك هیچ بەهرەیەکی لەزانستو پیشەکان نەبووە، چۆن دەتوانێت لەزانستێکدا شارەزابێت کە زۆر ئاڵۆز و سەرسوڕهێنەرە و لەسەر ناسینی تەبایعی تەنە مورەکەب و تایبەتمەندیەکانیان وەستاوە باس و لێکۆڵینەوە بکاتو بەتایبەت کەکتێبی بیرمەندانی ئەم هونەرانە وەك تەبیعیات و تووب لەو سەردەمەدا هێشتا باوی نەبووەو هیچکەسێك تەرجەمەی نەکردوون، مەگەر ئەوەی کەبڵێین خالیدی کوڕی یەزیدێکی تر کەهاوناوبوون لەڕیزی ئەهلی ئەم هونەرەدا بووە.

من لێرەدا لەڕیسالەکەی ئەبوبەکری کوڕی بشرون[٢٦٠] کەلەم صنعەتەدا نوسیویەتی‌و ناردوویەتی بۆ ئیبن السمح باسدەکەم کەهەردووکیان لەقوتابیەکانی مەسلەمەی

---

[٢٦٠] حاجی خەلیفە لەکشف الزنوندا باسی کەسێکی سیسیلی دەکات بەناوی ئیبن بشرون و کۆمەڵەیەکی دەداتە پاڵ ئەگەر ئەم کەسە هەمان ئەو کەسەبێت کەئیبن خەلدوون باسی دەکات دەبێت ئەوەبڵێین کەلەکۆتایی سەدەی چوارەمی کۆچیدا ژیاوەو خوێندنی خۆی لەئەندەلوسدا تەواو کردووە. (حاشیەی دسلان) .

مەجریتی بوون و ئەگەر خوێنەر بەشیاوی بیری لێبکاتەوە بەپێی ئەو شێوازەی کەدانەری ناوبراو لەم هونەرەدا هەڵیبژاردووە لەقسەکانی ئەوەوە ڕێنمایی دەکرێت بۆلای ئەم هونەرە. ئیبن بشرون لەپاش باسکردنی دیباجەی ڕیسالەکەی کەلەمەبەستەکە بەدوورە دەڵێت: پێشەکیەکانی ئەم صەناعەت شەریفە پێشینان هێناویانە و هەموویان ئەهلی فەلسەفە گێڕاویانەتەوە وەك: ناسینی تەکوینی کانزاکان و سروشتی بەردەکان و گەوهەرە گرانبەهاکان تەبایعی سەرزەوی و شوێنەکان. ناوبانگیان ئێمە لەباسکردنیان بێنیاز دەکات.

بەڵام لێرەدا من ئەو مەسەلانەی کەپێویستن بۆ خوێنەر لەم صنعەتەدا باسدەکەم و سەرەتاش دەبێت بەناسینی ئەوانە دەستپێبکات شەرح و توێکاری دەکەم: ئەهلی ئەم هونەرە گوتوویانە: شیاوە کەقوتابیانی ئەم زانستە سەرەتا سێ سیفەت بزانن کە:

١ - ئایاکیمیا بوونی هەیە ؟ ٢ - چۆن بەدی دێت ؟ ٣ - لەچ شتێکەوە بەدەست دێت؟ وەهەرکات خوازیاری ئەم زانستە هەرسێ پرسیاری باسکرا و بناسێت و بەجوانی فێریان ببێت ئەوکات لەمەبەستی خۆیدا سەرکەوتوو دەبێتو دەگاتە کۆتاییەکەی. بەڵام لەبارەی گەڕان و بەڵگەهێنانەوە لەدروستبوونی کیمیادا هێندە بەسە کەخوێنەر بزانێت کەئێمە هەندێك ئکسیرمان بۆ ناردووە. بەڵام ئەوەی کە لەچ شتێکەوە پێکدێت. مەبەستی ئەهلی ئەم هونەرە لەم مەسەلەیەدا گەڕانە بەشوێن بەردێکدا کەبەهۆیەوە بەدەستهێنانی ئکسیری گەورە گونجاودەبێت و ئکسیر بالقوە لەهەمووشتێکدا بوونی هەیە، چونکە ئەو لەچوار تەبعدایە سەرەتا لەوانەوە پێکدێت و سەرەئەنجامیش دەگەڕێتەوە سەریانو بەلام لەهەندێك شتدا ئکسیر تەنها بەقوە بەدی دێت نەك بەکردار چونکە دەستەیەك لەو شتانەی کەشی دەبنەوە دەستەیەکیش کەشی نابنەوەو ئەو شتانە کەشی دەبنەوەدەتوانرێت بەکار بهێنرێن و شیکاریان بۆ بکرێت و ئکسیرەکەیان لەقۆناغی قوەوە دەچێتە قۆناغی کردار، بەڵام ئەو دەستەیەی کەشی نابنەوە بەکار ناهێنرێنو شیکاراین بۆ ناکرێت، چونکە ئکسیر تێیاندا تەنها بەقوە بوونی هەیە. هۆکاری ئەوەشی

کەشتە ناوبراوەکان شی نابنەوە ئەوەیە کە هەندێك لەتەبایع (مادەکان) یان ڕەق و سەختە و ئاوێتەی یەکتری بوون و هێزە زۆرێك لەمادەکانی مادە کەم هێزەکانیان بەهێز کردووە. کەواتە واباشترە کەسازگار ترین بەرد کەشی دەبێتەوە و دەتوانرێت ئکسیری کیمیای لێوە بەدەست بهێنرێت بناسی و پەی بەجنس و تایبەتمەندی و هێزییان بەری‌و ئاشنای ئامادەکاریەکانی توانەوە و بەستن و پاککردنەوە و پاڵفتەکردن و تکلیس (توانەوە) ووشککردنەوە و تەقلیب (گۆڕان لەشێوەیەکەوە بۆ شێوەیەکی تر) ببیت. چونکە هەرکەسێك ئەم بنەمایانە کەهەروەك پایەو کۆڵەکەی ئەم زانستەن نەناسێت ئەوا شارەزا نابێت تێیدا و هیچکات ناگاتە ئەنجامی باش.

وەباشترە کەبزانی ئایاگونجاوە شتێکی تریش بەیارمەتی ئەو (بەردی کیمیا) هەڵبژێریت یان دەبێت تەنها هەرئەو بەبەس بزانین ؟ وەیان ئایا ئەو بەردە لەسەرەتادا یەك مادە بووە یان مادەگەلێکی تر لەپێکهاتەکەیدا بەشدارن لەئەنجامی کردارەکانی کیمیاگەرانەوە بووەتە یەك مادە و دواتر پێیان گوتووە بەرد یان حجر. وەهەروەها باشتروایە کەچۆنیەتی کردارو چەندیەتی وەزنەکان (ئەو کێشانە و پێوانانەی کەدەبێت بەکار بهێنرێن) کاتەکانیان بزانی و ئاگادری ئەوەبی کەچۆن ڕۆح ئاوێتە بووە تێیدا و چۆن نەفس چووەتە ناویەوە. وەئایا لەپاش ئاوێتەبوون دەکرێت ئاگر لەیەکتریان جیابکاتەوە؟ وەئەگەر ناکرێت هۆکارەکەی چیە؟ چونکە زانینی ئەم شتە زۆرپێویستە، کەوتە دەبێت ئەم خاڵە بەباشی تێبگەین. وەدەبێت ئەوە بزانین کەهەمووفەیلەسوفەکان نەفسیان بەباش زانیوەو وایانزانیوە کەنەفسی مودەبیر(ڕێکخەر)و حامیل (هەڵگر)و مودافیع (بەرگریکار)ی جەستەن و کاران تێیدا، چونکە هەرکاتێك نەفس لەجەستەدا بچێتەدەرەوە، ئەوا جەستە دەمرێت و سارد دەبێت‌و توانای جوڵەی نابێت و ناتوانێت بەرگری لەخۆی بکات، چونکە ئیتر لەنیعمەتی ژیان و ڕۆشنایی بێ بەهرەیە. ئەوەی کەباسی جەستەو نەفسم کرد بەو هۆیەوەیە کەئەم صنعەتە وەك جەستەی مرۆڤ وایە کەپێکهاتەکەی وابەستەیە بەخۆراك و خواردن و خواردنەوەکانەوە هەیە، بەڵام بەژن و

باڵای و کەماڵی بەهۆی ئەو نەفسەزیندووە ڕووناکەوەیە کەبەهۆیەوە کارگەلێکی گەورە ئەنجام دەدات و بەیارمەتی ئەو هێزە زیندووەی کەلەودا هەیە شتانێکی دژو لەیەکچوو بەدی دەهێنێت و کەبوونەوەرێکی تر توانای ئەو کارەی نیە. مرۆڤ لەو ڕووەوە کاردانەوە نیشاندەدات کەتەرکیبی تەبایعەکانی لەگەڵ یەکتردا جیاوازیان هەیە ئەگەر تەبایعەکانی سازگارو گونجاوبن ئەوکات لەعەرەزو تەزادەکان پارێزراو دەبوو، ئەوکات نەفسی ئەو توانای ئەوەی نەدەبوو کەلەجەستە دەربچێت و بە بوونەوەرێکی نەمرو هەرهەری دەژمێردرا. پاك و بێگەردە خودای تعالی ڕێکخەری شتەکان. وەدەبێت ئەوەبزانین ئەو مادەو تەبایعانەی کەلێیانەوە ئەم ئکسیرە بەدی دێت لەسەرەتادا چۆنیەتی پاڵنەرێکە کە بەرز دەبێتەوە و پێویستی بەکۆتاییەکەو خاوەنی ئەم تایبەتمەندیە نیە، کەئەگەر بگوازرێتەوە بۆجەستەیەك بەوەی کەلەو تەرکیبەوە بەدەستی هێناوە ئیستیحالە ببێت هەروەك چۆن لەدێرەکانی پێشوودا لەبارەی مرۆڤەوە باسمانکرد، چونکە بەشەکانی مادەی ئەم گەوهەرە پێویستیان بەیەکتری هەیە و یەك مادە پێکدەهێنن کەلەڕووی هێز و کاریگەری بۆ سەر نەفس و لەڕووی تەرکیب و کەرەستەی هەستەوە لەجەستە دەچن. ئەمەلەکاتێکدا گەوهەری ناوبراوی سەرەتا مادەگەلێکی سادە و سەربەخۆ بوون. کردارو تایبەتمەنی مادەکان زۆر سەیەرە؟

سەیرکەن کەچۆن هێز دەبەخشێتە جنسێکی لاواز کەتوانای شیکردنەوە و تەرکیب و دابەشکردنی شتەکانی هەیە، هەربۆیە من بابەتی بەهێزو لاوازم بۆ مانای (نەفس و جەستە) بەکار هێناوە. وەهەروەها ڕوودانی تەرکیب و فەنا لەپێکهاتنی یەکەمین جەستە بەهۆی جیاوازیە بەڵام لەتەرکیب و پێکهاتەی دووەمدا ئەم شتە بەهۆی ڕوداوەوە لەناوچووە. هەندێك لەپێشینانی حەکیمەکان گوتوویانە: دابەشکردن و جیاکردنەوە لەم حجرەدا (ئکسیر) ژیان و مانەوە و تەرکیب و مەرگ و نابوودیە ئەم قسەیەش خاوەنی مانایەکی ووردە، چونکە مەبەستی ئەو حەکیمە لەژیان و مانەوە دەرهاتنیەتی لەنەبوونەوە بۆ بوون، چونکە کاتێك ئەو حجرە لەسەرهەمان پێکهاتەی یەکەمین بێت

کتوپڕ لەناودەچێت، بەڵام کاتێك ئاوێتەی تەرکیبی دووەم ببێت ئەوکات لەناوچوون نامێنێت، وەتەرکیبی دووەم تەنها لەپاش دابەشبوون و جیاییەوە بەدی دێت هەربۆیە دابەشبوون و جیایی لەتایبەتمەندیەکانی ئەم حجرەیە. هەربۆیە هەرکات گەوهەری تێکەڵ (محلول) واتە نەفسی حجر بەرجەستە بکەوێت بەهۆی شێوەوە لەودا گەشەدەکات، چونکە گواستنەوەی گەوهەری نابراو بۆ جەستە (محلول) وەك نەفسێك وایە کەخاوەنی شێوەیەك نەبێت هۆکارەکەشی ئەمەیە کە گەوهەری نابراو کێشی نیە و ئێمەش لەئایندەدا ئاماژە بەم خاڵە دەکەین. انشا اللەتعالی.

وەباش وایە کەخوازیاری ئەم زانستە بزانێت: تێکەڵبوونی نەرم لەگەڵ نەرمدا ئاسانترە لەتێکەڵبوونی ڕەقو خەست لەگەڵ خەستدا مەبەستی منیش لەم خاڵە هاوشێوەیی و سازگاری نێوان ڕۆح و جەستەکانە، چونکە شتەکان بەهۆی لێکچوویی شێوەیانەوە پەیوەست دەبن بەیەکترەوە منیش ئەم خاڵەم لەو ڕووەوە وەیاد هێنایەوە بۆ ئەوەی بزانی کە (حجری ئکسیر) لەمادە ڕۆحانیەکان ئاسانتر سازگار تر بەدەستدێن تاوەکو مادەو تەبایعە خەست و ڕەقە جەستییەکان. وەهەندێك جار بەئەقڵی مرۆڤدا ئەوەدێت کە بەردەکان لەبەرامبەر ئاگردا خۆڕاگرتر و بەتواناترن لەڕۆحەکان (وەك گۆگرد و جیوەو....هتد)، هەورەك چۆن دەبینی زێڕ و مس و ئاسن لەبەرامبەر ئاگردا بەتواناترن لەگۆگرد و جیوە و ڕۆحەکانی تر زیاتر خۆڕاگریان هەیە. من دەڵێم تەنەکان لەسەرەتادا ڕۆح بوون، بەڵام هەرکە گەرمی سروشتی بەدیهێنیان پێگەشتووە ئەوانی گۆڕیوە بۆ تەنگەلێکی خەستی توندی لیق لەم ڕووەوە بەهۆی خەستی و لیقی تەن ناوبراوەکانەوە ئاگر ناتوانێت لەناویان ببات، بەڵام هەرکات گەرمایەکی توندیان لێبدرێت تەنەناوبراوەکان دەگۆڕێن بەڕۆح، هەروەك چۆن لەسەرەتای بوونەوەرەوە بەم شێوەیە بوون وەهەرکات ئاگر بگاتە ڕۆحە نەرمەکان ڕادەکەن و ناتوانن لەناو ئاگرەکەدا خۆیان ڕابگرن. کەواتە واباشە کەبزانی چ شتێت تەنەکان دەگۆڕێت بەم حاڵەتە و ڕۆحەکان دەگۆڕێت بۆ ئەم چۆنیەتیە؟ چونکە ئەم خاڵە گرنگترین ئەصڵێکە کە دەبێت بیناسین. وەڵامی ئەم

پرسیارەش ئەمەیەکە ئەم ڕۆحانە ڕاپانکردووە و سوتون بەهۆی ئەوەی کەخاوەنی سوتانن و زۆر ئاسکن هەربۆیە زوو دەسوتێن لەبەرئەوە شێی زۆریان هەیە، چونکە کاتێك شێ بگاتە ئاگر لەگەڵیدا ئاوێتە دەبێت چونکە شێی هەوایی وەك ئاگر وایە و ئاگر خۆراکی لێوە وەردەگرێت تاوەکو دەگاتە ئەنجام. هەربەم شێوەیەن تەنەکان کەبەهۆی گەشتنی ئاگر پێیان دەردەچن بەهۆی کەمی لیقی و خەستیانەوە ئەم جۆرە تەنانە ناسوتێن کەلەزەوی و ئاو پێکهاتوون کەلەبەرامبەر ئاگرەوە خۆیان ڕادەگرن. کەوتە ئاسکەکەیان لەگەڵ بەشی چڕیاندا بەهۆی درێژبوونەوەی ئەوپێگەشتنە لەسەرخۆییانەوە کەشتەکان ئاوێتەدەکات بووەتە یەك. چونکە هەرتەنێك کەلێکهەڵوەشێت لەم ڕووەوە بەهۆی ئاگرەوە هەڵدەوەشێت کەبەشی ئاسکی لەبەشی چڕی جیادەبێتەوە بەشەکانی بەبێ تەحلیلو ئاوێتەبوون و سازگاری لەگەڵ یەکتریدا تەرکیب دەبن هەربۆیە پەیوەستبوون بەیەکەوەو چوونە ناویەکی ئەوان بەشێوەیەکی نزیکەلەیەکەوە نەوەك ئاوێتەی یەکتری بوبن. هەربۆیە دابەشبوون و جیاییان لەیەکتر ئاسان دەبێت وەك ڕۆن و ئاو و تەن هاوشێوەکانیان. ئەم بابەتەم بەو هۆیەوە شەرح کرد تاوەکو بەهۆیەوە ڕێنمایی بکرێیت بۆ تەرکیب و تەقابولی مادەکان.

وەهەرکات ئەم بابەتە بەشێوەیکی کامڵ و باش بزانی لەخەرمانی ئەم زانستە بەهرەی خۆت دەبەیت. وەباشتر وایە ئەوەش بزانی کەئەوتێکەڵیەی کەمادەکانی ئەم صنعەتە پێکی دەهێنن هەموویان لەگەڵ یەکتریدا سازگارن و لەیەك گەوهەرەوە جیابوونەتەوە یاسای یەك نەریت و ڕێوشوێنەکان و یەك چارەدۆزینەوە ئەوانی کۆکردووەتەوە هیچ بەشێکی بێگانە ناچێتە نابەش یان کۆی ئەوانەوە هەروەك چۆن فەیلەسوفێك گوتوویەتی: ئەگەر بەلێزانیەوە مادەکان بەکار بهێنیت و چۆنیەتی تەرکیب بوونیان بزانی و تەرکیبێکی بێگانەیان نەخەیتە ناوەوە و، دواتریش لەهەر ئەزموونێکدا کەبتەوێت بەباشیو بەهێزیەوە بەکاری بهێنی ئەوا دەتوانیت، چونکە تەبیعەت هاوئاهەنگ و یەکتایە هیچ شتێکی نامۆ ناچێتە ناویەوە هەربۆیە ئەگەر کەسێك نامۆیەکی بخاتە ناوەوە

بەدڵنیاییەوە لەسروشت لایداوە و ڕووی لەهەڵخلیسکان دەبێت. وەدەبێت ئەوەبزانین کەهەرکات لەم سروشتەدا تەنێك کەلێیەوە نزیکە ئەوەندە شیاوە کە حەل ببێت بەجۆرێك لەنەرمی و ناسکیدا وەك ئەو بن، دواتر سروشت لەو تەنەدا گەشەدەکات وەبەرەو هەرشوێنێك کەبڕوات ڕۆدەچێت. چونکە تانەوکاتەی کەتەنەکان چڕو ووشك بن گەشەناکەن و ئاوێتەی یەکتری نابن حەل بوونی تەنەکان بەبێ ڕۆحەکان ئەنجام نادرێت. کەواتە خودا ڕێنماییت بکات. ئەم جۆرە حەلبوونە لەجەستەی حەیواندا حەقیقەتێکە کە لەناوناچێت و نوقسانی تێناکەوێت ئەمەش تایبەتمەندیەکە کە مادەکان ئاوەژوو دەکاتەوە و دەیانپارێزێت و ڕەنگ و ڕووناکی گەلێکی سەرسوڕهێنەریان ئاشکرا دەکات. وەهەرتەنێك کەبەپێچەوانەی ئەمەوە حەل ببێت، ناتوانین بەحەل و تەواو کامڵ بزانرێت چونکە وەها حەلێك پێچەوانەی ژیانەو حەلیشی بەشتێکە کەلەگەڵیدا سازگار بێت و سوتانی ئاگری لێوە بکاتە دەرەوە تاوەکو چڕیەکەی نەهێڵێت و مادەکان لەحاڵەتەکانیان بگەڕێنەوە تاوەکو بگەنە قۆناغێك کەلەناسکی و چڕیدا بگۆڕێن کەتایبەتە بەوانەوە، کەواتە لەبەر ئەوەی جەستەکان دەگەنە ئەو پەڕی حەلبوون و ناسکی لەم کاتەدا بۆ ئەوان تواناو هێزێك بەدی دێت کەدەیپارێزێتو دەچێت بەناویداو ئاوەژووی دەکاتەوە دەچێتە ناویەوە.

وەهەرکارێك کەلەسەرەتاکەیدا وەها میصداقێك نەبینرێت خێرو بێرێکی تێدا نابێت. وەدەبێت ئەوەبزانین کەتەبایعی سارد شتەکان ووشك دەکاتەوە شێکەیان دەبەستێنێن، بەلاَم تەبایعی گەرم شێی شتەکان ئاشکرا دەکات وشکیەکەیان ئاڵۆزدەکات منیش ئەو گەرمی و ساردیەم بەتایبەت باسکرد، چونکە ئەوانە کاراو کاریگەری شێو ووشکی کارلێکراو دەبن. بەپێی کارلێکرا و ئینفیعالی هەریەکەلەو دوانە (شێ و ووشکی) لەبەرامبەر هێزی کارلێکەر (گەرمی و ساردی) تەنەکان حادیس و تەکوین دەبن هەرچەندە تایبەتمەندی کاریگەری گەرمی لەمبارەیوە لەسەرمادا زیاترە، چونکە سەرما شتەکان ناگوازێتەوە و نایانجوڵێنێت، بەلاَم گەرمی هۆکاری جوڵەیە وەهەرکات هۆکاری

بوون و هەستی کەهەمان گەرمایە لاواز ببێت ئەوکات هیچ شتێك بەهیچ شێوەیەك بەئەنجام ناگات. هەروەك چۆن ئەگەر بێت و گەرمی بەشێوەیەکی لەڕادەبەدەر بدات لەشتێك و لەشوێنێکدا بێت کەهیچ سەرمایەکی تێدا نەبێت ئەوا دەیسوتێنێت و لەناوی دەبات. بەهۆی ئەم هۆکارەوە لەم کارانەدا پێویستی بەسارد پەیدا بووە بۆ ئەوەی بەهۆیەوە هەردژێك لەبەرامبەر دژەکەی خۆیدا هێز وەربگرێتو گەرمای ئاگرەکەی لێوە دەربکات. فەیلەسوفەکان بەرلە هەرشتێك ئاگری سوتێنەریان بەترسناك ناوبردووە فەرمانیان داوە کەتەبایع (مادە) و نەفسەکان پێویستە پاك بکرێنەوە و ناپاکی شێکەیان دەربکرێت و ئافەت و پیسیەکانیان لابرێت.

بۆچوونی فەیلەسوفەکان پشتی بەم شتە بەستووە چونکە کارەکانی ئەوان سەرەتا بەئاگرەو هەربەویش کۆتایی دێت هەربۆیە گوتوویانە: خۆتان لەئاگرە سوتێنەرەکان دوور بخەنەوە) مەبەستی ئەوانیش لەم قسەیە نەرێ کردنی ئەو زیانانەیە کەلەئاگردا هەیە، کەدوو زەرەر لەجەستە دەدەن کەبەخێرایی دەبێتە هۆی لەناوچوونی. وەهەروەها هەرشتێك کەلەزاتی خۆیدا بەهۆی دژبوون و جیاوازی مادەکانیەوە لێکهەڵدەوەشێتەوە. هەروەك چۆن لەنێوان دوشتدا ڕوودەدات و هیچ شتێك بەدەست نایەت کەهێزی پێ ببەخشێتو یارمەتی بدات بێجگە لەوەی کە ئافەت زاڵدەبێت بەسەریدا و دەبێتە هۆی لەناوچوونی، وەدەبێت ئەوەش بزانین کەحەکیمەکان چەندین جار باسی گەڕانەوەی ڕۆحەکانیان بۆ جەستەکان کردووە بۆ ئەوەی جەستەکان بەهۆی ڕۆحەوە پایەدار تر بن و لەکاتی هاونشینی لەگەڵ ئەم ئاگرەدا واتە ئاگری توخمی بەهۆیەوە بەتواناتر بن. کەواتە ئەم خاڵە بزانە، ئێستەش دەستدەکەین بەباسی حجر(بەردێك) دەکەین کەلەوانەیە لەو ئکسیرەوە بەدەست بێت، قسەکانی ئێمەش بەپێی تیۆرگەلێکە کە فەیلەسوفەکان باسیانکردووە. وەلەبارەی حجری ناو براوەوە جیاوازی بیرو ڕایان هەبووە هەروەك چۆن گروپێك لەوان گومانی ئەوەیان بردووە کەحجری ناوبراو لەحەیواندایە. وەهەندێك وایانزانیوە ئەم حجرە لەگیادایە وەهەندێکیش پێیانوابووە کەلەتەنە ڕەقە

بێگیانەکاندایەو هەندێکیش گوتوویانە لەهەموو بوونەوەراندایە ئێمەش نیازی ئەوەمان نیە کەلەبارەی ئەم بانگەشانەوە بەدوادا چوون بکەین و لەگەڵ هەندێك لەخاوەن بۆچوونەکاندا مونازەرەبکەین، چونکە قسەی زیاد لەپێویست درێژە دەکێشێت — منیش لەباسەکانی پێشوودا ئەوەم گوت کەئکسیر لەهەرشتێکدا بالقوە هەیە، چونکە لەهەرشتێکدا مادە بوونی هەیە کەواتە ئکسیریشی تێدایە. کەواتە دەمانەوێت بزانین کەئکسیر هەم بالقوە و هەم بەکردار لەچ شتێکدا هەیە لێرەدا باسی قسەکەی حەرانی دەکەین کەدەڵێت: هەمووڕەنگەکان یەکێکە لەدووڕەنگەکان، یان ڕەنگی جەستەیە وەك زەعفەران لەدەریاچەیەکی سپیدا کەتێیدا نفوز دەکات بەڵام پاش ماوەیەك لەناو دەچێت‌و پێکهاتەکانی لەناو دەچن و نامێنن.

ڕەنگی دووەم گۆڕانی گەوهەرە لەگەوهەری زاتی خودەوە بەگەوهەری ڕەنگێکی ترە، وەك ئەوەی کە درەخت خاك دەکات بەنەفسی خۆی بگۆڕێك و گۆڕینی حەیوانی گیا بەنەفسی خۆی بەو جۆرەی کەخاك بەگیاو گیا بە حەیوان دەگۆڕێت، ئەم گۆڕانەش تەنها بەڕۆحی زیندوو تەبیعەتێکی کارا کەتەنەکان بەرهەمدەهێنێت دەگۆڕێت و ئاوەژووی دەکاتەوە دەبێت. وەهەرکات شتەکە بەم شێوەیە بێت کەواتە دەڵێن کەئکسیر یان لە حەیوان یان لە گیادا هەیە بەڵگەش ئەمەیە کەسروشتی دوو بوونەوەری ناوبراو لەسەر خۆراك پێدان ئافرێنراوە و مانەوە و کامڵبوونیان بەخۆراکە، بەڵام لەبارەی گیاوە دەبێت بڵێین کەئەو ناسکی و هێزەی کەلەحەیواندا هەیە لەودا دەستناکەوێت، هەربۆیە حەکیمەکان کەمتر لێکۆڵینەوەیان تێدا کردووە. بەڵام حەیوان کۆتایی هەرسێ ئیستیحالاتەکەیە. چونکە کانەکان دەگۆڕێن بۆ گیا و گیاش بۆ حەیوان ئیستیحالە دەبێت ئەمە لەکاتێکدا حەیوان ناگۆڕێت بەشتێکی نەرم و ناسکتر لەخۆی مەگەر ئەوەی کە خەست ببێتەوە. سەرەڕای ئەمەش لەجیهاندا شتێك بێجگە لەحەیوان بوونی نیە کەڕۆحی زیندووی پێوە پەیوەست دەبێت کەڕۆحی ناسکترین شتەکانی جیهانە، وەبێجگە لەئەو لێکچوونەی کەلەنێوان حەیوان و ئەو ڕۆحە ناسکەدا هەیە ڕۆح پەیوەست نەبووە

بەحەیوانەوە. بەلاّم ڕۆحێك كەلەگیادا هەیە كەم و چڕە و لەگەلّ ئەمانەشدا ڕۆحی نابراو لەگیادا بەهۆی خەستیەكەی و خەستی تەنی گیاوە ڕۆچووە شاردراوەتەوە و گیاش بەهۆی خەستیەكەی و خەستی ڕۆحیەوە ناتوانێت بجولێت. وەڕۆحی جولاّو بەچەندین پلە ناسكترە لەڕۆحی شاراوە. چونكە ڕۆحی جولاّو خاوەنی وەرگرتنی خۆراك و جولّە لەلایەكەوە بۆلایەكی تر و هەناسەدانە، لەكاتێكدا ڕۆحی شاراوە بێجگە لەوەرگرتنی خۆراك هیچ تایبەتمەندیەكی تری نیە. وەئەگەر لەگەلّ ڕۆحی زیندوودا قیاس بكرێت ڕۆشتنی ئەو وەك ڕۆشتنی زەویە بەنیسبەت ئاوەوە.

هەروەها جولّەی گیا بەنیسبەت حەیوانەوە بەم شێوەیە، كەواتە ئكسیر لەحەیواندا لەپێشتر و بالآتر و ئاسانترە. هەربۆیە باشتر وایە كەكەسی ژیر لەپاش ناسینی ئەم خالآنە بەتاقیكردنەوە شتێك بەدەست بهێنێت كەئاسان بێت و ئەوەشی كەترس هەیە دژوار بێت بیخەنەلاوە. (كۆتایی قسەكەی حەرانی).

وەدەبێت بزانین كەحەیوان لەلای حەكیمەكان دابەشبووە بەچەند بەشێكەوە كەبریتین لەامهات یان تەبایع و بوونەوەرانی نویّ، یان مەوالید و ئەمەش بەنابانگەو تێگەشتن لێی دژوار نیە، هەربۆیە حەكیمەكان توخم و مەوالیدەكانیانیان دابەشكردووە بە زیندوو مردوو هەر جولاّوێكیشیان بەبكەر و هەر نەجولاّوێكیشیان بە كارتیاكراو هەژمار كردووە، ئەم دابەشكردنەشیان لەهەموو شتەكاتەكان و شتە تواوەكان و مادە كانزاییەكانیان فراوانكردووەو، هەربۆیە هەرشتێك بخرێتە ناو ئاگرەوە و گڕ بگرێت پێیان گوتووە زیندوو هەرشتێكیش گڕی نەگرتبێت بەمردوویان داوەتە قەلّەم، وەلەگیاو حەیوانیش هەرشتێك كەدابەشببێت بەهەرچوار تەبایعەكەوە بەزیندوویان داناوە و وەهەر شتێكیش دابەش و شی نەبێتەوە بەمروویان زانیوە. دواتریش كیمیاگەرەكان گەڕان بەدوای هەموو بەشە زیندووەكاندا بەلاّم شتێكیان تێدا نەدۆزیەوە كەلەگەلّ ئەم صەناعەتەدا سازگار بێت، واتە لەوانەی كەبەشێوەیەكی هەستپێكراوو ئاشكرا دابەشبن بەچوار تەبایع و مادەكانەوە بەدەستیان نەهێنا سەرەئەنجام بێجگە لەو حجرەی كەلەحەیواندا هەیە شتێكی تریان

نەدۆزیەوەو، دواتر دەستیانکردە گەڕان بەشوێن ڕەگەزو جنسی ئەو حجرەدا تاوەکو ناسیان و بەدەستیان هێناو دەسیانکردە ڕێوشوێن و گەڕان بەدوای چارەسەرو دواتر ئەو شتەی کەدەیانویست لەوەوە دروستبوو، هەندێك جاریش هاوشێوەی ئەو حجرە لەکان و گیاکاندا گەشەدەکاتو دواتر کەمادە دەرمانیەکان کۆبکرێنەوەو ئاوێتە بکرێن و دواتر بەش بەش بکرێن، بەڵام لەبارەی گیاکانەوە دەبێت ئەوەبڵێین کەهەندێکیان دابەشدەبن بەم جۆرە دابەشکردنانە وەك اشنان (غاسول) گیای پاککەرەوە لەکانەکانیشدا جەستە و ڕۆح و نەفسگەلێك بوونیان هەیە، کەهەرکاتێك ئاوێتە بکرێن و هەوڵی ئامادەکاریان بدرێت شتێك بەدەست دێت کەخاوەنی کاریگەریەو ئێمەش ئامادەکاریمان بۆ هەموو ئەمانە کردووە و، بەئەزموون تێگەشتوین کەحەیوانەکەی لەپێشتر و بالآترە و تەدبیر و ڕێکسازیەکەی ئاسانتر دەبێت.

هەربۆیە زۆرباشە کەئەوەبزانیت حجری هەبوو لەحەیواندا چیە؟ و ڕێگەی بەدەستهێنانی کامەیە؟ ئێمە ئەوەمان سەلماند کەحەیوان لەپێشترینی مەوالیدەکانەو هەروەها هەرچیەك لەوەوە پێك بێت بەدڵنیاییەوە لەخودی ئەو ناسکترە وەك گیا کەلەخودی زەوی ناسکترە، هۆکارەکەشی ئەمەیە کەگیا لەگەوهەری ساف و تەنی ناسکی زەویەوە دروستدەبێت هەربۆیە ناسك و تەنکە. وەهەروەها ئەم حجرە حەیوانیە وەك گیا وایە لەخاکدا. بەکورتی لەحەیواندا بێجگە لەحجری ناوبراو شتێکی تر بوونی نیە کەدابەشبێت بەسەر هەرچوار تەبایع ومادەکاندا. کەواتە ئەم قسەیە وەرگرە چونکە هەروەك چۆن من بابەتەکەم دووبارەکردەوە کەمتر دەکرێت بەلای کەسێکەوە ڕوون نەبێت مەگەر نەزانێك کەلەنەزانیدا ڕۆچووبێت، یان کەسێك لەنیعمەتی ژیری بێ بەش بێت. من چیەتی ئەم حجرەم بۆتۆ باسکرد و تۆم والێکرد کەهەڵوەستە بکەیت لەسەر ڕەگەزەکەی، هەربۆیە ئێستاکەش تەدبیرەکەی ئاشکرادەکەین تاوەکو ئەو مەرجە وەسفداربوونە (اتصاف) مان کەلەئەستۆ گرتووە کامڵ ببێت — انشا اللەسبحانە.

## تەدبیر

بەبەرەکەتی خودای گەورە حجرە(بەرد) بەنرخەکە هەڵگرەو، بیخەرەناو قەرع و ئنبیقەوە و هەرچوار مادە و تەبایعەکەی، واتە ئاوو خاك و ئاگر و هەوا لەیەکتر جیابکەرەوە کەبریتین لە جەستە و ڕۆح و نەفس و ڕەنگ. وەلەبەر ئەوەی ئاومان لەخاكو هەوامان لەئاگر جیاکردەوە دواتر هەریەکەیان بەجیا هەڵگرە و بیانکەرە دەفری تایبەتیانەوەو، لەخوار دەفرەکەوە کەبریتیە لەبنی دەفرەکە بەئاگر بسوتێنی تاوەکو ئاگرەکە ڕەشیەکەی لادەبات و قایمی و خەستیەکەی کەم ببێتەوەو بەتەواویو بەهێزەوە سپی بکەرەوە، زیادەی ئەو شێیانەی کەتێیدا قەتیس ماون بیانکە بەهەڵم و تاوەکو ئەوکاتەی کەئاوێکی سپی بمێنێتەوە، ئاوێك کە نەلێڵ بێت و نە چڵك و نەدژبوونی تێدا بمێنێتەوە دواتر بەو مادەسەرەتاییانەی کەلەوەوەبەرزبوونەتەوە وورد ببەرەوە ئەوانیش لەڕەشی و دژبوون پاك بکەرەوە چەندین جار بیانشۆو تاوەکو پاك و ساف ببنەوە. ئەگەر ئەم کردارنە ئەنجام بدەیت خودا ڕێگە بۆ تۆ خۆشدەکات. دواتر ئەو تەرکیبەی کەخولگەی کارەکەی لەسەرە دەست پێبکە. ئەوەش ئەمەیە کە تەرکیب ڕوونادات مەگەر لەڕێگەی جوتکردنو تێکەڵکردنەوە بەتەواوی، بەڵام جووتکردن بریتیە لە تێکەڵکردنی خەست لەگەڵ شل بەجۆرێك هەموو بەشەکان بەباشی تێکەڵ بەیەکتری بن، وەك یەك مادەو تەەنیان لێبێت و هیچ کەموکورتیەکی تێدا نەبێت وەك تێکەڵبوونی ئاوی لێبێت، لەم کاتەدا خەست بۆ وەرگرتنی شل و نەرم هێز پەیدا دەکات و ڕۆحی ڕووبەڕوو بوونەوەی لەگەڵ ئاگر دا بەهێز دەبێت نەفس بۆ ڕۆچوون بەناو تەنەکاندا بەهێزدەبێتو ئەم تایبەتمەندیانە بەوهۆیەوە لەپاش تەرکیبەوە بەدی دێن کەجەستەی حەل بوو لەبەر

ئەوەی کەلەگەڵ ڕۆحدا جووت دەبێت ئاوێتەی هەمووبەشەکانی دەبێت و، بەشەکانیش بەهۆی لێکچوونیانەوە تێکەڵ بەیەکتری دەبن، لەئەنجامدا دەبنە یەك مادەو وەلەم ئاوێتەبوونەوە پێویست بەوەدەکات کەبۆ ڕۆح باشی خراپی و مانەوە کەبەهۆی ئاوێتەبوونەوە بێتەدی، هەروەها کاتێك کە نەفس لەگەڵ ڕۆح و جەستەدا ئاوێتە دەبێت نەفس و ئەودوانە(ڕۆح و جەستە) دەبنە یەك شت و هیچ جیاوازیەکیان تێدا نەبێت، وەك بەشێك لەگشتیەك کەمادەکانی بەساغی بمێننەوە و بەشەکانی بەسازگاری بمێننەوە. هەربۆیە هەرکات ئەم جۆرە پێکهاتەیە بدات لەتەنێکی حەلبوو بەئاگر بەردەوام گەرمای لێبدرێت و ئەو شێیەی کەتێیدایە بێتە سەرەوە و ئاشکرابێت ئەو شێیە لەتەنە حەلبووەکەدا دەتوێتەوە.

وەتایبەتمەندی شێی گرگرتن و ئاگرتێبەربوونیەتی، وەهەرکاتێك ئاگر بیەوێت بیسوتێنێت ئاوێنە بوونی ئاو بەشێ ڕێگری لێدەکات کەلەگەڵ نەفسدا یەکبگرێت، چونکە ئاگر لەگەڵ ڕۆندا یەکناگرێت تاوەکو خالص بێت. وەهەروەها لەتایبەتمەندیەکانی ئاو ئەمەیە کە لەئاگر تێپەڕدەکات، هەربۆیە هەرکاتێك بیانەوێت گەرمای ئاگری بەردەوام لێبدەن و بیانەوێت ببێتە هەڵم، ئەو تەنە ووشکەی کەلەگەڵیدا ئاوێتە بووە لەناخی خۆیدا زیندانی دەکات و ڕێگردەبێت لەدەرپەڕینی، کەواتە جەستەو تەن هۆکاری گلدانەوەی ئاوو، ئاویش هۆکاری مانەوەی ڕۆن و، ڕۆنیش هۆکاری جێگیر بوونی مادەی ڕەنگین و مادەی ڕەنگینیش هۆکاری دەرکەوتنی ڕەنگەو، ڕەنگیش هۆکاری دەرکەوتنی ڕۆن و ئاشکرابوونی چەوریە لەشتە ڕەشەکاندا، کەنەڕووناکی و نەژیانیان تێدایە بەم شێوەیە تەن و جەستەی ڕێك و ڕاست. بەم شێوەیە ئکسیر بەدەستدێت ئەمەش هەمان ئەو تەصفیەو پاڵفتەکردنەیە کەلەبارەیەوە پرسیارت کرد و حەکیمەکان ناویاننناوە هێلکە(بیضة). مەبەستی ئەوان بەهیچ شێوەیەك هێلکەی مریشك نیە. وەدەبێت ئەوەبزانین کەحەکیمەکان تەرتیبی ناوبراویان بەبێ ئەوەی کە مانایەکی تایبەتیان لێیەوە مەبەست بێت ناویان نەناوە بەم ووشەیە، بەڵکو تەشبیهیانکردووە و چواندوویانە، من

ڕۆژێکیان پرسیاری ئەم بابەتەم لەمەسلەمە کرد کەتەنها خۆم بووم لەلای و گوتم: ئەی حەکیمی بەڕێز پێم بڵێ بۆچی بە پێکهاتە و مورەکەبی حەیوانیان گوتووە (بیضة) ؟ ئایا ئەم ووشەیان تەنها بۆ مەبەست و مانای ناوبراو هەڵبژاردووە یان مانا تایبەتەکەی ناچاری کردوون کەهەڵیبژێرن؟ گوتی لەبەر مانا ئاڵۆزەکەی هەڵیانبژاردووە.

گوتم ئەی حەکیم چ سوود و بەڵگەیەکیان لەم صنعەتەدا وەرگرتووە کەتەشبیهیان کردووە و ناویانناوە بەیزە، گوتی: لەبەر لێکچوون و نزیکی ئەو لەپێکهاتەکەوە. بیری لێبکەرەوە ماناکەیت بۆ دەردەکەوێت. من بەردەوام بەبیر کردنەوەوە لەلای ئەو مامەوەو نەمتوانی بگەمە ماناکەی. ئەویش کاتێك منی بینی کەبیر دەکەمەوە بۆی دەرکەوت کەهەموویبرو هۆشم بەلای ئەم شتەوەیە دیسانەوە منی گرت و هەندێك ڕایوەشاندم و گوتی: ئەی ئەبوبەکر هۆکارەکەی نیسبەتێکە کە لەنێوان ئەم پێکهاتە حەیوانی و بەیزەدا هەیە لەچەندیەتی ڕەنگەکان لەکاتی ئاوێتەبوون و فەراهەم بوونی مادەو تەبایعەکاندا بوونی هەیە. کاتێك ئەم قسەیەی کرد تاریکی لەدڵمدا نەماو دڵمی ڕووناککردەوە ژیریم بۆ تێگەشتن لێی توانایی پەیدا کردو، دواتر هەستامەوە و سوپاسی خودام کرد و گەڕامەوە ماڵەوە. وەلەبارەی قسەکەی مەسلەمەوە بیرم لەشێوەیەکی هەندەسی و ئەندازیاری کردەوە کەڕاستیەتی قسەکەی ئەو بەبەڵگەوە دەسەلمێنێت ئێستەش لەم نامەیەدا ئەوەت بۆ باسدەکەم: نمونەی ئەوەش ئەمەیە کەهەرکات پێکهاتە بەئەنجام بگات و کامڵ ببێت، نیسبەت و ڕێژەی تەبیعەتی ئەو هەوایەی کەلەو و لەبەیزەکە(هێلکە) کەدا بوونی هەیە وەك ڕێژەی تەبیعەتی ئەو ئاگرەیە کەلەپێکهاتە و بەیزەکەدا هەیە.

وەهەروەها هەردوو تەبیعەتی تری ئاوو خاك لەودا یەك ڕێژەیە وەهەردوو شتێك کە لەم سیفەتەدا بەیەکەوە گونجاوین ئەوا لەیەك دەچن. بۆنمونە سەرڕووی هێلکەکە بەپیتەکانی (هـ ر — و — ح) دیاری دەکەین، کەمترین مادەی پێکهاتە کەسروشتێکی ووشکیان هەیە وەردەگرین و، ڕێژەی ئەو تەبیعەتی شێیە دەخەینە سەری و دەستدەکەین بە تەدبیر کردنیان بۆ ئەوەی تەبیعەتە ووشکەکە تەبیعەتە شێدارەکە بۆلای خۆی ڕابکێشێتو

هێزەکەی وەربگرێت. هەروەك بڵێی لەم قسەیەدا ناڕوونی و شاراوەیی و ڕەمز هەیە بەڵام بابەتەکە بۆ تۆ شاراوە نابێت. دواتر ئەو دوانە (ووشکی و شێ) دووهێندەی هەریەکە لەڕۆح و ئاوەکە زیاد دەکەین، لەئەنجامدا هەریەکەیان دەبنە شەش بەشی یەکسانەوە.

وەئەوکاتەی کەئەوان تەدبیر و کاریان تێدا دەکەین بۆ هەریەکەیان نمونەیەك لەتەبیعەتی هەوا زیاد دەکەین کەبریتیە لەنەفس کەسێ بەشە، لەپاش هەموو ئەمانە بەهێزێکی نۆ(٩) بەرابەرەوە ووشك دەبنەوە. وەلەژێر هەریەکە لەدووسەری ئەم پێکهاتەیەوە کەتەبیعەتەکەی دەورەی سەری پێکهاتەکەی داوە دووتەبیعەت دادەنێین بەجۆرێك کەهەردوو سەری یەکەمین کەدەورەی سەر ڕووی ئەویانداوە تەبیعەتی ئاوو تەبیعەتی هەوا دادەنێین و ئەو دوانەش بریتین لەدووسەری ا ح ج و سەر ڕووی ئەبجەد. وەهەروەها ئەو دووسەرەی کەدەورەی سەر ڕووی بەیزەکە(هێلکە) کەیانداوە و بریتین لە ئاوو هوا دەبنە هەردوو سەری هەر ڕۆحێك. کەواتە دەڵێین کەسەر ڕووی ئەبجەد وەك سەر ڕووی هەر ڕۆحێکی تەبیعەتی هەوایە کەپێی دەڵێن نەفس. وەهەروەها بە ح لەسەر ڕووی پێکهاتەکەوە. حەکیمەکان هیچکاتێك شتێکیان بەناوی شتێکی تر ناونانێن مەگەر ئەوەی کەوەك ئەو وابێت و لەو بچێت. لەبارەی ئەو ووشانەی کەشەرحەکەیانت لەمن پرسیبوو: زەوی پیرۆز لەمادەو تەبایعەکانی ئاڵۆزی سەرەوە و خوارەوەیە. مس کانزایەکە کەڕەشیەکەی کراوەتە دەرەوە و بەجۆرێك نەرمیانکردووەتەوە کەوەك تۆپەڵێکی لێهاتووە و دواتر بەزاج سووریانکردووەتەوە تاوەکو سەرئەنجام بووەتە ئەو مسەی کەئێستە هەیە. وەمغنیسیا حجری ئەمان (کیمیاگەران) نە کەڕۆحەکانی تێدا دەدۆزیتەوە ئەو تەبیعەتە بەرینەش کەڕۆحەکانی تێدا زیندانی دەکرێت دەیکەنە دەرەوە بۆ ئەوەی بخرێتە ناوئاگرەوە. وە فرفرە ڕەنگێکی زۆر سوورە کەتەبیعەت و سروشت دەیهێنێتە بوون. وە ئرزیر یش بەردێکە کە خاوەنی سێ هێزی جیاوازی ئاشکرایە، بەڵام هێزە ناوبراوەکان هاوشێوە و هاوڕەگەزن،

یەکەمینیشیان– هێزی ڕۆحانی ڕووناك سافە کە هێزی بکەر (فاعلە) یە.

دووەمینیش– هێزێکی نەفسانی جوڵاو هەستیارە بەڵام لەهێزی یەکەمین خەستترە، ناوەندەکەشی لەخوار ناوەندی یەکەمینەوەیە.

سێیەمیش – هێزێکی زەمینی (حاسە) هەستەوەر و وەرگرەو بەهۆی قورسیەکەیەوە پێچەوانەی ناوەندی زەویەو، ئەوەش هەردوو هێزی نەفسی و ڕۆحی دەپارێزێت و دەورەیاندەدات، بەڵام بابەتەکانی تر مەسەلە داهێنانکاری و دروستکراو بۆ گومانلێکردن‌و لادانی نەزانان و کەسێك کە پێشەکیەکان بزانێت لەمەسەلەکانی تر بێ نیاز دەبێت. ئەمانە هەموو ئەو بابەتانەن کەلەمنت پرسیبوو منیش وەڵام و تەفسیر و شەرحەکەیانم بۆ ناردی و هیوادارم بەیارمەتی خودای گەورە لەم هونەرەدا مەلەکەیەکی بەرز بەدەست بهێنی. والسلام.

کۆتایی قسەکەی ئیبن بشرون: کەئەو لەقوتابیەگەورەکانی مەسەلەمەی مەجریتی پێشەوای ئەندەلوسیەکان لەزانستەکانی کیمیا و سیمیا و ساحیری لەسەدەی سێیەم و پاش ئەو ڕۆژگارەش بووە وەتۆ ئەی خوێنەر دەبینی کەهەموو دەستەواژەکانی ئەم گرووپە لەم صنعەتەدا ئاوێتەیە لەگەڵ ئاماژەو مەتەڵدا بەئەندازەیەك کە تەقریبەن ناتوانرێت لێیان تێبگەین، ئەمەش خۆی بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە کیمیا صنعەتێکی تەبیعی نیە و ئەوەی کەلەکیمیادا دەبێت باوەڕمان پێی هەبێت بریتیەلەحەقیقەتێك کەواقیعیەتیش پشتگیری دەکات، ئەمەیە کەهونەری ناوبراو لەجۆری شوێنەوارەکانی نەفسی ڕۆحانی و دەستیوەردانی ئەو لەجیهانی تەبیعەتدا وەك کەرامەت وایە ئەگەر نەفسەکانی ئەوان چاکەخواز بن وەیان لەجۆری ساحیری بن کاتێك کەنەفسە خراپەکان خراپەکاریان هەیە. بەڵام بابەتی کەرامەت ڕوون و ئاشکرایە، بەڵام لەبارەی مەسەلەی ساحیریەوە دەبێت بڵێین کەجادووگەر هەروەك چۆن لەشوێنی خۆیدا سەلمێنراوە تەنە مادیەکان بەهێزی ئەفسونگەر دەگۆڕێت و بەناچاریەوە دەبێت لەگەڵ هەموو ئەمانەدا لەلای ئەم مادەیەك بوونی هەبێت کەکاریگەریە ئەفسونگەریەکەی لەسەر ئەو ڕوویدات، وەك دروستکردنی هەندێك لەگیانەوەران لەمادەی خاك یان درەخت و گیاو بەکورتی

لەغەیری مادەی تایبەتی ئەوە. هەروەك چۆن ساحیرەكانی فیرعەون لەبارەی ڕێسمان‌و عاساكانەوە ئەنجامیانداوە. هەروەك چۆن لەساحیرە ڕەش پێستەكانەوە هیندیەكان لەئەوپەڕی باشوردا دەگێڕنەوە كەئەمانە بەهێزی ساحیری بارانیان دەباراندا. وەلەبەر ئەوەی كەكیمیاگەری بریتی بووە لەدروستكردنی زێ لەشتێكی بەدەر لەمادەی تایبەتی ئەو بووە هەربۆیە دەبێت وەك ساحیری سەیری بكەین. وەئەوكەسانەشی كەلەمبارەیەوە باسیانكردووە لەحەكیمە ناودارەكانی وەك جابر و مەسلەمەو ئەوكەسانەشی كەبەرلەوان لەمبارەیەوە قسەیانكردووەو لەحەكیمەكانی نەتەوەكانی ڕابوردوو بوون شوێن هەمان مەبەست كەوتوون و درێژەیان پێداوە.

ئەوان لەترسی ئینكاری شەریعەتەكان لەكاتی باسكردنی سیحرو جادووەكاندا بەئامازەو مەتەڵ قسەكانیان كردووە نەوەك ئەم شاراوەییە بەو هۆیەوە بووبێت كەگومانیان لەم هونەرە هەبێت كەبەئامازە و مەتەڵ باسیان لێوە كردووە. ئەوەی كە مەسلەمە كتێبەكەی خۆی لەبارەی سیحرو تەلیسمەكانەوە بەناوی (رتبەالحكیم) و كتێبەكەی تریشی (غایەالحكیم) ناوناوە، خۆی ئامازەیە بەگشتگیری بابەتی كتێبی الغایە و تایبەتمەندی بابەتێكی ترە چونكە غایە لەرتبە لەپێشترە هەروەك بڵێی هۆكارەكە مەسەلەكانی كتێبی رتبە و هەندێكیش لەمەسەلەكانی كتێبی الغایەیە، یان لەبابەتەكاندا لەگەڵ كتێبی الغایەدا هاوبەش و بەشدارە. وەئەوەی كەدانەر لەهەردوو هونەرەكەدا قسەی كردووە بەڵگەیە لەسەر سەلماندنی قسەكەی ئێمە ئێمەش لەبەشەكانی داهاتوودا هەڵبوونی تێۆری كەسانێك كەپێیان وایە مەشاعیر و ئیدراكەكانی ئەم شتە بەهۆی صەناعەتی تەبیعیەوەیە باسدەكەین و خوداش دانای ئاگادارە.[٢٦١]

---

[٢٦١] (وَهُوَالحَكِيمُ العَلِيم) س الانعام ئا ١٨.

# بەشی بیست و پێنجەم

## لەبارەی بەتاڵکردنەوەی فەلسەفەو خراپەی ئەوکەسانەی کەمومارەسەی دەکەن

ئەم بەشەو بەشەکانی دواتری زۆر گرنگن، چونکە ئەم جۆرە زانستانە فەلسەفەو ئەستێرەناسی و کیمیا لەکۆمەڵگەدا بوونیان هەیەلەشارە گەورەکانیشدا گەشەدەکەن‌و، زیانێکی گەورە بەئاین دەگەیەنێت. هەربۆیە پێویستە بەئاشکرا لەبارەیانەوە قسە بکرێت‌و بیروباوەڕی ڕاست و دروست لەبارەیانەوە ئاشکرا بکرێت، چونکە گروپێك لەئاقڵەکانی مرۆڤ واگومانیان کردووە کەزاتەکان و ئەحواڵی هەموو جیهانی بوون ئیتر هەستی یان ماورای هەستی بێت، بەهۆی هۆکارو سەبەبەکانی ئەوانەوە و لەڕێگەی تیۆرە فیکری و قیاس و پێوانە ئەقڵیەکانەوە دەرك دەکرێن و ڕاستکردنەوەی عەقیدە ئیمانیەکانیش دەبێت لەڕووی نەزەر و ئەندێشەوە بێت نەوەك لەڕێگەی بیستن (ڕیوایەت‌و نەقڵەوە)، چونکە بیستن بەشێکە لەئیدراکە ئەقڵیەکان. بەم گروپەش دەڵێن فەلاسیفە کەتاك و موفرەدەکەی فەیلەسوفە لەزمانی یۆنانیدا بەمانای ئەو کەسەدێت کە حیکمەتی خۆشدەوێت حەزی لێیەتی. ئەوانە دەستیانکردە باسکردن لەبارەی ئەم زانستەوە و بۆ تەحقیق تێیدا ئامادە بوون ولەسەر پێکانی مەبەستەکەی کۆبوونەوەو یاسایەکیان دانا کەژیری لەنەزەر و ئەندێشەی خۆیدا بۆ جیاکردنەوەی حەق لەبەتاڵ ڕینمایی دەکات، ئەو یاسایەش ناوی مەنتیقە دەرئەنجامی ئەمەش ئەوەیە کە ئەو ئەندێشەو نەزەرەی کە کاری جیاکردنەوە و ناسینی حەقە لەبەتاڵ، ئەوەیە کە بۆ زەینی مرۆڤ دەبێت، لەمانا

مونتەزیعەکان لەبوونەوەراندا کەسێك کەسەرەتا لە بوونەوەرە نابراوەکانەوە شێوەگەلێك جیادەکاتەوە کەبەسەر هەممو تاکەکاندا تەتبیق و جێبەجێ دەبن هەروەك چۆن مۆر بەسەر هەموو نەخش و نیگارەکان کەلەسەر گڵ یان مۆم دەردەچێت جێبەجێ دەبێت. وەبەم جیاکراوو تەجرید بووە لەمەحسوسات دەڵێن مەعقولاتە یەکەمینەکان. ئەوکات ئەگەر ئەم مانا گشتیانە لەگەڵ ماناگەلێکی تردا هاوبەشبن و زەین لەیەکتریان جیابکاتەوە ئەو مانایانەی تر کەهاوبەشن لەگەڵ مانا پێشووەکاندا جیادەکاتەوە. وەدیسانەوە ئەگەر لەگەڵ ماناگەلێکی تریشدا هاوبەشیان هەبێت دووبارە و سێ بارە بەهەمان شێوە تەجرید دەکات، تاوەکو سەرئەنجام تەجرید بەمانا ئاسایی و گشتیەکانەوە کەبەسەر هەموو ماناو تاکەکاندا کۆتایی دێت، لەدوای ئەوەش ئیتر زەین ناتوانێت لێی جیاببێتەوەو تەجریدی لێبکاتو ئەوەشی بەم جۆرە تەجریدی کردووە جنس و ڕەگەزە باڵاکانن و هەموو ئەم تاك و موجەڕەدانەی کەلەغەیری هەستپێکراوو مەحسوساتن و، لەڕووی کۆبوونەوەی هەندێك لەوانەوە لەگەڵ یەکتریدا بۆ بەدەستهێنانی زانستەکان بەکاریان دەهێنن پێیان دەڵێن مەعقولاتە دووەمینەکان.

وەهەرکات ئەندێشە سەیری ئەم مەعقولاتە تاکانە بکات و بەشوێن تەصەووری بووندا وەك ئەوەی کەهەیە بگەڕێت، لەم کاتەدا زەین بەناچاریەوە دەبێت بەبەڵگەی ئەقڵی یەقینی هەندێکیان نیسبەت بدات بەوی تریانەوەو، دەستەیەکیان لەدەستەیەکی تر نەفی بکات بۆ ئەوەی تەصەووری بوون بەشێوەیەکی ڕاست و گونجاو لەگەڵ واقیعدا بەدەست بهێنرێت، وەهەروەك ڕابوورد ئەمە لەکاتێکدا کەبەهۆی یاسایەکی ڕاستەوە بێت. وەدەستەی زانیاریە تەصدیقیەکان کەبریتین لە نیسبەت دان و حوکمە لەلای ئەمان لەپێشترە لەدەستەی زانیاریە تەصەووریەکان لەڕووی کۆتاییەوە، تەصەووریش لەڕووی سەرەتاو فێربوونەوە لەتەصدیق لەپێشترە.

چونکە تەصەووری تەواو لەلای ئەمان بریتیە لەوپەڕی داواکاری ئیدراکە و تەصدیق هۆکارێکە بۆ ئەو وەئەوەی کەلەکتێبی مەنتیقیەکاندا دەیبیستین، کەتەصەوور لەپێشتر و

تەصدیقی لەسەر وەستاوە بەمانای شعورە نەوەك بەمانای زانستی تەواو. ئەمەش شێوازو تیۆری ئەرستۆی گەورە و پێشەوای فەیلەسوفانە. ئەوکات فەیلەسوفەکان واگومان دەبەن کەبەختەوەری لەئیدراکی هەموو بوونەوەراندا بەیارمەتی ئەم جۆرە بەحس و نەزەرو ئەم جۆرە بەڵگەوەیە ئیتر لەجیهانی هەستدابێت یان لەماورای هەستەوە. وەئەنجام و حاصڵی مەشاعیر و ئیدراکەکانیان لەبارەی بوونەوە بەشێوەیەکی گشتی و ئەوەشی کەبگەڕێتەوە سەر ئەم ئیدراکە، ئەوەش هەمان ئەو بابەتەیە کەمەسەلەکانی نەزەریە و تیۆرەکەی خۆیان لەسەر ئەو کردووە بەچەند بەشێکەوە ئەوەیە کەئەوان سەرەتا ئاگاداری تەنی خوارەوە (تەنە مادیەکان)، بەهۆی شاهیدو هەستەوە بوونەتەوەدواتر ئیدراکی ئەوان کەمێك پێشکەوت بەهۆی نەفسەوە لەلای جووڵەوهەستەوە پەی بەحەیوانات ببەن دواتریش هێزە نەفسیەکانیان هەستپێکردووەو، بەهۆیەوە فەرمانڕەوایی ئەقڵی خۆیان دەرککردو ئیدراکیان وەستا.

دواتریش باوەڕیان بەقیاس لەسەر زاتی مرۆڤ کەخاوەنی نەفس و ئەقڵە بۆ تەنی باڵای ئاسمانی و هەم نەفس و ئەقڵ هەیە وەبەبڕوای ئەمان پێویستە فەلەکیش وەك مرۆڤ خاوەنی نەفس و ئەقڵ بێت. لەپاشان ئەقڵیان لەڕووی ژمارەوە گەیاندە کۆتایی ژمارە یەکانەکان کەدەیە نەوەك ئەقڵی زاتەکانیان لەیەکتری جیایە، بەڵام هەموویان کۆن (جمع) ن[٢٦٢] وەیەکێکیان یەکەمین موفرەد و تاکەکەدەیەم[٢٦٣] (ئەقڵ یان فریشتە) بێت

---

[٢٦٢] بەپێی بیروباوەڕی پێشینان جیهان هەمووی یەك تۆپە، کەناوەندەکەی دەکاتە ناوەندی زەوی و فەفلاکەکانی تر وەك توێکڵی پیازن بەدەوری ناوکەکەدا.

[٢٦٣] دەئەقڵ لەلای حەکیمەکان هەموویان دە فریشتەن بەو جۆرەی کە یەکەمجار حەق تەعالی یەك فریشتەی ئافراندو، لەپاشانیش فریشتەیەکی ترو یەك ئاسمانی دروستکرد دواتریش فریشتەی دووەم و یەك فریشتە و یەك ئاسمان و، هەروەها دەفریشتە و نۆ ئاسمان پەیدا بوون و، فریشتەی دەیەم بەحوکمی خودای تعالی جیهانی پەیدا کرد. ئەقڵ لەلای حەکیمەکان کەلەسەرەتای دەستپێکردنیەوە پێی دەڵێن فریشتە. حەکیمەکان دەڵێن صادیری یەکەم لەباری تعالی وە ئەقڵە کەسێ ئیعتیباری هەیە لەبوونی خۆیدا، وەبوونی ئەو بەنیسبەت غەیری خۆیەوە و ئیمکانی بەزاتیەوەیە. هەربۆیە لەئەقڵی گشتی بەپێی هەریەکە لەسێ ئیعتیباری ناوبراو فەرمانێك دەردەچێت، هەروەك چۆن بەئیعتیباری بوونی ئەقڵی دووەم و بەئیعتیباری بوونی نیسبەت بەغەیری نەفسیەوە

وەوادەزانن بەختەوەری لەلەدەرککردنی بووندا بەم شێوەیە داوەریە. بەپاککردنەوەی نەفس و پابەند بوونی بەفەزائیلەوە هەرچەندە شەرعێکیش بۆ جیاکردنەوەی فەزیلەت لەڕەزیلەت بەدی نەیەت ئەم شتە، واتە (تەهزیبی نەفس) بەپێی زیری و حەزی مرۆڤ بۆ کردەوەچاکەکان و دوور کەوتنەوەی لەکردارە خراپەکان بەپێی سروشتی مرۆڤ بۆ ئەو گونجاوە، هەرکات ئەم ئیدراکە بۆ نەفس بێتەدی خۆشی شادیەکی بۆ دروستدەبێت کەنەزانینی ئەو فەزائیلانە بریتیە لەبەدبەختیەکی هەمیشەیی و مانای نیعمەت و عەزاب بەبڕوای ئەمان هەرئەمەیە.

وەیەکێکی تر لەو هەڵانەی کەئەمان لەمبارەیەوە هەیانە لەقەسەکانیاندا بەناوبانگەو پێشەوای ئەم شێواز و بیرو باوەڕانە کەمەسەلەکانیان بەدەستهاتوون و زانستەکانیان تەدوین کراون و بەڵگەکانیان نوسراونەتەوە، لەو سەردەمەدا هەروەك ئێمە ئاگادارین ئەرستۆی مەقدۆنی کەلەخەڵکی مەقدۆنیەی وولاتی ڕۆمە و لەقوتابیەکانی ئەفلاتۆن بووەو، هەروەها مامۆستای ئەسکەندەریش بووە و ناویانناوە مامۆستای یەکەم و مەبەستیشیان لەم نازناوە مامۆستای صەناعەت و هونەری مەنتیق بووە، چونکە بەر لەئەرستۆ هیچ کەسێك صەناعەتی ناوبراوی تەهزیب نەکردبوو ئەو یەکەمین کەسێك بوو کەیاساکانی مەنتیقی ڕێکخست و، مەسەلەکانی کامڵکردوو زۆر بەباشی ئەم زانستەی فراوانکرد و ئەم یاسایەی بەدڵی خۆی بەباشی ڕێکخست ئەگەر بێت و مەبەستی فەیلەسوفەکان لەئیلاهیاتدا زامن بکات. دواتریش و لەپاش ئەم لەئیسلامیشدا کەسانێك بیروباوەڕو تیۆرەکانی ئەو فێربوون و بۆچوونەکانی ئەویان هەنگاو بەهەنگا و بێجگە لەهەندێك شوێنی کەمدا نەبێت پەیڕەویانکرد، چونکە کاتێك لەسەردەمی عەباسیەکاندا

---

و بەئیعتیباری ئیمکانی تەنێك کەفەلك الافلاك بێت لەوەوە دەردەچێت. وەهەروەها لەئەقڵی دووەمو ئەقڵی سێیەم و نەفسی دووەمەوە فەلەکێکی دووەم دەردەچێت و، هەروەها تاوەکو ئەقڵی دەیەم کەلەپلەی نۆیەمدا بەنیسبەت ئەفلاکەوە واتە فەلەکی قەمەر و ئەم ئەقڵە بەئەقڵی کارا و لەزمانی ئەهلی شەرعدا بەجبریل (ع) ناوزەد کراوە.(اصتیلاحات الفنون) الکشاف. یان (غیاس)

کتێبی ئەو گروپە لەپێشینانیان لەزمانی لەزمانی یۆنانییەوە وەرگێڕایە سەر زمانی عەرەبی زۆرێك لەموسوڵمانان دەستیانکردە لێکۆڵینەوە تێیانداو مەزهەبو شێوازەکانیان کەسانێکی شوێنکەوتەی ئەم زانستانە کەخودا گومڕای کردبوون فێری بوون و، دەستیانکردە باس و موجادەلە تێیاندا و لەهەندێك مەسەلەیدا جیاوازی بۆچوونیان تێکەوت کەبەناوبانگترینیان بریتی بوون لەئەبو نصری فارابی لەسەدەی چوارەمدا لەسەردەمی سیف الدولەدا ئەبو علی سینا لەسەدەی پێنجەمدا، لەسەردەمی خاندانی بویە کەلەئەصفەهاندا فەرمانڕەواییان دەکرد و نمونەی ئەمانە.

وەدەبێت ئەوە بزانین کەئەو ڕێگەیەی کەئەوان هەڵیانبژاردبوو و ئەو بۆچوونەی کەباوەڕییان پێی هەبوو لەهەمووڵایەکەوە باتڵە. چونکە بریتی بوو لەوەی کەهەموو بوونەوەرانی دەدایە پاڵ ئەقڵی یەکەمین (اول)[٢٦٤] لەبەرزبوونەوە بۆ پلەومەقامی واجب[٢٦٥] بەبەسیانزانیبوو کەئەمەش موکورتیە کەلەگەڕان بەدوای پلەکانی خەلقی خودادا کەلەماورایەوە ئەقڵی یەکەمین بوونی هەیە. چونکە بازنە وجود و بوون لەمە فراوان ترە. خوداش شتانێك دروستدەکات کەئێوە نایانزانن[٢٦٦] هەروەك بڵێی ئەوان لەئیکتیفاکردن بۆ سەلماندنی ئەقڵی تەنها و ئەوەی کە لەماوەرای ئەوەوەیە وەك شتە سروشتی و تەبعیەکانن، کەبەتایبەت سەلماندنی تەنەکانیان بەبەس زانیوە لەنەفس و ئەقڵ دوور کەوتوونەتەوە و پێیانوایە کەلەماوەرای هەرتەنێکدا لەڕووی حیکمەتی بوون و وجودەوە(خودا) شتێك نیە، بەڵام ئەو بەڵگانەی کەواگوماندەکەن ڕاستن کەلەسەر بانگەشەکانی خۆیان لەبارەی بوونەوەرانەوە دەیانهێننەوە و بەپێی پێوەرەکانی مەنتیقو یاسا دەیانخەنە ڕوو، بۆ مەبەستە بەس نین. بەڵام بەڵگەی بەس نەبوون و نەشیاوی بەشێك لەم بورهان و بەڵگانە لەبارەی بوونەوەرە جەستەییەکانەوە کەپێیان

---

[٢٦٤] ئەقڵی یەکەم پێشیانگوتووە فریشتە و گەوهەری یەکەمین (اول). غیاس

[٢٦٥] مەبەست واجب الوجودە ئەوەش زاتێکە کەبوونی لەزاتی خودی ئەوبێت و پێویستی بەهیچ شتێکی تر نەبێت. (تعریفات جرجانی)

[٢٦٦] (وَيَخْلُقُ مَالاتَعلَمُون) س النحل ئا ١٦.

دەڵێن زانستی تەبعی و سروشتی ئەمەیەکە: گونجاوی نێوان ئەم دەرئەنجامە زەینیانە کەبەگومانی خۆیان بەسنور ی تەعریفات و قیاسەکان دەریاندەهێنن‌و، ئەوەی کەلەدەرەوە بوونی هەیە لەسەر یەقین دانەمەزراوە، چونکە سنوری قیاسەکان ئەحکامی زەینی و گشتی و گشتگیرن ئەمەلەکاتێکدا بوونەوەرانی دەرەکی بەمادەکانیاندا دەناسرێنەوە و لەوانەیە لەمادە ناوبراوەکاندا شتێك هەبێت کەلەگونجاوی زەینی کوللی لەگەڵ خاریجی جوزئی رێگری بکات، مەگەر لەو شوێنانەی کەهەست گەواهیدەرە لەسەری لەم کاتەشدا بەڵگەی ئەم هەمان گەواهی هەستە نەوەك ئەوبورهان و بەڵگانە. هەربۆیە ئەو یەقینەی کەلەو بەڵگانەی خۆیاندا دەیدۆزنەوە لەکوێن؟ هەرچەندە کەدەستێوەردانی زەین هەم لەمەعقولاتە یەکەمینەکان (اولی)[٢٦٧] کەموتابیقی جوزئیاتن بەهۆی صورەتە خەیاڵیەکانەوەیە نەوەك لەمەعقولاتە(ثانویة) سانەویەکاندا[٢٦٨] کەتەجریدیان لەقۆناغی دووەمدایەو، لەم کاتەشدا حوکم یەقینیە و وەك مەحسوسات وایە، چونکە مەعقولاتەکان سەرەتا لەگونجان و موتابەقەت لەگەڵ دەرەوە نزیکترن چونکە تێیاندا کەماڵی ئینتیباق و جێبەجێ بوون دەستدەکەوێت لەم کاتەشدا بانگەشەکانیان لەمبارەیەوە قبوڵدەکەین، بەڵام باشتر وایە کەلەبیرکردنەوە و گرنگیدان پێیان دوور بکەوینەوە چونکە دوورکەوتنەوە لەتێڕوانین لە زانستە تەبیعی و سروشتیەکان وەك ئەوە وایەکە: تاکی موسوڵمان ئەوشتانەی کەبۆ ئەو بەسود نین وازیان لێبهێنێت[٢٦٩] چونکە مەسەلەکانی تەبیعیات نەلەدین و نەلەدونیاو مەعاشماندا بەکارمان نایەن، هەربۆیە پێویستە وازیان لێبهێنین. وە ئەوەی کەلەبەڵگەکانی ئەمانەوە لەبارەی

---

[٢٦٧] ئەوانەن کە لەبەرامبەریانەوە بوونەوەرێك لەدەرەوە بوونی هەبێت وەك تەبیعەت و حەیوان و ئینسان کەدەتوانین حەملیان بکەینە سەر بوونەوەرێکی دەرەکی و بڵێین زەید ئینسانە و ئەسپ حەیوانە. (تعریفات جرجانی)

[٢٦٨] مەعقولاتی سانەوی ئەوانەن کە لەبە رامبەر یانەوەشتێك لەدەرەوە نەبێت وەك نەوع و جنس و فصل کەناتوانرێت حەمل بکرێنە سەر بوونەوەرێکی دەرەکی. (تعریفات جرجانی)

[٢٦٩] ئاماژەیە بەفەرموودەی (من حسن اسلام المو ترکه مالایعنیه).

بوونەوەرانێکەوەبێت کەلەماوەرای هەستەوەن واتە ڕۆحانیات کەپێیان دەڵێم زانستی ئیلاهی و مابعدالتبیعە، زاتی ئەو بوونەوەرانە بەگشتی نادیارە دەستیان پێ ناگات و ناتوانرێت بەڵگەیان بۆ بهێنرێتەوە، چونکە تەجریدی مەعقولات لەبوونەوەرە دەرەکیە جورئیەکان تەنها کاتێك بۆ ئێمە ئیمکانی هەیە کەبتوانین دەرکیان بکەین، ئەمە لەکاتێکدا ئێمە زاتە ڕۆحانیەکان دەرك ناکەین تاوەکو بتوانین ماهیەت و چیەتی گەلێکی تر لەوانەوە تەجرید و جیابکەینەوە چونکە لەنێوان ئێمە و ئەواندا پەردەی هەست کێشراوە کەواتە نەئێمە دەتوانین بەڵگەیەکیان بۆ بهێنینەوەو نەدەشتوانین بەشێوەیەکی گشتی لەسەلماندنی بوونیاندا شتێك دەرك بکەین مەگەر ئەوەی کەلەبەامبەری خۆمانەوە بیدۆزینەوە لەبارەی: ئەمرە نەفسانی و ئەحواڵی مەداریکەکانی و بەتایبەت لەجیهانی خەوندا کەبۆ هەرکەسێك شتێکی ویژدانیە[٢٧٠] بەڵام پەی بردن بەماوەرای ئەم واتە حەقیقەت و سیفەتە نەفسیەکانی مرۆڤ شتێکی ئاڵۆزە کەهیچ ڕێگەیەك نیە بۆ ئاگادار بوون لێی.

هەروەك چۆن لێکۆڵەرەوانی فەیلەسوفەکان لەشوێنێکدا هاتوونەتە سەر ئەو باوەڕەی کەهەر شتێك مادە نەبێت ناتوانرێت بەڵگەی بۆ بهێنرێتەوە، ئەمەیان بەڕاشکاوانە گوتووە، چونکە یەکێك لەمەرجەکانی موقەدیمات[٢٧١]ی بەڵگە ئەوەیەکە زاتی بن[٢٧٢]. ئەفلاتۆن کەلەگەورەکانی فەیلەسوفەکان دەژمێردرێت دەڵێت: ئیلاهیات نامانگەیەننە یەقین، بەڵکو لەم زانستەدا باشتر و ئەولاتر یان بەمانایەکی تر زەنن لەبەر چاو دەگرن. وەهەرکات لەپاش ماندووبوونێکی زۆر تەنها زەنن بەدەست بهێنین لەم کاتەدا ئەو

---

[٢٧٠] واتە بەهەستەکانی ناخی مرۆڤ دەرك دەکرێت

[٢٧١] بریتیە لەڕستەگەلێك کەڕاستیەتی بەڵگەیان لەسەر وەستاوە. (تعریفات جرجانی)

[٢٧٢] بۆ هەرشتێکە کەشتێکی پێوە تایبەتکرابێت و لەغەیری خۆی جیای بکاتەوە، وەدەڵێن زات شتێکی نەفسو عەینی شتێکی ترە کەخاڵی نیە لەعەرەز وەجیاوازی نێوان زات و شخص ئەمەیە کەزات لەشەخص گشتی ترە چونکە زات هەم بەجەستە و هەم بە شەخصیش دەگووترێت بەڵام شخص تەنها بەجەستەدەگووترێت. (تعریفات جرجانی)

زەننەی کەپێشتر هەمانبوو بەسە بۆمان. کەواتە ئەم زانستانە و سەرقاڵبوون پێیانەوە چ سودێکیان هەیە بۆمان لەکاتێکدا گرنگیدانی ئێمە بەوەیە کەلەبارەی بوونەوەرانی ماوەرای هەستەوە یەقین بەدەست بهێنین. ئەمەیە ئامانج و مەبەستی فیکرە مرۆییەکان بەلای فەیلەسوفەکانەوە.

بەلاّم ئەوەی کەدەڵێن: بەختەوەری لەوەدایە کەبوونی بوونەوەران هەربەو جۆرەی کەهەن (واتە گوناجاولەگەڵ واقیعیەتدا) بەیارمەتی ئەم بەڵگانە دەرک بکەین، قسەگەلێکی بێ ماناو ڕەتکراوەن بەم شەرحەی کەمرۆڤ پێکهاتووە لەدوو بەش یەکێکیان جەستەیی و ئەویتریان ڕۆحانی کەئاوێزانبووە پێیەوە، وەهەریەکە لەدوو بەشی باسکراو خاوەنی مەداریك و مەشاعیری تایبەت بەخۆیانن، بەلاّم ئیدراککەر لەودا یەکێکە کەهەمان ئەو بەشە ڕۆحانیەیە وەئەوەی کە هەندێك جار مەشاعیرە ڕۆحانیەکان و جارێکیش مەشاعیرە جەستەییەکان دەرك دەکات بەلاّم بەم جیاوازیەی کەمەداریکە ڕۆحانیەکان بەزاتی خۆی و بەبێ واسیتە دەرك دەکات، بەلاّم مەداریکە جەستەییەکان بەهۆی ئەندامەکانی جەستەوەیە وەك دەماخ و حەواسەکان. وەهەرئیدراککەرێك کەشتێك دەرك دەکات شادمانی ڕووی تێدەکات. ئەمەش لەحاڵەتی منداڵ لەسەرەتای مەداریکە جەستەییەکانیەوە لەبەرچاو بگرین کەچۆن بەهۆی بینینی ڕووناکی و بیستنی ئاوازە خۆشەکانەوە شادمان دەبێت. کەواتە گومانی تێدا نیە کەشادمانی و خۆشحاڵی کاتێك بەهۆی ئیدراکێکەوە دەست بدات و بۆ نەفس بەزاتی و بەبێ واسیتە بێتەدی ئەوا بەچەندین پلە توندتر و لەزەت بەخشتر دەبێت. هەربۆیە هەرکاتێك نەفسی ڕۆحانی بەهۆی ئیدراکێکی تایبەتەوە کەلەزاتی نەفسدا هەیە و بەبێ واسیتە شتێك هەست پێبکات شادە و دڵخۆشیەکی دەستدەکەوێت کەوەسف ناکرێت ئەم ئیدراکەش بەئەندێشەو زانست بەدی نایەت، بەڵکو بەهۆی کەشفکردنی پەردەی هەست و فەرامۆشکردنی هەموو مەشاعیرە جەستەییەکان دێتەدی و، صۆفیەکان لەزۆربەی کاتەکاندا بۆ بەدەستهێنانی شادمانی باسکراو گرنگی دەدەن بەبەدیهاتنی ئەم ئیدراکە بۆ

نەفس، هەربۆیە بەیارمەتی ڕیازەت و کوشتنی هێزە جەستەییەکان و مەشاعیرەکان و، تەنانەت هەوڵی لەناوبردنی ئەندێشەی سەرچاوەگرتوو لەدەماخ دەدەن و تاوەکو بۆ نەفس ئەو ئیدراکەی کەتایبەتە بەزاتی ئەوەوە لەکاتی نەمانی هەراو هۆریاکانی ژیان و بەربەستە جەستەییەکاندا بێتە دی و، دواتر بەجۆرێك شادمانی خۆشیان پێبگات کەوەسفناکرێت. وەئەوەی کە فەیلەسوفەکان بەتەقدیر گومانیانکردووە کەڕاستە و سەلمێنراوە، بەڵام دیسانەوە بۆ مەبەستەکەی ئەمان بەس نیە.

وە ئەوەی کەدەڵێن بەڵگە ئەقڵیەکان بەدیهێنەری ئەم جۆرە ئیدراکەیە و شادمانی لێوە بەدەستدێت هەروەك بینیمان قسەیەکی بەتاڵە، چونکە بەڵگە و دەلیلەکان لەڕیزی مەشاعیر و ئیدراکاتە جەستەییەکاندایە چونکە ئەوان بەهۆی هێزە دەماخیەکانەوە وەك خەیاڵ و ئەندێشە و حافیزە فەراهەم دێن ئەمەلەکاتیکدا ئێمە دەزانین بەیەکەمین هۆکارێك کە بۆ بەدەستهێنانی ئەم جۆرە ئیدراکانەوە بەکاریان دەهێنین کوشتنی هەموو ئەم هێزە دەماخیانەیە، چونکە هێزە ناوبراوەکان لەگەڵ ئەو ئیدراکەدا لەجەنگدان و دەبێتە هۆی نوقسانبوونی و دەبینین فەیلەسوفە لێهاتووەکانیان ڕوویانکردووەتە کتێبەکانی شیفا و ئیشارات و نەجات و تەلخیصلتی ئیبن ڕوشد و کتێبی فەصی ئەرشتۆو نمونەی ئەمانە، و لاپەڕەکانیان ئەمدیوو ئەو دیو دەکەن و پشت بەبەڵگەکانیان دەبەستن و لەکتێبە ناوبراوەکاندا بەشوێن ئەمجۆرە سەعادەت و بەختەوەریانەدا دەگەڕێن، لەکاتێکدا نازانن بەم شێوەیە ڕێگریەکانی کارەکە زیاد دەکەن. بەڵگەی ئەمان لەمکارەدا گوفتارێکەکە لەئەرستۆو فارابی و ئیبن سینا بەم شێوەیە دەگێڕنەوە: هەرکەسێك ئیدراکی ئەقڵی کارا بەدەست بهێنێت و لەژیانی دونیایدا پێی بگات، ئەوا بەهرەی خۆی لەم بەختەوەریە بەدەستدەهێنێت. وەئەقڵی کارا لەلای ئەمان بریتیە لە یەکەمین پلەیەکە کەهەست تێیدا لەنێو پلەکانی ڕۆحانیەتدا کەشف دەبێت پەیوەست بوون و پێڕاگەیشتن بەئەقڵی کارا دەدەنە پاڵ ئیدراکی زانستی ئێستەش ئەوەبوو ئێمە بەتاڵی و خراپی ئەم تیۆرەمان باسکرد. بەڵکو مەبەستی ئەرستۆو پەیڕەوەکانی لەم

پەیوەستبوون و ئیدراکە دەرککردنی نەفسێکە کە لەزاتی خۆی و بێ واسیتە هەیەتی. ئەوەش بێجگە لەرێگەی کەشفی پەردەی هەستەوە نەبێت بەدی نایەت. وەئەوەی کە دەڵێن: ئەوشادمانیەی کەلەم ئیدراکەوە سەرچاوە دەگرێت هەمان سەعادەت و بەختوەری وادەدراوە، بەهەمان شێوە باتڵە، چونکە بۆ ئێمە بەو پێیەی کەحەکیمەکان باسیانکردووە ئاشکرابووە کەنەفس لەماوەرای هەستدا خاوەن دەرککەرێکی ترە کەبەهۆی هەستەکانەوە دەرك دەکات و بەهۆی ئەم ئیدراکەشەوە شادمانیەکی زۆری پێدەگات، بەڵام ئەم شتە ئەوەبۆ ئێمە دیاری ناکات کەشادمانی ناوبراو بەدڵنیایەوە عەینی بەختەوەری ئەو دونیایە، بەڵکو ئەو حاڵەتە لەو لەزەتانەیە کەتایبەتە بەبەختەوەری ئەو دونیاوە.

بەڵام قسەکەی ئەوان لەبارەی ئەوە کەبەختەوەری وابەستەیە بەئیدراکی ئەم بوونەوەرانەوە هەروەك ئەوەی کەهەیە (واتەدەرکی واقیعیەتیان) قسەیەکی باتڵە بەو پێیەی کەلەبەشەکانی پێشوودا باسمانکرد (بەشی تەصەووف)و، گوتمان لەئەصڵی تەوحیدی ئەواندا هەڵە و وەهم هەیە لەبارەی ئەوەی کە بوون لەلای هەر ئیدراککەرێك تەنها لەمەداریکەکانی ئەودایەو، ئێمەش بەتاڵی ئەم بۆچوونەمان باسکرد ئەوەمان وەیاد هێنایەوە کەبوون فراوانتر لەوەیە کەبتوانرێت دەورە بدرێت یان هەمووی ئیتر رۆحانی یان جیسمانی بێت بەتەواوی دەرك بکرێت. وەلەهەموو ئەو بابەتانەی کەلەبارەی بیروباوەرەکانی ئەمانەوە باسمانکرد دەگەینە ئەم ئەنجامەی کە هەرکات بەشی رۆحانی لەجەستە جیاببێتەوە جۆرێك لەئیدراك بەدەستدەهێنێت کەزاتی خۆیەتی و تایبەتە بەجۆرێك لەمەداریکەکانەوە ئەوانیش بریتین لە بوونەوەرانێك کەزانست ئاشکرای کردوونو ئەم ئیدراکەش لەهەموو بوونەوەراندا گشتی نیە چونکە بوونەوەران بێشومارنو سنوریان نیە دواتر لەگەڵ ئەوبەشە رۆحانیەدا بەهۆی ئەم جۆرە ئیدراکەوە شادمانیەکی توند دروستدەبێت هەروەك چۆن منداڵان لەمەشاعیرە هەستیەکانی خۆیان لەسەرەتای پەروەردەکردنەوە شادمان دەبن. کەوتە چۆن ئێمە بەم وەسفەوە دەتوانین

هەموو بوونەوەران دەرك بكەین؟ یان بگەین بەو بەختەوەریەی كەشاریع وەعدەی پێداوین ئەگەر هەوڵی بۆ نەدەین؟ دوورە دوورە ئەوەی كە وەعدە دەدرێت[٢٧٣] وەقسەكەی ئەمان لەبارەی ئەوەی كە:(مرۆڤ لەتەهزیبی نەفس و ئیصلاحكردنیدا بەهۆی دەستگرتن بەخووە پەسەندەكان و دوور كەوتنەوە لەخووە ناپەسەندەكان سەربەخۆ دەبێت) لەسەر ئەمە دامەزراوە كەدەڵێن شادمانی نەفس بەهۆی ئیدراكی زاتی ئەو هەمان ئەو سەعادەت و بەختەوەریەیەكەوەعدەی دراوە، چونكە ئەو خراپانەی كەبەهۆی مەلەكەو ڕەنگە جەستەییەكانەوە بۆ نەفس دروستدەبێت لەبەرامبەر ئیدراكی زاتی نەفسدا بەشێوەیەكی تەواو دەبنە ڕێگر و ئێستەش ئەوەی كەئێمە باسمانكرد شوێنەوارەكانی سەعادەت و بەدبەختی لەماوەرای ئیدراكاتە جەستەیی ڕۆحانیەكاندایە.

سودی ئەم تەهزیبەش كەناسیویانە لەو شادمانی خۆشیەدایە كەبەهۆی ئیدراكی ڕۆحانیەوە بەدەستدێت، ئەو ئیدراكەی كەلەسەر پێوەر و یاساگەلێك دامەزراوە بەڵام ماوەرای سەعادەت و بەختەوەری كەشاریع وەعدەی بەئێمە داوە و فەرموویەتی وابەستەی كردون بەئەخلاق و كردارگەلێك كەفەرمانی بەئێمە كردووە جێبەجێیان بكەین، ئەمەش شتێكەكە مەشاعیری مرۆڤەكان ناتوانن دەورەی بدەن. پێشەوای ئەوان ئەبو عەلی سینا ئاگاداری ئەم حەقیقەتە بوونەتەوە لەكتێبی مبدأ و مەعاددا لەمبارەیەوە گتووگۆیانكردووە كەمانای قسەكەی بەم جۆرەیە:

(مەعادی ڕۆحانی ئەحواڵەكانی لەشتانێكن كەبەڵگە ئەقڵی قیاسەكان پێیاندەگەین چونكە ئەم شتە بەپێی ڕێژە و نیسبەتی تەبیعی و سروشتی پارێزراوە و تاكە ڕێگەیە، هەربۆیە بەڵگەكانی ئێمە لەم ڕووەوە زۆرن، بەڵام مەعادی جەستەیی ئەحواڵەكانی ناتوانرێت بەبەڵگە دەرك بكرێت، چونكە ئەم شتە بەپێی یەك ڕێژە نیە شەریعەتی لەڕێگە محمدەوە بەجوانی بۆ ئێمەی ڕوونكردووەتەوە. كەواتە دەبێت لەمبارەیەوە سەیری قسەكانی شاریع بكەین و لەبارەی ئەحواڵەكانیەوە بگەڕێینەوە بۆ شەرع). كەواتە ئەم

---

[٢٧٣] (هَیهَاتَ هَیهاتَ لِمَا تُوعَدُونَ) س المومنون ئا ٣٨.

زانستە هەروەك بینیت بۆ ئەو مەبەستانەی کەفەیلەسوفەکان لەسەریان کۆبوونەتەوە بەس نیە، سەرەڕای ئەوەی کە تێیدا مەسەلە گەلێك هەن کە دژی شەرایع و دیاردەکانیەتی هەروەك چۆن ئێمە لەوە تێگەشتوین کەزانستی فەلسەفە تەنها یەك سوودی هەیە، کەبریتیە لە ئامادەکاری زەین بۆتەرتیبکردنی دەلیلەکان بۆ بەدەستهێنانی مەلەکەی باش و ڕاست لەبەڵگەکاندا چونکە ڕێکخستنی قیاسەکان بەشێوەیەکی بەهێزو جوان کاتێك دەگونجێت، کەبەپێی هەلومەرجی حەکیمەکان لەصنعەتی مەنتیقدا (زانستە تەبیعیەکان) بێت ئەوانیش ئەم جۆرە قیاسانە لەزانستەکانی حیکمەتدا وەك تەبیعیات و تەعالیم (ریازیات) بیرکاری و زانستەکانی دوای ئەو دوانە زۆر بەکار دەهێنن.

لەئەنجامدا کەسێك کەلەم زانستانەدا تەحقیق دەکات بەهۆی زۆری بەکارهێنانی ئەو بەڵگانەی کە هەلومەرجی پێویستیان تێدایە لەبەحس و بەڵگەهێنانەوەکەیدا مەلەکەی ئامادەباشی و دڵسۆزی و چاکە بەدەستدەهێنێت و شارەزاییان تێدا پەیدا دەکات، چونکە قیاسە مەنتیقیەکان هەرچەندە بۆ مەبەستی فەیلەسوفەکان بەس نین بەڵام هەروەك بۆمان دەرکەوتووە لەهەمان کاتدا بەڕاسترین یاسای ئەندێشە و مەسەلەنەزەریەکان دەژمێردرێن. ئەمەیە بەرهەمی ئەم صەناعەتە، بەئاگادار بوون لەعەقیدە و بۆچوونەکانی ئەهلی زانست و زیانەکانیان لەسەر ئەوەی کەزانیت، هەربۆیە عەودالی حیکمەت دەبێت هەوڵی ئەوە بدات کەلە هەڵدێرەکانی دوور بکەوێتەوە و دەبێت سەرەتا بەشێوەیەکی گشتی و جامیع زانستە شەرعیەکان بخوێنێتەوە و ئاگاداری لەبارەی تەفسیر و فیقهەوە هەبێت و، دواتر بەرە و حیکمەت بڕوات و بەهیچ شێوەیەك نابێت کەسێك کە زانیاری لەبارەی زانستە ئیسلامیەکانەوە نەبێت ڕووبکاتە حیکمەت (فەلسەفە)، چونکە کەمتر دەکرێت وەها کەسێك لەمەهلەکە و لەناوچوونەکانی لەئەماندا

بێت. خوداش یارمەتیدەری مرۆڤە بەرەو ڕێگەی ڕاست و ڕێنماییش هەریەوە. ئێمەش هیدایەتمان وەرنەدەگرت ئەگەر خودا هیدایەتی نەداینایە[٢٧٤].

---

[٢٧٤] (وَماكُنَّا لِنَهتَدِيَ لَولا أن هَدانَا الله) س الاعراف ئا ٤١.

# بەشی بیست و شەشەم

## لەبارەی بەتاڵ کردنەوەی صەناعەتی نجوم و سستی مەدرەکەکانی و خراپی ئامانجەکەیەوە

نجوم صنعەتێکە کەبەگومانی خاوەنەکانی بوونەوەران لەجیهانی توخمەکان بەرلە دروستبوون و حدوسیان دەناسێت و، پێی وایە ئەم ئاگاداربوونەش لەرێگەی ناسینی ئەستێرەکان و کاریگەریانەوە لەئافرێنراوە توخمیەکاندا ئیتر تاك بن یان بەکۆمەڵ بەدەستدێت. هەربۆیە بارودۆخی ئەفلاك و ئەستێرەکان و هەرجۆرە لەجۆرەکانی بوونەوەرانی کوللی و جوزئی کەحادیس دەبن نیشاندەدات. پێشینانی ئەمان باوەڕیان وابووە کەناسینی هێزی ئەستێرەکان و کاریگەریان لەرێگەی ئەزموونکردنەوە بەدەستدێت، ئەمەلەکاتێکدا ئەمە شتێکە کە ئەگەر هەموو تەمەنەکان بخرێنە سەر یەك دیسانەوە بۆ بەدەستهێنانیان کەمە، چونکە بێگومان ئەزموون لەرێگەی چەندبارە بوونەوەی زۆرەوە بەدەستدێت تاوەکو سەرئەنجام لەو زانستەوە زەننێك بەدەستدێت، هەندێك لەدەوری ئەستێرەکان بەئەندازەیەك درێژە کەدووبارە بوونەوەیان پێویستی بەچەندین سەدەی دوور و درێژ هیە کەبەنیسبەت تەمەنەکانی جیهانەوە زۆر کورتن. هەرچەندە هەندێك لەنجومگەرە بیرکۆڵ و کورت بینەکان پێیان وابووە کەناسینی هێزی ئەستێرەکان و کاریگەریان بەهۆی وەحیەوە بووە. ئەمەش بۆچوونێکی لاواز و هەڵەیە و نجومگەرو ئەستێرەناسەکان هەرهێندەیان بەسەکە باسی بەتاڵی ئەو بۆچوونە بکەین،

کەباشترین بەڵگە ڕۆشنەکان لەمبارەیەوە ئەمەیە کە ئەوەبزانین کەپێغەمبەران (ع) لەهەموو کەسێك لەصنعەتەکانەوە دوورترن و هیچکات لەبارەی غەیبەوە قسەیان نەکردووە مەگەر ئەوەی کەخودا فێری کردبن و لەلایەن ئەوەوە بوبێت. کەواتە ئەی چۆن دەگونجێت بانگەشەی غەیب گوتن بن بەهۆی صنعەتەکانەوە، ئەم شتەش بۆ ئەو خەڵکەی کەپەیڕەوی ئەمانن بەشەرعی بزانن؟ بەڵام بتلیموس و ئەو پاشینانەی کەپەیڕەویان لەم کردووە لەسەر ئەو باوەڕەن کەدەلالەتی ئەستێرەکان لەم جۆرە شتانەدا دەلالەتگەلێکی تەبعین لەڕووی تەرکیب یان میزاجێکەوەیە کەبۆ ئەستێرەکان لەبوونەوەرە توخمیە(مادە) کاندا بەدی دێت.

بتلیموس دەڵێت: (چونکە کردار تایبەتمەندی و کاریگەری هەردوو ڕووناککەرەوەکە (مانگ و خۆر) لەمادە توخمیەکان (عناصر) دا (ئاوو ئاگرو خاك و هەوا) ئاشکرایە و هیچ کەسێك ناتوانێت ئینکاری بکات وەك کاری خۆر لەگۆڕینی وەرزەکان و میزاجەکانیان و پێگەشتنی میوەو کشتوکاڵەکان و نمونەی ئەمانە.

وەکاری مانگیش لەشێکان و ئاوو گەیاندنی ئەو مادانەی کەخراپ دەبن و میوەکانی وەك خەیار و کردارەکانی تری. دواتریش دەڵێت: وەبۆ ئێمە لەپاش خۆر و مانگ لەبارەی ئەستێرەکانی ترەوە دووڕێگە هەیە: یەکەمیان چاولیکەری لەکەسێك کە لەبارەیانەوە لەپێشەوایانی صەناعەت بابەتێکی نەقڵ کردبێت، بەڵام ئەم شێوەیە بۆ نەفس باوەڕپێهێنەر (مقنع) نیە. دووەم گومان و ئەزموون لەڕێگەی قیاسکردنی هەریەکەیانەوە بەڕووناکی گەورە (خۆر) کەتەبیعەت و کاریگەریەکەیمان بەشێوەیەکی ڕوون ناسیوە، کەواتە تێڕوانین دەکەین کەئایا ئەم ئەستێرەیە لەکاتی قیران (بورجەکان) لەڕووی هێز و میزاجی ئەوەوە زۆر دەبێت تاوەکو موافەقەت لەتەبیعەت یان کەمبوونەوەی لەو بناسرێت و پەی بەو دژبوونە بەری کە لەودا هەیە، دواتر ئەگەر هێزەتاکەکانی بناسین ئەوکات پەی بە هێزە پێکهاتە و مورەکەبەکانیشی دەبەین ئەمەش لەکاتی هاوشێوە بوونیدایە لەگەڵ شێوەکانی تەسلیسو تەربیع (سێیی و چواری) و نمونەی ئەمانەیە و ناسینی لەڕێگەی

تەبایعی بورجەکانەوە و بەقیاسکردنیان بەڕووناکی گەورە (خۆر) دەبێت وەهەرکاتێك هێزی هەموو ئەستێرەکان بناسین ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کەهێزە ناوبراوەکان کاریگەرن لەهەوادا، هەروەك چۆن ئەم شتە ئاشکرایە. وەئەو میزاجەی کەلەوەوە بۆ هەوا بەدی دێت بۆ بوونەوەرانی خوارەوەشی دێتەدی و نوتفە و توخمەکان بەهۆیەوە دەخولقێن و لەجەستەی بوونەوەرە دروستبووەکان لەوو نەفس پەیوەست دەبێت بەجەستەی ئێستەوە، نەفسێك کەبەرەکەت بەخشە بۆجەستە و کەماڵ بەدەست دەهێنێت، وەهەروەها ئەو میزاجە لەحاڵەتانێکدا کەشوێنکەوتەی نەفس و جەستەن کاریگەری دەبێت و چونکە چۆنیەتی توخم و نوتفە بوونەوەرانێکن کەلەوانەوە دروستدەبن و دێنەبوون.)

وەهەروەها دەڵێت: ئەو میزاجەش لەگەڵ هەموو ئەمانە دا زەننیە و بەهیچ شێوەیەك لەشتە یەقینیەکان و قەزای ئیلاهیش ناژمێردرێت بەڵکو لەهۆکارە تەبیعیە مەخلوقەکان دەژمێردرێت، وە قەزایان چارەنوسی ئیلاهی لەپێش هەموو شتێکەوەیە. بەم شێوەیە کورتەی قسەکانی بتلیموس و هاوڕێیانی. ئەم قسەانەش دەقی تیۆرەکانی ئەوە کەلەکتێبی چوار(اربع) کتێبەکانی تریدا باسیکردوون ئەم قسانەش سستی ئەم ئوصوڵ و بنەمایانە دەردەخات کە ئەم صنعەتەی لەسەر بنیات نراوە، چونکە زانست یان زەنن بەبوونەوەرێك لەزانست بەهەمووهۆکارەکانی وەك بکەر و قابیلی شێوە و ئامانج بەدەستدێت هەروەك چۆن لەبابەتی خۆیدا باسکراوە. ئەمەلەکاتێکدا هێزە نجومیەکان بەپێی ئەو مەسەلانەی کەباسیانکردووە تەنها بکەرن و بەشی توخمی وەرگرە و سەرەڕای ئەم هێزە ئەستێرەیی نجومیانە بەگشتی ئەو چوار هۆکارە کاریگەرنین، بەڵکو لێرەدا هێزگەلێکی تر بوونیان هەیە کەبەهۆیانەوە لەبەشێکی مادەدا کاریگەرە وەك هێزی بەرهەمهێنان و تەولیدی کەتایبەتە بەباوکەوەو، ئەو جۆرەی کەلەنوتفەدا بوونی هەیە و ئەو هێزە تایبەتانەی کەبەهۆیانەوە یەك بەیەکی بەشەکان دەناسرێن و لەیەکتری جیادەکرێنەوە و نمونەی ئەمانە. هەربۆیە ئەگەر هێزە نجومیەکان بەتەواوەتی بەدی

بێن‌و بەهۆیانەوە زانست ڕوویدات، ئەوکات هەمان بکەر(فاعل) یان ئەو یەك کاریگەرە وەك هۆکارە کاریگەرەکان لەبوونەوەردا دەژمێردرێت. دواتر دەبینین کەبەزانست بەهێز و کاریگەری ئەوان مەرج دەکەن کەدەبێت گومان و تەخمینی زۆر هەبێت بۆ ئەوەی لەوکاتەدا بەڕوودانی کائین و بوونەوەرێك زەنن بێتە دی. ئەمەلەکاتێکدا گومان و تەخمین هێزگەلێکن کەتایبەتن بە عەودالْ یان بینەری ئەم هێزە نجومیانەیە ئەم هێزانەش لەئەندێشەی ئەودا دەبن و بەهۆکاری کائین نازمێردرێن، هەربۆیە هەرکات کەسێك ئەم گومان و تەخمینەی نەبێت پلەی زەننی ئەو دێتەخوارەوە بۆ شك وگومان. ئەم هەمووەش لەکاتێکدایە کە زانست بەهۆی هێزە نجومیەکانەوە بەشێوەیکی بەهێز بێتەدی‌و هیچ ئافەتێك لەبەرامبەریەوە ڕوونەدات لەکاتێکدا ئەم شتەش زۆر دژوارە، چونکە بۆ بەدیهێنانی ئەو پێویستی بەناسین و مەعریفەی حیساباتی ئەستێرەکان لەڕۆشتن و جوڵەدا هەیە تاوەکو بەهۆیەوە بارودۆخی ئەستێرەکان بناسێت لەو ڕوەوەی کەبەڵگەیەك لەدەستدا نیە بۆ ئەوەی هەرئەستێرەیەك تایبەت بکرێت بەهێزێکەوە، بەڵگەی بتلیموسیش لەسەلماندنی هێزی پێنج ئەستێرەکەدا لەڕووی قیاسی ئەوانەوە بەخۆر تیۆرێکی لاوازە، چونکە هێزی خۆر زاڵە بەسەر هەموو ئەستێرەکاندا هەربۆیە کەمتر دەتوانین لەکاتی بەرابەریکردندا هەروەك چۆن ئەو دەڵێت پەی بەزۆری و کەمی هێزەکەی بەرین.

ئەمانەش هەموویان جێگەی ڕووشاندن و قەدحن (تانە لێدان) لەناسینی بوونەوەرانی جیهانی توخمەکاندا بەم صنعەتە ڕابووردووە، سەرەڕای ئەم کاریگەری ئەستێرانە لەبوونەوەرانی خوارترو پلەنزمتر لە خۆیاندا باتڵە، چونکە لەبابی تەوحیددا بەشێوەیەی بەڵگەهێنانەوە سەلمێنراوە کەبێجگە لەخودا هیچ کاریگەر و بکەرێك نیە هەروەك چۆن خوێنەر زانیویەتی و زانایانی عیلمی کەلام لەمبارەیەوە بەئەندازەیەك بەڵگەیان هێناوەتەوە کەپێویست ناکات باسیان بکەین، وەك ئەوەی کە چۆنیەتی نیسبەتدانی ئەسباب بەموسەبەباتەکانەوە نەزانراوە ئەقڵیش لەبارەی ئەو داوەریەی کەلەیەکەمین

تێڕوانیندا سەبارەت بەو کاریگەری دەبێت تۆمەتبارە بەهۆی ئەوەی کەلەوانەیە پشت بەستنی ئەوان بەشێوەیەك بێجگە لەشێوەی زانراو بێت و هێزی ئیلاهی پەیوەندیەکە لەنێوان ئەو دوانەدا، هەروەك چۆن هەموو بونەوەرانی سەرەوە و خوارەوە پەیوەست دەکات بەیەکەوە، بەتایبەت کەشەرع هەموو ڕووداوەکان دەگەڕێنێتەوە بۆ هێزی خودای گەورە و هێزەکانی تر بێجگە لەهێزی خودایی لەبەدیهێنانی بوونەوەراندا دوور دەخاتەوەو پێغەمبەرایەتیەکانیش ئینکاری چۆنیەتی نجوم و کاریگەریەکەیان دەکەن و، لێکۆڵینە و گەڕان بەناو شەرعیاتەکاندا گەواهیدەری ئەم ڕاستیەیە هەروەك پێغەمبەر دەفەرمێت: (خۆر و مانگ بۆ ژیان یان مردنی هیچ کەسێك ناگیرێن).

وەفەرموودەکەی خودای گەورە لەحەدیسی قودسیدا هاتووە: (هەندێك لەبەندەکانم باوەڕیان بەمن هەی و هەندێکیش کافرن و ئەوانەی کەبڵێن بەفەزڵ و ڕەحمەتی خودا بارانمان بۆ باری ئەوا باوەڕدارن و بێباوەڕن بەئەستێرە و نجومگەری بەلآم کەسانێك کەبڵێن بەهۆی نوء[٢٧٥]ی فلآنەوە بارانمان بۆ باری ئەوانە بێباوەڕن بەرامبەر بەمن و باوەڕیان بەئەستێرەکان هەیە). کەواتە باتڵبوونی ئەم صنعەتە لەڕێگەی شەرع و سستی بەڵگەکانی لەڕێگەی ئەقڵەوە ئاشکرادەبێت. سەرەڕای ئەوەی کەصەناعەتی ناوبراو لەکۆمەڵگە مرۆڤایەتیدا زیانگەلێکی زۆری هەیە، چونکە هەرکاتێك ئەحکامەکانی هەندێك جار بەڕێککەوت ڕاست دەربچن دەبێتە هۆی خراپبونی بیرو باوەڕی نەخوێندەوارەکان، ئەمە لەکاتێکدا لەم جۆرە شوێنانەدا ڕاستبوونەکەی بەشێوەیەکی ڕێککەوتە هیچ بەڵگەو دەلیلێکی نیە، بەلآم ئەوانەی کەهیچ زانیاریەکیان لەبارەیەوە نیە هەڵدەخەڵەتێنو وادەزانن کەئەم ڕاستیە هەموو ئەحکامەکان دەگرێتەوە گشتگیرە، بەلآم گومانەکەیان ڕاست نیە، کەواتە ئەم جۆرە کەسانە کەهیچ زانیاریەکیان لەبارەیەوە نیە و شتەکان دەگەڕێننەوە بۆ بکەرێك بێجگە لەخودا و زۆرجار لەزۆربەی ناوچە و وولآتەکاندا

---

[٢٧٥] ئەو ئەستێرەیە کەلاربووەتەوە بەلای ڕۆژئاوادا، یان ئەو تالیعەیە کەئەو جێگەیە کە مانگ لە بیست و هەشت مەنازیلەکەوە هەژمار دەکەن. وەعەرەب بە باران و هەوا و گەرما دەڵێن انواء. منتهی الارب.

ئەستێرەناسان پێشگۆیی دەکەن بۆ ڕووداوە ناخۆشەکانی وەك چەتەیی و ڕێگری و، ئەم کارەش خەڵك ناچار دەکات کەباوەڕیان پێی هەبێت وەك دەستدرێژی دووژمن و بانگەشەکارانی دەوڵەت کەدەستدەکەن بەخوێنڕشتن و کودەتا و ئێمەش هاوشێوەی ئەمانەمان زۆر بینیوە.

کەواتە واباشە ئەم صنعەتە لەهەموو خەڵکی کۆمەڵگەشارنشینیەکان و خەڵکانی تریش حەرام و قەدەغە بکرێت چونکە زیانێکی زۆر لەدین و دەوڵەتان دەدات لەمبارەیەوە تەبیعی بوونی بوونی ئەو بۆ مرۆڤ بەپێی زانست و ئاستی زانیاریان بەخراپ نازانرێت. بەڵێ خێرو شەڕیش هەردووکیان تەبیعی و سروشتین و لەم جیهانەدا بوونیان هەیەو ناتوانرێت ڕیشەکەن بکرێن، بەڵکو ئێمە موکەلەفین کەلەهۆکارەکانی بەدیهاتنیدا ووردەکاری بکەین.

هەربۆیە واجبە لەبەدەستهێنانی خێردا لەڕێگەی ئەسبابەکانیەوە هەوڵبدەین و هۆکارو ئەسبابە خراپەکان لەخۆمان دوور بخەینەوە. ئەم تەکلیفەش بۆ کەسێك کەخراپەو زیانەکانی ئەحکامی نجومگەری دەزانێت لەسەری واجبە کەخۆی بەدوور بگرێت. وەدەبێت ئەوە بزانین کەئەم زانستە بەگریمانە خۆی لەخۆیدا دروست بێت ناکرێت هیچکام لەئەهلی ئیسلام لەسەر زانستەکەی بووەستێت و مەلەکەکەی بەدەست بهێنێت، بەڵکو ئەگەر عەودالێ بیخاتە بەرباس و لێکۆڵینەوەوە و وابزانێت هەمووی دەزانێت، بێگومان کەئەو لەواقیع و نەفس الامردا لەو پەڕی کەموکورتیدایە، چونکە کاتێك کەشەریعەت لێکۆڵینەوە و تەحقیقی تێدا حەرامکرد لەئەهلی کۆمەڵگە کەسێك نیە بیخوێنێتەوە و یان خوازیاری فێربوون و فێرکردنی بێت و لەئەنجامدا عەودالأنی زۆر کەم دەبنەوە و بەپەنجەی دەست دەژمێردرێن و، وایان لێهاتبوو کەلە کونجی ماڵەکانیاندا و بەنهێنی ئەم جۆرە کتێبانە بخوێننەوە و لەبەرچاوی جەماوەر نەمێنن. سەرەڕای ئەوەی کە صنعەتی ناوبراو خاوەن لق و بەشگەلێکی زۆرە و تێگەشتن لێی زۆر دژوارە، ئەی کەواتە لەوەها هەلومەرجێکدا عەودالی ئەم زانستە لەخوێندنەوەکەی هیچ سودێك

وەردەگرێت لەکاتێکدا ئێمە دەبینین زانستی فیقە کەهەم بۆ دین و هەم بۆ دونیا سوودی هەیە و فێربوونی لەقورئان و سوننەتدا ئاسانەو، خەڵکی ڕوودەکەنە فێربوون و فێرکردنی لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا عەودالآنی لەپاش تەحقیق و کۆکردنەوەی مەسەلەکانی و بەردەوامبوون لەسەر فێربوونی و بەشداریکردن لەکۆڕو کۆبوونەوەکانی زانستی ناوبراودا، سەرئەنجام بەدرێژایی سەردەم و نەوەکان بەشێوەیەکی یەك لەدوای یەك شارەزایی تێدا پەیدا دەکەن، ئەی کەواتە بەچ شێوەیەك خوازیارو عەودالآنی ئەستێرەناسی و نجومگەری دەتوانن زانستێك فێربن کەشەریعەت خستویەتیەلاوە و لەبەردەمیدا بەرەبەستی حەرامیی داناوە و، داوایکردووە لەخەڵکی کەئەوەی دەیزانن لەبیری خۆیانی بەرنەوە و فێری کەسی نەکەن، هەربۆیە سەرچاوەکانی وەرگرتن و فێربوونی زۆر دژوارن و ناچارن لەپاش موممارەسەو خوێندنی ئوصول و فەرعەکانی بەئەندازەیەکی زۆر گومان و تەخمین کەلەهەرلایەکەوە دەورەی داون فێریان ببن.

وەپێشبینی کار لەوەها بارودۆخێکدا بەم هەموو کێشەیەوە بەچ شێوەیەك بەدەستی دەهێنن و شارەزا دەبن تێیدا؟ ئەمەلەکاتێکدایە کەبانگەشەکارەکەی لەلای خەڵکی ڕەتکراوەیە و هیچ بەڵگەیەکی نیە کەلەسەر کارو بانگەشەکانی بیهێنێتەوە، کەواتە نامۆیی ئەم هونەرە لەلای نەتەوەی ئیسلام و زانیارانی زۆر کەمە، بەلەبەرچاوگرتنی ئەم خالآنە ڕاستیەتی بۆچوونەکەی ئێمە بۆ خوێنەر ئاشکرا دەبێت. خوداش غەیب زانە و هیچ کەسێك لەبارەی غەیبەوە ئاگادار ناکاتەوە[٢٧٦] وەلەم مانایەدا بۆ هەندێك لەهاوەلآنمان هەرلەم سەردەمەدا هاتووەتە پێشەوە (قەصیدەیەك) لەکاتی زاڵبوونی عەرەب بەسەر سوپاکەی سوڵتان ئەبوالحسن دا کەلەقەیرەوان گەمارۆیاندابوو، هەواڵ و پێشگۆیی مەترسیدار لەنێو هەردوولادا دەکران و بلآودەبوونەوە، لەمبارەیەوە ئەو (ابوالقاسم) ی ڕەحوی کەلەشاعیرانی تونسە دەڵێت:

---

[٢٧٦] (عالِمِ الغَيبِ فَلا يُظهِرُ عَلى غَيبِهِ أحَدًا) س الجن ئا ٢٦.

بەردەوام داوای یارمەتی لەخودا دەکەین خۆشی و شادیەکانی ژیان لەناوچوون، من بەیانی و ئێوارە لەتونسدا دەبەمەسەر و بەیانی و ئێوارەش هی خودایە. فیتنە و پەتاو برسیەتی مردنی هێناوە. خەڵکی لەشەڕ و شۆڕدان و چۆن دەتوانین هیوادار بین کەشەڕ سودی هەبێت. هەوەسبازانی ئەحمەدی[٢٧٧] پێشبینی دەکەن کەعلی بەمزوانە دووچاری لەناوچوون دەبێتەوە. وەهەروەهایەکێکی تریش دەڵێت: لەئایندەیەکی نزیکدا بەهۆی علی یەوە شنەیەکی بەبەرەکەت و فراوانی ژیان بەرەو لای ئێوە دێت.

بەڵام لەهەردووکیان باشتر و لەپێشتر خودایە و هەرچیەکی بوێت لەنێو شوێنکەوتوانی (احمد و علی) دا حوکمی پێدەکات. ئەی چاودێری کارانی ئەستێرە گەڕۆکەکانی[٢٧٨] ئەم ئاسمانە چ هونەرێکی کردووە ؟ ئەو وەعدانەی کەبەئێمەتاندا دواتان خستن و وادەزانن هێشتاش بەتواناو بەهێزن ؟ پێنج شەممە بەسەر پێنج شەممەدا تێپەڕی و شەممە و چوارشەممەهاتن. و نیوەی مانگ و دەیەك و دووەم و سێیەمی ئەو تێپەڕی. بەڵام بێجگە لەدرۆ هیچی ترمان لەئێوە نەبینی ئایائەمە نەزانی ئێوەیە یان سوکایەتی کردنە بەئێمە، ئێمە پەنادەگرین بەخودا و دەزانین کەهیچ شتێك چارەنوسەکانی ئەو ڕەت ناکەنەوە، من دڵخۆشم بەخودا و من خودایەکم هەیە کەمن بێ نیاز دەکات لەئێوە و مانگ و خۆر و ئەم ئەستێرە بێزمانانە تەنها خزمەتکارێکی خودان و، لەژێر فەرمانی ئەودان و خۆیان هیچ فەرمان و دەسەڵاتێکیان نیە و لەژێر دەسەڵات و فەرمانی خودان هیچ کاریگەریەك ناکەنە سەر خەڵکی ژیریە گومڕابووەکانن.

(حەکیمەکان) کەلەکۆنەوە وایانزانیوە ئەوەی کە جیهانی بوون لەسروشتەوە سەرچاوەی گرتووە و ئاوو هەوا هێناویەتیە بوون. ئەوانە هیچ شیرینیەکیان لەبەرامبەر تاڵیەوە نەچەشتووە مەگەر ئەوەی کەبڵێین خاك و ئاو پەروەردەیانکردوون. پەروەردگاری

---

[٢٧٧] شازادەی حەفصیە کەعەرەبە دەشتەکیەکان پشتگیری ئەو بوون و ئەویان بەناوی ئەحمەدی کوڕی عوسمانەوە بانگیاندەکرد و ناوی سوڵتان ئەبوالحسن علی بووە. (حاشیەی دسلان).

[٢٧٨] ئاماژەیە بەئایەتەکانی ١٥ و ١٦ و ١٨ ی س التکویر.

من خودایە. وەنازانم جەوهەری فەرد کامەیە و خلا چیە. وەنە هیولی دەناسم کەدەڵێن نیە من نەبوون و نەبوون و نە سابیتی و فەنابوون دەناسم و دەیزانم. من لەبارەی کەسبی باش و خراپەوە شتێك نازانم بێجگە لەوەی کەهۆکارێکە بۆ کڕین و فرۆشتن و مەزهەبوو ئاینی من نەبووە کەخەڵکی وەك دۆست و هاوڕێ بوون، چونکە لەوسەردەمەدا نەفصوڵ و نەاصوڵ هەبوون و نەجیدال و نەبیرکردنەوەیەك بوونی نەبووە ئەوەشی کەلەسەرەتای ئیسلامدا پەیڕەویانکردووە ئێمەش پەیڕەوی لێدەکەین و چەند خۆشە ئەم پەیڕەوی کردنە. خەڵکی ئەو سەردەمە لەسەر شێوازێك بوون کەلەگەورەکانی دینەوە فێری دەبوون وەئەم هەمووە گەڕەلاوژێیە لەو سەردەمەدا نەبووە.

ئەی ئەشعەری ئەم سەردەمە هەواڵی بەمن داوە کەهاوین و زستان ئەزموونی فێری من کردووە من خراپە بەخراپە وەلأم دەدەمەوە چاکەش بەچاکە وەلأم دەدەمەوە. وەئەگەر من گوێڕایەڵی خودا بم ئەوا سەرفراز دەبم وەئگەر نافەرمانی بکەم دیسانیشەوە هەرئومێدەوارم. من لەژێر فەرمانی پەروەردگارێکدام کەعەرش و زەوی فەرمانبەریان کردووە. ئەوەی کەڕوودەداتبەهۆی دەرئەنجامی نوسینەکانی ئێوەوە نیە بەڵکو حوکم و چارەنوسی بڕیاردراوی خودا تەقدیریان دەکات، وەئەگەر بڵێن بەشیعرێك لەبارەی ئەو کەسانەی کەخۆیان دەدەنە پاڵ بۆچوونەکەی ئەو هەواڵی پێبدەن بەدڵنیاییەوە دەڵێت بڵێن کەمن لەقسەکانی ئێوە بێزارم.

# بەشی بیست و حەوت

## لەبارەی ئینکاریکردنی سوودی کیمیا( ئکسیر ) و مەحاڵ بوونی بوونی( وجود ) و ئەو خراپانەی کەبەهۆی ئەنجامدان و مومارەسەکردنیەوە بەدی دێن

دەبێت ئەوە بزانین کەزۆرێك لەخەڵکان کەناتوانن مەعاشیان بەدەست بهێنن هەوڵی بەدەستهێنانی لەمومارەسەکردنی ئەم صنعەتەدا دەدەن و، پێیانوایە کەئەم صنعەتەش یەکێکە لەرێگەکانی بەدەستهێنانی مەعاش و گوزەران و وادەزانن بەدەستهێنانی سەروەت و سامان بەم رێگەیە ئاسانترە. هەربۆیە لەم رێگەیەدا دەرد و رەنجێکی زۆر دەکێشن و تەحەمولی سەختیەکان دەکەن و جەورو ستەمی فەرمان رەوایان دەبینن و لەرێگەی ئەو دەرامەتانەی کەدەبنە هۆی گەشتنیان بەمەبەستیان پارەو سامانێکی زۆر لەدەستدەدەن و، لەئەنجامدا ئەگەر بێت و نائومێد بن ئەوا بەیەکجاری لەناودەچن و پێیانوایە تەنها چاکە دەکەن، ئەوەی کەئەمان لەمبارەیەوە دەخاتە تەماعەوە ئەمەیە کەدەبینن هەندێك لەکانزاکان بەهۆی مادەی هاوبەشی ئەوانەوە دەگۆرێن بۆ یەکتری، هەربۆیە هەوڵی ئەوە دەدەن لەرێگەی تەدبیر و صنعەتەوە سیم بکەن بەزێرو مس و مس‌و قەلعیش بکەن بەسیم و پێیانوایە کەئەمکارە لەمومکیناتی جیهانی تەبیعەتە. ئەوان لەکردارو رێگەچارە دۆزینەوە بۆ ئەم هونەرە رێگەگەلێکی جیاوازیان هەیە لەکردارو شێوەی ئەو وەهمەدا لەمادەیەك کەبۆ ئەنجامدانی کارەکە ناوی حجری مکرم لەدەستی ئەواندایە. هەروەك چۆن لەمادەی ناوبراودا عەقیدەگەلێکی جۆراو جۆر بوونیان هەیە و هەندێك بەکارت (خوێنی) دەزانن و هەندێکیش بە خوێن و دەستەیەك موو کۆمەڵێك

هێلکەی مریشکەکانی دەزانن و هەندێکیش سەسەرای ئەمانە بەشتانێکی تری دەزانن. وەهەموویان تەدبیر بەلایانەوە لەپاش دیاریکردنی مادە ئەمەیە کەلەسەر بەردی صلایە دەیهەسوون لەسەر ئەم بەردە صیقلیە لەکاتی هەسویندا ئاوی مادەکە دەدەن و، دواتر ئەندازێك دەرمان کەگونجاوە لەگەڵ مەبەستەکانیاندا و لەگۆڕینی بەکانزای ناوبراو کاریگەر دەبێت لەسەری بۆی زیاد دەکەن و، دواتریش لەپاش ئاودان یان شۆردن لەبەر خۆریان بەهۆی ئاگرەوە دەیکوڵێنن یان بۆ دەرهێنانی ئاو یان خاك بەتصعید یان تکلیس کاری تێدا دەکەن. وەئەوکات لەدۆزینەوەی ڕێگەچارەی ئەو ئەو هەموو کردارانە بەشێوەیەکی ڕەزامەند ئەنجام دەدرێن وەتەدبیرەکەی بەپێی پێویستیەکانی بنەماکانی ئەو صنعەتە کۆتایی دێت و لەهەموو ئەم ئامادەکاریانە خاك یان شلەیەك بەدەستدێت کەپێی دەڵێن ئکسیر.

وەپێیانوایە هەرکات بیخەنەسەر ئاسنێکی سورەو کراوە بیکەنە سەر ئاگر دەگۆڕێت بۆ زێڕ یان ئەگەر بیخەنە سەر مسی گەرمکراو بیکەنە ناوئاگرەوە بەپێی خواستی ئەوان دەگۆڕێت بۆ سیم. وەلێکۆڵەرەوانیان پێیانوایە ئەم ئکسیرە مادەیەکی پێکهاتووە لەهەرچوار توخمەکە کەلەئەنجامی ئەم گەڕانە بەدوای چارەسەرە تایبەتە و کاری ئەمان لەو میزاج و تەرکیبەدا کەخاوەنی هێزێکی تەبیعیە بەدیهاتووە، وەئەوەی کەلەودا ڕوویداوە بکرێتە ناوهەرمادەیەکی ترەوە شێوەی تایبەتی خۆی دەبەخشێت بەو شتە و وەك شێوەی تەرکیبەکەی خۆی لێ دەکات ئەو چۆنیەتی و هێزانەی کەلەودا هاتوونەتەدی لەودا جێگیر و بەپایەداری دەمێنێتەوە، وەك هەویر کەمایەیە بۆ نانو هەویرەکە دەگۆڕێت بۆ زاتی خۆی و تایبەتمەندی نەرم و ناسکی تێدا بەدی دەهێنێت بۆئەوەی هەرسکردنی لەگەدەدا ئاسان ببێت و بەخێرایی ببێتە خۆراك. ئکسیری زیوسیمیش بەم شێوەیە کەبکرێتە ناوهەرکانزایەکەوە ئەوا دەیانگۆڕێت و دەیانکات بەیەکێك لەو دووکانزایە (زێڕ و سیم). کورتەی بۆچوونی ئەمان بەم شێوەیە. وەهەروەك چۆن دەبینین ئەم گروپە لەم ڕووەوە و لەم کارەدا مومارەسەی بەردەوام دەکەن

کەڕۆژیو مەعاشی خۆیانی تێدا بدۆزنەوە یاساو ڕێساکانیان لەکتێبی پێشەوایانی ڕابوردوی ئەم صنعەتەوە نەقڵدەکەن و، لەنێو خۆیاندا کاری پێدەکەن و لەهەوڵی تێگەشتنن لەمانای ئالۆز و مەتەڵەکانیاندان و سەرقاڵی بەحس و ئەندێشەن تێیاندا و نهێنیەکانیان ئاشکرادەکەن، چونکە زۆربەی دانراوەکانیان وەك مەتەڵ وەهایە وەك کتێبەکانی جابری کوڕی حەییان لەحەفتا پەیامەکەیدا و نوسینەکانی مەسلەمەی مەجریتی و لەکتێبی رتبەالحکیم بەرهەمەکانی توغرایی قەصیدەکانی موغەیربی کەبەو پەڕی بەهێزیەوە چڕدراون و هۆنراونەتەوە.

وەنمونەی ئەمانەو لەپاش هەموونەمانەش هیچ سودێك لەصنعەتی ناوبراو نابێتە بەشی ئەمان و، هەروەك چۆن ڕۆژێکیان من لەگەڵ شێخی گەورەمان ئەبوالبرکاتی بلفیقی گەورەی مەشایخەکانی ئەندەلوس لەمبارەیەوە قسەمکرد و، کتێبێکی کیمیام پێداو ماوەیەك لێی وورد بوویەوە و لێکۆڵینەوەی کرد و دواتر بۆی گێرامەوە و گوتی: من گرنتی ئەوە دەدەم کەخوێنەری ئەم کتێبە بێجگە بەنائومێدیەوە ناگەڕێتەوە ماڵەکەی خۆی. دواتر دەبێت ئەوەش بزانین کە گروپێك لەم کیمیاگەرانە تەنها سەرقاڵی خەڵەتاندن و فێڵکردنن و پێیانوایە هێندە بەسە بەجۆرێك زۆرجار کانزایەکی خراپ بەزێڕ ڕووپۆش دەکەن و بەنرخێکی گران دەیفرۆشن، وەیان بەهۆی سپیکردنەوەی مس بەجیوە و جوان نیشاندانی و فریودانی خەڵکانی خۆش باوەڕ. دواتر وەك زیوی لێدێت و بێجگە لەصەرافە شارەزاکان نەبێت کەسیتر نایناسێتەوە، وەهەروەها لەمادەکانزاییە کەم نرخەکان دراو لێدەدەن و بەناوخەڵکیدا بڵاویاندەکەنەوە و بەتەزویر مۆری سوڵتانی لێدەدەن و، ئەمانەش لەکەم مایەترین و هەژارترینی خەڵکن چونکە بەفێلکردن ماڵ و سامانی خەڵکی دەبەن، چونکە ئەم فێڵبازانە لەبری زیو مس و لەبری زێڕیش زیو بەکار دەهێنن و بۆ ئەوەی قازانجی لێبکەن. کەواتە ئەمانە دز یان خراپترن لەدزەکان.

زۆربەی ئەم گروپانە لەسەرزەوی ئێمەدا واتە مەغریب لەقوتابیان بەرابەرن کەلەدووری سەر زەمینەقەرەباڵغەکان لەسنورەکان و لەنزیك شوێنی نیشتەجێی خەڵکانی کەم فام و

بێ ئەقڵەکاندا دەژین و پەنادەبەنە بەرمزگەوتەکانی دەشتاییەکان (بادیە) و خاوەن تواناکان هەڵیاندەخەڵەتێنن و، وا نیشاندەدەن کەلەزانستی کیمیاگەریدا شارەزاییان هەیە دەتوانن لەکانزاکان زێڕ و زیو دروستبکەن و، لەبەرئەوەی کە نەفسەکانی خەڵکی حەزلەم دووکانزا گرانبەهایە دەکەن و لەرێگەی بەدەستهێنانیاندا بڕێکی زۆر پارەو پول خەرج دەکەن هەربۆیە کیمیاگەرانی ناوبراو هۆکاری مەعاشی خۆیان لەلای ئەوان دەدۆزنەوە. دواتر لەلای ئەمان بەترس و لەرزەوە دەستدەکەن بەفێربوونی کیمیا تائەوکاتەی کە بێتواناییان دەردەکەوێت و ڕسوادەبن و دواتر دەچن بۆ شوێنێکی تر و، حاڵەتێکی تازە بەخۆیاندەدەن و دیسانەوە لەو شوێنە نوێیەشیاندا تەماعی کەسانێکی دونیا پەرست بەلای خۆیاندا ڕادەکێشن هەڵیان دەخەڵەتێنن و وایان لێدەکەن کەحەز لەم کارەبکەن. ئێمە قسەیەکمان لەگەڵ ئەم بەشەدا نیە چونکە لەوپەڕی نەفامیدان و دزیان کردووتە پیشەی خۆیان و تەنها ڕێگە ڕێگری لەم کەسانە ئەوەیە کەفەرمانڕەوایان دەستگیریان بکەن و وەك دزەکان دەستیان ببڕن، چونکە کردارەکانی ئەم گروپە دەبێتە مایەوی لەناوچوونی سککەیەك کەپێویستی هەموو خەڵکیە و بەسەروەت و سامانی هەموو خەڵکی دادەنرێت.

سوڵتان لەسەریەتی کە کاروباری ئەمانە باشبکات و بەو پەڕی توندیەوە هەڵسووکەوت لەگەڵ ئەوکەسانەدا بکات کەمادەو هۆکاری ئەم کارەن. بەڵام ڕووی قسەی ئێمە لەوکەسانەیە کەئەم صنعەتەیان کردووەتە پیشە و هیچ فێڵ و هەڵخەڵەتاندنێکی تێدا ناکەن، خۆیان لەلەناوبردنی سککەو پارەی موسوڵمانان بەدوور دەگرن، بەڵکو بەدوای ئەوەدا دەگەڕێن کەبەم کردارانە لەڕێگەی بەدەستهێنانی ئکسیرەوە کەهی ئەوانە سیم دەکەن بەزێڕو مس و قلع دەکات بەسیم. بەڵام لەگەڵ ئەم گروپەدا لەبارەی ئامێرەکانیانەوە باس و گفتوگۆمان هەیە لەگەڵ ئەوەی کەدەشزانین کەهیچکام لەخەڵکی ئەم دونیایە نەگەشتوون بەم ئامانجە و مەبەستی خۆیان لەودا بەدەست نەهێناوە، بەڵکو تەمەنی خۆیان لەتەدبیر و هەڵسوین و صلایەکردن و تصعیدو تکلیس و هەڵبژاردنی

مەترسیەکان بۆ کۆکردنەوەی دەرمانەکان و گەڕان بەدویاندا بەرباد دەکەن و، لەمبارەیەشەوە حەکایەتگەلێك لەو کەسانەوە دەگێڕنەوە کەلەم بوارە سەرکەوتنیان بەدەستهێناوە و قەناعەت بەم جۆرە حەکایەتانە دەکەن و، هیچ شك و گومانێکیان لێناکەن هەروەك ئەو کەسانەن کەعەودالّ و دلّدۆڕاوی هەولّگەلێکی وەسوەسەدارن لەبارەی ئەوەی کەلەئەستۆیاندایە. وەهەرکات پرسیاریان لێبکرێت کەئایا بەچاوی خۆتان بینیوتانە ؟ وەلاّمی نەرێنی دەدەنەوە و دەلّێن بیستوومانە بەلاّم نەمانبینیوە. بارودۆخی ئەم گروپە لەهەرسەردەمێکدا بەم شێوەیە بووە، وەدەبێت بزانین کەبەپیشەکردنی ئەم صنعەتە لەجیهاندا شتێکی تازە نیە و هەرلەسەردەمەکۆنەکانەوە بوونی هەبووە زاناکان لەپێشینانەوە بیگرە تاوەکو دواینان لەمبارەیەوە قسەیانکردووە. هەربۆیە ئێمەش لێرەدا بیروباوەڕەکانیان باسدەکەین وەدواتریش و دوابەدوای ئەمەش ئەو تەحقیقاتەی کەبۆ ئێمە لەبارەی واقیعیەت و چیەتیی شتەکە ئاشکرا دەبێت و، وەیاد دەهێنینەوە و خوداش یارمەتیدەری مرۆڤە بۆ ڕێگەی ڕاست.

کەواتە دەلّێین کەبنەماو بنەڕەتی قسە لەم صەناعەتە دا لەلای حەکیمەکان و لەبارەی چۆنیەتی هەرحەوت کانزاکەوە یان حەوت جۆشەکە کەبریتین لە زێڕو زیوو سرب قلع و ئرزیر و مس و ئاسن و ڕووی، کەئایا ئەمانە لەڕووی فەصلّەوە واتە فەصلّی بەرامبەر جنس لەگەلّ یەکتریدا جیاوازن و هەریەکە لەوان جۆرێکی سەرەبەخۆیە و کەبەزاتی خۆی قائیمە و، یان ئەوەی کە جیاوازی کانزا ناوبراوەکان لەتایبەتمەندیەکە لەچۆنیەتی ئەواندا و هەموویان بەشگەلێکن لەیەك جۆر وەجیاوازیەکەشیان لە چۆنیەتی گەلێکی وەك شێ و ووشتی و نەرمی و ڕەقی و لەڕەنگیشدا وەك زەردی و سپیەتی و ڕەشی. وەهەموویان بەشگەلێکن بۆ ئەم یەك جۆرە، بەلاّم بۆچوونی ئیبن سینا کەحەکیمەکانی مەشریقیش پەیڕەوی لێدەکەن ئەوەیە کەکانزا ناوبراوەکان لەڕووی فصلەوە لەیەکتری جیاوازن هەریەکەیان قائم بەزاتی خۆیەتی و، بەحەقیقەتی خۆی دێتەدی و فەصلّ و جنسێکی تایبەتی هەیە وەك جۆرەکانی تر. ئەبو نەصری فارابی بەپێی بیروباوەڕی خۆی

لەگەڵ ئەوەی کە کانزا ناوبراوەکان لەڕووی جۆرەوە وەك یەکن باوەڕی بە ڕوودانی گۆڕانی هەندێکیان بەهەندێکی تریان هەبووە، چونکە لەم کاتەدا گۆڕانی عەرەزەکان بەیەکتر چارەسەرکردن و تەدبیریان لەڕێگەی صنعەتەوە گونجاودەبێت. هەربۆیە صنعەتی کیمیا لەلای ئەو گونجاوە و خاوەنی سەرچاوەیەکی ئاسانە، بەڵام ئەبوعلی سینا بەپێی بیرباوەڕ ئینکاری جۆری صنعەتی ئەمانەی دەکرد و بوونی کیمیای بەمەحاڵ زانیوە و تێڕوانینەکانی لەسەر ئەوە دامەزراوە کە بەهۆی صنعەتەوە ناتوانرێت بگەینە فەصل، بەڵکو فەصڵی هەرجۆرێك ئافرێنەر و تەقدیر کەری شتەکان دروستی دەکات کەخودای گەورەیە حەقیقەتی فەصڵەکان بەشێوەیەکی گشتی و بنەڕەتی نادیارن و تەصوور ناکرێن. ئەی کەواتە چۆن دەتوانین ئەوانە لەڕێگەی صنعەتەوە ئاوەژوویان بکەنەوە، بەڵام توغرائی کەلەگەورەکانی ئەم صنعەتەیە ئەم قسەیەی ئیبن سینایان بەهەڵە داویانەتە پاڵی و بەم شێوەیە ڕەتی کردووەتەوە کەتەدبیر و چارەسەر بۆ ئافراندن و داهێنانی فەصڵ نیە، بەڵکو ئەم شتە بەتایبەت بۆ ئامادەکردنی مادە قبوڵکراو بووە فەصڵ لەپاش ئامادەکردن لەلای ئافرێنەر و خوای ئەوەوە بەدی دێت هەروەك چۆن لەپاش صەیقەلی کردن و ئاودان نورو درەوشاوەیی بەدی دێت ئێمە لەمبارەیەوە پێویستمان بەتەصوورو ناسینی نیە.

توغرائی دەڵێت: وەهەرکاتێك ئێمە لەئافراندنی هەندێك لەحەیواناتدا بەنەزانینی فەصڵەکانیان ئاگاداربین وەك بۆگەنکردن بەخاك و کاوە وەمارە پێکهاتووەکان لەموو، هەروەك ئەو قسانەی کەخاوەنانی کشتوکاڵ لەبارەی تەکوینی هەنگەوە باسی دەکەن و دەڵێن هەرکات ئەم هەنگە کەمبێتەوە دەتوانین لەجەستەی گوێرەکە یەکەوە دروستی بکەینەوە. وەدروستکردنی قامیش لەشاخی حەیواناتی ژەهراوی بەچاندن و گۆڕینی بەقامیشی شەکر لەڕێگە پڕکردنی شاخەکانەوە لەهەنگوین لەکاتی چاندنیاندا، لەم کاتەدا چ ڕێگریەك هەیە کەبەشێوەی ئەمانە لەزێڕو زیودا (کانزاکان) ئاگاداربین. هەموو ئەمانەش لەڕێگەی صەناعەتەوە ئەنجام دەدرێن ئەڵبەتە بابەتەکەیان ماددەیە، بەڵام تەدبیر و

چارەسەر وای لێدەکات کەتەنها ئامادەی قبوڵی ئەم فەصلانەبێت نەوەك خەلقی فەصڵەکان. توغرائی دەڵێت: کەواتە ئێمەش بەشوێن هاوشێوەی ئەم جۆرە کردارانە لەزێرو زیودا دەگەڕێین و مادەیەك بەدەستدەهێنین کەبیخەینە بواری کردارو چارەسەرەوە ئەڵبەتە بەمەرجی ئەوەی کە سەرەتا تێیدا یەکەمین ئامادەباشی زێرو زیو بوونی هەبێت. دواتریش هەوڵی چارەسەری دەدەین تاوەکو لەودا ئامادەباشی قبوڵی ئەم فەصڵە بگەیەنینە کەماڵ. (کۆتایی قسەکەی توغرائی بەماناوە). وەئەو قسەیەی کەتوغرائی لەڕەتدانەوەی ئیبن سینا دا باسی کردووە ڕاستە، بەڵام ئێمە لەڕەتدانەوەی کیمیاگەرەکاندا سەرچاوەیەکی ترمان هەیە کەبەهۆیەوە نەگونجاوی بوونی کیمیا و بەتاڵبوونەوەی بیروباوەڕەکانیان ئیتر توغرائی یان ئیبن سینا ئاشکرادەبێت.

بەوجۆرەی کەکورتەی چارەسەرەکەیان ئەمەیە کە لەپاش ئاگادار بوون لەمادەی ئامادە بەیەکەمین ئامادەباشی دەیکەنە بابەت و لەتەدبیر و چارەسەریدا شێوازی تەبیعەت لەبەرامبەر هەرتەنێکی کانزاییەوە دەگرنە بەر و، بۆ ئەوەی بیگۆڕن بەزێڕ یان زیو وەهێزە کاراو کارلێکەکان دەکەنە دووهێندە بۆ ئەوەی لەکاتێکی کورتتردا بەئەنجام بگات، چونکە لەجێگەی خۆیدا ئەوە ئاشکرابووە کەدووهێندەکردنی هێزی کارا لەکاتی کردارەکە کەمدەکاتەوە هەم گوتراویشە کە زێڕ لەکانزاکەی خۆیدا لەپاش هەزارو هەشتا ساڵەوە لەساڵەکانی قۆناغی گەورەی خۆر کامڵ دەبێت. کەواتە هەرکاتێك هێزو چۆنیەتیەکان لەچارەسەردا ببێتە دووهێندە کاتی بەدیهاتنەکەی بمانەوێت و نەمانەوێت بەپێی ئەوەی کەباسمانکرد کورتتر دەبێت لەو، یان لەڕێگەی ئەم چارەسەرەیانەوە لەگەڕان بەدوای دروستبوونی شێوەیەکی پێکهاتە بۆ ئەم مادەیە دەبێت کەوەك هەوێر مایەی دەداتێ و، دواتریش ئەو مادەیە لەگۆڕانی تەنی و جەستەییدا کەمەبەستی چارەسەرەکەیە تایبەتمەندی و کاریگەری پێویست دەبەخشێت و، وەها تەنێکیش هەمان ئەو ئکسیرەیە هەروەك ئاماژەمان پێکرد.

وەدەبێت ئەوە بزانین کەهەرتەنێت لەمەوالیدە توخمیەکان دروست ببێت ئەوا بەناچاریەوە دەبێت کەتێیدا هەرچوار توخمەکە بەرێژەیەکی جیاواز کۆببنەوە، چونکە ئەگەر توخمەناوبراوەکان لەڕووی ڕێژەوە بەرابەر بن ئەوا تەرکیبەکەیان بەئەنجام ناگات. هەربۆیە بەناچاریەوە دەبێت یەکێك لەبەشەکانی بەسەر هەموویاندا زاڵ ببێت و هەروەها بەناچاریشەوە دەبێت لەهەرتەنێکدا کەلەم توخمانە پێکهاتووە گەرمای غەریزی بوونی هەبێت کەبۆ بوونی ئەو هێزە کارایە یان کاریگەر و یان وەك پاسەوانێك بێت. دواتر هەر بونەوەرێکی تەکوینکراو لەکاتێکدا بەدی دێت هەربۆیە بەناچاریەوە دەبێت لەقۆناغ و حاڵەتەکانیدا و گواستنەوەی لەکاتی تەکوین لەحاڵەتێکەوە بۆ حاڵەتێکی تر جیاوازی هەبێت تاوەکو بەئەنجامی خۆی کۆتایی بێت.

وەلەمبارەیەوە دەبێت سەیری چۆنیەتی دروستبوونی مرۆڤ بکەین کەسەرەتا بەشێوەی نوتفەیەو دواتر شێوە وەردەگرێت و دواتر شێوەی کۆرپەلە وەردەگرێت و، سەرئەنجام بەشێوەی منداڵێك لەدایك دەبێت و دواتریش قۆناغی شیرە خۆری تەواو دەکات تاوەکو دەگاتە کۆتا قۆناغی ژیان و، ڕێژەی بەشەکان لەهەرشێوە و قۆناغێکدا لەڕووی ئەندازە و چۆنیەتیەوە لەیەکتری جیاوازن وەگەرنا حاڵ و قۆناغی یەکەمین وەك خۆی دەبووە حاڵ و قۆناغێکی تر. وەهەروەها گەرمای غەریزی لەهەرقۆناغێکدا جیاوازە لەقۆناغەکەی تر. ئێستەش سەیری ئەو قۆناغ و شێوانە دەکەین کەلەماوەی هەزار و هەشتا ساڵدا بۆ زێڕ دروستدەبێت لەکانزاکەیدا و ئەو چۆنیەتیانەی کەدەگوازرێتەوە بۆیان، دەگەینە ئەو دەرئەنجامەی کەکیمیاگەر دەبێت کار و تایبەتمەندی تەبیعەت لەکانزادا بگرێتە بەر تەدبیر و چارەسەری خۆی ڕووبەڕووبکاتەوە تاوەکو کۆتایی دێت. وەیەکێك لەمەرجەکانی صەناعەت بەبەردەوامی ئەمەیە کە ئەوەی کەئەیەوێت لەڕێگەی صنعەتەوە دروستی بکات لەزەینی خۆیدا شێواز و تەصویری بکات و هەروەك چۆن لەنمونەی حەکیمەکاندا هەیە کەدەڵێن: سەرەتای کار کۆتایی ئەندێشەیە و کۆتایی ئەندێشەش سەرەتای کارە، کەواتە دەبێت ئەم چۆنیەتیانە بۆ زێڕ لەحاڵەتە جۆراو

جۆرەکان و رێژە جیاوازەکانیدا لەهەرقۆناغێکدا تەصەووری بکەن و جیاوازی گەرمای غەریزی لەکاتی جیاوازە شێوەکانیدا ئەندازەی کاتەکەی لەهەر قۆناغ و ئەندازەیەکدا ئەو هێزە زیادانەی کەدەبێتە جێگرەوەی لەبەر چاوبگرین، بۆ ئەوەی هەموو ئەم تایبەتمەندیانە بەم شێوەیە بەکاریگەری تایبەتمەندی تەبیعەت لەکانزادا بەرابەر ببێت بۆ هەندێك لەمادەکانیش شێوەیەکی پێکهاتەیی ئامادە بکات، کەوەك شێوەیەکی هەویر ئاساوەك نان بێت لەم مادەیەدا بەرێژەی هێز و ئەندازەکەی تایبەتمەندی بەدی بهێنێت. وەهەموو ئەم کارانە بەزانستی ئیلاهی موحیت بەناوبانگە و چونکە زانستە مرۆییەکان لەوەها کردارێك بێتوانان ئەڵبەت حاڵی ئەم کەسە کەبانگەشەی ئەوە دەکات بەم صنعەتە دەتوانێت زێڕ بەدەست بهێنێت بەتەواوی، وەك ئەو کەسەوایە کە بانگەشەی ئەوە بکات کەدەتوانێت لەرێگە ئەم صنعەتەوە مرۆڤێك لەمەنی دروستبکات.

وەئێمەش هەرکات بۆ ئەو زانینی بەش و رێژە و شێوە و قۆناغەکانی مەنی بەسە لمێنراو بزانین و دان بەوەدا بنێین کەئاگاداری چۆنیەتی ئافەرینشە لەو رەحمەدا، وەئەم شتانەش بەشێوەیە زانستێکی کرداری و بوونەوەرێکی وادەزانێت کەئاگاداری هەموو ووردەکاریەکانیەتی، بەئەندازەیەك کەبچوکترین شتێکی نایاب و شاز لەزانستی ئەو نەفەوتێت ئەوکات دەتوانین بەسەلمێنراوی بزانین کەئەو دەتوانێت وەها مرۆڤێك دروستبکات بەلأم ئەو چۆن ئەم جۆرە زانیاریانەی دەستدەکەوێت؟ ئێستەش ئەم بەڵگەیە بەکورتی باسدەکەین بۆ ئەوەی تێگەشتن لیی ئاسان بێت و دەڵێین کورتەی صەناعەتی کیمیاو ئەوەی کەبانگەشەدەکەن بەهۆی ئەم صەناعەتەوە ئەنجامی دەدەن ئەوەیە کە: پێشخستنی تەبیعەتی کانزایی بەهۆی کردارە صەناعیەکانەوە و بەرابەرکردنی بەم کارانە تائەو شوێنەی کەبوونی تەنێکی کانزایی بەئەنجام بگات، یان ئافراندنی مادەیەکی خاوەن هێز و دەسەلآت و شێوەیەکی تەرکیبی بەجۆرێك کەلەجیسمدا کریگەریەکی سروشتی هەبێت و بیگۆرێت وەك خۆیی لێبکات ئەم کاریگەری کردارە صەناعیە تەسەوور و ئەحواڵی تەبیعی و کانزایی پێشی کەوتوون، کەئەبەوێت بەهۆی ئەوەوە تەبیعەت بەرەو پێشەوە ببات و لەگەڵ کردارە صەناعیەکەدا موقابەلەی

بکات و یان مادەیەك دروستبکات کەخاوەنی هێزگەلێك بێت کەتێیدا هەموو وردەکاریەکانی یەك بەیەك تەسەوور بکات. ئەم جۆرە چۆنیەتیانەش کۆتاییان نایەت و زانستی مرۆیی لەزانینی ئەندازەیەکی کەمتریان بێتوانایە و ئەو وەك کەسێك وایە کەبیەوێت مرۆڤ یان حەیوان یان گیایەك دروستبکات.

ئەمەیە کورتەی ئەو بەڵگەیەی کەباسمانکرد و ئەم بەڵگەیەدڵنیاکەرترین بەڵگەیە کەلەبەتاڵبونەوەی کیمیایە کەفێری بووم، هەروەك بینرا نەبوونی کیمیا لەم بەڵگەیەدا لەڕووی فەصڵەکان یان بەهۆی تەبیعەتەوە نیە، بەڵکو ئەم شتە بەهۆی نەتوانینی مرۆڤەوەیە لەزانینی و وەئەو ڕتکردنەوەیەی کەئیبن سینا کردبووی بەگشتی لەم بەڵگەیە جیاوازەو، ئیبن سینا بەڵگەیەکی تر لەبارەی نەگونجانی گۆڕانی کانزاکان بەیەکتر لەڕووی ئامانج و دەرئەنجامەوە هێناویەتی بەو جۆرەی کەحیکمەتی خودایی لەبوون و نایابی دوویەردی (زێڕو زیو) ئەمەیە کە ئەوانە بەهای سەوداو مامەڵەو کەسابەت و سەروەت و سامانی خەڵکیە، هەربۆیە ئەگەر لەڕێگەی صنعەتەوە بەکاریان بهێنن ئەوا حیکمەتی خودایی لەمبارەیەوە بەتاڵ دەبێتەوە بوونیان بەجۆرێك زۆر دەبێت کەهیچکەسێك لەدروستکردنیان سودێکی ئەوتۆ نابات.

وەهەروەها بەڵگەیەکی تری هەیە لەبارەی ئەوەی کە کانزاکان ناگۆڕدرێن بۆ یەکتری و دەڵێت کەسروشت لەکردارەکانی خۆیدا نزیکترینی ڕێگاکان واز لێ ناهێنێت ڕێگە دژوارو دوورەکان نابڕێت. وەئەگەر ئەم ڕێگە صنعەتیە کەکیمیاگەرەکان وادەزانن ڕاستە لەڕێگەی تەبیعەتەوە لەکانزا بەنزیکتری دەزانن، یان پێیانوایە لەڕووی کاتەوە لەو کەمترە، بەڕاستی ڕاست دەبوو، و سروشت و تەبعەت وازی لێ نەدەهێنا و ئەو ڕێگە دوورترەی لەپێناو بەدیهێنانی زێڕ و زیودا نەدەبڕی. بەڵام ئەوەی کەتوغرایی ئەم تەدبیرو کردارەی تەشبیه کردووە و چوانوویەتی بەهەندێك لەشتە نایابەکانەوە لەسروشتدا کەئاگاداریان بوون وەك: هەنگ و مارو، ئافەرینشیان، بەم هۆیەوە لەمبارەیەوە تێڕوانینەکەی دروستە کەبەپێی بڕوای ئەو ئاگاداری ئەوان بوون. بەڵام لەبارەی کیمیاوە هیچ کەسێك لەخەڵکی دونیا نەیگێڕاوەتەوە کەئەو خۆی ئاگاداری بووە یان تەریقەکەی

دەزانێت، بەڵکو ئەوانەی کەمومارەسەی دەکەن بەشێوەیەکی کوێرانە شوێنی کەوتوون تاوەکو ئێستەش هەربەوجۆرەنو بێجگەلەئەفسانەو چیرۆکە درۆینەکان هیچیان دەست ناکەوێت، ئەمەلەکاتێکدا ئەگەر ئەم ئەفسانانە هەبوونایە و یەکێك لەئەفسانەگەرەکان فێری کیمیا بوایە ئەوا بێگومان منداڵ یان یەکێك لەقوتابیەکانی ئەم صنعەتەیان لێوە وەردەگرت و فێری دەبوون و لەبەریان دەکرد و، دەگوازرایەوە بۆ عەوادالآنی زانستی ناوبراو لەپاش خۆیان و ڕاستی کارەکەش لەپاش ئەوە دەبوویە باشترین گەواهیدەر لەسەر ڕاستیەتی ئەو صنعەتە تاوەکو سەرئەنجام بڵاو دەبوویەوە و، دەگەشت بەئێمەوە بەخەڵکانی تریش.

وەهەروەها لەبارەی ئەوەی کەدەڵێن ئکسیر وەك هەوێرێکی مایەدار وایە و تەنێکی مورەکەبە کەهەرشتێك بچێتەناویەوە دەیگۆڕێت وتوخمەکانی وەك توخمی خۆی لێدەکات، دەبێت ئەوەش بزانین کەهەویری مایەدار هەویری تر دەگۆڕێت و ئامادەی دەکات بۆ هەرسکردن و ئەوەش جۆرێکە لەخراپبوون. خراپبوونی مادەکانیش ئاسانە و بەکەمترین شتێك لەکردارو تەبایعەکان ڕوودەدات، ئەمە لەکاتێکدا ئەوەی لەئکسیردا پێویستە بریتیەلە گۆڕینی کانزا بەشتێك کەشەریفتر و لەپێشترە لەو لەحەقیقەتی کردارو تایبەتمەندیەکانیدا تەکوین و صلاحە. تەکوین لەخراپبوون دژوارترە هەربۆیە ناکرێت ئکسیر لەگەڵ هەویری مایەداردا قیاس بکەین تەحقیق و بەدیهاتنی ئەم کارەش لەمبارەیەوە ئەوەیە کەبەگریمان بوونی کیمیا ڕاستیەتی هەبێت بەپێی قسەی ئەو حەکیمانەی کەلەمبارەیەوە قسەیانکردووە، وەك جابری کوڕی حەییان و مەسلەمەی کوڕی ئەحمەدی مەجریتی ونمونەی ئەمانە ئەم شتە لەجۆری صنعەتە تەبیعیەکان نیەو بەهۆی یەك کرداری صەناعیەوە ئەنجام نادرێت و قسەی ئەم گروپە لەمبارەیەوە لەو مەبەستانە نین کەلەتەبیعیاتدا هێناویانە، بەڵکو لەجۆری مەبەستە سیحری و خەواریقەکانی ترە وەك ئەو کردارانەی کە بۆ حەللاج و نمونەی ئەو ڕوویانداوە، وەمەسلەمەی مەجریتی لەکتاب الغایەدا بابەتگەلێکی هاوشێوەی ئەوانەی ئێمەی هێناوەو قسەی ئەو لەکتێبی رتبەالحکیم دا لەم جۆرە قسانەیەو، هەروەها قسەکانی جابر

لەرِیسالەکانیدا بەتەواوی وەك قسەکانی مەسلەمەیە و بەدەست هەموویان گەشتووەو پێویست ناکات لێرەدا شەرحیان بکەین.

بەکورتی دەبێت بڵێین کەبابەتی کیمیا لەلای حەکیمەناوبراوەکان لە کوللیاتی مادەگەلێکە کە لەحوکمی صنعەتەکان دەچنە دەرەوە، چونکە هەروەك چۆن کەئافراندنی شتێك لەجۆری دار و چێوو حەیوان لەغەیری رِێگەی ئاسایی بەدیهێنانیانەوە لەیەك رِۆژ یان لەیەك مانگدا ئاسان نیە، بەهەمان شێوەش ناتوانرێت لەمادەی زێرِ لەیەك رِۆژ یان لەیەك مانگدا زێرِ دروستبکرێت، چونکە رِێگەی ئاسایی ئەو ناگۆرِێت مەگەر بەیارمەتی لەماوەرای جیهانی تەبیعەتو کرداری صەنایعەکانەوە نەبێت. لەم رِووەوە هەرکەسێك لەرِێگەی صەنایعەوە بەدوای کیمیادا بگەرِێت ئەوا سەروەت و کارەکەی خۆی لەناودەبات و بەم تەدبیرە صەناعیەش دەڵێن تەدبیری (سترون)، واتە هەوڵێکی نەزۆك و پوچەڵ، چونکە ئەگەر گەشتن پێی دروستیش بێت ئەوا بەدڵنیاییەوە لەرِێگەی ماوەرای تەبایع و صەنایعەوەیە وەك رِۆشتن بەسەرئاودا و فرِین بەهەواداو چوونە ناو جەستە ستبرەکانەوەو، نمونەی ئەمانەن کەلەرِیزی کەرامەتی ئەولیاو خەواریقی عادەتەکانەوە دەبێت، یان وەك خولقاندنی باڵندە و هاوشێوەی ئەمە کەبەدەستی پێغەمبەران ئەنجامدراوە.

خودای تعالی دەفەرمێت: وەکاتێك کەلەقورِ هاوشێوەی باڵندەت بەیارمەتی من دروستکرد و فوت پێدا کردو بەئێزن و یارمەتی من بوویە باڵندە[٢٧٩]، هەربۆیە بەدەستهێنانی ئکسیر بەپێی حاڵەتی ئەو کەسانەی کەپێیان دەبەخشرێت جیاوازە چونکە ئەم تواناو ئامادەباشیە دەدرێت بەتاکێکی صالح و باش ئەویش دەیدات بەیەکێکی تر و، لەلای دوومین کەس بەشێوەیەکی ئەمانەت دەمێنێتەوە وەهەندێك جاریش دەدرێت بەکەسێکی صالح بەلأم ناتوانێت بیبەخشێت بەکەسێکی تر کەواتە ناکەوێتە دەست غەیری ئەو.

---

[٢٧٩] (وَإِذ تَخلُقُ مِنَ الطِّينِ كَهَيئَةِ الطَّيرِ فَتَنفُخُ فِيها فَتَكُونُ طَيرا بِإذنِى) س المائده ئا ١١٠. وەس ال عمران ئا ٤٤

لەم ڕەوە کارەکەی ئەو لایەنێکی ساحیری هەیە کەواتە ئاشکرابوو کەمەسەلەی کیمیا بەهۆی کاریگەری نەفسەکان و خەواریقی داب و نەریتەکانەوە ڕوودەدات و، ئەوەش یان لەڕێگەی موعجیزەوە یان لەڕێگەی کەرامەتەوە و یان بەشێوەیەکی ساحیری، هەربۆیە قسەی زۆربەی حەکیمەکان لەمبارەیەوە ئالۆز و مەتەڵ ئاسایە. هیچ کەسێك دەستی ناگاتە ڕاستەقینەکەی مەگەر ئەوەی کەبەناوقووڵایی ساحیریدا بچێتە خوارەوە و ئاگاداری هەڵسووکەوت و تەسەڕوفاتەکانی نەفس ببێت لەجیهانی تەبیعەتدا. وەکارەکانی خەرقی عادەت بێ سنورن و هیچ کەسێك حەز بەبەدەستهێنانیان ناکات، خوداش ئاگاداری ئەوەیە کەدەیکەن. ئەوی کەزیاتر خەڵکی والێدەکات کەدەست بدەنە ئەم صنعەتەو کاری تێدا بکەن هەروەك باسمانکرد بریتیە لەبێتواناییان لەبەدەستهێنانی ڕۆزی و مەعاشیانە لەڕێگە ئاساییەکانەوە بێجگە لەم ڕێگەیە وەك: کشتووکاڵ و بازرگانیو صنعەت و پیشەسازی. لەبەر ئەمەیە کەخەڵکی بێتوانا هەوڵی بەدەستهێنانی ڕۆزی خۆیان لەم سێ ڕێگەیەوە نادەن و ئەیانەوێت کوتوپڕو بەشێوەیەکی یەکسەر سەروەت و سامانێکی زۆر لەڕێگەی کیمیاوشتەکانی تری هاوشێوەی ئەوەوە بەدەست بهێنن. زۆربەی ئەوکەسانەشی کەگرنگی بەم بابەتە دەدەن هەژارو بێنەواشارنشینەکانن و تەنانەت ئەم تایبەتمەندیەش لەبارەی حەکیمانێکەوە کەلەبارەی گونجان یان نەگونجانیەوە قسەیانکردووە جێبەجێ دەبێت، هەروەك چۆن ئیبن سینا باوەڕی بەڕوودانی کیمیا نەبووە. وەدەشزانین کەئەو لەوەزیرە پلەباڵاکان بووە و لەڕیزی خەڵکانی داراو بەتواناکاندا بووە بەڵام فارابی کەباوەڕی بەکیمیا هەبووە لەهەژاران و بێنەوایان بووە کەپێویستی بەسەرەتایی ترین پێداویستیەکانی ژیان هەبووە. وەلەبارەی بۆچوونی ئەوانەی کەخوازیارو عەوداڵی فێربوونی کیمیان و مومارەسەی دەکەن و ئەم مەسەلەی هەژاری و بێنەواییە تۆمەتێکی ئاشکرایە و گومان لەوەدا نیە کەخودا ڕۆزی دەری خاوەن هێزی بەهێزە (قوه المتین)[٢٨٠].

---

[٢٨٠] (إِنَّ اللَّهَ هُوَ الرَّزَّاقُ ذُو الْقُوَّةِ الْمَتِينِ) س الذاريات ئا ٥٨.

## بەشێك

## لەبارەی ئەو مەبەستانەی کەبۆ نوسینی کتێب دەکرێت پشتیان پێ ببەسترێت و غەیری ئەوان بخرێنەلاوە

دەبێت ئەوەبزانین کەگەنجینەی زانستە مرۆییەکان بریتیە لەگیان (نەفسی ئینسانی) بەوهۆیەوە خودا دەرکی تێدا ئافراندووە سوودی ئیدراکیش بەدیهاتنی ئەندێشەیە بۆ گیان، کەیەکەم لەڕێگەی تەصەووری حەقیقەتەکانەوە و دواتریش سەلماندنی نەفی عەوارزی زاتی بۆ ئەو دێتەدی و دوومیش تەسەووری حەقایقی ڕاستەوخۆی بێ واسیتە یان بەواسیتەیە بۆ ئەوەی لەم ڕێگەی ئەندێشەیەوە مەسەلە گەلێك کە ئەیەوێت بیانسەلمێنێت یان نەفیان بکات و نەیانسەلمێنێت بەدەست بهێنێت و، دواتریش کاتێك بەم هۆیەوە شێوەیەکی کرداری لەویژدان و زەمیردا جێگیر دەبێت و دەبێت بۆ کەسانی تری باسبکەیت و باسکردنەکەشی بەدوو شێوە دەبێت:

١ – بەشێوەی فێرکردن.

٢ – لەڕێگەی گفتوگۆ لەگەڵ خەڵکانی تردا بەمەبەستی ڕووناککردنەوەی ئەندێشەو سەلماندنی حەقیقەت.

پایەی یەکەمی باسکردن: ئەڵبەت باسکردن و ڕوونکردنەوەی ئەندێشە تەنها لەڕێگەی تەعبیر و دەستەواژەوە ئەنجام نادرێت چونکە قسە لەزاراوەگەلێك پێکدێت کەلەقسەکردندا بەکار دێن و، خوداش لەزماندا ئافراندوونی لەفزەکان لەپیتەکان پێکهاتوون و پیتەکانیش لەچۆنیەتی ئاوازە پچڕ پچڕ (مەقتەعیە) کانن کەبەهۆی زمانە

بچکۆلەو زمانەوە ئەدا دەکرێن و، بەهۆیانەوە قسەکەران لەکاتی قسەکردندا ئەندێشەکانی خۆیان دەگەیەنن بەیەکتری و ئەمەش یەکەمین پایەی باسکردنی ئەندێشەو تەعبیرەکانە لەپێکهاتە دەروونیەکان، هەرچەندە گرنگترین و شەریفترینی ئەوان وانستەکانن، بەلاّم ئەم جۆرە ڕوونکردنەوەیە بەشێوەیەکی گشتی هەموو ئەو شتانەی کەلەدەرونی مرۆڤدا خۆی حەشارداوە ئیتر خەبەر بێت یان ئینشا هەموویان دەگرێتەوە.

پایەی دووەمی باسکردن: بەو جۆرەیەکەبتوانین ئەوە کەلەدەرونماندایە بگەیەنین بەوانەی کەلیمانەوە دوورن یان نادیارن یان بەوکەسانەی کە هاچەرخی ئێمەنین ئەمەش تایبەت بەنوسینەوە. نوسینیش بریتیەلەنەخشاندنی نیشانەگەلێکە بەدەست بەجۆرێك کەشێوە و وێنەکانی پیت بەپیتو ووشە بەووشە مانای زاروەگەلێك دەبەخشێت کەلەقسەکردندا بەکاردێن. کەواتە باسکردن و هۆنیەنەوەی شتەکانی دەروونی مرۆڤ لەڕێگەی نوسینەوە بەهۆی هەمان ئەو قسەوەیە کە لەنوتق و گوتندا بەکار دێت هەربۆیە ئەویان لەپایەی دووەمدا داناوە، بەلاّم هەریەکە لەم دووجۆرە باسکردنە لەشتەکانی دەروونی مرۆڤ زانست و مەعریفەکان نیشاندەدات ئەوا شەریفتر دەبێت و، گرنگی خاوەنانی زانست و هونەر بەوەیە کە ئەندێشەو شتەکانی دەرونی خۆیان بەهۆی نوسینیان لەسەردڵی لاپەڕەکان بەیادگار دابنێن بۆ ئەوەی داهاتوان سود لەفێربوونیان وەربگرن و ئەو هەڵانەشی کەغایین و ئامادەنین بەهرەمەند بن لێیان. ئەم گروپەش بریتین لەدانەرانی کتێب.

لەنێو کۆمەڵگە مرۆڤایەتی و نەتەوە جۆراو جۆرەکاندا کتێبگەلێکی زۆر دانراون و ئەم کتێبانە لەسەردەمانێکی دوور و درێژی یەك لەدوای یەکدا گوازراوەتەوە بۆ نەوەکانی داهاتوو، بابەتەکانیان بەپێی شەریعەت و مەزهەبە جۆراوجۆرەکان و مێژووی دەوڵەت و نەتەوەکان جیاوازە. بەلاّم لەزانستە فەلسەفیەکاندا جیاوازی نیە، چونکە هەموو بابەتەکانی بەیەك شێوە و بەپێی خواستەکانی ئەندێشەی مرۆڤ و ئادەمیزاد لەتەسەووری بوونەوەراندا کۆ دەکرێتەوە و ئەوان لەڕووی جەستەیی و ڕۆحی و فەلەکی و توخمی و

موجەرەد و مادەوە بەو جۆرەی کەهەن و بەپێی واقیعیەت بیردەکەنەوە، هەربۆیە لەم زانستانەدا جیاوازی ڕوونادات، بەڵکو جیاوازی لەزانستە شەرعیەکاندا ڕوودەدات، چونکە گەلان لەڕووی مەزهەبەوە لەیەکتری جیاوازن یان بەهۆی جیاوازی ئەو هەواڵانەی کەبەشێوەیەکی سەتحی و ڕووکەش کۆدەبنەوە لەزانست و مێژووشدا جیاوازی دەبینرێت. دواتر دەبینین بەهۆی زاراوە جۆربەجۆرەکانی مرۆڤەوە لەشێوە و شێوازی پیتەکاندا کەپێیان دەڵێن قەڵەم و خەت نوسینیش یەکسان نیە و جیاوازی زۆری هەیە. لەوانەش خەتی حەمیریە کەپێی دەڵێن (مسند) هۆزی حەمیر و خەڵکی کۆنی یەمەن بەو خەتە دەیاننوسی و پێچەوانەی شێوازی عەرەبە پاشینەکانی وەك موزەرییەکان بوون، هەروەك چۆن لوغەتیشیان لەگەڵ لوغەتی موزەریدا جیاواز بوو هەرچەندە کەهەموویان بەعەرەبی قسەیاندەکرد بەڵام نەریت و مەلەکەی موزەرییەکان لەزمان و شێوازی دەربڕیندا جیاوازە لەگەڵ حەمیریەکانداو، هەریەکە لەوان لەقسەکردندا یاساگەلێکی گشتیان هەیە کەلەشێوازی دەربڕینیانەوە وەرگیراوە و جیاوازە لەگەڵ یاساو ڕێسای ئەویتردا.

هەربۆیە لەم بارەیەوە ئەوانەی کەئاشنای مەلەکەی تەعبیرو دەربڕین نین دەکەونە هەڵەوە. یەکێکی تریش خەتی سریانیە کەنەبەتی و کلدانیەکان پێیان دەنوسی و هەندێك جاریش هەندێك لەنەزانەکان پێیانوایە کەخەتی سریانی کۆنیەکەی شتێکی تەبیعیە، چونکە ئەوان لەکۆنترینی نەتەوەکان دەژمێردران، بەڵام ئەم بۆچوونە وەهم و هەڵەیە و یەکێکە لەبیروباوەڕ عامیانە و نەخوێندەوارانەکان، چونکە هیچکام لەکردارە ئیختیاریەکانی مرۆڤ سروشتی و تەبیعی نیە، بەڵکو ئەم کردارانە بەهۆی کۆنی و ڕاهێنانەوە هێنەدە دەمێننەوە تاوەکو دەبنە مەلەکەیەکی نەگۆڕ و بینەر وادەزانێت کەسروشتین.

هەروەك چۆن زۆرێك لەخەڵکی کاڵفام لەبارەی زمانی عەرەبیەوە بەم شێوەیە بیردەکەنەوە و دەڵێن عەرەبەکان بەشێوەیەکی سروشتی بەعەرەبی قسەیانکردووە، لەکاتێکدا ئەم بۆچوونەش هەڵەیە. یەکێکی تریش خەتی عیبریە کەخاندانی عابیری کوڕی

شالیخ لەبەنی ئیسرائیل و نمونەی ئەوان پێیاننوسیوە. یەکێکی تریش خەتی لاتینیە کەهی خەڵکی ڕۆمە و خاوەنی زمانێکی تایبەتن و هەریەکە لەم نەتەوانە لەنوسیندا خاوەن زاراوەی تایبەت بەخۆیانن وەك تورکەکان و فەرەنگ و هیندیەکان و نمونەی ئەوان، بەلاّم تەنها سێ جۆر خەتی یەکەم گرنگی پێدراوە، چونکە هەروەك باسمانکرد خەتی سریانی بەکۆنترینی خەتەکان دادەنرێت هەرئەم کۆنیەشی بووەتە هۆی ئەوەی کە گرنگی پێبدرێت. بەلاّم خەتە عەرەبی و عیبریەکان بەو هۆیەوە گرنگیان پێدەدرێت کە قورئان و تەورات بەو دووزمانە هاتوونەتە خوارەوە و نازڵ بوون و بەو خەتانە نوسراونەتەوە و لەبەر ئەوەی هەردوو خەتی ناوبراو هۆکاری دەربڕینی ئایەتە نازڵ بووەکانی ئەم دوو کتێبەبوون، هەربۆیە سەرەتا هەوڵی ڕێکخستنی ئەوانیانداوەو دواتریش یاساو ڕێساگەلێکیان لەزمانە ڕێکخراوەکەوە بەهەمان شێوە گەشەیان پێداوە، خەڵکی شەریعەتەکانی لەڕێگەی ئەو دووزمانەوە وەردەگرت و فێریاندەبوون و هۆکاری گرنگیدانیش بەزمانی لاتینی ئەوەبوو لەبەر ئەوەی ڕۆمیەکان بەرەو مەسیحیەت چوون و زمانەکەیان لاتینی بوو، هەروەك چۆن لەسەرەتای کتێبەکەدا باسمانکرد تەعالیمەکانی ئاینی مەسیح یەکسەرە لەتەوراتەوە وەردەگیران هەربۆیە کتێبی ناوبراو باقی کتێبەکانی تری پێغەمبەرانی بەنی ئیسرائیل تەرجەمەیانکردنە سەر زمانی خۆیان بۆ ئەوەی ئەحکامە دینیەکان بەئاسانترین شێوە وەربگرن و، فێریان بن و لەئەنجامدا ڕۆمیەکان زیاتر گرنگیان دابەزمان و خەتی خۆیان و تەوراتیان پێ نوسیەوە.

کەواتە ئەوەمان بۆ دەرکەوت کەبێجگەلەخەتە باسکراوەکان خەتی نەتەوەکانی تر هێندە جێگەی بایەخ و گرنگی نەبووە، بەڵکو هەرنەتەوەیەك بەپێی زاراوەتایبەتەکانی خۆی خاوەنی خەتێکە کەتەنها تایبەتە بەو نەتەوەیەوە و نەتەوەکانی تر گرنگی پێنادەن. سەرەڕای ئەمەش دانەرەکان مەسەلەگەلێکیان لە دانراوەکانیاندا زۆربەگرنگ ناودەبەن و لەحەوت مەبەستدا کورتیانکردووەتەوە و تەنها ئەوانە بەمتمانە پێکراو دەزانن و غەیری مەبەستە ناوبراوەکانیان خستوەتە لاوە ئەوانەش بریتین لە:

١ – دەرهێنانی یەك زانستی نوێ بەو جۆرەی کەبابەتەکانی بەدەست بهێنن و باب و بەشەکانی دابەشبکەن و لەبارەی مەسەلەکانیەوە تەحقیق و بەدواداچوون بکەن، یان بەدەستەواژەیەکی تر زانا لێکۆڵەر و موحەقیقەکان لەتەحقیقاتەکانیاندا مەسەلە و بابەتگەلێکی نوێ دەربهێنن و، هەوڵی ئەوەبدەن کەبیانگەیەنن بەخەڵکی بۆ ئەوەی سودیان لێوەربگرن و دواتریش دەرئەنجامی تەحقیق و دەرهێنانەکەیان لەڕێگەی نوسین لەکتێبەکاندا بەیادگار بهێڵنەوە و بیانپارێزن بۆ ئەوەی داهاتوان سوودیان لێوەربگرن، هەروەك چۆن لەزانستی ئوصولّی فیقهدا ئەم شێوازە ڕوویداوە و سەرەتا شافیعی سەرقاڵی بەحس بووە لەدەلیلە لەفزیە شەرعیەکان و کورتی کردونەتەوە و، دوای ئەویش حەنەفیەکان دەستیانکردە دەرهێنانی مەسەلەکانی قیاس و بەشێوەیەکی کۆو جامیع کۆیانکردنەوە و زانستخوازانی دوای خۆیان سودێکی زۆریان لێوەرگرتن.

٢ – شێوازی دووەمی دانان ئەوەیە کە کەسێك سەرقاڵی خوێندنەوە و لێکۆڵینەوە بێت لەقسەی پێشینان و دانراوەکانیاندا و بەسەختی لێیان تێبگات، بەڵام خودا دەرگای تێگەشتنی بۆ بکاتەوە و دواتر هەوڵی ئەوە بدات ئەو شتانەی کەخەڵکانی تر لێیان تێناگەن و، بووەتە کێشە بۆیان شەرح بکات و تێیان بگەیەنێت و بۆئەوەی ئەوانەی کەشایستەی تێگەشتنن سود وەرگرن و بەهرەمەند بن ئەم شێوە عیبارەتەش لەشەرح و تەفسیری کتێبە مەعقول و مەنقولەکاندا بەکاردەهێنرێت لەنوسینی کتێبدا و بەبەشێکی شەریفیش دادەنرێت.

٣ – کاتێك یەکێك لەزانایانی پاشینان هەڵەو پەڵەی پێشینانی هەڵکەوتوو بدۆزێتەوە بەبەڵگە ئاشکراو بێگومانەوە بیسەلمێنێت، ئەوکات هەوڵدەدات بیگەیەنێت بەداهاتووان. چونکە بەهۆی بڵاو بوونەوەی ئەو دانراوە لەسەدەگەلێکی دوور و درێژدا لەهەموو وولاتاندا نابانگە دانەر بەفەزڵی زانستەکە و متمانەکردنی خەڵکی بەزانیاریەکانی لابردن و، ڕاستکردنەوەی هەڵە زۆر ئەستەم و دژوار دەبێت. چونکە کاتێك زانا هەڵەکان

ڕاستدەکاتەوە دەبێت بەڵگەی باوەڕپێکراوی پێبێت بەشێوەی کتێب بیاننوسێت بۆ ئەوەی خوێنەر لێیان بەئاگابێت.

٤– کاتێك زانا لەیەکێك لەهونەرەکاندا کەموکورتیەك دەبینێت بۆنمونە بەپێی دابەشکردنی بابەتەکانی دەتوانرێت بەش و باب گەلێکی تری بۆ زیاد بکرێن یان بەش و بابەکانی تەواو بکرێن ئەوکات لەمبارەیەوە هیممەت دەکات دەستدەکات بەنوسین.

٥ – یەکێکی تر لەو شوێنانەی کەپێویستە کتێبی تێدا بنوسرێت ئەوەیە کەمەسەلەکانی زانستێك ناڕێك بن و هیچ ڕێکخسنێکیان پێوە دیار نەبێت و هەرباسێك و لەبابی خۆیدا دانەنرابێت، ئەوکات زانای بەئاگا دەستدەکات بەتەرتیب و تەهزیبی زانستەکەو هەرمەسەلەو لەشوێن و بابی خۆیدا دادەنێت و، هەروەك چۆن ئەم شتە لە(المدونە) دا کەسحنون لەئیبن القاسمەوە گێڕاویەتیەوە و (العتبیە) کەعوتبی لەهاوەڵانی مالیکەوە گێڕاویەتیەوە دەبینرێت، چونکە زۆرێك لەمەسەلەکانی فیقە لەکتێبی ناوبراودا لەبابی خۆیدا نەهاتبوو. هەربۆیە ئیبن ئەبوزەید دەستیکردە تەهزیبی المدونە، بەڵام التبیە وەك خۆی مایەوە و تەهزیب نەکرا بەڵام خوازیارانی زانست بەبوونی المدوەنە و تەهزیبەکەی ئیبن ئەبوزەیدو دواتریش ئەو تەهزیبەی کە بەرادعی لەسەری نوسیبوو پێویستیان بە العتبیە نابێت.

٦ – کاتێك مەسەلەکانی زانستێك لەنێو مەسەلەی زانستێکی تردا پرژو بڵاوبنو هەندێك لەزانایان ئاگاداری بابەت و هەموو مەسەلەکانی بن و کۆیان بکەنەوە، ئەوکات لەم ڕێگەیەوە هونەر یان زانستێکی نوێ ڕێکدەخرێت و دەچێتە سەر ژمارەی ئەو زانستانەی کەمرۆڤ ئەندێشەی خۆی تێدا بەکار دەهێنێتو تەمرین و مومارەسەیان دەکات، هەروەك چۆن لەزانستی بەیاندا ڕوویداوە و عبدالقاهیری جورجانی و ئەبو ئەیوبی یوسفی سکاکی مەسەلەکانی زانستی بەیانیان لەکتێبەکانی نەحودا بینیان کەبڵاو بوبونەوە، چونکە جاحیز لەکتێبی البیان والتبیین دا زۆرێك لەمەسەلەکانی ئەو زانستەی کۆکردبوویەوەو دواتر زاناکان ئاگادار بوونەوە و، کەوتنە سەرئەوەی کەبابەتەکانی لەیەکتر جیابکەنەوەو

دەستیانکردە نوسینی زانستی البیان و کتێبگەلێکی بەناوبانگیان لەوبارەیەوە نوسی کەوەك بنەمای زانستی البیان دەژمێردران و، دواتریش داهاتوان فێریان بوون و هەوڵێکی زۆریاندا بۆ کامڵکردن و تەواوکردنی ئەو زانستە و پێش پێشینانیش کەوتن لەو بوارەدا.

٧ – کورتکردنەوەی کتێبی پێشینان ئەوەش لەکاتێکدا دەبێت کەببینرێت کتێبێك لەریزی امهاتی کتێبەکاندایە و وەك سەرچاوەی سەرەکی وایە، بەلآم زۆر دوورودرێژە، ئەوکات زانایەك بریاری ئەوە دەدات کە بەشێوەیەکی تێروتەواو کورتی بکاتەوە و بابەتەدووبارەکانی لاببات و لەهەمان کاتیشدا ئاگاداری ئەوەبێت کەنەوەك بابەتە سەرەکیەکانی بەنەزانیەوە لاببات، نەوەك کەموکورتی بکەوێتە مەبەستی دانەرەوە. ئەمانە ئەو کۆمەڵە مەبەستەبوون کەشیاوی ئەوەن لەنوسنی کتێبدا پشتیان پێ ببەسترێت وهەموو دانەرێکیش دەبێت رەچاویان بکات لەدانراوەکانیدا، ئەگەر بەپێچەوانەوە بێت ئەوا نوسینەکە دەبێتە شتێکی ناپێویس وەك لادانی لێدێت لەو رێگەیەی کەزیرەك و ژیرەکان پێیدا تێپەریون.

وەك ئەوەی کەکەسێك بەکەمێك دەستکاریەوە بەرهەمی پێشینان بداتە پاڵ خۆی و تەزویریان بکات وەك گۆرینی دەستەواژەی کتێبەکە و جێگۆرکێ بەبەشەکانیان وەیان هەندێك مەسەلەی پێویستی لاببات و، بابەتگەلێکی تێدا دابنێت کەپێویست نین وەیان مەسەلەراستەکان بگۆرێت بەناراست و لەبابەتگەلێکی بێ سوودا گفتوگۆبکات. ئەم شێوازەش نیشانەی نەفامی و بێشەرمیە، پەنادەگرین بەخودا لەوکارەی کەئەنجامیانداوە کەشیاوی ئاقڵ و ژیرەکان نیە. خودا جا مرۆڤ رێنمایی دەکات بۆ ئەوەی کەراسترە.[٢٨١]

\

[٢٨١] (أنَّ هذا القُرآنَ يَهدي لِلّتي هِيَ أقوَم) س النحل ئا ٩.

# بەشی بیست و هەشتەم

## لەبارەی ئەوەی کە زۆربوونی کتێب و دانراوەکان لەزانستەکاندا ڕێگرە لەبەردەم فێربووندا

دەبێت ئەوە بزانین کەئەو شتانەی کەزیانیان گەیاندووە بەخەڵکی لەبەدەستهێنانی زانست و ئاگادار بوون لەئامانج و، مەبەستەکانی زۆری دانراوەکان و جیاوازی زاراوەکانە لەفێرکردندا زۆری شێوازەکانی و دواتریش داواکردن لەفێرخواز کەهەموویان کۆبکاتەوەو بۆ ئەوە پلەی فێربوونی بسەلمێنێت، لەم کاتەدا فێرخواز ناچارە کە زۆربەیان هەموویان لەبەر بکات و هەوڵی ڕەچاوکردنی هەمووشێوازەکانی بدات و ئەگەربیەوێت ئەوکۆمەڵە کتێبەی کەلەزانستێکدا نوسراون بەتەنهایی لێکۆڵینەوەیان بکات، ئەوا تەمەنی دەڕوات و ناتوانێت ئەو کارەبکات و پلەیەکی خوارتر لەنمرەی خوێندنەکەی وەردەگرێت. وەبۆ بەرجەستە بوونی ئەم کارە چۆنیەتی فیقھ لەمەزهەبی مالیکیدا بەنمونە دەهێنینەوە و کتێبی المدونە لەبەرچاو دەگرین‌و کەچ شەرحگەل و تەنبھاتێکیان لەسەر کردووەو نوسیوە وەك: کتێبی ئیبن یونس و لەخمی و ئیبن بەشیر، وەهەروەها کتێبەکەی ئیبن حاجیب و ئەو شەرحانەی کەلەسەری نوسراون.

دواتر فێرخواز و قوتابی ناچارە کەشێوازە فیقهیەکانی قەیرەوانی و قورتوبی و بەغدادی و میسری لەیەکتری جیابکاتەوەو شێوازەکانی پاشینانیش لەشێوازە نابراوەکان لەیەکتری جیابکاتەوەو، لەم کاتەشدا پلەی فتوای بۆ مسۆگەر دەبێت. لەگەڵ ئەوەی کە هەمووکتێبەکانی تەریقە و شێوازی ناوبراو بێجگە لەدووبارەکردنەوەی بابەتەکان شتێکی

تر نیە و هەموویان یەك مانایان هەیە و قوتابی ناچارە کەشارەزایی لەهەموویاندا هەبێت‌و شێوازە جۆراو جۆرەباسکراوەکانیان لەیەکتری جیابکاتەوە. ئەمەلەکاتێکدا تەمەن بەشی تەحقیق و لێکۆڵینەوەی یەکێکیان ناکات و تەواو دەبێت. وەئەگەر مامۆستایان تەنها ئەوەیان بەبەس بزانیایە کە زانستخوازان هەمان ئەو مەسەلە مەزهەبیانە فێربن کەپێویستن ئەوا بەدڵنیاییەوە بارودۆخی فێربوون جۆرێکی تردەبوو و لەوەی ئێستە و فێربوون ئاسانتر دەبوو خەڵکی بەخێرایی فێری زانستەکان دەبوون. بەڵام ئەم شتە وەك دەردێکی بێ دەرمانی لێهاتووە و بەجۆرێك عادەت و خوی پێوە گیراوە کەوەك سروشت‌و تەبیعەتێکی نەگۆڕی لێهاتووە. بۆنمونە باسی زانستەکانی زمانی عەرەبی دەکەین وەك کتێبی سیبویە و ئەو هەموو شەرح و تەفسیر و پەراوێزانەی کەلەسەری نوسراون وەك شێوازە جۆراو جۆرەکانی بەصری و بەغدادی و کوفیەکان و، دوای ئەوانیش شێوازی ئەندەلوسیەکان.

وەرێگە و توروقی پێشینان و پاشینان وەك ئیبن حاجب و ئیبن مالیك و هەموو ئەو کتێبانەی کەلەمبارەیەوە نوسراون و، دواتر ئەوەلەبەرچاو دەگرین کەچۆن داوا لەزانستخواز دەکەن هەمووئەمانە بخوێنێت و فێریان ببێت و لەئەنجامدا دەبینین تەمەنی لەبەرامبەر ئەمانەوە دەڕوات و، هیچکام لەزانستخوازان و قوتابیان بێجگە لەژمارەیەکی کەم نەبێت کەبەپەنجەی دەست دەژمێردرێن ناگەنە کۆتاییەکەی و لەوانەشی کەگەشتوونەتە کۆتایی و شوێنی مەبەست دەتوانین ناوی هەندێکیان بهێنین، کەلەم سەردەمەدا کتێبەکانی بەئێمە گەشتوون یەکێکیان پیاوێکی میسریە لەئەهلی صەناعەتی زمانی عەرەبیە کەبەئیبن هیشام ناسراوە[٢٨٢].

وەقسەکانی ئەو لەبارەی ئەم صنعەتەوە ئەوە نیشاندەدات کەئەم گەشتووەتە ئەوپەڕی مەلەکە لەم زانستەدا هەربۆیە لەڕیزی کەسانێکی وەك سیبویە ئیبن جنی دایە.

---

[٢٨٢] جمال الدین عبداللەی ابن هشام (٧٠٨ – ٧٦١) خەڵکی میسر بووەو، زانایەکی شارەزای فیقە و تەفسیر و صەرف و نەحو بووە و کتێبی بەناوبانگی مغنی اللبیبی هی ئەم زاتەیە. (لغتنامە دهخدا).

چونکە ئەو مەلەکەیەکی گەورەی هەبووە و بەتەواوی ئوصول و فروعی ئەم هونەرەی زانیوە و شارەزا بووە و بەباشترین شێوە کاری تێدا کردوون و ئەوەی سەلماندووە کەفەزڵ و گەورەیی لەم زانستەدا تەنها تایبەت نیە بەپێشینانەوە. لەگەڵ ئەوەشی کەباسمانکرد ئێستاکە بەهۆی زۆری شێوازو دانراوە جۆراو جۆرەکانەوە دژواری و کێشەگەلێکی زۆر بوونیان هەیە، بەلآم ئەمە فەزڵی خودایە کەبەهەرکەسێك کەبیەوێت دەیبەخشێت.[٢٨٣] ئەم کەسانەش لەنایابەکانی جیهانی هەستی دەژمێردرێن. وەگەرنا ڕواڵەتی کارەکە ئەوەنیشاندەدات کەبۆنمونە ئەگەر قوتابی تەمەنی لەم هەمووە بابەتانەدا تەی بکات و کاتێکی بۆ نامێنێتەوە کەبتوانێت زانستەکانی زمانی عەرەبی فێربیێت، زانستێك کوەك یەکێك لەبناغەو هۆکارەکان دەژمێردرێت، ئەی کەواتە چۆن دەتوانین بگەین بەئەصڵی مەبەست کەبەرهەمی ئەم پیشەکی و هۆکارانەیە، بەلآم خودا هەرکەسێك کەبیەوێت ڕێنمایی دەکات[٢٨٤].

[٢٨٣] (ذالكَ فَضلُ اللهِ يُؤتيهِ مَن يَشاء) س المائدة ئا ٥٩.

[٢٨٤] (يَهدي مَن يَشاء) س المدسر ئا ٣٤.

# بەشی بیست و نۆیەم

## لەبارەی ئەوەی کە کورتکردنەوەی زۆر لەکتێب و دانراوە زانستیەکاندا زیان بەکاری فێرکردن دەگەیەنێت

زۆرێك لەپاشینان سەرقاڵی ئەم شێوازە بوون کەتەریقە و مەبەستی زانستەکانیان کورتکردووەتەوە و بەوپەڕی حەزەوە بەم شێوازە دەستیانکردووتە دانان و کورتکردنەوەی کتێبەکان، کەلەهەرزانستێکدا مەسەلەکانی کورت دەکاتەوە بەجۆرێك هەوڵدەدەن کەکەمترین زاراوەبەکاربهێنن کەزۆرترین مانایان هەبێت و ئەم شێوازەش زیانی بەبەلاغەت و ڕەوانبێژی دەگەیاند و تێگەشتنی بۆ قوتابی و فێرخواز دژوارە. ئەمە سەرەڕای ئەوەش دەستیانکردووە بەکورتکردنەوەی کتێبی امهات (دایکی کتێبەکان) لەهونەرەکانی تەفسیر وبەیاندا و بۆئەوەی بەئاسانی لەبەر بکرێن هەروەك چۆن ئیبن حاجب لەفیقە و ئوصولّی فیقە و ئیبن مالیك لەزانستەعەرەبیەکان و، خونجی لەمەنتیق و نمونەی ئەمانە ئەم کارەیان کردووە واتە کورتیانکردوونەتەوە.

بەلاّم ئەم شێوازە دەبێتە خراپی لەفێربوون و زیانگەیان بەخوێندن، چونکە لەم شێوازەدا مەسەلەی تێکەڵکردن و ئاوێتەبوون بابەتەکان دەسەپێنرێن بەسەر فێرخوازی سەرەتاییداو ئەمە لەکاتێکدا هێشتا ئەو بۆ وەرگرتنی ئامانجی زانستەکان ئامادەباشی تێدا نیە، بەلاّم پێی دەخوێنن‌و ئەمەش لەشێوازە خراپ و نابەجێکانی فێرکردنە هەروەك چۆن لەداهاتوودا باسی دەکەین. سەرەڕای ئەمەش لەم شێوازەدا لەگەڵ هەموونەمانەشدا زەینی قوتابی بەتوندی سەرقاڵی گەڕان دەبێت بەشوێن ئەو زاراوە کورتانەی کەتێگەشتن

لێیان زۆر قورس بوو چونکە ماناگەلێکی زۆر لەو زراوانەدا گونجێنراوە و بەچەندین مانا بەکار هاتوون و دەرهێنانی مەسەلەکان لەنێویاندا ئاستەمە، چونکە دەبینین زاراوەکانی کتێبە کورتەکان بەم هۆیەوە زۆر مانایان ئاڵۆزە و تێگەشتن لێیان زۆر سەختە و دەبینین کەقوتابی و فێرخواز کاتێکی زۆر سەرفدەکات لەتێگەشتن و فێربوونیاندا. سەرەڕای ئەمانەش ئەو مەلەکەیەی کەبەهۆی ئەم کتێبە کورتکراوانەوە بەدەست دێت باوادابنێین کەبەشێوەیەکی پایەدار بێتەدی زیانێکی پێ ناگات، بەنیسبەت ئەو مەلەکانەی کە لەبابەتە دوورودرێژەکانەوە بەدەستدێن بەڵام مەلەکەیەکی کورت و نەشیاو دەبێت، چونکە مەلەکەکانی جۆری دووەم بەهۆی دووبارەبوونەوەی فراوان باسی درێژەوە لەمەسەلەکاندا دێتە دی و ئەوەش دیارە کە دووبارەکردنەوەی فراوان و درێژە پێدانی قسەکان بۆ بەدەستهێنانی مەلەکەی تەواو شتێکی بەسوودە.

وەهەرکات دووبارەکردنەوەی کەم بەبەس بزانرێت ئەوکات بەهۆی کەمیەکەیەوە مەلەکە ناتەواو دەبێت و وەك ئەو هەمووە بابەتە دانراوە کورتانە (دانراوە کورتەکان لەزانستەکاندا) کەمەبەستی دانەرەکانیان ئاسانکاریە لەلەبەرکردنی مەسەلەکانیاندایە بۆ فێرخوازان، ئەمەلەکاتێکدا بەهۆی دوور کەوتنەوەی فێرخوازەکان لەبەدەستهێنانی مەلەکە بەسودەکان و جێگیر بوونیان لەزەینیاندا دووچاری کێشەگەلێکیان دەکات، کەسێکیش کەخودا ڕێنماکاری بێت کەس ناتوانێت گومڕای بکات[٢٨٥]. وەئەوکەسەشی کەخودا گومڕای بکات کەس ناتوانێت ڕینماکارو هیدایەت دەری بێت[٢٨٦].

---

[٢٨٥] (وَمَن يَهدِ اللهُ فَمالهُ من مُضِل) س الزمر ئا ٣٧.

[٢٨٦] (وَمن يُضلِلِ اللهُ فَما لَهُ من هاد). هەمان سورەت ئا ٣٦.

# بەشی سی هەم

## لەبارەی شێوازی ڕاستی فێرکردنی زانستەکان و بەسودترین شێوازی فێربوون

دەبێت ئەوەبزانین کەتەلقین و فێرکردنی زانستەکان بەقوتابی و فێرخوازەکان کاتێك بەسود دەبێت کەپلە بەپلەو بەش بەبەش و کەم کەم بێت و، هەروەك چۆن سەرەتا دەبێت لەهەربابێکی هونەری ئەو مەسەلانەی کەلەئوصولْ و بنەمانی ئەوبێت فێری قوتابی بکرێت و بەشێوەیەکی گشتی بۆ نزیککردنەوەیان بۆ زەینی ئەو شەرحیان بکەن و، لەمبارەیەوە هێزی ئەقلْ و ئامادەباشی ئەو بۆ وەرگرتنی ئەو مەسەلانەی کە بۆ ئەو دەخوێنرێنەوە ڕەچاو بکرێت و تاوەکو سەرئەنجام بگەنە کۆتایی ئەم هونەرەو لەم کاتەشدا بۆ ئەو مەلەکەیەك لەم زانستەدا بەدی دێت، بەلاّم مەلەکەی ناوبراو شتێکی ناسەرەکی و لاوەکیە و ئامانجی ئەم مەلەکەیە ئەمەیە کەئەو بۆ تێگەشتن لەهونەرەکەو بەدەستهێنانی مەسەلەکانی ئامادە بکات و، دیسانەوە دەبێت جارێکی تر بیگێڕنەوە سەرئەو هونەرە و بەلاّم ئەمجارەیان لەتەلقیندا ئەو دەگەیەننە قۆناغێکی بالآتر لەقۆناغی یەکەم و شەرح و بەیانێکی کاملْتری بۆ دەکەن و لەئاستی ئالۆزی گشتی دەردەچن و لەم قۆناغەدا ئەو جیاوازیانەی کەلەهونەرەکەدا هەیە بەباسکردنی بەلْگەوە باسیاندەکەن بۆ ئەوەی بەم شێوەیە بگەنە کۆتایی هونەرەکە.

لەم کاتەدا مەلەکەی ئەو باشدەبێت و دواتر بەڕسوم دەیگێڕنەوە بۆی و لەم قۆناغەشدا ئەو لەسنوری فێرخوازی سەرەتایی دەرچووە و ئەندازێك لەو زانستە

فێربووە.[٢٨٧] هەربۆیە لەم کاتەدا نابێت هیچ بابەتێکی ئالۆز و مانا نادیار و داخراو بەبێ شەرح و تەفصیلی تەواو بخوێنەڕوو، دەبێت هەموو دەرگا داخراوەکانی ئەم زانستە بەڕووی ئەودا بکەنەوە و تاوەکو لەفێربوونی ئەم هونەرە تەواو ببێت و لەکاتێکدا بەتەواوی هەموو مەلەکەکەی بزانێت و زاڵە بەسەریدا.

بەم شێوەیە شێوازی فێرکدرنی بەسود. هەروەك بینیت بەم شێوازە زانست لەسێ جاری دووبارەدا فێری زانستخوازو قوتابی دەکەن بۆ ئەوەی بەدەستی بهێنێت و هەندێك جاریش لەوانەیە بۆ هەندێك کەس بەدەستهێنانی زانست لەماوەیەکی کەمتر لەم سێ قۆناغەشدا ڕوویدات بەپێی ئەو توانایەی کە خودا پێی بەخشیوە و ئاسانکراوە بۆی. (کل میسر لما خلق). وەبینیومانە کەزۆرێك لەمامۆستایانی هاوچەرخمان ئاشنای ئەم شێوازەی فێرکردن و چۆنیەتی سود گەیاندنەکەی نین و، لەسەرەتای فێرکردنەکەدا مەسەلەگەلێکی قورس و دژوار بەقوتابی دەڵێن و داوای لێدەکەن کەزەینی خۆی بۆ حەلکردنیان ئامادەبکات و، وادەزانن ئەم شێوازە جۆرێکە لەڕاهێنان لەفێرکردنداو شێوازێکی دروستە و قوتابی سەرەتایی ناچاردەکات کە فێریان ببێت بەهۆی خوێندنەوەو فێرکردنی ئامانجی هونەرەکان بەقوتابی لەسەرەتای کارەکان و بەرلەوەی کە ئامادە ببێت بۆ تێگەشتنی ئەو لەو جۆرە مەسەلانە زەینی ئالۆز دەکەن و، توشی هەڵەی دەکەن و ئەمە لەکاتێکدا وەرگرتنی وانست و ئامادەباشی بۆ تێگەشتنی بەشێوەیەکی پلەبەپلە بۆ قوتابی دێتەدی و، لەسەرەتادا بەتەواوەتی ناتوانێت لەمەسەلەکان تێبگات و مەگەر لەچەند شوێنێکی کەم و بەپێی خەمڵاندن و بەشێوەیەکی گشتی بەهۆی نمونە هەستیەکانەوە (حسی).[٢٨٨] دواتریش بەردەوام توانای ئەو کەم کەم بەهۆی ئاوێتە بوونی

---

[٢٨٧] لەفێرکردنی پێشینیاندا سێ قۆناغ بوونیان هەبووە: یەکەم: سەرەتایی دووەم: شادی سێیەم: کۆتایی. قۆناغی شادی ئەوەیە کەقوتابی بەشێك لەبنەماو ئوصوڵەکانی زانست فێربووە بەڵام نەگەشتووەتە قۆناغی کۆتایی مەبەستی دانەریش لەبارەی دووەم گەشتنە بەم قۆناغە.

[٢٨٨] ئەم تیۆرە بەتەواوەتی وەك شێوەی نوێی پەروەردە وایە کەفێرکردنی هەستی بەباشتر دەزانێت لەنەزەری.

زەینیەوە لەگەڵ مەسەلەکانی هونەرەکەو دووبارەکردنەوەیان بۆی گەشەدەکات و لەقۆناغی تەخمینەوە دەگاتە قۆناغی جامیعیەت و کەماڵ کە لەپێشترە لەقۆناغی تەخمین و خەملاّندن دەگوازرێتەوە، تاوەکو مەلەکەکەی ئەو لەڕووی ئامادەباشی و فێربوونەوە کامڵ دەبێت و فێری مەسەلەکانی هونەرەکە دەبێت. بەلاّم ئەگەر لەسەرەتای کارەکەوە ئامانجەکانی زانستی فێربکرێت لەکاتێکدا ئەو لەم کاتەدا لەتێگەشتن و لەبەر کردن خودی زانست لەبنەڕەتدا دژوارە لەئەنجامدا لەو جۆرە بابەتانە وازدەهێنێت و دووچاری تەمبەڵی دەبێتەوە و لەوەرگرتنی لادەدات و ئەم بارودۆخەش دەبێتە هۆی جیابوونەوەی ئەو لەفێربوونی زانست، ڕوونیشە کەوەها چۆنیەتیەك بەهۆی خراپی فێر کردنەوە بەدی دێت و باش نیە مامۆستا قوتابی لەوەرگرتن و فێربوونی کتێبێك کەفێری دەکات مەسەلەگەلێکی زیاتری لەتوانای قوتابیەکەو وەرگرتنی بەدەر بێت فێری بکات ئیتر لەکۆتاییەکانی فێرکردندا بێت یان فێرخوازی سەرەتایی بێت.

وەنابێت مەسەلەکانی کتێبەکە لەگەڵ مەسەلەکانی تردا ئاوێتە بکات بۆ ئەوەی بتوانێت بابەتەکانی کتێبەکە لەسەرەتاوە تاوەکو کۆتایی فێریان ببێت ئامانج و مەبەستەکانیان بەدەست بهێنێت و بەهۆی یەوە بەسەر مەلەکەیەکدا زاڵ بێت کەبەهۆیەوە لەغەیری ئەو کتێبەشدا توانا پەیدا بکات، چونکە ئەگەر قوتابی مەلەکەیەکی کەم لەیەکێك لەزانستەکاندا بەدەست بهێنێت بەهۆیەوە بۆ قبوڵکردنی پاشماوەی ئەو زانستەش ئامادەباشی پەیدا دەکات، وەچالاکیەکی لەزیاد خوازی و هیممەتکردن بۆ چوونە قۆناغێکی لەپێشتر لەو قۆناغەزانستیە بۆئەو بەدی دێت تاوەکو سەرئەنجام ئامانجەکانی زانست بەدەست دەهێنێت، بەلاّم ئەگەر مەسەلەکەی لێ تێکەڵ ببێت و زانیاریەکانی لەگەڵ زانیاریەکانی تردا تێکەڵ ببن ئەوا لەتێگەشتن دۆش دادەمێنێت و ماندو دەبێت و ئەندێشەی نامێنێت و لەفێربوون و خوێندن بێئومێد دەبێت و زانست و زانیاریش واز لەو دەهێنێت، خوداش هەرکەسێك کەبیەوێت ڕێنمایی دەکات.[٢٨٩]

---

[٢٨٩] (وَاللهُ يَهدي مَن يَشاء) س ٧٤ تا ٢٤.

وەهەروەها باشتر وایە کەمامۆستا لەیەك هونەر و یەك کتێبدا فێرخواز زۆر ماتڵ نەکات و بەجۆرێك ماوەی نێوان وانەکانی دوور درێژ بێت و قوتابیەکە بابەتەکانی لەبیر بچێتەوە، هەربۆیە بەدیهاتنی مەلەکە بەهۆی بڵاوی بابەتەکانەوە زۆر دژوار دەبێت. وەهەرکات سەرەتاو کۆتایی زانست لەزەیندا ئامادەبێت و دوور بێت لەلەبیرچوونەوەوە، ئەوکات مەلەکە ئاسانتر دەبێت و پەیوەندی بەهێزتر دەبێت و شێوەی لەزەیندا باشتر دەنەخشێت، چونکە مەلەکەکان لەئەنجامی پەیاپەی بوونی کردار و دووبارەبوونەوەیدا بەدی دێت وەهەرکات کارەکە لەبیر بچێتەوە ئەومەلەکەیەشی کەلەوەوە سەرچاوە دەگرێت لەبیر دەچێتەوە.

خوداش ئەوەی کەنەتاندەزانی فێری ئێوەی کرد[٢٩٠] وەلەوشێوازە باشانەی کەلەفێرکردندا پێویستە بریتیە لەوەی کەهەردووزانستەکە بەیەکەوە فێری قوتابی نەکرێن چونکە ئەم لەم کاتەدا کەمتر دەکرێت لەهیچکامیاندا سەرکەوتوو بێت، چونکە لەوکاتەدا دەبێت زەینی خۆی دابەشبکات و لەتێگەشتنی هەریەکە لەبری ئەویتر دووری بخاتەوە. هەربۆیە هەردوو زانستەکە بۆ ئەو داخراوو پرکێشە دەبوون و بەو هۆیەوە بێئومێدی ڕووی تێدەکات و، بەڵام ئەگەر ئەندێشە بۆفێربوونی ئەوە بێت کەئەم عەودالیەتی سەرقاڵبێت و بەخڵی بیهێڵێتەوە ئەوکات هەرچەندە کەئەم شێوازە بۆ خوێندن و فێربوونی ئەو شایستە تر دەبێت. وەخودا سبحانە وتعالی یارمەتیدەری ئادەمیزادە بۆ سەر ڕێگەی ڕاست.

---

[٢٩٠] (عَلَّمَكُم مَّالَم تَكُونُوا تَعلَمُون) س البقرة ئا ٢٤.

## بەشێك

وەئەی قوتابی ئەوەبزانە کەمن لەڕێگەی فێرکردندا سودێك بۆ تۆ بەدیاری دەهێنم کەئەگەر بەقبوڵەوە وەری بگری و بەهێزەوە دەستی پێوە بگری، ئەوا گەنجینەیەکی گەورە و بەنرخ و شەریف بەدەستدەهێنی، هەربۆیە سەرەتا پێشەکیەك باسدەکەم کەلەتێگەشتندا یارمە تیت دەدات. ئەوەش ئەمەیە کە ئەندێشەی ئادەمیزاد سروشتێکی تایبەتی هەیە کەخودا ئەوی وەك هەموو ئافرێنراوەکانی خۆی دروستی کردووە ئەوەش بریتیە لەکردارو جوڵەیەك کەلەنەفسدا بەهۆی ناخی ناوەڕاستی دەماخەوە ڕوودەدات، کەهەندێکجار سەرەچاوەی کردارە ڕێك و پێکەکانی مرۆڤە هەندێك جاریش سەرچاوەیە بۆ زانینی شتێك کەهێشتا لەزەیندا بەدی نەهاتووە بەجۆرێك کەگرنگی بەشتەخوازراوەکە دەدرێت و هەردوو سەری وێنە دەگرێت و، نەفی یان ئیسباتی دەکات و دواتریش ناوەڕاستێن کەلەنێوان ئەو دوانەدا کۆدەبێتەوە و لەچاو خێراتر لەپێکداداندا دەدرەوشێتەوەو، ئەمەش لەکاتێکدایە کەیەکێك بێت وەئەگەر زۆربن ئەوا دەچێت بۆ بەدەستهێنانی ناوەڕاستینێکی تر و مەبەستی خۆی بەدەستدەهێنێت. بەم جۆرەیە کاری ئەم تەبیعەتە ئەندێشەیەك کەمرۆڤ بەهۆیەوە لەگیانەوەرانی تر جیادەبێتەوە.

لەپاشان دەبێت ئەوەبزانین کەصەناعەتی مەنتیق چۆنیەتی کرداری فیقه نیشاندەدات و وەسفی دەکات بۆ ئەوەی ڕاستەکەی لەهەڵەجیابکاتەوە، چونکە هەرچەندە باشی لەزاتی ئەودایە بەڵام هەندێك جاریش بەشێوەیەکی دەگمەن هەڵ ڕوودەدات بۆی و ئەم هەڵەیەش یان بەهۆی تەسەووری هەردوولایە مەسەلەکەیە لەسەر شێوەیەك بێجگە لەشێوەی ئەصڵی ئەوان دێتەدی، وەیان بەهۆی هەڵەوەیە لەشێوەکانی ڕێکخستنی مەسەلەکان و

تەرتیب کردنیاندایە لەکاتی دەرئەنجامدا ڕوودەدات لەم کاتەشدا بۆ ڕزگار بوون لەگێژاوی ئەم خراپەیە، ئەگەر بێتە پێشەوە، سود لەمەنتیق وەردەگیرێت، کەواتە مەنتیق شتێکی صەناعیە و بەرەو سروشت و تەبیعەتی فیکریمان دەبات و بەسەر شێوەی کرداریەکەیدا جێبەجێ دەبێت، لەو ڕووەوەی کە مەسەلەیەك صەناعیە بەزۆری پێویستیان پێی نابێت، هەربۆیە دەبینین کەزۆرێك لەگەورەکانی خاوەن بۆ چوون بەبێ ئەوەی ئاشنای مەنتیق بن مەبەستە زانستەکانیان دەستدەکەوێت بەتایبەت کاتێك کەبەنیەت و مەبەستی ڕاستو پشت بەستن بەڕەحمەتی خودا ڕوویکەنە زانست، چونکە ئەم شتە دەبێتە گەورەترین یارمەتیدەری ئەوان.

ئەمەیە کەبەپێی تەبیعەتی فیکری بەهێزی خۆیان ڕێگەی زانست دەبڕن و بەشێوەیەکی سروشتی شێوازی ئەوان بەبەدەستهێنانی وەسەت و ئاگایی لەمەبەست کۆتایی دێت هەروەك چۆن خودا لەسەر ئەم سروشتە دروستیکردووە. دواتریش دەبێت ئەوە بزانین کەسەرەڕای ئەم مەسەلە صەناعیەی کەبەمەنتیق ناسراوە بۆ فێربوونی پێویستی بەپێشەکیەکی تر هەیە کەبریتیە لەناسینی زاراوەکان و دەلالەتەکانیانە لەسەر مانا زەینیەکانیان، کەبەهۆی خوێندنەوەی شێوازە نوسینەکانەوەو تەلەفوزەوە لەکاتی قسەکردندا دێت بەسەر زەیندا، کەواتە تۆ ئەی فێرخواز بەناچاریەوە دەبێت لەهەمووقۆناغەکانی ئەم پەردانە تێپەڕبکەیت و بگەیتە ئەندێشەی خوازراوی خۆت. کەواتە سەرەتا دەبێت ئاشنای دەلالەت و شێوە و شێوازەکانی نوسین لەزاراوەکانی قسەکردندا ببیت، ئەمەش ئاسانترینی قۆناغەکانەو دواتریش دەلالەتی زاراوە زارەکیەکان بەسەر مانا خوازراوەکاندا فێر ببیت و، دواتریش یاساکانی تەرتیبکردنی ماناکان لەقاڵبە ناسراوە کانیاندا بۆ بەڵگە هێنانەوە فێرببیت کەلەصەناعەتی مەنتیقدا بەکار دەهێنرێن. لەپاش ئەویش مانا تاکەکان لەئەندێشەدا هەروەك داوگەلێك دابنێیت تاوەکو بەهۆیانەوە خوازراو بەپێی تەبیعەتی فیکری و پشتبەستن بەڕەحمەتی خوداو بەخششەکانی ئاشکرا ببێت. هەرکەسێکیش ناتوانێت لەم قۆناغانە بەخێراییەوە بگوزەرێت و ئەم پەردانە

بەئاسانی لاببات و مەبەست و ئامانجەکەی بەدەست بهێنێت، بەڵکو هەرچەندە کەزەین بەهۆی موناقەشەوە لەبەردەم پەردەکانی ئەلفازدا دۆش دادەمێنێت یان بەهۆی حەماس و غەوغای موجادەلە و شوبهەکانەوە دەکەوێتە داوی بەڵگەکانەوە و لەئەنجامدا لەبەدەستهێنانی مەبەستەکەیدا بەجێ دەمێنێت، تەنها بێجگە لەگروپێکی کەم نەبێت کەخودا ڕێنماییان دەکات وەگەرنا کەم کەسانێك لەم گۆماوە ڕزگاریان دەبێت. کەواتە هەرکاتێك دووچاری وەها چارەنوسێك ببیت و لەبابەتەکان تێنەگەیت شوبهە و گومانت لەلادروست ببێت و زەینت سەرقاڵ بکات، ئەوکات هەموویان بخەرەلاوە پەردەکانی ئەلفاز و ڕێگریەکانی شوبهەکان بخەرە کەنارەوە و مەسەلە صەناعیەکە بەگشتی وازلێبهێنە و ئازادانە و بەبێ هیچ غەل و غەشێك بەرەو گۆڕەپانی ئەندێشەی تەبیعی کەلەسەری ئافرێنراوی ئاگاداربەو، نەزەری خۆت لەو مەیدانەدا بخەرە جوڵە و بۆ چوونە ناو قوڵایی ئەو دەریافراوانەوە و گەڕان بەدوای مەبەستدا تەنها لەودا زەینت جێگیر بکەو، ئەو ڕێگەیەی کەخاوەن نەزەرەگەورەکانی پێش تۆ گرتوویانە بەشوێنیدا بڕۆو پشت بەدەروی خێری خودا ببەستە، هەروەك چۆن خودا دەرگاکانی زانستی بەڕووی ئەواندا بەڕەحمەتی خۆی کردووەتەوە و ئەوەی کەنەیاندەزانی فێری کردن.[۲۹۱]

کەواتە ئەگەر ئەم شێوازە هەڵبژێری نورەکانی فراوانی لەلایەن خوداوە بۆ بەدەستهێنانی مەبەست بەردەمت ڕووناك دەکەنەوە مەسەلەی وەسەتی کەخودا بەپێویستی ئەم ئەندێشەیەی داناوە و هەروەك گوتمان بۆئەم ئەندێشەی ئافراندووە ئیلهام بەتۆ دەبەخشێت. وەلەو کاتەدا ئەو ئەندێشەیە لەقاڵب و شێوەکانی بەڵگەدا بڕێژەو حەقەکەی لەیاسای لەیاسای صەناعیدا ئەدا بکە دواتریش شێوەی لەفزەکانی لەبەربکە و بەبنیاتێکی دروست بۆ جیهانی قسەکردن و گفتوگۆ ئاشکرا بکە.

بەلأم لەکاتی موناقەشەی ئەلفازەکان و شوبهە لەبەڵگە صەناعیەکان و کەشفی باشەیان لەخراپە و هەڵە کەشتانێکی صوناعی و وەزعین و لایەنە جۆربەجۆرەکانیان

---

[۲۹۱] (وَعَلمَكُم مَّالَم تَكُونُوا تَعلَمُون) س البقرة ئا ۲٤۰—

بەرابەر دەبن لەڕوانگەی دانانی زاراوەوە وەك یەكن ئەگەر بوەستی، ئەوكات لایەنی حەقیقەتیان ناتوانیت دیاری بكەیت. چونكە حەقیقەت كاتێك دەناسرێتەوە كەبەشێوەیەكی سروشتی بێت و قوتابی ئەو شك و گومانەی كەبۆ ئەو ڕوویداوە، بەردەوام دەبێت و پەردەكان لەبەردەم ئامانجەكەدا دەبنە ڕێگر ناهێڵن هیچ شتێك بەدەست بهێنێت. ئەم شێوازەش شێوازی زۆربەی موتەكەلیمە كانی دواترە بەتایبەت ئەوانەی كەپێشتر زمانیان عەجەمی بووە، ئەوكات زەینیان بەوەدادەخرێت وەیان ئەگەر لەكەسانێك بن كەخوازیاری یاسای مەنتیقین، تەعەصوبیان هەیە بۆی و باوەڕیان وایە كەئەوە بەتەبع هۆكاری ئیدراكی حەقەو ئەوكات لەنێوان شوبهەكان و شك و گومانەكانی بەڵگەكاندا سەرگەردان دەبن و، ڕزگاریان نابێت لێی و ئەمەلەكاتێكدا هۆكاری تەبیعی ئیدراكی حەق هەروەك گوتمان هەمان ئەندێشەیٚ تەبیعیە بەو مەرجەی لەهەموو وەهمەكان داماڵرێن و عەودالٚ پشت بەبەخششەكانی خودا ببەستێت، بەلاّم مەنتیق وەصفدەری كردار و تایبەتمەندی ئەم ئەندێشەیە كەبەزۆری ئەو ڕاپێچ دەكات بەرە و حەق كەوابوو فێرخواز دەبێت پەند لەم خالاّنە وەربگرێت و كاتێك كەتێكەشتن لەمەسەلەكان بۆ ئەو دژوار دەبێت داوای بەخشندەیی خودا بكات، بۆ ئەوەی نوری خودایی بەسەردا ببارێت و ئیلهامی حەقیقەت بەدەست بهێنێت، زانستیش بێجگە لەلای خودا لەهیچ شوێنێكی تر بەدەست نایەت [٢٩٢].

٢٩٢ (إنّما العلمُ عندَالله) س محمد ئا ٢٢ وة س القلم ئا ٢٦.

# بەشی سی و یەك

## لەبارەی ئەوەی کەنابێت نەزەریات و تەحقیقات لەو زانستانەی کە هۆکاری بەدەستهێنانی زانستن فراوان ببێت مەسەلەکانیشیان دەبن بەچەندین بەشی جۆراو جۆرەوە

دەبێت ئەوە بزانین کە زانستگەلێکی ئاسایی و ناسراو لەنێو نەتەوە شارستانیەکاندا دوو جۆرن: یەکێکیان زانستگەلێکن کەبەزاتی خۆیان مەبەستن وەك زاستە شەرعیەکان لەوانەش تەفسیر و حەدیس و فیقە و عیلمی کەلام و تەبیعیات و ئیلاهیات لەفەلسەفەدا. دووەمیشیان زانستگەلێکن کەهۆکاری فێربوونی زانستە ناوبراوەکانن وەك زانستەکانی زمانی عەرەبی و حیساب و نمونەی ئەمانە بۆ زانستە شەرعیەکان، مەنتیقیش بۆ فەلسەفە، هەرچەندە بەپێی شێوازی پاشینانی مەنتیق هۆکارەکانی عیلمی کەلام و ئوصولی فیقە دەژمێردرێت. بابەتەکانی ئەو زانستانەی کە ئامانج و مەبەستن ئەگەر فراوان بن و مەسەلەکانی ببن بەچەندین بەشی جۆراوجۆرەوەو بەڵگەو نەزەریاتگەلێکی نوێ بۆ ئەوان کەشف ببێت، هیچ باکێك نەبوو چونکە ئەم شتە دەبێتە هۆی ئەوەی کەمەلەکە قوتابیەکانیان جێگیر ببێت مانای مەسەلەکانیان زیاتر ڕوون بکرێنەوە. بەڵام ئەو زانستانەی هۆکاری زانستەکانی ترن وەك عەرەبی و مەنتیق و نمونەی ئەمانە باش نین کەتەنها بێجگە لەمەبەستی ئەوەی کە تەنها هۆکارو ئامێری زانستەکانی ترن موتاڵایان بکەین، پێویست ناکات کەبابەتەکانیان فراوان بکەین یان مەسەلەکانیان بکەین

بەچەند بەشێکی جۆراوجۆرەوە. چونکە وەها شێوەیەك دەبێتەهۆی ئەوەی کەئەوان لەمەبەستی ئەصڵی دەکاتەدەرەوە چونکە مەبەستی ئەمان هەمان کەهۆکارێکن بۆ زانست و بەس. هەربۆیە هەرچەندە ئەوانە لەم شێوازە دەربکەین بەهەمان ئەندازە لەمەبەستی ئەصڵی دەردەچین و ئەوکات سەرقاڵبوون پێیانەوە دەبێتە شتێکی بێهودە، لەگەڵ ئەوەشی کەدەزانین بەهۆی زۆری ماوەی فێر بوونیانەوەو ئەو لقە زۆرانەی کەهەیانە بەدەستهێنانی مەلەکەکەیان زۆر دژوارە.

هەرچەندە کەزانستە ناوبراوەکان دەبنە رێگرێکی بنەڕەتی لەبەردەم بەدەستهێنانی مەبەستدا ئەمەلەکاتێکدا گرنگی زانستە ئەصڵیەکان زیاترە تەمەنی مرۆڤ بەم شێوەی کەهەیە بۆ فێربوونی هەمووئەمانە (هۆکارەکانی زانستی مەقصود بالزات) بەس نین، هەربۆیە سەرقاڵبوون بەم زانستەبنەڕەتیانەوە دەبنە مایەی زایەکردنی زانست و سەرقاڵبوونە بەشتانێکەوە کەبەکەڵکی مرۆڤ نایەن، ئەم بارودۆخەش بەتەواوەتی بەسەر شێوازی پاشیناندا جێبەجێ دەبێت کەلەصەناعەتەکانی نحو و مەنتیقدا و بەڵکو لەئوصوڵی فیقهدا بەکاریان هێناوە، چونکە ئەوان بازنە بەحسیان لەزانستە ناوبراوەکاندا ئیتر لەڕووی نەقڵ یان لەڕووی بەڵگەهێنانەوەوە بێت، فراوانیان کردووە و مەسەلەو بەڵگەگەلێکیان بۆ زیاد کردووە بەجۆرێك لەئاستی بنەڕەتی بوون دەریان هێناون و، وەك زانستگەلێکیان نیشانداون کەلەزاتی خۆیاندا مەبەست و ئامانجن هەرچەندە کەلەواندا دەستیان کردووەتە بەحس و لێکۆڵینەوە کەلەزانست و مەبەست و بنەڕەتدا پێویستی بەوان نیەو، هەربۆیە بەبێهودە دەژمێردرێن و بەهەموو شێوەیەك بۆ قوتابیان زیانبەخشە، چونکە گرنگیدانی قوتابیان بە زانستە بنەڕەتیەکان زیاترە لەم شتە بنەڕەتیو هۆکارانە.

هەربۆیە هەرکات تەمەنی خۆی لەبەدەستهێنانی وەسایلەکاندا سەرف بکات بەچ شێوەیەك و کەی دەگاتە مەبەستی ئەصڵی، هەربۆیە پێویستە مامۆستایان لەم زانستانەدا باوەڕیان بەدرێژەدان بەشتە بنەڕەتیەکان نەبێت و قوتابیان فێری ئامانج و

مەبەستی ئەصڵی بکەن و، لەبەرامبەر مەبەستەکاندا بیانپارێزن و دواتر هەرکات هیممەتی کەسێك تائەندازەیەك حەزی لەڕۆچوون بێت تێیدا و خۆڕاگری و شایستەیی بەرامبەر بەو نیشان بدات، دەبێت ئەو زانستە بۆ خۆی هەڵبژێرێت. وەهەرکەسیش ئامادە بێت ئەو شتەی کەبۆ ئەو ئافرێنراوە و حەزی لەفێربوونیەتی، تائەندازێك لێکۆڵینەوەی تێدا بکات.

# بەشی سی و دوو

## لەبارەی فێرکردنی منداڵان و جیاوازی عەقیدەی خەڵکی شارە گەورە ئیسلامیەکان لەشێوازەکانی فێرکردندا

دەبێت ئەوە بزانین کەفێرکردنی قورئان بۆ منداڵان یەکێکە لەشیعارە دینیەکانە و لەهەموو شارە ئیسلامیەکاندا ئەم ڕێگەیان بڕیوە، هەربۆیە بەهۆی ئایەتەکانی قورئان و هەندێك دەقی حەدیسی عەقیدە ئیمانیەکاندا بەرلەهەموو شتێك لەدڵەکاندا جێگیر دەبێت، هەربۆیە قورئان وەك بناغە و بنەڕەتی فێرکردن دانراوە و مەلەکەکانی تریش دواتر دەبێت قوتابی فێریان ببێت هەموویان لەسەر ئەو دامەزراون. لەو ڕووەوەی کەفێربوون لەمنداڵیدا زیاتر جێگیر دەبێت و وەها فێرکردنێکیش دەبێتە ئەصڵ و پایەی خوێندنی داهاتوو. لەگەڵ ئەوەی کەهەرچیەك کەلەسەرەتادا لەدڵدا دەنەخشێت وەك پایەو بنەمای مەلەکەکان دەژمێردرێت، حاڵ و چۆنیەتی ئەوەی کەلەسەر ئەو بنیات دەنێرێت بەپێی بناغە و شێوازەکانی ئەوە. بەپێی جیاوازی بۆچوونەکانیان لەبارەی ئەو مەلەکانەی کەلەفێربوونەوە بەدی دێن شێوازەکانی موسوڵمانان لەفێرکردنی قورئان بەمنداڵان لەناوچە جۆراو جۆرەکاندا جیاوازە. هەروەك چۆن شێوازی خەڵکی مەغریب بەم شێوەیە کە تەنها فێرکردنی قورئان بەبەس دەزانن و لەوکاتەشدا منداڵان والیدەکەن کەفێری ڕەسمی خەت و مەسەلەکانی و جیاوازی بۆ چوونی قورئان خوێنان ببن و، وەهیچکام لەدانیشتنەکانی وانەکانی ئاوێتەی بابەتەکانی تر ناکەن ئیتر فیقه بێت یان حەدیس یان شیعر یان قسە و گوفتارەکانی تری هەرەب، تاوەکو شارەزایی تێدا پەیدا

بکەن یان لەبەرامبەریەوە بێ توانا بن و واز لەفێربوونی بهێنن، چونکە بەزۆری کەسانێك لەفێربوونی قورئان بەجێ دەمێنن کەبەتەواوەتی واز لەفێبوونی زانست دەهێنن. ئەمەش شێوازی خەڵکی شارەکانی مەغریبەو ئەو بەربەرانەی کەلەناوچەو گوندەکاندا شوێنکەوتەی خەڵکی مەغریبن، بەهەمان شێوە پەیڕەوی لەفێرکردنی منداڵەکانیاندا جێبەجێی دەکەن تاوەکو باڵغ دەبن و دەگەنە تەمەنی لاویەتی.

وەهەروەها ئەم شێوازەش لەتەمەنی گەورەیشدا کەلەپاش تێپەڕینی قۆناغێکی درێژ لەتەمەنیان دەگەڕێنەوە بۆ خوێندن و فێربوونی قورئان و ئەم شێوازە بەکار دەهێنن و، بەهۆی تەمەنەوە لەفێر بوونی ڕەسمی خەت و ئیملای قورئان و لەبەرکردنیدا لەخەڵکانی تر بەتواناترن. بەلاَم شێوازی ئەهلی ئەندەلوس بریتیە لەوەی کەقورئان و کیتاب لەڕوانگەی خوێندنەوە و نوسینەوە فێردەبن و ڕەچاوی ئامانجی خوێندەوار کردن دەکەن، بەلاَم لەو ڕوانگەیەوە کەقورئان ئەصلّ و ئەساسی خوێندنەوە و نوسین و سەرچاوەی زانستەکان و ئاینە، هەربۆیە کردوویانەتە ئەصلێك بۆ فێربوون هەربۆیە تەنها فێربوونی قورئانیان بەبەس نەزانیوە بەڵکو لەفێرکردنی منداڵەکانیاندا مەسەلەگەلێکی تری تێکەڵ دەکەن وەك: گێڕانەوەی شیعر بەشێوەیەکی زۆرتر و تەڕەسول و لەبەر کردنی یاساکانی زمانی عەرەبی و خۆشنووسی و نوسین و گرنگیدانیان لەفێرکردندا تەنها تایبەت نەبوو بەقورئانەوە، بەڵکو گرنگیشیان لەم بوارەدا لەهەمووشتەکان زیاتر بەخەت دەدا. مەبەستی ئەوان ئەوەیە کەکاتێك منداڵ لەتەمەنی باڵغبوونەوە دەگاتە تەمەنی گەنجی و لەوەش تێپەڕدەکات و دەگاتە قۆناغی مامناوەند(شادی) بابەتگەلێك لەبارەی زمانی عەرەبی و شیعرەوە فێردەبێت و، بەصیرەتیان تێدا پەیدا دەکات و لەخەت و نوسینیشدا دەردەکەوێت و بەشێوەیەکی گشتی ئەگەر سەنەدێك بۆ فێربوون هەبێت ئەوا ئاوێتەی دامێنی زانست دەبێت و، بەلاَم ئەندەلوسیەکان لەم قۆناغەدا وازلەفێربوون دەهێنن چونکە لەسەر زەوی ئەواندا سەنەدی فێربوون پچڕاوەو، بێجگە ئەم ئەندازە لەفێربوونی سەرەتایی شتێك لەخەرمانی زانست بەدەست ناهێنن و بۆ کەسێك کەخودای

گەورە ڕێنمایی بکات و بەتوانا بێت و ئەگەر مامۆستایەك بدۆزێتەوە ئەم ئەندازەیەش بەسە. بەلأم خەڵکی ئەفریقا: سەرەڕای قورئان بەزۆریش حەدیس فێری منداڵەکانیان دەکەن و یاسای زانستەکان و هەندێك مەسەلەی زانستیشیان فێردەکەن، بەلأم گرنگیەکی زیاتر بەقورئان دەدەن منداڵان هان دەدەن کەلەبەری بکەن و جیاوازیەکانی ریوایەتو خوێندنەوەیان فێردەکەن.

دوای قورئانیش گرنگی بەخەت دەدەن و بەکورتی تەریقەی ئەمان لەفێرکردنی قورئاندا زیاتر لەتەریقەی ئەندەلوسیەکانەوە نزیکە، چونکە لەم بوارەدا سەنەدی تەریقەتی ئەوان پەیوەستە بەمەشایخی ئەندەلوسەوە. ئەوان کەلەکاتی زاڵبوونی مەسیحیەکان بەسەر خۆرهەلأتی ئەندەلوسدا لەو ولأتەوە کۆچیانکرد بۆ ناوچەکانی ئەفریقاو لەتونس جێگیر بوون و منداڵانی ئەفریقا لەوەبەدواوە قورئان لەوانەوە فێربوون. بەلأم خەڵکی مەشرق: بەپێی ئەو هەواڵانەی کەبەئێمە گەشتووە کەئەوانیش لەفێرکردندا چەندین بابەت ئاوێتەی یەکتری دەکەن و نازانم زیاتر گرنگی بەکامیان دەدەن. هەربۆیە ئەوەی کەبۆ ئێمەی دەگێڕنەوە گرنگی ئەوان دەردەخات لەتەمەنی لاویەتیدا بۆ قورئان کتێبە زانستیەکان و یاساکانی و فێربوونی ئەم قۆناغە تێکەڵ بەفێربوونی خەت ناکەن و، بۆ فێربوونی خەت یاساو مامۆستای تایبەتیان هەیە کەبەجیا خەت وەك صنعەتەکانی تر فێردەبن و، فێرکردنی خەت لەقوتابخانە منداڵانەکاندا ئەنجام نادەن وەکاتێك کەئەلواح لەقوتابخانەکاندا بۆ منداڵان دەنوسن بەخەتێکە کەلایەنی هونەری جوانی تێدا نیەو، کەسێك کەبیەوێت فێری خەت ببێت بەپێی ئەو هەوڵەی کەلەپاش قۆناغی سەرەتایی دەیدات دەبێت بواری ئەوەی هەبێت لەخاوەنەکانی ئەو صنعەتەوە فێری ببێت. بەلأم ئەو دەرئەنجامەی کەخەڵکی ئەفریقاو مەغریب لەشێوەی فێربوونی خۆیانەوە وەریان گرتووە و تەنها فێربوونی قورئانیان بەبەس زانیوە بریتی بووە لەوەی کە بەتەواوەتی لەفێربوونی مەلەکەی زمانی عەرەبیدا بێتوانابوون، چونکە لەقورئانەوە بەزۆری مەلەکە بەدی نایەت لەو ڕووەوەی کەمرۆڤ لەهێنان وەك خۆی لادەدات هەربۆیە ئەمان

لەبەکارهێنانی شێوازەکانی قورئان و پەیڕەوی لەچۆنیەتیەکەی بەتەواوەتی ناکەن و نەتەوە ناوبراوەکان بێجگە لەقورئان لە شێوازەکانی تریشدا هیچ مەلەکەیەکیان نیە. هەربۆیە ئەو کەسانەی کەبەم شێوەیە پەروەردە و فێردەکرێن هیچ مەلەکەیەکیان لەزمانی عەرەبیدا بۆ دروست نابێت و بەهرەیان بێجگە لەبەستن لەدەستەواژەکان‌و هەندێك دەستیوەردان لەقسەدا شتێکی تر نیەو، هەرچەندە کە باری خەڵکی ئەفریقا لەم بارەیەوە بەبەراورد بەخەڵکی مەغریب سوکترە، چونکە هەروەك گوتمان لەگەڵ فێربوونی قورئانیشدا هەندێك لەدەستەواژەی یاسای زانستەکانیش فێری منداڵان دەکەن لەم ڕووەوە تائەندازێك توانایەکی باشیان هەیە بەسەر دەستەواژەکانداو وەك نمونە وان، بەڵام مەلەکەی ئەمان لەبەلاغەتدا کەموکورتە چونکە زۆربەی لەبەرکردنەکانیان دەستەواژەی زانستەکانەو کەلەقۆناغی خوارەوەی بەلاغەتدایە، هەروەك دواتر لەبەشەکانی تایبەت بەوەوە باسی لێوە دەکەین.

بەڵام سودو ئەنجامی شێوازی فێرکردنی خەڵکی ئەندەلوس کەخاوەن چەند جۆریە و لەسەرەتای خوێندنەوە ئەندازێکی زۆر لەشیعر و تەڕەسول فێری منداڵان دەکەن و زمانی عەرەبیان پێدەڵێن، هەربۆیە مەلەکەیان بۆ دروستدەبێت و ئاگادارترو شارەزاترن لەزمانی عەرەبیدا و لەزانستەکانی تردا کۆڵن، چونکە لەخوێندنی قورئان و حەدیسدا کەبە بناغەو ئەصڵی زانستەکان دەژمێردرێن دوورن و، هەربۆیە بەپێی ئەوەی کەلەپاش پلەی فێربوونی منداڵان (سەرەتایی) ئەگەر دووەمیش بێت یان نا لەخەت و ئەدەبدا شارەزا یان نەشارەزان، هەربۆیە قازی ئەبوبەکری بن عەرەبی لەکتێبی سەفەرنامەکەی خۆیدا باوەڕی بەشێوەیەکی سەرسوڕهێنەر هەبووە لەفێرکردندا و لەمبارەیەوە ئەوە دووبارە دەکاتەوە سەرلەنوێ دەستی پێدەکاتەوە. ئەو فێربوونی شیعر و زمانی عەرەبی بەلەپێشتر زانیوە لەهەموزانستەکان هەروەك چۆن شێوازی خەڵکی ئەندەلوسیش بەم شێوەیە و دەڵێت: لەبەر ئەوەی کەشیعر دیوانی عەرەبە واپێویست دەکات لەگەڵ ڕیزمانی عەرەبیدا بەلەپێشتریان بزانین و فێرکردنی قەواعیدی عەرەبی لەبنەماکانی فێرکردندا زۆر پێویستە

تاوەکو ڕێگری لەخراپبوونی زمان بگیرێت و دواتریش دەبێت قوتابی ناچار بکرێت کەحیساب فێرببێت و تەمرینی تێدا بکات و یاساو ڕێساکانی فێر ببێت. دواتریش پێویستە ئاشنابکرێت بەخوێندنەوەی قورئان چونکە بەم پێشەکیانەوە خوێندنی قورئان بۆ قوتابی ئاسانتر دەبێت. دواتر دەڵێت: خەڵکی وولاتی ئێمە توشی چ بێئاگاییەك بوون کەمنداڵ لەسەرەتای منداڵیەوە ناچار بەفێربوونی قورئان دەکەن، شتێك کەلێی تێناگات دەیخوێنێت و لەشتێکدا نارەحەتی دەچەژێت کەمەسەلەگەلێکی لەو گرنگتر هەن کەفێریان ببێت.

وەدەڵێت: دواتریش دەبێت قوتابی ئوصوڵی دین بخوێنێت و دواتریش ئوصوڵی فیقە و لەپاشانیش ئاشنای زانستی جەدەل بێت و سەرقاڵی حەدیس و زانستەکانی بێت. لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا ئەو ڕێگری لەفێر بوونی دووزانست بەیەکەوە دەکات مەگەر ئەوەی کەفێرخواز بەهۆی زیرەکی و بیر تیژیەوە شایستەیی تێدا بێت. ئەمەیە ئەو شێوازەی کەقازی ئەبوبەکر ئاماژەی پێکردووە دەتوانین سوێند بخۆین کە شێوازێکی پەسەندیدەیە. بەڵام نەریت ئامادەباشی قبوڵکردنی ئەم شێوازەی تێدا نیەو نەریتەکانیش زیاتر وەك حاڵەتە باوەکانن و هۆکاری ئەوەش کەنەریتەکان بەم جۆرەن کە فێربوونی قورئانیان بەلەپێشتر زانیوە لەهەموزانستەکانی تر لەڕووی هەڵبژاردنی تەبەڕك و خێرەوەیە هەمیش لەبەر ئەوەیە کەنەوەك بەهۆی فێربوونی زانستەکانی غەیری قورئانەوە منداڵەکانیان لەقورئان دوور بکەونەوەو، بەرە و هەڵدێر بچن و واز لەخوێندن بهێنن چونکە منداڵ تا کاتێك لەژێر چاودێری باوك و دایکدایە گوێڕایەڵیان دەکات، بەڵام کاتێك لەقۆناغی باڵغبوون تێپەڕبکات و، لەژێر فەرمانی دایك و باوکی دەربچێت و لەخۆبایی بوونی لاویەتی دەیخاتە زۆنگاوی تەممەڵیەوە، هەربۆیە ئەو ماوەیەی کەمنداڵ لەژێر فەرمانی دایك و باوکیدایە بەفرسەتی دەزانن کەفێری خوێندنی قورئانی بکەن بۆ ئەوەی نەوەك ئەم قۆناغە تێپەڕ ببێت و لەم مەسەلەیەدا دەستخەڕۆو نەدار بێت. بەڵام ئەگەر یەقینمان لەبەردەوامی خوێندنی منداڵ هەبێت لەوە دڵنیا بینەوە کەفێرکردن

قبوڵدەكات. ئەوكات عەقیدە و شێوازەكەی قازی ئەبوبەكر شایستەترین شێوازێكە كە خەڵكی مەشریق و مەغریب وەریانگرتووە، بەڵام خودا هەرچیەك كەبیەوێت حوكم دەكات و هیچكەسێكیش ناتوانێت حوكمەكەی ڕەت بكاتەوە[٢٩٣].

[٢٩٣] (وَاللهُ يَحكُمُ وَلا مُعَقِّبَ لِحُكمِهِ) س الرع ئا ٤١.

# بەشی سی و سێ

## لەبارەی ئەوەی کە توندی و سەختگیری لەبەرامبەر فێرخوازاندا زیانی هەیە بۆیان

چونکە توندی و فشارکردن لەفێربووندا بۆ قوتابی زیانی هەیە بەتایبەت لەمەلەکەی ئامادەباشی (استعداد) ی مندالآن و تازە فێرخوازان کاریگەری خراپی دەبێت و، هەریەکە لەقوتابیان یان خزمەتکاران ئەگەر بەشێوەیەکی ستەم و زۆر پەروەردەبکرێن زۆرو ستەمەکە بەسەریاندا زاڵدەبێت و بێزراویاندەکات و فراوانی نەفسیان تەسك دەکاتەوە و و چالاکیان لەناودەبات و بەتوند خوویی پەروەردە دەبن و بەرەو تەمبەڵیان دەبات و درۆو قسەی نابەجێیان فێردەکات. درۆو پیسی و نابەجێیی بریتیە لەوەی کەبەدەم شتێك بڵێیت و بەدڵ وانەبێت ئەمەش لەترسی ئەوەی نەوەك دەستدرێژی و ستەمیان لێبکرێت هەربۆیە توشی فێڵ و درۆدەبن و ئەم سیفەتانەش دەبنە خووتێیاندا و لەئەنجامی شارنشینی و بەسەر بردنی ژیان لەکۆمەڵگەدا سیفەتە مرۆییەکانی وەك: جوامێری و بەرگریکردن لەخۆو ماڵ و سامانی تێدا نامێنێت و نەفسی ئەو لەبەدەستهێنانی فەزیلەتەکان و سیفەتە جوانەکاندا سست دەبێت و، تەمبەڵ دەبێت و لەئەنجامدا لەئامانجو مەبەستی مرۆیی خۆی لادەدات و سنوردار دەبێت و سەرئەنجام سەرنگون دەبێتو دووچاری پەسترینی گێژاوەکان دەبێت وەهەروەها حاڵی هەرنەتەوەیەکیشە کەدووچاری ستەمگەری و زۆرگوتن ببێتەوە.

وەئەم چۆنیەتیەش لەهەرکەسێکدا کەخەڵکانی تر زاڵبن بەسەریدا و پیاوانی دەوڵەت ئەرکی ژیان و گوزەرانی بگرنە ئەستۆو لەگەڵیدا بن دەبنە پەندو ئامۆژگاری و دەتوانین بەشێوەیەکی بەدواداچوون لەم جۆرە کەسانەدا بدۆزینەوە. بەتێڕوانین لەنەتەوەی یەهود ئەم بانگەشەیە دەسەلمێت چۆن بەهۆی ئەم چارەنوسەوە دووچاری خوی خراپ و ناپەسەند بوونەتەوە و لەهەموو سەردەم و هەرسەرزەویەکدا وەسفدار دەکرێن بەخەرج و مانای ووشەکەش لەزاراوەی بەناوبانگدا ئەوە نیشاندانی پیسی و فێڵە هۆکارەکەشی هەرئەوەیە کەباسمانکرد. هەربۆیە باش وایە کەمامۆستا بەرامبەر بەقوتابیەکەی و باوك بەکوڕەکەی لەمەسەلەی تەئدیبدا شێوازی ستەمکردن نەگرنەبەر.

هەروەك چۆن محمدی کوڕی ئەبو زەید لەو کتێبەی کەلەبابەتی مامۆستاو فێرخوازاندا نوسیویەتی دەڵێت: باش نیە کەمامۆستاو پەروەرشیاری منداڵان ئەگەر پێویستی بەتەنبیێ کردنی جەستەیی منداڵان هەبێت دەبێت زیاتر لەسێ قامچی لەتەئدیبەکەدا بەکار بهێنێت. لەقسەکانی حەزرەتی عومەرە کەدەفەرمێت: کەسێك کەشەرع تەئدیبی نەکات خوداش تەئدیبی ناکات، ئەم قسەیە لەڕوانگەی پەیوەندی ئەوەوە بە پاراستنی نەفسەکان لەزەلیلی بریتیەلە تەئدیب وەهەم لەبەر ئەوەی کە ئەو ئاگادار بووە، کە هەمان ئەندازە ئەو تەئدیبەی کەلەشەرعدا دیاری کراوە تەربیەتی تاك زامن دەکات چونکە شەرع ئاگادارترە بە بەرژەوەندیەکانی خەڵکی. لەباشترین شێوازەکانی فێرکردن گوفتارێکەکە ڕەشید بۆمامۆستای کوڕەکەی (خلف احمر) دەڵێت: ڕەشید بۆ تەئدیبی کوڕەکەی محمدئەمین کەسێکی ناردەلای من و گوتی ئەی ئەحمەر ئەمیر المومنین جگەر گۆشەی خۆی بەتۆ سپاردووە دەستی توانای تۆی فراوانکردووە و گوێڕایەڵی تۆ بۆ ئەو واجبە، کەواتە بۆ ئەو بەوجۆرە بە کەئەمیرالمومنین تەکلیفی کردویت: قورئانی بۆ بخوێنەو مێژووی عەرەب و عەجەمی فێربکەو شیعری بۆ بگێڕەرەوەو، حەدیسی فێربکەو شێوازەکانی ئاخاوتن و ڕەوانبێژی فێربکە و بێجگە لەکاتی گونجاودا نەبێت مەهێڵە هێندە گاڵتە و گەپ بکات و پێبکەنێت و فێری ڕێزگرتنی بکە لەمەشایخەکانی بەنی هاشم کاتێك

دێنەلای و، ئەوەی یاد بخەرەوە کاتێك سەرکردەکانی سوپا دێنەلای بارێزیان لێبگرێت و لەشوێنێکی بەرزترو لەپێشتردا دایانبنێت و هەرکاتژمێرێکیش کەتێدەپەڕێت بەسەرتدا بەدەستکەوتی بزانە کەسودێك بەو بگەیەنیت و بەبێ ئەوەی خەمباری بکەیت و زەینی بمرێنی هێندە ماوە و کاتی پشووی پێ مەدە کە بێکاری بەشیرین بزانێت و خوی پێوە بگرێت و، هەرچیەك دەتوانی لەگەڵیدا بەشێوەیەکی دڵدانەوە و نەرمخوویی ڕەفتار بکە. وەئەگەر لەم شێوازە سەرپێچی بکات ئەوکات بەپێی پێویست سەختگیری بەکار بهێنە.

# بەشی سی و چوارەم

## لەبارەی ئەوەی کە گەشتوگوزار بۆ بەدەستهێنانی زانست و بینینی مەشایخ ( مامۆستایان ) کامڵبوونی فێرکردن زیاد دەکات

هۆکارەکەشی ئەوەیەکە مرۆڤ مەعاریف و ئەخلاق و مەزهەب و فەزیلەتگەلێك کەموماڕەسەیان دەکات هەندێك جار لەڕێگەی فێربوون و زانستەوە فێریان دەبێت و هەندێك جاریش بەشێوەیەکی چاولێکەری و ئامادەبوون لەکۆڕو کۆبوونەوەی وانەکاندا فێریان دەبێت. بەڵام ئەو مەلەکانەی کەبەشێوەیەکی ڕاستەوخۆو بەتەڵقین بەدی هاتبن بەهێزتر دەبن، کەواتە مەلەکەکان بەپێی زۆری مەشایخەکان دێنەدی و جێگیر دەبن. وەزاراوەکانیش لەفێربووندا دەبنە هۆی هەڵەی فێرخواز بەجۆرێك وادەزانن ئەوانەش بەشێکن لەزانست و ئەم هەڵەیەش لەفێرخواز دوور ناکەوێتەوە، مەگەر ئەوەی کە خۆی لەخزمەت مامۆستاکەیدا سود وەربگرێت، چونکە هەریەکە لەمامۆستاکان شێوازی تایبەت بەخۆیان هەیە لەزاراوەی زانستەکاندا هەربۆیە دیداری زاناو مەشایخەکان لەڕووی ناسینەوەی زاراوەکانەوە بۆ فێرخواز زۆر بەسودە، چونکە لەم دیدارانەدا جیاوازی شێوازەکانیان لەزانستدا دەبینێت لەئەنجامیشدا زانست لەزاراوەکان جیادەکاتەوە و لەوە تێدەگات کەزاراوە ناوبراوەکان ڕێگەکەلێکن بۆ فێرکردن و شیوازەکانی گەشتن بەزانستو هێزەکانی بۆ جێگیر بوون لەمەلەکەکاندا ڕادەپەڕێنرێن و زانیاریەکانی ڕاستدەکرێتەوە و مەعریفە جۆراو جۆرەکان لەیەکتر جیادەکاتەوە و لەهەمان کاتدا مەلەکەکانی بەهۆی عادەتکردنەوە بەئامادەبوون لەکۆڕوکۆبوونەوەی وانەی مامۆستاکان و سود وەرگرتن

لەڕاسپاردەکانیان و بینینی ئەو هەمووە مامۆستاو مەشایخە جۆراو جۆرە بەهێزدەبێت، ئەم ئەنجامانەش بۆ کەسێکە کە خودا ڕێگەکانی ڕێنمایی و زانستی بۆ ئەو ئاسان بکات و ئەوکات دەبێت بۆ بەدەستهێنانی زانست سەفەر بکات گەشت بکات بەشوێنە جۆربەجۆرەکانی دونیادا بۆ ئەوەی سودێکی فراوان و کامڵی زانیاریەکان خۆی تەواوبکاتو، دیداری مەشایخ و بینینی پیاوە ناودارەکان بەدەست بهێنێت وەخودا هەرکەسێك کەبیەوێت ڕێنمایی دەکات بۆسەر ڕێگەی ڕاست[٢٩٤]

---

[٢٩٤] (وَاللهُ يَهدِي مَن يَشاءُ إلى صِراطٍ مُستَقِيم) س بقرة تا ١٣٦.

# بەشی سی و پێنجەم

## لەبارەی ئەوەی کە لەنێو تاکەکانی مرۆڤدا زانایان و فەقیهەکان بەبەراورد بەهەموو کەسێك لەبارەی کاروبارەوە سیاسی و شێوازەکانیەوە دوورترن

چونکە ئەمان لەسەر ئەوە ڕاهاتوون کەلەمەسەلە فیکریەکاندا زیرەکیان هەبێت و لەدەریای ماناکاندا ڕۆبچن ولەمەحسوسات و زەیندا جیایان بکەنەوە و وەك شتە گشتیەکانیان لێبکەن، تاوەکو بەشێوەیەکی گشتی حوکمیان بکەن ئەوەك مادە یان بەش یان کەسێك یان نەوەیەکی تایبەت لەبەر چاو بگرن ئەوکات ئەم گشتیە بەسەر شتە دەرەکیەکاندا جێبەجێ دەکەن، وەهەروەها شتەکان بەهاوشێوەکانیان بەپێی شێوەیەك کەلەقیاسی فیقهیدا لەسەری ڕاهاتوون و عادەتیان پێوە کردووە، بەرابەر بکەن و هەموو ئەحکام و تێڕوانینەکانیان بەردەوام لەزەیندایە و ناگاتە قۆناغی جێبەجێ بوون مەگەر لەدوای لێبوونەوە لەباس و ئەندێشە یان ئەوەی کەبەگشتی جێبەجێ نابن، بەڵکو ئەوەی کەلەدەرەوەهەیە لەم کولیات و گشتیە زەینیانە جیادەبێتەوە وەك ئەحکامە شەرعیەکان چونکە ئەوان لق گەلێکن لەپارێزراوەکان لەبەڵگە و کتاب و سوننەتدایە و بەدوایدا دەگەڕێن بۆ ئەوەی ئەوەی کەلەدەرەوە دەستیان دەکەوێت لەگەڵ ئەوانەدا بەرابەریان بکەن و بیانگونجێنن، بەپێچەوانەی تیۆری زانستە ئەقڵیەکان کەبۆ ڕاستیەتی ئەوان هەوڵ دەدەن نەزەریاتە ناوبراوەکان لەگەڵ ئەوەی کەلەدەرەوەدا هەیە جێبەجێ بکەن هەربۆیە ئەمان لەهەموو نەزەریاتەکانیاندا لەسەر شتە زەینی و نەزەریاتە

فیکریەکان ڕاهاتوون و، بێجگە لەشتە ناوبراوەکان هیچی تر ناناسن. ئەمەلەکاتێکدا خاوەنی سیاسەت ڕەچاوی ئەو کاروبارە دەرەکی و ئەو ئەحواڵ و چۆنیەتیانەی کە پەیوەست دەبن پێیانەوە و شوێنیان دەکەون دەکات کەپێویستی پێیان هەیە. چونکە سیاسەت شتێکی شاراوەیە و لەوانەشە تایبەتمەنی تێدا بێت کەنەتوانرێت بەلیکچوو یان نمونەیەك پەیوەست بکەین لەگەڵ ئەو کوللیە زەینیەی کەئەیانەوێت بەسەر ئەواندا جێبەجێی بکەن دژی ئەوانیش بێت.

وەهیچکام لەچۆنیەتیەکانی ئاوەدانی و کۆمەڵگا ناتوانرێت بۆ ئەویتر قیاس بکەین، چونکە هەروەك چۆن لەشتێکی شاراوەدا لێکچوونیان دەبێت لەوانەیە لەشتانێکی تریشدا جیاوازیان لەگەڵ یەکتریدا هەبێت ئەمەیە کەزاناکان بەهۆی ڕاهاتنیان بەگشتی کردنی ئەحکامەکان و قیاسکردنی شتەکان لەگەڵ یەکتریدا ئەگەر بێت و گرنگی بەمەسەلەی سیاسەت بدەن و، مەسەلەکانی لەقاڵب و نەزەریات و ئەندێشەکان و جۆری بەڵگەهێنانەوەکانی خۆیان دەڕێژن و لەئەنجامدا دووچاری هەڵە و کاری نابەجێ دەبن و ناتوانرێت متمانەیان پێبکرێت لەهەڵەدا. وەدەبێت هۆشمەندان و ئەو خەڵکە زیرەکەی کەئەهلی کۆمەڵگە و ئاوەدانین بیانخەینە ڕیزی زانایانەوە چونکە ئەوان بەهۆی ئەو زەینە ڕۆشنەی کەهەیانە وەك فەقیهەکان حەزیان لەڕۆچوونە بەناو دەریای ماناو قیاس و موشابەهەت و لێکچوونەکانەو، لەئەنجامدا دەکەونە هەڵەوە. بەڵام پیاوێکی عامی و نەخوێندەوار کەخاوەنی تەبعێکی تەواوو هۆشێکی مامناوەندە بەهۆی ئەوەی کەفیکری لەم جۆرە قیاس و بەڵگە هێنانەوانە قاصرو کەموکورتە و گوێیان پێنادات و بۆ هەربابەتێك لەکاروبارە سیاسیەکاندا تەنها حوکمی هەمان مادە بەبەس دەزانێت. وەلەهەر دەستەیەکیشدا ئەحواڵ و کەسانێك هەن تەنها لەسەر ئەوەدەچن کەتایبەتکراون پێیەوە و حوکمەکەش بەقیاس یان گشتگیر کردن لەسنورەکەی تێناپەڕێنن لەزۆربەی کاتەکاندا تیۆرو نەزەریاتەکانیان لەمادە هەستپێکراوەکان جیانابنەوە و، بەزەینیاندا هاتوچۆیان پێناکەن هەروەك مەلەوانێك وایە کەلەکاتی شەپۆلەکاندا لەووشکانی دوور

ناکەوێتەوە، شاعیریش دەڵێت: کاتێك مەلەدەکەیت بەهیچ شێوەیەك لەکەنارەکان دوور مەکەوەرەوە چونکە سەلامەتی لەکەنارەکاندایە. هەربۆیە وەها کەسێك لەدیدی سیاسی خۆیدا لەهەڵە بەدوور دەبێت لەهەڵسوکەوت لەگەڵ هاوڕەگەزەکانیدا بۆچوونێکی ڕاستی هەیەو، لەئەنجامدا ژیان و گوزەرانی باش دەبێت و هەموزەرەرو زیانێك بەخۆڕاگری تێڕوانینەکانی لادەبات و لەسەرو هەرخاوەن زانستێکەوە زانایەك هەیە[٢٩٥] لێرەدا ئەوە ئاشکرادەبێت کەصەناعەتی مەنتیق لەهەڵە پارێزراو نیە، چونکە داڕنین و ئینتیزاعی زۆری تێدایە و لەمەحسوسات دوورە، چونکە مەنتیق لەمەعقولاتە دووەمەکاندا باس دەکات و لەوانەشە لەمادەکانیدا شتێك بدۆزرێتەوە کەڕێگری لەم ئەحکامانە بکات و لەکاتی جێبەجێکاری یەقینیدا دژیان بێت، بەلاَم باسکردن لەمەعقولاتە یەکەمینەکاندا کەتەجریدیان نزیکە بەم شێوەنیە، چونکە مەعقولاتە ناوبراوەکان خەیاڵین و شێوەی مەحسوسات و هەستپێکراوەکان لەبەردەکرێن و ڕاستیەتی جێبەجێ بوونیان ڕادەگەیەنن.

---

[٢٩٥] (وَفَوقَ كُلِّ ذِي عِلمٍ عَلِيم) س يوسف ئا ٧٦.

# بەشی سی و شەشەم

## لەبارەی ئەوەی کە زۆربەی زانایانی ئیسلام لەئێرانیەکانن

لەو شتە سەر سوڕهێنەرانەی کەواقیعیەت و حەقیقەتیان هەیە ئەوەیە کە زۆربەی زانایانی نەتەوەی ئیسلام ئیتر لەزانستە شەرعیەکان بێت و، یان لەزانستە ئەقلّیەکاندا و بێجگە لەهەندێك بابەتی کەمدا نەبێت هەموویان غەیرە عەرەبن و ئەگەر کەسانێکیشیان هەبن کەبەڕەگەز عەرەب بن، بەلاّم لەڕووی زمان و مەشایخ و مامۆستایانەوە عەجەمین، لەگەلّ ئەوەی کە دین و خاوەنی شەریعەت عەرەبیە. وەهۆکارە کەشی ئەوەیە کەلەسەرەتای دەرکەوتنی ئەم مەزهەبەوە بەپێی داخوازی ئەحوالّی سادەیی و دەشتەکیەتی لەنێو نەتەوەی ئیسلامدا زانست و صەناعەتێك بوونی نەبووە، بەلّکو ئەحکامەکانی شەریعەت تەنها بریتی بوون لەئەمرو نەهیەکانی خودا کەزاناکان لەسینەی خۆیاندا پاراستوویانە و نەقلّیانکردووە. وەدەیانزانی سەرچاوەی وەرگرتنی ئەو ئەحکامانەکتاب سوننەتە، چونکە ئەوانیان لەخاوەنی شەرع و خاوەنانیەوە وەریان گرتوون، بەلاّم لەو سەردەمەدا ئەو هۆزە (صەحابە) دەشتەکی بوون و ئاشنای فێربوون‌و تەدوین و نوسین نەبوون هیچ شتێك وای لیّ نەکردبوون ئەو شتانە فێر بین و سەردەمی صەحابەو تابیعین، بەم شێوەیە بەردەوام بوو ئەو کەسانەی کەبەتایبەت قورئانیان دەزانی و نەقلّیان دەکرد بەقوڕا ناسرابوون واتە ئەوانەی کەقورئان (کتاب) دەخوێننەوەو ئەوانە نەخوێندەوارو ئومی نەبوون چونکە لەو سەردەمەدا لەنێو صەحابەدا نەخوێندەواری بەیەکێك لەسیفەتەکانی ئوممیەت دەژمێردرا چونکە ئەوان

لەعەرەبە دەشتەکیەکان بوون ناونانی قورئان خوێنان بەقوڕا ئاماژەیەك بوو بەبوونی ئەم ئوممیەتە چونکە ئەم قوڕائانە گوازەرەوەی قورئان بوون لەخوداوە بۆ خەڵکی و ئەحکامی شەرعیەکانیان تەنها لەقورئان و حەدیسەوە وەردەگرت حەدیسیش لەزۆربەی کاتەکاندا وەك ڕوونکەرەوە و تەفسیر وابوو بۆ قورئان.

پێغەمبەر (ص) فەرمووی: (دووشتم بۆ ئێوە لەپاش خۆم بەجێ هێشتووە ئەگەر بێتو پابەندبن پێیانەوە هەرگیز گومڕا نابن ئەوانەش بریتین لەقورئان و سوننەتی من) وەلەسەردەمی دەوڵەتی هارون الرشید دا لەبەر ئەوەی کەنەقڵ دوور بوویەوە هەربۆیە پێویستیان کەوتە تەفسیر و قەیدی حەدیسەکان لەدەقەکاندا و لەترسی ئەوەی نەوەك حەدیسەکان لەناو بچن، دواتریش دەستیانکردە ناسینی زنجیرەی ڕیوایەتی حەدیس و تەعدیلی ڕاویەکان و بۆ ئەوەی لەم ڕێگەیەوە سەنەدی ڕاستی حەدیس لەوانی تر جیابکەنەوە. دواتریش دەرهێنانی شتانێك کە ڕوویان دەدا لەقورئان و سوننەتدا فراوان بوو سەرەڕای ئەمەش ئەم کەلێنەش کەوتە زمانی عەرەبیەوە لەئەنجامدا پێویستی کرد کەیاساو ڕێساش بۆ زمانی عەرەبی دابنرێت (یاسانەحویەکان) و هەموو زانستە شەرعیەکان وەك مەلەکەیەکیان لێهات بۆ دەرهێنان و موشابەهەت و لێکچوون و قیاس و پێویستیان کەوتە زانستگەلێکی تر و، کەوەك هۆکارو ئامێرگەلێك بوون بۆ ناسینی زانستە شەرعیەکان وەك: ناسینی یاساکانی عەرەبی و یاساکانی ئەم ئیستینبات و دەرهێنان و قیاسە و بەرگری لەعەقیدە ئیمانیەکان بەبەڵگەوە. چونکە بیدعەگەلێکی زۆر و عەقیدەی بێ باوەڕی (الحاد) دەرکەوتبوون. هەموو ئەم زانستانە بوونە خاوەن مەلەکە گەلێك کەپێویستیان بەفێربوون هەبوو لەڕیزی صنعەتی هونەرەکاندا دەژمێردران و ئێمەش لەڕابوردوودا باسی ئەوەمان کرد کە شارنشینەکان مومارەسەی صەنایع دەکەن و عەرەبی دەشتەکی لەهەمووان زیاتر دوورن لەم کارەوە، کەواتە زانستەکانیش لەکاری شارنشینان بوو عەرەبیش لەوان و لەبازاڕی پڕ ڕەواجیانەوە دوور بوون ئەو سەردەمەی خەڵکی شاریش بریتی بوون لەئێرانی و عەجەمیەکان و مەوالی و خەڵکی ئەو

شارەگەورانەی کە لەو سەرەدەمەدا لەشارستانیەت و چۆنیەتیەکانیدا وەك: صنعەت و پیشەکان چاویان لەئێرانیەکان دەکرد، چونکە ئێرانیەکان بەهۆی ئەو شارستانیەتە ریشەدارەی کەلەسەرەتای دامەزراندنی دەوڵەتی فارسەوە هەیانبووە لەم شتانەدا بەتواناتر بوون، هەروەك چۆن خاوەنی صەناعەتی نەحو سیبویە و فارسی و بەدوای ئەویشدا زەجاج هات و هەموو ئەمانە بەڕەگەز ئێرانی بوون بەڵام لەژینگەی زمانی عەرەبیدا پەروەردە بوون و زمانیان لەو ژینگەیەدا وەرگرتووەو، وەك یاساو هونەرێکیان لێکرد کەداهاتووان لەوان بەهرەمەند بوون.

هەروەها زۆربەی حەدیس زانەکان کەبۆ ئەهلی ئیسلام لەبەریان کردبوون ئێرانی بوون یان لەڕووی زمان یان پەروەردەوە نەژادیان ئێرانی بووە، چونکەهونەرەکان لەعێراقیشدا فراوان بوبو هەموو زانایانی ئوصوڵی فیقھ هەروەك دەزانی و هەموو زانایانی عیلمی کەلامو زۆربەی موفەسیرەکان ئێرانی بوون و بێجگە ئێرانیەکانیش هیچ کەسێك هەوڵی نوسینەوەی زانستەکانی نەداوە، هەربۆیە میصداقی فەرموودەکەی پێغەمبەر (ص) هاتە دی کەفەرمووی: (ئەگەر زانست بەئاسماندا هەڵواسرێت نەتەوەیەك لەخەڵکی فارس بەدەستی دەهێنن و فێری دەبن) بەڵام ئەو تازی و غەزاکەرانەی کە دەرکیان بەم شارستانیەتە کردو لەدەشتەکیەتی هاتنە دەرەوە و بەرەو شارستانیەتی ناوبراو چووبوون سەرۆکایەتی لەدەوڵەتی عەباسیدا ئەوانیان بەخۆیانەوە سەرقاڵ کردبوو کاروباری دەوڵەتداری لەزانست و ئەندێشە بیری خستبوەوە، چونکە ئەمان ئەهلی دەوڵەت و پارێزەر و کاربەڕێکەری بوون. سەرەڕای ئەمەش خۆبەگەورە زانین و لەخۆبایی بوونیان لەو کاتەدا ڕێگر بوو لەوەی کەخۆیان بەزانستەوە سەرقاڵ بکەن، چونکە زانست لەڕیزی صنعەتەکاندا بوو گەورەکانیش خۆیان لێی بەبێ نیاز دەزانی و سەرپێچیان لێدەکرد و بەهیچ شێوەیەك نزیکی نەدەکەوتنەوە و، ئەم کارانەیان دەسپاردە کەسانێك کەلەنەژادە غەیرە عەرەب و موەلیدان[٢٩٦] بوون و باوەڕیان وابوو کەئەرکی هەستان بەو

---

[٢٩٦] موەلید کەسێکی عەجەمەکە لەژینگەیەکی عەرەبیدا پەروەردە بوبێت.

کارە لەئەستۆی ئەوانە و پێیان وابوو کەئەو کەسانە بەشێکن لەخۆیان و ئەوەی کەئەم زانستانەیان دەزانی بەکەم سەیریان نەدەکرد، تائەوکاتەی کەبەگشتی فەرمانڕەوایی لەدەستی عەرەبدا نەما و کەوتە دەستی نەژادە غەیرە عەرەبەکان و لەم کاتەشدا ئەندامانی دەوڵەت هیچ نیسبەتێکیان بەزانستەکانەوە نەبوو چونکە لێیانەوە دوور بوون زانایانی زانستە شەرعیەکان لەناوخەڵکیدا کەسایەتیان نەمابوو، چونکە دەیانبینی لەدامو دەزگاکانی دەوڵەتەوە بەدوور بوون سەرقاڵی کارانێکن کەهیچ سودێکیان بۆ دەوڵەتداری نیە، هەروەك چۆن لەبەشی پلە دینیەکاندا باسمانکرد.

دوای ئەوەی کە باسمانکرد ئەوە ڕوونبوویەوە کەبۆچی زانایانی زانستە شەرعیەکان یان زۆربەیان ئێرانی بوون. وەهەروەها زانستە ئەقڵیەکانیش دەرنەکەوتن مەگەر دوای ئەوسەردەمەی کە زانایان و نوسەرانیان جیابوونەوە و هەموو زانستەکان وەك صنعەت جێگیر بوون و، لەئەنجامدا تایبەت بوو بەئێرانیەکانەوە و تازی و غەزاکاران وازیان لێهێنان و بێجگە لەئێرانیە عەرەبی زانەکان هیچ کەسێك نەیدەزانین وەك هەموو صنعەتەکان، هەروەك چۆن لەسەرەتای ئەم بەشەوە باسمانکرد، ئەم زانستانە بەردەوام لەشارەکاندا باویان هەبووە تائەو سەردەمەی کە شارستانیەت و ئاوەدانی لەئێران و وولاتانی تردا وەك عێراق و خوراسان و ماوەرای النهرین دا جێگیر بوو. بەلاّم هەرکە شارە ناوبراوەکان بەرەو وێرانی چوون و شارستانیەت و ئاوەدانی کەلەنهێنیەکانی خودایە لەبەدیهاتنی زانست و صنعەتەکاندا لەو سەرزەویەدا دوور کەوتەوە و زانستیش بەگشتی لەوولاّتی ئێراندا لەناوچوو، چونکە ژیانی دەشتەکیەتی زاڵ بوبو بەسەر ئەو ناوچەیە دا زانست تایبەتکرا بەخەڵکی شارە زۆر گەورەکانەوە کەلەشارستانیەتدا بەهرەیەکی فراوانیان هەیە ئێستاکەش هیچ وولاّتێك بەئەندازەی میسر لەشارستانیەت بەهرەمەند نیە چونکە ئەم وولاّتە لەم سەردەمەدا وەك دایکی جیهان و کۆشکی بەشکۆی ئیسلام و سەرچاوەی زانست و صنعەتەکان بووە. وەلەماوەرای النهریشدا بەشێك لەشارستانیەتی ڕابوردوو هەرمابوویەوە ئەم شارستانیەتەش بەهۆی ئەو دەوڵەتەوەیە کەلەو

سەرزەمینەدا حوکم دەکات هەربۆیە بەشێك لەزانست و صنعەتەکان تایبەتە بەوانەوە کەئینکاری ناکرێت، ئەوەی کەئێمەی بۆ ئەم مەسەلەیە ڕێنمایی کردووە نوسینەکانی یەکێك لەزانایانی ئەو سەرزەویەیە کەنوسینەکانی لەم مەملەکەتانەدا (مغرب) بەدەستمان گەشتوون کەبریتیە لەسعدالدینی تفتازانی. بەلاّم لەئێرانیەکانی تر لەپاش ئیمام ئیبن الختیب (فخری ڕازی) نصیرالدینی توصی و بەرهەمگەلێکمان نەبینیوە کەبتوانرێت لەو پەڕی باشی و پێکاندا پشتیان پێ ببەستین.

پێویستە ئەم بارودۆخانە لەبەرچاو بگرین و بیریان لێبکەینەوە ئەوکات شتانێکی سەرسوڕهێنەر لەبارەی ئەحوالّی خەلّکیەوە دەزانین و بۆمان دەردەکەوێت. خوداش هەرچیەك کەبیەوێت دەیئافرێنێت[٢٩٧] هیچ خودایەکیش بێجگە لەو بوونی نیە.

---

[٢٩٧] (يَخلُقُ مَا يَشاء) س مائدة ئا ٢٠.

# بەشێك

## لەبارەی ئەوەی کە ئەوکەسانەی کەلەسەرەتای ژیانەوە ئاشنای زمانی غەیرەعەرەبی بوون ئەوا لەفێربوونی زانستەکانی زمانی عەرەبیدا سودێکی زۆر کەم دەبینن

هۆکارەکەشی ئەوەیەکە هەموو بابەتی زانستەکان بریتین لەمانا زەینی و خەیاڵیەکان ئەم مانایانەش لەنێو زانستە شەرعیەکاندا هەڵدەبژێردرێن زۆربەی بابەتەکانی ئەم زانستە لەبارەی لەفزەکانەوەیە و، مادەکانیان لەئەحکامەکانی قورئان سوننەت و لوغەتگەلێکەوەیە کەماناکانیان دەگەیەنێت وەردەگیرێن و هەموو ئەم مانایانە لەخەیاڵدا دەنەخشێن و، هەم ماناوبراوەکانیش لەنێو زانستە ئەقڵیەکاندا هەڵدەبژێردرێن کەلەزەیندا جێگیر دەبن. لەڕاستیدا لوغەتەکان وەك تەرجومانی ماناگەلێکن کە لەزەمیرو ویژدانەکاندا جێگیردەبن و لەڕێگەی قسە کردنەوە لەکاتی مونازەرەو فێربوون و مومارەسە لەباسی زانستەکاندا بۆ بەدەستهێنانی مەلەکەکەیان لەم مانایانەدا بەڕاهێنانی بەردەوام پەیوەست دەبن بەیەکەوە. ئەلفازو لوغەتەکان وەك پەردەگەلێکن لەنێوان زەمیرو ویژدانەکاندا و وەك پەیوەستگە لێکن لەنێوان ماناو مۆرگەلێکن بەسەریانەوە و کەسێك کەئەیەوێت زانست فێرببێت ناچارە کەماناکان لەڕێگەی دەلالەتە زمانەوانی و لوغەویەکانەوە بەباشی فێربوونی مەلەکەی ئەو بەخێرایی لەئەلفازەکان دەربهێنێت، وەگەرنا سەرەڕای ئەو کێشانەی کەلەبابەتە زەینیەکاندا ڕوودەدات ئەوا دەرهێنان و بەدەستهێنانی ماناکان بۆ ئەو دژوار دەبێت، بەڵام کاتێك کەمەلەکەی ئەو لەدەلالەتەکانی

ئەلفازدا لەسەر ماناکان جێگیر بێت هەروەك چۆن لەکاتی بەکارهێنانی ئەلفازە بەدیهی و بەڵگە نەویستەکاندا بەبێ وەستان ماناکانی پێشوەختە بچنە ناو زەینەوە ئەوکات پەردەی ناوبراو لەنێوان ماناو تێگەشتنیدا لادەچێت یان کەمدەبێتەوە و ئەوکات کێشەیەکی نابێت بێجگە لەوەی کە تەنها لەمانای بابەتە زانستیەکاندا ڕاهێنان و مومارەسە دەکات. هەمووئەمانە کاتێکە کە شێوازی فێرکردن بەشێوەی تەلقین و خیتابو تەعبیرکردنی بابەتەکان، بەڵام ئەگەر قوتابی پێویستی بەخوێندن لەسەر خوێندنەوەی شێوەکانی خەت و دیوانی نوسینگەکان مەسەلەی زانستەکان هەبێت. لێرەدا پەردەیەکی تر لەنێوان شێوە و ئەلفازە زارەکیەکاندا کەلەخەیاڵی ئەودا نەخشاوە دروستدەبێت. چونکە شێوەکانی نوسینیش دەلالەتێکی تایبەتیان هەیە لەسەر ئەلفازە زارەکیەکان تائەوکاتەی ئەم دەلالەتە نائاسرێت پەی بردن بەتەعبیرەکە دژوار دەبێت. وەئەگەر بەمەلەکەی نوقسانەوە فێریان ببێت ئەوا مەعریفەشی نوقسان دەبێت وەلەم ڕێگەیەدا پەردەیەکی تر دێتە بەردەم خوێنەر و فێرخواز کەلەنێوان و ئەوو خوازراوەکەیدا کەبەدەستهێنانی مەلەکەی زانستەکانە و بەچەندین پلە لەپەردەی یەکەمین دژوار ترە. بەڵام هەرکات مەلەکەی ئەو لەدەلالەتە لەفزی و خەتیەکاندا بەهێز ببێت ئەوکات هەموو ئەو پەردانەی کەلەنێوان ئەوو ماناکاندا کێشراون لادەچن و تەنها کێشەیەك کەبۆ ئەو دەمێنێتەوە بریتیە لەمومارەسەو ڕاهێنان لەتێگەشتنی بابەتی زانستەکاندایە. بەم شێوەیە چۆنیەتی ماناکان لەگەڵ ئەلفاز و خەت بەنیسبەت هەرووشەیەکەوە، وەئەوانەی کەلەمنداڵیەوە دەستدەکەن بەفێربوونی ئەلفاز و نوسین ئەوا مەلەکەکانیان بەهێزتر دەبێت.

دواتر دەبێت ئەوەبزانین لەبەر ئەوەی کە وولاّتی ئیسلامی فراوان بوو نەتەوە جۆراو جۆرەکان هاتنە ناوئیسلامەوە لەکاتێکدا شیعاری نەتەوەی عەرەب نەخوێندەواری بوو بەهۆی دەرکەوتنی پێغەمبەرایەتی لەنێویاندا بەناچاریەوە زانستەکانی پێشینانیان فێربوون و، ئاشنای خوێندن و نوسینیان بوون، هەربۆیەبەهۆی شارستانیەت و

تەهزیبەوە نەتەوەکانیان خستە ژێردەستی خۆیان و دەستیانکردە دەوڵەتداری و بەڕێز بوون و لەپاش ئەوەی کەزانستە شەرعیەکانیان بەشێوەی ڕیوایەت‌و سینە بەسینە گوازراوەتەوە بۆ ئەوان و وەك صنعەت و هونەرێکیان لێکردوون و کەسانێك پەیدا بوون کەئەم مەلەکانەیان پەیدا کردوو و دیوان و دانراوگەلێکیان نوسی و زانستی گەلانی تریش فێربوون و، دواتریش زانستە جۆراو جۆرەبێگانەکانیان تەرجەمەکرد بۆ عەرەبی و خستنیانە ناوقاڵبی ئەلفازگەلێکەوە کەشیاوی ئەندێشەکانی ئەوان بوون و زاراوە بێگانەکانیان خستەلاوە و، زاراوەگەلێکیان لەزمانی خۆیاندا بۆئەم زاراوانە داناو بەپێی تێگەشتن و ئیدراکی خۆیان زانستەناوبراوەکانیان گەشەپێداو ئەو دیوانانەی کەبەزمانی بێگانە بوون بەتەواوی وازیان لێهێنان و، لەبیر چوونەوە و هەموو زانستەکان بەزمانی عەرەبی ڕەواجیان پەیدا کرد و دیوان و کتێبەکانیان بەخەتی عەرەبی نوسرایەوە و ئەوانەی کە سەرقاڵە کارە زانستیەکان بوون ناچار بوون دەلالەت یان ئوصولّ و قەواعیدەکانی لەفزی زمانی عەرەبی فێربېن و وازلەزمانەکانی تر بهێنن، چونکە بێجگە لەزمانی عەرەبی زمانەکانی تر تەرك کرابوون و گرنگیان نەمابوو ئێمەش لەبەشەکانی پێشودا باسی ئەوەمان کرد کە زمان بریتیە لەمەلەکەیەك کەلەزماندا بەدی دێت، وەهەروەها گوتمان خەتیش هونەرێکە کەمەلەکەکەی دروستدەبێت.

هەربۆیە هەرکاتێك سەرەتا مەلەکەی زمانێکی بێگانە بۆ کەسێك ڕوویدات و دروست ببێت ئەم کەسە لەشارەزابوون لەزمانی عەرەبیدا بێتوانا دەبێت چونکە لەڕابووردودا ئەوەمان وەیاد هێنایەوە کەهەرکات کەسێك سەرەتا لەصنعەتێکدا شارەزا ببێت کەمتر دەکرێت، مەلەکەی صنعەتێکی تر لەهەمان ئەو کەسەدا کامڵ ببێت و دەلیلەکەشی ئاشکرایە. هەربۆیە هەرکات کەسێك بەباشی نەتوانێت یاساو ڕێساکانی لەفزی و خەتی زمانی عەرەبی بەباشی فێرببێت هەروەك چۆن لەڕابوردوودا باسمانکرد تێگەشتنی مانای ووشەکانی ئەو زمانە بۆ ئەو دژواردەبێت مەگەر ئەوەی کەکاتێك سەرقاڵی فێربوونی زمانی عەرەبی بێت، پێشتر مەلەکەی زمانێکی بێگانە فێربوبێت بەڵام هێشتا لەزەینیدا

جێگیر نەبوبێت وەك منداڵە بچووکەکانی نەتەوە غەیرەعەرەبەکان کەبەرلە بەهێزبوونی مەلەکەی زمانی دایکیان لەگەڵ عەرەبی زانەکاندا پەروەردەدەبن لەم کاتەشدا ئەوانە وەك ئەو کەسانەن کەلەسەرەتاوە ئاشنادەبن لەگەڵ زمانی عەرەبیدا و دواتر لەماناکانی زمانی عەرەبیدا شارەزان و دانامێنن. کەسێك کەلەپاش فێربوونی خەتی عەرەبی خەتێکی تر فێربووبێت ئەم تیۆرە دەیگرێتەوە. هەربۆیە دەبینین کەزۆرێك لەزانایانی غەیرە عەرەب لەتەدریس و وانە ووتنەوە لەکۆڕو کۆبوونەوەکانی فێرکردندا لەبەری شەرحکردنی بابەتی کتێبەکان عەینی عیبارەتی کتێبەکە بەشێوەیەکی ڕووکەش و سەتحی دەخوێننەوە و، بەم شێوەیە خۆیان لەدژواری هەندێك لەمانا شاراوەکان ڕزگاریان ببێت بۆ ئەوەی لەم ڕێگەیەوە فێربوونی ماناکان بۆ ئەوان ئاسانتر ببێت، بەڵام کەسێك کەلەبەیان و خەتی زمانێکدا خاوەنی مەلەکەیەکی بەهێزبێت پێویستی بەم شێوەیە نیە، چونکە مەلەکەی زمان بەتەواوەتی لەمدا جێگیر بووە و تێگەشتنی بابەتەکان لەخەت و دەرکی مانای قسەکان بۆ ئەو وەك سروشتێکی لێهاتووەو، هیچ جۆرە پەردەیەك لەنێوان ئەوو ماناکاندا بوونی نیە چونکە بەهۆی مومارەسەو ڕاهێنانەوە لەفێربوونی خەت و زمانی بێگانە مەلەکەیەك بۆ ئەو فێرخوازە بەدی دێت هەروەك چۆن ئەم بارودۆخە لەزۆرێك لەزاناکانی ئیسلام کەلەڕەگەزی غەیرە عەرەبن دەبینین، بەڵام ئەم جۆرە کەسانە بەکەمی دەبینرێن وەهەرکات ئەم زانایانە لەگەڵ هاوشانەکانیان لەزانا عەرەبەکان قیاس بکەین دەبینین کەزانایانی عەرەب لەزماندا بەتواناترن و مەلەکەکەیان بەهێزترە.

چونکە خەڵکی غەیرەعەرەب بەهۆی ئەوەی کەلەسەرەتاوە ئاشنای زمانی عەجەمی دەبن دووچاری جۆرێك لەسستی دەبنەوە کەبمانەوێت و نەمانەوێت کاردەکاتە سەر بێتوانایی ئەوان لەفێربوونی تەواوەتی زمانی عەرەبیدا. وەنابێت بەهۆی ئەوەی کەلەبەشەکانی پێشوودا گوتمان: زۆربەی زانایانی ئیسلام غەیرە عەرەب و ئێرانی بوون. ڕەخنە لەم قسەبگیرێت چونکە مەبەستی ئێمە لەوێدا لەعەجەم کەسانێکن کە لەڕووی

نەژادەوە غەیرە عەرەبن و ئەوەمان سەلماند کەرەواجی شارستانیەت لەنێوئەواندا بووەتە هۆی ئەوەی کە کەلەصەنایع و مەلەکە جۆراو جۆرەکان و لەوانەش مومارەسەی زانستەکان بکەن. بەلاَم عەجەمی بوون لەزماندا شتێکی ترە و مەبەستی ئێمە لێرەدا شتێکی ترە. وەهەروەها نابێت ئەم قسەیەش بەخراپ تەفسیر بکرێت کەچۆن یۆنانیەکان لەزانستەجیاوازەکاندا پێشەنگ بوون لەگەڵ ئەوەی کەئەوان ئەم زانستانەیان لەزمانی کۆنی خۆیان و بەدەر لەو زمانەی کەقسەیان پێدەکرد دەنوسی.

دەبێت ئەوە بگوترێت غەیرە عەرەب یان عەجە می کەلەناونەتەوەی ئیسلامدا زانست فێردەبێت و هەم زانست لەزمانی غەیرەدایکیی خۆیەوە فێردەبێت و هەمیش بەخەتێك نانوسێت کەمەلەکەی ئەو تێیدا پێشتر جێگیر بووبێت. ئەم شتەش هەروەك گوتمان بۆ ئەو وەك پەردەیەك وایە کەرێگرە لەپێشکەوتنی ئەو. ئەم بابەتەش لەنێو ئەو نەتەوانەی کە بەزمانی عەرەبی قسەناکەن وەك ئێرانی رۆمی و تورك و بەربەرو فەرەنگ و نتەوەکانی تری غەیرە عەرەبدا گشتگیری هەیە. وەلەم شتەدا نیشانەگەلێك هەن بۆ ئەو کەسانەی کەبیردەکەنەوە[٢٩٨].

[٢٩٨] (إِنَّ فِي ذالِكَ لَآيَةً لِقَومٍ يَتَفَكَّرُونَ) س النحل ئا ٦٩.

# بەشی سی و حەوتەم

## لەبارەی زانستەکانی زمانی عەرەبییەوە

زانستەکانی زمانی عەرەبی خاوەن چوار پایەن کەبریتین لە: لوغەت، نحو، بیان، ادب، ناسینی ئەمانە بۆ ئەهلی شەریعەت زەرورییە، چونکە سەرچاوەی وەرگرتنی هەمووئەحکامە شەرعیەکان قورئان و سوننەتە کەبەعەرەبین و صەحابە و تابیعینیش کەگێڕەرەوەی ئەو دوانەن عەرەبن و شەرحی کێشەکانیشیان بەزمانی ئەو نەتەوەیە دەبێت و، هەربۆیە کەسێك کە بیەوێت زانستی شەریعەت فێرببێت دەبێت زانستەکانی پەیوەست بەزمانی عەرەبی بزانێت ئەو زانستانەش لەبەهێزی زماندا بەپێی جیاوازیان لەگەیاندنی قسەدا جیاوازە. وەبۆ ڕوونبوونەوەی ئەم خاڵە تنها هێندەبەسە کە ئێمە هەموویان یەکەبەیەکە هونەر بەهونەر باسبکەین و ئەوەشی کەبەڵگەنەویست و سەلمێنراوە ئەوەیەکە گرنگترین و لەپێشترینی هەموویان زانستی قەواعید (نحو) وە، چونکە لەڕێگەی ئەم زانستەوو ئوصولێ و مەبەستەکان لەڕێگەی دەلالەتی لەفزەکانەوە ئاشکرا دەبن، فاعیل لەمەفعول و موبتەدا لەخەبەر جیادەکرێنەوە و ئەگەریش ئەم زانستە نەبوایە ئەصڵی سوودی قسە نادیار بوو بەنادیاریش دەمایەوە. وەحەق وابوو کەزانستی زمانەوانی لەپێشتر بێت بەسەر هەموو ئەم زانستانەدا، بەڵام زۆربەی شێوە و شێوازە زمانەوانیەکان لەسەر هەمان ئەو بابەتەی کەبۆی دانراون ماونەتەوە و گۆڕانکاریان بەسەردا نایەت، بەپێچەوانەی (اعراب) حەرەکات و جوڵەی ووشەکان کەدەلالەت دەکەنەسەر اسناد و مسندالیە کەبەهۆی جوملەوە دەگۆڕێت و هیچ جۆرە

شوێنەوارێکی لەپاش بەجێ نەماوە. هەربۆیە زانستی نحو لەزمانەوانی گرنگترە، چونکە نەزانینی بەشێوەیەکی گشتی دەبێتە مایەی تێکدانی تێگەیشتن ئەمەلەکاتێکدا زمان بەم شێوەیە نیەو خوداش داناترە.

# زانســـتی نحــو

دەبێت ئەوەبزانین کەزمان بەپێی ئەوەی کەناسراوە بریتیە لەتەعبیری قسەکەر لەمەبەستی خۆی و ئەم تەعبیرە کرداریە پەیوەستە بەزمانەوە کەلەمەبەستی ئیفادەی کەلامەوە سەرچاوە دەگرێت، هەربۆیە دەبێت وەك مەلەکەیەکی نەگۆڕی لێبێت لەئەندامێکدا کەئەنجامی دەدات و ئەو ئەندامەش زمانە. وەتەعبیر لەمەبەست لەنێو هەرنەتەوەیەکدا بەپێی زاراوەی تایبەتی ئەو نەتەوەیە. وەئەو مەلەکەیەی کەلەوانەوە بۆ عەرەب بەدیهاتووە لەباشترینی مەلەکەکانە و زیاتر لەمەلەکەی هەرزمانێکی تر مەبەستەکان ئاشکرا دەکات، چونکە لەزمانی عەرەبیدا نیشانەگەلێکی تر بێجگە لەووشەکان دەلالەت دەکەنە سەر زۆرێك لەماناکان وەك ئەو حەرەکاتانەی کە وەك فاعل و مفعول و مجرور واتە مضاف الیە دیاری دەکات، هەروەك پیت گەلێك کە فیعلەکان، واتە حەرەکاتەکان دەگەیەننە زاتەکانیان بەبێ ئەوەی کە پێویستیان بەئەلفازی تر هەبێت. ئەم تایبەتمەندیەش بێجگە لەزمانی عەرەبیدا لەهیچ زمانێکی تردا بوونی نیە هەروەك چۆن لەزمانەکانی تردا بۆ هەرمانا یان چۆنیەتیەك بەناچاریەوە ئەلفازگەلێك هەڵدەبژێرن کەبەتایبەت دەلالەت لەم ماناو چۆنیەتیانە دەکەن.

هەربۆیە دەبینین قسەی خەڵکی عەجەم (غەیرەعەرەب) لەکاتی گفتوگۆدا بەنیسبەت زمانی عەرەبیەوە درێژترە. ئەم مانایەش فەرموودەکەی پێغەمبەر (ص) نیشاندەدات کەدەفەرمێت: جوامع الکلم[٢٩٩] بەمن دراوە و قسەی من بەئەندازەی کافی کورت و پوختە). هەربۆیە پیت و حەرەکات و شێوەکان لەزمانی عەرەبیدا لەڕووی دەلالەت

---

[٢٩٩] بریتیە لەو قسانەی کەماناگەلێکی زۆریان هەیە و زاراوەکانیان کەمن.

لەسەر مەبەست ئیعتیباریە کەبۆ سود وەرگرتن لەم مەبەستە پێویست بەتەکەلوف و زۆرلەخۆکردنی صەناعی نیە، مەلەکەیەکە کەلەزمانی ئەماندا بوونی هەیە و مندالآن لەگەورەکان و پاشینان لەپێشینانەوە وەری دەگرن و هەروەك چۆن مندالآنمان لەم سەردەمەدا زمانی ئێمە فێردەبن.

بەلأم لەو کاتەوەی کەئیسلام دەرکەوت و عەرەب بۆ بەدەستهێنانی ئەو وولآتانەی کەلەژێر دەسەلأتی نەتەوەکانی تردا بوون حیجازیان جێهێشت و لەگەڵ نەتەوەکانی تردا ئاوێتەبوون و، ئەو مەلەکەیەش گۆڕاو بەهۆی ئەوەی کە بەو مەلەکەیە لەڕێگەی گوێوە ووشە و زاراوەگەلێکی جیاواز لەخەڵکانی غەیرە عەرەب (عەجەم) دەگوترا ئەمەلەکاتێکدا گوێ سەرچاوەی مەلەکەزمانیەکانە، هەربۆیە بەهۆی ئەم جۆرە گوتنانەوە کە پێچەوانەی ئەو مەلەکەیە بوو خراپە چوویە ناویەوە بەهۆی ڕاهاتنی گوێوە ووردە ووردە تەبعی ئەو حەزی لێکردن و زانایانی ئەو نەتەوەیەش ترسی ئەوەیان هەبوو، کەمەلەکەی زمانەکەیان بەتێپەڕبوونی کات بەتەواوەتی لەناو بچێت و لەئەنجامیشدا تێگەشتن لەقورئان و حەدیس دژوار بێت و هەربۆیە بۆ پاراستنی ئەم مەلەکەیە یاساگەلێکی موتەرید[300] هاوشێوەی کوللیاتەکان و قەواعیدەکان لەڕێڕەوی کەلامی عەرەبدا دەرهێنا و، هەموو جۆرە قسەکانی تریان بەوان هەڵدەسەنگاند و مەسەلە هاوشێوەکانیان دەلکاند بەیەکترەوە وەك: فاعل مرفوع و مەفعول منصوب و مبتدا مرفوعە.

دواتر ئەوەیان بۆ دەرکەوت کەلەپاش گۆڕینی ئەم حەرەکاتانە دەلالەتی لەفزەکانیش دەگۆڕێت هەربۆیە زاراوەگەلێکی تایبەتیان بۆ یاساناوبراوەکان دانا و هەروەك چۆن حەرەکاتە ناوبراوەکانیان ناونا (اعراب)، ئەو هۆکارەشی کەدەبێتە هۆی ئەم گۆڕانکاریە بە(عامل) ناوزەدیانکرد و نمونەی ئەمانە. وەهەمووئەمانە بوونە زاراوەگەلێکی تایبەت و لکاندنیان بەکتێبەکانەوە و کردیانە صەناعەتێکی تایبەت بۆ ئەمان و هەموو زاراوە و یاساکانی ئەم صنعەتەیان ناونا (علم النحو).

---

[300] (ئەوانەی کەغەیری خۆیان لەیاساکە دەکەنەدەرەوە).

وەیەکەمین کەسێك کەلەمبارەیەوە دەستیکردە نوینی کتێب ابو الاسودی دوئەلی بوو لەهۆزی بنی کنانەو، دەڵێن کەگوایە ئەو بەفەرمانی ئیمامی علی (ع) دەستیکردووە بەم کارە چونکە حەزرەتی علی گۆڕانی ئەو مەلەکەیەی بینی هەربۆیە فەرمانی بەابوالاسود کرد بیانپارێزێت و، ئەویش بۆ پاراستنیان پشتی بەکۆمەڵێك یاساو رێسای سنوردار بەست کەبۆ ئەم مەبەستە دەرهێنرابوون. دواتر و لەپاش ئەمیش خەڵکانێکی تر لەم بارەیەوە کتێبیان نوسی و یاساناوبراوەکان گەشتنە دەست خەلیلی کوڕی ئەحمەدی فەراهیدی و، کەهاوچەرخی ڕەشیدبوو خەڵکی لەو سەردەمەدا زۆر پێویستیان پێی هەبوو، چونکە مەلەکەی زمان لەناوعەرەبدا نەمابوو هەربۆیە خەلیلی کوڕی ئەحمەد دەستیکردە تەهزیبی ئەو صەناعەتە و بابەکانی کامڵکرد. دواتریش سیبویە ئەو زانستەی لەو وەرگرت و فەرع و لقەکانی کامڵکرد و دەلیل و شاهید گەلێکی زۆری بۆزیاد کرد و کتێبە بەناوبانگەکەی خۆی داناو، ئەم کتێبەش وەك ڕێنماو ڕیبەرێکی لێهات بۆ ئەو کەسانەی کەلەپاش ئەو لەمبارەیەوە دەستیانکردە نوسینی کتێب.

لەپاشان ئەبوعلی فارسی و ئەبوالقاسمی زەجاج کتێبگەلێکی کورتیان بۆ فێرخوازان داناو هەمان ئەو شێوازەی کەسیبویە لەکتێبەکەی خۆیدا دایهێنابوو ئەمیش گرتیەبەر. لەپاش ماوەیەك کتێبگەلێکی زۆر لەبارەی ئەم صنعەتەوە نوسران و لەنێوان زانایانی زانستی ناوبراودا لەکوفە و بەصرە هەردوو شاری کۆنی عەرەب جیاوازی بۆچوون دروستبوو بەڵگە و دەلیلەکانی هەردوولا زۆر بوون و، شێوازی فێرکردنی کوفی بەصری زۆرجیاوازی پەیدا کردو بەهۆی جیاوازی نەحو زانەکانەوە لەقەواعیدە ناوبراوەکاندا لەبارەی ئیعرابەوە لەزۆرێك لەئایەتەکانی قورئاندا جیاوازی بۆچوون دروستبوو فێربوونی ئەم هەموو جیاوازی و بۆچوونە جۆراو جۆرانە بۆ فێرخوازان دژوار بوو کاتی دەکوشتن. هەربۆیە پاشینان شێوەی کورتیان هەڵبژارد و زۆرێك لەکتێبە دوورو درێژەکانی پێشینانیان کورتکردەوە و لەهەمان کاتیشدا هەموو ئەو ئوصوڵ و قەواعیدانەی کەنەقڵ کرابوون بەشێوەیەکی کشتگیر لەو کتێبە کورتانەدا گونجاندیان. هەروەك چۆن ئیبن

مالیك ئەم شێوازەی لەکتێبی (تسهیل) و هاوشێوەکانیدا بەکارهێنا و هەندێکیش تەنها بەنەقڵکردنی بنەماکانیان بۆ فێرخوازان بەبەس زانی، هەروەك چۆن زەمەخشەری لەکتێبەکەی خۆیدا (مفصل) ئیبن حاجیب لە (مقدمە) کەی خۆیدا ئەم شێوازەیان بەکار هێناوە چونکە ئەم یاسایانەیان بەشێوازێکی تایبەت ڕێکخستووە و هۆنیوەتەوە وەك ئیبن مالیك لەئورجوزەی صغری وکبری (الفیە) کەیدا و ئیبن معتی[٣٠١] لە ئورجوزەی الفیەدا.

بەکورتی نوسین لەم هونەرەدا بەئەندازەیەك زۆربوو کەلەژمارە نایەن و ناکرێت هەموویان بەدەست بهێنین و شێوەی فێرکردنەکەشی جیاوازە. هەروەك چۆن شێوازی پێشینان لەگەڵ شێوازی پاشیناندا جیاوازە شێوازی کوفیەکان لەگەڵ بەصری و بەغدادیو ئەندەلوسیەکان جیاوازی هەیە و هەریەکە تەریقەیەکی تایبەتی خۆیان هەیە. بەهۆی لاوازبوون و کەموکورتی ئاوەدانی و شارستانیەت نزیك بوو ئەم صنعەتە لەناوبچێت و چارەنوسی وەك چارەنوسی زانستەکانی تری لێبێت کەلەقۆناغی لەناوچووندان.

بەڵام لەم سەردەمەدا دیوانێك (کتێبێك) لەمیسرەوە گەیشتە مەغریب و کەوتە دەستمان کەزۆر جامیعە و ئەم کتێبە هی جمال الدینی کوڕی هیشامە کەلەزاناکانی ئەو سەرزەمینەیە، دانەری کتێبی ناوبراو ئەحکامەکانی اعرابی بەگشتی تێیدا بەشێوەیەکی جامیع کۆکردووەتەوە و لەبارەی پیت و مفرەدات و جوملەکاندا قسەی کردووەو، لەزۆربەی بابەکانی ئەم صنعەتەدا دووبارەکانی لابردووە و ناوی ناوە (مغنی) لەئیعرابدا. وەهەروەها دانەر باسی هەموو خاڵەکانی ئیعرابی قورئان کردووە و لەدووتوێی باب و بەش و قەواعیدەکاندا زەبت کردووە، هەروەك چۆن هەموبابەکانی ڕێکخراوەو، ئێمەش

[٣٠١] یحیی ابن معتی لەهۆزی زواوەیە لەناوچەی کابیلی و دانەری چەندین ڕیسالەیە لەنحودا و لەساڵی ٦٢٨ ك (١٢٣١ – ١٢٣٠ز) لەقاهیرەدا مردووە، الفیەکەی ئەو تانەوکاتەی کەئیبن مالیك الفیەکەی خۆی نوسی ناوبانگێکی زۆری هەبوو نوسخە دەستنوسەکانی ئیبن موعتی زۆر کەمن. حاشیەی دسلان ب ٣ لا ٣١٢.

بەهۆی خوێندنیانەوە زانستێکی فراوانمان بەدەستهێنا کەگەواهیدەری پلەی بڵند و زۆری توێشووی دانەرە لەم زانست و صنعەتەدا وەهەروەك بڵێی ئەو لەم شێوازەدا شێوازی موصڵیەکانی پەیڕەویکردووە کەلەشوێنکەوتوانی ئیبن جنێن و زاراوەو شێوەی فێرکردن فێردەبن. هەروەك چۆن ئیبن هیشام لەوبارەیەوە کتێبێکی سەرسوڕهێنەری نوسیوە کەبەڵگەیە لەسەر بەهێزی مەلەکە و زانیاری ئەو. خوداش زیاد دەکات لەنێو مەخلوقاتیدا هەرچیەك بیەوێت[٣٠٢].

---

[٣٠٢] (يَزِيدُ فِي الخَلْقِ ما يَشاء) س فاتر لەئایەتی یەکەوە.

## زانستی زمان

ئەم زانستەش بریتیەلە باسکردنی بابەتە زمانەوانیەکانە، هەربۆیە دەستیانکردە تەدوینکردنی کەخراپە چوبوویە ناوحەرەکاتەکانی زمانی عەرەبیەوە کەنحویەکان پێی دەڵێن اعراب. وەهەروەك چۆن گوتمان بۆ پاراستنی ئەوان یاساگەلێکیان دەرهێنا و ئەو خراپەیەش بەهۆی ئاوێتەبوون و هاتووچۆی عەرەبەکان لەگەڵ بێگانەکاندا بەردەوامبوو تاوەکو ئەوەی کە ووردە ووردە چوویە ناوبابەتی ئەلفازەکانەوەو بەهۆی لادان لەزمانی ئەصڵی زۆرێك لەزمانە عەرەبیەکان لەغەیری ئەوەی کەبۆی دانراون بەکارهێنران، کەلەسەرەتاوە بۆ ئەو مانایانە دانەنرابوون سەرەڕای عەیب و ناشیرینی قسەی ئەوغەیرە عەرەبانەی کەبەعەرەبی قسەدەکەن لەو زاراوانەی کە بەپێچەوانەی ئوصوڵە ڕاشکاوەکانی عەرەبیدا بەکاریان هێناوە. هەموو ئەمانە بوونە هۆی ئەوەی سەیری لەبەرکردنی بابەتە زمانەوانیەکان بکات و بۆ ئەم مەبەستە پێویستیان بەنوسین و تەدوینیان هەبوو، لەترسی ئەوەی نەوەك زمانی عەرەب لەناو بچێت و موسوڵمانان بێبەش بن لەتێگەشتن لەقورئان و حەدیس. ئەمەیە کەزۆرێك لە پێشەوایانی زانستی زمان بۆ ئەنجامدانی ئەم مەبەستە هیممەتی کرد و لەمبارەیەوە کتێبگەلێکیان نوسی، بەلاّم یەکەمین کەسێك کەلەم گۆڕەپانەدا هەنگاوی هەڵێنا خەلیل کوڕی ئەحمەدی فەراهیدی بوو کەکتاب العین ی لەزماندا نوسی. خلیل هەموو زاراوە مورەکەبەکانی لەپیتە الفباکانی لەدوو پیتیەوە تاوەکو پێنج پیتی کەکۆتا جۆری تەرکیبی پیتەکان بوو لەزمانی عەرەبیدا هەیە ژمارد و، توانی لەفزەکان لەبەشگەلێکی ژمێردراوو دیاریکراودا بەم شێوەیە کورتکردەوە: هەموو ووشە دووپیتیەکان بەم شێوەیە بەدەستدێن: یەکێکیان لەپیتی

ئەلفبای بەتەرتیب بە ٢٨ پیتی تر کەیەك پیت کەمتر لەکۆی پیتەکانی ئەلفبا دەبن تەرکیبیان دەکەن[٣٠٣] لەئەنجامی ئەوەدا یەك پیت بەشێوەیەکی مورەتەب لەگەڵ ٢٧ پیتی تردا تەرکیب دەبێت و ٢٧ ووشەی دوو پیتی بەدەستدێت دواتریش پیتی دووەم بەهەمان شێوە لەگەڵ ٢٦ پیتەکەدا تەرکیب دەکەن، دوای ئەویش پیتی سێیەم و چوارەم تادەگەنە ٢٧ و ٢٨ کەدەکاتە یەك ووشە و هەربۆیە کۆی ئەوان ژمارە یەك لەدوای یەکەکان لەیەکەوە تاوەکو ٢٧ پێکدەهێنن و لەگەڵ ئەوکارانەی کەلەلای موحاسیبەکان بەناوبانگ بوو کۆدەکەنەوە، واتە ژمارەی یەکەم لەگەڵ ژمارەی کۆتاییدا کۆو کۆکردنەوە زەربی نیوەی ژمارەکە دەکەن و دواتریش بەهۆی هەڵگێڕانەوەی لەفزە دووپیتیەکان لەکۆتاییەوە بۆ سەرەتا دەیکەنە دووهێندە، چونکە پێشخستن و دواخستنی پیتە کانیش لەتەرکیبدا جێگەی سەرنجە دەرئەنجامی ئەم موحاسەبە هەموو لەفزە دووپیتیەکان پێکدەهێنێت. وەئەلفازە سێ پیتیەکان لەلێکدانی بەدەستهاتووی ئەلفازە دووپیتیەکان لەژمارەیەکەوە بەدەستدێت کەلەئەنجامی تەرکیبی سێ پیتیەکان لەیەکەوە تاوەکو ٢٦ بەپێی یەك لەدوای یەکبوونی ژمارەی کۆکراوەیە، چونکە لەسەر هەرلەفزێکی دووپیتی یەك پیت زیاد بکەن لەفزێکی سێ پیتی پێك بهێنن کەواتەدووپیتی وەك یەك پیت لەگەڵ هەریەکە لە پاشماوەی پیتەکانە کە ٢٦ پیتن.

هەربۆیە بەردەوام لەیەکەوە تاوەکو ٢٦ کۆبکەنەوە و هەموو دووپیتیەکانی تێدا لێکدەدەن لەپاشان بەلێکدانی ژمارەی بەدەستهاتوو لەشەش ڕستەی هەڵگەڕاوەدا ووشەی سێ پیتی لەکۆی تەرکیباتی دووپیتی و سێ پیتیەکانی ئەلفبا بەدەستدێت. ئەم شێوازەش لەچوار پیتی و پینج پیتیەکاندا بەکار دەهێنن. بەم شێوەیە خلیل هەموو تەرکیباتەکانی بەدەستهێنا و بابەکانی بەپێی پیتەکانی هەجا بەپێی شێوازێکی ئاسایی ڕێکی کرد و، لەم کارەشدا مەخاریجی پیتەکانی لەبەرچاوگرت لەم ڕووەوە سەرەتا پیتەکانی حەلق و دواتریش پیتەکانی حەنك و دواتریش پیتی ددانەکان (خرێکان) و،

---

[٣٠٣] بۆنموونە بابی: اب لەپاشان بات ات و دواتریش باث و اث.

لەپاشان ئەو پیتە شەفەویانەی قەید کرد و پیتەکانی عیللە نەخۆش (ا و ی) یان پیتە هەواییەکان لەکۆتاییدا هێنای لەحەرفەکانی حەلقدا پیتی عەینیان لەپێشتر زانیوە، چونکە پیتە ناوبراوەکان دوورترین پیتەکانی حەلقن هەربۆیە دانانەکەی خۆی ناونا کتاب العین. چونکە پێشینان لەناونانی کتێبەکانیاندا شێوازێکی تایبەتیان هەبووە کەبریتی بووە لەناونانی کتیب بەیەکەمین ووشە یان لەفزەکانی سەرەتای کتێبەکە. دواتر خلیل لەفزە بەکارهاتوو(مستعمل) بەکار نەهاتووەکانی (مهمل) دیاریکرد و بەکارنەهاتووەکان (مهمل)ی زیاتر لەچوار پیتی پێنج پیتیەکاندا بوون، چونکە عەرەب لەبەکارهێنانی ئەم جۆرە وەزنە قورسانە خۆیان بەدوور دەگرن و لەفزە دووپیتیەکانیشیان پێوە دەلکاند، چونکە ئەم جۆرە لەفزانە لەحیوارەکاندا کەمتر بەکار دەهێنرێن.

بەڵام زۆربەی لەفزە سێ پیتیەبەکارهاتووەکان و ماناداربوون چونکە ئەم جۆرە لەفزانە لەحیوارەکاندا زیاتر بەکاردێن. خلیل هەموو ئەم خاڵانە لەکتاب العین دا گونجاندووە بەباشترین شێوەی جامیع و کامڵ فەراهەمی کردوون. دواتر لەسەدەی چوارەمدا ئەبوبەکری زبیدی مامۆستای هەتی هشام المويد لەئەندەلوسدا دەرکەوت کتاب العینی کورتکردەوە، بەڵام هەوڵیدا کەلەهەمانکاتدا جامیع بێت و زۆربەی لەفزە مهملەکانو زۆرێك لەشاهێدی زمانە بەکارهاتووەکانی لابردو بەمەبەستی لەبەرکردنی زمانەکان باشترین کورتکردنەوەشی لێوە فەراهەم کرد و، جەوهەریش لەخەڵکی مەشریقەوە کتێبی صیحاحی بەتەرتیبێکی ئاسایی پیتە تەهەجیەکان داناو لەهەمزەوە دەسپێکرد و پیتی کۆتایی ووشەکەی کردە میلاك، چونکە زیاتر خەڵکی پێویستیان بەکۆتایی ووشەکەیە(وەزن و قافیەی شیعرەکان) هەربۆیە پیتی کۆتایی ووشەکانیان لەژێرناوی باب و دواتر پیتەکانی سەرەتای ووشەکان بەتەرتیبی پیتەکانی تەهەجی تاوەکو کۆتایی پیتەکانی خوارەوە بەناوی (فصل) وە هێناوە لەژمارەی زمانەکان و، سنورداركردنیان شوێنی خەلیل کەوت و چاوی لەو کرد. دواتریش یەکێك لەئەندەلوسیەکان کەبە ئیبن سیدە ناسرابوو لەخەڵکی دانیە لەهونەری زماندا

دەستیکردە نوسین کەلەدەوڵەتی علی کوڕی موجاهیددا پلەیەکی باڵای هەبوو کتێبی المحکم ی لەڕووی جامیعیەتە، وە بەشێوەی صیحاح نوسی و تەرتیبی کتاب العین ی لەدەست نەدا و سەرەڕای ئەمەش دەستیکردە گەڕان لەبارەی ئیشتیقاق و تصریف کلمات و لەم ڕووەوە دانراوەکەی بەباشترین کتێب دەژمێردرێت.

ئەم کتێبەش محمدی کوڕی ابوالحسین ی حاجب مستنصر لەپاشاکانی دەوڵەتی حەفصی تونس کورتی کردووەتەوە و تەرتیبەکەی گۆڕیوەو، لەڕووی ئیعتیباری پیتی کۆتایی ووشەکانی وەك صیحاحی لێکردووە.

هەربۆیە ئەم کورتکردنەوەیە هێندە لەصیحاح دەچوو هەروەك دوو برای یەکبن لەیەك دایك وەکراع کەیەکێکە لەپێشەوایانی زمان کتێبێکی بەناوی المنجد و ئیبن درید کتێبی الجمهرەی لەلوغەتدا دانابوو ئیبن الانباریش خاوەنی کتێبی الزاهرە. ئەمانە بنەماکانی کتێبەکانی زمانن بەپێی ئەو زانیاریانەی کەدەستی ئێمە کەوتوون. وەلەمبارەیەوە کتێبێکی تری کورتیش هەیە کەهەریەکەیان تایبەتن بەدەستەیەکی دیاریکراوەوە لەزمانەکان و کۆکەرەوەی هەندێك یان زۆرێك لەبابەکانی زمانن، بەڵام جیاوازی ئەم کتێبە کورتانە لەگەڵ کتێبە دوورو درێژەکاندا ئەوەیە لایەنی کورتی زمانەکان لەڕووی تەرکیباتەوە لەجۆری دووەمدا نادیارە و لەجۆری یەکەمیندا هەروەك باسمانکرد ئاشکرایە. وەهەروەها لەبارەی ئەو کتێبانەی کەلەبارەی زمانەوە دانراون کتێبەکەی زمخشریە لەم کتێبەدا هەموو لەفزو ماناکان کەعەرەب لەمانا ئەصڵیەکەیەوە بۆ مانا مەجازیەکەی نەقڵیانکردووە شەرحی کردوون. کەبەکتێبێکی شەریف و بەسوود ناودەبرێت. سەرەڕای ئەمانەش لەبەر ئەوەی کەعەرەب ووشەگەلێکیان بۆ مانا گشتیەکان داناوە و، دواتریش بۆ شتەتایبەتەکان لەفزگەلێکی تایبەت دادەنێن و بەکاری دەهێنان کەتایبەت بوون بەهەمان ئەو شتانەوە لەئەنجامدا لەلای ئێمە لەنێوان دانان و بەکارهێناندا جیاوازیەك هاتە ئاراوە و لەزماندا پێویستمان بە فیقهێك هەبوو کەخاوەن سەرچاوەیەکی بەڕێزبێت هەروەك چۆن ابیض یان داناوە بۆ هەرشتێك کەسپیەتی تێدا

بێت و دواتر ئەسپی سپیان بەاشهب ناوبردووە و، مرۆڤی سپی پێستیان بە ازهر ناوزەد کردووە و بەمەڕی سپیشیان گوتووە املح. وەبەکارهێنانی ابیض بۆ سپی لەهەموو ئەمانەدا هەڵەیەو بەدەرلەشێوازی زمانی عەرەبی دەژمێردرێت. وەسەعالیبی بەتایبەت لەمبارەیەوە دانراوێکی جیای داناوە و پێی دەڵێن فقەاللغە ئەو لەبارەی تەعەهودی لوغەوی لەگەڵ خۆیدا لەبەلارێدا نەبردنی بەکارهێنانی عەرەب لەشوێنی خۆیدا جەختی لەسەر دەکاتەوە. چونکە ناسینی یەکەمین دانانی زمان لەتەرکیبی ووشەکاندا بەس نیە مەگەر ئەوەی کە بەکارهێنانەکانی عەرەب گەواهیدەری ئەوەبێت ئەم هونەرەش لەگرنگترینی ئەو بابەتانەیە کەهەر ئەدیبێك لەهونەری شیعر و پەخشاندا پێویستی پێیەتی، بۆ ئەوەی نەوەك لەدانای ئەصڵی موفرەدات و تەرکیباتی زمانەکان دووچاری هەڵەی فراوان ببێتەوە، ئەم هەلأنەش لەهەڵەکردن لەئیعرابی ووشەکاندا خراپتر و ناشیرینترە.

وەهەروەها هەندێك لەپێشینان لەبارەی لەفزە هاوبەشەکانەوە کتێبیان نوسیوەو هەوڵی کۆکردنەوەی هەموبەشەکانیانداوە، هەرچەندە نەگەشتوونەتە کۆتایی ئەم هونەرە و دانراوەکانیان بەشێکی زۆری لوغەتە هاوبەشەکانە نەوەك هەموویان بەشێوەیەکی جامیع. بەلأم ئەو کتێبە کورتکراوانەی کە کەئێستاکەش لەهونەری لوغەتدا بوونی هەیە یەك و دوان نیە بەتایبەت کەئەم کورتکراوانە چەندین لوغەتی بەکارهاتوویان تێدایە کەزۆر بەکار دەهێنرێن بۆ ئەوەی قوتابی بەئاسانی لەبەریان بکات و لەمبارەیەوە چەندین دانراو بوونیان هەیەوەك: الفازی ئیبن کیت فصیح ی دانراوی سەعلەب و نمونەی ئەمانە. هەندێکیان بەبەراورد بەوانی تریان لوغەتگەلێکی کەمتریان هەیە ئەمەش هۆکاری جیاوازی بۆچوونی ئەوانەلەمبارەیەوە کەبۆ لەبەرکردنی قوتابیانی زانست چونکە ئەندازە گرنگتر و پێویستترە. خوداش ئافەرێنەری دانایە[٣٠٤].

---

[٣٠٤] (وَهُوَالخَلّاقُ العَلِيم) س يس ئا ٨١.

## بەشێك

دەبێت ئەوەش بزانین کەمەبەست لەونەقڵەی کەبەهۆیەوە لوغەت و زمان دەسەلمێت ئەوەیە کەلەعەرەبەوە نەقڵی دەکەن ئەمان لەفزگەلێکی تایبەتیان بۆ ماناگەلێکی تایبەت بەکار هێناوە، نەك ئەوەی کەنەقڵیانکردوو ئەوان لوغەتەکانیان داناوە، چونکە ئەم جۆرە نەقڵە دژوارە و دوورە لەتەریقەی زمانەوانیەوە و هیچکەس ئەم دانانە ناناسێت. وەهەروەها ناتوانین لوغەتەکان بەقیاسکردنی ئەوەی کە بەبەکارهێنانی ئەو زانراوە لەگەڵ ئەوەی کە بەبەکارهێنانی ئەو ناسراوە بسەلمێنین، بۆنمونە بەئیعتیباری ئەوەی کە بەئیتیفاق لەسەر سەرخۆشکەری ووشەی (خمر) کەئاوی ترێیە حوکمیانکردووە، و دەتوانین لوغەتەکانی تری قیاس بکەینەسەر و بەهەر سەرخۆشکەرێك بڵێین خمر، چونکە بەموعتەبەر زانینی لێکچوونی شتەکان لەبابی قیاسدا تەنها لەرێگەی شەرعەوەیە کەلەئەصڵی قیاسەوە رێنماییمان دەکات بۆ لای صیحەتی ئەو ئێمەش لەلوغەتدا وەها قیاسێکمان نیە، مەگەر بەحوکمی ئەقڵ و ئەوەش تەحەکوم و قیاسێکی بێ بەڵگەیە و جمهوری ئیمامەکان لەسەر ئەم بۆچوونەن.

وەهەرچەندە قازی (باقلانی) و ئیبن سریج و ئەوانیتریش دەستیانکردووەتە قیاس بەلأم بۆچوونی ئەوانەی کە نەفی ئەوانەیان کردووە راجیح ترە. وەنابێت وابزانین کەسەلماندنی لوغەت لەبابی سنورە لەفزیەکاندایە، چونکە سنور (حد) دەگەرێتەوە بۆ ماناکان بەم شەرحەش کەمانای لەفزی مەجهول و شاراوە بریتیە لە مەدلولی روون و بەناوبانگەو، ئێستەش لوغەت بۆ سەلماندنی ئەوەیە کەلەفزی فلأن بۆ فلأن مانایە. جیاوازی نێوان هەردوو بەشەکە لەو پەڕی روونیدایە.

## زانستی بەیان

بیان لەنێو نەتەوەی ئیسلامدا زانستێکی نوێیە و ئەوەش لەپاش زانستی عەرەبی و لوغەت بەکارهێنراوەو لەزانستەکانی پەیوەست بەزمانەوەیە، چونکە ئەوزانستە پەیوەستە بەئەلفاز و هەرمانایەکەوە کەئەلفازەکەی ئەوان بگەیەنێت و بەوان دەلالەتی ماناکان مەبەست بێت لەسەر ئەو مەفهومە. بەمانایەکی تر ئەو شتانەی کەقسەکەر بەوان مەبەستی ئەوەبێت سود بەبیسەر بگەیەنێت بەقسەکانی خۆی یان بریتیە لەتەسەوری موفرەداتێك کەببنە مسند ومسندالیە هەندێکیان پەیوەست دەبن بەهەندێکی تریانەوە، وەدەلالەت دەکاتەسەر ئەم مانای موفرەداتی اسم فعل و حرفانە. وەیان ناسینی مسند لەمسندالیە و ئەزمینە (زەمانی فیعلەکان) نە ئەوانە بەهۆی گۆڕینی حەرەکاتەکان یان اعراب و بیناکان(ابنیە) ی ووشەکان نیشاندەدرێت. هەموو ئەمانە صەناعەتی نحو پێکدەهێنن. وەلەو شتانەی کەبەرپوداو گەلێك دەورە دراون پێویستیان بەدەلالەتە، ئەحوالی قسەکەرەکان لەگەلّ یەکتریدا یان فاعیلەکان و ئەوەی کە حالّی فیعل دەیخوازێت، دەمێنێتەوە کەپێویستی بەدەلالەتە لەسەر فعل، چونکە ئەم شتەلەوپەڕی کاملّبوونی ئیفادەدایە وەکاتێك کەبۆ قسەکەر دێتەدی و دەگاتەئەوپەڕی ئیفادە لەقسەی خۆیدا هەرکات هیچ بەشێکی نەگرێتەوە ئەلّبەت لەجۆری قسەی عەرەب ناژمێردرێت، چونکە بازنەی قسەی عەرەب بەرینە و لەلای ئەمان بۆ هەرپلەیەك قسەیەك هەیە. کەلەپاش تەواوبووی اعراب و ڕوونی و ڕۆشنی بابەتی ئەو گوفتارە تایبەتە بەو مەقامە دیاریکراوە، وەمەگەر نابینی کەلەقسەی ئەماندا جملەی: زید جائنی (زەید هات بۆلای من) جیاوازە ؟ لەورووەوەی کە لەلای قسەکەر هەریەکە لەبەشەکانی جملەکە پێش بکەوێت

هەرجێگەی گرنگی ئەوە چونکە لەگەڵ (جائنی زید) هەریەك مانا دەگەیەنێت و، بەپلەی یەکەم گرنگی بەهاتنی مسند دەدات نەوەك کەسی مسنداليه. وەئەوەشی کەدەڵێت: (زید جائنی) زەید هات بۆلای من، قسەکەی ئەوەدەگەیەنێت کە گرنگی ئەو بەرلەهاتنی مسند بەمسنداليه یە هەروەها تەعبیر لەبەشەکانی جملە بەوەی کە گونجاوی مەقامەکەبێت وەك موصولّ یان مبهم یان معرفه وەهەروەها بەشێوەیەکی گشتی تەئکیدی اسناد بۆسەرجملە وەك ئەوەی کە سێ جملە: زەید وەستاوە، بەتەئکید زەید وەستاوە، بێگومان زەید لەهەرکاتێکدا وەستاوە. بەتەواوی لەڕووی دەلالەتەوە لەیەکتری جیاوازن هەرچەندە لەڕووی ئیعرابەوە بەرابەر بن، چونکە ڕستەی یەکەمین کەتەئکیدی تێدا نیە بۆ بیسەرێك بەسود دەبێت کەلەمبارەیەوە بەسادەییەوە بیر بکاتەوە زەینی لەهەرجۆرە گومان و دودڵیەك خاڵی بێت.

وەجملەی دووەم کەتەئکید کراوەتەوە بۆ کەسێك کەدودڵی و گومانی هەبێت بەسوودە وەجملەی سێیەم بۆ کەسی ئینکار سودبەخشە. هەربۆیە ڕستەنابراوەکان جیاوازن. وەهەروەها گۆیا دەڵێت: ئەوپیاوە هات بۆلای من، دواتر لەبری ئەو جملەیە بەهەمان شێوە دەڵێت: پیاوێك هات بۆلای من کاتێك مەبەستی ئەو لەنەکیرەهێنانی (فاعل) بکەر بەگەورەزانینی ئەو بێت و بیەوێت کەئەو پیاوێك بێت کەهیچکام لەپیاوان هاوتای نین. دواتر دەبێت بزانین کەسیاقی جملەی ئیسنادی هەندێك جار خەبەری و هەندێك جاریش ئینشائیە. جۆری یەکەم ئەوەیە کە خارجی بێت ئیتر ئەو خاریجیە موتابەقەت بکات یان نەیکات، وەجۆری دووەم خاوەن خاریجی نیە وەك داخوازی و جۆرەکانی. دواتر دەبێت ئەوەبزانین کەهەندێکجار تەرك کردنی عاتیف لەنێوان دوو جملەدا پێویست دەبێت، ئەوەش کاتێکە کەجملەی دووەم مەحەلی لەئیعرابدا هەبێت بەم هۆیەوە وەك تابیعی مفردی جملەی دووەم دەبێت وەك: نعت (صفه) یان تەئکید یان بدل.

لەم شێوەیەدا عەتف ڕەوا نیە هەندێك جاریش عەتف پێویستە ئەوەش کاتێکە کەجملەی دووەم مەحەلێکی لەئیعرابدا نەبێت و، سەرەڕای ئەمەش هەندێکجاریش مەقامو

مەحەللی قسە پێویستدەکات درێژەی پێبدرێت (اتناب) یان کورت بکرێتەوە(ایجاز)، وەبەناچاریەوە دەبێت قسەکە بەپێی پێویستی شوێنەکە کرت یان درێژ بکرێتەوە. دواتر هەندێکجار لەفزەکە بەکار دەهێنین لەبری ئیرادەکردنی قسەپێکراو ئەگەر مفرد بێت ئەوا لازمەکەیمان دەوێت وەك ئەوەی کەکاتێك دەڵێین: زەید شێرە، مەبەست حەقیقەتی شێر کەقسەپێکراوی قسەکەیە نیە، بەڵکو مەبەست ئازایەتی شێرە کەلەلەوازیمەکانیەتی مەبەستی دەکەین و دەیدەینە پاڵ زەید.

بەم شێوەیەی قسەش دەڵێین (استیعارە) وەهەندێکجاریش لەلەفزی مرکب لەسەر مەلزومەکە دەلالەت دەکرێت وەك: زەید خۆڵەمێشی زۆرە، ئەوەی کەمەبەستە لەزەیدا (کینایە)ی بەخشینی زۆرو میوان نەوازیە، چونکە خۆڵەمێشی زۆر لەچێشتخانەی ماڵێکدا بەهۆی زۆری میوان و نانخۆری ماڵی ناوبراوەوەیە و مانای ئەو دووسیفەتە دەگەیەنێت، هەربۆیە هەموو ئەو بوارانەی کەباسمانکرد دەلالەتگەلێکی زیاتر لەدەلالەتی ئەلفازە مفرەدو مورکەبەکان دەبێت، بەڵکو ئەمانە بریتین لەچۆنیەتی و ئەحواڵگەلێك بۆ ڕووداوەکان دەژمێردرێن، کەبۆ دەلالەت لەسەر ئەوان لەلەفزەکانیشدا هەمان ئەو جۆرە چۆنیەتیو ئەحوالآنەی دانراون و هەریەکە بەپێی ئەوەی کە مەقام و شوێنەکەیان دەیخوازێت دەبن. ئەم زانستەش کەناوی بیانە باسی ئەم جۆرە دەلالەتانەی تێدایە کەتایبەتە بەهەیئەت و ئەحواڵەکانە لەمەقامە جۆراو جۆرەکاندایە و بریتیە لەسێ شێوە:

١ – جۆرێك کەتێیدا باسی ئەم ئەحوڵ و شێوازانە دەکرێت کەهەموو پێویستیەکانی حاڵ لەگەڵ لەفزدا موتابەقە دەکات ئەمەش پێی دەڵێن زانستی بەلاغەت.

٢ – هەرجۆرێك کەتێیدا باس لەدەلالەت لەسەر لازمی لەفزو مەلزومەکەی بکرێتو، هەروەك گوتیشمان بریتیە لەاستعارە و کنایە و پێی دەڵێن زانستی بیان.

٣ –جۆرێکی تریان لکاندووە بەم دووجۆرەوە کەباس لەجوانکاری قسەدەکات ئەوەش بەیەکێك لەجۆرەکانی جوانکاری لەقسەدا دەبێت، یان بەسەجعێك کەووشەکە جیا دەکاتەوە یان تەجنیسێك کەلەفزەکان دەکاتە لێکچووی یەکتری، وەیان تەرصیعێك

کەوەزنی لەفزەکان دەپچڕێنێت و تەقتیع دەکات، یان تەوریە بەابهامی مانایەکی شاراوەتر لەو بەهۆی ئەوەی کە هاویەشە، یات تیباق بەهۆی تەقابولی نێوان دژ و ئەزدادەکانەوە. و نمونەی ئەمانە.. بەم جۆرەش دەڵێن زانستی بدیع.

ئەدیبە نوێکان بەسێ ناو باسی زانستی بیانیان کردووە ئەمەلەکاتێکدا بەیان ناوەکەی جۆری دووەمە چونکە پێشینانی یەکەمین جار باسی ئەویانکردووە دواتر مەسەلەی هونەرەکەیان یەك لەدوای یەك پەیوەستکردووە پێیەوە. لەمبارەیەشەوە کەسانێکی وەك جەعفەری کوڕی یەحیا و جاحیز و قودامە و نمونەی ئەمانە کتێبگەلێکیان نوسیوە کەهێندەش بۆ مەبەستەکە بەس نیە، دواتریش مەسەلەکانی ئەم هونەرەیان کۆکردەوەو تەهزیبیان کرد و بابەکانیان بەپێی شێوازێك کەئێمە لەم بەشەدا باسمانکرد تەرتیبی کردن و، کتێبی (مفتاحی) لەنحو تصر یفَ و بیاندا داناو ئەم هونەرەشی خستە ناویەشەکانیەوە و پاشینانیش لەکتێبەکەی ئەوەوە وەریانگرتو امهاتێکیان لێ کورتکردەوە کەتاوەکو ئەم سەردەمەش دەخوێندرێت هەروەك چۆن سماکی لەکتێبی (بیان)و ئیبن مالیك لەکتێبی (مصباح)و جلال الدینی قزوینی لە کتێبی (ایضاح و تلخیص) دا کەقەبارەکەی بچووکترە، گرنگیان بەم مەسەلەیە داوە.

لەم سەردەمەدا خەڵکی مەشریق لەشەرحکردن و فێرکردنی تلخیص دا لەهەموو کتێبێك زیاتر گرنگیان دەدا. بەکورتی شەرقیەکان لەمبارەیەوە لەغەربیەکان بەتواناترن و هۆکارەکەشی (خودا داناترە)، ئەوەیە کەهونەری ناوبراو لەنێو زانستەکانی زماندا لایەنی کەمالی و هونەری هەیە صنعەتە کەمالی و هونەریەکان لەقۆناغی گەشەی ئاوەدانی کۆمەڵگەدا دەستدەکەوێت، هەروەك باسیشمانکرد پێشکەوتن و گەشەسەندنی ئاوەدانی لەمەشریقدا زۆرزیاترە لەمەغریب. یان باشتر بڵێین هۆکارەکەی گرنگیدانی ئێرانیەکان کەبەشێکی زۆری خەڵکی شەرق پێکدەهێنن بەتەفسیرەکەی زمخشریە کەهەموو بابەتەکانی لەسەر ئەم هونەرە دامەزراون و بەبناغەی هونەری ناوبراو دەژمێردرێت ئەو جۆرەی کەتایبەتە بەخەڵکی مەغریبەوە بەتایبەت زانستی بدیعە، کەئەم زانستە لەڕیزی

زانستەکانی ئەدەبی شیعردا هەژمار کراوە و کردوویەتی بەچەندین ناوونیشانەوە و دابەشی کردووە بەچەندین بابەوە و جۆری جیاوازی لێ دروستکردووەو، زادەزانن کەئەمان ئەو زانستەیان لەزمانی عەرەبیەوە دەرهێناوە و خەڵکی مەغریب تەنها کاریان لەسەر جوانکاریەکانی کەلام کردووەو سەرەڕای ئەمەش فێربوونی زانستی بدیع ئاسانەو، فێربوونی هونەری بەلاغەت و بەیانیان بۆ مەغریبەکان بەکارێکی دژوار نیشانداوە، چونکە لەهونەرەناوبراوەکاندا ئەندێشەی وورد ماناکان دژوارن هەربۆیە خۆیان لەفێربوونی دوور خستووەتەوە. وەلەو کەسانەی کەلەزانستی بدیع دا لەخەڵکی ئەفریقا کتێبیان نوسیوە. ئیبن ڕەشیقە کەکتێبی (عمدە) کەی بەناوبانگە و زۆرێك لەخەڵکی ئەفریقاو ئەندەلوس پەیڕەویان لەشێوازەکەی ئەو لەم کتێبەدا کردووە و، دەبێت ئەوەش بزانین کە بەرهەمی ئەم هونەرە ئەوەیە کە مرۆڤ بۆ تێگەشتن لەئیعجازی قورئان ڕێنمایی دەکات. چونکە ئیعجازی قورئان لەوپەڕی دەلالەتەکانیدا لەسەر هەموو موقتەزیاتەکانی ئەحواڵ، ئیتر لەڕووی مەنتوق یان لەڕووی مەفهومەوە بێت، وەئەمەش بەرزترین پلەکانی قسەیە لەگەڵ کەماڵدا لەشتانێکدایە کەتایبەتە بەهەڵبژاردنی لەفزەکان و جوانی ڕێکخستن و تەرکیبیانەوە، ئەمەش هەمان ئەو ئیعجازەیە کەفەهمەکان لەتێگەشتنی بێتوانان تەنها چەند دەقیقەیەك کەسانێك لێی تێدەگەن کەبەهۆی زۆر تێکەڵیان لەگەڵ زمانی عەرەبی و زەوق و ئەلەکەکەیەوە بۆ ئەمان هاتووەتەدی و، هەریەکەیان بەئەندازەی زەوق و ئارەزووی خۆی ئیعجازەکەی دەرك دەکەن.

هەربۆیە مەشاعیر و مەداریکی ئەو تازی و غەزاکەرو سوارانەی کەقورئانیان لەموبەلیغەکەیەوە بیستووە لەو بەرزترینی پلەکاندایە، چونکە ئەوان لەپێشەنگانی قسە و ڕەخنەگرانن و ئەو پەڕی زەوق و ئارەزوو لەلای ئەمان بەباشترین و ڕاسترین شێوە بوونی هەبووە. ئەوانەشی کەلەهەمووکەسێك زیاتر پێویستیان بەم هونەرە هەیە موفەسیرەکانن و زۆربەی تەفسیری پێشینان لەم هونەرە خاڵیەو دانەرەکان لەمبارەیەوە بێئاگابوون تائەوکاتەی کەجاروڵڵەی زمخشری دەرکەوت و، کتێبەکەی خۆی لەتەفسیردا

دانا و ئایەتەکانی قورئانی بەپێی ئەحکامەکانی ئەم هونەرە بەدواداچوونی بۆکردن، بەوهۆیەوە هەندێك لەبەشەکانی ئیعجازەکەی ئاشکرابوو لەم ڕووەوە ئەگەر ئەو عەقیدەی بیدعەچیەکان لەکاتی دەرهێنانیاندا لەقورئان بەبوونی بەلاغەت پشتگیری نەدەکردن، تەفسیرەکەی لەنێو تەفسیرەکاندا بەهۆی ئەم جیاوازیەوە تایبەت دەبوو هەربۆیە زۆرێك لەئەهلی سوننەت بەو توێشووە فراوانەی کەخاوەنی ئەم کتێبە لەبەلاغەتدا هەیەتی بەڵام هێشتا لێی دوور دەکەونەوە، بەڵام ئەگەر کەسێك عەقیدەکانی سوننەت بەباشی بزانێت و لەم هونەرەدا تائەندازێك بەشداری بکات بۆ ئەوەی بتوانێت بەجۆری هەمان قسە ڕەتی بکاتەوە، یان بزانێت کەتەفسیری ناوبراو بیدعەتە و لێی دوور بکەوێتەوە و زیانێك نەگەیەنێت بەعەقیدەکانی ئەو، هەربۆیە پێویستە لەسەری کەئەم کتێبە بخوێنێتەوە تاوەکو هەندێك لەخاڵەکانی ئیعجازی دەستبکەوێت و، لەهەمانکاتیشدا لەبیدعەت و هوابازیەکانی پارێزراوبێت. وەخوداش هەرکەسێك کەبیەوێت ڕێنمایی دەکات بۆ ناوەندی ڕێگا.

# زانستی ئەدەب

ئەم زانستە بابەتێکی نیە کەتێڕوانین لەسەلماندنی عەواریز یان نەفی کردنیاندا بکەین، بەڵکو مەبەست لەو لەلای ئەهلی زمان بریتیە لەسەمەرەو نەتیجەکەیەتی کەبریتیە لەشارەزابوون لەهەردوو هونەری شیعر و پەخشان و، شێوازەکانی مەبەستی زمانی عەرەبیە هەربۆیە قسەکانی عەرەبیان بۆ لەبەرکردن کۆکردووەتەوە و بەوهیوایەی کەمەلەکەکەی بۆیان بێتەدی. وەك ئەو شیعرانەی کەلەتەبەقەی بەرزی شیعردایە و ئەو سەجعانەی کەلەجوانی و بەهێزیدا بەرابەرن لەگەڵ ئەو شیعرانەدا و مەسەلەگەلێك لەلوغەت و نەحو لەلەناویاندا بلاّو جیابونەتەوە. بەجۆرێك عەودالّ و خوێنەری ئەم جۆرە هەڵبژاردە ئەدەبیانە بەزۆری بەناو بەشێکی زۆری یاساکانی زمانی عەرەبیدا دەگەڕێن، لەهەمانکاتیشدا هەندێك لەسەردەمانی جەنگی عەرەب دەخوێنێتەوە و بەم هۆیەوە پەی دەبات بەخالگەلێك کەلەبارەی ئەم جەنگانەوە لەشیعرەکاندا هاتووە، وەهەروەها نەسەبی گرنگ و بەنابانگ و هەواڵە گشتیەکان دەخوێنێتەوە، مەبەستیش لەفێربوونی هەموو ئەمانە ئەوەیە کەخوێنەر و عەودالّی ئەدەب هیچکام لەقسەئەدەبی و شێواز و ناوەڕۆك و مەبەستەکانی بەلاغەتی عەرەب لەکاتی لێکۆڵینەوە و بەدواداچووندا بەشاراوەیی نەمێننەوە، چونکە مەلەکە بەهۆی لەبەرکردنەوە کاتێك دێتەدی کەکەسەکە لەبابەتەکان تێبگات، هەربۆیە عەودالّی ئەم مەلەکەیە ناچارە هەموو ئەو شتانە بخاتە پێشەوە کەتێگەشتنی ئەویان لەسەر وەستاوە. لەپاش ئەم پێشەکیە ئەگەر بیانەوێت سنوری پێناسە و تعریفی ئەم هونەرە لەبەر بکەن دەڵێن: ئەدەب بریتیە لەلەبەرکردنی شیعر و مێژووی عەرەب وبەدەستهێنانی مەڵۆیەکە لەخەرمانی هەرزانستێك. مەبەستیش

لەم زانستانە برتین لەزانستەکانی پەیوەست بەزمان و زانستەشەرعیەکانە تەنها لەڕوانگەی دەقەکانیانەوەیە کەبریتین لەقورئان و حەدیس.

چونکە لەزمانی عەرەبیدا مەدخەلێك بۆ غەیری ئەم زانستانە نیە بێجگە ئەو شێوەیەی کەهەندێك لەپاشینان ڕوویان تێکردووە، کەبریتیە لەوەی کەگروپێك لەڕووی حەزیانەوە بۆ صەناعەتی بەدیع لەکاتی هێنانی صنعەتی تەوریە لەشیعرەکانیاندا قسەکان بەرەو زاراوە زانستیەکان دەبەن. هەربۆیە خاوەنی ئەم هونەرە بەم چۆنیەتیەوە دەبێت زاراوەی زانستەکان بزانێت. ئێمەش لەمەشایخەکانی خۆمان لەکۆڕو کۆبوونەوەکانیاندا بیستوومانە کەئوصولێ و ڕووکنەکانی ئەم هونەرە چوار دیوانە: ١ – ادب الکاتب دانراوی ئیبن قوتەیبە ٢ – کامل ی موبەڕەد ٣ – البیانێ والتبیین ی جاحیز ٤ – نوادر ابو علی قالی بغدادی. بێجگە لەم چوار کتێبەش هەرچیەکی تر هەیە شوێنکەوتەی ئەوانەو فەرعن بۆ ئەوان. کتێبی ئەدیبانی نوێ لەمبارەیەوە زۆرو زەوەندن. لەسەرەتای یەکەمی سەردەمی ئەدەبیدا هونەری گۆرانی بەبەشێك لەم هونەرە دەژمێردرا، چونکە گۆرانی شوێنکەوتەی شیعرە و تەنها ئاوازێکە بۆی ئەو نوسەرو خاوەن فەزڵانەی کەلەکەسەتاییەتەکانی دەوڵەتی عباسیەکان دەژمێردران، لەڕووی دڵبەندیان بۆ فێربوونی شێوازە جۆراوجۆرەکانی هونەری شیعرەوە کەهەیانبوو هەربۆیە زۆر حەزیان لەگۆرانی دەکرد، هەربۆیە بەپیشەکردنی گۆرانیان نەکردبووە تەعنێك بۆ سەر کەسایەتی و پیاوەتی گۆرانیبێژ.

وەقازی ابوالفرەجی ئەصفەهانی کتێبەکەی خۆی لەبارەی گۆرانیەوە داناو تێیدا هەواڵو شیعر و نەسەبەکان و ڕۆژی جەنگەکانی دەوڵەتانی عەرەبی کۆکردووەتەوە، بنەمای ئەو کتێبەی لەسەر گۆرانی لەبارەی سەد دەنگەوە داناوە و کەگۆرانیبێژەکان بۆ ڕەشیدیان هەڵبژاردبوو، ئەو لەم بابەتەدا بەباشی ئەنجامی داوە و کتێبێکی زۆر جامیع و کامڵی پێکەوەناو سوێند دەخۆم کەکتێبەکەی ئەو دیوانی عەرەبو باشترین کۆمەڵەی بەرهەمە پەراگەندەکان بوو، کەڕابووردوانی هەریەکە لەهونەرەکان بەیادگار بەجێیان

هێشتبوو وەك: شیعر و مێژوو گۆرانی و چۆنیەتیەكانی ترو ئاداب. وەتا ئەو شوێنەی كەئێمە زانیاریمان هەیە لەمبارەیەوە كتێبێك نیە كەهاوشێوەی ئەو بێت و بابەتەكانی ئەو كتێبە وەك ئامانجێكی بەرز وایە كە هەرئەدیبێك بۆ بەدەستهێنانیان هەوڵی بۆ دەدات و لەبەرامبەر كەماڵیدا هەڵوەستەی كردووە.

وەچۆن دەتوانێت بەو ئامانجە بگات وەئێمەش ئێستاكە بەشێوەیەكی گشتی دەستدەكەین بەتەحقیق لەمەسەلەگەلێكی زانستەكانی زمان كەلەبارەیانەوە گفتووگۆمانكرد، خوداش رێنمای مرۆڤە بۆسەر رێگەی باش.

# بەشی سی و هەشتەم

## لەبارەی ئەوەی کەزمان مەلەکەیەکە وەك مەلەکەی صنعەتەکانە

دەبێت ئەوە بزانین کەهەموو زمان و لوغەتەکان مەلەکەگەلێکن وەك مەلەکەکانی صنعەت، چونکە ئەوانە تواناو ئامادەباشی گەلێکن.لەزماندا بۆ تەعبیرن لەماناکان لێهاتوویی یان بێتوانایی لەتەعبیردا وابەستەیە بە کاملّی یان نوقسانی ئەو توانا یان مەلەکەیە و، ئەم مەلەکەیەش لەڕێگەی خوێندنەوەو فێربوونی موفرەداتەوە بەدی نایەت بەڵکو دەبێت تەرکیباتەکان، فێرببن هەربۆیە هەرکات لەتەرکیب کردنی لەفزە مفرەد و تاکەکاندا قسەکەر بۆ تەعبیر کردن لەو مانایانەی کەئیرادەیان دەکات و دەیانهێنێت مەلەکەیەك بێتەدی و، هەم لەتەعبیر کردن لەماناکاندا تەرکیبگەلێك لەبەرچاو بگرێت کەقسەکە لەگەڵ داخوازی و موقتەزای حاڵەکەدا بگونجێت و موتابەقەت بکات، ئەوکات دەگاتە ئامانجی خۆی کەسود گەیاندنە بەبیسەر. مانای بەلاغەتیش هەرئەمەیە. مەلەکە و تواناکان بێجگە بەدووبارە کردنەوەی کارەکان بەدەست نایەن، چونکە هەرکارێك سەرەتا کەڕوودەدات لەو سیفەتەی زاتی ئینسان دەگەڕێتەوەو لەپاش دووبارەکردنەوەی ئەو سیفەتە دەگۆڕێت بۆ حاڵێك و، مانای حاڵیش لێرەدا بریتیە لەسیفەتێکی غەیرە ڕاسیخ و کاتێك کەدووبارەکردنەوەکە زۆردەبێت ئەو حاڵە دەبێتە مەلەکە، واتە دەبێتە سیفەتێکی ڕاسیخ. هەربۆیە گۆیای عەرەب لەوکاتەی کە مەلەکەی زمانی عەرەبی لەودا بوونی هەبێت قسەو شێوازەکانی دەربڕینی هاوڕەگەزەکانی خۆی لەناوەڕۆکی ئەو قسانەی کە لەگەڵ یەکتریدا دەیانکرد، دەیبیستن و گوێی بۆ چۆنیەتی تەعبیر کردن لەمەبەستەکانیان

دەگرت و هەروەك چۆن منداڵ بەکارهێنانی مفرەداتەکان دەبیستێت و فێریان دەبێت و، دواتریش تەرکیباتەکان دەبیستێت و فێریشیان دەبێت و دواتریش ئەم تەعبیراتانە بەشێوەی دەم بە دەم لەهەر قسەکەرێکەوە نوێ دەبنەوە و بەکارهێنانیان بەدووبارەکردنەوە دەبیستێت و، تاوەکو سەرئەنجام ئەوئەلفاز و تەرکیبگەلەی کە فێریانبووە وەك مەلەکە و سیفەتێکی ڕاسیخیان لێدێت و ئەویش وەك خەڵکانی تر تەعبیر لەمەبەستەکانی خۆی دەکات.

بەم شێوەیە زمان و لوغەتەکان لەنەوەیەکەوە دەگوازرێنەوە بۆ نەوەیەکی تر و خەڵکی بێگانە و منداڵان فێریاندەبن. لێرەدایە کەمانای قسەگشتیەکە دەردەکەوێت کەدەڵێن: زمان بۆ عەرەب تەبعەن دێتەدی واتە بەهۆی ئەو یەکەمین مەلەکەیەوە بەدەستدێت کەلەخۆیانەوە وەرگیراوە نەك لەگەلانی ترەوە. دواتر هێندەی نەبرد کەئەم مەلەکەی هۆزی موزەڕە بەهۆی ئەوەی کە تێکەڵی بێگانەکانیان کرد خراپ بوو، دواتر خراپەکە بەجۆرێك بوو کەمنداڵی ئەم نەوەیەی ئەمان لەتەعبیرکردن لەمەبەستەکانی چۆنیەتی گەلێکی تری بێجگە لەچۆنیەتیەکانی زمانی عەرەبیان دەبیست و، بەهۆی تێکەڵی لەگەڵ گروپێکی زۆری بێگانەوە بەهەمان چۆنیەتی ئەوان تەعبیری لەمەبەستەکانی خۆی دەکرد و لەهەمان کاتیشدا چۆنیەتی تەعبیرکردنەکانی عەرەبیشی دەبیست، لەئەنجامدا شتەکەی لێ ئاڵۆز دەبوو بەشێك لەم و بەشێکیش لەوی وەردەگرتو بەم هۆیەوە مەلەکەیەکی نوێ هاتەدی کەبەبەراورد بەمەلەکەی پێشوو نوقسان بوو. ئەمەیە مانای فەسادی زمانی عەرەبی.

هەربۆیە زمانی قورەیش بەفەصیحترین و پاراوترینی زمانی عەرەبی دەژمێردرا چونکە ئەوان لەمەملەکەتە عەرەبیەکانەوە بەهەمووشێوەیەك دوور بوون دوای قورەیشیش زمانو لوغەتی ئەو هۆزانە پاراو بوو بەپلەی دووەم کەلەنزیك قورەیشدا دەژیان وەك: سەقیف و هەزیل و خوزاعە و بەنی کینانە و غەتفان و بەنی ئەسەد و بەنی تەمیم، بەڵام ئەو هۆزانەی کە لەمانەوە دووربوون وەك ڕەبیعە و لەخم و جزام و غەسان و ئەیاد و

قزاعە و عەرەبی یەمەن کەلەدراوسێکانی ئێران و ڕۆم و حەبەشە دەژمێردران، مەلەکەی زمانیان تەواو نەبوو، چونکە ئاوێتەی بێگانەکان بوبون، وەئەهلی صەناعەتی زانستە عەرەبیەکان بەنیسبەتی دووری هۆزەکانەوە لەقورەیش بەڵگە بەصەحیحی و فاسیدی لەهجە و زمانەکان دەهێنرێتەوە، خوداش داناترە.

# بەشی سی و نۆیەم

## لەبارەی ئەوەی کە زمان عەرەبی لەم سەردەمەدا بەزمانێکی سەربەخۆو جیاواز لەلوغەتی موزەڕ و حەمیر دادەنرێت

دەبینین کە ئەم زمانە لەباسکردنی مەبەستەکان و گەیاندنی دەلالەت بەپێی نەریتەکانی زمانی موزەڕە و، هیچکام لەبنەماکانی بێجگە لەدەلالەتی حەرەکات لەدیاریکردن و جیاکردنەوەی مفعول لەفاعل ی لەدەست نەداوە. هەربۆیە لەبری ئەو پێشخستن و دواخستن و قەرینانەیان بەکار هێناوە کەدەلالەت دەکاتە سەر تایبەتمەندی مەبەستەکان، بەلاّم بەم جیاوازیەوە کەبەیان و بەلاغەت لەزمانی موزەڕیدا زیاتر و ریشەدارترە، چونکە لەفزەکان دەلالەت لەسەر عەینەکانیان دەکەن و ماناکانیش لەسەر عەینەکانیان دەکەن و ئەو کات خوازیارو موقتەزای حاڵەکە کەئەمان پێی دەڵێن ڕاخەر (بیسات)ی حالّ و، پێویستی بەشتێك دەبێت کەدەلالەت بکاتە سەری و هەرمانایەکیش بەناچاریەوە دەبێت حالّگەلێك بگرێتەوە کەتایبەتە پێیەوە هەربۆیە دەبێت ئەم ئەحوالانە لەئەدای مەبەستەکەدا لەبەرچاوبگیرێن، چونکە بەشێکن لەسیفەتەکانی. ئەحوالّی ناوبراو لەهەموو زمانەکاندا بەزۆری بەهۆی لەفزگەلێکەوە نیشاندەدرێن کەبەتایبەت بۆ ئەم مەبەستە دادەنرێن، بەلاّم لەزمانی عەرەبیدا لەڕێگەی چۆنیەتی و تایبەتمەندیەکانەوە کەلەتەرکیبی لەفزەکاندا ڕوو دەدات نیشاندەدرێن، وەك تەقدیم و تأخیر یان حەزف یان حەرەکەتی اعراب. وەهەندێکجاریش بەهۆی پیتگەلێکەوە نیشانیاندەدەن کەسەربەخۆ

نین هەربۆیە وەك باسمانکرد تەبەقاتی قسە لەزمانی عەرەبیدا بەپێی جیاوازی دەلالەت لەسەر ئەم چۆنیەتیانە جۆراو جۆر و جیاوازە و هەربۆیە قسەی عەرەبی کورتتر و لەگەیاندنی مەبەستیشدا لەفزو عیبارەت و دەستەواژەکانی لەهەموو زمانەکان کەمترن. ئەمەش مانای ئەو قسەیەی پێغەمبەرە(ص) کەدەفەرمێت: (لەقەسەکردندا جوامع الکلم بەمن بەخشراوە و بەئەندازەی پێویست کورت و پوختە.) لەمبارەیەوە دەبێت ئاماژە بەو بابەتە بکەین کەلەبارەی عیسای کوڕی عومەرەوە گێڕدراوەتەوە؛ ئەوەش ئەوەیە کەیەکێك لەنحویەکان پێی گوتووە: من جۆرێك لەدووبارەکردنەوە لەقسەی عەرەبیدا دەبینم کەدەڵێن ( زەید وەستاوە) زید قائم بەتەئکید زەید وەستاوە، (ان زیدا قائم) بەدڵنیایی و بێ گومان زەید وەستاوە، ان زیدا لقائم ئەمەلەکاتێکدا مانای هەرسێ جملەکە یەکێکە، بەڵام عیسای کوڕی عومەر گوتی: نەخێر ماناکانیان جیاوازە چونکە جملەی یەکەمین بۆ ئاگادار کردنەوەی کەسێکە کە زەینی خاڵیە لەوەستانی زەید. وەدووەمیش بۆ کەسێك کە ئاگاداری وەستانی زەید بووە بەڵام ئینکاری دەکات، سێیەمیشیان بۆ کەسێکە کە سوورە لەسەر ئینکاری کردنەکەی.

کەواتە جیاوازی دەلالەت بەپێی جیاوازی ئەحواڵەکانە ئەم جۆرە بەلاغەت و بەیان تائەمڕۆکەش نەریتی عەرەب بووە و نابێت باوەڕ بەهەڵەکاریەکانی نحویەکان بکەین کەتەنها ئەهلی صەناعەتی اعرابن و ئیدراکیان توانای تەحقیقی نیە، چونکە وادەزانن لەم ڕووەوە بەلاغەت لەم سەردەمەدا لەناوچووە و زمانی عەرەبی خراپبووە کاتێك خراپە و فەساد چووەتە ناو اعرابی کۆتایی ووشەکانی ئەو هونەرەوە، کەئەوان سەرگەرمی خوێندن و موتاڵاکردنی بوون. ئەمەش قسەیەکە کە باوبوون لەتەبعی ئەواندا دروستیکردووە و نەتوانی ئەویان داوە بەگوێی ئەندێشە و دڵیاندا.

وەگەرنا ئێمە ئێستاکە دەبینین زۆرێك لەلەفزەعەرەبیەکان وەك خۆیان ماونەتەوە و تەعبیر لەمەبەستەکان و جیاوازی لەتەعبیردا بەنیسبەتی جیاوازی ڕوونی و ڕاشکاوی تاکو ئێستەش لەقسەکانیاندا بوونی هەیە، لەگفتوگۆکانیشیاندا شێواز و هونەری جۆراو جۆری

زمان ئیتر شیعر یان پەخشان بێت بوونی هەیە. خەتیبی بەلیغ و ڕەوانبێژ لەئەنجومەن و کۆڕوکۆبوونەوەکانیاندا ووتار دەدەن و شاعیری بەتوانا شیعری سەرسوڕهێنەر دەهۆنێتەوە زەوقی دروست و تەبعی سەلیم گەواهیدەرە لەسەر ئەم بانگەشەیە. وەعەرەب ئەمڕۆکەش هیچ چۆنیەتیەکی زمانی نوسراوو دانراو بێجگە لەحەرەکاتی اعرابو کۆتایی کەلیماتەکانی لەدەستنەداوە اعراب هەمان ئەو چۆنیەتیەیە کەتەنها لەزمانی موزەڕدا بەتاکە شێواز و تەریقەیەکی بەناوبانگ دەژمێردرێت و، ئەوەش هەندێکە لەئەحکامەکانی زمان هۆکاری ئەوەی کەزمانی موزەڕ گرنگی پێدراوە ئەوەیە کەزمانی ئەو هۆزە لەپاش زاڵبوونی عەرەب بەسەر وولآتانی عێراق و شام و میسر و مەغریبدا و بەهۆی ئاوێتەبوون و تێکەڵی لەگەڵ نەتەوەغەیرەعەرەبەکاندا خراپ بووە و مەلەکەکەی شێوەی سەرەتای لەدەستداوەو، هەروەك بڵێی گۆڕدراوە بۆزمانێکی تر ئەمەلەکاتێکدا قورئان بەو زمانە دابەزیوە و فەرموودەی پێغەمبەر (ص) بەو نەقڵکراوە و قورئان و حەدیسیش بەدووپایەی ئاینی ئیسلام دەژمێردرێن و، لەبەر ئەوەی ترسی ئەوە هەبووە کەئەم دووپایەیە لەبیر بچنەوە و تێگەشتن لێیان بەهۆی نەمانی ئەو زمانەی کەپێیان نازڵبوون بۆ خەڵکی دژوار ببێت، هەربۆیە ناچار بوون دەستبکەنە تەدوین و نوسینی ئەحکام و دانانی قەواعید و دەرهێنانی یاساو ڕێساکانی ئەو زمانەو، لەپاش ئەم دەستپێشخەریە زانستێك هاتەئاراوە کەبوویە خاوەن بەش و باب و پێشەکی و مەسەلەگەلێکی سەربەخۆو ناویان ناوە زانستی نحو. واتە هونەری ڕێزمانی عەرەبی و لەئەنجامدا هونەرێکی پارێزراوو زانستێکی نوسراو فەراهەمهاتوو وەك پەیژەیەکی لێهات بۆ تێگەشتن لەقورئانەکەی خوداو سوننەتی پێغەمبەرەکەی (ص)و، لەوەوە بەشوێن بەرزیدا دەگەڕێن لەوانەشە ئەگەر ئێمە لەم سەردەمەدا گرنگیمان بەو زمانەعەرەبیەی ئێستا بدایە توانای دەرهێنانی ئەحکامەکانیمان هەبووایە لەبری نیشاندانی حەرەکاتی اعراب کەخراپە چووەت ناویەوە، لەدەلالەتەکانیاندا شتانێکی ترمان هەڵدەبژارد کەتێیدایە و وەك یاساگەلێکن کەتایبەت بوون بەو زمانەوە لەوانەشە ئەوکات بارودۆخی

کۆتایی کەلیمەکان بەشێوەیەکی لێبهاتایە کەلەگەڵ شێوەی یەکەمینی زمانی موزەڕدا جیاوازی پەیدا دەکرد، چونکە زمان و مەلەکەکانی بەخۆڕایی و سودفە بەدەست مایەن. لەڕابوردوودا زمانی موزەڕی لەگەڵ زمانی حەمیریشدا بەم شێوەیە دەبوو بەڵام زۆرێك لەبابەتەکانی زمانی حەمیری صەرفی ووشەکانی لەزمانی موزەڕیدا گۆڕدراو بەڵگەش ئەو نەقڵکراوانەی کەلەلای ئێمە بوونیان هەیە. ئەمەش بەپێچەوانەی تێڕوانینی کەسانێکەوەیە کەبەهۆی کاڵفامیەوە پێیانوایە کەزمانی حەمیری و موزەڕی هەردووکیان یەکن و ئەیانەوێت زمانی حەمیری بەپێی یاساو ڕێساکانی زمانی موزەڕی بەکار بهێنن. هەروەك چۆن هەندێك لەوان اشتیقاقی کەلیمەی قیل بەفەتحەی قافەکە پێیانوابووە لە(قول) وە هاتووە.

لەبارەی زۆرێك لەووشەکانی تری زمانی حەمیریەوە ئەم جۆرە بیرکردنەوانەیان هەبووە ئەمەلەکاتێکدا بۆچوونی ئەمان ڕاست نیەو، زمانی حەمیر زمانێکی جیاوازە لەزمانی موزەڕ لەزۆرێك لەماناو صەرفی کەلیمەکان و حەرەکاتی اعراب جیاوازە لەو، هەروەك چۆن زمانی عەرەبی ئەمڕۆکە جیاوازی زۆری هەیە لەگەڵ زاراوەو لوغەتی موزەڕدا. بەڵام هەروەك کەگوتمان ئەو گرنگیەی کەبەلوغەتی موزەڕ دراوە لەبەر شەریعەت بووە، بەڵام لەسەردەمی ئێنەدا ئەم جۆرە بیرۆکەیە بوونی نیە کەهانمان بدات بۆ وەها بەدواداچوون و لێکۆڵینەوەیەك. لەوتایبەتمەندیانەی کەلەلوغەتی ئەم هۆزەدا(موزەڕ) بوونی هەیە لەگەڵ ئەوەی کەلەسەرزەویە جیاوازەکانیشدا دەژین بەڵام ئەو تایبەتمەنیەیان لەدەستنەداوە، چۆنیەتی گوتن و تەلەفوزی قافە چونکە ئەمان ئەم پیتە لەمەخرەجی قافێکەوە تەلەفوز ناکەن کەلەنێو خەڵکی شارنشیندا باوە هەروەك چۆن لەکتێبەکانی زمانی عەرەبیدا نوسراوە، کە مەخرەجی ئەو لەکۆتایی زمان لای سەرەوەی لەبڕناخەوە (حنك)ی سەرەوەیە، بەڵکو ئەوان ئەو پیتە بەلەهجەیەك لەنێوان قاف و کافدا تەلەفوز دەکەن و هەموو تاکەکان و نەژادە نابراوەکان ئەم لەهجەیان لەبەر کردووە و لەهەر شوێنێکدا بن شەرق بێت یان غەرب لەدەستی نادەن، هەروەك چۆن لەهجەی ناوبراو بۆ هۆزی موزەڕ

بەنیشانەیەکی تایبەت دادەنرێت لەنێو نەتەوە و نەژادەکاندا و تەنها تایبەتە بەوانەوەو هیچ نەتەوەیەکی تر لەم لەهجەیەدا بەشدار نیە لەگەڵ هۆزی موزەڕدا. بەئەندازێك هەرکات کەسانێك بیانەوێت خۆیان وەك عەرەب نیشان بدەن و خۆیان بدەنە پاڵ ئەو نەتەوەیە و بچنە ناویانەوە لەگوتن و تەلەفوزی ئەم پیتەدا تەقلید لەم نەتەوەیە دەکەن. بەبڕوای موزەڕیەکان ناسینەوەی عەرەبی فەصیح لە غەیرە فەصیح لەبارەی ئەوەی کە لەنەژادی عەرەبی خالیصن یان خەڵکی شارێکن کەوابەستەی تەلەفوزی ئەم قافەیە و ئەم لەهجەیە ئەوە نیشان دەدات کەزمانی ئەمان هەروەك لوغەتی موزەڕە، چونکە زۆربەی ئەو نەوەیەی کەئێستە ماونەتەوە و زۆربەی سەرۆکەکانیان ئیتر لەمەشریقدا بن یان مەغریب لەنەوەکانی مەنصوری کوڕی غەکرەمەی کوڕی حەفصەی کوڕی قەیسی کوڕی غیلانن، چ لەنەوەکانی سەلیمی کوڕی مەنصور و چ لەنەوەکانی بەنی عامیری بەنی صعصەعەی کوڕی معاویەی کوڕی بکری کوڕی هوازنی کوڕی مەنصور.

ئەمانە لەم سەردەمەدا لەهەمووگەلانی سەرەزەویە ئاوەدانەکان زیاترن زۆرینە لەوانن و لەنەوەکانی موزەڕن و نەژادەکانی تر کەلەگەڵ ئەماندان وەك بنی کهلان لەگوتنی ئەم قافەدا تەقلید و چاولێکەری لەوان دەکەن. ئەم لەهجەو شێوەزارەش نەوەی نوێ داینەهێناوە بەڵکو بەدرێژایی سەدە یەك لەدوای یەکەکان بەشێوەیەکی بۆماوەیی بەمیراتی بۆیان ماوەتەوەو، ئەوەش دیارە کە لوغەتی زمانی موزەڕی کۆن یان هەمان ئەو شێوەزارو لەهجەیەی زمانی پێغەمبەر (ص) بێت، ئەم مانایەش فەقیهەکان و خاندانی پێغەمبەرایەتی بانگەشەیان بۆ کردووە وایانزانیوە کەهەرکەسێك لەاماالقران (سورەتی الفاتحە) دا لە (الصراط المستقیم) دا بێجگە بەلەهجەی ئەو هۆزە تەلەفوز بەقافەکە بکاتو بیڵێت ووشەکەی بەهەڵە خوێندووەتەوە و نوێژەکەی بەتاڵە.

نازانم ئەم گومانەش لەکوێوە سەرچاوەی گرتووە. چونکە زمان و لەهجە و شێوەزار شارنشینەکان دایاننەهێناوە و لەسەردەمانی پێشینی خۆیانەوە وەریانگرتووە و بەزۆری لەخاندانی موزەڕ بوون کەلەکاتی فەتحی مەملەکەتەکاندا هاتوونەتە شارەکانەوە و،

خەڵکی ئەو نەوەیەش ئەوەیان دانەناوە بەتایبەت کەئەمان لەتێکەڵی و ئاوێتەبوون بەشارنشینە غەیرە عەرەبەکانەوە دوورتر بوون. کەواتە باشتر وایە بەبەڵگەی ئەوەی کە شێوەزارو لەهجەی ناوبراو لەلای ئەوان هەبوو بڵێین لەیادگارەکانی پێشینانی ئەوانە، سەرەڕای ئەوەی کە هەموو ئەم نەژادە ئیتر لەمەغریبدا بێت یان لەمەشریقدا لەدەربڕین و تەلەفوزەکەیدا یەکسانن و لەهجەی ناوبراو تایبەتمەندیەکی هەیە کەبەهۆیەوە عەرەبی لەلەهجەی ناشیرین و شێوەزاری شارستان جیادەکرێتەوە.

وەڕواڵەتی ئەم قافەی کەنەوەی عەرەبی دەشتەکی قسەی پێدەکەن لەمەخرەجی ئەو قافەیە کەپێشینانیان تەلەفوزیان پێکردووە، ئەڵبەتە مەخرەجی قافەکە فراوانە هەروەك چۆن ئەوەڵەکەی لەسەرەوەی بڕناخەوەیە و کۆتاییەکەشی لەمەخرەجێکەوەیە لەخوارەوەی مەخرەجی کافە. هەربۆیە ئەوکەسانەی کەلەسەرەوەی بڕناخەوە نوتقی پێدەکەن خەڵکی شارن و ئەوانەشی کەلەخوارووی مەخرەجی کافەوە دەیڵێنەوە نەوەی دەشتەکین و، بەم شێوەیە قسەی فەقیهەکان و خاندانی پێغەمبەرایەتی وارید نیە کەدەڵێن تەرککردنی مەخرەجی قافی ام القران (سورەتی فاتیحە) نوێژ بەتاڵ دەکاتەوە، چونکە هەموو فەقیهە شارنشینەکان بەپێچەوانەی ئەم بۆچوونەن و دووریشە کە وەلایان نابێت، بەڵکو ڕووی ئەو هەرئەوەیە کەئێمە باسمانکرد.

ئەوە ڕاستە کەئێمە دەڵێین باشتر و چاکتر هەمان ئەو مەخرەجەیە کە کەنەوەی دەشتەکی هاوچەرخ نوتقیان پێکردووە، چونکە هەروەك باسمانکرد تەواتورەکەی لەنێو ئەماندا گەواهە لەسەر ئەوەی کەمەخرەجی ناوبراوی زمانی یەکەمین نەوە لەپێشینانی ئەو هۆزو تایفەیە کەواتە هەمان لەهجەو زمانی زمانی پێغەمبەرە (ص). وەئەم ئیدغام و تێهەڵکیشکردنی لەگەڵ کافەکەدا باشترە، بەهۆی نزیکی هەردوو مەخرەجەکەوە. ئەگەر بەو شێوە بوایە کەشارنشینان لەبێخی قوڕگ و بڕناخەوە تەلەفوزی دەکەن ئەوکات مەخرەجی ئەوکافە نزیك نەدەبوو ئیدغام نەدەکرا. سەرەڕای ئەمانەش جەعلی عەرەبیەتی ئەم قافە کەمەخرەجەکەی لەکافەوە نزیکە باسیانکردووە دەڵێن ئەمە هەمان

ئەو پیتەیە کەنەوەی عەرەبی دەشتەکی ئەمڕۆکە تەلەفوزی پێدەکەن و، مەخرەجەکەی وەك پیتێکی سەربەخۆ لەنێوان مەخرەجی قاف و کاف دا دیاری کراوە، بەلاَم وەها نەزەرێك دوورە لەمەنتیقەوە. بەڕواڵەت وادیارەکە لەهجەی ناوبراو هەروەك باسمانکرد بەهۆی فراوانی مەخرەجی قافەکەوە لەکۆتایی مەخرەجی ئەوەوە بەدی دێت. وەهەم ئەو گروپە بەناشیرینی تەلەفوزی پێدەکەن هەروەك بلێی لەلای ئەمان ڕاست نەبووە کەپیتی ناوبراوی لوغەتی نەوەی ناوبراو، لەکاتێکدا ئێمە یادمان هێنایەوە کەئەم تەلەفوزەی ئەمان پەیوەستە بەنەوەی یەکەمەوە، چونکە ئەمان لەپێشینانی خۆیانەوە پشتاوپشت بەمیراتی بردوویانە و لەهجەی ناوبراو لەشیعارە تایبەتەکانی ئەمانە ئەمانەش هەموویان بەلگەن لەسەر ئەوەی کە لەیادگارەکانی یەکەمی نەوە و زمانی پێغەمبەر (ص) من، هەروەك هەموو ئەمانەمان باسکرد.

وەلەوانەیە کەسێك وابزانێت کە ئەم لەهجەی قافەی کەلەنێو شارنشینە جۆراو جۆرەکاندا بەکار دێت لەپیتی قافی عەرەبەوە نیە، لەهجەی ناوبراو بەهۆی تێکەڵی عەرەب لەگەڵ عەجەم و غەیرە عەرەبەکاندا بەدیهاتووە عەرەبەکان وەك عەجەمەکان تەلەفوزیان پیێ کردووە هەربۆیە پیتی ناوبراو لەپیتەکانی زمانی عەرەبی نیە. بەلاَم ئەوەی کەلەقیاسەوە نزیکترە هەرئەوەیە کەئێمە باسمانکرد و گوتمان هەردوو لەهجەی ناوبراو یەك پیت زیاتر نین بەلاَم پیتی قاف خاوەن مەخرەجێکی فراوانە. کەواتە دەبێت ئەم خاڵە بەباشی تێبگەین، و خوداش ڕێنماکارو ئاشکراکەرە.

# بەشی چل

## لەبارەی ئەوەی کە زمانی شارنشینان و خەڵکی شارە گەورەکان زمانێکی سەربەخۆو جیاوازیان لەزمانی موزەڕ هەیە

دەبێت ئەوە بزانین کە قسەو گفتووگۆکردنی شارنشینەکان نەبەزمانی موزەڕی کۆن و نەبە زمانی نەژادی ئێستەی ئەو نەتەوەیە، بەڵکو ئەمان بەزمالنێکی سەربەخۆی تر کەهەم لەلوغەتی موزەڕ و هەم لەزمانی ئەم نەژادەعەرەبەی ئێستاوە دوورن و قسەدەکەن لەهەمان کاتیشدا لەزمانی موزەڕەوە دوورترەو، ئەوەشی کەگوتمان لوغەتێکی سەربەخۆیە هۆکارەکەی ئاشکرایە و بەڵگەکەشی ئەو جیاوازیەیە کەلەلای نەحویەکان بەهەڵە دادەنرێت. زاراوەی ئەم زمانە لەگەڵ هەموونەمانەدا لەشارە جیاوازەکاندا لەیەکتری جیاوازە، چونکە زمانی خەڵکی مەشریق تا ئەندازەیەك لەگەڵ زمانی خەڵکی مەغریبدا جیاوازە و لەولاشەوە زمانی ئەندەلوسیەکان لەگەڵ هەردوو زمانەکەشدا جیاوازی هەیە. وەهەریەکە لەخەڵکی وولاتانی ناوبراو لەئەداکردنی مەبەستو تەعبیر لەئەندێشە دەروونیەکاندا زاراوە و لوغەتی خۆیان بەکار دەهێنن، مانای لوغەت و زمانیش هەر ئەمەیە و نەمانی اعراب لەزمانی ئەماندا زیانێکی نیە، هەروەك چۆن لەلوغەتی عەرەبی ئەم سەردەمەدا باسمانکرد. وەئەوەی کەگوتمان زمانی شاریەکان بەبەراورد بەزمانی نەژادی ئەمڕۆکە لەزمانی یەکەمینی موزەڕیەوە دوورترە بەهۆی ئەوەوەیە کەدووری لەیەك زمانەوە بەهۆی تێکەڵیەوەیە لەگەڵ بێگانەکاندا، هەربۆیە هەرنەتەوەیەك زیاتر تێکەڵی بێگانەکان بکات ئەوا لەهجەکەی لەزمانی ئەصڵیەوە دوورتر دەبێتەوە، چونکە هەروەك گوتمان مەلەکەو ئامادەباشی زمان تەنها بەهۆی فێربوونەوە

بەدەستدێت. بەڵام نەڵەکەی ئەم جۆرە کەسانە بریتیە لەمەلەکەیەك کەپێکهاتووە لەمەلەکەی یەکەمین کەهی عەرەبە لەگەڵ مەلەکەی دووەمدا کەهی بێگانەکانە. لەم ڕوەوە بەو ئەندازەیەی کەلەبێگانەکانەوە دەیبیستن و لەسەری پەروەردەدەبن لەمەلەکەی یەکەمین دوور دەکەونەوە. دەبێت ئەم بابەتەش لەشارەکانی ئەفریقاو مەغریب و ئەندەلوس ومەشریقدا لەبەرچاوبگرین.

بەلأم لەئەفریقاو مەغریبدا عەرەبەکان لەگەڵ بەربەرەبێگانەکاندا کردووە چونکە بەربەرەکان لەو سەرزەمینەدا ئاوەدانی کۆمەڵگەیەکی فراوانیان هەیە، تەقریبەن هیچ شارو دەستەیەك لەبەربەرەکان خاڵی نیە لە لەم ووشە و لەهجە عەجەمیانە، چونکە ووشەو لەهجەی عەجەمی لەزمانی ئەماندا کەلەئەصڵدا عەرەبی بوون زاڵبووە و وەك لوغەتێکی ئاوێتەی تری لێهات کەلەفزەکانی بێگانە بەهۆی ئەوەی کەباسمانکرد تێیدا زاڵبوو هەربۆیە زمانی ناوبراو لەلوغەتی یەکەمینەوە دوور تربوو. وەهەروەها لەمەشریقدا پاش ئەوەی کەعەرەب زاڵبوو بەسەر نەتەوەکانی وەك ئێرانی و تورکەکانی ئەو سەرزەمینانەداو تێکەڵیان بوون و، لوغەتەکانیان لەنێو عەرەبەکاندا لەڕێگەی کریکاران و جوتیاران و ئەسیرگەلێکەوە کەوەك خزمەتکار و دایەن و پەروەرشکارانی مندالأنیان بەکاریان دەهێنان، لەئەنجامدا زمانی ئەمان بەهۆی خراپبوونی مەلەکەکەیەوە خراپ بوو بەجۆرێك گۆڕا بۆزمانێکی تر، وەهەروەها لەئەندەلوسیشدا لەگەڵ بێگانەگەلێکی وەك جلاقە و فەرەنگیەکاندا تێکەڵیان پەیدا کرد. هەموو خەڵکی شارەکانی ئەم هەرێمانە بوونە خاوەنی لوغەتی تری تایبەت بەخۆیان کەلەلایەکەوە زمانەکەیان جیاواز بوو لەلوغەتی موزەڕ و، لەلایەکی تریشەوە هەروەك باسی دەکەین زمانی هەر هەرێمێك لەگەڵ زمانی هەرێمەکەی تردا هێندە جیاوازیان هەبوو هەروەك بڵێی بەهۆی پایەداری و بەهێزی مەلەکەکەیەوە لەنەوە و وەچەکانی ئەماندا، زمانێکی ترە. وەخوداش هەرچیەك کەبیەوێت دەیئافرێنێت[٣٠٥].

---

[٣٠٥] (وَاللَّهُ يَخْلُقُ مَا يَشَاءُ) س مائدة ئا ٢٠.

# بەشی چل و یەك

## لەبارەی فێربوونی زمانی موزەریەوە

دەبێت ئەوەبزانین کە مەلەکەی زمانی موزەری لەم سەردەمەدا لەناوچووە و خراپ بووە، زمانی هەموو خەڵکە نەوەی ئەمڕۆکەشیان لەگەڵ لوغەتی موزەری کەقورئانی پێ دابەزیوە جیاوازە. وەهەربەو جۆرەی کەباسمانکرد بەهۆی ئاوێتە بوونەوە لەگەڵ زمانە بێگانەکاندا بووەتە لوغەت و زمانێکی تر، بەڵام لەو ڕووەوەی هەروەك ڕابورد لوغەتەکان مەلەکەگەلێك زیاتر نین و فێربوونیان وەك هەموو مەلەکەکانی تر گونجاوە. وەئەو کەسانەشی کەعەوداڵی فێربوونی ئەم مەلەکانەن ڕێگەی فێربوونیان ئەمەیەکە بەلەبەر کردنی قسەکۆنەکانیان کەبەپێی شێوازەکانی زمانی ئەوانە دەستی پێبکەن. وەك قورئان‌و حەدیس و گوفتاری سەلەف و قسەو گفتوگۆی پیاوەگەورەکانی عەرەب کەبەشێوەی پەخشانی سەجعدار و شیعر باسیانکردووە و قسەی مولدان[٣٠٦] لەهەموو

---

[٣٠٦] شاعیرانی عەرەب دەبن بەسێ بەشەوە: ١ – شاعیرانی جاهیلیەت (بەرلەهاتنی ئیسلام) ٢ – شاعیرە (مخضرم) کان واتە ئەوانەی هەم سەردەمی پێش ئیسلام و هەم سەردەمی ئیسلامیشیان ڕەتکردووەتەوە. ٣– شاعیرانی مولد واتە شاعیرانی دوای سەرەتای ئیسلام. خاوەنی اقرب الموارد دەڵێت: ووشەی مولد بەزەممەی میمەکە و فەتحەی واوەکە و شەددەی لامەکە (موەللید) بەمانی تازە عەرەبیش هاتووە. ابوالبقا لەکولیاتدا دەڵێت: هەرلەفزێکی ئەصڵی کەبەلابردنی هەمزە یان زیادکردنی یان پێدانی حەرەکەیەك یان سکونێك بیگۆڕن پێی دەڵێن مولد، وەهەروەها دەڵێت: مولد کەسێکە کەلەنێو عەرەبدا لەدایك بووە و لەگەڵ منداڵانی ئەواندا گەورە بووە خووی بەداب و نەریتەکانی ئەوانەوە گرتووە. وەخاوەنی اساس گوتوویەتی: مولد قسەیەکە لەلەئەصڵی عەرەبیدا نەبێت واتە دواتر دایانهێنابێت و لەڕابوردوودا لەقسەی ئەمان نەبووە.

هونەرەکانی زمانی عەرەبیدا بەهۆی لەبەر زۆری لەبەر کراوەکان لەهۆنراوە و پەخشان و، قسەی ئەمان لەڕیزی ئەوکەسانەدا هەژمارکران کەلەنێو عەرەبدا پەروەردە بێن و شێوەی دەربڕین و تەعبیر لەوانەوە فێربێن. دواتر بەشێوەیکی کرداری تەعبیریان لەمەنویاتەکانی خۆیان بەپێی عیبارەت و دەستەواژەکان و تەرکیبات و چۆنیەتی نەزم و پێکهاتەی جوملەعەرەبیەکان دەستپێدەکەن و، مەحفوزات و لەبەرکردنەکان کەلەشێوە و تەرتیبی لەفزەکانی ئەوانەوە فێری بوون بەکاریان هەهێنن. دواتر بەهۆی ئەم مەحفوزاتانەوە و بەکار هێنانیان مەلەکەی ئەو زمانەیان بۆ دێتەدی هەرچی زیاتر مەحفوزات فێربێن و بەکاری بهێنن، ئەو مەلەکەیە بەهێزتر و چەسپاوتر دەبێت لەگەڵ هەموو ئەمانەدا فێرخوازەکەی پێویستی بەتەبعێکی سەلیم و تێگەشتنێکی باش هەیە بۆ ئەوەی بتوانێت لەحەزوو ئارەزوو تەرکیباتی قسەکانیان تێبگات و، لەگەڵ داخوازی حاڵەکاندا (موقتەزیاتی ئەحواڵ) جێبەجێیان بکات و زەوقیش گەواهیدەری ئەم شتەیە ئەو لەم مەلەکە و تەبعە سەلیمەوە لەمەلەکەوە بەدی دێت، هەروەك چۆن لەداهاتوودا لەبارەی ئەو (زەوقەوە) گفتووگۆدەکەین.

وەجوانی باشی قسەی دروستکراو ئیتر شیعر و هۆنراوەبێت یان پەخشان وابەستەیە بەمەحفوزاتی زۆر وبەکارهێنانیانەوە، کەسێکیش کەئەم مەلەکانە بەدەست بهێنێت زمانو لوغەتی موزەڕ فێربووە وەها کەسێك بەهۆی ڕەوانبێژی و بەلاغەتەوە تێیدا دەبێتە ڕەخنەگرێکی بەصیر و بینا، هەربۆیە باشتر وایە لوغەتی موزەڕ فێببن، و خوداش ڕێنمایی هەرکەسێك دەکات کەبیەوێت[٣٠٧].

---

[٣٠٧] (وَاللهُ يَهدِي مَنْ يَشاء) س بقره تا ١٣٦ و ئایەتی ٩٥ س النحل.

# بەشی چل و دوو

## لەبارەی ئەوەی کە مەلەکەی ئەم زمانە غەیری صەناعەتی عەرەبی ( نحو ) وە و لەفێربوونی ئەو مەلەکەیەدا پێویست بە نحو ناکات

هۆکارەکەشی ئەمەیە کە صەناعەتی عەرەبی نحو بەتەنها و بەتایبەت بریتیەلە ناسینی یاساو رێساکانی ئەم مەلەکەیە، هەربۆیە صەناعەتی ناوبراو ئاشناییە لەگەڵ چۆنیەتیدا نەوەك خۆدی چۆنیەتیەکەبێت. هەربۆیە نابێتە خودی مەلەکەکە، بەڵکو فێرخوازی ئەم صەناعەتە وەك کەسێك وایە کەیەکێك لەصەناعەتەکان بەشێوەیەکی زانستی و نەزەری دەزانێت، بەلآم بەکرداری شارەزا نیە تێیدا، وەك کەسێك کەزایناری لەبارەی خەیاتیەوەهەبێت، بەلآم بەکرداری نەیزانێت و نەیکردبێتە مەلەکە و شارەزایی تیدا نەبێتو لەباسکردنی هەندێك لەبەشەکانیدا بلێت: خەیاتی ئەوەیە کەدەزوەکە بکەیت بەکونی دەرزیەکەدا و دواتریش بیکەیت بەهەردوولای قوماشەکەدا و، لەلایەکی تریەوە بەئەندازێك بیهێننە دەرەوە و دواتریش بیکەنەوە بەو جێگەیەی کەپێشتر ئەو کارەیان تێدا کردووە و، لەلای یەکەمین شوێنەوە بیهێننە دەرەوە لەشوێنی دوورکەوتنەوەی هەردوو کونی یەکەم و بەم شێوەیە بەردەوامبێت تاوەکو کۆتایی کارەکە، وەشێوەی قەراغ دوورینەوە و گوڵدوورین و شتەکانی تریش بەم شێوەیە باسبکات، بەلآم کاتێك داوای لێبکەن ئەم کارانە بەدەستی خۆی ئەنجام بدات نەتوانێت هیچکامیان بەباشی ئەنجام بدات. وەهەروەها کەسێك کەخۆی لەدارتاشیدا بەشارەزا بزانێت و پرسیاری چۆنیەتی برینی تەختەی لێ بپرسن دەڵێت: پێویستە مشارەکە بخەینە لای سەرەوەی

دارەکە و دەست بەلاکەیەوە بگرین و کەسی بەرامبەریش دەبێت ئەو سەرەکەی بگرێت‌و دواتریش بەهەردووکیانەوە ددانە تیژەکانی مشارەکە بەسەر دارەکەدا بهێنن و بیبەن‌و بەردەوام ئەم کارە دووبارە بکەنەوە، تاوەکو کۆتایی کارەکەکەووردە ووردە مشارەکە بەسەردارەکەدا دێت و دەڕوات و دەبێتە هۆی بڕینەوەی داری نابراو، بەڵام ئەگەر بەکرداری داوا لەم کەسە بکرێت ئەم کارەبکات، دەبینین ناتوانێت ئەنجامیان بدات. زانیاری لەبارەی قەواعیدەکانی اعراب لەگەڵ خودی ئەو مەلەکەیەدا بەهەمان شێوەیە، چونکە زانینی قەواعیدەکانی اعراب تەنها ئاگادار بوونە لەچۆنیەتی کارکردنیان نەوەك نەفسی کردارەکە، هەربۆیە زۆرێك لەڕەخنەگرانی زانستی نحو کەسەلێهاتووەکانی صنعەتی زمانی عەرەبی لەڕووی زانستیەوە لەهەموویدا شارەزاییان هەیە، بەڵام دەبینین ئەگەر پرسیاریان لێبکەین کەدووديڕ بۆ هاوڕێ یان دۆستانی بنوسێت یان شکاتی ستەمێك بکەن، واتە سکالآیەك بنوسن و مەبەستەکانی خۆیانیانی تێدا باسبکەن. دەبینین بەهیچ شێوەیە توانای ئەو کارەیان نیە هەڵەی زۆر دەکەن و قەسەکان بۆ ئەم مەبەستە بەباشی نانوسن.

وەهەم بەپێچەوانەشەوە زۆرێك لەو کەسانەی کەلەم مەلەکەیەدا شارەزاییان هەیە دەبینین لەهەردوو هونەری شیعر و پەخشاندا دەستێکی باڵآیان هەیە، لەکاتێکدا اعرابی فاعل و مفعول لەیەکتری جیاناکەنەوە و مرفوع لەمجرور و جیاناکەنەوە و و شارەزای هیچکام لەیاسانی زمانی عەرەبی نین. لێرەوە لەوەتێدەگەین کەئەم مەلەکەیە جیاوازە لەصەناعەتی زمانی عەرەبی و بەگشتی بێ نیازە لێی. هەندێك جاریش لەوانەیە کەسانێك هەبن کەلەصەناعەتی زمانی عەرەبیدا شارەزابن و لەهەمانکاتیشدا شارەزای مەلەکەکەشی بن، بەڵام ئەم جۆرە کەسانە زۆرکەم و دەگمەنن، و زۆربەی ئەم کەسانە ئەوانەن کەالکتاب ی سیبویە فێردەبن و چونکە ئەو تەنها یاساکانی اعرابی بەبەس نەزانیوە، بەڵکو کتێبی ناوبراو پڕیەتی لەشاهێدی شیعر و نمونەی عەرەبی و عیبارەتەکانی ئەمانە. هەربۆیە بەشێکی شایستەی لەبارەی فێربونی ئەم مەلەکەیەوە

تێدایە هەربۆیە دەبینین ئەوانەی کەفێری ئەم کتێبە دەبن کاتی خۆیان بۆ فێربوونی سەرفدەکەن و، بەهرەیەکی فراوان لەقسەی عەرەب بەدەستدەهێنن ئەو قسانەش لەناو مەحفوزاتەکانی ئەواندا لەشوێنی خۆیی و لەکاتی پێویستدا بەکاریان دەهێنن و بەوهۆیە ئاگاداری چۆنیەتی مەلەکەکە دەبن بەتەواوەتی فێری دەبن‌و، ئەوکات باشتر و ڕەوانتر مەبەستی خۆیان بەخەڵکی دەگەیەنن.

هەندێك لەو کەسانەی کە کتێبی (سیبویە) دەخوێننەوە بێئاگان لە تێگەشتن لەم جۆرە بابەتانە هەر بۆیە زانستی زمان لە ڕووی صەناعەتەوە فێری دەبن و مەلەکەکەی بەدەست ناهێنن، بەڵام ئەو کەسانەی کە کتێبی پاشینان کەخاڵین لەم جۆرە قسەو شاهێدانە دەخوێننەوە و تەنها یاساکانی نحو بەبێ شیعر و قسەی عەرەبی فێردەبن، کەمتر دەکرێت بەم هۆیەوە گرنگی بەمەلەکەی زمان بدەن هەربۆیە ئەم کەسانە وادەزانن پایەیەکی زمانی عەرەبیان بەدەستهێناوە ئەمەلەکاتێکدا لەدوورترین کەسانی ئەو بوارەن. ئەهلی صەناعەتی عەرەبی و مامۆستاکانی لەئەندەلوسدا لەفێربوونی ئەم مەلەکەیە و بەدەستهێنیدا لەخەڵکانی تر نزیکترن، چونکە ئەوان لەگەڵ فێربوونی یاساکانیشدا گرنگی بەنمونە و شاهێدەکانیش دەدەن و لەزۆرێك لەتەرکیبەکانی قسەی عەرەبیدا لەکۆڕی وانە و فێرکردنەکاندا باس و لێکۆڵینەوە دەکەن.

هەربۆیە فێرخوازی سەرەتایی لەگەڵ فێربوونی قەواعیدەکاندا زۆرێك لەو مەسەلانەی کەبۆ فێربوونی مەلەکە پێویستە ئەزموون پەیدا دەکەن و، خۆیان دەکەنە هاونشینی ئەو مەلەکەیە و ئامادەدەبن بۆ بەدەستهێنان و وەرگرتنی. بەڵام بێجگە لەئەهلی ئەندەلوس نەتەوەکانی تر وەك ئەفریقی و مەغریبیەکان و ئەوانی تریش صەناعەتی عەرەبی لەڕوانگەی بەحس و تەحقیقەوە وەك زانستەکان وەری دەگرن لەفێربوون و بیرکردنەوە لەتەرکیباتی قسەکانی عەرەب چاوپۆشی دەکەن و، تەنها لەڕووی اعرابەوە شاهێدێك یان تەرجیح دانی شێوازێك ئەویش لەڕووی خواستی زەینیەوە نەوەك لەڕووی ئاراستەکردنەکانی زمانەوە باس دەکەن، هەربۆیە صەناعەتی عەرەبی لەدیدی ئەواندا

وەك یەكێك لەیاسائەقڵیەكانی مەنتیق و جەدەلە و لەمەبەستەكانی زمان و مەلەكەیەوە دوور كەوتووەتەوە. ئەوسودەشی كەدەگات بەزاناكانی ئەم شێوازە لەم شارانەدا ئەوەیە كەبەگشتی لەمەلەكەكەی دوور كەوتوونەتەوە هەروەك بڵێی لەقسەی عەرەبیدا بەحس و تەحقیق ناكەن. هۆكارەكەشی تەنها ئەوەیە كە لەباس لەشاهێد و تەركیباتەكانی زمان و جیاكردنەوەی شێوازە جۆراو جۆرەكانی لایانداوە و بێئاگابوون لەفێركردنی فێرخواز لەمبارەیەوە، ئەمەلەكاتێكدا ئەم شتە لەباشترینی ئەو هۆكارانەیە كەبۆ بەدەستهێنانی مەلەكەی زمان بەسودە و تەنها هۆكارێكیشە بۆفێربوونی زمان و نەزیاتر.

بەڵام ئەوان یاساناوبراوەكانیان بەپێچەوانەی مەبەستێك كەبۆ ئەو دانراون جێبەجێ دەكەن و وەك زانستێكی خالسیان لێكردوون و لەبەرهەمەكە دوور كەوتوونەتەوە، ئەوەی كەلەم بابەدا باسمانكرد ئەوەمان بۆ دەركەوت كەهاتنەدی مەلەكەی زمانی عەرەبی تەنها لەرێگەی لەبەركردن و مەحفوزاتی زۆرەوە لەقسەكاندا بەدی دێت، تاوەكو لەخەیاڵی فێرخوازدا وەك شێوازو رێرەوێك كەقسەی عەرەبی لەسەر دامەزراوە بنەخشێت و ئەویش بەهەمان شێواز قسەبكات و وەك كەسێكی لێبێت كەلەنێو عەرەبدا پەروەردە بوبێت و زەینی ئەو بەگۆڕانكاریەكانی ئەمان ئاوێتەی مەبەستەكان ببێت، تاوەكو مەلەكەی پایەدار لەتەعبیر كردن لەمەبەستەكان لەشێوازی قسەی عەرەبدا بۆ ئەو بێتەدی. خوداش تەقدیر كەری كاروبارەكانە.

# بەشی چل و سێ

## لەبارەی تەفسیری ووشەی ( زەوق ) کەلەنێو زانایانی بیان دا بووەتە زاراوە تەحقیقی ماناکەی وباسی ئەوەی کە ئەم زەوقە بەزۆری بۆ عەجەمی زمانەکان کەفێری عەرەبی دەبن بەدی دێت

دەبێت ئەوە بزانین کە لەفزی زەوق کەسانێك بەکاریان هێناوە کەگرنگی بەهونەرەکانی زانستی بیان دەدەن. ماناکەشی بریتیە لە: هاتنەدی مەلەکەی بەلاغەت لەزماندا. لەبەشەکانی پێشوودا تەفسیری بەلاغەتمان باسکرد گوتمان کەبەلاغەت بریتیە لەموتابەقەتی قسە لەگەڵ مانادا لەهەموو ڕووەکانیەوە بەهۆی ئەو تایبەتمەندیانەی کەبۆ تەرکیبات لەئیفادەو گەیاندنی مانادا بەدی دێت. کەواتە قسەکەری ڕەوانبێژ لەزمانی عەرەبدا بۆ ئەم مەبەستە بەشوێن شێواز و شکڵێکی بەسوددا دەگەڕێت کەبەپێی شێوازەکانی زمانی عەرەب و مەلەکەکانیان بێت، وەتائەندازێکیش توانایی ڕەچاوکردنی هۆنینەوەی قسە لەسەر ئەم شێوازانە بکات. کەواتە هەرکات مومارەسەی ئەو لەڕێگەی فێربوون و خوێندنەوەوە بەردەوام بێت ئەوا مەلەکەی ووتاربێژی و قسەکەری لەسەر ئەم شێوازە بۆ ئەو دێتەدی و، کاری تەرکیباتی قسەبۆ ئەو ئاسان دەبێت هەروەك چۆن لەمبارەیەوە توشی هەڵخلیسکان نابن و لەمەبەست و شێوازەکانی بەلاغەتی تایبەتی عەرەب دوور ناکەونەوە و، ئەگەریش تەرکیبێك ببیستێت کەلەسەر ئەم مەبەست وشێوازە نەڕوات بەکەمترین ئەندێشەو بگرە بەبێ هیچ ئەندێشەیەك لەبەرگێی گراندەبێت و ڕەتی دەکاتەوە. مەگەر بەوەی کەلەهاتنەدی ئەم مەلەکەیە سوود وەربگرێت، چونکە هەرکات

مەلەكەكان لەجێگەی خۆیاندا جێگیربن بەجۆرێك دەردەكەون هەروەك بڵێی شتێكی سروشتی بن. هەربۆیە هەندێك لەبێ خەبەران كەئاشنای چۆنیەتی مەلەكەكان نین وادەزانن كەڕاستیەتی اعراب (حەرەكاتی كۆتایی ووشەكان) و، بەلاغەت (ڕەوانبێژی) لەزمانی عەرەبدا شتێكی سروشتیە و دەڵێن عەرەب هەربەسروشت قسەیان بەم شێوازە كردووە، لەكاتێكدا كەئەم بۆچوونە ڕاست نیە. بەڵكو قسەكردنی مەلەكەیی زمانێكە لەنەزمی قسەدا كەوزەی لێوە وەرگرتووە و جێگیر بووە، هەربۆیە لەیەكەمین سەیركردنەوە وەها دەردەكەوێت هەروەك بڵێی شتێكی تەبیعی و سروشتیە. ئەم مەلەكەیەش هەروەك چۆن لەبەشەكانی پێشوودا باسمانكرد تەنها لەڕێگەی مومارەسە لەقسەی عەرەبیدا و دووبارەكردنەوەی بیستنیان و، زانینی تایبەتمەندی ئەو زمانە بەدەستدێت و بەهۆی ناسینی یاسازانستیەكانەوە كەخاوەنانی صەناعەتی بیان دەریان هێناون نایەتەدی. چونكە تەنها سودێك كەئەم یاسایانە هەیانە ئەوەیەكە مرۆڤ ئاگاداری زانستی نەزەری ئەو زمانە ئاگادار دەكاتەوە، بەڵام بەهۆی ئەوانەوە مەلەكەی زمان بەكرداری لەشوێنی خۆیدا نایەتەدی. ئێمەش لەڕابووردودا لەمبارەیەوە باسمانكرد، لەبەرئەوەی كەئەم خاڵانە سەلمێنران، پێویستە بڵێین كە مەلەكەی بەلاغەت لەزماندا، خەڵكانی بەلیغ و ڕەوانبێژ ئاشنای شێوازە جۆراوجۆرەكانی قسە و جوانی تەركیبەكەیمان دەكات، كەلەگەڵ تەركیبەكانی عەرەبدا لەڕوانگەی بنەماو ئوصوڵە زمانەوانی و نەزمی قسەدا سازگارو گونجاو بێت.

وەئەگەر خاوەنی وەها مەلەكەیەك بیەوێت لەم ڕێگە دیار و تەركیباتە تایبەتانە لابدات توانای نابێت و، زمانی لەسەر ئەم لادانە سازگار نابێت چونكە زمانی ئەو ڕانەهاتووە لەسەری وئەو مەلەكەبەهێزو پتەوەی كەتێیدا هەیە دووچاری ئەم جۆرە لادانەی ناكات. وەهەركات قسەیەكی بۆ بكرێت كەلەشێوازی عەرەب و بەلاغەتی ئەمان لەنەزمی قسەدا لایدابێت، ئەوا لێی دوور دەكەوێتەوە و گرانیش دەبێت لەبەر گوێیەكانی و دەزانێت كەئەم قسەیە لەجۆری قسەی عەرەب نیە كەئەم مومارەسەی هەبووە تێیدا، بەڵام

ناشتوانێت هۆکارو بەلگەکەشی باسبکات بەجۆرێك کەنحوی و زانایانی زانستی بیان بەلگە دەهێننەوەو، هۆکاری ئەو دەستەواژانەی کەپێچەوانەی قیاسن دەهێنن، چونکە یاساکانی نحوو بیان لایەنی بەلگەهێنانەوەیان هەیە و لەئوصولّ و قەواعید گەلێکەوە وەردەگیرێن کەبەهۆی پشکنینەوە بەدەستدێن، بەلام ئەم گرانیەی لەبەرگویّ شتێکی ویژدانی و نەفسیە کەبەهۆی مومارەسەی قسەعەرەبیەکانەوە دێتەدی، بەجۆرێك کەفێرخواز لەکۆتاییدا دوەك کەسێکی عەرەبی لێدێت.

بۆنمونە وادادەنێین: منداڵێك لەمان لەنێو هۆزێکی ئەواندا گەورەببێت دیارە کەئەم منداڵە زمانی ئەوان فێردە بێت و چۆنیەتی اعراب و بەلاغەتی ئەو نەتەوەیە بەباشی فێردەبێت و، دەگاتە کۆتاییەکەی ئەمە لەکاتێکدا وەها فێرکردنێك بەهیچ شێوەیەك لەڕیزی زانستەگونجاوەکان لەگەلّ یاساو ڕێساکاندا نیە. بەلکو قسەکردنی ئەو بەزمانی فەصیح و پاراو بەهۆی هاتنەدی ئەم مەلەکەیە لەزمان و بیان دا وەهەروەها چۆنیەتی ناوبراو بۆ کەسێکیش کە لەو نەتەوەیەوە دوور بێت دێتەدی. بەلام بەومەرجەی کەقسە و شیعرو ئەحواڵی ئەو نەتەوەیە لەبەربکات و ئەم شێوەیە بەئەندازەیەك بەردەوامی پیّ بدات، تاوەکو مەلەکەی ئەو زمانەی بۆ دروست ببێت و بچێتە ریزی ئەوکەسانەوە کەلەناو ئەو نەتەوەیەدا گەورەبوون و لەیاساو ڕێساکانەوە بەدوورن. ووشەی زەوق کەلەنێو ئەهلی صەناعەتی بیان دا بەکاردێت، بەشێوەیەکی مەجازی بەمەلەکەی ناوبراودەلێن بەو مەرجەی کەئەو مەلەکەیە بەتەواوەتی بەهێزبێت و، لەزماندا جێگیرببێت و زەوقیش لەزماندا بۆ دۆزینەوەی چێژ دانراوە، بەلام لەبەرئەوەی کە پلەو پایەی ئەم مەلەکەیە لەڕوانگەی قسەکردنەوە لەزماندایە هەروەك چۆن زمان جێگەی ئیدراکی چێژەکانیشە، هەربۆیە ئەم ناوەیان بەشێوەیەکی مەجازی لەمەلەکەی ناوبراو ناوەو سەرەڕای ئەمەش مەلەکەی ناوبراو لەزماندا شتێکی وویژدانیە، هەروەك چۆن چێژەکانی تێدا دەبنە هەستی (حسی) لەم ڕوەوە بەم مەلەکەیە دەلێن زەوق، لەبەر ئەوەی ئەم بابەتە ئاشکرابوو دەگەینە ئەو ئەنجامەی کەبۆ گروپێك لەخەلکی غەیرە عەرەب وەك ئێرانی و ڕۆمی و

تورکەکانی مەشریق و بەربەرەکان لەمەغریب و، کەلەزمانی عەرەبیدا بێتوانان بەهۆی تێکەڵی و ئاوێتەبوونی ناچاری لەگەڵ تازی و غەزاکەراندا بەزمانی ئەوان قسەدەکەن، ئەم زەوقە نایەتەدی، چونکە ئەوان لەو مەلەکەیەی کەباسمانکرد بەهرەیەکی زۆرکەمیان هەیە، چونکە ئەو پەڕی هەوڵ و ماندوبوونیان لەپاش تێپەڕینی ماوەیەك لەتەمەن و پێشکەوتنی مەلەکەی زمانێکی تر، واتە زمانی دایکیان لەم زمانەی ئێستایان بەناچاریەوە ووشە و زاراوەگەلێك فێر دەبن کەلەکاتی حیوارو گفتوگۆ لەنێو خەڵکی شاردا[٣٠٨] باویان هەیە. وەهەروەك لەڕابوردوودا باسمانکرد ئەم مەلەکەیە لەنێو خەڵکی شارنشیندا نەماوەو لێی دوورکەوتوونەتەوە، بەڵکو ئەوان بۆ قسەکردن مەلەکەیەکی تریان هەیە کەگونجاوو موافیقی مەلەکەی داواکراوی زمان نیە.

وەهەرکەسێك ئەحکامەکانی مەلەکەی ناوبراو لەڕووی یاساو بنەماگەلێکەوە بناسێت کە لەکتێبەکاندا نوسراون بەهیچ شێوەیەك ئەو مەلەکەیە بەدەست ناهێنێت، بەڵکو هەروەك باسمانکرد تەنها ئەحکامەکانی فێردەبێت بەڵام مەلەکەی ناوبراو لەڕێگەی مومارەسەکردنی قسەی عەرەبی و خووگرتن پێیان و دووبارەکردنەوەیان بەدی دێت. وەئەگەر بۆ تۆ ڕووبدات کەببیستیت کەسانێکی وەك سیبەوەهیی و فارسی و زەمەخشەری و نمونەی ئەمانە کەلەمامۆستایانی گەورەی ووتار زانراون ئێرانی بوون، دەبێت بزانین ئەو گروپەی کەلەبارەی ئەوانەوە فەزایل گەلێك لەقسەی عەرەبدا دەبیستین تەنها لەنەژادی غەرەیرە عەرەب بوون، بەڵام پەروەردە و گەشەکردنیان لەنێو خاوەنانی ئەم مەلەکەی زمانی عەرەب و کەسانێك بوون کەمەلەکەی ناوبراویان لەعەرەبەوە وەرگرتووە. هەربۆیە هێندە شارەزای ئەم مەلەکەیە بوون کەگەشتوونەتە

---

[٣٠٨] کورتەی تێڕوانینی دانەر لەبارەی شێوازی فێرکردنی زمانەوە بریتیە لەوەی کەناتوانرێت زمان لەڕێگەی قەواعیدی نحو صرف و معانی بیان فێریان ببین، بەڵکو ئەو دووشێوازی کرداری باسدەکات: ١ – ژیان و تێکەڵی لەگەڵ نەتەوەیەکدا. ٢ – فێربوونی دەق و شیعر و ووتار و بەرهەمەکانی نەتەوەیەك. بەبڕوای ئەو قەواعیدە ووشکەکانی نحو صرف و بەلاغەت هیچکات ناگونجێت ببنە هۆی فێربوونی زمانێکی بێگانە. ئەم بۆچوون و تێڕوانینەی ئەو گونجاوە لەگەڵ بیروباوەڕ و بۆچوونی پەروەرشیارو ڕامێنەرانی هاوچەرخدا.

کۆتا سنورەکانی. وەهەروەك ڕابورد ئەمانە لەسەرەتای پەروەردەوە وەك مندالأنێك لەعەرەب هەژمارکراون کەلەنێو هۆزەکانیاندا پەروەردە بوون و، تەنانەت گەشتوونەتە قولأیی و ناخی زمانی عەرەبی و بەبەشێك لەئەهلی ئەو زمانە دەزانرێن ئەوانە هەرچەندە لەنەسەبی غەیرە عەرەب بوون. بەلأم لەزمان و قسەدا ناتوانین ئەوان بەغەیرە فەصیح و عەجەمی بزانین، چونکە گروپی ناوبراو هەرلەسەرەتاوە نەتەوەی ئیسلامیان ناسیوەو، کاتێك زمانی عەرەبی فێربوون کەبەسەردەمی لاویەتی زمانی ناوبراو دەزانرا و هێشتا شوێنەوارەکانی مەلەکەی ئەو زمانە لەنێو هۆزەکانی عەرەب و تەنانەت خەڵکی شاریشدا باوبووە و لەنێو نەچووە. دواتریش ئەو گروپە دەستیانکردە فێربوونی زمانی عەرەبی تاوەکو بەتەواوەتی گەشتنە ئەو پەڕی سنورەکانی لەفێربوونیدا.

ئەمڕۆکەش هەرکات یەکێك لەخەڵکانی غەیرە عەرەب لەشارەکاندا تێکەڵی عەرەبەکان بکات، یەکەمین شتێك کەبەدەستی دەهێنێت ئەوەیەکە شوێنەوارەکانی مەلەکەی واقیعی زمانی عەرەبی بەنادیار دەبینێت و، مەلەکەیەکی تر دەبینێت کەتایبەتە بەخەڵکی شارنشینەوە و جیاوازە لەگەڵ مەلەکەی زمانی عەرەبیدا. سەرەڕای ئەمەش باوادابنێین وەها کەسێك کەدەستدەکات بەمومارەسەی قسەو شیعری عەرەبی لەڕێگەی فێربوون و لەبەرکردنەوە فێریان ببێت، کەمتر دەکرێت سود لەم شێوازە وەربگرێت و بگاتە مەبەستی خۆی، ئەو مەلەکەیەی کەپێشتر باسمانکرد بەدەستی بهێنێت. چونکە هەرکات مەلەکەیەکی تر پێشتر بچێتە زەینی کەسێکەوە جێگیر بێت تێیدا ئەوا مەلەکەیەکی تازە بێجگە لەنوقسان و کەموکورت لەزەیندا بەدی نایەت. وەهەرکات وادابنێین کەسێك لەنەژادی غەیرە عەرەب بەتەواوی لەتێکەڵبوون لەگەڵ عەجەمیەکاندا پارێزراو بێتو بیەوێت مەلەکەی زمانی عەرەبی لەڕێگەی باش خوێندنەوە و لەبەرکردنەوە فێرببێت، ئەڵبەت لەوانەیە وەها کەسێك بگاتە مەبەست و ئامانجی خۆی، بەلأم زۆر بەکەمی ئەم شتە ڕوودەدات و بەو بەڵگانەی کەلەبەشی پێشوودا باسمانکرد هۆکارەکەی بۆ خوێنەر

ئاشکرایە.[٣٠٩] هەرچەندە کە زۆربەی ئەو کەسانەی کە سەرقاڵی یاساکانی زانستی بیانن و بانگەشەی ئەوە دەکەن کەئەم زەوقە (مەلەکەی زمانی عەرەبی) بۆ ئەوان بەدی هاتووە. بەڵام وەها بامگەشەیەك هەڵەیە، بەڵکو باوادابنێین ئەم جۆرە کەسانە مەلەکەیەکیان بەدەستهێنابێت و ئەوا تەنها مەلەکەی ئەو یاساو ڕێسایانەی زانستی بیان یان بەدەستهێناوەو، بەهیچ شێوەیەك مەلەکەی تەعبیر و قسەکردن لەم ڕێگەیەوە بەدەست ناهێنن. خوداش ئەگەر بیەوێت ڕینمایی هەرکەسێك دەکات بۆ سەر ڕێگەی ڕاست[٣١٠].

[٣٠٩] ئیبن خەلدون پێی وایە کەدەبێت زمان یان لەنێو هۆزێکدا و لەڕێگەی تێکەڵی وقسەو ژیانەوە مرۆڤ فێری ببێت، یان بەهۆی گەڕانەوە بۆ دەقە جیاوازەکانی شیعر و پەخشان فێری ببێت، بەڵام لەبەرکردنی قەواعیدە ووشکەکانی زمان و فێربونی بنەماکانی زانستی بیان و مەعانی مرۆڤ ناگەیەنێتە فێربوونی زمان.

[٣١٠] (وَاللهُ يَهدِي مَن يَشاءُ إِلى صِراطِ مُستَقِيم) س بقرة ئا ١٣٦.

# بەشی چل و چوار

## لەبارەی ئەوەی کە خەڵکی شارنشین بەشێوەیەکی ڕەها لەبەدەستهێنانی ئەو مەلەکە زمانیە( زمانی موزەڕ و فەصیحی عەرەب ) کەلەڕێگەی فێربوون و بەدەستهێنانەوە دەبێت بێتوانان و، گرو پێکیان کەلەزمانی عەرەبەوە دوورترن بەدی هاتنی مەلەکەی ناوبراو بۆ ئەوان دژوارترە

هۆکارەکەشی ئەوەیە کە لەزەینی فێرخوازدا بەرلەفێربوونی زمانی فەصیحی عەرەبی مەلەکەیەکی زمانی تر کەدژە لەگەڵ مەلەکەی خوازراو دا دێتەدی، چونکە ئەو سەرەتا زمانی شاری فێردەبێت و ئەم زمانەش بەجۆرێك لەگەڵ زمانی بێگانە و غەیرە فەصیحدا تێکەڵ و ئاوێتە بووە، کەلەمەلەکەی یەکەمەوە هاتووەتە خوارەوە بۆ مەلەکەیەکی تر کەبریتیە لەزمانی شارنشینەکانی ئەم سەردەمەیە، هەربۆیە دەبینین کەمامۆستایان بەرلەهەموو شتێك زمان فێری منداڵان دەکەن و نحویەکانیش پێیان وایە سەرەتا دەبێت نحو فێری قوتابی بکرێت بەڵام ئەم بۆچوونە ڕاست نیە، بەڵکو دەبێت مەلەکەی ناوبراو لەڕێگەی تێکەڵیەوە لەگەڵ ئەهلی زمان و قسەی عەرەبیدا بەدەست بهێنن. ئەوە ڕاستە کەصەناعەتی نحو لەتێکەڵبوون لەگەڵ ئەهلی زماندا ئاسانترە و، هەرچی لوغەتەکانی خەڵکی شار لەفەصیح نەبووندا ڕیشەدارترو لەزمانی موزەڕەوە دووتربێت دەبێتەهۆی ئەوەی کەگۆیاکانی ئەو زمانە لەفێربوونی زمانی موزەڕی زمانی نوێدا جیاوازیەکی ئاشکرا ڕوودەدات. بۆنمونە دەتوانرێت ئەم شتە لەخەڵکی سەرزەویە جۆراو جۆرەکاندا لەبەرچاو بگرین هەروەك خەڵکی ئەفریقا و مەغریب، لەبەر ئەوە لەفەصیح نەبووندا ڕیشەدار ترە و

لەزمانی یەکەمین (موزەڕی) دوور تربوون بێتواناییەکی تەواویان لەفێربوونی مەلەکەکەیدا هەبووە. ئیبن الرقیق گێڕاویەتیەوە کەیەکێك لەنوسەرەکانی قەیرەوان بەم جۆرە نامەیەکی بۆ هاوڕێیەکی نوسیوە: (برای من، ئەی ئەوکەسەی کەنادیاریەکەی لەدەست نەدەم، ئەبوسعید منی لەقسەیەك ئاگادار کردەوە کەتۆ بیر دێیتەوە و لەگەڵ کەسانێکدا دێیت و ئەمڕۆکە ڕێگریەك بۆ ئێمە هاتووەتە پێشەوە و ئامادەی دەرچوون نەبووین، بەڵام ئەهلی ماڵی سەگەکان بەهۆی شتی خراپەوە بێگومان درۆیان کردووە ئەم شتە بەتاڵە لەم یەك پیتە یەکێك نیە، نامەکەی من نێردرا بۆتۆ و من ئامەزرۆی بینینی تۆم). مەلەکەی ئەمان لەزمانی موزەڕیدا بەم شێوەیەبووە هۆکارەکەشی هەمان ئەوبەڵگانەیە کەئێمە باسمانکردن. شیعرەکانیشیان دووربوون لەمەلەکەی ناوبراوەوە و لەڕووی ڕیزبەند یەوە لەچین و تەبەقەیەکی نزمتردا بوون. تاوەکو ئەم سەردەمەش لەسەر هەمان بارودۆخە.

وەلەشاعیرە هەڵکەوتووەکان لەئەفریقادا بێجگە ئیبن ڕەشیق و ئیبن شرف کەسێکی تر شك نابەین و زۆربەی شاعیرانی ئەو سەرزەویە لەدەرەوە هاتوونەتە ئەو ناوچەیە، وەتا ئەم سەردەمەش چینی شاعیانی ناوبراو لەبەلاغەتدا کەموکورتی هەیە، بەڵام خەڵکی ئەندەلوس مەلەکەی ناوبراویان باشتر لەئەهلی ئەفۆیقا بەدەست دەهێنن و زۆر مومارەسەی تێدا دەکەن و، لەبەدەستهێنانی مەحفوزاتە زمانەوانیەکاندا ئیتر شیعرو هۆنراوە یان پەخشان بێت هەوڵێکی زۆر دەدەن و هەروەك چۆن لەنێو خەڵکی ئەندەلوسدا ئەم جۆرە کەسایەتیەگەورانە سەریانهەڵداوە وەك: ئیبن حەیان مێژوونوس و پێشەوای ئەهلی صەناعەتی ئەم مەلەکەیە کەئاڵای ئەم صەناعەتە (ڕەوانبێژی زمان) ی لەو وولآتەدا بەرزکردەوە. وەابن عبدربە (خاوەنی عقدالفرید) و قستەلی[٣١١] و نمونەی ئەمان

---

[٣١١] ئەبوعمر احمدی کوڕی محمدی دراجی قستەلی لەدایك بووی قستەلە، کەیەکێکە لەشارەکەناراویەکانی پورتوگال کەئەمڕۆکە پێی دەڵێت: custro marin لەئەندەلوسدا لەشاعیر و لێکۆڵەرەوەکان دەژمێردرێت. قستەلی لەساڵی ٣٤٧ ك لەدایك بووە و لەساڵی ٤٢١ ك (١٠٣٠ ز) مردووە (حاشیەی دسلان)

لەشاعیرانی سەردەمی ملوك التوایف. هۆكاری دەركەوتنی ئەم جۆرە زانایانەش ئەوەیە كە زمانی عەرەبی و ئەدەب وەك دەریایەكی فراوان لەئەندەلوسدا گەشەی كردووە و بۆسەدان ساڵ لەنێویاندا باو بووە، تائەو ڕۆژەی كەبەهۆی زاڵبوونی مەسیحیەتەوە سەردەمی دووری و ئاوارەیی لەنیشتیمان دەستپێدەكات و خەڵكی لەفێربوونی ئەم جۆرە زانستانە دوور دەكەونەوە ئاوەدانی شارستانیەت نوقسانی تێدەكەوێت و، بەم هۆیەشەوە بارودۆخی هەموو صنعەتەكان بەرەو داڕووخان دەچێت و مەلەكەی زمانیش بەجۆرێك دابەزین بەخۆیەوە دەبینێت كەدەگاتەوە قۆناغە سەرەتایی و خراپەكانی و، كۆتا ئەدیبی فەصیحی ئەوان كەلەوسەردەمەدا ناوبانگیان هەبووە دەتوانین، صالح ابن شریف[٣١٢] و مالیك بن مرحل[٣١٣] وەك نمونە بهێنینەوە كەلەقوتابیاتی چینی شاعیرانی ئیشبیلیە بوون كەبناغەی ئەمان لەسیبتەدا بنیاتنراوەو، هەم لەنوسەرانی بەنی ئەحمەریش بوون كەلەسەرەتای دامەزراندنی دەوڵەتەوە كرابوونە مامۆستاو بەڕێوە بەرایەتیان پێ سپێردرابوو. ئەندەلوسیش چەند پارچەیەك لەجگەری خۆی لەئەهلی ئەم وولآتانە بەهۆی كۆچكردنیانەوە بۆ ئەفریقا لەدەستداوە.

ئەوان لەئیشبیلیەوە بۆ سیبتە و لەخۆرهەڵاتی ئەندەلوسەوە بۆ ئەفریقا و ئاوارە بوبون و، هێندەی نەبرد كەئەم ئەدیب و زانایانە لەناوچوون و نەمان و سەنەدی تەعلیمیان لەزانستە مرۆڤایەتیەكاندا پچڕا، چونكە وەرگرتنی فێركردنی مەلەكەی ناوبراو بۆ خەڵكی ئەفریقا زۆر دژوار بوو بەهۆی ئەوەی كەلەهجە و شێوەزاریان خراپ بوو خراپی زمانی بەربەریان تێدا بڵاو بوبویەوە، ئەم بارودۆخەش هەروەك لەبەشەكانی پێشوودا

---

[٣١٢] ابوالبقا صالح ابن شریف ئەدیب و شاعیری بەناوبانگ كەلەڕەندەدا لەدایكبووە (حاشیەی دسلان).

[٣١٣] مالك بن عبدالرحمن بن مرحل دانەری چەندین كتێبە لەزمانەوانی شیعروبابەتەكانی تردایە. ئەو لەمالیقە (مالكا) دا لەساڵی ٦٠٤ ك (١٢٠٨ – ١٢٠٧ ز) لەدایكبووە و، لەغەرناتە لەساڵی ٦٩٩ ك (١٣٠٠ – ١٢٩٩ ز) كۆچی دوایی كردووە، ئەو بەهۆی ئەوەی كەبنەماڵەكەی ئەو لەكۆچە گەورەكە خەڵكی ئەندەلوسدا چوونەتە سیبتە و، لەوێدا نیشتەجێ بوون پێشی دەڵێن سیبتی لەساڵەكان ٦٧٥ و ٦٨٦ ك لەدەرباری سوڵتان ابویوسفی كوڕی عبدالحق پاشای مەرینیدا بووە (حاشیەی دسلان).

باسمانکرد دژبوو لەگەڵ فێربوونی زمانی فەصیح و پاراوی عەرەبیدا. بەڵام لەپاش ماوەیەك زمانی عەرەبی لەئەندەلوسدا گەڕایەوە سەر ڕێڕەوە بنەڕەتی و باشەکەی و نوێ بوویەوە لەو وڵاتەدا شاعیرانێکی وەك ابن شبرین و ابن جابر[٣١٤] و ئیبن الجیاب[٣١٥] و ئەو چینەی کەلەوان پەیڕەویان دەکرد دەرکەوتن و، دواتر ئیبراهیمی ساحیلی تویجن[٣١٦] و چینی ئەو دەرکەوتن و، لەپاش ئەویش چینی ابن خەتیب و لەسەردەمی ئێمەدا دەرکەوتن‌و ناوبانگیان دەرکرد و لەڕێڕەوی ئەوان پەیڕەوی دەکرد و، بەهۆی دژایەتیکردنی دوژمنانیەوە شەهید بوو ئەو لەمەلەکەی زمانی عەرەبیدا خاوەن توانایەکی زۆر گەورەیە و قوتاتابیەکانی شێوازەکەی ئەویان پەیڕەو کردووە.

بەکورتی گرنگی ئەم مەلەکەیە لەئەندەلوسدا زیاتر و فێربوونی ئاسانترە و لەو ڕوەوە کەخەڵکی ئەو وڵاتە هەروەك باسمانکرد ئێستاکەش لەزانستەکانی زمان و ئەدەبدا مومارەسەیان هەیە، لەپاراستنی زانیاریەکانی زانستە ناوبراوەکان و سەنەدی فێرکردنەکانیاندا. بەوهۆیەوە کەکەعەجەمی زمانانی شێوەزار خراپ و ئەوانەی کەمەلەکەی زمانی عەرەبی موزەڕییان خراپ بووە تەنها گروپێکن کەلەدەرەوە دێنە ئەم وڵاتە و، فەصیح نەبوونیان ڕیشەی لەنێو خەڵکی ئەندەلوسدا نیە بەرەبەرەکان لەم کەنارەدا خەڵکی ئەوێن و زمانیان زمانی ئەو ناوچەیە مەگەر تەنها لەو شارانەی[٣١٧] کە ئەم

---

[٣١٤] چەند کەسێك لەئەدیبەکانی ئەندەلوس نازناوەکانیان ئیبن جابیر بووە، لێرەدا نازانرێت ئیبن خەلدون مەبەستی کام ئیبن جابیریان بووە.

[٣١٥] ابو الحسن علی کوڕی جیاب ئەدیبی ناسراو لەساڵی ٦٦٣ ك (١٢٦٥ – ١٢٦٤ ز) لەغەرناتە لەدایکبووە لەساڵی ٧٤٩ ك (١٤٤٩ – ١٣٤٨ ز) دا مردووە.

[٣١٦] ئیبراهیمی کوڕی محمدی ساحیلی تویجن کەبەابو اسحاق ناسراوەو، وەچەی دەگەڕێتەوە سەر یەکێك لەخێزانە بەناوانگەکانی غەرناتەو بەهۆی ئاینپەروەری و زانیاری زۆر و ئامادەباشی و توانایی لەشیعردا پلەیەکی بەرزی بەدەستهێنابوو، لەساڵی ٧٢٤ ك چوویە حەج و لەوێشەوە چوویە سودان و لەلایەن سوڵتانی ئەو وڵاتەوە ڕێزێکی زۆری لێگیراو لەوێدا نیشتەجێ بوو، لەساڵی ٧٧٤ ك (١٣٤٦ زاینی) لەشاری تنبکتو مردووە.

[٣١٧] لەسەردەمی ئیبن خەلدوندا بەشێکی زۆری مەراکیش بەزمانی بەربەری قسەیاندەکرد لەشارەگەورە و بەشی باکوری بیابانی ئەفریقا زمانی عەرەبی ڕەواجی نەبوو، بەڵام ئێستاکە عەرەبی لەوویلایەتی ئاران و هەموو

نەتەوەیە بەزمانی ناوچەیی بەربەری قسەی پێدەکەن. هەربۆیە بەپێچەوانەی خەڵکی ئەندەلوسەوە کەبەئاسانی مەلەکەی زمانی عەرەبی فێردەبن فێربوونی مەلەکەی ئەم زمانە بۆ ئەوان دژوارە. بارودۆخی خەڵکی مەشریق لەسەردەمی ئەمەوی و عەباسیەکانیشدا لەم ڕووەوە وەك خەڵکی ئەندەلوس بووە، مەلەکەی زمانی عەرەبیان لەو پەڕی لێهاتن و شارەزاییدا وەرگرتووە چونکە ئەوان لەو سەردەمەدا بێجگە لەهەندێك شوێنی کەمدا نەبێت لەتێکەڵی لەگەڵ عەجەمی زمانانەوە بەدوور بوون.
هەربۆیە مەلەکەی زمانی عەرەب لەو سەردەمەدا لەنێو ئەواندا بەهێزتر بووە و گروپێکی زیاتر لەنوسەر و شاعیرانی گەورە لەو ناوچەیەدا دەرکەوتبوون، هەربۆیە نەتەوەگەلێکی زۆر لەتازی و غەزاکەران و نەوەکانیان لەمەشریقدا دەژیان. بۆ سەلماندنی ئەم شتە دەبێت کتێبی اغانی بخوێنینەوە کەبەرهەم و هۆنراوە و پەخشانی ئەمانی تێدایە، ئەوکات بۆمان دەردەکەوێت کەکتێبی ناوبراو وەك کۆمەڵەیەکە لەدیوان و بەرهەمەکانی عەرەب، هەروەك چۆن باسی زمان و مێژوو و جەنگەکان و مەزهەب و قەومیەت و ژیاننامەی پێغەمبەر (ص) و بەرهەمی خەلیفەکان و شیعر و گۆرانی (موسیقا) و ئەحواڵو چۆنیەتیەکانی تری عەرەبی تێدا کۆکراوەتەوە. هەربۆیە دەتوانین بڵێین هیچ کتێبێك وەك ئەو کتێبە بۆناسینی ئەحواڵی عەرەب جامیع تر و گشتگیرتر نیە. وەمەلەکەی زمانی عەرەبی لەمەشریقدا و لەکاتی فەرمانڕەوایی هەردوو دەوڵەتی(اموی عباسی) دا وەها بەهێز دەبوو چونکە لەسەردەمی جاهیلیەتەوە بەلیغتر و زمان پاراوتر بوو هەروەك باسی دەکەین. تاوەکو سەردەمی پەرێشانی بێسەروبەری عەرەب هاتە پێشەوە و شوێنەواری زمانیان سڕایەوە و قسەیان لەناوچوو فەرمانڕەوایی هەردوو دەوڵەت تێپەڕی و، حکومەتو دەوڵەتداری کەوتە دەستی نەتەوەکانی تری غەیرەعەرەب و ئەم بارودۆخەش

---

وویلایەتەکانی الجزیرە و وولآتی مەراکیشدا بووەتە جێگرەوەی زمانی بەربەری و، زمانی بەربەری تەنها لەناوەند و بەشێی باشوری یابانی ئەفریقادا باوی هەیە کەنەتەوەکانی وەك toucregs لەناوچە کوێستانیەکاندا قسەی پێدەکەن، وەك هەردوو بەشی kalylie زنجیرە چیاکانی ئەتلەس و aouras و ناوچەی کوێستانی تونس و ویلایەتی sous هەندێك ناوچەی لەیەك جیا. (حاشیەی دسلان).

لەسەردەمی دەوڵەتی دیلم و سلجوقیەکاندا بەدیهات کاتێك عەجەمەکان لەگەڵ خەڵکی شارەگەورەکاندا تێکەڵبوون و لەعەرەبەکان زیاتر بوون و، لەئەنجامدا زمانەکەیان بڵاو بوویەوە و نەبوونی فەصاحەت لەنێو خەڵکی شارە گەورە و بچووکەکاندا زۆر بوو لەزمانی عەرەبی مەلەکەکەی دوور کەوتنەوە و، فێرخوازان توانای فێربوونی زمانی عەرەبیان لەدەستدا.

هەربۆیە لەم سەرەدەمەدا لەنێو شیعر و پەخشان و ئەدەبدا زمانی عەرەبی زۆر زەلیل و لاواز دەبینرێت هەرچەندە لەڕووی چەندیەتیەوە بەرهەمگەلێکی فراوان دەبینرێت، خوداش هەرچیەکی بوێت دەیئافرێنێت و هەڵیدەبژێرێت[318].

---

[318] (وَرَبُّكَ يَخْلُقُ مَا يَشَاءُ وَيَخْتَارُ) س قصص ئا ٦٦.

# بەشی چل و پێنج

## لەبارەی دابەشکردنی قسەوە بەهەردوو بەشی هۆنراوە و پەخشانەوە

دەبێت بزانین کە زمانی عەرەبی و قسەکانیان دەبن بەدوو هونەرەوە: یەکەمیان شیعری هۆنراوە کەبریتیە لەقسەی وەزن و قافیەدار بەو مانایەی کە هەموو کێش و وەزنەکانی یەك شیعر خاوەنی یەك شێواز بن کەپێی دەڵێن قافیە. وەدووەمیشیان پەخشانە کەقسەیەکی بێ کیش و وەزنە، هەریەکە لەدووهونەری باسکراو چەندین هونەرو شێوازی جۆراوجۆریان لەقسەدا هەیە. هەروەك چۆن شیعر خاوەنی چەندبەشێکی وەك پیاهەڵدان (مدح) بەخراپە باسکردن (هجو) شیوەنە (رثا) یە، پەخشانیش یان مەسجەعە ئەوەش قسەیەکە کەبەشێوەی پارچەی جیاوازی لێدەکەن و پابەند دەبن پێیەوە، کەلەهەردوو ووشەکەیدا یەك قافیە هەبێت کەپێی دەڵێن سەجع[٣١٩]. وەیان ئازاد (مرسل)و، ئەوەش جۆرێکە کە قسەتێیدا بەتەواوەتی ئازادە و دابەش نابێت، بەڵکو بەبێ موقەیەد کردنیەوە بەقافیە یان قەیدێکی تر قسەکە بەتەواوەتی ڕەها دەکەن. ئەم جۆرە پەخشان و نەسرەش لەخوتبە و دووعاکان و لەکاتی هاندان و هەڕەشەکردن لەجەماوەری خەڵکی بەکار دێت. بەڵام قورئان هەرچەندە لەجری پەخشان و نەسەر دەژمێردێت، بەڵام لەهەردوو سیفەتی باسکراو بەدوورە و نەبەشێوەیەکی ڕەها پێی دەڵێن مەسجەع وەنە پێشی دەڵێن مورسەل و ئازاد، بەڵکو ئایەتگەلێکی لەیەکتر جیاوازن و کەبەپارچەگەلێك

---

[٣١٩] سەجع: بریتیە لە تەوافوقی دووفاصیلە و ماوەی نێوان پەخشانە لەسەر یەك پیت لەکۆتایی ڕستەکەوە.

کۆتاییاندێتو، زەوق و ئارەزو بۆکۆتایی قسەکە لەو پارچەو کۆپلانەدا گەواهیدەری ئەم ڕاستیەیەو دواتریش قسەکە دەگەڕێتەوە سەر ئایەتێکی تری دوای ئەوو بەبێ پابەند بوون و ئیلتیزام ئەو پیتەی کەسەجع یان قافیەیە دووبارە دەهێنرێتەوە. ئەمەش مانای فەرموودەکەی خودای تعالی یە کەدەفەرمێت: خودا باشترین قسەی ناردە خوارەوە کتێبێکی موتەشابیە مثانی[٣٢٠] کەپێستی ئەوانەی کە لەپەروەردگاریان دەترسن بەهۆیەوە دەلەرزێت[٣٢١]و، فەرمووی بەدڵنیاییەوە درێژەمان بەئایەتەکانداوە لەڕونکردنەوەدا (تفصیل).[٣٢٢]

بەکۆتایی ئایەتەکانی قورئان دەڵێن فواصل، چونکە سەجع نین وەئەوەی کەلەسەجعدا پێویستە لەسەریان تێیاندا بەپێویست نەزانراوە وەقافیەش نین بەڵکو هۆکاری ئەوەی کەباسمانکرد بەهەموو ئایەتەکانی قورئان گوتراوە مەسانی وەك زاڵبوون تایبەتکراوە بە ام القران[٣٢٣] وەك نجم کەبەشێوەیەکی زاڵ بەسورەیا گوتراوە، هەربۆیە پێی دەڵێن سبع المثانی[٣٢٤]. ئەم قسەیەی ئێمەلەگەڵ قسەی موفەسیرەکان لەڕووی ناونانی ئەو سورەتانە بەمەسانی بەراورد بکە ئەوکات حەقیقەت ئەو گەواهیە دەدات کەقسەکەی ئێمە ڕاجیحترو باشترە. وەدەبێت ئەوەبزانین بۆ هەریەکە لەم هونەرانە شێوازگەلێك هەن کەلەلای ئەهلی ئەوان تایبەتە بەهەمان هونەرەوە و شیاونیە بۆ هونەرێکی تر و، تێیدا بەکار ناهێنرێت

---

[٣٢٠] (ئایەتەکانی قورئان) اقرب الموارد. یان ئایەتـە دوو بەیتیـەکان مەسـانی قورئانـە لەبـەر ئیقـتیران و لکـانی ئایەتەکانی ڕەحمەت بەئایەتەکانی عەزابەوە، یان ئەوەیـە کەلەقورئانـدا دووبارەیـە یـان سـورەتی فاتیحـە یـان سورەتی بقرە یان سورەتی برائەت، یان هەرسورەتێك کەکەمتربێت لەسورەتە درێژەکان و زیاتر بێت لەسورەتە کورت و مانادرێژەکان (قصار المفصل) منتهی الارب.

[٣٢١] (اللهُ نَزَّلَ أحسَنَ الحَدِيثِ كِتاباً مُتَشابِهًا مَّثانِيَ تَقشَعِرُ مِنهُ جُلُودُ الَّذِينَ يَخشَونَ رَبَّهُم) س الزمر ئا ٢٣.

[٣٢٢] (قَدفَصَّلنَا الأيات) س الانعام ئا ٩٧، ٩٨.

[٣٢٣] ام القران سورەتی فاتیحە یان ئایەتە محکماتەکان لەئایەتەکانی ئەحکام.

[٣٢٤] مەبەست سورەتی فاتیحەیە لەو ڕووەوەی کەحـەوت ئایەتـە یـان حـەوات سـورەتی درێـژ لـەبقرەوە تـاوەکو تەوبە(منتهی الارب).

وەك غەزەلی (نسیب) كەتایبەتە بەشیعرەوە و سوپاس و دوعا كەتایبەتە بەخوتبە و دووعاكانەوە ئەوانەی كەتایبەتن بەقسەكردن و موخاتەباتەكانەوە و نمونەی ئەمانە. پاشینان پێداویستی و خوازیاریە شیعریەكان لەپەخشاندا بەكار دەهێنن وەك: سەجعی زۆر و ئیلتیزام و پابەندبوونی قافیە و پێشخستنی غەزەلی نسیب لەسەرەتای مەبەستەكانەوە. هەربۆیە ئەگەر بەباشی بیر لەو جۆرە پەخشانە بكەینەوە لەبابی شیعرو هونەردا، ئەوەیەكە بێجگە لەوەزن و كێش هیچ جیاوازیەك لەنێوان ئەوو شیعردا نیە و نوسەرە پاشینەكان لەسەرئەم شێوەیە بەردەوام دەبن و، لەنامە سوڵتانیەكان (دەوڵەتی – فەرمی) دا بەكاریان دەهێنن و پەخشانیان تەنها لەم هونەرەدا كورت كردووەتەوە و پەسەندیانكردووە و شێوازگەلێكی تریان ئاوێتەی كردووە.

وە پەخشانی مرسل و ئازادیان واز لێهێناوە و لەبیری خۆیان بردووەتەوە ئەم شێوازەش بەتایبەت لەنێو خەڵكی مەشریقدا باوبووە، قسەو موخاتەبە سوڵتانیەكان (دەوڵەتی – فەرمی) یەكان لەم سەردەمەدا نوسەرە بێئاگاكان لەم شێوازە كەئاماژەمان پێكرد دەینوسن ئەمە لەكاتێكدا ئەم شێوازە لەڕووی ڕەوانبێژی و بەلاغەتەوە ڕاست نیە. چونكە لەبەلاغەتدا جێبەجێ كردنی قسە لەسەر خواست و موقتەزای حاڵ بەپێی حاڵەتەكانی قسەكەر و بیسەر لەبەرچاو دەگیرێت. ئەم هونەری پەخشانە بەقافیەوە پاشینان ئاوێتەی شیوازەكانی شیعریانكرد و پێویستبوو نامەسوڵتانیەكان لەو هونەرە بەدووربن، چونكە لەشێوازە شیعریەكاندا دروستە كەفەصاحەت و زمان لوسی تێكەڵكردنی جیدیەت لەگەڵ گاڵتەدا و درێژدادڕی و ئیتناب لەسیفەت ونمونە هێنانەوەكان تەشبیهات و ئیستیعارە دا زۆر بەكاریان هێناوە لەكاتێكداپێویستی ئەوە ناخوازێت كەئەم شێوازانە لەنامە فەرمیەكاندا بەكاربهێنرێن.

وەهەروەها پابەندبوون و ئیلتیزام بەقافیەوە لەبنەماكانی فەصاحەت و ئارایشكردنەكانی قسەیەو، ئێستەش دەبینین كە شان و شكۆی دەوڵەتداری و سەڵتەنەتو فەرمانە سوڵتانیەكان بۆ جەماوەری خەڵكی لەهاندان و ترساندندا دژی ئەم

شێوازانەیە. بەڵکو شێوازی پەسەند لەنامە سوڵتانیەکاندا (دەوڵەتی– فەرمی) شێوازی ئازاد و مرسلە، واتە دەبێت قسەکە لەقەید گەلێکی وەك: سەجع مەگەر لەچەند شوێنێکی کەمدا نەبێت و لەو شوێنەی کەمەلەکە بەبێ هیچ تەکەلوفێك و بەشێوەیەکی تەبیعی بەرەو ئەو ببرێت ئازاد بکرێت و، دواتریش دەبێت مافی قسە لەڕووی موتابەقەتەوە لەگەڵ موقتەزای حاڵدا ئەدا بکرێت، چونکە پلەکانی قسە جۆراوجۆرن[٣٢٥] وەهەر مەقامێکیش شێوازێکی تایبەتی هەیە وەك اطناب[٣٢٦] و ایجاز[٣٢٧]، یان لابردن و هێشتنەوە یان تصریح یان اشارە یان کینایە[٣٢٨] و ئیستیعارە[٣٢٩]، بەڵام ڕێکخستنی نامە سوڵتانیەکان (فەرمی – دەوڵەتی) بەشێوازێك کەگونجاو بێت لەگەڵ شێوازە شیعریەکاندا ناپەسەند و خراپە ئەوەی کەوای لەخەڵکی ئەم سەرەدەمە کردووە ئەم شێوازە بەکار بهێنن زاڵبوونی عەجەمیەکانە بەسەر زمانی ئەماندا، هەربۆیە ناتوانن مافی قسە لەگونجانی لەگەڵ داخوازو موقتەزای حاڵەکەدا ئەدا بکەن، لەئەنجامدا لەقسەی ئازاد و مرسل بەهۆی دووری مەبەست و ئامانجەکەیەوە لەبەلاغەت و فراوانی کاروبارە جۆراوجۆرەکانیدا بێتوانان چونکە زیاد لەپێویست لەبەلاغەوە دوورن و، دڵبەندی ئەم قسە مەسجەعە دەبن و کەموکورتیەکانی خۆیان لەجێبەجێ کردنی قسە لەگەڵ مەبەست و موقتەزای حاڵدا لەڕێگەی تەلفیق و شوێنکەوتنی قسە مەسجەعەکانەوە دادەپۆشن و، بەکەمێك لەئارایشور سەجع و لەقەبەکان ناونیشانی قسەکانیان چاکسازی دەکەن و لەشتەکانی تر

[٣٢٥] لکل مقام مقال.

[٣٢٦] گەیاندنی مەبەست بەشێوازێکی دوور ودرێژ و دوور لەعادەت. (تعریفات الجرجانی)

[٣٢٧] گەیاندنی مەبەست بەکەمتر لەدەستەواژە و عیبارەتی ئاسایی. (تعریفات).

[٣٢٨] تەعبیرکردنە لەشتێك بەلەفز یان مانا بەلەفزێکی غەیرە صەریح لەدەلالەتکردن بۆ چەند مەبەستێکی وەك شاردنەوە لەبیسەر وەك جـا فـلان. یـان بەمەبەسـتی جۆرێـك لەفەصـاحەت وەك: بەجـەرگی کەکینایەیـە لەئازایەتی و دەستدرێژی کەکینایەیە لەزوڵم ز دەسترۆیشتن. (تعریفات).

[٣٢٩] بانگەشەی مانای حەقیقەتە لەشتێکدا بۆ موبالەغەو زیادەڕەوی لەچواندن لەگەڵ باسـکردنی چـوێندراودا (مشبە) هەروەك بگوترێت: شێرێکم بینی. بەڵام مەبەستی پیاوێکی ئازابێت. (تعریفات)

بێئاگادەبن و، زۆربەی ئەو کەسانەشی کەئەم شێوازە ئەنجام دەدەن لەهەموو قسەکانیاندا زۆربەشێوەیەکی زیادەڕەوانە بەکاریان هێناوە نوسەران و شاعیرانی مەشریقی ئەم سەردەمەن. ئەمانە تەنانەت کەلێن و خەلەلیش دەخەنە نێو اعراب و تصریفاتی ووشەکانەوە کاتێك بیانەوێت لەتەجنیس یان موتابەقەیەکدا بەکاریان بهێنن کەلەگەڵ تصریف یان اعراب دا نەگونجێت و، ئەگەریش ببینن بەدەگەدان لەاعرابی ووشەکان و تصریفەکەیان جیناسەکە دروست دەبێت ئەوا ئەم جۆرەی جیناس بەباشتر دەزانن و، واز لەاعرابەکە دەهێنن بنەڕەتی ووشەکە لەناودەبەن بەهیوای ئەوەی کە لەگەڵ جیناسەکەدا بگونجێت و پێی بگات.

ئەگەر خوێنەر لەمبارەیەوە بیربکاتەوە و ئەو ووتارەی کەلەمبارەیەوە پێشکەشمانکرد بەووردیەوە بیخوێنێتەوە ئاگاداری ڕاستیەتی قسەکانمان دەبێت. خوداش یارمەتیدەری ئادەمیزادە.

# بەشی چل و شەش

## لەبارەی ئەوەی کەبەدەگمەن دەکرێت کەسێك لەهەردوو هونەری شیعرو پەخشاندا شارەزاو لێهاتووبێت

هۆکاری ئەمەش ئەوەیە کە هەروەك باسمانکرد قسەکردن مەلەکەیەکە کە هەرکات سەرەتا مەلەکەیەکی تر جێگەی بگرێتەوە ئەوکات لەتەواوکردنی ئەو مەلەکەیەی کە دواتر پێی دەگات بێتوانا دەبێت، چونکە قبولّ و هاتنەدی مەلەکەکان لەتەبایعەکاندا ئاسانترە. کاتێك لەلەسەر فیترەتی یەکەمینیان بن و هەرکاتێك مەلەکەیەکی تر پێشی کەوتبێت ئەوکات مادەی وەرگری ئەو دژی دەبێت و دەکەوێتە کێبەرکێ و کێشە لەگەڵیداو دەبێت رێگرو بەربەستێك لەبەردەم قبولّبوونیداو، لەئەنجامدا دژبوون ڕوودەداتو کاری کامڵکردنی مەلەکەی دووەم دژوار دەبوو ئەم بارودۆخەش لەهەموو مەلەکە صەناعیەکاندا (فێربوونیەکان)دا بوونی هەیە. ئێمەش لەشوێنی خۆیدا بەم جۆرە بەڵگانە بەڵگە دەهێنینەوە و دەبێت لەزمانەکانیشدا لەبەرچاوی بگرین چونکە لوغەت لەمەلەکەکانی زمانە و وەك صنعەت وایەو، دەبێت ئەو کەسانە کەلەسەرەتاوە خاوەنی کەم تازۆرێك عەجەمی بوون لەبەرچاو بگرین کەچۆن هەمیشە ئەوان بەبێتواناییەوە وازیان لێدەهێنن. هەربۆیە کەسێکی بەڕەگەز ئێرانی کەپێشتر زمانی فارسی فێربووبێت زالّ نابێت بەسەر مەلەکەی زمانی عەرەبیدا و بەردەوام وازی لێدەهێنێت، هەرچەندە فێریان ببێت و فێریشیان بکات بەخەڵکی. وەهەروەها بەربەرو ڕۆمی و بێگانەکانیش وەك

ئێرانیەکانن و کەمتر دەکرێت کەسانێك لەوان مەلەکەی زمانی عەرەبی بەباشی فێرببێت. تەنها هۆکاری ئەمەش ئەوەیە کەمەلەکەی زمانێکی تر لەواندا بەرلەمەلەکەی زمانی عەرەبی کەوتووە بەئەندازەیەك ئەگەر قوتابی زانستێك لەموتەکەلیمەکانی ئەم زمانانە بیەوێت زانست لەعەرەبی زمانەکان و کتێبەکانیانەوە فێرببێتو، تێیدا دۆش دادەمێنێتو ناگاتە ئامانجی خۆی و تەنها هۆکارەکەشی پەیوەستە بەزمانەوە.

ئێمەش لەبەشەکانی پێشوودا باسی ئەوەمانکرد کەزمان و لوغەتەکان وەك صنعەتەکانن و دیسانەوە لەبەشەکانی تردا باسمانکرد، کەمەلەکەی صنعەتەکان بەیەکەوە ڕاست دەرنایەن و ئەگەر کەسێك سەرەتا لەمەلەکەی صنعەتێکدا شارەزایی و لێهاتنی هەبێت کەمتر دەکرێت لەصنعەتێکی تردا لێهاتووبێت و بگاتە ئەو پەڕی. خوداش ئێوە و ئەوە دروستدەکات کەدەیئافرێنێت[٣٣٠].

---

[٣٣٠] (وَاللَّهُ خَلَقَكُمْ وَمَا تَعْمَلُونَ) س الصافات ئا ٩٤.

# بەشی چل و حەوت

## لەبارەی صەناعەتی شیعر و شێوازی فێربوونیەوە

ئەم هونەرە لەهونەرەکانی قسەی عەرەبە و لەلای ئەوان بەشیعر ناسراوە. شیعر لەزمانەکانی تریشدا هەیە، بەڵام ئێستە ئێمە لەبارەی ئەو شیعرەی کەتایبەتە بەزمانی عەرەبیەوە قسەو باس دەکەین. هەرچەندە لەوانەیە ئەو خەڵکانەی کەبەزمانەکانی تر قسەدەکەن، بەهەمان شێوە شیعر بەهۆکارێك بۆ دەربڕینی مەبەستەکانیان بزانن. وەئەگەریش بەدەر لەمە بێت هۆکارەکەی ئەوەیەکە هەر زمانێك شێوازی بەلاغەتو ئەحکامی تایبەتی هەیە، شیعریش لەزمانی عەرەبیدا خاوەن مەبەستی تایبەت و سەیرەو چونکە باسو دەستەواژە لەبارەی قسەیەکەوەیە دەبن بەچەند بەشێکی هاوکێشو وەزنەوەو، ئەم بەشانەش لەپیتی کۆتاییدا یەکێکن و بەهەریەکەیان دەڵێن بەیت و پیتی کۆتایی لەهەموو بەیتەکاندا یەکسانەو پێی دەڵێن قافیە. وەکۆی بەیتەکان تاوەکو کۆتایی پێی دەڵێن قەصیدەو کەلیمە وەتەرکیباتی هەر بەیتێك لەیەك قەصیدەدا بەتەنهایی مانادەگەیەنێت، هەروەك بڵێی قسەیەکی سەربەخۆیە و پەیوەندی بەبەیتەکانی پێش خۆیی و دوای خۆیەوە نیە و هەرکات بەتەنهایی بیخوێننەوەو لەبابەتی خۆیدا وەك: مەدح یان تغزل یان ڕەسط کامڵ دەبێت، هەربۆیە شاعیر هەوڵدەدات هەربەیتێك بەو شێوەیە بڵێتو بۆ دەرچوون لەهونەرەکە مەبەستەکەی و استیتراد و قسەکردنێك کەقسەی تری لێوە بخوێنرێتەوە، واتە بەم جۆرە لەمەبەستی مانا یەکەمینەکاندا زەمینە خۆش دەکات بۆ ئەوەی گونجاوبێت لەگەڵ مەبەستی دووەمداو، قسەکە لەتەنافور بەدوور

دەگرێت و هەروەك چۆن لەتەغەزولەوە بۆ مەدح و لەوەسفی فەلات و ڕووتو ڕازاندنەوەی وەسفی سوارچاکان یان ئەسپ یان شێوەیەکی خەیاڵی خۆشەویستو مەعشوق دەهێنێت، یان لەوەسفکردنی مەدحکراو بەوەسفی تایفەو لەشکریەکانی ئەو دەگەڕێتەوە. وەلەشکات و شەکیبایی لەشیوەندا بەژماردنی چاکەکانی مردوو تێپەڕین بەسەریدا و وەك بەرەو ئەم جۆرە ناوەڕۆکانە دەڕوات و، هەماهەنگی هەموو بەیتەکانی قەصیدەکە لەڕووی وەزنەوە ڕەچاو دەکەن تانەوەکو تەبعەکەی ئاسانکاری بکات و لەوەزنی تایبەتی ئەو قەصیدەیە دەربچێتو بەرەو ئەو وەزنەی کەلەوەوە نزیکە بڕوات، چونکە بەهۆی نزیکی هەندێك لەوەزنەکانەوە لەیەکتر هەندێك جار ئەم شتە بۆ هەندێك خەڵك ئاڵۆز دەبێت.

وەئەم مەوازینانە خاوەن هەلومەرج و ئەحکام گەلێکن کەلەزانستی عەروزدا باسیان کردوون. عەرەبیش لەهونەری شیعردا هەروەزنێك کە لەگەڵ تەبعدا سازگار بووە بەکاریان نەهێناوە، بەڵکو وەزنگەلێکی تایبەتی لەهونەری شیعردا هەڵبژاردووە و خاوەنانی ئەم صنعەتە پێیان دەڵێن بحور، کەهەموویان لەپانزە بەحردا کورتکردووەتەوە و هۆکاری کورتکردنەوەکەش ئەمەیەکە ئەهلی هونەری شیعر هێندە بەرهەمی هۆنراوەیان لەعەرەبەوە دەستکەوتووە، کەلەپانزە بەحرەکە زیاتر نەبووە و لەوەزنە ئاساییەکانی تردا شیعرێك لەعەرەبەوە نەبینراوە.

وەدەبێت بزانین کەهونەری شیعر لەنێو بەشەکانی قسەدا لەنێو تازیەکاندا پلەیەکی شەریفی هەبووە، هەر بۆیە شیعریان بەدیوانی زانست و هەواڵ و گەواهی باش و خراپی خۆیان داناوەو، وەك سەرچاوە و ئەصڵێکی دەزانن کەلەزۆرێك لەزانستەکانی حیکمەتی خۆیاندا دەگەڕێنەوە بۆی و مەلەکەی شیعر لەنێو ئەماندا وەك هەموو مەلەکەکان بەهێز و پایەدار بووە. وەهەموو مەلەکە زمانیەکان بەڕێگەی صەناعەت و مومارەسە لەقسەدا کەلەو زمانەدا هەیە سەرچاوە دەگرێت و دەبێت مومارەسە هێندە بەردەوامبێت، تاوەکو لەم مەلەکانەدا هاوشێوەگەلێك دروستببن‌و بۆ ئەوکەسانەی کەئەیانەوێت مەلەکەی شیعر بەشێوەیەکی صەناعی لەپاشینانەوە فێرببن هونەری ناوبراو لەهونەرەکانی تر دژوارترە،

چونکە دەبێت هەر بەیتێك سەربەخۆ بێت و بتوانرێت لەڕووی مەبەستەوە بەقسەیەکی تەواوی بزانین و باشتربێت بەشێوەیەکی جیاو بەتەنها باسی بکەین و، لەم ڕووەوە ئەم مەلەکەیە دەبێت جۆرێك لەباریك بینی و نەرمی بوونی هەبێت تاوەکو شاعیر بتوانێت قسەی شیعری لەو قاڵبانەی کە لەهەرشێوەیەکی شیعری عەرەبدا بەناوبانگە بڕێژرێتو بەخۆی ئاشکرای بکات. دواتر یەك بەیەکی بەیتەکانی تر بەم شێوەیە ڕێکبخاتو مەبەستەکەی تەواو دەکات. دواتریش بەپێی جیاوازی ناوەڕۆك و شێوەکان کەدەبێت لەقەصیدەدا ڕەچاوبکرێت بەیتەکان بەجۆرێك بەدوای یەکدا بهێنێت کەگونجان و تەناسوبیان پارێزراوبێت.

بەهۆی دژواری مەبەست و غەریبی هونەری شیعرەوە لەڕووی لێهاتنەوە لەشێوازە شیعریەکاندا و بەکارهێنانی ئەندێشەکان لەقاڵبرێژی قسەکاندا، وەك مەحەقی قەریحەکانیان دەزانی بۆ چرینی شیعریش تەنها مەلەکەی قسەی عەرەبی بەس نیە، بەڵکو شاعیر بەتایبەت دەبێت خاوەنی نەرمی و هەوڵدان بێت لەڕەچاوکردنی شێوازە تایبەتەکاندا کەعەرەب تایبەت بووە پێیانەوە و لەشیعردا بەکاری هێناون. ئێمەش لێرەدا مانای لەفزی شێواز لەلای خاوەنانی ئەم صنعەتە و ئەوەی کە لەقسەیاندا ئیرادەی دەکەن باسدەکەین: دەبێت ئەوە بزانین شێواز وەك پارچەیەك وایە کە پێکهاتەکانی لەسەر دەدورن یان وەك قاڵبێکە کە قسەی تێدا قاڵبرێژی دەکەن. وەنابێت تەسەووری ئەوە بکەین کە لەشێوازو ئوسلوبدا دەلالەتی قسە لەسەر ئەصڵی ماناکە کەپەیوەستە بەئیعرابی نحوەوە لەبەرچاو دەگرن. یان گرنگی بەدەلالەتی قسە دەدەن لەسەر تەواوی ماناکە کەلەتایبەتمەندیەکانی پەیوەست بەزانستی بەلاغەیە، یان وەزنی شیعر بەپێی بەکارهێنانەکانی عەرەب دەخەنە بەر ووردەکاریەوە کەپەیوەستە بەزانستی عەرووزەوە، هەر بۆیە هەرسێ زانستی ناوبراو بەهیچ شێوەیەك پەیوەست نین بەم هونەری شیعرەوە، بەڵکو شێوازو ئوسلوبی شیعر بریتیە لەشێوەیەکی زەینی کەتایبەتە بەتەرکیبە هۆنراوەیی و گشتیەکانەوەیە بەئیعتیباری جێبەجێ بوونی ئەوان لەسەر هەر تەرکیبێکی

تایبەت و زەین، کەئەم شێوازە لەعەین یان زاتی تەرکیبەکان دادەماڵێتو، وەك قاڵب یان پارچەیەك دەیسپێرێت بەخەیاڵ دواتر ئەو تەرکیباتەی کەلەلای عەرەب لەڕوانگەی اعرابو بیانەوە ڕاستن هەڵیاندەبژێرێت و بەباشترین تەرتیب قاڵبڕێژیان دەکات، هەروەك چۆن وەستا قاڵبڕێژی دەکات یان چنەر پارچەکە وورده وورده دەچنێت تاوەکو کۆتاییو، لەئەنجامدا بەدیهاتنی تەرکیبە وافیەکان مەبەستی قاڵبی زەین فراوان دەکاتو، لەڕووی مەلەکەی زمانی عەرەبیەوە بەو شێوە ڕاستەی کەتێیدا هەیە جێبەجێی دەکات. هەروەك چۆن هەریەکە لەهونەرەکانی کەلام خاوەن ئوسلوب گەلێکی تایبەتن و ئەم شێوازو ئوسلوبانەش لەو شێوە جۆراو جۆرانەدا دەردەکەون، وەك ئەوەی کە پرسیار لەبارەی ئاسەواری ماڵی وێران لەشیعردا کاتێك لەڕێگەی قسەکردن لەبارەی شوێنەواری ناوبراوەوەیە بەم شێوەیە: ئەی خانووەکە کەلەسەر کێوەکەیت و دواتریش لەتەکیەگاوە هەڵکەوتوویت[٣٣١].

وەهەندێك جاریش بەشێوەی ئەوەیە کە شاعیر داوا لەهاوڕێیانی خۆی دەکات ڕاوەستنو لەماڵە وێرانەکە بپرسن وەك: بوەستن لەو خانووەی کەدانیشتوانەکەی بەخێراییەوە سەفەریانکردووە بپرسین[٣٣٢] یان ئەوەی کەشاعیر داوا لەهاوڕێیانی خۆی دەکات کەلەشوێنەوارەکانی ماڵە وێرانەکە وورد ببنەوە: بوەستن لەیادخستنەوەی خۆشەویست و ماڵەکەی[٣٣٣].

یان قسەکەرێك نادیار ناچار بەپرشسیارکردن دەکات تاوەکو وەڵامی دەست بکەوێت وەك: ئایا پرسیارت نەکرد بۆ ئەوەی شوێنەوارە وێرانەکە هەواڵت پێ بدات ؟[٣٣٤]. یان وەك درود گوتن بەنیشانەکانی ماڵەوێرانەکە بەم شێوەیە کەشاعیر فەرمان بەقسەلەگەڵ

---

[٣٣١] یادار میته باالعلیا فالسند.

[٣٣٢] قفا نسئل الدارالتی قفا اهلها.

[٣٣٣] قفا نبك من زكر حبيب ومنزل.

[٣٣٤] الم تسئل فتخبرك الرسوم.

کراوێکی نادیاربکات کەدرود بنێرێت وەك: درود بنێرە[٣٣٥] بۆ ئەو خانوانەی کەلەلای عەزلەوەن[٣٣٦] یان نیشانەی ماڵی وێران بەدابارین و ئاوەدانی دوعا دەکات وەك: هەورێکی خرۆشانی باراناوی کەنیشانەکانی ماڵی وێرانەی ئەمان تێراو بکات و لەباوەشی بەتوانایی‌و نازو نیعمەتدا جێگیر بن[٣٣٧].

ئەی هەورەبروسکە لەسەر ئەو خانوەوە دەرکەوە کە لەابرق دایە. هەور لەسەر ئەو خانووە بەجۆرێك لابەرە کەحوشترەوانەکان دەخورنە حوشترەکانیان[٣٣٨]. یان وەك ئەوەی کەلەکاتی رووداوێکی کارەساتباردا شیوەن خوێنێك داوای راپەرین دەکات، وەك: بەم جۆرەیە دەبێت ئەم شتە بەگەورە بزانین و بەخەمباری دابنێین و بۆ دیدەیەك کەفرمێسکاوی نەبێت هیچ بەهانەیەك نیە[٣٣٩]. یان رووداوێك بەگەورە نیشاندەدات بەم شێوەیە: ئایابینیت کەچ کەسێکیان بەدارەمەیت بردە گۆرستان؟ ئایابینیت کەچۆن شەمعی شوێنی ئاهەنگەکان کوژایەوە[٣٤٠]. یان شاعیر بەهۆی لەدەستدانی خۆشەویستێکەوە بوونەوەرانی بێگیانیش لەموصیبەتەکەدا بەشدار دەکەن وەك: سەوزەزارە خۆشەکان، ئیتر ئێوە پاسەوان وشوانێکتان نیە، چونکە چنگاڵی مەرگ ئەو پیاوە جەنگاوەرەی رفاند[٣٤١] یان رووده‌کاتە شتە بێگیانەکان کەلەمەرگی خۆشەویستەکەیدا بەبروای ئەو توشی موصیبەت نەبوون و، بەئینکاریەوە کاری ئەوان دەستپێدەکات هەروەك خارجیە دەڵێت: ئەی درەختی خابور چۆن پرگەڵ و سەوز

---

[٣٣٥] عزل کانیەکە لەنێوان بصره و یەمەندایە.

[٣٣٦] حی الدیار بجانب العزل.

[٣٣٧] اسقی طلوعهم اجش هزیم — وغدت علیهم نضرة ونعیم.

[٣٣٨] یابرق تالع منزلا بالابرق — واحد السحاب لها حدا الابنق.

[٣٣٩] کذا فلیجل الخطب ولیفدح الامر — ولیس لعین لم یفض مائها عذر.

[٣٤٠] ارایت من حملوا علی الاعواد — ارایت کیف خبأ ضیاء النادی.

[٣٤١] منابع العشب لاحام ولاراعی — مضی الردی بطویل الرمح والباع.

دەبینین؟ هەروەك بڵێی تۆ لەسەر مەرگی ئیبن تەریف شیوەنت نەکردووە[٣٤٢] یان سەرەخۆشی لەشکستخواردو دووژمنی کەسێك کەمردووە چونکە لەژێرباری فشارو سەختگیری ئەودا ئازاد بووە وەك: خاندانی ڕەبیعەی کوڕی نزار ئیتر نەیزەکان بخەنە زەوی چنگاڵی مەرگی دووژمن شەرکەری ئێوەی ڕفاند[٣٤٣] زۆرێك لەم جۆرە شێوازانە کەلەزۆرێك لەهونەر و شێوازەکانی قسەدا بوونی هەیەو، ئەو تەرکیباتانەی کەلەشێوازی شیعردا پێکدێن و، لەوانەیە بەهۆی جوملە یان غەیری جوملەوە بن جوملەکانیش هەندێکجار ئینشائین و هەندێك جاریش خەبەرین و هەندێکجاریش ئیسمی یان فیعلین. لەوانەیە جوملەکان شوێنکەوتەی یەکتری بن یان نەبن لەهەندێك شوێندا جوملەکان لەڕووی ماناوە سازگارن بەیەکەوەو، لەهەندێك شوێنی تردا ناسازگارن‌و هەندێکجار لەوانە بەش بەش بن یان جیالەیەکتری.

ئەمانە هەموو بەپێی چۆنیەتی تەرکیباتەکان لەقسەی عەرەبی و ناسینەوەی شوێنی هەر ووشەیەك بەووشەیەکی ترە کەبەهۆی سود وەرگرتن لەمومارەسەو تەمرینەوە لەشیعرەکاندا پەیان پێدەبەین. بەهۆی ئەم مومارەسەیەوە قاڵبێکی گشتی موجەڕەد لەتەرکیباتە دیاریکراوەکان لەزەیندا دەنەخشێت و ئەم قاڵبەش بەسەر هەموویاندا جێبەجێ دەکرێت، چونکە فەراهەمهێنەری قسەیە وەك وەستا یان جۆلا وایە وەشێوەی زەینی جێبەجێکراو وەك قاڵبێکە کە وەستا خانوەکەی تێدا دروستدەکات، یان وەك پارچەیەك وایە کەچنەر دەیچنێت. لەم ڕووەوە ئەگەر وەستا لەقاڵب و جۆلاکەش لەئاستی خۆیان دەربچن ئەوا کارەکەیان خراپ دەبێت، وەنابێت تەسەووری ئەوەبکەین کەناسینی یاساو ئوصوڵەکانی بەلاغەت بۆ ئەم مەبەستە بەس بێت، چونکە ئێمە دەڵێین کەیاساکانی بەلاغەت بریتین لەیاساگەلێکی زانستی و پێوانەیین و تەنها سودیشیان

---

[٣٤٢] ایا شجر الخابور مالك مورقا — كانك لم تجزع على ابن طريف.

[٣٤٣] الق الرماح ربيعة بن نزار — اودا الردا بقريعك المغوار.

ئەوەیە کە بەکارهێنانی تەرکیباتەکان لەسەر شێوازی تایبەت بەقیاس بەئاسایی دەزانن قیاسێکی زانستی ڕاستی (مطرد)[٣٤٤] وەك قیاسی یاساکانی اعراب (نحو).

بەلاّم ئەم شێوازانەی کە ئێمە سەرقاڵی باسکردنیانین کەبەهۆی بەدواداچوونی تەرکیبە جۆراو جۆرەکان لەشیعری عەرەبدا لەنەفسدا جێگیر دەبن تائەوەندە بەسەر زاردا بێن، کەشێوەیان جێگیر و لەزەیندا بچەسپێت و سودیان لێوەربگرن و، لەهەر تەرکیبێکی شیعریدا بیانکەنە سەرمەشق و لەتەرکیبە ناوبراوەکان پەیڕەوی بکەن. هەروەك چۆن ئەم خاڵەمان لەباسی گشتی قسەکەدا باسکرد، بەلاّم یاسازانستیەکانی اعراب (نحو) و بیان ئەم شێوازانە بەهیچ شێوەیەك فێرناکەن و، سەرەڕای ئەمەش هەموو ئەوشتانەی کەلەڕوانگەی قیاسی قسەی عەرەب و یاسا زانستیەکانەوە ڕاست بن بەکار ناهێنرێن، بەڵکو بەشگەلێکی بەناوبانگ لەم قیاسانە لەلای عەرەب بەکاردێن و ئەوانەشی کەقسەو یاساکانی ئەمان لەبەر دەکەن ئاگاداریان دەبن و، شێوەیان لەژێر ئەو ئەو یاسایانەدا جێگیر دەبێت و، کەواتە هەرکات بەم شێوازە زەینیانە کەوەك قاڵبگەلێکن گرنگی بەشیعری عەرەب بدرێت ئەوکات گرنگی بەتەرکیبەکانیشیان دەدرێت نەوەك بەهەرشتێك کەقیاس دەیخوازێت. هەربۆیە گوتمان ئەوەی کەهۆکاری بەدیهاتنی ئەم قاڵبانەیە لەزەیندا تەنها لەبەرکردنی شیعرو قسەی عەرەبیەو ئەم قاڵبانە هەروەك چۆن لەشیعردا هەن لەپەخشانیشدا بوونیان هەیە. چونکە قسەی عەرەب لەهەردوو هونەرەکەدا بەکار هاتووە و چ لەهۆنراوە و چ لە پەخشانیشدا بەدوور و درێژی هێناویانە هەروەك چۆن لەشیعردا ئەو جۆرە قسانە لەبەیتە هۆنراوەکانداو قافیە موقەیەدەکاندا بەدیان دەهێنن و سەربەخۆیی قسە لەهەربەیتێکدا ڕەچاودەکەن.

لەپەخشاندا بەزۆری موازەنەو لێکچوونو تەشابوە لەنێوان جوملە عیبارەتەکاندا ڕەچاو دەکرێتو هەندێك جار قسەکە بەسەجع موقەیەد دەکرێتو، هەندێکجاریش ئازادە (شیعری حوڕ) وەقاڵبەکانی هەریەکە لەمجۆرانە لەزمانی عەرەبدا دیارو ئاشکرایە و

---

[٣٤٤] واتە قیاسێکی گشتی کەتێیدا استسنا نەبێت.

لەنێوانیاندا قاڵبگەلێك بەكار دێن كەبەدیهێنەری قسە لەسەر بنەمای ئەوان دانراوەكەی خۆی بنیات دەنێت. وەتەنها ڕێگەیەك كەقسەكەرەكان و ووتاربێژان ڕێنمایی دەكات بۆ ئەم قاڵبانە ئەوەیە كەقسەی فەصیح لەبەربكەن تاوەكو لەم قاڵبە دیاریكراوە جوزئیانە لەزەینی ئەواندا قاڵبێكی گشتی جیاببێتەوەو جێگیر بێت تێیداو، ببێتە نمونەیەك كەلەدروستكردنی قسەدا پەیڕەوی لێبكەن، هەروەك چۆن وەستا خانوو بەپێی قاڵب بنیات دەنێت و چنەریش پارچە بەپێی نەخش و نیگار دەدورێت.

لەم ڕووەوەیە كەهونەری قسەكردنو ووتاردان لەئەندێشەو نەزەری نحوی و بیانی و عەرەوزی جیاوازە و بەهونەرێكی سەربەخۆ دەدرێتە قەڵەم. ئەڵبەتە ڕەچاوكردنی یاسای زانستە ناوبراوەكان لەووتار بێژیدا بەو هەلومەرجانە دادەنرێت كە بەبێ زانینیان كامڵ نابێت. وەهەركات لەقسەدا هەموو ئەم سیفەت و تایبەتمەندیانە بێنەدی ئەوا تایبەت دەبن بەجۆرێك لەنەزەر و ئەندێشەی ناسكەوە لەم قاڵبانەدا كەلەڕیزی شێوازەكانی قسەدا دایاندەنێن وەبۆ ئاشنا بوونیش لەگەڵ ئەم شێوازانە هیچ شێوەیەك بەسوودتر نیە لەلەبەركردنی هۆنراوە و پەخشان. ئێستەش كەمانای شێواز ڕۆشن بوویەوە باشتر وایە كەبۆ شیعر بەحەد یاڕەسمێكە[٣٤٥] وە سەرقاڵبین تاوەكو بەهەموو ئەو قورسیەی كەلەم ئامانجەدا هەیە حەقیقەتەكەیمان بۆ ڕوون ببێتەوە و سەرقاڵی ماهیەت و چیەتیەكەی بینو هەم ئەوەش وەیاد دەهێنینەوە كەئێمە بەوەها تەعریفێك لەبەرهەمەكانی خەڵكانی

---

[٣٤٥] پێناسەی شت بەزاتیاتەكان دەڵێن حەد، وەك پێناسەی انسان بە حیوانی ناتیق. بەڵام ڕەسم كەپێناسەی شتەكانە بەعەرەزیات وەك پێناسەكردنی مرۆڤ بە(ماشی) ڕۆشتوو یا زاحیك، هەریەكەیان دووبەشن: تام و ناقص، حەدی تام ئەوەیەكە لەجنس و فەصڵی قەریب پێكهاتبێت، وەك پێناسەی مرۆڤ بەحەیوانی ناتیق. وەحەدی ناقیصیش ئەوەیەكە تەنها لەفەصڵی قەرەیب و جنسی بعید پێكهاتبێت، وەك پێناسەی مرۆڤ بەناتیق یان جسمی ناتیق. ڕەسمی تامیش لەجنسی قەریب و خاصە پێكهاتبێت وەك پێناسەی مرۆڤ بەحەیوانی زاحیك، وەڕەسمی ناقیصیش ئەوەیەكە تەنها لەخاصە یان خاصە و جنسی بعید پێكهاتبێت وەك پێناسەی مرۆڤ بەزاحیك یان بەجسمی زاحیك وەبەعەرەزیاتێك كەهەموویان تایبەت بوون بەیەك حەقیقەتەوە، هەروەك چۆن لەپێناسەی مرۆڤدا بڵێن لەسەرڕووپێ دەڕوات یان لای ڕاستی هەیە یان بەتەبع پێدەكەنێت و نمونەی ئەمانە (تعریفاتی جورجانی).

تردا دەستمان نەکەوتووە هیچکام لەپێشینانی شیعریان بەم شێوەیە پێناسە نەکردووە، هەروەك چۆن حەدعەروزیەکان دەڵێن: (شیعر بریتیە لەقسەیەکی وەزن و قافیەدار) بۆشیعرێك کەئێمە دەمانەوێت بیناسێنین، نەبەحەد دادەنرێت و نەبە ڕەسم و، عەروزیەکانیش لەهونەرەکەی خۆیاندا تەنها لەم ڕوانگەیەوە سەیری شیعر دەکەن کەژمارەی پیتە بزواوو نەبزواوەکانی بەیتەکانی پەیاپەی گونجاوبن لەگەڵ یەکتریداو، وەعەروزی[٣٤٦] بەیتەشیرەکان لەگەڵ زەڕبیاندا[٣٤٧] لێکچوونی هەبێت، ئەم جۆرە بۆچوونەش تەنها پەیوەستە بە وەزنی شیعرەوە و زۆر گرنگی نادات بەئەلفازو چۆنیەتی دەلالەتیان لەسەر مانا کەواتە گونجاو دەبێت لەگەڵیدا کەلەلای ئەوان حەدی بێت، بەلأم ئێمە لێرەدا لەو ڕوانگەیەوە سەیری شیعر دەکەین کە خاوەنی اعراب و بەلاغەت و وەزن و قالبگەلێکی تایبەتە.

وەگومانیش لەوەدا نیە پێناسەی عەروزیەکان بۆ شیعر کەمەبەستی ئێمەیە بەس نیەو بەناچاریەوە دەبێت بەشوێن پێناسەیەکدا بگەڕێین کەکەحەقیقەتەکەی لەم ڕوانگەیەوە ڕۆشن بکاتەوە، هەربۆیە دەڵێین: شیعر قسەیەکی بەلیغ و دامەزراوە لەسەر استعارەو وەصفەکان وەستاوە کەبەبەشگەلێك (بەیتێك)ی هاو وەزن بێت و دابەش ببێت، هەروەك چۆن هەربەشێکی بەیتەکەی لەڕووی مەبەست و ئامانجەوە بەنیسبەت بەشی بەیتەکەوە لەپێشو دوایەوە سەربەخۆبێتو بەپێی شێوازە تایبەتەکانی زمانی عەرەبی بێت. لەم پێناسەیەدا قسەی بەلیغ و ڕەوان جینسە کەفەصڵەکەی لەسەر استیعارە و صیفەتەکان دامەزراوە وەهەرقسەیەکیش کەئەم صیفەتەی تێدا نەبێت دەیکاتە دەرەوە، چونکە ناتوانین ئەم جۆرە قسانە ناوبنێین شیعر و جوملەی (دابەش ببێت بەسەر چەند بەش و بەیتی هاو وەزن و قافیەوە) بەش و فەصڵێکی ترە، بۆ ئەوەی پەخشان کە بەهەموو بەیتەکانی ناڵێن شیعر لەپێناسەکە بیانکاتە دەرەوە، وەقەیدکردنی (هەربەیت یان

---

[٣٤٦] بەشی کۆتایی میصراعی یەکەمی هەربەیتێك.

[٣٤٧] کۆتا بەشی میصراعی دووەمی بەیتێك. (تعریفات الجرجانی).

بەشێکی لەڕووی مەبەست و ئامانجەوە لەبەیتەکەی خۆی سەربەخۆ بێت) بۆ ڕوونکردنەوەی حەقیقەتی شیعرە، چونکە بەیتەکانی شیعر بەم شێوەیەن و شتێك لەیەکتریان جیاناکاتەوە. وەئەوەی کەگوتمان (بەپێی شێوازە تایبەتەکانی زمانی عەرەب بڕوات) فەصڵێکە بۆ کردنەدەرەوەی ئەو قسانەی کەلەسەر شێوازە بەناوبانگەکانی شیعر ناچن، چونکە ئەم جۆرە قسانە بەم جۆرە بەم جۆرە تایبەتمەندیانەوە ناتوانین ناوبنێین شیعر، بەڵکو بەقسەی هۆنراوە دێنە هەژمار، چونکە شیعر خاوەنی ئوسلوبگەلێکی تایبەتە کەلەپەخشاندا بوونی نیە هەروەك چۆن پەخشانیش شێوازگەلێکی هەیە کەلەشیعردا بوونیان نیە. هەربۆیە هەرقسەیەکی هۆنراوە کەلەسەر ئەم شێوازانە نەبێت ناتوانرێت ناوی بنرێت شیعر.

هەربۆیە زۆرێك لەشێخ و مامۆستایانی ئەدەبمان بینیوە کەپێیانوایە کەنەزمی موتەنەبی و مەعەڕڕی بەهیچ شێوەیەك شیعر نیە چونکە قسەکانی ئەوان لەسەر ئوسلوبەکانی شیعر ناڕوات. وەئەوەی کەلەپێناسەکەدا قەیدمانکرد (لەسەر شێوازەکانی زمانی عەرەبی بڕوات) بەش و فەصڵێکی ترە کەشیعری غەیرە عەرەب لەنێو نەتەوەکانی تردا لەپێناسەکە دەکاتە دەرەوە، بەپێی بۆچوونی ئەو کەسانەی کەپێیانوایە کە شیعر لەنێو نەتەوەی عەرەب و نەتەوەکانی تریشدا بوونی هەیە، بەڵام ئەو کەسانەی کەپێیانوایە شیعر بێجگە لەنێو نەتەوەی عەرەبدا لەناوهیچ نەتەوەیەکی تردا بوونی نیە پێویستیان بەم بەش و فەصڵە نیە و لەبری ئەوە دەڵێن: بەپێی شێوازە تایبەتەکانی خۆی بڕوات.

ئێستەش کەلەگفتوگۆی حەقیقەتی شیعر لێبوینەوە باسی صۆنیەتی گوتنەکەی دەکەین و لێزانی و شارەزایی لەم هونەرەدا خاوەن هەلومەرجگەلێکە کە یەکەمینیان پاراستنی جینسەکەیەتی واتە جینسی شیعری عەرەبیە بۆ ئەوەی لەنەفسدا مەلەکەیەك پەروەردە ببێت و وەك نەخشەی جۆلا ببێتە پێشەنگ و سەرمەشق و پەیڕەوی لێبکرێت. وەمەحفوزات لەشیعرە ئەصیل و بنەڕەتیەکانەوە هەڵدەبژێرن کەخاوەن شێوازگەلێکی

جۆراوجۆرین. لانی کەمی ئەم شیعرە هەڵبژێردراوانە بەسە کەلەناوداران و هەڵکەوتووانی شاعیرانی ئیسلامیەوەهەیە: ئیبن ئەبو ڕەبیعە و کەسیر و زوالڕیمە جەریر و ئەبی نەواس‌و حەبیب و ئەبو تەمام بەحتەری و ڕەزی و ئەبوفیراس و....هتد. زۆربەی شیعرە هەڵبژێردراوەکانیش دەبێت لەکتێبی ئەغانیدا لەبەر بکرێن، چونکە لەم کتێبەدا هەموو بەرهەمی شاعیرانی تەبەقەی ئیسلامی و شیعرە هەڵبژێردراوەکانی سەردەمی نەفامی (جاهیلیەت)ی تێدایە. وەکەسێکیش کەلەم مەحفوزاتانەی نەبێت ئەوا هۆنینەوەکانی نوقسان و خراپ دەبن و هیچ وەسیلە و هۆکارێکیش بێجگە لەمەحفوزاتی فراوان ڕەونەق نادات بەشیعر و شیرینیەکەی زیاد ناکات، هەربۆیە کەسێك کەمەحفوزاتەکانی کەم بن یاخود هەر مەحفوزاتی نەبن ناتوانین بەرهەمی تەبعەکەی ناوبنێین شیعر، بەڵکو دەبێت هۆنراوەکانی بەشتێکی پەست بزانین و کەسێك کەمەحفوزاتێکی نیە باشتر وایە کەواز لەشیعر گوتن بهێنێت.

دواتر لەپاش پڕکردن و ئاراستەکردنی دەماغ و مێشك لەمەحفوزات‌و تەشحیزی قەریحە بەمەبەستی نمونەو سەرمەشق دانانی مەحفوزاتە هەڵبژێردراوەکان، دەبێت ڕووبکەینە نەزمی قسەو هەرچی زیاتر شیعر بگوترێت ئەوا مەلەکەکەی بەهێزتر و جێگیر تر دەبێت. هەرچەندە کەبگوترێت مەرجێکی تری شاعیری لەبیرکردنی ئەو مەحفوزاتانەیە تاوەکو نیشانە پیتیەکانی دیاری ئەو لەزەینی ئەمدا بسڕێتەوە، چونکە تاوەکو ئەوکاتەی کەڕسومە ناوبراوەکان لەزەینی ئەمدا بوونیان هەبێت، ئەوا لەکاتی شیعر گوتندا هەمان ئەو ئەلفازانە بەکار دەهێنێت‌و خۆی ناتوانێت داهێنان بکات و نیشانە ناوبراوەکان دەبنە ڕێگر لەبەردەم بیرکردنەوەی ئەمدا. بەڵام ئەگەر فەرامۆشیان بکات لەکاتێکدا کەنەفس لەگەڵیاندا گونجاوە شێوازی مەحفوزاتە پێشینەکان لەزەینیدا دەنەخشێت و وەك ڕێبەی جۆلاً بۆ ئەو دەبێتە نمونەو سەرمەشق کەبەناچاریەوە لەووشەگەلێکی تری غەیری ئەوان یارمەتی وەردەگرێت و بەهەمان شێواز شیعر دەڵێت، ئەوکات مەرجی شاعیری دەبێتە خەڵوەت و تەنیایی و جوانی دیمەن، کەپلەیەکە شیعری تێدا دەڵێن وەك ئەوەی کە بۆ

لەزەت بردنی چاو لەکەنار ڕووبار و بێستانە پڕلەگوڵ و گیاو ڕێحانەکان دادەنیشێت و شیعرەکانی دەنوسێت. وەهەروەها بۆ ڕووناکبوونەوەی قەریحە و ئیلهامی شیعر گوێ بۆ بیستنەشادی هێنەر و لەزەت بەخشەکان ئامادەدەکات بۆ ئەوەی هەستەکان فەراهەم بێن و قەریحەو ئیلهام ڕاپەڕێت و بکەوێتە چالاکی.

سەرەڕای هەموو ئەمانە شاعیر دەبێت لەکاتی شیعر گوتندا لەوپەڕی چالاکی ئارامشی تەواوی خەیاڵدا بێت و لەکاتی ماندوو بوون و ناڕەحەتیدا شیعر نەگوترێت، چونکە لەکاتی ئارامش و هێمنیدا قەریحەی ئەو بۆگوتنی ئەو شیعرانەی کەموتابیقی مەحفوزاتگەلێکن کە لەبیرگە و حافیزەی ئەودا کۆبوونەتەوە گونجاوترن و ئەندێشەی ئەو بۆ ئەم مەبەستە ئامادەباشی زیاتری تێدا دەبێت. وەگوتوویانە باشترین کات بۆ شیعر گوتن بەیانیانە لەکاتی هەستانە لەخەودا و کاتی خاڵی بوونی گەدە چالاکی فیکر و لەهەوای حەمامدایە. وەهەرچەندە کەعەشق و سەرمەستیشیان لەئەنگیزەکانی شاعیر زانیوە ئەمەش قسەی ئیبن ڕەشیقە لەکتێبی (عمدە)دا کەلەهونەری شیعر و شاعیریدا بێهاوتایە، دانەری ئەو هەقی صەناعەتی شیعری بەباشیەوە ئەدا کردووە و هیچکام لەپێشینان یان ئەو ئەدیبانەی کە لەدوای ئەمەوە دەرکەوتوون کتێبێکی لەم شێوەیان نەنوسیوە. وەهەندێکیش گوتوویانە ئەگەر لەپاش هەلومەرجی باسکراو شیعر گوتن بۆ شاعیرێك دژوار بێت ئەوا دەبێت بۆکاتێکی دیکە دوای بخات و زۆر لەنەفس نەکات بۆ ئەوکارە. وەدەبێت لەسەرەتای قاڵبڕێژی و دانانی تەرکیباتە شیعریەکاندا لەسەر قافیە بنیاتی بنێت و، قسەکە تاوەکو کۆتایی لەسەر ئەو بەردەوام بکات، چونکە ئەگەر لەبنیاتنانی بەیتەشیعرێك لەقافیە بێئاگابێت ئەوا دانانی قافیە لەو شوێنەی کە دەبێت لەوێدا بێت بۆ ئەو زۆر دژوار دەبێت چونکە پەرێشان دەبێت و، هەرکاتێکیش لەتەبعی ئەودا بەیتێك گونجاو نەبێت لەگەڵ پێش و دوای خۆیدا، دەبێت وازی لێبهێنێت تاوەکو شوێنی شایستەتری بۆ بدۆزێتەوە، چونکە هەربەیتێك لەڕووی ماناوە بەتەواوەتی سەربەخۆیە. ئەوەشی کەدەمێنێتەوە ئەوەیە کە بەیتی قەصیدە یان غەزەلێك بەیەکەوە گونجاوبن و

شاعیر دەتوانێت بەیتەکان لەهەر شوێنێکی قەصیدەکەدا کەپێی گونجاوبێت دایانبنێت. لەدوای ئەوەی کەشاعیر شیعرەکەی تەواو دەکات، ئەوا دەبێت دووبارە بەتێڕوانینێکی ووردو ڕەخنەگرانەوە وردەکاری تێدا بکاتو نابێت لەخستنەلاوەی ناباشەکاندا بەخیل بێت، چونکە خەڵکی لەو ڕووەوەی کەشیعرەکەی ئەم زادەی داهێنانی زەین و قەریحەی ئەو دەزانن حەزیان لێی دەبێت.

وەئەو قسەیەی کەلەشیعردا بەکار دێت دەبێت لەفەصیحترینی تەرکیبەکان و خاڵص بێت و لەپێویستیەکانی زمان نەبێت و دەبێت شاعیر ئەوەی کەلەپێویستیەکانی زمانە بیخاتەلاوە، چونکە ئەم جۆرە ووشە و تەرکیبانە قسە لەچینی بەلاغەت دەهێننە خوارەوە. پێشەوایانی ئەدەب و قسە شاعیرانی مولدیان لەبەکارهێنانی زەرورەتە شیعریەکان ڕێگری کردووە. چونکە دەزانن قسە بۆ ئەوان هێندە فراوانە کەدەتوانرێت بەیارمەتی مەلەکەی خۆی لەبەکارهێنانیان خۆی لابدات و ڕووبکەنە ئەوتەریقەیەی کەزۆر لەحەق دەچێت وەهەروەها دەبێت شاعیر ئەوپەڕی هەوڵی خۆی بدات کەلەتەرکیبە ئاڵۆزەکان دوور بکەوێتەوە.

وەتەرکیبگەلێك بەکار بهێنێت کەماناکانی لەفەهمدا بکەوێتە پێش لەفزەکانیانەوە، وەهەروەها بەکارهێنانی مانای زۆر لەیەك بەیتدا شتێکی ڕەوا نیە چونکە بەجۆرێك لەئاڵۆزی دادەنرێت و بەئاسانی دەرك ناکرێت. بەڵکو شێوەی هەڵبژاردنەکەی ئەوەیە کە ئەلفازی یەك بەیت موتابیقی ماناکانی بێت یان باشتر و وافی ترین لەوان. چونکە ئەگەر ماناکان زۆربن ئەوا حشو[٣٤٨] دروست دەبێت، زەین سەرقاڵدەکات بەڕۆچوون تێیدا و زەوق لەگەشتن بەبەلاغەتی تەواو دەگێڕێتەوە. وەناتوانین شیعر بەئاسان بزانین مەگەر کاتێك ماناکانی لەزەیندا پێش لەفزەکانی بکەوێت. هەربۆیە گەورەکانمان هێندە گرنگیان بەئیبن خەفاجەی شاعیری ئەندەلوس دەداوە. چونکە لەهەریەکە لەبەیتەکانیدا ماناگەلێکی زۆر بوونیان هەیە و هەروەك ڕابورد لەشیعری متنبیو مەعەڕیش ڕەخنە

---

[٣٤٨] واتە ئەو زیادەیەی کە هیچ سوودێکی نیە (تعریفاتی جرجانی).

دەگرن و دەڵێن کەبەپێی شێوازەکانی عەرەبی نیە و، بەقسەی هۆنراوەی دەزانن کەلەتەبەقە و چینی شیعری عەرەب لەخوار ترە و قەزاوەتەکەی لەگەڵ زەوقدایە. وەهەروەها شاعیر دەبێت لەووشەی دەشتەکیەتی و بازاڕی لەشیعرەکانیدا دوور بکەوێتەوە و بەکاریان نەهێنێت، چونکە لەتەبەقەی شیعرەکەی دێتە خوارەوەو، هەوڵی ئەوەش بدات کەلەمانا پەستەکان دووربکەوێتەوە چونکە شیعری موبتەزیل و بێمانا هیچ سوودێکی نیە وەك ئەوەی کەبگوترێت: ئاگر گەرمەو، ئاسمان لەسەرمانەوەیە. بەئەندازەی بەکارهێنانی ئەم قسانە کەدەبنە هۆی دابەزاندنی بەهای قسەکان بەهەمان شێوەش دەبنە هۆی دابەزاندنی بەهای شیعر بەلاغەتەکەی ناهێڵن. چونکە هەردوو جۆری نابراو هەردوولای قسەی بەلیغ پێکدەهێنن، هەربۆیە ئەو شیعرانەی کەلەبابەتەکانی شیعری ڕەببانی و نەبەویدا دەگوترێن بەزۆری کەمتر لەڕیزی قسەی بەلیغ و باش دەژمێرن، لەم جۆرە بابەتانەدا بێجگە لەشاعیرانی گەورە کەس ناتوانێت شیعری باش و بەلیغ بچڕێت ئەوەش لەچەند شوێنێکی کەم و زۆر بەدژواریش دەتوانن ئەو کارە بکەن. چونکە ماناکانی ئەوان لەنێو عامەی خەڵکیدا باویان هەیە هەربۆیە لایەنی ناباشی و ئیبتیزال بەخۆیانەوە دەگرن.

وەهەرکات بەهەموو هەلومەرجە باسکراوەکانەوە شیعر گوتن بۆ شاعیر دژواربێت، ئەوا دەبێت تەمرین و ڕاهێنان بکاتو شیعرگەلێکی زۆر دووبارە بکاتەوە، چونکە قەریحەو ئیلهام وەك گوانی حەیوان وایە کەهەرچی زیاتر بیدۆشن شیرەکەی زیاتر دەبێت، وەئەگەر نەدۆشرێت ئەوا شیرەکەی ووشك دەبێت. وەصەناعەتی شیعر و چۆنیەتی فێربوونی بەشێوەیەکی کامڵ لەکتێبی عمدەی ئیبن ڕەشیقدا بەتەواوەتی باسکراوە ئێمەش بەپێی توانای خۆمان ئەوەکەلەوکتێبەدا لەبیرمان بوو لێرەدا نەقڵمانکردو هەرکەسێکیش بیەوێت بابەتگەلێکی کامڵتری لەو بارەیەوە دەستبکەوێت دەبێت کتێبی ناوبراو بخوێنێتەوە چونکە دەگاتە ئامانج و مەبەستی خۆی.

ئەم ئەندازەیەی کەئێمە باسمانکرد بەشێکی گرنگ بوو. خوداش یارمەتیدەرە. وەهەندێك لەشاعیران لەبارەی مەسەلە گەلێکەوە کەلە هونەری شیعردا زانینیان پێویستە شیعر گەلێکیان گوتووەو، باشترین قسەش لەم بابەتەدا ئەم شیعرەی خوارەوەیە و پێمان وایە کەبەرهەمی ئیبن ڕەشیق بێت: نەفرەتی خودا لەهونەری شیعر بێت کەنەزانەکان چەندە شتی جۆراو جۆری تێدا دەدۆزینەوە. ئەم نەزانانە قسەی دوور لەزەین و قورس لەگوفتارە ئاسانەکان کەبۆ بیسەران ئاشکرابێت بەباشتر دەزانن.

ئەوان مەحاڵ بەمان ڕاست دەزانن و قسەی بێ مانا بە شتێکی گرانبەها دەژمێرن.

لەشێوەی ڕاستی شیعر ئاگادار نین و لەنەزانیاندا پەی بەنەفامی خۆیان نابەن.

ئەوان لەلای غەیری ئێمەوە لۆمە دەکرێن، بەڵام لەلای ئێمە مەعزورو پۆزشدارن.

شیعر تەرکیبگەلێکە کەلەنێو ئەواندا لەڕووی نەزمەوە تەناسوب ڕەچاوبکرێت هەرچەندە لەڕووی سیفاتەوە جۆراوجۆریش بێت.

هەربۆیە دەبێت بەیتەکان لەیەك بچن و صەدرەکانیان[٣٤٩] مەتنی[٣٥٠] بەیتەکان ئاشکرا بکەن.

هەموو ماناو ناوەڕۆکی شیعرەکان دەبێت وەها ئاشکرابێت کەبیسەر بەو جۆرەی کەحەزدەکات بیدۆزێتەوە، ئیتر ئەو ئارەزووەهەبێت یان نا. وەلەئەنجامدا شاعیر دەبێت تەعبیر و بەیانی ماناکان بگەیەنێتە پلەیەك کەشیعرەکەی لەڕووی جوانیەوە بۆ بیسەرەکانی ئاشکرابێت.

بەوجۆرەی کەبڵێی ئەلفازی شیعرەکانی ئەو دەمووچاو گەلێکن و ماناکانیش چاوەکانیانن.

شیعری شاعیر لەڕووی ناوەڕۆکەوە دەبێت بەپێی ئارەزووەکان بێت و ئەوانەی کە دەیانچڕن بەجوانی ئەوان ڕازاوە بن. هەرکات ئازادەیەك مەدح دەکەیت دەبێت شێوەی

---

[٣٤٩] یەکەمین بەشی میصراعی یەکەمی بەیت.

[٣٥٠] مەتن لێرەدا لەبری عەجزو قافیەی بەیت بەکار هاتووە.

ئیتناب هەڵبژێری. لەهۆنینەوە و تەغەزولدا دەبێت شێوەی ئاسان بگریتە بەر. لەئەلفازی ناشیرین و ئازارگەێن بەگوێ دووربکەوە هەرچەندە وەزنیشیان هەبێت.

هەرکاتێك هەجووی خەڵکی بکەیت دەبێت شێوازی خراپگۆیان وازلێبهێنیت و ڕووی تێنەکەی. قسەی ڕاشکاو لەشیعردا وەك دەرمانەو تەعریز و کینایەش وەك دەردی شاراوەن.

وەهەرکات بتەوێت لەشیعردا لەڕۆژی فیراقی ئەو دۆست و یارانەی کەبەیانیان زوو سەفەر دەکەن شیعر بڵێیت، دەبێت بێ خەم و خەفەت بیت و دڵخۆشی یاران بدەیتەوە و نەهێڵیت کەفرمێسکەکان لەدیدەکان بێنە خوارەوە. وەئەگەر بتەوێت بەعەیب و لۆمە دەستپێبکەیت دەبێت وەعدە لەگەڵ وەعیدداو نەرمی لەگەڵ ڕەقیدا ئاوێتە بکەیت.

هەروەك چۆن لۆمەی کەسێك دەکەیت بەهەمان شێوەش دەبێت ئەو لەنێوان ترس و دڵنیایی و ڕێز و پەستیشدا بیهێڵیتەوە. ڕاسترین شیعر ئەوەیە کە بەیتەکانی لەڕووی نەزمەوە نزیك بن لەیەکەوە و ماناکەیان ئاشکرا و ڕوونبێت، بەجۆرێك هەرکاتێك بچڕدرێت هەموو خەڵکی تەماعی تێبکەن و هەرکات بیانەوێت وەك ئەوان بهێنن بەتواناکان عاجزبکات واتە سهل و ممتنع بێت. وەهەروەها لەم بارەیەوە شاعیرێك بەناوی (ناشی)[٣٥١] دەڵێت: شیعر شتێکە کە شاعیر لاریەکانی صەدرەکانی دەبێت چاك بکات.

وەبەتەمزیبی بنەڕەتی دەقەکانی بەهێز بکات بەشەجیاوازەکانی ببینێت، بەهۆی ئیتنابەوە فەراهەمی بکات بەیارمەتی بینەرانی بێنووری ئیجاز بەشە شاراوەکانی بکاتەوە.

وەمانا نزیکەکان بۆ تێگەشتن و دوور لەزەینی ئەو کۆبکاتەوە و نێوان بەشە ئاڵۆزو ئاسانەکانی پەیوەندی دروستبکات. وەهەرکات مەدحی بەخشندەیی و دروستکاری بکات

---

[٣٥١] ابوالعباس ناشی شاعیر لە سەرۆکەکانی موتەکەلیمینی زنادیقەیە (مانویە) بووە ئیسلامی خۆی ئاشکرا دەکرد و دیوانی شیعر و کتێبی فضیلة السودان علی البیضان ی هەیە (ابن الندیم). دسلانیش دەڵێت دووشاعیر نازناوەکانیان ناشی بووە، یەکێکیان عبداللە کەلەقاهیرەدا لەساڵی ٢٩٣ ك (٩٠٦ – ٩٠٥ ز) مردووە، ئەویتریشیان علی یە کەلەبەغدادا لەساڵی ٣٦٥ ك ٩٧٥ ز دا مردووە.

و بیەوێت ئەرکی سەرشانی بەسوپاسگوزاریەوە ئەدا بکات دەبێت بەقسەی جوان و گرانبەها وەسفی بکات. ئەوکات شیعرەکەی لەڕیزی بەشەکانی ئەو بەشە ڕەوانەدا و لەبەرامبەر شێوەی هونەرەکانەوە ئاسان دەبێت.

وەهەرکات شاعر بیەوێت بەسەر دیارو ئەهلەکەیدا بگری دەبێت بەجۆرێك خەمناکەکان بخاتە ژێرکاریگەریەوە و فرمێسکیان برێژێت. وەئەگەر بیەوێت لەشتێکی گوماناوی بەشێوەیەکی کینایە تەعبیر بکات دەبێت ئاشکراو نهێنی ئەو بەدی بهێنێت. بەجۆرێك کەبیسەر شکەکانی خۆی بەئیسبات و گومانەکانی خۆی بەدڵنیایی بگۆڕێت. وەهەرکات کەبیەوێت دۆستێکی کەهەڵەیەکی کردووە سەرزەنشت بکات دەبێت لەلۆمەکردنەکەیدا ڕەقیەکەی لەگەڵ نەرم ونیانیدا ئاوێتە بکات. بەجۆرێك ئەو کەسە بکاتە هاوەڵی نەرم و نیانیەکانی خۆی و لەو خەم و نارەحەتیانەی کەبەهۆی هەڵەکانەوە توشی مرۆڤ دەبێت ڕزگار بکات و دڵنیای بکاتەوە.

وەکاتێك کەشاعیر دۆستێکی خۆی لەدەستبدات هەروەك چۆن بەهۆی شیعری ئاژاوەئامێزەوە وازی لێبهێنێت، دەبێت بەقسەی نەرم و سۆزدار بیخاتە ژێر کۆتنرۆڵی خۆیەوە و بەڕەمزو نهێنیەکانی قسە بیکاتە عەودالّی خۆی.

وەهەرکات بەهۆی هەڵخلیسکانەوە داوای لێبوردن بکات و لەناو قسە ئاشکراو گوفتارە خەیاڵیەکاندا ڕەزامەندی مەدح کراو یان مەعشوق داوابکات، ئەوکات تاوانی ئەو لەلای ئەوکەسەی کەداوای لێبوردنی لێدەکات وەك سەرزەنشتێك وایە بۆ ئەو و لەهەمان کاتیشدا خەیر و چاکەی ئەو داوا دەکات.

# بەشی چل و هەشت

## لەبارەی ئەوەی کە صەناعەتی هۆنراوە و پەخشان لەئەلفازدایە نەوەك لەماناکاندا

دەبێت ئەوە بزانین کەصەناعەتی قسە ئیتر هۆنراوەبێت یان پەخشان تەنها بەهۆی ئەلفازەکانەوە ئەنجامدەدرێت نەك لەرێگەی ماناوە، بەڵکو مانا شوێنکەوتەی ئەلفازەو بنەرەتی ئەم صنعەتە تەنها ئەلفازە. کەواتە فێرکاری قسە کەهەوڵدەدات مەلەکەی قسە لەهۆنراوە و پەخشاندا بەدەست بهێنێت، بەتەواوەتیش خۆی ئاگاداری ئەلفاز دەکات و نمونەکانیان لەقسەکۆنەکانی عەرەب لەبەردەکات و زۆر بەکاریاندەهێنێت، تاوەکو مەلەکەی زمانی موزەری تێدا جێگیر ببێتو لەهجەی غەیرە عەرەبی فەصیح کەلەسەری پەروەردەکراوە تەرك بکاتو، وەها کەسێك خۆی وەك منداڵێکی ساوا کەلەنێو نەژادی عەرەبدا پەروەردەدەبێت حیسابدەکاتو، وەك منداڵێك زمانی ئەو نەتەوەیە فێر دەبێت و تاوەکو دەگاتە قۆناغێك هەروەك بڵێی لەرووی زمانەوە یەکێکەلە ئەندامانی ئەو نەتەوەیە ئەمەش بەو هۆیەوە کەئێمە لەبەشەکانی رابووردوودا باسمانکرد و گوتمان زمان مەلەکەیەکە کەلەقسەکردندا بەدی دێتو، هەوڵی دووبارە کردنەوەی بەسەر زاردا دەدەن تاوەکو سەرئەنجام بەدەستدێت و ئەوەی کەبەسەر زاردا دێت ئەلفازە نەك مانا، چونکە ماناکان لەزەمیرو ویژدانەکاندان سەرەرای ئەمەش ماناکان لەزەینی هەرکەسێکدا بوونیان هەیە ئەندێشەی هەرکەسێك توانای ئەوەی هەیە ئەوەی کەبیەوێت بەئاسانی لەماناکان تێبگات و، لەتەرکیب و تەئلیفیاندا پێویستی بەصەناعەتێك نیە هەروەك گوتیشمان

تەرکیبی قسە بۆ تەعبیر کردنە لەماناکان و پێویستی بەصەناعەتی فێربوون و مومارەسەت هەیە وەك قاڵبگەلێکن بۆ ماناکان، چونکە هەروەك چۆن دەفری تایبەتی ئاو جۆراو جۆرن، وەدەفرە زێڕو زیوو صەدەف و شوشە و سواڵەتەکان بەلآم ماماهیەت و چیەتی ئاو یەکێکەو باشی جوانی دەفرە پڕلەئاوەکان بەپێی جیاوازی جنسەکەیانە نەوەك بەپێی جیاوازی ئاوەکە، بەهەمان شێوەش باشی و جوانی زمان و بەکارهێنانی بەلاغەتیش تێیدا جیاوازە و، پەیوەستە بەشێوەی دانانیەوە کەچۆن بەسەر مەبەستەکاندا جێبەجێ بکرێت ئەمەلەکاتێکدا ماهیەتی ماناکان یەکێکە لەم ڕوەوە کەسێك کەشارەزای تەرکیبی قسەو پێویستیەکانی مەلەکەی زمان ئاگادار نەبێتو، بیەوێت تەعبیر لەمەبەستی خۆی بکات و ئەنجامی نەدات، وەهەروەها کەسێك کەئەیەوێت هەستێتەوە بەلآم لەبەر بێهێزی ناتوانێت بڕوات بەڕێوەو نەگاتە مەبەستی خۆی. خودا ئەوەی کەنەتاندەزانی فێری ئێوەی کرد[٣٥٢].

[٣٥٢] (فَاذكُرُوا اللهَ كَما علَّمَكُم مَالَم تَكونُوا تَعلمون) س بقرة ئا ٢٤٠.

# بەشی چل و نۆ

## لەبارەی ئەوەی کە مەلەکەی قسەزانی بەهۆی مەحفوزاتی زۆرەوە بەدی دێت و باشیش لەواندا بەهۆی مەحفوزاتی باش و مامۆستایانەوە بەدەستدێت

لەبەشەکانی پێشوودا باسی ئەوەمانکرد کەهەرکەسێك بیەوێت زمانی عەرەبی فێرببێت ئەوا دەبێت مەحفوزاتەکانی خۆی زۆربکات، بەهەرئەندازەیەك مەحفوزاتەکانی باشبن و لەچین و جۆری زۆرباش و بالآی قسە هەڵیانبژێرێت و ئەندازەیەکی زۆرتر لەبەر بکات، بەهەمان ئەندازەی کەمەلەکە بۆ لەبەرکەرەکە دروستدەبێت زۆر باشە. هەروەك چۆن ئەگەر مەحفوزاتی کەسێك لەشیعرە عەرەبی و ئیسلامیەکان حەبیب[353] یان عیتابی[354] یان ئیبن معتز، یان ئیبن هانی یان شریف یان پەیامەکانی ئیبن موقەفەع، یان سهلی کوڕی هارون یان ئیبن الزیات یان بدیع[355] یان صابی بێت، مەلەکەی ئەو بەنیسبەت کەسێکەوە کەلەبەرهەمی ئەم شاعیر و نوسەرانەی دوایی بریتیە لە: شیعری ئیبن سهیل یان ئیبن النبیه یان ترسلی بیسانی یان عیمادی ئەصفەهانی لەبەر بکات، بەچەندین پلە باشتر دەبێت و لەپلەیەکی بالآتری بەلاغەتدایە. چونکە دەستەی کۆتایی بەبەراورد بەگروپی یەکەم لەپلەیەکی خوارتردایە. ئەمەش بۆ کەسی ڕەخنەگر بەزەوق ئاشکرایە

---

[353] حبیب بن اوس ابوتمام.

[354] کەلسومی کوڕی عومەر نازناوەکە عباسە لەقنسرین لەدایکبووە و هاوچەرخی هارونە ڕەشید بووە و جێگەی گرنگی برەمکیەکان بووە و لەساڵی ۲۰۸ ك (۸۲٤– ۸۲۳ ز) مردووە.

[355] مەبەست بدیع الزمانی همدانیە.

بەئەندازەی باشی مەحفوزات یان بیستراوەکانی کەسێك دەتوانرێت بەشێوازێکی باش بەکار بهێنرێن دواتریش لەپاش لەبەرکردنی مەلەکەی باش و مامۆستایانە بەدەستدێت. هەربۆیە هەرچی مەحفوزات لەتەبەقەیەکی بەرزتردا بن بەهەمان رێژە ئەومەلەکەیەی کەلەوانەوە بەدی دێت گەشە دەکات، چونکە بەهەمان رێڕەوی ئەودا دەڕوات و هێزەکانی مەلەکە خۆراکیان لێوە وەردەگرێت گەشەدەکات و کامڵدەبێت. باسکردنی ئەم بابەتانەش بەو جۆرەیە کەنەفس هەرچەندە لەسروشتدا یەك جۆرە بەڵام مرۆڤ لەڕوانگەی هێزو لاوازیەوە خاوەنی ئیدراکگەلێکی جیاوازە، جیاوازیەکەشی بەهۆی ئیدراکات و مەلەکاتە جۆربەجۆرەکانەوەیە کەلەدەرەوە دێنە ناویەوە و چۆنیەتی تایبەتی پێدەبەخشێت. هەروەك چۆن لەدەئەنجامی ئەم واریداتانە تایبەتمەندیەکانی کامڵدەبێت شێوەی لەقۆناغی قوەوە دەچێتە قۆناغی کردار.

وەئەو مەلەکانەی کەبۆ نەفس حاصڵ دەبن کەم کەمە، هەروەك باسمانکرد. هەربۆیە مەلەکەی شاعیری بەهۆی لەبەرکردنی شیعرەکان و، مەلەکەی نوسەریەوە بەهۆی لەبەرکردنی نەسرە مەسجەعەکان و پەخشانی ئازاد بەدی دێت، وەمەلەکەی زانستی لەمومارەسەتدا لەزانست و تێگەشتن و تەحقیق و لێکۆڵینەوە لەمەسەلەو نەزەریاتەزانستیەکانەوە بەدەستدێت. وەمەلەکەی فیقهیش لەڕێگەی خوێندنەوە و مومارەسەی فیقهو تەنزیری مەسەلەکانەوە لەگەڵ یەکتریداو، دەرهێنانی فەرعەکانیان لەئوصوڵەکان و تەخریجی فەرعەکان لەسەرەئەصڵەکان دەتوانین بەدەست بهێنین.

مەلەکەی تەصەووفی ڕەببانی بەم شێوەیە دێتەدی کەسەرقاڵی عیبادەت و زیکرەکان بن و، حەواسە دیارەکان لەڕێگەی خەڵوەت و دووری لەخەڵکیەوە ئەوەی کەبگونجێت لەکار بخەن، تاوەکو مەلەکەی گەڕانەوە بۆ هەستی ناخ و جیهانی ڕۆح بێتەدی و گۆڕانی تێدا ڕوویداتو بگاتە مەقامی ڕەببانی. وەمەلەکەکانی تریش بەم شێوەیە دەتوانرێت بەدەست بهێنرێن. نەفسیش لەهەریەکە لەمەلەکە ناوەبراوەکاندا بەڕەنگێکی تایبەت

دەنوێنن و دەگونجێن لەگەڵیدا، هەرمەلەکەیەکیش لەنەفسدا بەپێی چۆنیەتی پەروەردەبوون و بەدیهاتنی ئیتر باش یان خراپ دێتەدی.

هەربۆیە مەلەکەی جۆری بەلاغەت کەلەجۆری تەبەقەی باڵابێت لەرێگەی لەبەرکردن و ئەو شوێنەوارانەی کەلەهەمان چیندا هەیە بەدەستدێن هەربۆیە هەموو فەقیهەکان و زاناکان لەبەلاغەتدا بێتوانان وەتەنها هۆکاری جۆرێکە لەمەحفوزات کەیەکەمجار لەزەینی ئەماندا جێگیر دەبێت حافیزەی خۆیان لەیاسازانستی و دەستەواژە و عیبارەتە فیقهیەکان کەلەدەرەوەی ئوسلوبی بەلاغەتە و لەچینی خوارەوەی قسەدایە کەڵەکەی دەکەن چونکە عیبارەتە پەیوەندیدارەکان بەیاساو زانستەکانەوە بەدیهێنەری بنەماکانی بەلاغەت نین هەربۆیە هەرکات ئەم جۆرە مەحفوزاتانە لەئەندێشەدا پێش بکەون و زۆربێن نەفس خوویان پێوەبگرێت و ببنە هاوئاهەنگ، ئەو مەلەکەیەی کەلەوانەوە بەدی دێت لەوپەڕی بێتواناییی و کەموکورتیدایە لەبەلاغەتدا. وەتەعبیرو ئوسلوبە فەصیحەکانی زمانی عەرەبی لادەدات.

وەهەروەها شیعری فەقیهو نەحوی و موتەکەلیمەکان و خاوەنانی نەزەریاتە زانستیەکانی حەکیمەکان و ئەو کەسانەی تریش کەکەمتر هەوڵی بەدەستهێنانی قسەی هەڵبژاردە دەدەن خاڵین لەبەلاغەت. هاورێی بەرێزمان ابوالقاسمی کوڕی ریزوان نوسەری عەلامەت (توغرانوسی دەربار) ی دەوڵەتی مەرینی بۆ منی باسکرد کە: رۆژێکیان لەگەڵ هاورێی خۆم ئەبوالعباس[٣٥٦] ئیبن شوعەیب نوسەری سوڵتان ئەبوالحسن قسەی دەکرد لەسەردەمی خۆیدا لەزمان و شیعری عەرەبیدا شارەزاییەکی باشی هەبوو سەمەشقی ئەدیبەکان بووە. وەئەم پێشەکیەی قەصیدەکەی ئیبن النحویم[٣٥٧] بۆ خوێندەوە و ناوی شاعیرەکە نەهێنا: کاتێك لەسەر وێرانیەکانی ماڵی یاردا وەستام نەمزانی لەنێوان نیشانە

---

[٣٥٦] ئەبوالعباس احمدی کوڕی شوعەیب لەئەدەبیات و زانستە ئەقلیەکان و زانستی پزیشکیدا ناوبانگێکی زۆری هەبووە لەدەزگای دەوڵەتی مەرینیداو، لەسەردەمی سوڵتان ئەبوسعید و سوڵتان ئەبوالعباسدا سەرۆکی دیوانی نامەکان بووە لەتونس و، لەساڵی ٧٤٩ ك (١٣٤٩ – ١٣٤٨ ز) بەهۆی نەخۆشی تاعوونەوە مرد.

[٣٥٧] ئەبوالفزڵی یوسف ناسراو بە ئیبن النحوی لەسەدەی پێنجەمی کۆچیدا ژیاوە و هاوچەرخی غەزالی بووە.

كۆن و تازەكانیدا چ جیاوازیەك هەیە ئەبوالعباسیش بەخێرایی گوتی: ئەم شیعرە هی فەقیهێكە، گوتم لەكوێوە دەزانی؟ گوتی: ئەم قسەیەی ئەو (ماالفرق) چ جیاوازیەكی هەیە؟ چونكە ئەم ڕستەیە لەدەستەواژەی فەقیهەكانە و لەئوسلوبەكانی زمانی عەرەبی ناژمێردرێت. منیش گوتم: ڕەحمەتی خودا لەباوكت، ئەم شیعرە هی ئیبن النحویە. بەلاّم نوسەر و شاعیرەكان بەم شێوەیە نین چونكە ئەوان بەرهەمە هەڵبژێردراوەكان لەبەر دەكەن و لەقسە عەرەبیە فەصیح و ئوسلوبەكانی ئامادەكردنیدا مومارەسە دەكەن‌و قسە باش و شیاوەكان هەڵدەبژێرن.

ڕۆژێكیان لەگەڵ هاوڕێی خۆم ئەبوعبداللەی كوڕی خەتیب وەزیری زنجیرەی بەنی ئەحمەر لەسوڵتانەكانی ئەندەلوس قسەم دەكردو، ئەو لەشیعر و نوسیندا سەرمەشق بوو. گوتم: هەركاتێك بمەوێت شیعر بڵێم بەدژواری دەزانم لەگەڵ ئەوەی كەلەشیعردا بیناییم هەیە و قسەی باش و هەڵبژاردە لەقورئان و حەدیس و هەندێك لەقسەكانی عەرەبی كۆنم لەبەركردووە هەرچەندە مەحفوزاتەكانم كەمن، بەلاّم من، خوداش داناترە، بەرلەوەی كەلەحافیزەمدا هەندێك لەشیعرە زانستی و یاساو ڕێسای كتێبەكانەوە جیگیر ببێت، (شیعرم گوتووە و دووقەصیدەی گەورە و بچوكی شاتیبیم[٣٥٨] لەزانستی قیرائەتدا لەبەركردووەو، دووكتێبی ئیبن حاجیبم لەفیقه و ئوصوڵ و مەنتیقدا و بەشێك لەكتێبەكەی سهیلەوە فێربووم، زۆرێك لەیاساكانی فێركردنم لەكۆڕەكانی دەرسدا فێری خەڵكم كردووە. لەحافیزەمدا ئەم جۆرە مەحفوزاتانە كەڵەكە بوون ڕووخساری ئەو مەلەكەیەی كەبەمەحفوزاتە باشەكانی وەك: قورئان و حەدیس و قسەی كۆنی عەرەب بەدەستم هێناوە بەهۆی مەحفوزاتە ناوبراوەكانەوە ڕووشێنراوە.. وەلەئەنجامدا قەریحە و ئیلهام نەگەشتووەتە قۆناغی كامڵبوون.

---

[٣٥٨] قاسم بن فیرە بن ئەبوالقاسم خلف بن احمد حافیز ئەبو رعینی ئەندەلوسی، ناسراو بەشاتیبی مالكی مقری نحوی، لەساڵی ٥٢٨ دا لەدایكبووە و لەساڵی ٥٩٠ لەمیسردا مردووە. خاوەنی كتێبەكانی تتمەالحرز من قرائە ائمەالكنز. حرز الامانی ووجە التهانی، و قەصیدەی بەناوبانگی شاتیبی لەقرائاتی عقیلە و....هتد.

ئیبن خەتیب بۆچرکەیەك بەسەرسوڕمان وباشەوە سەیری منی کرد و گوتی: خودا بتهێڵێت ئایا بێجگە لەتۆ کەسی تر هەیە کەبتوانێت بەم شێوەیە قسەبکات؟. ئەوەی کەلەم بەشەدا باسکرا ڕازێکی تریش ئاشکرا دەبێت ئەوەش بریتیە لەباسی هۆکاری ئەوەی کە بۆچی قسەی عەرەب لەسەردەمی ئیسلام و زەوقەکاندا (قسەزانانی ئەم سەردەمە) بەبەراوورد بەقسەکانی (هۆنراوە و پەخشان)ی سەردەمی جاهیلیەت لەچینێکی لەپێشتردایە، چونکە ئێمە دەبینین کەشیعری حەسانی کوڕی سابیت عومەری بن ابی ڕەبیعە و حتیئەو جریر و فرزدەق و نصیب و غیلانی زی الرمە احوص و بشار و، قسەی ئەو ڕابووردوانەی کەلەسەردەمی ئەمەوی و سەرەتای دەوڵەتی عەباسیەکاندا ژیاوە، ئیتر لەخوتبەکان یان لەئامادەکاری گفتووگۆکاندا لەگەڵ پاشاکاندا لەڕووی بەلاغەتەوە لەپلەیەکی باڵاتردایە بەبەراورد بەشیعری شاعیرانی جاهیلیەت باشترن لە شیعرەکانی نابیغە و عەنتەرە و، ئیبن کەلسووم و زوهەیر و عەلقەمەی کوڕی عبدە و تەرفەی کوڕی عبد و، وەقسەکانی سەردەمی جاهیلیەت ئیتر هۆنراوە بێت ئان پەخشان یان حیوارەکان لەپێشترن.

وەتەبعی سەلیم و زەوقی دروست بۆ ڕەخنەگری بەصیر لەبەلاغەتدا باشترین گەواهەو، هۆکارەکەشی ئەوەیە کە ئەوانەی کەلەسەردەمی ئیسلامدا بوون چینی باڵای قسەیان لەقورئان و حەدیسدا بیستووە، ئەو قسانەی کەمرۆڤ لەهێنانی هاوشێوەیان بێتوانایە.

لەبەرئەوەی کەئەم قسانە لەدڵی ئەواندا جێگیر بووە و نەفسەکانیان لەسەر ئوسلوبەکانی ئەوان پەروەردە بوون، تەبایعەکانیان بەرەو خۆڕاگری چوون و مەلەکەکانیان لەبەلاغەتدا لەپێشترە لەمەلەکەی ئەو ڕابووردوانەی کە لەسەردەمی جاهیلیەتدا ژیاون و، ئەم چینەی قسەیان بیستووە و لەسەری پەروەردە نەکراون. هەربۆیە قسەی ووتاربێژانی ئیسلام ئیتر هۆنراوەبێت یان پەخشان بەبەراوورد

بەبەرهەمەکانی سەردەمی جاهیلیەت لەڕووی دیباجەوە[٣٥٩] باشتر و لەڕووی ڕەونەقەوە صافترەو، بنەمای ئوسلوبەکەی ڕێکو پێکتر و لێهاتن و شارەزایی قسەزانانی سەردەمی ناوبراو سەلمێنراو ترە، چونکە ئەوان لەو بەرهەمانەی کەلەتەبەقەی بالآی قسەدان سوودیان وەرگرتووە ئەو خوێنەرەشی کەلەم باسەدا بیر بکاتەوە ئەگەر خاوەنی زەوق بێت لەبەلاغەتداو، بەصیروبینا بێت زەوقی ئەو لەم داوەریەدا باشترین گەواهیدەر دەبوو. لەمامۆستامانەوە ئەبوالقاسمی شەریف (سید) کەلەم سەردەمەدا قازی غەرناتەیە و مامۆستای ئەم صنعەتەیە (معانی، بیان، بلاغەت) دەژمێردرێت، زانیاریەکانی لەسیبتەدا لەگروپێك لەمامۆستایانەوە کەقوتابیانی شلوبین[٣٦٠] بوون فێربووەو، لەزانستەکانی زماندا زۆر شارەزا بووە و گەشتووەتە کۆتاییەکەی.

ڕۆژێکیان پرسیم بۆچی زمانی عەرەبی سەردەمی ئیسلام لەڕووی بەلاغەتەوە لەپلەیەکی بەرزتردایە لەزمانی عەرەبی، جاهیلیەت ئەو لەگەڵ ئەوەی کە بەداوەری زەوقی خۆی ئینکاری ئەم پرسیارەی نەکرد، ماوەیەکی درێژ بێدەنگبوو دواتر گوتی: بەخوا نازانم ؟. گوتم ئەو شتەی کەمن بۆم دەرکەوتووە بابۆتی باسبکەم، لەوانەیە هۆکارەکەی لەم خاڵەدابێت کەمن باسی دەکەم. دواتر بابەتگەلێکم لەمباریەوە نوسیبوو بۆم باسکرد و ئەویش زۆربەلایەوە باشبوو بێدەنگبوو، دواتر پێی گوتم: ئەی فەقیە شایانی ئەوەیە کەئەم قسەیە لەسەر ئاڵتوون بنوسنەوە. لەوەبەدواوە منی لەپلەیەکی

---

[٣٥٩] دیباجە لەعەرەبیدا بەمانای ئەصڵی فارسی ووشەی دیبا، یان ئاوریشم و حلە بەکار هێنراوە وەبەشێوەیەکی مەجازیش بۆشیعر بەکار هێنراوە، وەبەمانای ڕوخسارو دەمووچاوو نەخش و نیگار و سەرەتای کتێبیش بەکار هاتووە.

[٣٦٠] مەبەست ئەبوعلی عومەری کوڕی محمد شلوبین یان شلوبینیە و لەساڵی ٦٤٥ ك (١٢٤٧ – ١٢٤٨ ز) مردووە. لەزانایانی گەورەی نحو ئەدەب بووە دانراوگەلێکی زۆری هەبووە و شلوبین بەندەرێکە لە وویلایەتی غەرناتە. (حاشیەی دسلان ب ٣ لا ٣٩٢).

بالأتردا لەکۆڕی وانەکاندا دادەنا و گوێی بۆ قسەی من دەگرت و تێگەشتن و، زانیاری منی لەزانستەکاندا تەصدیق دەکرد. خوداش مرۆڤی دروستکرد و فێری بەیانی کرد[٣٦١].

[٣٦١] (خَلَقَ الإِنسانَ عَلَّمَهُ البَيان) س الرحمن ئا ٢، ٣.

# بەشێك

## لەبارەی ئەوەی کە بنەڕەت و پلەی قسەی (مطبوع) لەڕووی بەلاغەتەوە پایەدار ترو لە پێشترە لەقسەی (مصنوع)

دەبێت ئەوەبزانین کەڕازوحەقیقەتی ئەوەی کە بەجۆرێك لەقسە دەڵێن عیبارەت[٣٦٢] و، خیتاب ئەوەیە کەئیفادەی مانادەکات، واتە مانادەگەیەنێت، بەڵام ئەگەر قسەیەك بێماناو ئیهمالکراو بێت ئەوکات وەك مردوێکە کەهیچ تەعبیرێکی نیە. بەپێی ئەو پێناسەیەی کەزانایانی بەیان بۆ بەلاغەی دەکەن ئێمەش باسمانکرد، کەماڵی ئیفادە هەمان بەلاغەتە، چونکە زانایانی بەیان دەڵێن: بەلاغەت بریتیە لەگونجانی قسە لەگەڵ موقتەزای حاڵداو هونەری بەلاغەتیش ناسینی هەلومەرج و ئەحکامگەلێکەکە کەبەهۆیانەوە تەرکیبە لەفزیەکان دەگونجێن لەگەڵ موقتەزای حاڵدا، وەئەم هەلومەرج و ئەحکامانەی کەلەتەرکیبەکانی لەفزیدا موتابیقن لەزمانی عەرەبیدا بەشێوەیەکی پشکنین کۆکراوەتەوەو وەك یاسادادەنرێت. کەواتە تەرکیبە وەزعیەکان دەلالەت دەکەنە سەر ئیسنادی نێوان مسند و مسندالیە ئەم دەلالەت یان ئیفادەیە بەهۆی هەلومەرج و ئەحکامگەلێکەوەیە کەبەشی زۆری یاساکانی زمانی عەرەبی پێکدەهێنن. وەچۆنیەتی ئەم تەرکیبانە، وەك: پێشکەوتن و دواکەوتن و مەعریفە و نەکیرە بوون و ئیزمار و

---

[٣٦٢] بەو ئەلفازانە دەگووترێت کەدەلالەت دەکەنە سەرمانا و مەبەستەکانی دەروونی مرۆڤ و تەعبیریان لێدەکات.

ئیزهارو تقیید ئیتلاق و، نمونەی ئەمانە دەلالەت دەکەنە سەر ئەحکامگەلێك کەلەدەرەوەی نیسبەت یان اسناد و متکلم و مخاتەبیان لەحاڵی خیتابدا گرتووەتەوە، وەهەریەکەیان خاوەن هەلومەرج و ئەحکامگەلێکن کەکۆی هەموویان یاساکانی هونەری تایبەت نیشاندەدەن و ئەو هونەرەش بریتیەلە(علم المعانی). ئەم زانستە لەهونەرەکانی بەلاغەتە و هەربۆیە یاساکانی زمانی عەرەبی (صرف نحو) لەناو یاساو بنەماکانی علمی مەعانی دایە و، چونکە ئیفادەی یاساکانی صرف و نحو بەپێی اسنادی جوزئی ئیفادەکەی لەسەر ئەحوالگەلێکە کە دەوری ئیسنادیان داوە، وەئەوەی کەلەم تەرکیباتانەوە بەهۆی ئەو کەلێنەی کە لەناو یاساکانی اعراب یان یاساکانی مەعانی دا دروستدەبێت لەئیفادە بۆ موقتەزای حاڵ بێتوانابێت، ئەوکات لەموتابەقەت بەسەر موقتەزای حاڵیشدا بێتوانا دەبێت دەلکێت بەئەلفازە ئیهمالکراوەکانەوە کەلەڕیزی مرددوەکاندان.

سەرەڕای ئەمەش هونەریازی لەگواستەنەوەی زەین لەنێو ماناکاندا لەڕێگەی دەلالەتە جیاوازەکانیشەوە تەبەعیەت لەم ئیفادەی موقتەزای حاڵە دەکات، چونکە تەرکیب وەزعەن و بەو شێوەیەی کەدانراوە دەلالەت دەکاتە سەر مانایەکی تایبەت، بەلاّم دواتر زەین بەلازم یان مەلزوم یان هاوشێوەی دەگوازرێتەوە و دواتریش ئەم گواستنەوەی مانایە ئیتر بەشێوەی استعارە یان بەشێوەی کینایە بێت بەڕێگە پێدراو دادەنرێت. هەروەك چۆن لەشوێنی خۆیدا شەرح کراوە.

وەلەئەنجامی ئەم گواستنەوەیە هەروەك چۆن لەئیفادەی مانادا لەزەتێك بۆ ئەندێشە بەدی دێت. لێرەشدا لەزەتێك دەست دەدات کەدەتوانین بڵێین لەلەزەتی یەکەمین توندترە چونکە لەهەموو ئەم ئیفادە و دەلالەتانەدا لەڕێگەی دەلیل بەمەدلولەوە زەفەر دەبەین و، زەفەرەکەی خۆمان لەهۆکارەکانی لەزەتە هەروەك باسمانکرد. دواتر دەبێت ئەوە بزانین ئەم گواستنەوانەش خاوەن هەلومەرج و ئەحکامگەلێکن کەوەك یاساو ڕێسانو، وەك صنعەتێکیان لێکردووە بەهەموویان دەڵێن زانست وەئەم زانستەش

دەستەخوشکی عیلمی مەعانیە کەدەلالەت دەکاتە سەر موقتەزای حالّ، چونکە زانستی بیان لەبارەی مەعانی مەدلولاتەکانی تەرکیباتەوە گفتوگۆ دەکەن و یاساکانی زانستی مەعانی ئەحوالّی خۆی تەرکیباتگەلێك لەڕووی دەلالەتی ئەوانەوە دەخاتە بەرباس. وەهەروەك چۆن باسمانکرد لەفز و مانا لازم و مەلزومن و دەدرێنە پالّ یەکتری. هەربۆیە علمی مەعانی و علمی بیان بەدوو بەشی بەلاغە دادەنرێن‌و ئیفادەی تەواو موتابەقەتی موقتەزای حالّ بەهۆی ئەو دووزانستەوە دێتەدی. هەربۆیە هەرجۆرە تەرکیبێك کەلەموتابەقەت و کەمالّدا باش نەبێت بێگومان لەبەلاغەتیشدا باش نابێت و لەلای زانایانی زانستی بەلاغەت دەبێت، وەك ئاوازی گیانەوەرانی بێزمان حیسابی بۆبکەن. کەواتە واباش کەوەها تەرکیبێك بەعەرەبی نەزانین چونکە عەرەبی قسەیەکە کەموتابەقەتی موقتەزای حالّ بگەیەنێت، کەواتە بەلاغەت ئەصلّی زمانی عەرەبی و سروشت و ڕۆحی تەبیعەتی ئەوە.

کەواتەکاتێك دەلّێن قسەی تەبیعی(مطبوع) مەبەست ئەو قسەیەکەتەبیعەت و سروشتی ئەو لەڕووی ئیفادەی ئەو مانایەی کە ئاماژەی پێدەکرێت کاملّ بوبێت، چونکە وەها قسەیەك تەعبیر و خیتابێکە کە مەبەست لێی تەنها قسەکردن نیە، بەلّکو قسەکەر و متکلم ئەیەوێت ئەوەی لەدلّیدایە بەهۆی ئەوەوە ئیفادەیەکی تەواو بگەیەنێت بەبیسەر وەدەلالەتێکی بەهێز لەو مانایە بکرێت و، دواتریش لەدوای ئەم سروشتەی کەلەئەصلّی تەرکیبی قسەدا بوونی هەیە چەند جۆرێك جوانکاری و ڕازاندنەوەکان دێن و، ئەلّبەتە ئەم جوانکاریانە لەپاش کەمالّی ئیفادەی قسە دەبن هەروەك بلّێی ئارایشی قسەکان ڕەونەقی فەصاحەتی پێدەبەخشن. وەك: سەجع هێنان و موازەنەو هاوتەریبی نێوان بەشەکانی قسە. وەتەوریە بەلەفزی هابەش لەمانا نادیارەکانی. وەموتابەقەتی نێوان مانادژەکان بۆ دروستکردنی تەجانوس لەنێوان ئەلفازو مەعنادا. وەلەئەنجامی ئەم جوانکاریانەدا قسە ڕونەقێکی تایبەت پەیدا دەکات و لەزەت بەگوێکان دەگەیەنێت و دەبێتە مایەی شیرینی جوانی قسە. ئەم صنعەتەش لەچەندین شوێنی قسەی موعجیزی بەیاندا هاتووە

وەك:(بەشەو کەبەسەر خەڵکیدا دێت، وەبەڕۆژ کەڕۆشن بێت و دەرکەوێت، وەئەوەی کە دبەخشێت و لەخودا دەترسێت و چاکە بەڕاست دەزانێت....هتد تاوەکو کۆتایی سورەتەکە[٣٦٣] وەئەوەی کەسەرکەشی دەکات و ژیانی دونیا بەباشتر دەزانێت[٣٦٤]. وەئەوانەی کە وادەزانن چاکە دەکەن[٣٦٥] نمونەی ئەمانە زۆرە. وەئەمجوانکاریانە لەقورئاندا لەپاش کامڵبوونی ئیفادە لەئەصڵی تەرکیباتی ناوبراودایەو، بەرلەبەدیهاتنی ئەم هونەری بدیعە لەئایەتەکاندا بوونی هەبووەو، هەروەها جوانی قسە لەقسەی سەردەمی جاهیلیەتیشدا دەبینرێت، بەلاَم بەبێ ئەوەی کەشاعیر ئاگاداری لەبارەیەوە هەبێت و هەموو ئەم جوانیانە لەئیفادەی ئەو زیاد دەکەن.

---

[٣٦٣] (وَاللَّيلِ إذايَغشَى وَالنَّهارِ إذا تَجَلى) س الليل تاوەکو کۆتایی.

[٣٦٤] (فَأمَّا مَن طَغَى وَآثَرَ الحَيواةِ الدُّنيا) س النازعات ئا ٣٧ ٣٨.

[٣٦٥] (وَهُمْ يَحسَبُونَ أنَّهُم يُحسِنُونَ صُنعاً) س کهف ئا ١٠٤.

## بابەتە پاشکۆکانی نوسخەی دەستخەتی ینی جامیع

بێجگە لەمانەش کەتەصنیف کراون و هەژمار کراون و مەرج و ئەحکامیان بۆ داناوەو، ناویاننناوە هونەری بەدیع و پاشینان‌و پێشینانی زانایانی مەشریق و مەغریب لەژمارەی جۆرو بەشەکانیاندا جیاوازیان هەبووە، هەروەك چۆن مەشریقی و مەغریبیەکان جیاوازیان هەبووە. مەغریبیەکان لەهەژمارکردنیان لەناو زانستی بەلاغەدا و دەرچوونیان لەوزانستەدا دژایەتی دەکەن. وەمەشریقیەکان هەرچەندە جۆرە ناوبراوەکانیان لەهونەری بەلاغە هەژمارکردووە بەلآم وەك مەسەلەگەلێکی ئەصڵی لەقسەدا قبوڵیان نەکردوون، بەڵکو ناوونیشانی ناوبراو لەپاش ڕەچاوکردنی تەتبیقی قسە لەسەر موقتەزای حاڵ لەبەرچاو بگرن کەئارایش و جوانی‌و ڕەونەق ببەخشێتە قسە چونکە هەروەك باسمانکرد، قسەیەك کەخاوەنی ئەم موتابەقەتە نەبێت عەرەبی نیەو، ئەوکات جوانکاری و ئارایش لەوەها قسەیەکدا سوودی نابێت و ئەم جۆرە جوانکاریانەش لەهەمان کاتدا لەڕێگەی پشکنینەوە لەزمانی عەرەبیدا دەتوانرێت بەدەست بهێنرێت، هەروەك چۆن هەندێك لەبەشەکانی بیستراوە بینراویشن و هەندێکیان هەروەك چۆن لەکتێبی ئەماندا دیارە دەرهێنراون. هەربۆیە هەرکات بڵێن قسەی مصنوع، ئەوا مەبەستی ئەوان ئەم تەرکیباتانەیە کەتێیاندا هونەرەکانی بەدیع و ناوونیشانەکان و بەشەکانی بەکار هێنراوەو، هەروەها هەرکات بڵێن قسەی تەبیعی مەبەست لێی قسەیەکە کە کەماڵی ئیفادەی هەبێت. ئەم دووجۆرە قسەیە بەنیسبەتی یەکترەوە بەرابەرن و صەناعەتی بەدیع لەبەرامبەر بەلاغەتەوەیە و ئەدیبەکان لەسەردەمی ڕابووردوودا بەدیعیان لەڕیزی هونەرە ئەدەبیەکاندا هێناوە و لەم جۆرە کتێبانەدا نەقڵیانکردووە چونکە هونەری ناوبراو

خاوەنی بابەت نیە هەربۆیە ناتوانین بەزانستەکان هەژماری بکەین. وەئیبن ڕەشیق لەکتێبی عمدە دا کەبەشێوازێکی بێ وێنە باسی شیعر و چۆنیەتی کارکردەکەی قسەی کردووە هەر ئەم شێوازەی بەکار هێناوە (سەرەتا هونەری بەدیعی لەڕیزی هونەرە ئەدەبیەکاندا هێناوە)، بەدوای ئەویشدا لەبارەی ناوونیشانی ئەم هونەرەوە گفتوگۆی کردووە، ئەدیبەکانی تری ئەندەلوسیش ئەم شێوازەیان هەڵبژاردووە.

وەدەڵێن یەکەمین کەسێك کەئەم صنعەتەی بەکار هێناوە حبیبی کوڕی ئەوسی تائیە کەشیعرەکانی پڕن لەناوونیشانی ئەم هونەرە. دواتریش شاعیرانی تریش تەقلیدیان لەو کردووە ئەمەلەکاتێکدا شیعر تائەوکاتە خاڵی بووە لەهونەرەکانی بەدیع. وەشاعیرانی ڕابوودوو ئیتر ئەوانەی کەلەسەردەمی جاهیلیدا یان ئەوانەی کەلەسەردەمی ئیسلامدا بوون ئەم هونەرانەیان لەشیعردا بەکارنەهێناوە، یان تەنها کەمێکیان بەکارهێناوە وەئەگەر لەشیعرەکانیشیانداجوانکاریەك ڕوویدابێت بەدیهیەو لەپێش خۆیەوە بووە کەقەریحەکەیان بەوان دەبەخشی و، هەربۆیە بەچەشتنی خاوەنانی تەبعی سەلیم باش دەنوێنێت، بەڵکو ئەم جۆرە هونەرانە لەشیعری ئەماندا لەکەمالی موتابەقەت و ئەداکردنی حەقی بەلاغەت و دووری لەعەیبی تەکەللوف و زەحمەتی بەدەستهێنان و مومارەسەی ئەم ناوونیشانانەی باسکردووە. وەلەئەنجامدا جوانیەکان و موحەسیناتی فیترەت سەرەتا پەیوەست دەبوو بەوانەوە.

لەبارەی قسەی پەخشانیشەوە دەبێت بڵێین ئەم جۆرە قسەیە نوسەرانی سەردەمی جاهیلیەت و گەورەکانی سەردەمی ئیسلام، بەشێوەیەکی مرسل (ئازاد) بووە بەچەند بەشێکەوە دەهێنن بەبێ ئەوەی سەجع و وەزنیان هەبێت. ئەم شێوازە بەردەوام باوی هەبوو تائەو سەردەمەی ئیبراهیمی کوڕی هیلالی صابی نوسەری خاندانی بویە بەهەڵکەوتەییەکی تایبەتەوە لەم هونەرەدا بەدیهاتووە، سەجعیان لەقسەی پەخشاندا بەکارهێناو لەقسە سوڵتانیەکاندا (نامە دەوڵەتیەکان) ڕەچاوی دەکرد، بەهەمان ئەو ڕێژەیەی کەقافیە لەشیعردا بەپێویست دەزانن. ئەوەی کەهۆکاری هاندانی ئەمان بووە بۆ

ئەم کارە ئەوەیە کەمەلیکەکانی سەردەمی ئەو عەجەمی زمان بوون ئەو خۆی لەهەڵسووکەوتدا وەك خەڵکی بازاڕی بووە کەدوورن لەحەزوئارەزووە پاشاییەکانەوە. ئەو لەصولتی خەلافەت کەبەصولتی بەلاغەت کۆتایی دێت نزیکی نەبووە، هەربۆیە لەم ڕووەوە ئەویان لەقسەی پەستی ئاراستە و ڕازینراوە بەصەناعەتی بازاڕ (نوسینگەیەکی) تایبەت بووە. لەپاش ئەویش (صابی) ئەم صنعەتە لەقسەی پاشیناندا بوویە باو سەردەمی ئامادەکاری ئازاد و صولەتی بەلاغەتی قەسە لەبیرکرا و نوسراوە سوڵتانیەکان (فەرمی، دەوڵەتی) بەنامە دۆستانەکان و نوسراوە عەرەبیەفەصیحەکان یان عەرەبی بازاڕی پەست وەك یەکی لێهات و باش و خراپ تێکەڵی یەکتر بوو.

تەبعی قسەکەران لەبەکارهێنانی بەلاغەتی ئەصڵی لەقسەدا عاجز مایەوە، چونکە کەمتر لەمەدا مومارەسەیاندەکرد تەنهاشتێکیش کەمایەوە حەزکردن بوو لەهونەرەکانو جۆرەکانی ئەم صنعەتە لەهۆنراوە و پەخشاندا و بەکارهێنانیان لەهەمووجۆرەکانی قسەدا، وەمامۆستایانی بەلاغەت لەهەرسەردەمێکدا گاڵتەیان بەم جۆرە صەناعەتانە دەکرد و قوڵبوونەوە تێیاندا بەمایەپوچی دەزانی و، شێوازەکانی تری بەلاغەتیشیان ئینکاری دەکرد وەمامۆستایان و شێخەکانمان لەسەر ئەو قسەکەرانەی کەئەم صنعەتانەیان بەکار دەهێنا بەکەمیان دەزانی و لەپلەو پایەیان کەمدەکردەوە. لەشێخمانەوە مامۆستا ئەبوالبرکاتی بلفیقی کەلەزمانی عەرەبدا بینابووە لەزەوقی سەدا قەریحەیەکی باشی هەبووە، بیستم کەدەیگوت بەڕێزترین ئارەزووی من ئەوەیە کەڕۆژێك ببینم یەکێك لەوکەسانەی کە جۆرەکانی ئەم صەناعەتە لەهۆنراوە و پەخشانی خۆیاندا بەکار دەهێنن توندترین سزادراون و، خەڵکی بەهاوارکردن خراپەکانی ئەویان ئاشکرا کردووەو ڕێگری لە قوتابیانی خۆی دەکات لەفێربوونی ئەم صنعەتە، لەترسی ئەوەی کەبەرگی تازەی بەلاغەت کۆن ببێت و بێئاگابێت لەخودی بەلاغەت.

وەمامۆستای ئێمە ئەبوالقاسمی شریفی سبتی کەڕەواج پێدەری بازاڕی زمانی عەرەبیو هەڵگری ئالاکەی بوو دەیگوت: ئەم هونەرە بەدیعیانە هەرچەندە بێ مەبەست و

ویست بۆ شاعیر یان نوسەر ڕوویدات و هەندێکیان دووبارە بکاتەوە ئەوا ناشیرین دەبێت، چونکە هونەرە ناوبراوەکان لەجوانکاریەکانی قسە دەژمێردرێن و، وەك خاڵن بەدەموچاوەوە کەیەك تاوەکو دوانیان جوانن، بەڵام ئەگەر لەم ئاستە تێپەڕیکات ئەوا ناشیرین دەبێت. .

وەبەڕێزانی ناوبراو بەکارهێنانی هونەرە باسکراوەکان بەناشیرین دادەنێن هەروەك چۆن کەسێك ئەم صەناعەت و ناوونیشانە بەدیعیەکانی بەئەندازەیەك گرنگی پێبدات و قسە لەئاستی بەلاغەت بهێنێتە خوارەوە. ئەم قسانەی مامۆستایانی ئەدەب ئەوە نیشاندەدات کەقسەی مەصنوع و دروستکراو پلەیەك لەخوار قسەی تەبیعیەوەیە، هەروەك چۆن ڕازو حەقیقەتەکەیمان نیشان دا و داوەری ئەم کارەش زەوقە و پێشتریش باسمانکرد. وەخوداش داناترە و ئەوەی کەنەتاندەزانی فێری کردن. بەڵام لەقسەی شاعیرانی سەردەمی ئیسلامدا هەردوو جۆرەکە بوونیان هەیە واتە هەم بەبێ ئەوەی کە خۆیان مەبەستیان بێت، وەهەم لەڕووی مەبەست و ئیرادەوە قسەیان جوانکردووە و شتەسەرسوڕهێنەرەکانیان بەیادگار بەجێهێشتووە، وەیەکەمین کەسانێك کەشێوازیان لەم هونەرەدا پایەدارە بریتین لە: حبیب بن اوس، بحتری، مسلم بن ولید، کەزۆر حەزیان لەهونەر بووە و شتانێکی سەرسوڕهێنەریان پێشکەش کردووە.

وەهەندێکیش دەڵێن کەیەکەمین کەسانێك کەلەم شێوازەدا مومارەسەیانکردووە بەشاری بن بردواو ئیبن هەرمە بوون و، ئەم دووکەسە کۆتا کەسانێك بوون کەلەزمانی عەرەبیدا بەڵگە بەشیعرەکانیان هێنراوەتەوە، دواتریش کەلسومی کوڕی عومەر و عیتابیو مەنصور نومەیری و مسلمی کوڕی وەلید و ئەبو نەواس پەیڕەویان لەمانکردووە، دواتریش حبیب و بەحتەریش پەیڕەویان لەم گروپە کردووە. دواتریش ئیبن موعتەز دەرکەوت و زانستی بەدیع و هەموو ئەم صنعەتانەی گەیاندە کەماڵ. ئێستەش بۆ نمونە قسەی تەبیعی کەخاڵیە لە صنعەت نمونەیەك دەهێنینەوە کەوەك قسەکەی قیسی کوڕی

دورەیجە[٣٦٦] لەنێو ماڵەکاندا دەچمە دەرەوە بەڵکو لەشەودا لەگەڵ خۆمدا لەبارەی تۆوە قسە بکەم[٣٦٧]. وەقسەکەی کەسیر کەدەڵێت: لەپاش جیایم لەعیزە و دووری ئەو لەمن، عیشق و سەرگەردانیم بۆ گەیشتن بەو وەك کەسێکە کە هیوای بەسێبەری هەورێکە بۆ ئەوەی لەژێریدا قەیلولە بکات و کەمێك بخەوێت، بەڵام بەهەرئەندازەیەك کەهیوای پێ دەبەستێت هەورەکە تەنك دەبێت و بڵاودەبێتەوە.

ئێستەش لەبەهێزی دانان و شارەزایی و لێهاتنی تەرکیبی ئەم قسەتەبیعیەی کەصنعەتی تێدا نیە بیر بکەرەوە، ئەگەر لەپاش ئەم ئەصالەتە بەرەو صنعەتیش دەچوو ئەوا بەهەمان ئەندازەش جوانیەکەی زۆر دەبێت. بەڵام قسەی مەصنوع و دروستکراوو لەسەردەمی بەشار بەولاوە زۆرە و لەپاش ئەو حبیب و تەبەقەی ئەو گرنگیان بەو داوە، دواتریش ئیبن معتز کەبەخاتەم و کۆتایی ئەم هونەرمەندانە دەژمێردرێت و ئەوانەی کەلەدوای ئەوەوە دەرکەوتن لەم مەیدانەدا هەنگاویان هەڵێنا و پەیڕەویان لەمانکردووە. جۆرەکانی ئەم صنعەتە لەلای ئەهلی خۆی بێشومارە و زاراوەکانیان لەباب و بەشەکاندا جیاوازەو زۆرێکیان صنعەتی بەدیعیان لەژێر بابەکانی بەلاغەتدا جێدەکەنەوە. بەپێی ئەوەی کەدەڵێن ناچێتەناو بابەت و دەلالەت و ئیفادەکانی قسەوە، بەڵکو هونەری ناوبراو قسە ئارایش دەکات و ڕەونەقی پێدەدات، بەڵام پێشینەکانی هونەری بەدیع لەدەرەوەی بەلاغە هەژماریانکردووە. هەربۆیە ئەویان لەناو بەشێك لەهونەرەکانی ئەدەبیدا دەیهێنن کەبابەتی نیە ئەمەش عەقیدەی ئیبن ڕەشیقە کەلەکتێبی عمدەکەی خۆیدا باسی کردووە ئەدیبەکانی ئەندەلوسیش هاوڕان لەگەڵیدا. لەبارەی بەکارهێنانی ئەم هونەرەوە مەرجگەلێکیان باسکردووە لەوانەش دەبێت بەبێ تەکەللوف بێت و، ئەوەی کەبەمەبەست دروستکرابێت هێندە گرنگ نیە. بەڵام ئەو صنعەتانەی کەبەشێوەیەکی تەبیعی بەبێ مەبەست دێنەدی بەم شێوەیە نیە وجێگەی گفتوگۆنیە، چونکە ئەگەر هونەر

---

[٣٦٦] ئەبو زەید قەیسی کوڕی دورەیجی لینی کەلەساڵی ٦٥ ك (٦٨٥ – ٦٨٦ ز) مردووە.

[٣٦٧] واخرج من بين البيوت لعلني – احدث عنك النفس بالليل خاليا.

لەتەکەللوفەوە دووربێت ئەوا لەعەیبێکی ناشیرین پارێزراو دەبێت، چونکە مومارەسە لەتەکەللوفدا دەبێتەهۆی بێئاگایی لەتەرکیباتی بنەڕەتی قسە و کەلێن لەبنەڕەتی قسەدا دروستدەکات بەتایبەت بەلاغەت لەناودەبات، ئەوکات لەنێو قسەدا بێجگە ئەم جوانکاریانە شتێکی تر نامێنێتەوە.

وەئەم شێوەیەش ئێستاکە زیاتر لەنێو خەڵکی ئەم سەردەمەدا باوی هەیە و ئەوانەشی کەلەبەلاغەدا زەوقیان هەیە ئەوخەڵکانەی کەعەودالّی ئەم هونەرانەن گاڵتەیان پێدەکەنو، ئەم شێوازەش بەبێتوانایی لەبنەماکانی تری قسەو بەلاغەتدا هەژمار دەکەن. وەهەروەها بیستوومە کەشێخی ئێمە ئەبوالبرکاتی بلفیقی کەلەزمانی عەرەبیدا بەصیرو بینا بووە و لەزەوقی قسەدا قەریحە و ئیلهامێکی باشی هەبوو، دەیگوت: (خۆشترین ئەو ئەندێشانەی کەلەگەڵ خۆمدا بیری لێدەکەمەوە ئەوەیە کەڕۆژێك ببینم ئەوەی کەلەهونەرەکانی بەدیعدا مومارەسە دەکات جوانیەکانی لەهونراوەو پەخشانی خۆیدا بەکاردەهێنا، توندترین سزا بدرێت و خەڵکی بەهاوار کردنەوە ناشیرینیەکانی ئاشکرابکەن، وەئەم شتە وەك ئاگادار کردنەوەیەك بێت کەقوتابیەکانی لەم صنعەتە بگێڕێتەوە تاوەکو بەزۆرلەخۆکردن و تەکەللوف ڕووی تێنەکەن بەلاغەیان لەبیر نەچێتەوە).

یەکێکی تر لەهەلومەرجەکانی بەکارهێنانی جوانکاریەکانی بەدیع کەمکردنەوەیانە بەو جۆرەی کە لەدوویان سێ شیعردا لەو قەصیدەیەی کەئەم صەنایعانە بەکاربهێنن بۆ ڕازاندنەوەی هەرقەصیدەیەك ئەم ئەندازەیە بەبەس بزانن. وەئیبن ڕەشیق و ئەوانی تریش گوتوویانە: هێنانی صەنایعی زۆر، بەعەیبی قسە دادەنرێت. وەشێخ ئەبوالقاسمی شریفی سبتی کەلەسەردەمی ژیانی خۆیدا ڕەواج پێدەری زمانی عەرەبی بووە لەئەندەلوسدا، دەیگوت: هەرکات شاعیر یان نوسەر هونەرەکانی بەدیع بەکار دەهێنێت زۆر ناشیرینە کەهەوڵی زۆرکردنیان بدات، چونکە ئەم صنعەتە وەك خاڵێك وایە بەنێوچاوانی دەموچاو جوانەکانەوەیە، کەخاڵێك یان دووان دەبنە هۆی جوانیان و لەوە

زیاتر ناشیرینیان دەکات. بەنیسبەت قسەی هۆنراوە و قسەی پەخشانەوە لەسەردەمی جاهیلیەت و ئیسلامدا سەرەتا سادەبووە و لەنێوان جوملەکانیدا جۆرێك لەموازەنە بەئیعتیبار دەژمێرن، ئەو نێوانانەش کەلەنێو تەرکیبەکانیاندا هەیە بەبێ تەکەللوف و سەجع و گوێنەدان بەهیچ صنعەتێك جوملە و ڕستەکانیان هێناوە، ئەمەخۆی گەواهیدەری ئەم جۆرە موازەنەیە لەنێو ڕستەکاندا. تائەوکاتەی ئیبراهیمی کوڕی هیلالی صابی نوسەری خاندانی بویە بەشارەزایی و هەڵکەوتوویەکی تایبەتەوە لەهونەری شیعردا دەرکەوت و، دواتریش لەپەخشانی صنعەت و قافیەدا سەجعی بەکار هێنا و، لەمبارەیەوە شتانێکی سەرسوڕهێنەری لەخۆی نیشاندا و خەڵکیش حەزی ئەویان بۆ ئەم هونەرانە کەلەنامە دیوانیە دەوڵەتیەکاندا بەکاری دەهێنا ڕەخنەیان لێدەگرت. ئەوەشی کەصابی والێکرد ئەم شێوازە بگرێتەبەر ئەوەبوو کەئەو لەدەرباری پاشاغەیرە عەرەبەکاندا ژیاوەو لەصولەتی دەزگای خەلافەتدا کەبازاڕی بەلاغەت لەبارەگای ئەواندا ڕەواجی هەبوو دوور بوو.

دواتر بەکارهێنانی صنعەت لەقسە پەخشانە کانی دوایینانی دوای ئەودا بڵاوبوویەوە ڕۆژگاری سادەنوسی لەبیرچوویەوە، نامە دیوانی و دۆستانەکان و هەم نوسینەکانی عەرەبی فەصیح لەگەڵ عەرەبی بازاڕیدا و پەتیدا وەك یەکیان لێهات و باش و خراپ تێکەڵبوو. وەهەموو ئەمانە ئەوە نیشاندەدات کەقسەی مەصنوع کاتێك بەمومارەسە و تەکەللوف و زۆر لەخۆکردن دروستبکرێت لەبەرامبەر قسەی تەبیعیەوە کەم بەهایە. چونکە لەم جۆرە قسەیەدا گرنگی بەئەصڵی بەلاغەت نادرێت و زەوق باشترین داوەرە لەم بابەتەدا. خوداش ئێوەی دروستکرد و ئەوەی کەنەتاندەزانی فێری کردن.

# بەشی پەنجا

## لەبارەی ئەوەی کە خاوەنی پلەبالاکان خۆیان لە پیشەی شاعیری دوور دەخەنەوە

دەبێت ئەوەبزانین کەشیعری دیوانی[٣٦٨] عەرەب بووە کەهەموو زانست و مێژووەکان و حیکمەتەکانیانی تێدا ڕەنگی دەدایەوەو گەورەکان و سەرۆك هۆزەکان حەزیان لێدەکرد، بەجۆرێك کەلەبازاڕی عوکازدا[٣٦٩] بۆ چڕینی انشاد[٣٧٠] و شیعر ئامادە دەبوون و، هەریەکەیان شیعرەکەی خۆی بۆ گەورەو فحولەکان باسدەکرد بۆ خاوەنانی بەصیرە و بینایی لەو بوارەدا و، تاوەکو شێوازی شیعرەکەیان بناسرێتەوە و سەرئەنجام کارەکەیان بەچاولێکەری کردن و شانازیکردن بەسەر یەکتریدا کۆتایی دەهات و، باشترین شیعرەکانیان بەپایەکانی کەعبەدا هەڵدەواسران و، کەشوێنی حەج وماڵی ئیبراهیمی (ع)

---

[٣٦٨] مەبەست نوسینگەی گشتی بەڵێندەرایەتی و موعامەلات بووە، یان بەدەستەواژەی ئەمڕۆکە دائیرە المعارفە. یان بەقسەی نفایس الفنون: زانستی دیوانەکان بریتیە لە ناسینی شیعرە تەدوین کراوەکان و تەرکیبی مەصنوع بەعیبارەتی تەرکیب و ماناو ئیعراب و بینا، لەگەڵ باقی ڕەمزو ئیشارەت و نوکتە بۆنە و موناسەباتەکان. (نفایس الفنون لا ٦٨).

[٣٦٩] بازاڕی عوکاز لەسەردەمی جاهیلیەتدا هەمووساڵێك لەنێوان نخلە و تایف دا لەسەرەتای زی القعیدەوە تاوەکو بیست ڕۆژ یان مانگێك پێکدەهێنرا، کەتێیدا هەموو هۆزە عەرەبەکان کۆدەبوونەوە بەنەشید و شیعر و موفاخەرە بەسەریەکتریدا و کڕین و فرۆشتنیان دەکرد.

[٣٧٠] مەبەست لەانشاد یان چڕینی شیعرە بەدەنگی بەرز کەلەزۆربەی کاتەکاندا مۆسیقاشی لەگەڵدا بووە. (٤) مەبەست کەعبی کوڕی زوهەیرە خاوەنی قەصیدەی بەناوبانگی بانت سعاد فقلبی الیوم متبول، کەلەبارەی عوزرخواهی مەدحی پێغەمبەرەوە نوسیبووی (اعلام المنجد).

باوەگەورەیان بوو بەجۆرێك ئەم شاعیرانە ئەم شتەیان بەدەستدەهێنا وەك: ئیمرەئولقەیس بن حجر، نابیغەی زەبیانی، زوهەیربن ابی سلمی، عنترە بن شداد، تەرفە بن عبد، علقەمە بن عبدە و اعشی و.. کەسانێکی تریش کەلەهاوەڵانی نۆ هەڵواسراوەکە بوون. بەپێی ئەوەی کەلەبارەی ناونانی موعەلەقات یان هەڵواسراوەکانەوە گوتراوە ئەڵبەت کەسانێك دەیانتوانی شیعرەکانیان بەکەعبەدا هەڵدەواسی کەهێزی خزمایەتی و عەصەبیەت و مەکانەتیان لەنێو هۆزی موزەڕدا هەبوو، دەیانتوانی ئەم کارەبکەن.

دواتر و لەسەرەتای هاتنی ئیسلامەوە نەتەوەی عەرەب وازیان لەم کارە هێنا، چونکە زۆربەی خەڵك سەرقاڵی مەسەلەی دین و پێغەمبەرایەتی و وەحی بوون، بەتایبەت لەشێوەی نەزم و خوێندنەوەی قورئان بەشێوەی قەواعیدی عەرەبی زۆر سەرسام بوون، هەربۆیە لەگوتنی شیعر زمانیان بەسراو بۆ ماوەیەك لەقوڵبوونەوە لەهۆنراوە و پەخشاندا دوور کەوتنەوە و بێدەنگیان هەڵبژارد. تاوەکو دین جێگیر بوو گەل و نەتەوە خوویانگرت بەرێگەی ڕاستەوە و هیچ ئایەتێك بۆ حەرامکردنی شیعر نەهاتە خوارەوە و پێغەمبەر گوێی لەشیعری شاعیرێك[٣٧١] دەگرت و پاداشتی دەکرد.

لەم کاتەدا عەرەب گەڕانەوە سەر خووە کۆنەکەیان (واتە شیعر گوتن)، وەعومەری کوڕی ئەبی ڕەبیعە یەکێکە لەشاعیرە گەورەکانی قورەیش لەم سەردەمەدا لەشیعردا پلەو مەقامێکی باڵای هەبووە، بەزۆری شیعرەکانی بۆ ئیبن عباس دەخوێندەوە و گوێی بۆدەگرتن و ئافەرینی دەکرد. پاش ماوەیەك سەردەمی سەڵتەنەت و گەورەیی هاتە پێشەوە و عەرەب لەڕێگەی شیعرەوە لەدەزگاکانی دەوڵەت خۆیان نزیك دەکردەوە و مەدحی خەلیفە و پیاوەگەورەکانی دەوڵەتیان دەکرد و، بەپێی ئاستی جوانی و بەهێزی شیعرەکانیان خەڵات دەکران و زۆر حەزیاندەکرد کەشاعیرەکان شیعرەکانیان بەدیاری بۆ بهێنن، بۆئەوەی لەم ڕێگەیەوە ئاگاداری جوانی و سەربەرزی و گەورەییەکان ببنەوە،

---

[٣٧١] ابوتمام حبیب بن اوس بن حارس ئامدی لەناسراوترین قسەکەران دەژمێردرێن کتێبی بەناوبانگی (حماسە) بەڵگەی باشی هەڵبژاردن و ووردی و گەورەیی و بێهاوتایی شێوازەکەیەتی.

نەتەوەی عەرەب هانی منداڵەکانیان دەدا کەشیعر لەبەر بکەن. ئەم بارودۆخەش لەرۆژگاری دەوڵەتی ئەمەویان و سەرەتای دەوڵەتی عباسیەکاندا بەردەوام بوو، بەجۆرێك کە خاوەنی عقد الفريد لەبارەی شەو نشینی ئەفسانەگۆیی ڕەشید لەگەڵ ئەصمعی دا لەبابی شیعر و شعردا هێناویەتی وورد ببینەوە، دەبینین کەڕەشید تاوەکو چ ئەندازەیەك ئاگاداری شاعیر بووە و مومارەسەی زۆری لەم بوارەدا هەبووە و، بەشێوەیەکی سەیرو بێ ئەندازە جوانیەکانی ناسیوە و مەحفوزاتێکی زۆری هەبووە. دواتریش لەدوای ئەمانەوە خەڵکانێکی تر دەرکەوتن کەزمانی دایکیان عەرەبی نەبوو چونکە عەجەمە غەیرەعەرەب بوون و لەسەرەتاوە ئاشناییان لەگەڵیدا نەبووە، بەڵکو ئەم زمانەیان لەرێگەی فێربوونەوە وەرگرتبوو دواتریش شیعر گەلێکیان لەمەدحی ئەمیرەکانی عەجەمدا کەزمانی عەرەبی زمانی میللی ئەوان نەبوو چڕی و، تەنها خوازیاری چاکە و پەیوەندی بوون هیچ ئامانجێکیان بێجگە لەمە نەبوو وەك: حبيب ابوتمام[٢٧٢] و بحتری و متنبی و ابن هانی و شاعیرانی دوای ئەمان تاوەکو ئەمڕۆ...لەوەبەدواوە ئامانجی شیعر تەنها درۆو بەرژەوەند خوازی بوو، چونکە هەروەك لەم بەشەدا باسمانکرد ئەو بەرژەوەندیانەی کەگروپی یەکەمین لەشیعردا وەریاندەگرت لەناوچووبوو، هەربۆیە گەورەکان و پلەباڵاکان لەشیعر دوور دەکەوتنەوە بارودۆخ گۆڕاو کارگەیشتە جێگەیەك کەشاعیرێکیان بۆ سەرۆکایەتی خاوەن پلە باڵاکانیان بەناشیرین دایە قەڵەم. وەخودا سوڕێنەری شەو ڕۆژە.

---

[٢٧٢] بەپێی جیاوازی بۆچونەکان لەساڵی ١٩٠ یان ١٨٨ یان ١٨٢ یان ١٩٢ لەگوندی جاسم لەاعمالی دیمەشق لەدایك بووە لەساڵی ٢٣١ یان ٢٢٨ یان ٢٣٢ دا مردووە.(لغتنامە دهخدا).

# بەشی پەنجاویەك

## لەبارەی شیعرەعەرەبیە( دەشتەكیەكان ) و ( شارنشینان ) لەم سەردەمەدا

دەبێت ئەوەبزانین كەشیعر تەنها تایبەت نیە بەزمانی عەرەبیەوە، بەڵكو ئەم هونەرە لەهەمووزمانەكاندا عەرەبی یان عەجەمیدا هەبووە هەروەك چۆن لەئێرانی بەرلەهاتنی ئیسلامدا و، هەروەها لەیۆنانیشدا شاعیر گەلێك هەبوون ئەرستۆ لەكتێبی مەنتیقدا لەشاعیرە یۆنانی همر (امیروس) ناودەهێنێت درودی بۆ دەنێرێت. وەلەنێوان حەمیریشدا بەرلەهاتنی ئیسلام شاعیرگەلێك بوون و لەبەر ئەوەی كەزمانی موزەڕ كەقەواعیدو، ئوصوڵەكانی اعرابی تەدوینكرابوو خراپ بوو لەوەبەدواش لوغەتی ئەو قەومە بەهۆی تێكەڵی و ئاوێتەبوون لەگەڵ زمانەكانی تردا جیاوازی تێكەوت، نەژادی عەرەبی دەشتەكی بەشێوەیەكی سەربەخۆ بوونە خاوەنی زمانێك كەبەشێوەیەكی گشتی لەزۆرێك لەبابەتەكانی اعراب دا لەزمانی موزەڕ جیاواز بوو. وەهەروەها لەنێو شارنشینانیشدا زمانێكی تر هاتە ئاراوە كەلەگەڵ زمانی موزەڕدا لەاعراب زۆربەی زمانەوانیەكان و صرف‌و ووشەكاندا جیاوازبوو، سەرەڕای ئەمەش جیاوازبوو لەلوغەتی نەژادی عەرەبی ئەم سەردەمەشدا. وەدیسانەوە ئەم زمانە شاریەش بەپێی زمانەوانیەكانی خەڵكی سەرزەمینە جۆراو جۆرەكان گۆڕدراو خەڵكی شارەكانی مەشریق زمانێكیان غەیری زمانی ئەهلی مەغریب هەبوو، وەدیسانەوە زمانی خەڵكی شارە جۆراو جۆرەكانی ئەندەلوس جیاوازە لەگەڵ زمانەكانی شەرق و غەربدا. سەرەڕای ئەمەش بەهۆی ئەوەی كەشیعر بەتەبیعەت لەنێو ئەهلی هەرزمانێكدا بوونی هەیە، چونكە مەوازینی شیعری لەڕووی

ژمارەی پیتە متحرك و ساكنەكانەوە لەهەموو زمانەكاندا بەپێی نیسبەتی یەكسانە. وەقبوڵكردنیان لەتەبایعی مرۆڤدا بوونی هەیە هەربۆیە بەهۆی نمانی یەك زمانەوە كەلوغەتی موزەڕە و بەپێی ئەو ناوبانگەی كەلەنێو خەڵكیدا هەیەو دەڵێن گەورەكان و سەرمەشقانی شیعر لەئەهلی ئەو زمانە ڕاپەڕیون ناكرێت شیعر وازی لێبهێنرێت، بەڵكو هەرنەژاد و موتەكەلیمەكان بەهەریەكە لەجۆرەكانی زمان عەرەبی غەیرە فەصیح و خەڵكی شارنشین لەشیعر ئەوەی كەنیسبەت و بنیاتنانی لەگەڵ تەریقەیەكی فراوانی زمانی خۆیاندا گونجاو بێت دەیگرنە بەر.

بەلاَم تازیەكانی ئەم نەوەیە كەبەنیسبەت ئەسلافی خۆیانەوە (هۆزی موزەڕ) غەیرە فەصیحن. لەم سەردەمەدا لەهەموو بحور و وەزنەكاندا لەسەر هەمان شێوەی ڕابوردوانی بەعەرەب كراویان شیعر دەچڕن شیعرگەلێكی زۆر دوور و درێژ دەڵێن كەشێوازو مەبەستەكانی شیعر دەگرێتەوە وەك نسیب (غزل) و مەدح و هەجاو، لەدەرچوون لەهونەرێكەوە بۆ هونەرێكی تر قسە دەهێنن، هەرچەندە لەیەكەمین بەیتەوە دەچنە ناومەبەستەكەوە. بەزۆری قەصیدەكانیان لەبەیتی یەكەمدا بەناوی خودی شاعیرەكەوە دەستپێدەكات و دواتر دەستدەكەن بەغەزەل. وەتازی و غەزاكەرانی سەرزەوی مەغریب بەم جۆرە قەصیدانەیان گوتووە (اصمعیات) كەوەك دانەپاڵێكە بۆ اصمعی گێڕەرە وەی شیعری عەرەبی. وەتازیەكانی مەشریق زەمین ئەم جۆرە شیعرانەیان ناوناوە بەدەوی و حورانی قەیسی. وەهەرچەندە كەلەم شیعرانەدا ئاوازگەلێكی سادەش لەبەرچاو دەگرن، بەلاَم نەك بەشێوازی صنعەتی موسیقاو دواتریش بەم شیعرانە گورانی دەڵێن و بەم جۆرە شیعرانەش كەدەكرێنە گۆرانی دەڵێن (حورانی)، كەوەك نیسبەتدانێكە بۆ حوران كەیەكێكە لەناوچەكانی عێراق و شامە.

وەناوچەی ناوبراو لەم سەردەمەدا جێگەی تازیەدەشتەكیەكانە. وەئەمان هونەرێكی تریان هەیە كەلەهۆنراوەدا زۆر بەكار دێت بەم جۆرە كەشیعری لق لق دەڵێن كەخاوەنی چوار بەشی میصراعە، بەلاَم لەسەر پیتی كۆتایی قافیە میصراعی كۆتایی پێچەوانەی

هەرسێ میصراعەکەی ترە وەئەم قافیەی میصراعی میصراعی چوارەم لەهەموو میصراعەکانی چوارەمی بەیتەکان تاکۆتایی قەصیدەی شیعرەکە ڕەچاوی دەکەن، وەك مربع و مخمس و کەلەم دواییانەدا شاعیرانی مولد دایانهێناون. ئەم تازیانە لەم جۆرە شیعرانەدا بەلاغەتی تەواویان هەیە و هەڵکەوتووگەلێك لەنێویا ندا دەرکەوتوون و پاشینانێکی زۆر لەمونتەسیبی زانستەکان لەم سەردەمەدا بەتایبەت زاناکانی زانستی زمان کەئەم جۆرە شیعرانە دەبیستن بەناشیرینیان دەزانن و، ئەگەر نەزمیان بخوێننەوە نەفرەت دەکەن و پێیان وایە کەزەوقی ئەمان بەهۆی ناشیرینی ئەلفازەکان و نەمانی اعرابی حرکات پەسەندیان ناکەن. بەلاّم ئەم دەربڕینی بەناشیرین زانینە بەو هۆیەوەیە کەمەلەکەی زمانی ئەو گروپەیان نیە وەئەگەر یەکێك لەمەلەکەکانی زمانی ئەو گەلە بۆ زانا ناوبراوەکان بێتەدی، ئەوکات زەوق و تەبع گەواهیدەری بەلاغەتی ئەوان دەبێت. بەو مەرجەی فیترەت و بۆچوونیان لەئافەتەکان پارێزراوبێت.

وەگەرنا اعراب دەستێوەردانی لەبەلاغەتدا نیە، بەڵکو بەلاغەت بریتیە لە موتابەقەتی کەلام لەگەڵ مەبەست و موقتەزای حاڵدا کەتێیدا هەیە، ئیتر ڕەفع دەلالەت بکاتە سەرفاعیل و نصبیش لەسەر مفعول یان بەپێچەوانەوە. بەڵکو قەرینەکانی کەلام اعرابی کۆتایی ووشە نیشاندەدات هەروەك چۆن ئەم شتە لەزمانی ئەم هۆزەدا بوونی هەیە. هەربۆیە دەلالەت بەپێی ئەوشتەیە کەخاوەنانی مەلەکەی زمان بەکاری دەهێنن، هەربۆیە هەرکات زاراوەیەك لەمەلەکەدا بناسرێت و ناوبانگ دەربکات ئەوکات دەلالەت ڕاستدەبێت، هەرکات ئەم دەلالەتە لەگەڵ مەبەست و موقتەزای حاڵدا موتابەقەت بکات بەلاغەت ڕاستدەبێت وەبەهیچ شێوەیەك پێویست ناکات یاساکانی نحویەکان لەمبارەیەوە بەموعتەبەر دابنێن.

لەم جۆرە شیعرانەشدا ئەوان شێوازەکان و هونەرەکانی شیعر بێجگە حەرەکاتی کۆتایی ووشەکان بوونی هەیە. هەربۆیە کۆتایی زۆربەی ووشەکانیان ساکنە لەلای ئەوان فاعل لەمفعول و مبتدا لەخبر بەقەرینەی قسەکان دەناسرێنەوە نەك بەحەرەکاتی اعراب،

هەروەك چۆن لەم جۆرە شیعرانەی ئەواندا بەشێك هەیە كەلەقسەی شریفی كوڕی هاشمەوە كەبۆ دووری و هیجرانی جازیەی كچی سرحان گریە و زاری دەكات و، لەسەفەر كردنی ئەو لەگەڵ خاندانە كەیدا بەرەو مەغریب دەدوێت و دەڵێت: شریف ئەبو الهیجای كوڕی هاشم، لەبارەی حاڵی دڵی خۆیەوە كەپڕە لەخەم بەم جۆرە دەڵێت و لەبەدبەختی خۆی شكات دەكات و واباسی دەكات كە: ئەندێشەی ئەو بۆئاگادار بوون لەوەی كە یار لەكوێوە تێپەڕیوە دڵەڕاوكێی هەیە دەكەوێتە شوێن غولام ،و خزمەتكارێكی دەشتەكی و پێی دەڵێ كەدڵی زۆر ئازاری هەیە.

ئەو پێی دەڵێت كەڕۆحی بەچ ئەندازەیەك لەبەدبەختی ناڕەحەتیدا هەرلەبەیانیەوە ناڵەی خوداحافیزی دەكات. خودا ئەو كەسەی كەڕازی ئەم داستانە دەزانێت لەناوببات. هەروەك دوژمنێك كەبەشمشێری هیندی دروستكراو لەپۆڵای خالیص برینداری كردووە بەدڵ و گیان دەناڵێنێت.

هەروەك مەڕێكە كە لەنێو دەستشۆردا كەسەختی دەستەكانی لەو ماوەیەی كەپەتەكان بەتوندی دەبەستێت و، دەبێتە هۆی دروستبوونی دەرد و ئێش لەودا كەلە ئێشی تیخەكانی شیری بڕان دەچن.

بەریەستە دووسەرەكان قاچەكانی دەگوشن، وەهەروەها سەری كەلەنێوان ئەو دووقاچەدا گیری كردووە. وەبەدرێژایی ئەو ماوەیەی كەبەدەست دەیشوات شاخی ڕادەكێشێت. فرمێسكەكانم زۆر هاتنە خوارەوە. هەروەك بڵێی پیاوێك بەسوڕانەوەی ئامێری سوڕێنەرەوەی ناوچاڵ دەیهێنێتە سەرەوە.

ئەو مۆڵەتەی كەبەچاوی من دراوە ماندوبوونەكەی قەرەبوو دەكاتەوە ئەو شێیەشی كەلەهەوادا كۆبووەتەوە هەورە چڕەكان دروستدەكات كەلافاوی فرمێسكەكانم توندتر دەكەن. لافاو گەلێكی تر كەلەسەرچاوە وە ڕۆدەچن بەسەر ئەودەشتەی كەلەدامێنی صفادایە دەڕوات و لەنێو ئەم فراوانیانەدا درەوشاوەیی بریقەكان دەبینرێت.

ئەم گۆرانی ووتنە تەسلیە بەدڵ دەدات. کاتێك کەگرفتاری عەشق بووم، لەبەغداد تەنانەت هەژارەکانیشی لەچارەنوسی من وورد دەبوونەوە. بانگەوازکەر بەرێکەوتنی ڕاگەیاند هەموو کەلوپەلەکان پێچرانەوە و حوشتری ئامادە لەبەردەم کەسێکدا کە ڕووتی کردبوویەوە وەستابوو.

ئەی زیابی کوڕی غانم کەرێگری لەجوڵەیان دەکەیت، سەرپەرشتی گەشتیاران دراوەتە دەستی مازی مقرب. حەسەنی کوڕی سەرحان پێی گوتن بەرەو مەغریب بچن ئاژەڵەکان بدەنەبەر و من دەیانپارێزم.

سواریەکەی خۆی بەرەو پێشەوەبرد لەنێو حەیواناتدا هاواری کردە مەڕو مانگاکان بەبێ ئەوەی کەلەکێڵگە سەوزەکاندا بیانگێڕێت. زیان بەخشندەی کوڕی عابیس یان (تولەجین) لەهۆزی حمیر، منی وازلێهێنا کە کێڵگەگەلێك لەحەمیردا هەبوو کەبۆ ئەو بەس نەبوون.

هەرئەوەی کەخۆی بەدۆست و هاوسەفەری من دەزانی منی وازلێهێنا و ئێستە من قەڵغنێکم نیە و کەنیشانی دووژمنانی بدەم. بیلالی کوڕی هاشم گەڕایەوە پێی گوتن: ئێمە دەتوانین لەپەنای لەناوچوونا بژین بەڵام لەسەرزەوی تینویەتیدا ناتوانین بژین.

دەروازەی بەغداد و سەرزەویەکەی بۆ ئێمە حەرامە ئێمە ناتوانین بچینە ئەوێ و من ناگەڕێمەوە بۆی و وولآخەکەم لەوێ دوور دەکەوێتەوە. ڕۆحی من لەووڵاتی ئیبن هاشم ڕوو وەردەگێڕێت بەهۆی گەرمای توندی خۆرەوە.

وەئەگەر لەوێدا بمێنمەوە گەرمای سەخت مەرگم بەرەو ڕوو دەهێنێت. لەکاتی شەودا ئەو ئاگرانەی کەبەدەستی کچانی هۆزەکە دەکرێنەوە پزیسکی لێدەبوویەوە. دواتر ئەسیری ئەو جوانیانە بوو حوشترەکەی لەسەر ڕێگەی لود خەرجان هاندەدا.

یەکێکی تر لەبەرهەمی شاعیرەناوبراوەکان شیعرێکە لەبارەی شیوەنی ئەمیری زناتە، ئەبوسعدی بقری هاوجەنگی ئەوان لەسەرزەوی ئەفریقاو زاب کەبەشێوەی شیوەنی گاڵتەجاڕی گوتراوە: سعد ئەی ڕومەت جوانی بەیانیان لەگەڵ کارواندا بەشێوەیەکی نەرم

ئاسا عەزیمەتی کردو گوتی: ئەی ئەو کەسەی کەلەمن دەپرسی گۆڕی خەلیفەی زناتی لەکوێیە ئەم نیشانە لەمن وەربگرە و لەوەرگرتنیدا سستی مەنوێنە. ئەم بەیتانە لەشەریفی کوڕی هاشمەوەیە کەتێیاندا لەو گرنگیدانەی کە لەنێوان ئەو مازی بنی مەقرەب ڕوویداوە گفتوگۆ دەکات: ماضی خۆی قسەی دەستپێکرد و گوتی: شوکور ئێمە لەتۆ ڕازینین، ئەم شیعرانە سەفەری ئەوان بۆ مەغریب و زاڵبوونی زناتە بەسەر ئەو نەتەوەیەدا دەردەخات: ئیبن هاشم چ دۆستێکی جوانبوو کەلەدەستم دا.

چونکە زۆرێك لەو پیاوانەی کەبەلەرمن باشترین دۆستەکانی خۆیان لەدەستداوە.

قەصیدەی ناوبراو بەرهەمی تەبعی سوڵتانی کوڕی موزەفەری کوڕی یەحیا لەزەواویدە، کەیەکێکە لەتیرەکانی بتونی هۆزی ڕیاحە کەلەو هۆزەدا لەخاندانە حاکم و بەرێزەکان دەژمێردرین. شاعیر ئەم بەیتانەی لەحاڵێکدا گوتووە کەلەزیندانی ئەمیر ئەبو زەکەریا بن ابی حفص لەیەکەمین زنجیرەی موەحیدانی ئەفریقا زیندانی بووە: شاعیر کاتێك کە کەم کەم تاریکی دەڕوات‌و خەو لەچاوانی نامێنێت دەڵێت: چ کەسێك یارمەتی دڵ دەدات کەبووەتە دۆست و هاودەمی جیایی و دەرد خەم.

وەلەشیعری دواییینانی ئەوان قسەکەی خالیدی کوڕی حەمزەی کوڕی شێخ کەعوب[٣٧٣] لەنەوەکانی ابواللیله کەحەریفەکانی خۆی منداڵانی مهلهل سەرزەنشت دەکەن، بەشاعیری ئەمان ئیبن شبلی ئیبن مسکینانەی بن مهلهل وەڵام دەداتەوە کەلەبەیت گەلێکدا شانازی بەنەتەوەو خزمانی خۆیەوە کردووەو، لەئەولادی ئەبواللیل بەباشتری زانیوە. وەهەروەها یەکێك لەشاعیرانی ئەوان لەبارەی مەسەلە حیکمەت ئامێزەکانەوە شیعری گوتووە: گەڕان بەدوای شتێکدا کەبەدەستی ناهێنی کارێکی نەفامانەیە پشتکردنە کەسێك کەڕوولێوەرگێڕاوی کارێکی دروستە.

هەرکات ببینی خەڵکی دەرگاکانیان بەڕووی تۆدا داخستووە سواری حوشترەکان ببە (واتەسەفەر بکە) خودا دەرگایەکی ترت لێدەکاتەوە. لەم بەیتەدا شبل بن مسکینانە نیسبەتی کەعوب دەداتە پاڵ تەرجەم: پیران و لاوانی خێزانی تەرجەم بەهۆی توندی

---

[٣٧٣] ناوی هۆزێکە لە عەرەبەکانی مەغریب.

یەکبوونی یەکترەوە لەسکالآی خەڵکی بەگشتی دێنە هیجان. لەم بەشەدا خالیدی کوڕی حمزە براکانی خۆی سەرزەنشت دەکات کە بۆچی بەچاودێری ئەبو محمدی کوڕی تافراکین شێخی گەورەی موەحیدان ڕاپەڕیون؟ ئەبو محمد کەسێك بوو کە لەئەرکی حاجیبی سوڵتانی تونس کەڵکی خراپی وەرگرت و، بەناوی کەفالەتی ئەبواسحاقی کوڕی سوڵتان ئەبویحیا جڵەوی دەسەڵاتی زۆردرانە گرتبووە دەست.

ئەم شتەش لەڕووداوەکانی نزیك بەسەردەمی ئێمە دەژمێردرێت: خالیدی جوامێر بەئاگایی تەواوەوە قسەدەکات ئەو خیتابەیەی کەشیاوی پیاوێکی خەتیبە دەهێنێت و لەڕووی ژیری و ڕاستیشەوە دەستدەکات بەقسەکردن...ئەم شیعرانەش بەرهەمی تەبعی علی بن ابراهیمە کەلەم سەردەمەدا لەسەرکردەکانی عامیر، کەیەکێکە لەهۆزەکانی بتونی هۆزی زوغبە دەژمێردرێت. ئەو لەم بەیتانەدا کوڕەمامەکانی سەرزەنشت دەکات کەبوونەتە سەروەری ئەندامانی تری هۆزەکە. علی بن عمر ئەم شیعرانەی کۆتایی گوتووەو خیتابەیەکی هۆنراوی هێناوە. ئەم بەیتانە وەك مرواری گەلێکن کەگەوهەر فرۆش لەکاتی ڕاکێشانیان بەسەر پارچەی ئاوریشمدا بەدەستەوە دەیگرێت هێندە جوانو دڵپەزێرن. وەشیعرەکانی خوارەوە لەاعرابی دەشتەکی نشینی ناوچەکانی حورانە و زادەی تەبعی ژنێکە کە کەمێردەکەی کوژراوە، ئەم بەیتانەی بەرەو هۆزی قەیس هاوسوێنانی هۆزەکەی خۆیان ناردووە بەم شێوەیە ئەوانی بۆ خوێنڕشتنی مێردەکەی هانداوە: امسلامە ژنی لاوی هۆز بەخۆی دەڵێت: خودا ئەگەر سوزی بەرامبەر کەسێك نەبێت دووچاری ترس و تۆقاندنی دەکات[٢٧٤]، وەهاوشێوەی شیعرە ناوبراوەکان لەلای ئەوان زۆرو زەوەندە هەندێکیشیان لنێو خەڵکیدا باویان هەیە. هەندێك لە تیرەی هۆزەکانی ئەو نەتەوەیە سەرقاڵی شیعر گوتنن، هەندێکیشیان هەروەك لەبەشی شیعردا باسمانکرد خۆیان بەدوور گرتووە، وەك زۆرێك لەسەرکردەکانی ئێستای هۆزەکانی ڕیاح و زوغبە و سلیم و نمونەی ئەمانە.

---

[٢٧٤] تقول فتاة الحي امسلامة — بعين اراع الله من لارثى لها.

## موشحات[٣٧٥] و ازجالی[٣٧٦] ئەندەلوس

بەڵام پاشینانی ئەندەلوس لەپاش ئەوەی کەشیعر لەسەردەمی ئەواندا زۆر بوو مەبەست و هونەرەکانی تەهزیب کران و گەشتنە ئەو پەڕی جوانی هونەری، داهێنانیان تێدا کردو بەموشح ناوزەدیانکرد. ئەوان ڕشتەڕشتە و لق لق قسە ڕێکدەخەن لەسەر خۆیان و عەروزەکانیان زیاد دەکەن پێیان دەڵێن بیت و ژمارەی قافیەی ئەم لقانەو، وەزنەکانیان تاوەکو کۆتایی بەشەکە پەیاپەی و یەك لەدوای یەك دەیانهێنن. وەلایەنی زۆری ئەم شیعرانە کەلەم شێوەیەدا دەگوترێن حەوت بەیتین و هەربەیتێکیش چەند لقێکی هەیە کەژمارەیان ببەراورد بەمەبەست و شێوازەکان جۆراوجۆر و جیاوازە و

---

[٣٧٥] موشحات لەشیعری پێشیناندا بەهونەرێکی نوێ دەگووترێت، کەخەڵکی ئەندەلوس دایانهێناوە و لەبەر ئەوەی کەصنعەت و جوانکاری تێدا بەکار هاتووە پێیان گوتووە موشح، لەم ناونانەشدا پشتیان بەویشاح و ئەو خشڵانەی کەئافرەتان بۆ جوانکاری بەکاریان دەهێنن بەستووە، ئەم جۆرە شیعرەش لەڕووی ڕشتە و بەیت و قفڵەکانەوە بەویشاحیان چواندووە. ابن سنا الملك لەکتێبەکەی خۆیدا بەناوی (دارالطراز) هێناویەتی: موشحات دەبن بەدوویەشەوە ا– موشحاتێك کە لەسەر وەزنی شیعرە عەرەبیەکان ووتراون. ب – جۆرێکیش کەخاوەنی وەزنی ناوبراونیە شاعیریش گرنگی بەو وەزنانە نادات. ئەو جۆرەی کەلەسەر وەزنی شیعرە عەرەبیەکان گووتراوە دووجۆرە: بەشێکی کەلە اقفال و ابیاتەکانیدا ووشەیەك ناچێتە ناویەوە کەبەهۆی ووشەی ناوبراوەوە ئەو بەشەی بەیتەکە لەوەزنی شیعر دەربچێت، ئەو موشیحاتانەی کە لەسەر ئەم شێوەیەبن گرنگیان پێنادرێتو ڕەواجیان نیە. بەشی دووەم: موشیحاتێکە کە هیچ بەشێکیان بەهیچ شێوەیەك پەیوەندی بەوەزنی شیعری عەرەبیەوەنیە، ئەم جۆرەش زۆر بەناوبانگە و بەشی گەورەی موشیحات پێکدەهێنێت. هەرموشحێك لەچەند اقفالێك پێکدێت کەپێیان دەڵێن زنجیرەکان و خاوەنی بیت گەلێکن کەدەبن بەچەندین لقەوە کەبریتین لەبەشەکانی موشح.

[٣٧٦] عبداللەی مروانی حەوتەمین خەلیفەی بنی ئومەییە بووە کەلە ئەندەلوسدا سەڵتەنەتی کردووە و لەساڵی ٢٧٥ ك گەشتووەتە خەلافەت.

ناوەڕۆکی غەزەل و مەدحیان تێدا بەکار دەهێنن، هەروەك چۆن لەقەصیدەکاندا باوە ئەم هونەرەیان گەیاندە ئەوپەڕی کەماڵ و خەڵکی پەسەندی دەکەن و بەناسك دەیدەنە قەڵەم و چینی خاص و عام بەهۆی ئاسانی فێربوونیانەوە و نزیکی شێوازەکەی بۆ زەین لەبەریاندەکەن. داهێنەری ئەمەش لەدوورگەی ئەندەلوسدا مقدمی کوڕی معافیری نیریزیە کەلەشاعیرانی امیرعبداللەی کوڕی محمدی کوڕی مەروانی بووە، (٢) ئەم شێوازەش ابوعبدالله احمدی کوڕی عبدربە خاوەنی کتێبی عقدالفرید تەقلید و چاولێکەری ئەمی کردووە، بەڵام بەدەرکەوتنی پاشینان لەم شێوازەدا کەسێك ناوی ئەو دوانەی نەدەبرد و موشحاتەکانیان هیچ ڕەونەقێکی نەبوو، یەکەمین کەسێکیش کەلەپاش ئەمان شارەزایی لەم هونەرەدا پەیداکرد عوبادەی قەزازە[٣٧٧]، شاعیری معتەصەمی کوڕی صمادح[٣٧٨] خاوەنانی المریە بووە.

وە اعلمی بتلیموسی[٣٧٩] گوتوویەتی کەلەئەبوبەکری بن زوهرەوە بیستوویەتی کەدەیگوت: هەموو ئەو شاعیرانەی کەبەشێوەی موشح شیعر دەڵێن شرخۆر و شوێنکەوتەی عبادەی قەزازن تەقلید لەشیعرەکانی ئەو دەکەن. مانگ تەواوە و شەوی چواردەیە – خۆری بەیانیانە– لقێکی تازە سەوزبووی ناومێرگانە – بۆنی میسکە – چ لەشو لار تەواوە – چەندە ڕووناك و ڕۆشنە – چەندە بەڕەونەق و جوانە – بۆنی خۆش بڵاو دەکاتەوە.

کتوپڕ هەرکەسێك چاوی پێبکەوێت – دڵی دەداتێ – و بەدەستی ناهێنێت. وەهەروەها دەڵێن لەهاوچەرخەکانی عبادە لەسەردەمی ملوك التوایفدا ژیاون هیچ کەسێك

---

[٣٧٧] لەساڵی ٤٢٢ك (١٠٣٠ ز مردووە).

[٣٧٨] محمدی کوڕی معنی کوڕی محمدی کوڕی احمدی صەمادح نازنادار بەئەبویەحیا و لەقەبدار بە معتصمی تجیبی، خاوەنی المریە و بجایە و صمادحیە لەووڵاتی ئەندەلوسدا، لەساڵی ٤٤٤ ك گەشتە سەڵتەنەت و لەساڵی ٤٤٨ لەالمریەدا مرد(لغتنامەی دهخدا).

[٣٧٩] اعلمی بتلیموسی عبداللەی کوڕی سەعیدە زانای زمان و نحو لەبلنسیەدا (ڤالانسیادا) و لەساڵی ٥٢١ ك مردووە.

لەهونەری موشح گوتندا پێش ئەو نەکەوتووە. لەپاش ئەویش لەپلەی دووەمدا ابوبکر محمد ابن ارفع راسە شاعیری مأموونی کوڕی زەنون خاوەنانی سوڵتانی تولەیتیلەیە. دەڵێن ابن ارفع سەرەتا موشحێك بەناوی ئەوەوە ناوبانگی هەبووە و زۆربەجوانی شیعرەکانی تێدا گوتووە کەدەڵێت: چنگی داهێنەرترین ئاوازی گوتو – جوگەو سەوزاییەکانی بێستانی تێرئاو کرد. کۆتاییەکەشی بەباشی چڕیوەو دەڵێت: بجوڵێو لێرەبڕۆ چونکە لەسوپاکەی مەئمون یحیای کوڕی زەنون پارێزراو نیت، سوپایەك کەسوارەکان هەراساندەکەن[٣٨٠].

دواتر لەم هونەرەدا گۆڕەپانی پێشبڕکێیەکی تر دێتە پێشەوە کەهاوکاتە لەگەڵ سەردەمی دەمامك دارەکاندا (مرابیتان) داهێنانگەلێکیان تێدا کرد. وەناودارانی ئەم مەیدانەش بریتی بوون لە: یحی بن بقی، اعمی تطیلی[٣٨١] ئەمەش قسەی ئەوە: چۆن دەتوانم گەورەیی بەدەست بهێنم – لەکاتێکدا نیشانەکانی ڕێگە خەمناکن. کاروان ئێستاکە لەنێو بیاباندا – لەگەڵ جەستە نەرم و تۆڵەکاندا بەڕێکەوەن و دوور دەکەونەوە.[٣٨٢] هەندێك لەمەشایخەکان گوتوویانە کەخوازیارانی ئەم جۆرە شیعرانە لەئەندەلوسدا گێڕاویانەتەوە کەگروپێك لەموشح بێژان لەاشبیلیە کۆبوونەتەوە و، هەریەکە موشیحێك لەپەڕی بەهێزی جوانیدا دروستکردووە و، دواتر یەکەمین کەسێك کەموشحی خوێندەوە اعمی توتەیلی بوو ئەو هەرکە موشحی بەناوبانگی خۆی بەم جۆرە دەستپێکرد: خەندانە لەگەوهەر. کاتێك پەردە لادرا مانگ بەتەواوەتی دەرکەوت – ڕۆژگاری جیهان بۆداپۆشینی ئەو تەنگ بوویەوە – دڵی من ئەوی داپۆشی.[٣٨٣]

---

[٣٨٠] (العود قدترنم بابدع تلحين – وسقت المذاب رياض البساتين)(تخطر ولش مسلم عساكرالمأمون – مروع الكتاب يحى بن نوالنون ).

[٣٨١] نیسبەتە بۆ توتەیلە کەشارێکە لەئەندەلوس.

[٣٨٢] كيف السبيل الى صبر – وفى المعالم – اشجان – والركب وسط الفلا– بالخرد النواعم – قدبانوا.

[٣٨٣] ضاحك عن نجمان – سافر عن بدر – ضاق عنة الزمان – وحواة صدرى.

ئیبن بقی بەبێ وەستان موشحی خۆی دڕاند و خەڵکانی تریش پەیڕەویان لێکرد. وەاعلمی بتلیوسی گوتوویەتی: بیستوومە ئیبن زوهەیر دەیگوت: هەرگیز ئیرەیم بەقسەی موشحات نەبردووە مەگەر ئەم قسەیەی ئیبن بقی نەبێت کەگوتوویەتی: مەگەر احمد لەو پایەی گەورەییەدا – نابینی کەهیچکەسێکی پێناگات ؟. ئەو وەك خۆرێکە کە لەخۆرئاوابووندا هەڵهاتووە. ئەی خۆهەلآت وەك ئەومان نیشان بدە؟.

وەلەسەردەمی ئەو دووشاعیرەدا (ابن زهیر، ابن بقی) یەکێك لەموشح بێژەکان کەموشحاتی دڵپەسەندی دەگوت ابوبکری ابیض بوو[٣٨٤] حەکیم ابوبکر بن باجە[٣٨٥] بێژەری ئاهەنگە بەناوبانگەکان بوو، لەسەردەمی ئەماندا دەژیا یەکێك لەحەکایەتە بەناوبانگەکانی ئەمەیە کە ئیبن باجە لەمەجلیسی مەخدومی خۆی ئیبن تیفلویت لەخاوەنانی سرقستە ئامادە بوو، موشحەکەی خۆی دابەیەکێك لەکەنیزەکە ئاواز خوێنەکانی ئە شازادەیە دا بۆ ئەوەی بیخوێنێتەوە کەسەرەتاکەی بەم جۆرەیە: هەرچی ئەتەوێت بەدامێنی بلآوەوە وەرە – مەستی ئێمە پەیوەست بکە بەمەستیەوە. مەمدوح یان مەدحکراو لەم شیعرە شادمان بوو هەرکە موشحەکەی بەم قسەیە کۆتایی پێهێنا: خودا ئالآی سەرکەوتن بۆ ئێوە، امیری پایەبەرز بەست. کاتێك کەئاوازەکە کەوتە بەرگوێی ئیبن تیفلویت کەوت هاواری کرد: چ شادیەکی گەورەیە؟ و عاباکە بەری خۆی هێندە ڕاکیشا تاوەکو دڕاو گوتی: ئافەرین، چەندە جوان دەستت پێکرد و چەندەجوانیش کۆتاییت پێهێنا. دواتر سوێندگەلێکی دڵنیاکەرەوەی خوارد کەنابێت ئیبن باجە بچێتەوە ماڵی خۆی مەگەر بەسەر ئاڵتوندا دەبێت بڕوا. بەلآم حەکیم لەدوارۆژی

---

[٣٨٤] ابوبکری ئەبیەز لەساڵی ٥٤٤ ك و (١١٤٩ ز دا مردووە.

[٣٨٥] ابوبکر محمد بن باجەی تجیبی سرقستی فەیلەسوف و پزیشکی بەناوبانگ بەئیبن صائغ لەئەدیب و شاعیرانی موشح بێژ بوو، وەزارەتی امیری ئەبوبکری صحراوی فەرمانڕەوای سرقستەی دەکرد لەلایەن مورابیتانەوە. لەشاری فاس لەساڵی ٤٣٣ ك ١١٣٨ ز ژەهر خوارد کراو دوونیای بەجێهێشت.

خراپی ئەم سوێنە زۆر ترساو چارەیەکی دۆزیەوە و گوتی کەمێك ئاڵتوون بدەن لەپێلآوەکەی و بەو پێلاوەوە چوویەوە بۆ ماڵەوە.

ابوالختاب ئیبن زهرە گوتوویەتی: لەمەجلیسی ابوبکر ئیبن زهردا[٣٨٦] باسی ئەبوبەکری ئەبیەز موشح خوێنێك کەناوەکەی هێنرا هاتە ناوەوەو، یەکێك لەئامادەبووان بەبێ بەها باسی کرد. ئیبن زهر گوتی: چۆن بەبێ نرخ دادەنێیت کەسێك کە دەڵێت: نۆشینی بادە لەسەر سەوزەزاری پڕلەگوڵی چاوقەوی لەزەتی بەمن نەدەبەخشی ئەگەر دڵبەندێکی کەمەر باریك نەبوایە. کەهەرکات بەیانیان یان عەسر بگەڕێتەوە دەڵێت: بۆچی مەی زلەی لەڕوومەتم دا و بای باکور هەڵی کرد. بەڵام بەبێ وەستان قامەتی لقی تازەی لاربوویەوە و منیش لەژێر ڕووپۆشەکەمدا جێگەم کردەوە. لەو بوونەوەرانەیە کەدڵەکان دەبات بۆ خۆی. دڵ دەبات و ئێمە توشی شك و دڵەڕاوکێ دەکات چونکە نیگا پڕنازەکانی ئێمە بەرەو گوناه دەبات. وەهاوار لەو لێوە گەنم ئاسایانە کەلەژێریانەوە ددانە جوان و سپیەکان شاردراونەتەوە. ددانە تاکەتاکەکان کەتینوەکان تێرئاودەکات. وەشیفابەخشی عاشقی ڕەنجبەرە.

عاشقێك کەپەیمانی عەشق هەرگیز ناشکێنێت. ئارەزو مەندی ویصالە — ئێستەش ئەوەتا لەحاڵی هیجراندایە.

لەپاش ئەمانیش لەسەرەتای دەوڵەتی مووەحیدانەوە چەند کەسێك لەم هونەرەدا ناوبانگیان دەرکرد وەك: محمدی کوڕی ابوالفضل ی کوڕی شرف و ئەوانی تره. حەسەنی کوڕی دوەیریدە دەڵێت: حاتەمی کوڕی سعیدم بینی کەبەم شێوەیە دەستیکردبوو بەموشیحەیەك: بادەو هاودەمی خۆش تەبع — وەك ئەوە وایە کەمانگی تەواو ڕووبەڕووی خۆر ببێتەوە.

---

[٣٨٦] ابوبکر محمدی ابن زهری اشبیلی لەباشترین هەڵکەوتوانی خاندانی زوهەر کەلەئەندەلوسدا بەفەزڵ و ئەدەب بەناوبانگبووە، لەپزیشکان و ئەدیبانی بەناوبانگی سەردەمی خۆی بووە، لەدەرباری مورابیتان و دواتریش مووەحیداندا کاری کردووە و لەساڵی ٥٠٧ ك ١١١٣ ز لەدایکبووە و لەکۆتایی ساڵی ٥٩٥ ك ١١٩٨ ز ژەهراوی کراوە و مردووە.

وەئیبن هردوس کەدەڵێت: ئەی شەوی بەیەکگەشتن و خۆشی بەخودا دێیتەوە. وەئیبن موهیل دەڵێت: جەژن کاتێك نیە کەجلوبەرگی ئاوریشم و جوان بپۆشن و بۆنی عەتر بکەن، بەڵکو جەژن ئەوکاتەیە کەدیداری یاری تێدایە.

وەئەبو ئیسحاقی دوینی ابن سعید دەڵێت: لەابوالحسنی سهلی کوڕی مالیکەوە بیستوومە کەدەیگوت: ڕۆژێکیان چوومەلای ئیبن زەهر لەوکاتەی کەئەو پیر بوبو جلوبەرگی دەشتەکیەکانی لەبەردا بوو، چونکە لەقەڵای استپەدا دەژیا ئیبن زەهر منی نەناسیو، لەکۆتایی مەجلیسەکەوە دانیشتم. دواتر باس هاتە سەرباسی شیعر و منیش لەو موشیحەیەی کەخوێندبوومەوە ئەم چەند بەیتەم چڕی: سورمەی تاریکی لەدیدەی سپێدەدا، لەکاتی بەرەبەیاندا نامێنێت و، کەناری ڕووبار بەخشڵە سەوزەکان ڕازێنراوەتەوە کەلەشیوەکانەوە دەستیان پێکردووە. ئیبن زەهر هەستایەوە و گوتی: تۆ ئەم شیعرەت گوتووە؟ گوتم تاقیم بکەرەوە.

گوتی: تۆ کێیت؟ منیش خۆم ناساند. دواتر گوتی: بگەیتە پلەیەکی بەرزتر سوێند بەخودا نەتم ناسی. ئیبن سعید دەڵێت ئەبوبەکری کوڕی زەهر سەرمەشقی شاعیر گەلێکە کە من دیدارم کردوون، موشحاتەکانی لەشەرق و غەربدا بلاو بوونەتەوە. وەهەروەها دەڵێت: ئیبن سعید لەابوالحسنی سهلی کوڕی مالیکەوە بیستوومە کەدەیگوت: بەئیبن زەهریان گوت: ئەگەر لەتۆ بپرسن بەدیعترین و داهێنراو ترین شیعرێك کەلەجۆری موشحات گوتووتە کامەیە چ وەلامێك دەدەیتەوە؟ گوتی ئەم بەیتانە دەخوێنمەوە: بۆچی ئەم شەیدای عەشقە لەسەرمەستی بەهۆش نایەتەوە؟ ئای چەندە ئەو مەستە؟ (بەبێ ئەوەی کەبادە بنۆشێت. بۆچی خەمبارێك کەعەوداڵی دیاری خۆیەتی ئەم هەموو گریە و زاریە دەکات بۆ نیشتیمان؟. ئایا شەووڕۆژگەلێکی خۆش کەلەنزیك کەنداوەکەدا گوزەراندوومانە دەگەڕێتەوە بۆمان؟ وەئایا لەنەسیمی بۆنخۆشی میسکی دارین[٢٨٧] هەڵدەمژین؟ وەئەوکاتەی کەشوێنێکی جوان و شادی بەخش گیانێکی تازەمان بەبەردا

---

[٢٨٧] دارین بەندەرێکە لەبەحرەین کەلەهیندەوە میسکی بۆدەهێنن. (اقرب الموارد).

بکاتەوەو، ئەو جۆگەلەیەی کەدرەختی چڕو پڕو پڕلەلق و گەلاّ سێبەری بۆ کردبێت ئاویش لەو کاتەی کەدەڕوات بەسەرو ژێری ئەو سەوزەزارەدا و نغرۆ بوبێت تێیدا.

لەدوای ئەویش ئیبن حیون ناوبانگی دەرکرد، کەداهێنەری ڕیزبەندی (زجل) ێکی بەناوبانگە کەبەم شێوەیە دەستپێدەکات: هەرکات ئەو تیرێك لەدڵ دەدات — بەهەرجۆرێك کەبیەوێت بەدەست بێت یان بەدیدە.

وەهەروەها لەبارەی چاوبازیەوە دەڵێت: منی جوان و خوێنگەرم دروستکراو — هەروەك تیرئەندازێکی شارەزام لێهاتووە. وەبۆ چرکەیەکیش واز لەشەڕ ناهێنم. بەهەردوودیدەم هەمان ئەو ئەرکە جێبەجێ دەکەم کەبەدەستەکانم لەکاتی تیر هاویشتندا ئەنجامی دەدەم.

وەلەسەردەمی ئەو دوانە(ابن زهر ابن حیون) لەغەرناتە مهری کوڕی فرسیش ناوبانگی دەرکردبوو. ابن سعید دەڵێت: ئەم شیعرانە هی ئەون: بەخوا خۆشە ڕۆژێکی شادی بەخش بوو، کەلەسەر چیمەنەکانی کەنار ڕووباری حمص (اشبیلیە) دا گوزەراندمان. دواتریش بەرەو ناوەندی کەنداوەکە چووین و لەبادەیەکی ئاڵتوونی کەبەڕەش مۆرکرابوو بۆنی خۆشمان لەهەوادا بلاّو دەکردەوە. لەوکاتەشدا چنگاڵی تاریکی ڕووپۆشی عەسری دەپێچایەوە. کاتێك ئیبن زەهر ئەم شیعرەی بیست، چەندە ئێمە لەم ڕووپۆشەوە دوورین وەلەهەمان کاتدا مهری بن فرس لەهەمان شاردا، شاعیرێکی تریش بەناوی مترفەوە هەبوو، ئیبن سعید لەباوکی خۆیەوە دەگێڕێتەوە کەمترف ڕۆژێکیان چوویەلای ئیبن فرس‌و، ئیبن فرسیش لەشوێنی خۆی هەستایەوە ڕێزێکی زۆری لێگرت، مترف گوتی: دانیشە و هێندە شەرمەزارم مەکە. ئیبن فرس گوتی: چۆن کەسێك کەئەم شیعرەی گوتووە هەڵنەستمەسەرپێ بڵێ بزانم ئایادڵی ئەو عەودالاّنەی کەبەتیری نیگاکان بریندار کراون دەکرێت خەمبارنەبن؟. لەدوای شاعیرانی ناوبراویش دەبێت باسی ئیبن خرمون بکەین کەلەمرسیەدا ژیاوە. ئیبن ڕائس گوتوویەتی کەیەحیای خەزرەجی لەمەجلیسێکدا چوویە لای ئیبن خرمون و ئەو موشحەیەی کە گوتبووی خوێندیەوە و ئیبن خرمونیش

گوتی: کاتێك دەتوانین بەشیعر بڵێین موشحە کەتەکەللوف و زۆر لەخۆکردنی تێدا نەبێت. یەحیاش پرسی وەك کامە شیعر؟ گوتی وەك ئەم موشحەی من: ئەی یار کەمنت دووچاری فیراق کردووە – ئایادەتوانم ڕێگەی بەیەککەشتن بدۆزمەوە؟ وەئایا ئەم دڵە ڕەنجاوە لەعەشقی تۆ ساکن دەبێت؟.

یەکێکی تر لەم جۆرە شاعیرانە ابوالحسنی کوڕی مالیکە کەلەغەرناتەدا دەژیا، ئیبن سعید دەڵێت: باوکم ئەم ووتاری ئەوی بەلاوە زۆر پەسەند و جوان بوو: لافاوی بەیانیان لەلای خۆرهەڵاتەوە گەڕایەوە بۆ دەریایەك لەسەرانسەری ئاسۆوە. گریە و زاری ناڵەی کۆترەکان بەرزبوویەوە. ئایا ئەوان لەنوقم بوون لەم لافاوەدا بێزارن؟ هەربۆیە بەیانیان فرمێسکەکانیان دەڕێژنە سەرگەلای درەختەکان. هەرلەو سەردەمەدا ابوالحسنی کوڕی فەزڵ لەاشبیلیەدا ناوبانگی دەرکردبوو. ابن سعید دەڵێت: باوکم دەیگوت لەسهلی کوڕی مالیکەوە بیستوومە کەبەابوالحسنی گوتووە: ئەی ابن فەزڵ تۆ بەم قسانەی خۆت پێشی موشحە چڕەکان کەوتووی: ئاخ بۆ ئەو سەردەمەی کەڕابودوە و ڕۆشتووەو، لەو ئێوارە ژوانەی کەعەشقی منی گیرۆدەی فیراق و جیایی کرد. وەبەپێچەوانەی مەیلەوە نەك لەرووی خۆشیەوە بەتەنها مابمەوە. وەبەهۆی مەشخەڵە رووناکەکانەوە شەوم رووناك کردەوە لەجیهانی ئەندێشەدا خوداحافیزیم لە شوێنەواری وێرانی مەنزڵ و ماڵی یارم کردوو، لەجیهانی خەساڵدا ماچی نیشانەکانی وێرانیم دەکرد.

وەهەروەها ئیبن سعیدیش دەڵێت: بیستوومە چەندین جار ابوبکری صابوونی موشحاتەکانی خۆی بۆ مامۆستا ابوالحسنی دباجی دەخوێندەوە و بیستوشمە ئافەرینی کردووە بێجگە لەم شیعرانەدا نەبێت سوێند دەخۆم بەعەشقی خاوەن ژیریەك – کەشەوی عەودالان و ئارەزومەندان ڕۆژی لێنابێتەوە. ڕووباریش بەیانیان بەستوویەتی و ناڕوات – هەربۆیە وادەزانم ئەم شەوە درێژەی من بەیانی نیە – هاوارم کرد مەگەر تۆ نەبەدیت یان باڵەکانی ئەستێرەی نسر قرتاون؟ – کەئەستێرەکانی تری ئاسمان لەشوێنی خۆیان ناجوڵێن ؟.

وەلەموشحاتە باشەکانی ئیبن صابونی ئەم شیعرانەیە: سەیری حاڵی عاشقێکی نەخۆش و خەمبارکەن – کەپزیشك داماوی کردووە و هاوار بۆی. خۆشەویستەکەی لێی دوور دەکەوێتەوە. وەئەوکاتیش خەو لەم ڕەفتارەدا چاولێکەری و تەقلید لەمەحبوب دەکات– بەڵی خەولەچاوانم تۆراوە – بەلاّم بێجگە بۆلەدەستدانی خەوو خەیاڵی مەعشوق بۆشتێکی تر ناگریم. لەو سەردەمەدا ویصالی ئەو هەروەك دەیویست فریوی دام ئەفسوس؟ چ ویصالێکی خراپ. هەربۆیە ناتوانم کەسێك کە لەمن دوور کەوتووەتەوە ئیتر بەڕاستی یان لەجیهانی خەیاڵدا سەرزەنشتی بکەم.

وەلەنێو خەڵکی عدوە(مۆریتانیا) دا ئیبن خەلەفی جزایری لەهونەری موشح ووتندا زۆر لێهاتووە و بێژەری موشحەی بەناوبانگە: دەستی. بەیانیان مەشخەڵی ڕووناکی لەپشکۆدانی گوڵدا دەرهێنا. شاعیرەکانی تری ئەو ناوچەیە (مۆریتانیا) ئیبن خزری بجاییە کەلەموشحەیەکدا دەڵێت: ڕۆژگار ددانی موافیق نیشان دەدات – درود لەسەر تۆ بێت بەزەردەخەنەی ئەو.

وەلەبەرهەمە دڵپەزێرەکانی پاشینان موشحەکەی ئیبن سهل[٣٨٨] و ئەو شاعیرێکە کەسەرەتا لەاشبیلیەدا و، دواتر لەسیبتە دا ناوبانگی دەرکردووە موشحەکەشی بەم شێوەیە دەست پێدەکات: ئایائاسکێك کەلەشوێنێکی بێوەیدا دەژیا لەبۆسەدایە تاوەکو دڵی عاشقی شەیدا کەپەنای بۆ هێناوە نەهێڵێت بچێتە بەر ئەو سێبەرەی کەخۆی پشووی تێدا دەدات. هەربۆیە ئەو دڵە وەك نەرمە گیایەك کەبادی سەبا لێی دەدات لەهاتووچۆدایە. وەهاوڕێی ئێمە وەزیر ابوعبداللەی کوڕی خەتیبی شاعیری ئەندەلوس و مەغریب کەپێشتر ناومان هێنا موشحەیەکی بەم شێوازە و بەم جۆرە گوتووە: زۆرت بکات باران – کاتێك کەدەبارێت. ئەی ڕۆژگاری وەصڵ لەئەندەلوسدا وەصڵی تۆ

---

[٣٨٨] ابراهیم بن سهلی ئیسرائیلی اشبیلی شاعیری ناوداری اسپانیولیەکان کەئەدەبیاتی عەرەبی فێربووە و پێیان گوتووە مستعرب، ئەو لەغەزەلدا لێهاتوو شارەزا بووە و شیعری ناسکی گوتووە لەتەمەنی چلساڵیدا و لەساڵی ٥٤٩ ك و ١٢٥١ز دا مردووەو، دەڵێن گوایە بەهۆی غەرق بوون و خنکانی ناوئاوەوە بووە. (ادبا العرب).

بێجگەلەخەوو خەیاڵو فرسەتێکی زوو تێپەڕبوو زیاتر نەبوو. ئەوکات سەردەمی جڵەی ئارەزووە جۆراوو بڵاوەکان ئێمەیان بەپێی دڵخواز و فەرمانمان گرتوویەتی بەدەستەوەو، گوێڕایەڵی ئێمە بوو بەرەو هەرجێگەیەك کەتەرسیم دەبوو دەجوولاً. ئەمە لەکاتێکدا گرووپێك لەئارەزووەکانی چ یەك یەك و چ دوو دوو وەك گرووپگەلێك لەمەوسیمی حەجدا کەبەرەو مەککە دەچن دەیجولاًندن. باران سەرتاسەری سەوزەزارەکانی ڕووناك کردووەتەوە هەربۆیە گوڵەکان لەنێو ئەو دیمەنە درەخشانەدا زەردەخەنە دەکەن. نوعمان (شقایق) لەبارانی باوکی (ئاوی ئاسمان) تێرئاو دەبێت. یان گوڵەنعمانەکان لەبارانەوە ڕیوایەت دەکەن. هەروەك چۆن مالێك لەئەنەسەوە(باوکی خۆی) دەگێڕێتەوە. جوان ئەو پارچەخەت خەت و زەخرەفەدار کراوە داپۆشراوە کەلەنێو هەموو جلوبەرگەکاندا خۆی پێوە هەڵدەکێشێت.

وەلەو شەوانەی کەتاریکی ڕازی عەشقی پەنهان دەکرد — ئەگەر ڕووخسارە درەوشاوەکان نەبوونایە کەوەك خۆر دەدرەوشانەوە. جلەکە کەهەروەك ئەستێرەیەك وابوو لەو شەوە تاریکەدا دەدرەوشایەوە، لەیەك جوڵەی ڕاستەوخۆدا بەکاریگەریەکی باشەوە لاربوویەوە و هاتە خوارەوە بەرەو دەستەکانی ئێمە. ئەمەش پێویستیەك بوو کەهیچ جۆرە عەیب و نوقسانیەکی تێدا نیە بێجگە لەوەی کەزووتێپەڕبوو وەك چاوتروکانێك ئەو کاتژمێرە خۆشانەتێپەڕین. کاتێك کەخەو بۆ ئێمە لەزەت بەخش بوو، کتوپڕ بەیانیان وەك پاسەوانێك کەلەبۆسەدا بێت هێرشی بۆ کردین. ئایائەستێرەکان بەووردیەوە سەیری ئێمەیان دەکرد، یان هەردوودیدەی گوڵی نێرگز کاری لەئێمە دەکرد؟. بۆکەسێك کە لەکۆت و بەندەکان ڕزگاری بووە و بێستانی دڵڕفێن ئەوی شادمانکردووە کام دڵدەرەوە باشتر لەمە دەکرێت ئەو دڵخۆش بکات؟. گوڵەکان هەلەکانی لەدەست وەردەگرن و لەو شەڕەی کەلەئەماندا نەبوو ئێستە بێخەمە لێی. لەم کاتەدا ئاوی جۆگەلەکان لەگەڵ وورده بەردەکاندجا کەلەبنەکەوەیەتی ڕازو نیاز دەکەن. وەیاران هەریەکە لەگەڵ دڵداری خۆیاندا گۆشەی تەنهاییان هەڵبژاردووە. ئەوان بەدیدەی

غیرەت و ئازاییەوە سەیر دەکرد. چونکە گوڵەکانیان بەجوانتر دەزانی لە دڵ ئارامی خۆیان. وەلەترساندا جلی ڕەنگ سووریان لەبەر دەکرد کەگوڵەکان خۆیان پێ ڕازاندبوویەوە. مورد دەبینی کەوەك ژیر و کەسێکی دووربین بەهەردوو گوێی ئەسپ[٣٨٩] گوێ هەڵدەخات ئەی خەڵکی خۆشەویستی ئەو هۆزەی کەبەکەنار شیوی (غضا) وەن جێگەی ئێوە لەدڵی مندایە.

عەشقی من ئەم ڕووبەرە فراوانەی بۆ ئێوە تەسك کردووەتەوە. بەلای منەوە گرنگ نیە کەلەکەناری خۆرهەلآت یان خۆر ئاوایەوەبن. ئەوپەیمانی خۆشەویستی و هاوڕێیەتیە دێرینەی کەلەنێوانماندا هەبوو تازەی بکەنەوە، ئەو دڵدارەی کەپەنای بۆ هێناون لەخەم و خەفەت ڕزگاری بکەن. لەخودا بترسن و عاشقێك کەبەردەوام عەشقەکەی لەناوو دەرەوە بووتە خۆرەی ئەندامەکانی دیسانەوە زیندووی بکەنەوە. عاشقێك کەلەوپەڕی بەخشندەیی و کەرەمی خۆی دڵی وەقفی ئێوە کردووە. ئایائێوە بەوێرانبوونی ئەو وەقفە ڕازی دەبن؟. دڵبەرێك لەهۆزەکەی ئێوە بەهۆی تەڵقیناتی ئارەزووەکانەوە نزیکە لەدڵی منەوە، هەرچەندە بەڕواڵەت ئەو لەمنەوە دوورە.

مانگێکە کەلەدەرهاتنی ئەو لەمەغریبێکی بەخت ڕەشدا عەودالآنی بەدی هاتوون، لەکاتێکدا ئەو مانگە خۆی بەختەکەی باشە. لەعەشقی ئەودا چاکەکار و خراپەکار لەنێوان وەعد و وەعیددا یەکسانن. بەنیگایەکی ئەفسونگەرانە لێوی شیرینی خۆی هەروەك هەناسە لەگیاندا جێگیر دەبێت و دەیکاتە شوێنی هاتوچۆی خۆی. تیری نیگای ڕاستی ناولێنا (بەناوی هەرکەسێك کەبیەوێت ئەو ئاشکرا بکات) وەدڵی منی کردە ئامانج و وەك ڕاوچیەك بەتالآن بردی. ئەگەر ستەم پیشەیەك بێت و ئومێد لەدەست بدرێت و دڵی دڵدارەکەی لەشەوق دەوەستێت لەگەڵ ئەمەشدا ئەو یەکەمین خۆشەویستی گیانە. وەلەعەشقدا ناتوانرێت بۆ دڵئارام باوەڕمان بەگوناه هەبێت. فەرمانی ئەو لەهەموو سینەو دڵەکاندا کەبێتواناو ڕەنج بەخەساری کردوون کاریگەرەو بەگیان قبوڵی دەکەن. نیگای

---

[٣٨٩] لێرەدا شاعیر گەڵای مۆردی چواندووە بەگوێی ئەسپەوە.

ئەو بۆ ڕاگەیشتن دەستیکردە داوەری، بەڵام لەڕووی هەواو هەوەسەوە داوەری کرد و لایەنی دڵە بێتواناکانی لەبەرچاو گرت. لەدادگایی کردندا ستەم لێکراو لەبری ستەمگەر دەگرێت و چاکەکار و خراپەکار بەیەکسانی سزا دەدات. ئەی هاوار لەدڵی من کەهەرکات بادی سەبا هەڵدەکات خەمێکی نوێ لەحەزی دڵدار دەیدا لێی: لەلەوحدا بۆ دڵی من قسەی ئەو نوسراوە: عەزابی من بەهەرشێوازێك سەختە)[٣٩٠] ئەم چارەنوسە بۆ دڵم دەرد و ڕەنجی هێنا کەواتە دڵم بەهۆی خەم و دەردەکانەوە لەناڕەحەتیەکی بێ پایاندایە. وەهێندە دەردی دەرونم لەسوتاندایە هەروەك بڵێی ئاگر لەپوشی ووشکدا کەوتووەتەوە. ئەم عەشقە لەگیانی مندا بێجگە لەخەم هیچی جێنەهێشتووە و، ئێستاکەش ژیانی من هەروەك پاشماوەیەکی ڕۆژی دوای جەنگی سوپاو تاریکیە.

ئەی دڵ تەسلیمی فەرمانی چارەنوس و قەزا ببە. وەکات بۆ گەڕانەوەی تەوبە بهێڵنەوە. یادهێنانەوەی ڕۆژگاری ڕابوردوو واز لێبهێنە، ڕۆژگارێك کەئاوێتەیە لەگەڵ خۆشنودی و زیریدا (شادی و خۆشی) بوو ڕابوردووە. وەلەمەولای شازادەی ڕەوشت جوان قسە بکە کەئیلهام کراوی سەرکەوتن لەقورئاندایە. بەخشندەیەکی تەواو بەحەسەبو نەسەب کەلەکاتی شەڕدا هەروەك شێرێکی دڕندەیەو، هەندێکجار وەك مانگ لەگۆڕەپاندا دەدرەوشێتەوە. سەرکەوتن بەجۆرێك بۆ سەر ئەو نازڵ دەبێت هەروەك ئەوەی کەوەحی بۆ روح القدس (جبریل) نازڵ دەبوو.

بەڵام لەو موشحاتانەی کە خەڵکی مەشریق چڕیویانە، شوێنەواری تەکەللوفیان پێوە دیارە و، لەباشترین نمونەکانیان موشحەی ئیبن سناء الملك ی میسریە کەلەشەرق و غەربدا ناوبانگی پەیدا کردووە و، سەرەتاکەشی بەم شێوەیە: دڵداری من پەردەی نوری لەسەر دەموچاو لابردووە زوڵفی ڕەش لەسەر کافور لەڕووی گوڵنار دەبینرێت. ئەی هەورەکان، تەپۆڵکە و لاپاڵەکان تاجدار بکەن و بەگوڵەکان بیانرازێننەوە. پیچ و قەمچەکانی جۆگەلەکان بکەنە دەست بەندیان.

---

[٣٩٠] (إِنَّ عَذابِي لَشَدِيد) س ابراهيم ئا ٧.

وەلەبەر ئەوەی کەهونەری موشح گوتن لەنێو خەڵکی ئەندەلوسدا ڕەواجی پەیدا کرد، زۆربەی خەڵکی بەهۆی ئاسانی جۆر و جوانی شێوە و تەوازونی ووشەکانەوە پێشوازی لەم جۆرە شیعرە دەکەن. هەموو شاعیرانی ئەو شارە جۆراو جۆرانەبەو شێوەیە شیعریان گوتووە بەزمانی مەحەلی خۆیان ئەو شێوەیان تەقلید کردووە، بەبێ ئەوەی کە پابەند بن بەاعرابی کۆتایی ووشەکانەوە و، هونەرێکی نوێی لێوە داهێنان بکەن کەبەناوی زجل(تصنیف) ناویان ناوە و، تائەم سەردەمەش ئەم شێوازەیان پاراستووە بەپێی مەبەست و ناوەڕۆکەکانی کەبیری لێدەکەنەوە بەشێوەی زجل شیعرەکان دەچڕن. هەربۆیە چەند جۆرێکی باش و سەرسوڕهێنەریان بەیادگار بەجێهێشتووە. بەپێی زمانی غەیرە فەصیحی خۆی (بەبەراورد بەزمانی عەرەبی موزەڕ) بوارێکی فراوان بۆ بەلاغەت لەم شێوازەدا بەدەستیانهێناوە، یەکەمین کەسێکیش کەئەم شێوازەی زجل ی داهێنا ابوبکر ابن قزمانە[٣٩١] دەرکەوتووە و لەسەردەمی دەمامکداراندا (مورابیتان) دا ژیاوە و، بەپێشەوای هەموو زجل سازان دادەنرێت. ئیبن سعید دەڵێت: من بینیم زجلەکانی ئەو لەبەغداد زیاتر لەهەموو شارەکانی مەغریب دەیانگێڕنەوە. وەهەروەها دەڵێت: ابوالحسنی کوڕی جحدەری اشبیلی پێشەوای زەجل سازانی ئەم سەردەمەم بیستووە کەدەیگوت: هیچکام لەمامۆستایان و گەورەکانی ئەم هونەرە بەوەها بەدیهی گوتنێکی سەرسوڕ هێنەر کەئەم مامۆستا قزمانە پێشەوای ئەم هونەرە دەستپێکردووە توانای ئەوەیان نەبووە: ئەو ڕۆژێك لەگەڵ بەشێك لەیارانی خۆیدا دەچێت بۆ گەڕان و لەگەڵ ئەواندا لەژێرسێبەرێکدا دادەنیشن. لەبەرامبەریانەوە پەیکەرێکی شێری دروستکراو لەمەڕمەڕ هەبووە و، لەدەمیەوە ئاوڕژاوە بەسەر بەردی تەختدا کەپلیکانیان

---

[٣٩١] ابوبکر محمد وەزیری عبدالملکی کوڕی قزمان، یان ابوبکری عیسای کوڕی عبدالملك ی کوڕی قزمانی مەغریبی قورتوبی، لەگەنجیدا خزمەتی ئاخرین فەرمانڕەوای بنی افتس لەبتلیوس کردووە و چەندین سەفەری لەئەندەلوسدا کردووەو شاری اشبیلیە و غەرناتەی بینیوەو، لەغەرناتەدا شاعیری نزهونی بینیوە موشحاتێکی زۆری بەزمانی گشتی نوسیوە. وەهەروەها جۆرێکی تری بەناوی زجل نوسیوە کەلەپێشنیارەکانی ئەوە. لەساڵی ٥٥٥ ك دا مردووە. (لغتنامە دهخدا).

دروستکردبوو. ابن قزمان دەڵێت: سێبەرێك لەسەر تەختەیەکی دروستکراو کەوەك باڵکونێك وایە. وەشێرێك کەبەساقی مارێکی قوتداوە و دەمی کردووەتەوە هەروەك ئەو مرۆڤەی کەباوێشك دەدات. وەئەومارە لەدەمی شێرەکەوە هەندێکی بەسەر تاشەبەردەکاندا دەخشێت.

ئیبن قزمان لەگەڵ ئەوەی کە لەقورتوبەدا ژیاوە بەڵام زۆریش چووەتە اشبیلیە بۆ سەیرکردنی ڕووباری ئەو شارە. ڕۆژێکیان گروپێك لەزجل سازانی هەڵکەوتوو بۆ گەڕان و خۆشی لەوێدا کۆبوونەوەو بەکەنار ڕووبارەکەدا دەگەڕان، منداڵێکی جوان لەخاندانەگەورەکانی ئەو شارەیان لەگەڵدا بوو، وەکاتێك کەهەموویان بۆ ڕاو لەناوبەلەمەکەدا دانیشتبوون دەستیانکردە زجل گوتن لەباسی حاڵی دەستپێکردن و، عیسای بلیدی گوتی: دڵی من دەیەوێت خۆی لەجەوری مەعشوق ڕزگاری بکات. لەکاتێکدا لەدەستی چووە و هێشتا عەشق لەلەناوچوون نزیکی دەکاتەوە. ئەم بێچارەیەی کەلەبارە قورسەکانی عەشق نارەحەتی زۆری بینیوە، بەهۆی ئەو بەڵا گەورەیەی کەگرفتاری بووە دڵەڕاوکێی هەیە و پەرێشانە. بێگومان ئەگەر ئەو چاوە جوانە ڕەشانە دیار نەمێنن دڵی من خەمبار دەکەن لەگەڵ هەمووئەمانەشدا چاوەڕەشەکان دڵی منیان بێتواناو زەبوون کردووە. دواتر ئەبو عەمری زاهیدی اشبیلی[٣٩٢] گوتی: دڵڕفێنێك دەستیپێکرد ئەوە عەشقە کەئەو والێدەکات دڵەکان کەمەندکێش بکات بۆلای خۆی و هیوادارە دڵەکان ڕاوبکات. دەبینی چ شتێك ئەوی والێکردووە ڕەنج و ئازار بکێشێت؟. حەزی کرد عەشق بکاتە یاریچەیەکی دەستی خۆی. وەلەم یاریەوی ئەو گروپێکی زۆر لەخەڵکی لەناوچوون.

دواتر ئەبوالحسنی مقری دانی شیعری گوت: ڕۆژێکی خۆشە، هەموبینەران لەجوانیەکانی سەرسامن و باسی دەکەن مەیی و میهر لەنێو قەیرەوانی مندا فراوانە.

---

[٣٩٢] ابوعەمری کوڕی زاهیری اشبیلی لەچەند شوێنێکی تردا هاتووە.

کاتێك کەهاوڕێان لەژێر درەختی سنەوبەردا خەوەنوچکە دەکەن، باشتر وایە بۆمن کەڕاوەماسی بکەم و سەیری ئەو چاوە دڵڕفێنانە بکەم.

دواتر ئەبوبکری کوڕی مرتین گوتی: بەڕاستی ئەتەوێت سواری کەشتی ببی؟ لەسەر ئەو ڕووبارە دڵڕفێنە کەتێیدا ماسی و ڕاوچییەکان دەبینرێن. ئەو ڕاوچیە ماسیەکانی ڕاونەکردووە، بەڵکو داوەکەی پڕە لەدڵەکانی خەڵکدا. دواتریش ابوبکری کوڕی قزمان گوتی: کاتێك ئەو کوڕە تۆڕەکەی خۆی بۆدانانی لەناوئاوەکەدا دادەنێت چۆن ماسیەکانی بەرەو ئەم لاو ئەولا فڕێ دەدات؟ ئەوان نایانەوێت بکەونە داوەکەوە بەڵکو تەنها حەزیان لەوەیە کەئەو دەستە بچووکە دڵنشینانە ماچ بکەن، وەلەهەمان سەردەمدا لەخۆرهەڵاتی ئەندەلوسدا شاعیرێکی زجل ساز بەناوی محفلی اسود، کەزجل گەلێکی زۆرباشی هەبوو کەیەکێکیان بەم شێوەیە دەست پێدەکات: من کەهەمیشە لەگیرۆدەیی دەترسام. سەرئەنجام گرفتار بووم و عەشق دووچاری چارەنوسێکی خەمباری کردم.

وەهەرلەم زجلەدا دەڵێت: کاتێك سەیری ئەو گۆنا جوان و نەجیبانە دەکەیت سوری سەرانسەری دادەپۆشێت. ئەی عەوداڵی کیمیا اکسیر لەچاوانی مندایە کەسەیری سیم دەکات و دەیکات بەئاڵتوون. لەپاش ئەمانیش گروپێك لەزجل نوسان دەرکەوتن کەسەرقافڵەیان مدغلیس بوو کەلەم جۆرە شیعرەدا بەرهەمگەلێکی سەیری هەیە. هەروەك لەزجلە بەناوبانگەکەیدا دەڵێت:

بارانێکی نەرم دەبارێت – تیشکی خۆر دەدرەوشێتەوە

ئەو یەك ئاسنین و ئەویتر – بەئاڵتوونی دەرکەوتووە

گیا تێرئاوو سەرمەست دەبن – لقی درەختانیش لەسەماو گۆرانیدان

ئەوانە ئەیانەوێت بەرەو ئێمە بێن – بەلاَم شەرمدەکەن و ڕادەکەن

ئەم شیعرانەش لەباشترین زجلە کانی ئەوە:

ڕووناکی دەرکەوت و ئەستێرەکان سەرگەردانن

هەستەبابەیەکەوە ماندوبوون لەخۆما بەدوور بکەینەوە

تێکەڵیەکم لەسوراحیەکدا نۆشی کەبەلای منەوە لەهەنگوین شیرین ترە– ئەی ئەو کەسەی چاولێگەری لەمن دەکەی و لۆمەم دەکەیت، خودا بتخاتە شوێن ئەوەی کەئەتەوێت. تۆدەڵێیت ئەم گوناهە گوناهێکی تر بەرهەمدەهێنێت. – وەزیری لەناودەبات. ئەڵبەتە مانەوە بۆتۆ لەسەرزەوی حیجازدا باشترە، چ شتێك تۆی والێکردووە ئەم قسە بێهودانە لەگەڵ مندا بکەیت؟. تۆبڕۆ بۆحەج و زیارەت – وازم لێبێنە با بنۆشم. بۆکەسێك کەتواناو هێزی نیە – نیەت لەکردار باشترە.

وەلەپاش زجل بێژانی ناوبراو لەاشبیلیەدا ئیبن جحدر دەرکەوت، کەکەسێکە لەکاتی فەتحی میروقەدا بەسەر هەموو زجل سازاندا لەپێشتر بووە، هۆکارەکەشی ئەو زجلەیە کەبەم شێوەیە دەستپێدەکات: هەرکەس لەگەڵ یەکتاپەرستیدا دووژمنایەتی بکات دەکوژرێت من لەو کەسانەی کەدژایەتی حەق دەکەن زۆر بێزارم. ئیبن سعید دەڵێت: من ابن جحدر و قوتابیەکەی یعتعم بینیوە و یعتع بێژەری زجلێکی بەناوبانگە کەبەم شێوەیە دەست پێدەکات: خۆزگە دڵدارەکەم بدیایە بۆ ئەوەی گوێی ماچ بکەم بەهێواشی ئەم پەیامە بچووکەم پێبگەیاندایە: بۆچی وازی لەگەردنی ئاسك هێناوە و دەنوکی جوجکەی کەوت فڕاندووە؟.

لەپاش گروپی نابراو ابوالحسنی سهلی کوڕی مالیك پێشەوای ئەدەب لەگۆرەپانی زجل سازیدا دەرکەوت. لەپاش ئەوانیش لەم سەردەمەدا هاوڕێمان وەزیر ابوعبداللەی کوڕی خەتیب سەرمەشقی شاعیرانە و بەکۆی دەنگ پێشەواو مامۆستای هۆنراوە و پەخشانە لەنێو نەتەوەی ئیسلامدا، وەلەباشترین شیعرەکانی لەم شێوازی زجلەدا ئەمانەن کەبەم شێوەیە دەستپێدەکەن: بادە بکە بەناو شەرابەکاندا پەیاپەی بۆم بێنە. سەروەت تەنها بۆ ئەوە ئافرێنراوە کەبەرباد بکرێت.

وەلەقسەکانی ئەو وەك شێوەی صۆفیەکان کەبەشێوازی یەکێك لەو گروپە بەناوی ششتریەوە گوتوویەتی ئەم زجلەیە: لەهەلاتنی خۆرەوە تاوەکو ئاوابوونی بەیەك غەزەل

ئاوێتەی کردووە: ئەوەی کەنەدەبوو لەجیهانی بووندا بێت مردو ئەوەشی کە دەبوایە بمێنێت مایەوە.

وەهەروەها لەباشترین بەرهەمەکانی ئەو زجلێکە کە بەم شێوەیە دەستپێدەکات: ڕۆڵەگیان دووری لەتۆ گەورەترین بەڵاو موصیبەت بۆمن — وەکاتێك لەتۆوە نزیکم کەشتی ئومێد دەگاتە کەنار.

وەلەسەردەمی وەزیر ئیبن خەتیبدا لەئەندەلوس زجل سازێك بەناوی محمدی کوڕی عبدالعزیم لەخەڵکی وادی ئاش دەرکەوتووە لەم شێوازەدا پێشەوا بووە و، زجلێکی هەیە وەك زجلەکەی مدغلیس کەبەناونیشانی: (ڕۆشنایی دەرکەوت ئەستێرەکان درەخشانن) بەم شێوەیە گوتوویەتی: ئەی گێلەکانی دیلی فیکر، کاتی سەرمەستی شەیدایی کۆتایی هات، چونکە خۆر هاتە سەر بورجی حمل و هەرڕۆژێك مەستی شێتی دەستپێبکات وریا بن ماوە نەخەن نێوان ژێری دووربینیەوە. بەرەو شنیل بچین و لەوێدا بەسەر چیمەنە پڕو سەوزەکانەوە بادەنۆشی مەستی بەدەست بهێنین. باسی بەغداد و قسەکانی نیل مەکە، سەرزەوی ئێمە بەلای منەوە زۆر دڵگیر ترە. لێرەدا سەرزەویەکی فراوان و تەختی زۆر هەیە بەئەندازەی زیاتر لەچل میل کەلەکاتی هەڵکردنی هەوا لەهەر لایەکەوە، هەرگیز نیشانەیەك لەتەپوتۆز نابینی. چۆن بەم شێوەیە نەبێت لەکاتێکدا هیچ شوێنێکی ئاوەدان بەئەندازەی پەڕەکاغەزێکیش نەماوە، مەگەر ئەوەی کە بەهۆی زۆری گوڵ و ڕیحانەوە لەوەرگەی هەنگەکان بوونی هەبێت.

وەئەم شێوازەی زجل سازی لەم سەردەمەدا لەو هونەرانەیە کەخەڵکی ئەندەلوس بەگشتی هەڵیانبژاردووە و بەو شێوەیە شیعر دەڵێن. تەنانەت ئەوان لەباقی بحورە پانزە جۆریەکەشدا ئەم شێوازە زجلیەیان بەباشتر زانیەوە، بەڵام هەرئەو زمانە گشتی و مەحەلیەیان لەهەموو بحورەکاندا بەکار هێناوە. بەم جۆرە قسە هۆنراوانەش دەڵێن زجل وەك قسەی ئەم شاعیرە ئەندەلوسیە: ڕۆژان و ساڵانێکە کەعاشقی چاوە ڕەشەکانتم بەڵام تۆ نەلەگەڵمدا میهرەبانی نەدلیشت نەرمە — تەنانەت دەبینی کەدڵی من بەهۆی

عەشقی تۆوە دووچاری چ چارەنووسێك بووەتەوە: وەك ئاسنێکە لەکورەی ئاسنگەرەکاندا و فرمێسکەکانی دەڕژێن و دەیخەنە ناوئاگرەکەوە و پیکەکان لەچەپ و ڕاستەوە دەیکوتنەوە – خودا مەسیحیەکانی بۆ جەنگ دروستکردووە (کەموسوڵمانان جەنگیان لەگەڵدا بکەن) بەڵام تۆ لەگەڵ دڵی عاشقاندا دەجەنگی.

وەلەباشترین بێژەرانی ئەم شێوازە لەسەرەتای ئەم سەدەیەدا ادیب ابوعبیداللەی لوشی[٣٩٣] بوو کەقەصیدەیەکی هەیە و تێیدا سوڵتان ابن احمر ستایش دەکات: بەیانی هات و خۆردەرکەوت، ئەی هاودەمی من هەستە بەیانیان بنۆشین و لەپاش شادی گۆرانی پێبکەنین. فجر هەروەك زیوێکی ئاڵاو لەگەردنی شەو سوری شەفەقی دەرخستووە، هەستە بەدڵی خۆمان کامەرانی بکەین – عەیاری خالصی سپی و پاکیزەی ڕۆژ دەبینی کەوەك زیودەدرەو شێتەوە لەکاتێکدا کەشەفەق زێڕینە؟ ئەم زیوە سکەیەکە کەلەلای مرۆۋ ڕەواجی هەیە چاوەجوانەکان نوری لێوە بەدەستدەهێنن – بەڵێ هاوڕێی من ئەوە ڕۆژە کەخەڵکی تێیدا دەژین – وەبەو خودایەی کە ژیانی ئاوێتەی خۆشی و کامەرانی کردووە و، شەویشی بۆ ماچ و لەلادانیشتن داناوە تاوەکو لەسەر جێگەخەوی بەیەکگەیشتن دڵدارەکان یەکتری لەئامێز دەگرن – ڕۆژگار لەپاش ئەوەی ئیرەیی دەبردو بەخیل و بوو ئێستە بەخشندەبووە – هەربەو جۆرەی خەڵکی لەڕابوردوودا شەربەتی تاڵیان دەچەشت ئێستە وا بەنەینەوای دەنۆشن و خواردنی باش دەخۆنو، ڕەقیب گوتی: سەیرە، بۆچی هێندە لەعەشق و شەرابدا نغرۆ بویت و بەردەوامیش گریە و زاری دەکەیت؟ ئەوکات لۆمەکەرانی من لەم هەواڵە سەرسام بوون. گوتم ئەی قەوم هۆز لەچی سەرتان سوڕماوە؟. من بێجگە بەرامبەر دولبەرێکی جوانی نەرمخوو عاشقی کەستر نابم بۆچی من و ئەو بەکافر دەزانن و بەدرۆمان دەخەنەوە، بێجگە لەشاعیر و ئەدیب کەسیتر

---

[٣٩٣] ابوعبیدالله محمدی لوشی پزیشکێکی بەناوبانگبووە و لەمیسردا لەساڵی ٦٦٠ ك ١٢٦٢ ز وەهەندێکیش دەڵێن لەساڵی ٦٧٠ ك مردووە

لەجەماڵ و کەماڵ و جوانی بەهرەمەند نابێت. کچی پاکیزە هەڵدەبژێرێت و بێوەژنی ناوێت. ڕاستە کەجامی بادە حەرامە.

بەڵێ بادە بۆ کەسێك حەرامە کەنازانێت چۆن بینۆشێت.

هەربۆیە بەهۆی ئەوەی کەدەزانن چۆن بینۆشن گوناهی ژیران و بیرمەندا یان گێژانی گوێ پێنەدەر نامێنێت، ئەگەر وەها گوناهێك بکەن. ئەمەیە ئەو دولبەرەی کەجوانیەکەی منی وەفتون کردووە، بەلآم من ناتوانم بەباسکردنی لەفزەکان و قسەی لوس بیکەمە شەیدای خۆم.

— ئاسکێکی ڕووناکە کەئاگر دەکوژێنێتەوە، بەلآم دڵی من لەئاگری نەکوژاوەی عەشقدا بڵێسە دەدات.

ئاسکێکە هەرکە سەیری دڵی شێران دەکات بەخێرایی بۆ لای خۆی ڕایاندەکێشێت.

ئەوکات هەرکات زەردەخەنەیەك بکات زیندوویاندە کاتەوە و لەپاش گریە و زاری زەردەخەنە و شادی دەکات. دەمی بچووك وەك مستیلە و ددانە درەخشانەکانی وەك خەتیبێکە کە میللەت هاندەدات بۆ ماچ ویستن.

مرواری لەمەرجاندایە، هاوڕێی من کام گەوهەر ساز بەبێ ئەوەی بەدوایاندا بگەڕێت بەم شێوەیە ڕێکی خستوون؟.

وە بڕۆیەك کەهەرچیەك دەیەوێت دەیکات. ئەوانە کەچواندوویانە بە ڕەشیەوە ڕێگەی هەڵەیان تەی کردووە..

نازو ئەدایەك دەکات کەشەوەکانی هیجرانی من وەك پەڕی قەلەڕەش پرژو بلآو دەبێتەوە و دووچاری نامۆیی و ترسناکی دەبێتەوە..

مووە ڕەشەکانی لەسەر ئەندامگەلێکی سپیە بەڕەنگی شیر، کەهەرگیز شوان شیری لەو جۆرەی لەمەڕەکانی نەدۆشیوە، دوومەمکی بچووکی هەیە کەپێشتر لەم جۆرە مەمکە ڕەقانەی نەدیوە.

–وەبینیم چەندە خڕو ڕەقن. لەژێر مەمکەکانی کەمەر باریکێکدایە کەلەباریکیدا عەودالّ نایاندۆزێتەوە

– لەباریکیدا لەدینی من باریکترە ئەوەشی کەلۆمەکەر لەبارەی منەوە دەیلێت ڕاستەو من بەدرۆی ناخەمەوە..

بەڵێ بەعەشقی تۆ کام دین یان عەقلّ بۆمن لەجێگەی خۆی دەمێنێتەوە، هەرکەس بەدوای عەشقی تۆ بکەوێت دین و ئەقلّی دەڕفێنرێت.

وەسەرین قورسێك لەگەڵ خۆیدا دەبیات کەلەباری گراندا وەك ڕەقیب وایە کاتێك کەعاشق سەیری دلّدار دەکات، یان کاتێك کەڕەقیب چاودێری مەعشوق دەکات جوانیەکانی تۆ وەك خەسڵەتی شازادەیە یان وەك زیخەکانی بیابانە، کێیە کەبتوانێت بیانژمێرێت؟ ئەو شازادەیە کۆڵەکەی شارەکان و زمانی فەصیحی عەرەبە، وەلەفەصاحەتی قسەی ئەو ئێمە لەگەڵ شێوازی زمان وخوی عەرەبدا ڕادێین. لەزانست و کرداردا هەردووکیان یەکسانن لەگەڵ شیعر گوتندا چەندە جوان دەنوسێت.

–لەکاتی جەنگدا چەندە سینەی زۆری بەنەیزە دڕیوە؟ وەچەندەها گەردنی بەشمشێر پەڕاندووە ..

ئاسمان لەچوار سیفەتدا ئیرەیی بەو دەبات بەمن بلّێ ئایا دەتوانێت سیفەت باشەکانی بژمێرێت؟. خۆر بە هەڵهاتنی و مانگیش بە هیممەت و بەخشش و باران ئەستێرە بەپلەی بەرزیەوە ئیرەیی دەبەن.

کاتێك سواری مەرکەبی بەخشش دەبێت جلّەوی گرنگیدان و ڕێزی دان بەخەڵکی واز لێدەهێنێت نیعمەتی بەهەر ئارەزوومەندێك دەگات و، هەرکەسێکیش بچێتەلای حەزی لەگرنگیدان بێت بەو هەرگیز بێئومێد نابێت لەبارەگای ئەودا.

حەق کەنهێنی بوو ئاشکاری کردو ئیتر باتلّ توانای ئەوەی نیە حەق دابپۆشێت.

دلّی من پایەی پەرهیزکاری بنیاتناوە دوای ئەوەی کە زەمانە وێرانی کردووە. خەڵکی لەکاتی دیداری ئەودا دەترسن لەوەی کەباسی ئارەزووەکانیان بکەن، بەلاّم هەرکە لەگەڵ

ڕووخۆشی ئەودا ڕووبەڕوو دەبنەوە ترس لەدڵیاندا نامێنێت لەکاتی جەنگە توندەکاندا بەخەندەوە ڕووبەڕوو دەبنەوە.

سەرکەوتووە لەم جیهانەدا هێزێك نیە کەزاڵبێت بەسەریدا کاتێك کەلەگەڵ دەرکراوەکان (کافران) دا شمشێر هەڵدەکێشێت. کاتێکیش لەکەسێك دەدات پێویست بەدووبارەکردنەوە ناکات چونکە بەیەك لێدان دەیکوژێت.

– ئەو هاوناوی محمدالمستەفایە (ص) خودا بۆ سەڵتەنەت هەڵیبژاردووە. ئەو خەلیفەی موسوڵمانان و فەرمانڕەوایانە.

سەرداری سوپاو جوانی کەژاوەیە. لەبەرامبەر ئەمارەتەکەیەوە خەڵکی سەری ڕێز و نەوازش دادەنەوێنن.

بەڵێ هەمووان خوازیاری ماچکردنی دەستی ئەون. بەنی نەصر لەخاندانی ئەون کەوەك مانگی تەواو وان.

لەئاسمانی گەورەییدا هەڵدێن و ئاوا نابن. وەلەبەرزی و شەرافەت پایەگایەکی دێرینیان هەیە، بەڵام لە ملکەچی و شەرم و حەیادا لەخەڵکەوە نزیکن.

تائەوکاتەی فەلەك بگەڕێت بەپایەداری دەیانهێڵێتەوە، مادەم کەئەم قەصیدەیە لەعەروزدا: یاشمس خدر ماله مغرب تغنی، تائەوکاتەی کە ئەم قەصیدەیە لەئەنجومەنەکاندا بەئاوازەوە بیخوێننەوە ناوەڕۆکەکەی بەم جۆرەیە: ئەی خۆر بشارێوە چونکە خۆری ئێمە ئاوانابێ.

دواتر خەڵکی شارەکانی مەغریب هونەرێکی نوێیان لەشیعردا داهێنا، کەوەك موشح لەڕووی افاعیلی عەروزیەوە خاوەنی میصراعگەلێکی دووسەرەیە. ئەم جۆرە شیعرانە بەزمانی مەحەلی شاری خۆیانیشیان دەگوتەوە و ناویان لێنا عەروزی بلد. یەکەمین کەسێکیش کەئەم شێوازەی داهێنا پیاوێکی ئەندەلوسی بوو، کەبەناوبانگ بەابن عمیر کەلەئەندەلوسەوە هات بۆ فاس و لەوێدا مایەوە و پارچەیەکی لەسەر شێوەی موشح چڕی، بەڵام لەم پارچەیەدا بێجگە لەهەندێك شوێنی کەمدا لەیاساو ڕێسای زمانی عەرەبی

دەرنەچووە وەپارچەی ناوبراویش بەم جۆرەیە: بەیانیان لەکەنار جۆگەلەکانەوە ناڵە و گریانی کۆترێك منی خستە گریەو زاری.

سەرلەبەیانیان لەسەر ددانەکانی گوڵێکی چاوقەوی شەونم و باران دەڕوات، بەیانی بەرەو بێستانەکە چووم بینیم قەترە بارانەکان کەنیزەکەکانی باخ گوڵەکانیان کردووە بەگەردن بەندی گەوهەر ئاسا ڕازاندووەتەوەو، جۆگەلەگەلێك کەبەهۆی دۆڵابی باخەوانەوە چوون وەك ئەوەوان هەروەك بڵێی لەدەوری درەختی میوەکانەوە مارگەلێك ئەڵقەیان بەستووە. قەدی لقەکان بەخاڵخاڵگەلێك ڕازێنرابوویەوە هەموو ئەم لقانە باخەکەی وەك دەستبەندێك دەورەیانداوە.

دەستی باران گیرفانی خونچەکانی دڕیبوو هەواش بۆنی میسکی لەخونچەگوڵەکانەوە بەملاوئەولادا بڵاو دەکردەوە. عاج (سپیەتی) ڕۆژ لەگەڵ ڕەنگی ڕەشی هەوردا ئاوێتە بوبو نەسیمی لەخونچەکانی دەدا و بۆنی خۆشی میسکی بەهەوادا بڵاو دەکردەوە.

بینیم باڵ و پەڕی کۆتر لەنێو گەڵای لقی درەختەکاندا بەهۆی قەترەکانی شەونمەوە وەك عاشقێکی دڵ لەدەستدراوی غەریبێك ناڵە و زاری دەستپێکردووە.

وەبەهۆی ئەم پارچەنوێیە هەروەك بڵێی عابایەکی پێچراوەیە، بەڵام ئەو خاوەنی نوکێکی سورو پەنجەی خەنەیی ڕەنگبوو زنجیرێکی گەوهەری لەگەردندا بوو. لەنێو لقی درەختاندا هەروەك عاشقێکی دڵدۆڕاو دانیشتبوو.

قومری کەپشتی بەباڵێکی خۆی بەستبوو کردبوویە ڕخەری خۆی و وەباڵەکەی تریشی پێچابوو لەخۆی و کردبوویە لێفەی خۆی.

ئەو شکاتی لەو عەشقەدەکرد کەلەدڵیدا هەیبوو هەربۆیە دەنوکی لکاند بەسنگیەوە و هاواری کرد. گوتم: ئەی کۆتر خەونەچووەتە چاوم، بەڵام دەبینم کەتۆ بەردەوام فرمێسك دەڕێژی؟ گوتی: هێندەگریاوم کەفرمێسك لەدیدەکانمدا نەماوە و بەناچاریەوە لەژیانمدا دەبێت بەناڵەو زاریەوە بژیم.

گریانی من بۆ لەدەستدانی بێچوویەکە کەلەهێلانەکەم هەڵفڕی و ئیتر نەگەڕایەوەو، منیش لەسەردەمی نوحەوە باوەشم کردووە بەگریەو زاریدا، ئایاوەفاو پاراستنی ماف بەم جۆرەیە؟

سەیری چاوەکانم بکە کەبەهۆی گریانی زۆرەوە برینداربوون. ئێستەش بزانن ئەگەر کەسێك لەنێو ئێوەدا یەك ساڵ بگری دەڵێت: ئەم گریەو ناڵە و زاریە ڕۆح و گیانی من ئازار دەدات، گوتم: ئەی کۆتر ئەگەر تۆ لەم دەریا بێبنەدا لەو خەمەی کەمنی تێدا نغرۆ بووە غەرق ببی لەحاڵی زاری من توشی شۆك دەبی و بارانی فرمێسك لەچاوەکانت دەباری.

وەئەگەر ئەم ئاگرە سوتێنەرەی کەلەدەروونی مندا هەیە لەدڵی تۆدا هەبووایە ئەو لقانەی کەبەسەریانەوە دانیشتووی دەبوونە خۆڵەمێش. ئێستەش ئەوە بۆچەندین ساڵە بەئەندازەیەك ڕەنجی هیجرانم تەحەمول کردووە بەهۆیَ لاوازیەوە خەڵکی نامبینن و تەنها مشتێك ئێسقانم ماوەتەوە و ئەم لاوازیەش منی لەبەرچاوی خەڵکی شاردووەتەوە.

ئەگەر مەرگ بەشێوەیەکی ئارەزوومەندانە بێتەلای من ئەوا پێشوازی لێدەکەم.

خەڵکینە هەرکەس لەمە بەدواوە بمرێت لەدەرد و ڕەنج ئاسودە دەبێت. کۆتر بەمنی گوت ئەم باڵە سپیانەی من لەئەشکی خوێنیندا سور بوون. وەتاوەکو ڕۆژی قیامەت تەوقی وەفاداری لەگەردنی مندایە.

بەلاَم کاتێك کەجەستەم دەبێتە خۆڵەمێش سەرەنەیزەکەم وەك پارچەئاسنی سوتێنەر دەمێنێتەوە و چیرۆکی خەمناکی من بلاَو دەکاتەوە. ئەوکات کۆترە جۆراو جۆرەکان بۆم دەگرین، وەئەو گرووپەشی کە دەرد و ڕەنجی دووری هیجرانی یاریان تەحەمول کردووە دەردەکانی دەروونی خۆیان ئاشکرا دەکەن.

ئەی دونیای زرق و برقدار کەمن لەناوتدا ئاسوودەیم نەبینی خودات لەگەڵ.

ئەم زجلە خەڵکی فاس پەسەندیانکردو زۆر حەزیان لێکرد و لەسەر شێوازەکەی دەستیانکردە زجل نوسین. بەلاَم اعرابی حەرەکاتی کۆتایی ووشەکان بەکەڵکی ئەوان

نەدەهات هەربۆیە وازیان لێهێناو ئەم جۆرە شیعرە لەنێویاندا بلاّو بوویەوەو، زۆرێك لەزجل بێژان شارەزاییەکی باشیان تێدا پەیدا کرد و، چەندین جۆری تری لیّ دروستبوو وەك مزدەوەج و کازی و ملعبە و غەزەل. وەبەپێی جیاوازی مزدوج کردن (تەرتیب کردن)ی قافیەکان و، ئەو تێبینیانەی کەشاعیرەکان لفەمیارەیەوە هەیانبوو شیعرە ناوبراوەکانیان بەچەندین ناوی جۆراو جۆرەوە ناوزەد دەکرد، وەك جۆرەکانی مزدوج شیعرگەلێکن کەیەکێك لەشاعیرە گەورەکان کەخەلّکی تاز بووە لەناوەڕاستی ڕێگەی ملویەدابووە، لەفاس و بەئیبن شوجاع بەناوبانگبووە بەم شێوەیە گوتوویەتی: سەروەت مایەی خۆشی و گەورەیی ژیانی دونیای خەلّکە، - کەجوانی دەبەخشێتە دەموچاوە ناشیرینەکان.

- هەربۆیە هەرکەسێك پارەی زۆری هەبێت قسەی لەهەموو شوێنێك دەروات و دەگاتە پلەو پایەی بەرز.

هەرکەس دیناری درهەمی زۆری هەیە ئەگەرچی بچوکیش بێت ئەوا گەورەدەبێت و هەرکاتێکیش کەگەورەیی گەلێك دووچاری بچوکبوونەوەهات ئەوا بچووك دەبێتەوە.

ئەوە کێیە کەدلّی منی دەچووشی و ئاوەژووی دەکردەوە؟ نزیکبوو دلّم بتەقێت، ئەگەر خۆمم تەسلیمی قەزاو قەدەر نەکردایە - کاتێك کەگەورەی گەلێك پەنای بردە بەرکەسێکی بیّ ئەصلّ و نەسەب، شتێکی باشە کەلەم ئاوەژوو بوونەی ڕۆژگار خەمباربین‌و نائومێدانەو بەپێچەوانەی نەریتەوە کراسەکەمان بەسەرمانەوە بپێچین-

کاتێك کە بێنەواکان ببنە پێشەوای پیاوە گەورەکان و ڕووباری گەورە لەجۆگەلەیەکی بچووك سود وەربگرێت، ئەوا خەلّکی دووچاری زەبوونی لاوازی بوونەتەوە یان زەمانە خراپ بووە.

ناشزانن دەبێت لۆمەی چ کەسێك بکەن.

سەردەمێك هاتووەتە پێشەوە کەفلاّن بە ابوفلان بانگدەکەن و ئەی خۆزگە بتدیایە کەچۆن وەلاّمی خەلّکی دەدەنەوە.

بەکورتی ژیاین و بەچاوی خۆمان بینیمان کەسەرکردەکانی گەل لەپێستی سەگدان.

گەورەکانی خەڵکی کەسانێکن کەخاوەنی پشتیوانگەلێکی زۆر زەبوونن ئەوانە لەکوێ و گەورەیی لەکوێ، ئەوانە لەو سیفەتانەوە زۆر دوورن. ئەوان خۆیان بە نمونەی شارو پشتوپەنای مەملەکەت دەزانن لەکاتێکدا خەڵکی بەبزنیشیان نازانن.

—یەکێکی تر لەشێوازەکانی شیعری خەڵکی فاس قسەکەی ئیبن شوجاعە کەلەهەندێك لەمزدوجەکانی خۆیدا دەڵێت: هەرکەس دڵبەستەی دولبەرانی ئەم سەردەمە ببێت ناڕەحەت دەبێت..

هاوڕێ گیان وازلەعەشق بهێنە نەوەك جوانی نازداران بتکاتە یاریچەی دەستی خۆی. چونکە هیچ نازدارێك نیە کەپەیمانەکەی بباتە سەر. بەکەمی دولبەرانێك هەن کەبتوانی دڵیان پێوە بەند بکەیت و ئەوانیش ببنە دڵداری تۆ. نازداران نازو تکبر دەکەن بەسەر دڵداراندا و لێیان دوور دەکەونەوە و ئەیانەوێت دڵی خەڵکی بشکێنن.

—وەئەگەر لەگەڵ دۆستاندا پەیوەندی ببەستن ئەوا بەخێرایی دووچاری فیراقیان دەکەن.

—وەئەگەریش پەیمان ببەستن بەهەرشێوەیەك بێت پەیمان دەشکێنن

—مانگ ڕوویەکم خۆشدەویست و دڵیدۆڕاوی بووم

—بەجۆرێك ئامادەبووم بەسەرگوناکانمدا بڕوات.

—بەدڵم گوت: ئەی دڵ میوانێك دێت بۆلات زۆر ڕێزی لێبگرە و ئەو زەلیلیەی کەلەم ڕێگایەدا دێتەرێت بەئاسان وەرگرە..

—چونکە بەناچاریەوە دووچاری بەلاو موسیبەتەکانی عەشق دەبیتەوە

—ئەوم کردە فەرمانڕەوای بوونی خۆم و سەڵتەنەتی ئەوم بەسەر دڵمدا قبوڵکرد.

— خۆزگە ئەوکاتەی کەسەیرم کرد و بوومە دڵدۆڕاوی حاڵی منی دەبینی لێم تێدەگەیشت.

–هەرئەندێشەیەك کەبەزەینی ئەودا بێت من بەخێرایی فێری دەبم و بەرلەوەی بیلێتەوە من لەبەرم کردووە.

–وەبۆ بەدەستهێنانی خوازراو هەرکات بیەوێت ئامادەم و هەرچەندە عەسری بەهار یان شەوی تاریك بێت..

وەبەمەبەستی فەراهەمهێنانی ئاواتەکانی زانیاری بۆ کۆدەکەمەوە بۆ هەرشوێنێك پێویست بێت دەچم ئەگەر ئەصفەهانیش بێت.

– وەبلێت پێویستم بەو شتەهەیە دەلێم بۆت دەهێنم. بەم شێوەیە شیعرەکە کۆتایی پێ دەهێنێت.

یەکێکی تر لەو شاعیرانەی کەلەتلمساندا دەژیا علی کوڕی موئەزین بوو. وەلەسەدەکانی کۆتایشدا یەکێك لەشاعیرە گەورەکانی ئەمان لەزهروندا لەناوچەکانی مکناسەدا دەژیا و ناوی کەفیف بوو. ئەو لەهەموو شێوەکانی ئەم هونەرەدا داهێنانگەلێکی زۆری هەبوو، لەنمونەی ئەو شیعرەکانی کەلەبیرمە مەلعەبەیەکە کەلەبارەی سەفەری سوڵتان ابوالحسن و خاندانی مەرینی بۆ ئەفریقا گوتوویەتی و، تێیدا کۆپلەیەکی تایبەتکردووە بەشکانی ئەو خاندانە لەقەیرەواندا لەپاش ئەوەی کەشێوازی ئەوان لەئەفریقادا ڕەخنە دەکات، دواتر دەستدەکاتە دڵدانەوەیان و زەینیان لەگەڵ ئەم جۆرە ڕووداوانەدا ڕادەهێنێت. سەرەتای مەلعەبەکەی کەلەهونەرەکانی ئەم تەریقە شیعریەیە لەبەدیعترین شێوەکانی بەلاغەت دەژمێردرێت، لەدەستپێکردنی قسەدا و پێی دەڵێن بەراعەتی استهلال[٣٩٤] و بەم شێوەیە دەستپێدەکات: پاك و بێگەردی بۆ ئەو کەسەی کەلەهەرچرکە و زەمانێکدا ئەندێشەو یادگاری ئەمیرەکان و گەورەکانی گەل بەدەستی ئەوە. ئەگەر گوێڕایەڵی بکەین سەرکەوتنی گەورە دەکاتە نسیبمان و ئەگەریش گوێڕایەڵی نەبین ئەوا بەرەو سەرشۆڕیماندەبات.

---

[٣٩٤] لەجوانکاریەکانی قسەیە کەشاعیر یان نوسەر لەسەرەتای قسەکانیدا بابەتەکان بەجۆرێك دەستپێدەکات کەکورتەی مەبەست لەشیعر یان بابەتەکە هەرلەسەرەتاوە بۆ کەسی شارەزا دیاربێت. (تعریفات جرجانی).

بەم شێوەیە قسەکانی درێژە پێدەدات تائەوەی کە لەپاش (تخلص)[٣٩٥] باسەکە دەباتە سەرباسی لەشکری مەغریب و دەڵێت: لەنێو ژمارەیەکی کەمی ڕەعیەتدا (مێگەل) بیت باشترە، چونکە سوڵتان (شوان) لێپرسراوە بەرامبەر بە ڕەعیەتەکەی[٣٩٦] قسەکەم بەدرودو سلاوات بۆسەر بانگەوازکاری ئیسلام پێغەمبەر (ص) ی ڕەوشت جوان و خاوەنی پلەو پایەی تەواو و، خەلیفە ڕاشیدەکانی و شوێنکەوتووانی (صحابە) دەست پێدەکەم و، لەدوای ئەمانیش ناوی ئەوانە بهێنە کەخۆشت دەوێن و یادیان بکە و بڵێ: ئەی ئەو حاجیانەی کەبیابانتان تەی کردووەو، لەچۆنیەتی مەملەکەت و دانیشتوانی تر ئاگادارن.- ئیرادەی سوڵتان لەشکری فاسی درەخشان و بەشکۆی بەرەو کوێ جولاندووە ؟. – ئەی ئەو حاجیانەی کەسەردانی ئارامگای پێغەمبەرتان کردووە و بینیوتانە لەبارەی لەشکرەکەی مەغریبەوە کە لەئەفریقای ڕەشدا لەناوچوون پرسیارتان لێدەکەم.[٣٩٧]

دواتر شاعیرلەبارەی سەفەری سوڵتان لەشکرکێشیەکەی بەرەو عەرەبەکان (دەشتەکیەکان) ی ئەفریقا و سەرئەنجامی کارەکەی گفتووگۆ دەکات و بەداهێنانێکی سەیر قسەی لەبارەوە دەکات. خەڵکی تونسیش بەزمانی مەحەللی خۆیان لەشێوازی مەلعەبەدا بەرهەمگەلێکیان هەبووە، بەلام زۆربەیان باش نین، هەربۆیە نمونەیانم لەبیر نیە.

---

[٣٩٥] لێرەدا مەبەست لەتخلص بریتیەلەگۆڕینی بابەتی شیعرەکە، بۆنمونە شاعیر لەوەصف یان غەزەل و تغزل دەچێت بۆ مەدح یان شیوەن، یان هەربابەتێکی تر و ئەگەر بەباشی دەرەقەتی بێت ئەوا پێی دەڵێت حسن التخلص کەیەکێکە لەصنعەتەکانی شیعر.

[٣٩٦] ئاماژەیە بەفەرموودەی: (کلکم راع وکلکم مسئول عن رعیتە).

[٣٩٧] پاشماوەی ئەم کۆپلەیە بەهۆی جیاوازی چاپەکانەوە بەڕوونی دیار نیەو، دسلان تەرجەمەی نەکردووەو ئێمەش لێرە وازمان لەتەرجەمەکەی هێناوە.

وەزۆربەی خەڵکی بەغدادیش کاریان بەجۆرێکی تایبەتکردووە لەهونەرەکانی شیعر کەپێیان گوتووە موالیا[٣٩٨] چونکە ناوی مەوالیا جۆرێکی ترەو، بەپێی جیاوازی ئەو وەزنانەی کەلەبارەی هەریەکە لەوانەوە لەلای ئەمان باوەڕپێکراو بووە. ئەوانیان بەچەندین ناوی جۆراو جۆر ناوزەد کردووە وەك قوما[٣٩٩] و کان وکان[٤٠٠] و دووبەیتی[٤٠١]. وەبەزۆری ئەم جۆرە شیعرانە مزدوجە خاوەنی چوار لقە. وەخەڵکە میسر و قاهیرە ئەم شێوازەیان لەبەغدادیەکانەوە وەرگرتووە، وەنمونە گەلێکی قابیل و باشیان هێناوە و بەپێی داخوازی زمانی مەحەلی خۆیان تێیاندا ئوسلوبەکانی بەلاغەتیان بەکارهێناوە،

---

[٣٩٨] ئەم جۆرە شیعرە خەڵکی واسیت لەبەحری بەسیتەوە دایانهێناوە، هەروەك چۆن دووبەیت دەڵێن و شەتری هەربەیتێك دەبێت قافیەی هەبێت و ئەم شیعرانە عەبدو منداڵەکان لەبەریان دەکردو، لەسەر دارخورما و لەکاتی ئاو دێریدا دەیانخوێندنەوە و لەکۆتایی هەرشێوەیەکیشدا دەیانگووت: یامەوالیا. کەئاماژەبووە بەخاوەنەکانیان هەریۆیە ئەم شیعرە ناونراوە مەوالیا. دواتر خەڵکی بەغداد مەوالیایان لەخەڵکی واسیت وەرگرت و هێندە شارەزاییان تێدا پەیدا کرد، کەلەبری نیسبەتدانی بۆ خاوەنە ئەصڵیەکانی دەیاندایە پاڵ بەغدادیەکان. (اقرب الموارد).

[٣٩٩] بەشەکانی قوما مستفعلن – فعلان بەسکونی حەرفی دووەم و حەرفی کۆتایی ڕوکنی دووەم. شاعیر دەڵێت: ماقام غصن البان – الاوسقمی بان مستفعلن وفعلان – من لحظ الفتان.

[٤٠٠] بەشەکانی بحر کان و کان لەبەشی یەکەمی هەربەیتێکی دا مستفعلن فعلاتن بەتەحریکی پیتی دووەم و ڕوکنی دووەم، وەبەشەکانی شەتری دووەم لەهەمان بەیتی مستفعلان بەسکونی پیتی کۆتایی وەلەبەیتی دووەم مستفعلن فعلانە بەسکونی پیتی دووەم و کۆتایی ڕوکنی دووەم. بەیتی سێیەم وەك یەکەم و بەیتی چوارەم وەك بەیتی دووەمە، هەروەك شاعیر دەڵێت: کن یاملیح حلیما – ثلثت میزان الصدور – مستفعلن فعلان یابدر یا فتان.

[٤٠١] بەشەکانی بەجۆرێکن کەابن غازی دەڵێت: دو بیتهم عروضة ترتجل – فعلن متفاعلن فعولن فعل. وەمامۆستای خوالێخۆشبوو نیشابووری: یامن بقاة کل یوم لی عید – یامن بمحیاة لی العید سعید. لوجدت بقبلة علی عبدك علی ذا – صبرت لة العیش مدی الدهر رغید. ئەمەش هەمان ئەو وەزنە رباعیەیە کەلەبەرامبەر لاحول ولاقوە الا بالله یە. دانەر قوما و کان وکان و دوبەیتی خستووەتە ناو مەوالیاوە لەکاتێکدا عەروزیەکانی هونەر سیلسیلە و دوبەیتی و قوما موشح و زجل و مەوالیا و کان و کان لەحەوت هونەرەکەیان زانیوە و بەداهێنانی موەلیدەکانیان زانیوە.

شیعرگەلێکی جوان و سەرسوڕهێنەریان گوتووە و لەدیوانی صفی حلی قسەیەکم لێ بیست نوسیبووی مەوالیا لەبەحری بەسیتە و خاوەنی چوار لق و قافیەیە و پێشی دەڵێن صوت و دووبەیتی و لەداهێنانەکانی خەڵکی واسیتە. وەکان وکان لەچوار شەتر پێکدێت کەهەموویان خاوەنی قافیەن، بەلاّم وەزنی شەترەکانیان لەیەکتر جیاوازە هەروەك چۆن شەتری یەکەمی بەیتەکە درێژترە لەشەتری دووەم و قافیەکەی هەمیشە ڕیزکراوە بە حەرفی عیللە. ئەم بحرە لەداهێنانەکانی خەڵکی بەغدادە. وەئەم جۆرە شیعرەیان ڕیوایەتکردووە: ئێمە لەبارەی خوماری بڕۆکانەوە قسەمان هەیە کەتەفسیرەکەی خودی خۆیەتی و گەنگەر زمانی گەنگەر دەزانێك. (کۆتایی قسەکەی صفی).

–باشترین نمونە لەم جۆرە شیعرە کەلەبیرم ماوە ئەمەیە: برینەکەی من کەهێشتا تازەیە و خوێنی لێ دەچۆڕێت ببینن

هاوڕێی من بکوژەکەم لەدەشتدا ئازادانە تەراتێن دەکات، گوتیان: تۆڵەی خۆت بسەنەوە، گوتم ئەمە ناشیرینترە.

– ئەوەی منی بریندار کردووە ئەگەر دەرمانم بکات شایستەترە. ئەویتریش دەڵێت: لەدەرگای میوانخانەیەکم دا نازدارێك گوتی: کێیە لەدەرگا دەدات؟ گوتم: دڵدارێکەو وانەزانی تالاّنکەر یان دزبێت

زەردەخەنەیەکی کردو لەددانەکانیەوە ڕووناکیەك لێی دام – حەیران و نغرۆ لەدەریای فرمێسکەکانمدا گەڕامەوە.

شاعیرێکی تر دەڵێت: عەهدو پەیمانم لەگەلیدا هیە بەلاّم لەفیراق و جیایی دەترسم وەهەرکات بەهۆی سوتێنەری عەشقەوە گلەیەی دەکەم دەڵێت: دیدەکانم بەفیدات بن.

لەبارەی گەنجێکی جوان کەبینیبوی پەیمانەکەی خۆی بەبیرهێنایەوە و گوتی: قەرزێکت لەگەردنی مندا هەیە.

وەیەکێکی تر لەوەسفی حەشیشدا دەڵێت: ئەمە بادەیەکی خاڵصە کەلەسەر پەیمانی خۆی مرۆڤ بێنیازدەکات لەبادە و، بادە فرۆش و ساقی زۆر توندە و دەمسووتێنیٚ و لەناخمدا شاردمەوە و شوێنەوارەکەی لەگلێنەی چاومدا دەرکەوت.

وەشاعیرێکی تر دەڵێت: لەکاتێکدا کەمووی ڕەش بەتەواوەتی سەری داگیر کردووم ئەو یارەم بانگکرد و گوتم ئەی (می) (دایکۆڵەی من) ماچێکی عاشقانەم پیٚ ببەخشە.

ئەو بەهەڵگێرساندنی ئاگرێك لەدەرروونی مندا گوتی: کەسێك کەزیندووە چۆن دەمی خۆی بەپەموو داپۆشیوە (واتە سمێڵی سپی بووە).

وەشاعیرێکی تریش دەڵێت: بەزەردەخەنەوە سەیری منی کرد، بەلاٚم بارانی فرمێسکی من بەرلە درەوشانەوەی ددانەکانی هاتنە خوارەوە. – ڕووپۆشەکەی لابردو مانگێکی تەواو هەلاٚت. گیسوی ڕەشی خۆی بەردایەوە بەسەر شانەکانیدا و دڵم لەنێو لولی زوڵفەکانیدا سەرگەردان بوو. – دواتر سپیەتی ڕووخساری منی لەو سەرگەردانیەی ناوزوڵفانی ڕزگار کرد و ڕینمایی کرا.

وەشاعیرێکی تریش دەڵێت: ئەی سارەوان حوشترەکان زووتر لێخوڕە و بەرلە هەڵهاتنی خۆر لەنزیك یارەوە بوەستەو، دواتر بەناو هۆزەکانیاندا جاڕ بدە و بڵیٚ: ئەوی ئەوانەی کەعەودالّی پاداشت و سەوابن هەستن و نوێژی ئەو مردووە بکەن کەکوشتەی هیجرانی یارە. وەیەکێکی تریش دەڵێت: ئەو چاوانەی کەبەهۆیانەوە سەیری ئێوەم دەکرد لەسەرانسەری شەودا ئەستێرە دەژمێرن و لەسەر شەو بێداری ڕاهاتوون تیرەکانی فیراق بەردەوام و یەك لەدوای یەك لێم دەدەن و ئارامی ڕۆحم نەماوە، خوداپاداشتی گەورەتان بداتەوە.

وەشاعیرێکی تریش دەڵێت: ئەی ڕوومەت مانگە ستەمکارەکان من لەشاری ئێوەدا عاشقی ئاسکێك بووم کەشێرە دڕندەکان خەمبار دەکات لقێکی تازە پێگەشتووە، کە لارو ڕاست ببێتەوە دەزگیرانەکان ئەسیر دەکات ئەگەریش ڕوومەتی دەربخات ئەوا ناتوانرێت ناوی مانگ بهێنرێت. ئەم شیعرەش لەجۆری دووبەیتیە. – کەسێك کەخۆشم

دەوێت سوێند بەخودا دەخۆم کەهەرشەو تەصویری خۆی (خەیاڵی شەو) تابەیانی بۆم دەنێرێت. ئەی ئاگری عەشق شەوان ڕووناك ببەرەوە بۆ ئەوەی ڕێگە بۆ ئەو ڕۆشن بکەیتەوە.

وەدەبێت ئەوە بزانین کەزەوقی ناسینی بەلاغەت لەهەرلەهجە و زمانێکدا بۆ هەرکەسێك ڕوودەدات کەمومارەسەی تێدا دەکات و، زۆر بەکاری دەهێنێت و لەنێو نەتەوەکانی ئەهلی ئەو زمانەدا گفتوگۆی پێ بکات، تاوەکو هەروەك لەبارەی لوغەتی عەرەبەوە باسمانکرد مەلەکەی ئەو زمانەی بۆ دروستدەبێت هەروەك چۆن بۆنمونە نەئەندەلوسی دەتوانێت بەلاغەتی شیعری ئەندەلوسی شەرقی بزانێت و، نەشەرقیش دەتوا نێت بەلاغەتی شیعری ئەندەلوسی غەربی بزانێت، چونکە زمانی مەحەلی لەناوچەیەکەوە بۆ ناوچەیەکی تر جیاوازە و خاوەنی تەرکیبات گەلێکی جۆراوجۆرەو، خەڵکی هەرشارێك لەبەلاغەتی زمانی مەحەلی خۆیان تێدەگەن و زەوق و جوانیەکانی شیعری نەژادی ئەو نەتەوەیە لەواندا دێتە دی.

لەئایەتەکانی خودایە ئافراندنی ئاسمان و زەوی و ڕەنگەکانتان کەئایەتگەلێکن بۆ جیهانیان.[٤٠٢] وەنزیکبوو لەمەبەستە دەربچین هەربۆیە هاتینە سەر ئەوەی کە لەبەر ئەوەی جڵەوی قسەکە لەدەست دەرچووبوو چەندیەتی قسەکە کەبەهۆی لەدەستدانی جڵەوەوە دەرۆشت بگرینەوە دەست و، کۆتایی بەبابەتی یەکەمی ئەم کتێبە بهێنین و چونکە بابەتەکەی تەبیعەتی کۆمەڵگە و ڕووداوگەلێکە کە تێیدا ڕوودەدەن، وەئێمەش لەبارەی مەسەلەکانیەوە وادەزانم تائەندازەیەکی باش بەشێوەیەکی جامیع و پێویست قسەمان لەبارەوە کردووە و، لەوانەیە کەسانێکیش لەدوای ئێمەوە بێن و لەلایەن خواوە ئەندێشەی باش و زانستی ئاشکرایان پێبەخشرابێت و، زیاتر لەوەی کەئێمە کردوومانە ووردەکاری بکەن، چونکە داهێنەر و دەرهێنەری هەرهونەرێك لەسەری پێویست نیە بەدوادا چوون بکات و بگاتە کۆتاییەکەی، بەڵکو ئەو دەبێت بابەتەکانی ئەو زانستە و

---

[٤٠٢] (وَمِن آياتِهِ خَلقُ السَّمواتِ وَالأرضِ وَاختِلافُ ألسِنَتِكُم وَألوانِكُم إنَّ في ذالكَ لَآياتٍ لِلعالَمين) س روم ئا ٢١.

دابەشکردنی بەشەکانی دیاری بکات و ئەوەی کەلەبارەیەوە دەگوترێت ئەمیش قسەی لەبارەوە بکات و نیشانی بدات. وەپاشینانیش مەسەلەکان لەپاش داهێنەرەکانیان بەش بەبەش زیاترو زیاتری دەخەنە سەر تاوەکو تەواوو کامڵدەبێت. خودا دەزانێت و ئێوە نازانن [٤٠٣].

**کۆتایی**

**لە١٧\٨\٢٠١٤ دا وەرگێڕانی تەواو بوو.**

[٤٠٣] (وَاللّهُ يَعلَمُ وَأنتُم لاتَعلَمُون) س البقرة  ئا ٢١٣.



## وەرگێڕ لەچەند دێڕێکدا

*– ناوی سیانی: سەعید بەشیر مستەفا

* – لەدایکبووی: ١ – ١ – ١٩٨٢

* – دانیشتووی: پارێزگای هەڵەبجە

* – بڕوانامە: بەکالۆریۆس – کۆلێجی زانستە ئیسلامیەکانی بەغداد – بەشی الشریعه. ساڵی (٢٠٠٧ – ٢٠٠٨)

* – لە ٣ –مانگی شوباتی ساڵی ٢٠٠٤ ز زانستە شەرعیەکانی تەواوکردووە و ئیجازەنامەی عیلمی (الأجازة العلمية) وەرگرتووە .

*– زمانەکانی فارسی عەرەبی – زۆرباش لەقسەکردن – وەرگێڕان.

*– پیشەی ئێستا: فەرمانبەر لە مۆنۆمێنتی شەهیدانی هەڵەبجە – وەرگێڕی بەشی لێکۆڵینەوەی ستراتیژی. (وەرگێڕی ئەو شاندە عەرەب و فارسانەی کە سەردانی مۆنۆمێنتی هەڵەبجە دەکەن).

*– خاوەنی پلەی (دووەم) لەبەرهەمی وەرگێڕدراو لەسەر ئاستی پارێزگای هەڵەبجە و دەوروبەری. لەفیستیڤاڵی خەڵاتکردنی کەسانی خاوەن بەرهەم لە(مەڵبەندی پێنجی یەکگرتووی ئیسلامی)

*– بەشدار لەچەندین چالاکی و کاری ڕێکخراوەییدا.

*– ئەندامی دامەزرێنەری (ڕێکخراوی گرین بۆ ڕاهێنانی مەدەنیەت)

* – سەرنوسەری گۆڤاری کۆمەڵایەتی مانگانەی (هانە) لە ٢٠٠٥ ئۆرگانی کۆمەڵەی چالاکیەکانی هاموون.

*– ئەندامی لیژنەی سەرپەرشتیکردن و نوسینی گۆڤاری ساڵانەی (زام) ٢٠٠٥ تا ٢٠٠٦ تایبەت بەکیمیابارانی هەڵەبجە (ئۆرگانی کۆمەڵەی چالاکیەکانی هاموون).

*- وەرگێڕ لەخانەی چاپ و پەخشی ڕێنما.

* - خاوەنی چەندین کتێبی وەرگێڕدراوە لەزمانەکانی فارسی و عەرەبی:

١ - موقەدیمەی ئیبن خەلدون بەکوردی.

٢ - ئیسلام ناسی - د شریعەتی.

٣ - موعتەزیلە - شۆڕشی فیکری ئیسلامی ئازاد.

٤ - ئیبن ڕووشد .

٥ - ڕێگە ڕاستەکان - د سروش.

٦ - مرۆڤ و ئیسلام - د شەریعەتی.

٧- ئەقلّ و ئازادی - د سروش.

٨ - سەدام لەزیندانی ئەمریکیەکانەوە - پرۆژەی هاوبەش

٩ - سێکس لەئاینەکانی جیهاندا.

١٠ - جوگرافیای دانیشتوان.

١١ - جوگرافیای ئاوو هەوا.

١٢ - خەونامەی کوردی - پرۆژەی هاوبەش.

١٣ - کاریگەری ئاین لەکۆمەڵگە مرۆڤایەتیەکاندا.

١٤ - کورتەیەك لەمێژووی چەکی کیمیایی - هەڵەبجەوەك نمونە.

١٥ - ڕوانینێك بۆ تایبەتمەندی سەدە نوێکان - د.شەریعەتی

١٦ - گەشتێك بەناو فەلسەفەی ئایندا

١٧ - بۆقەکەت ماچ بکە.

١٨ - ڕەهەندە نێو دەوڵەتیەکانی بەکارهێنانی چەکی کیمیایی.

١٩ - ئامۆژگاریەکانی لوقمانی حەکیم

٢٠ - زمانی جەستە .

٢١ - موعاویەی کوڕی ئەبو سوفیان .

# مقدمة ابن خلدون

**پێشەکی ئیبن خەلدون** یەکێکە لەشاکارە بەنرخ و گەورەکانی زانستی و مێژوویی لەجیهانی عەرەبی و ئیسلامیدا، کەبەشێوەیەکی گەورە و بەرفراوان و بۆیەکەمجار لەبارەی فەلسەفەی مێژوو کۆمەڵناسی و بنەماکانی زانستە ئابووری و سیاسیەکانەوە دواوە. سەرەڕای ئەمەش، ئەم زاناگەورەیە باسی هەموو ئەو زانستانەشی کردووە کەلەسەردەمەکەی خۆیدا بوونیان هەبووە. هەربۆیە دەتوانین پێشەکیەکەی ناوبراو وەك ئنسکلۆپیدیایەك دابنێین بۆ زانستەکان لەو سەردەمەدا. لەم پێشەکیەدا ئیبن خەلدون شێواز و کارکردنی پێشینانی خستووەتە بەر ڕەخنەوە و پێی وابووە کە مێژوونوس دەبێت نەك تەنها بەدوای ڕووداوەکانەوە بێت، بەڵکودەبێت هۆکارەکانی ڕوودانی ڕووداوەکانیش بەشێوازێکی زانستی شیکاری لێکۆڵینەوە بکات . دەتوانین بڵێین کە پێشەکی ئیبن خەلدون لەگرنگترینی ئەو دانراوانەیە کە لەپێتەختی دەوڵەتی عوسمانیدا ناوبانگی هەبووە و لەنێو پیاوانی دەوڵەتی ئیمپراتۆریەتی ناوبراودا یەکێك بووە لەو پەرتووکە بەنرخانەی کە موتاڵا کراوە و سود لەزانستەکانی وەرگیراوە.

لەبڵاوکراوەکانی خانەی چاپ و پەخشی ڕێنما

نرخی هەردووبەرگ (٣٥٠٠٠) دینارە